کۆکردنەوە و ڕێکخستنی
ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی



# سەرجەمی بەرهەمی

# شاکر فەتاح

سەرجەمی بەرهەمی

# شاکر فەتاح

کتێبی دووەم

ناوی کتێب: سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح- کتێبی دووەم
ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٧٥
دەرهێنانی هونەری و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی + دڵشاد مستەفا
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣١٤)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ

# پێشەکی

چیرۆکی کوردی کە (حیکایەت و نەقڵ) بوو، سەرەتاکەی زۆر ڕۆچۆتە قووڵایی مێژووی نەتەوەکەمانەوە، دەماو و دەم، جار جار لە شێوەی (بەیت) و (چامە)دا گەلێ لایەنی بەزیندوویی پارێزراوە ماوەتەوە.

کێ دەڵێ، لەوانەیە لە پەناو قوژبنەکانی مزگەوت و قسن و گوندە دووره دەستەکانی ناو دۆڵ و دامێنی کێو و شاخەکان و دێر و کڵێساکانی کوردستاندا دەسنووسی پواوی هەلا هەلا مابن و لە پاڵ چەندان چامە و پارچە شیعری شاعیراندا بەیت و حیکایەتی کۆنی ئەم نەتەوەیان گرتبێتە خۆ... بەڵام تا ئێستا پەیی پێ نەبراوە.

هەتا چەند ساڵێ لەمەوبەر ئێمەی هەڵوەدای وشەی کوردی، (لە خەوما)کەی جەمیل سائیب، ١٩٢٥مان دادەنا بە(سەرەتای چیرۆکی هونەریی کورد)، بەڵام پاش ماوەیە ئەوە خرایە ڕوو کە دەبێ لایەکیش بەلای ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) ١٩٢٠-١٩٢٢ دابکرێتەوە و بڕوانرێتە (ئەو چیرۆکە کوردییە بلاوکراوانەی ناو ڕۆژنامەکە و... لەهەمان کاتدا بلاوکردنەوەی چیرۆکی تەرجەمەکراوی ئەورووپی)[1]. لە ڕاستیشدا بڕیار و بیرکردنەوەیەکی بەجێیە و دەبێ ئەوە بزانرێ کە ئەوانەی ناو پێشکەوتن-یش هەروا لە پڕ بێ بنەماو پێشینەیەک پەیدا نەبوون و نەخراونەتە سەر لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژنامەیە.

دوای ئەمەش دەنگوباسی بلاوکردنەوەی چیرۆکەکەی (فوئاد تەمۆ) لە ١٩١٣دا هاتە گۆڕێ و مێژووی ئەو سەرهەڵدانەی قۆناغێک بردەوە دواتر.

د. فەرهاد لەمە دەڵێ: «لە ژمارە ١ و ٢ی گۆڤاری ڕۆژی کورد لە ئەستەمبۆڵ ساڵی ١٩١٣، زاراوەیەکی ئەدەبی تازە، کە واتای ژانرێکی ئەدەبی نوێ دەگەیەنێ لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا سەری هەڵدا: چیرۆک، لێرە بەملاوە -چیرۆک- وەک ژانرێکی تازە، ناوێک بۆ خۆی وەردەگرێت و دەچەسپێت و بلاو دەبێتەوە.

ئەم یەکەمین چیرۆکە بەپێنووسی فوئادی تەمۆ نووسراوە، هەرچەندە کورتە و تەواویش نەبووە، بەڵام سیستەمی دەربەگایەتی دەخاتە ژێر پرسیارەوە، لە ڕووی هونەریشەوە، دیالۆگ و مەنەلۆگ و گرێ و شیکردنەوەی سۆز و ئەندێشەی پاڵەوانی تێدایە، جگە لەمەش بەپێچەوانەی حەکایەت و هەبوو نەبوو، کاتی ئێستای بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکان بەکاهێناوە، لە هەمان گۆڤاردا، لە ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩١٣، چیرۆکا کرمانجی، لە نووسینی: کندۆ، بلاوکرایەوە».[2]

هەر لەم بەرهەمە دەستنیشانکراوەی د. فەرهاددا، ئەوە سەلمێنراوە (بەبەڵگەوە) کە (مەلا مەحموودی

---

(١) مامۆستای کورد - گ: ژ (١١ و ١٢)، فەرهاد پیرباڵ - چیرۆکەکان.

(٢) د. فەرهاد پیرباڵ: مەلا مەحموودی بایەزیدی ١٧٩٩ - ١٨٦٧ یەکەمین چیرۆکنووس و پەخشاننووسی کورد، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، ژمارە ٢٨١، ساڵی ٢٠٠٠، هەولێر، ل: ١٧١ - ١٧٢.

بایەزیدی ۱۷۹۹ - ۱۸٦۷) دەبێتە یەکەم چیرۆک - پەخشاننووسی کورد، ئەویش لە ڕێی ئەو چیرۆکانەی کە مەلا مەحموود بەپەخشان نەک بەشیعر تۆماری کردوون.[۱]

ئەو ڕایەی سەروتری ئێمەیش لەوەوەیە کە ئاینده و داهاتوو تا دێت شتی تازەیان پێیە و سەبارەت پەخشان و چیرۆکی کوردی، مێژووەکەی زۆر ڕۆ دەچێتە قوولایی مێژووەوە.

هەرچەندە پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار لەم بارەیەوە ڕایەکی جیاوازی هەیە و ئەوەی لە دانیشتنێکدا بۆ روون کردمەوە کە: مەسەلەی ئەو پێشینانەی چیرۆکی کوردییە (مەلا مەحموود و فوئاد تەمو و ئەوانی دی) بۆیە نابنە بنەما و دەسپێکی ئەم ژانرە چونکە بەدوایاندا بەرهەم نەهات و نەبووە خوویەک و نووسەران لەسەر هەمان شێواز بەرهەم بدەن، هەر ئەو هەوڵدانانە -محاولات- بوون و تەواو.[۲]

بەڵام دەبێ لە بەرامبەر ئەم بۆچوونەدا ئەوە بوترێ کە: بەپێی بار و زروفی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە، هەر ئەوە بووە کە کراوە، ئەو کارانەش وەک هەموو سەرەتایەک نابێ داببڕێن لەوانەی بەدوایاندا هاتن، کە ئێمە بەدوای نموونەی چیرۆکدا بگەڕێین لە مێژووی ئەدەبەکەماندا، لەوانە زیاتر چنگ ناکەون، ئەوانی دوایی درێژبوونەوەیەکی دەسپێکەکەی ئەو پێشەنگانەن کە بەحوکمی بەرەو پێشەوەچوونی باری ڕۆشنبیری و هێنانی کەرەستەی نووسینی خێرا -چاپخانە- ئیدی شێوازە نووسینەکە یا ئەو ژانرە کەم کەم زیاتر و سفتتر خۆی دەخستە ڕوو و سوودیشی لە تەجرەبەی گەلانی تریش وەردەگرت.

ئەوەندە هەیە، وەک مامۆستا د. مارف خەزنەدار دەڵێ: «لە چارەکی دوایی سەدەی نۆزدەمیشەوە پەخشان بایەخێکی ئەوتۆی نەبووە لە ئەدەبدا، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی نەتەوایەتی ڕێنیسانسی کولتووری دەستی پێ کردووە، هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا ڕۆژنامەی کوردی پەیدا ببێ، ڕۆژنامەی کوردستان ۱۸۹۸ لە قاهیرە»[۳] تا ڕۆژگارەکە بەرەو پێش دەهات دەسکەوتەکانی وێژەی کورد لە پەخشان و دانانی بناغەی ئەم شێوە نووسینەش زیاتر لەو زەمینەیەیدا سەری دەردەهێنا، هەتا کە چاپ و چاپخانە گەیشتە کوردستان، ئیدی بابەتەکە برەوی سەند و بووە بەشێکی سەرەکی لە هونەری نووسین و ئەدەبیاتی کوردی.

لە بیستەکانی چەرخی ڕابردویشەوە هونەری پەخشان تان و پۆی لێ بۆوە، دەستی بەخۆیدا هێنا و نووسەران هەوڵی ئەوەیان دەدا لە ڕێی ئەو جوانکاریانەوە مەبەست و مەرامەکانیان بچەسپێننە دڵەوە و کاریگەرتربێ... بەتایبەت کە ئەم هونەرە تازەیە دەستی دایە ململانێکردن لەگەڵ شیعری شاعیراندا.

ساڵانی بیستی چەرخی بیست کۆتایی نەهات کە (چەندانێ) لە نووسەرانی ئەم بابەتە بەدیارکەوتن و ناویان لە دنیای نووسینی وتاردا کەوتە سەر زاری خوێنەران، دیارە سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەری کوردی و

---

(۱) هەمان سەرچاوە: ل ۱٦۷.

(۲) لە دانیشتنێکدا شەوی ۲۸/۲۹-۱۰-۲۰۰۲ لە ماڵی خۆیان.

(۳) باسکار - گ: ژ (۱) هاوینی ۱۹۹۸ لەندەن، پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار، پەخشانی هونەری کوردی ۱۹٤٥ - ۱۹٦۱، ل: ۷۳.

دەرچوونی (هەر لە قاهیرە و ئەستەمۆڵ و بەغدا و ورمێ و سلێمانی و شام و ڕەواندزەوە) وای کرد کە بەرە بەرە لقەکانی پەخشان لێک جوێ بینەوە و هەریەک تایبەتمەندی خۆی بگرێتە ئامێز، ئەوەی مەبەستی ئێمەشە پەخشانی هونەریی کوردییە.

کەم نین ئەوانەی لە باشووری کوردستاندا خوویان دایە ئەم لایەنەی ئەدەبی نەتەوەکەیان، بابەتەکانیان لە شێوەی پارچەی هونەریدا بووایە یان چیرۆک یا وتا، بڵاو دەکردەوە، کتێب چاپکردن هێجگار کەم بوو، لە توانادا نەبوو، مەگەر و تاک و تەرا لێرە و لەوێ: «دیوانی مەحوی، چیرۆکی پێغەمبەران، حاجی قادری کۆیی، گۆرانی کورد... هتد) بەپەنجەکانی دەست دەژمێرران. لەو نووسەرە پێشینانەش: (م. نوری، زێوەر، ع. و. نوری، عەلی عیرفان، سائیب زادە جەمیل، ئەحمەد موختار، مەحموود جەودەت... هتد) لە سلێمانی، (حوسێن حوزنی، لاوێکی کورد، حەسەن کوردستانی) لە هەولێر، (جەلادەت و کامەران بەدرخان، مستەفا بۆتی، عوسمان سەبری، قەدری جان و جەمیل حاجۆ) لە شام و باکووری کوردستان.

## شاکر فەتاح.. داهێنان

لە دوا ساڵەکانی بیستەوە، مامۆستا شاکیر فەتاح قەڵەمەکەی دەخاتە کار و دەست بەنووسینی وتار و پەخشانی هونەریی و چیرۆک دەکات، هەر لەو کاتە زووەشەوە خولیای ئەوە دەبێ کە (بەکوردییەکی پەتی و ڕەوان و دوور لە وشەی بێگانە) بنووسێ و بڵاوکاتەوە. یەکەم بابەتێکی کە من دیبێتم چیرۆکێکی هونەریی کورتی مەجازییە بەناوی (هاواری وەتەنە خۆشەویستەکەمان)، لە (ژیان) ساڵی ١٩٢٧ بڵاوکراوەتەوە.

(لەو ساڵانەدا – چلەکان ا. ب. تا پلەیێکی بەرز بابەتی تر لە پەخشانی کوردا پەیدا بوو، بابەتی پەخشانی بچووک و کورت کە دەشێ ناوبنرێ چیرۆکی مەجازی allegory لە ئەدەبی کوریدا، ئەم هونەرە پەخشانییە پێوەندی بەفۆلکلۆرەوە هەیە، ئەم جۆرە بەرهەمە تازەیە زوو لەناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە، بەشەوقەوە خوێنەری کوردی وەری دەگرت، لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین هەڵوێستی خوێنەر و خوێندەواری کورد بۆ پێشوازی ئەم جۆرە نووسینە تازەیە بەپێچەوانەی پێشوازی کردنی شیعری تازە بوو. لە شیعری تازەدا هەڵوێستی خوێنەر سارد بوو، ماوەیێکی پێویست بوو تا گوێی بەکێش و قافیە و ڕیتمی تازە ڕابێ، کەچی بۆ چیرۆکی ئەلیگۆری پێشوازییەکە گەرم بوو).[1]

د. مارف باس لەو دیاردەیە دەکات، لە کۆتایی سییەکان و سەرەتای چلەکاندا، بەڵام لەلای مامۆستا لە کۆتایی بیستەکانەوە دەستی دابوویە و بابەتی پێ بڵاودەکردەوە، لێرەوە بەردەوام دەست دەداتە نووسین (کۆمەڵایەتی، سیاسی، زانستی، ئەدەبی)، جگە لە گرتنەبەری ڕێبازێکی تازە و دەگمەن بۆ ئەو ڕۆژگارە:

نووسینەوەی (یادنامە – مذکرات)ەکانی کە ساڵ لە دوای ساڵ نووسیونی و بەسەرهاتی خۆی و کۆمەڵی کوردەواری و شارەکەی -بەپێی دەرفەت- تیا تۆمارکردوون، لە شەشی سەرەتایی دەبێ کە دەست دەداتە نووسینەوەی (گەشتنامە)، ئەمە لەو سەردەمەدا، لەناو نووسەر و پیاوانی قەڵەم و کۆمەڵایەتی

---

(١) باسکار – گ: ژ (١) هاوینی ١٩٩٨ – ل٧٨.

کورددا زۆر دەگمەن بووە، ئەو سەفەرانەی کە بۆ ناوچە جیاجیاکانی دەوروبەری سلێمانی دەیکردن (شارباژێر، پێنجوین، هەورامان و هەڵەبجە، سرۆچک، لوبنان، شام و ئاکرێ)...

ئەم جۆرە لە نووسین کە لەناو عەرەبەکاندا (أدب الرحلات)ی پێ دەبێژرێ، بایەخێکی گەلێ تایبەتی و بەپرشتی خۆی هەیە؛ لە رووی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەتنیەوە، گەلێ لەو لایەنانە کە نادیارن دەیانپارێزێ و باسیان دەکات. هەر بۆیە (د. کەمال مەزهەر) دەربارەی نووسینەکانی دەڵێ: «... ناوی ئەو بەرهەمانەشمان تۆمار کردووە کە لەوانەیە تەنها بەشێکیان باسی مێژوو بکات، یا وەک سەرچاوەی مێژوویی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و هی تر بایەخیان بۆ کاری مێژوونووس هەبێ، وەک بەرهەمی بەپێتی مامۆستا شاکر فەتاح).[1]

جا لە رووی بایەخ و ئەو دوو جۆرە نووسینەوە (یادنامە، گەشتنامە)، دەتوانم بیانخەمە ڕیزی گەشتنامەکانی: ئەولیاچەلەبی، سۆن، نۆئێل و ئەدمۆندس، کە لە دوای ئەم زانای گەورە، بەهەشتی، عەلائەدین سەججادی بە ٢٥-٣٠ ساڵێک دەستی دایە تۆمارکردنی گەشتنامەیەکی و چاپی کرد: (گەشتێ لە کوردستاندا).

کە ئەو بەرهەمانە دەبینی، ئاواتەخواز دەبێ کە: کاشکای نووسەران و گەورە پیاوانمان هەریەک لە ئاستی خۆیەوە (نیوەی) ئەوەی مامۆستا کردوویە بیانکردبا و ئەو هەموو تۆمار و دیکۆمێنت و بەڵگەنامە بەنرخانە لەم پەناو لەو کەلاوە و لەو حوجرە و قسنانەدا نەڕزینایە و نەپوانایە، تا زۆر لایەنی شاراوەی مێژووەکەمان ئێستا لە (موعەمما!!)دا نەمانایەوە و تا هەر کەس بەئارەزووی خۆی و بۆچوونی تایبەتی، ئەمڕۆ، لێکیان نەداتەوە و ڕایان گەیەنێ.

پەخشانی هونەریی لەلای مامۆستا لایەنێکی سەرەکی نووسینەکانیتی، بایەخ و گرنگی پێداوە و بەدرێژایی تەمەنی دەیان پارچەی جوان و بەرزی لەسەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامە و کتێبەکانی خۆیشیدا خستۆتە بەر دیدی خوێنەران... بەجۆرێک ئەمڕۆ وای لێهاتووە کە ئەگەر باس لەم ڕووکارەوە بکرێ و ناوی (شاکر فەتاح) نەهێنرێ وەک بنیاتنەر و شۆڕەسوارێکی ئەو مەیدانە، بێگومان و بەتەئکید باس و لێکۆڵینەوەکە نابووت و ناتەواو دەردەچێ.

ئەمە ڕاستییەکە خۆی دەسەپێنێ و وەک ڕۆژ دیارە، هەر بۆ زانیاری دەربارەی ئەم بەرهەمە، نامەی ماجستێری برایەکم کەوتە بەردەست کە لە کۆتایی هەشتاکاندا پێشکەشی کردبوو (ئەو کاتە شاکر فەتاح گەیشتبووە پلەی شەهادەت)، ئەو برایە لە باسی چیرۆک و پەخشان و وتار و... هتد هەرچەندە دەیهێنێ و دەیبا ناوی ئەو ناهێنێ، دەیبوێرێ، سا لەبەر ئامۆژگاری لیژنەکە بێ یا لە ترسی ڕژێمی ئەوکاتە، ناوی کەسانی وا دەبات کە بەیەک دوو بەرهەم ناویان چۆتە ناو ناوانەوە، دوایی ناچار ناوی بەرهەمەکانی دەبا، بۆ نموونە: (خاوەنی شەبەنگەبەڕۆژ، نووسەری پرشنگ)، دواجار ئەو (ڕاستییە) هەر خۆی دەسەپێنێ و لە یەک دوو جێگا ناوی هەر دەهێنێ!!

---

(١) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو، چاپخانەی (دار آفاق عربیه)، بەغدا ١٩٨٣، ل: ٢٥٧

ئەمە بەلامەوە نیشانەی مەزنی و گەورەیی ئەو پیاوەیە، نیشانەی ئەوەیە کە ئەپارتمان و تەلارێک لە بناغەکەیەوە دەست پێ دەکات... ڕاستییەکی سادە و بەرچاو. چیرۆک وەک ڕەگەزێکی تری ئەدەبی لەلای ئەو خۆی نواندووە و مامۆستا بۆتە نووسەرێکی بەتوانا و دیاری ئەم مەیدانە، زیاتر لە هاوەڵانی ئاگاداریی لە تەجرەبە و ڕەوتی چیرۆک و چیرۆکنووسینی عەرەبی و بیانی بووە، بەحوکمی ئەوەی کە هەر لە پلەی ئامادەییەوە چۆتە بەغدا و ساڵێکیش ۱۹۳۱-۱۹۳۲ چۆتە لوبنان بۆ خوێندنی زمانی ئینگلیزی لە پەیانگەی (برومانا).

هەر لێرە خەیاڵی فراوان و بەپێزی خۆی دەخاتە کار، بەخوێندنەوەی چیرۆکە ئینگلیزییە بیانییەکان... بەهرەی خۆی زاخاو دەداتەوە.

خوێندنەوەی یادداشتەکانی ئەو ساڵەی دەری دەخات کە چ کۆششێکی کردووە لەو ڕێیەدا. هەر لێرە دەبێ کە یەکێ لە دەستپێشخەرییە دەگمەنەکانی دەخاتەڕوو؛ نووسینی چیرۆکی خەیاڵی زانستی و پێشبینی کردنێکی ڕاستی ژیانی کوردەواری لە ئایندەیەکی دووردا (نێوان ۱۹۵۰ - ۲۰۰۰).

بەمە شاکر فەتاح بەداهێنەر و پێشەنگی ئەم جۆرە نووسینە لە چیرۆکی کوردیدا دەژمێررێ، هەرچەندە تا ئێستا لە یەک دوو چیرۆک و چەندێکی وەرگێڕاو زیاتر چیدی شک نابەین، چونکە نووسینێ لەو جۆرە خۆخستنە ئەو بوارەوە سەلیقە و زانیاریی و زانینێکی فرەوان و هەمە جۆری پێویستە.

گومانیش لەوەدا نییە کە مامۆستا و چەندانی تر لە چیرۆکنووسانی هاوزەمانی کە لە دوای سییەکانەوە دەرکەوتن، بەهەر شێوەیەبێ سوودیان لە چیرۆکنووسانی قوتابخانەی ئەدەبی و نووسینی شام وەرگرتووە، (نووسەرانی گۆڤاری هاوار و ڕوناهی و ڕۆژانوو) کە بوونە هاندەر و پاڵنەر بۆ ئەمان، ئەخاسما لە ڕووی شێوە و چۆنێتی داڕشتنی بابەتەکانیانەوە.

بۆ ئەمە زۆر لەگەڵ ڕایەکەی د. فەرهاد پیرباڵ دام، کە لەو خاڵانەی دەستنیشانیان دەکات بۆ خاسیەت و دیاردە پێشکەوتووەکانی چیرۆکی کوردی لە نێوان ۱۹۳۲ - ۱۹۳۵، یەکیان ئەمەیە کە: (ئەم چیرۆکە بلاوکراوانەی گۆڤاری هاوار کاریگەرێتییەکی بەزەبریان هەبووە بەسەر نووسەرە گەنجە کوردەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی عێراق، لەوانە: شاکر فەتاح، حوسێن حوزنی، برایم ئەحمەد، عەلائەدین سەججادی، واتە بەسەر بوێژانەوە و پەرەسەندنی چیرۆکی هونەریی کوردی لە کوردستانی عێراقدا لە ماوەی ۱۹۳۹ - ۱۹٤۹...)[1] چونکە ئەگەر بڕوانرێتە گۆڤاری (هاوار) و ئەوانی دی، وە لە ئاستی ئەو چیرۆکانەی کە تیادا بلاوکراونەتەوە، وە ئەوانەش کە لە فەرەنسییەوە یا ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون، ئەو کاتە ئاستی پێشکەوتنی ئەو کارانە دەردەکەوێ، گومانیش نییە کە کاریگەریی بۆ سەر قەڵەمەکانی لای خۆمان بووبێ، چونکە ئەمانە لەوانە دانەبڕاون و هەر لەم کتێبەدا و لە پەخشانەکاندا نموونەی نووسینی مامۆستای تێدایە کە بۆ هاواری ناردووە و بلاویش کراوەتەوە.

لەم پێوەلکان (تواصل)ە ڕۆشنبیری و ئەدەبییەی مامۆستاوە بەبزووتنەوەی ڕووناکبیری و ئەدەبی

---

(۱) مامۆستای کورد - گ: ژ (۱۱.۱۲)... ل ۱۹.

دەوروبەر، وای کردووە کە ببێتە کەسایەتییەکی دیار و بەتوانا لە بنچینە دانانی گەلێ لە بابەتە وەیا رەگەزە ئەدەبییە کوردییەکاندا.

د. مارف لەم ڕووەوە دەڵێ: «شاکر فەتاح یەکێکە لە نووسەرە بەراییەکان کە پەخشانی بۆ نووسینی کوردی هەڵبژاردووە، بەمە بووە بەیەکێک لە دامەزرێنەرانی چیرۆک لە ئەدەبی کوردیدا. نووسەرێکی دیار و کەسێکی بەدیەنی کۆمەڵی کوردە). [1]

داهێنانەکانی لە بوارە جیاجیاکاندا ڕاستەوخۆ کاریگەریان هەبووە بۆ سەر لاوانی ئەو سەردەمە، چونکە لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکانیدا دەیویست وەک چاکەخواز و دڵسۆزێکی دوور لە توندوتیژی و زەبروزەنگی ڕۆژانە، ئەو چاکسازیانە بەرپا کات، لە کۆمەڵەکەیدا، بەمەش نموونەیەکی بەرجەستەی: تۆلستۆی و گاندی و ڕۆمان ڕۆلان و چەندانی تری چاکەخوازی بێ وەین.

(کەسێکی دیاری ناو کۆمەڵ و ڕۆشنبیرێکی هێمن و لەسەرخۆی دوور لە هەڵە پاچی و بزێوی بووە، ئەمەش لە سەرەتای سییەکانەوە دەست پێ دەکا، ئەم کۆمەڵە داهێنانە بەرزەی کارێکی گەورەی کردە سەر لاو و پێگەیشتووانی ئەو سەردەمە و دەورێکی بالای هەبوو لە پەروەردەکردنی نەوەی ئەو ڕۆژگارە بەشێوەییێک چێژ لە جوانی ژیان و سروشت وەربگرن). [2]

هەر ئەم سەرەتای (لاعنف)ە بووە کە شاکر فەتاحی دوورەپەرێز گرتبوو لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵ و حزبێ کە سیاسەت بکات، لە ژیانیدا (جارێک) تەکانێکی داوە بۆ بەشداربوون لە کۆمەڵەیەکدا لە بەغدا، ئەویش تەنیا لەبەر گەیاندنی مەرام و مەبەستی خۆی[3] و زیاتر بڵاوکردنەوەی بابەتە ئەدەبی و کۆمەلایەتییەکانی بەفراوانترین و ئاسنترین شێوە.

دیارە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە مامۆستا کەسایەتییەکی دوورەپەرێز و گۆشەگیر و تەریک بووە، پەیوەندی و دۆستایەتی بەهێز و پتەوی لەگەڵ هاوچەرخانی خۆی و کەسایەتییە نیشتمانپەروەرەکاندا هەبووە، لایەنی سیاسی دڵسۆز و ڕاست و تێکۆشەری لە پێناوی مافی ڕەوای نەتەوەکەیدا هەمیشە خۆشویستووە و بگرە نزیک بووە لێیان و هاوکاریشی کردوون... بەڵام لەو ئەندازەیەی کە خۆی بڕوای بووە (لاعنف). وتمان تەنیا بەشدارییەک و تەقەللایەک کە مامۆستا داویە بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی کوردی لە بەغدا، تەنیا ئەمەیە کە د. کەمال مەزهەری مێژوونووس دەیخاتە ڕوو: «لاپەڕەیەکی ون لە خەباتی دەستەی ڕووناکبیری کوردی عێراق -یانەی سمکۆی شوکاک-.

لە کۆتایی بیستەکانەوە بەشێک لە ڕووناکبیرە تێگەیشتووەکانی عێراق هاتبوونە سەر ئەو بیرەی کە ئەوانیش وەک ئەوروپاییەکان دەتوانن لە ڕێگەی یانە و دەستەی ڕووناکبیری تایبەتییەوە ڕۆڵی خۆیان لە وریاکردنەوەی خەڵکدا ببینن.

---

(١) باسکار - گ: ژ (١)... ل ٨٣.

(٢) هەمان سەرچاوە: ل ٨٤.

(٣) دیارە مەبەست لەمە: مەرام و مەبەستی لە ناوەڕۆکی وتار و نووسینەکانێتی.

سەرەتای ساڵی ۱۹۳۲ یانەی (جماعە الأهالی) دروست بوو... لە ۲٤ تشرینی یەکەمی ۱۹۳٤ (نادی القلم) لە بەغدا دامەزرێنرا، شاعیری گەورەی عەرەبی بەڕەگەز کورد جەمیل سدقی زەهاوی بەیەکەم سەرۆکی هەڵبژێررا.

شوباتی ساڵی ۱۹۳٥ دەستەیە ڕووناکبیری نەتەوەپەرست وەک: د. سائیب شەوکەت، فەهمی سەعید، دەروێش مقدادی و د. خالید هاشمی. داوای دامەزراندنی (یانەیەکی ڕووناکبیری وەرزشی)یان کرد و ناوی (المثنی بن حارثة الشیبانی)یان بۆ هەڵبژارد.

پاش چەند مانگێک وەزارەتی ناوخۆ ئەو داوایەی پەسەند کرد و یانە بەگوڕجوگۆڵی هاتە مەیدانەوە. یانەی المثنی نەک هەر هیچ ئاوڕێکی دۆستانەی لە کورد نەدایەوە بەڵکو زۆربەی ڕابەرانی بەرامبەر بەکورد تەواو شۆڤێنی و کورد نەویست بوون.

... بیری حەوت کەس لەو قوتابییە کوردانەی لە بەغدا دەیانخوێند دێتە سەر ئەوەی کە دەبێت ئەوانیش یانەیەکی ڕووناکبیری سەربەخۆ بۆ کورد دابمەزرێنن. ئەوانە: ئیبراهیم ئەحمەد، فازیل تاڵەبانی، عارف تاڵەبانی، شاکر فەتاح و بەهادین عارف کە هەر پێنجیانی قوتابی کۆلێجی یاسا بوون و عەبدولڕەحمان عەبدوڵلا کە قوتابی کۆلێجی پزیشکی بوو لەگەڵ شێخ ڕەئووفی شێخ مەحموود کە لە فێرگەی ئەمریکی لە بەغدا دەیخوێند... بڕیار دەدەن ئەو یانەیەی دەیانەوێ دایمەزرێنن ناوی لێ بنێن (سمکۆی شوکاک) کە برینی کوشتنی بەغەدر لەلایەن ڕەزا شاوە هێشتا لە ناخی دەروونیاندا ساڕێژ نەبووبوو... ڕۆژی ٤ مارتی ساڵی ۱۹۳٥ بەئیمزای هەر حەوتیان داوایەکی ڕەسمیان پێشکەش بەوەزیری کاروباری ناوخۆ کرد کە ئەوسا (عەبدولعەزیز قەساب) بوو... داواکەیان لە شەش خاڵی سەرەکی پێکهاتبوو. خاڵی سێیەم دەڵێت: «مەبەستەکانی یانە بریتین لە بڵاوکردنەوەی ڕووناکبیری نەتەوەیی کورد و بووژاندنەوەی گیانی وەرزشی لەنێو لاوانی کوردا و کۆشش بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕەوشت و ژیانی کۆمەڵایەتی و زانست لە کوردستان بەتایبەتی و لە عێراق بەگشتی».

بەڵام لە ئەنجامدا وەزارەتی کاروباری ناوخۆ ڕێگای دامەزراندنی ئەو یانەیەی نەدا. د. کەمال زیاتر دەڵێ: «ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری یانەکە بۆ خۆشیان دونیایان لێ هاتبووە یەک؛ ئەگەر هات و میری ڕێگەی دا ئەو ساکە دەبێ ئەوانی بێ دەرامەت کارەکە چۆن مەیسەر بکەن، تایبەت کە پارەدارانی کوردیش ئەو ساکە هەموویان پولپەرستی بێ هەست و هۆشی نەتەوەیی بوون».

***

لەم پێشەکیە چروپڕەدا، ئەوەی دەمێنێتەوە لایەنەکانی نووسینی شاکر فەتاح کە لەم کتێبی دووەمەدا بەپێی بابەت جیامان کردوونەتەوە:

۱- زمان و فەرهەنگ

۲- چیرۆک و پەخشان

۳- شیعر

٤- ئەدەبی منالان

٥- لێکۆڵینەوەکان

بۆ هەریەک لەمانەش کورتە پێشەکییەکی شیاو بەبابەتەکەمان نووسیوە، ناوە ناوەش باری سەرنج و بۆچوون و روونکردنەمان لە دوو توێی باسەکانیشدا لە پەراوێزدا نووسیوە.

ئاستەنگێکی دیار کە هاتە رێگای ئامادەکردنی ئەم کتێبی دووەمە ئەوەبوو کە زۆر جار بابەتێکمان لە زیاتر لە سێ گۆڤار و رۆژنامە و کتێبدا چاو پێ دەکەوت کە لە سێ یا چوار قۆناغی جیاوازدا بڵاوی کردۆتەوە، جاری واش هەیە دەستکاریشی کردووە (بەزیادکردن یا کورتکردنەوەی).

لە حاڵەتێکی ئاوهادا، ناچار هێناومانە لەو شوێنەی بەشیاومان زانیوە هێشتوومانەتەوە و بەپەراوێزیش ئاماژەمان کردووە بۆ ئەو گۆڤارە، یا رۆژنامەیە، یا کتێبەکەی تیادا بڵاوکراوەتەوە.[1]

بۆیە بابەتی وا هەیە، بۆ نموونە، لە (پرشنگ، شەبەنگە بەرۆژ، هاواری رۆشنبیران، زێوەر، بێکەس...) کە تەنیا ناونیشانەکەیان هێشتۆتەوە، لامانداوە، بەڵام لە پەراوێزدا هۆکەیان نووسیوە.

لە زنجیرەی ئەو باس و لێکۆڵینەوانەشی کە لە چوارچێوەی (پرۆژەی خوێندەواری کورد) نووسیونی و لیستی بۆ کردوون، ئەو باسەمان لە دوو شوێنی جیاوازدا کەوتە بەردەست: (دەسنووسێکی شاکر فەتاحی شەهید) کە کاتی خۆی مامۆستا فەلەکەدین کاکەیی و مەحموود زامدار ساغیان کردۆتەوە و وەزارەتی رۆشنبیری چاپی کردووە. هەروا (گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٣ و ١٠٤ی ساڵی ١٩٨٤). لە بەراوردکردنی ئەو دوو سەرچاوەیەدا جیاوازی لە ناوی وتار و کتێبەکانیدا هەبوو، بەروار و ژمارەی ئەو گۆڤار و رۆژنامانەی تیایدا بڵاوکردوونەوە، یان کتێبە بەرچڤەکراوەکانی، یا ئەو وتارانەی لە ئێزگەی رادیۆی بەغدا داونی، کە دووبارەکردنەوەی زۆربانی تێدایە؛ چونکە زۆریان دووبارەکردنەوەی وتار و پەخشانەکانی خۆین کە لەوەبەر بڵاوی کردوونەوە و لەوێدا بەکورتکراوەیی خوێندوونیەوە.

جا دەربارەی ئەو پرۆژەیە وا چاک بوو کە دەقاودەق نووسینەکەی خۆی دانێینەوە (دوای بەراورد و رێکخستنیان).

لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونە ئەدەبییەکانی مامۆستاش جێگایەکی بەنرخیان هەیە لەناو بەرهەمەکانیدا؛ مێژووی گۆرانی ئینتیباهـ (دلاوەران) کە چەندانێکی زۆر بووە مایەی لێکدانەوە و راوبۆچوون دەربڕین لە نێوان دەستەیە لە نووسەرانی گەورە و ناوداری کوردی باشوور، مێژووی کۆمەڵەی زانستی کوردان، کە مامۆستا خۆی ئەندامێکی چالاکی ئەو کۆمەڵە رۆشنبیری و زانستییە بووە. هەڵسەنگاندنی

---

(١) بۆ زیاتر بڕوانە: (د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، ٢٠٠١، ئامادەکردنی عەبدوڵڵا زەنگەنە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە هەولێر. ل ٣٣١ - ٣٤٤).

لە ئەسڵدا ئەم وتارە لە (رۆشنبیری نوێ، گۆڤار: ژ (١٤٣) ساڵی ١٩٩٩ لە ل ٧-١٢دا بڵاوکراوەتەوە، دەزگەی رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی - بەغدا). بڵاوکراوەتەوە.

یادداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی، ڕەخنە و لەسەر نووسینێک دەربارەی نامیلکەکەی مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم: (هەندێ لای ئەو دیوەکەی بیری قانیع/١٩٧٢) کە لە ڕاستیدا تەنیا وەک بەرهەمێکی مامۆستا لە بواری ڕەخنەی ئەدەبی و فیکریدا حەزمان بەبلاوکردنەوەی کرد، نەک تازەکردنەوەی ئەو مشتومڕانەی کە ماوەیان بەسەردا چووە و بۆ ئەمڕۆکە کەڵکێکی ئەوتۆیان نەماوە.

ئەمانە هەمووی بابەتی بەرز و بەنرخن لە ڕێڕەوەکەی مامۆستادا دەهێنن کە نەفەوتێن، بۆیە لە دووتوێی ئەم کتێبەدا داماننان.

کتێبی (ئاکرێ) کە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی چڕوپڕی فرەلایەنی ژیانی ئەو دەڤەرەیە کە شوێن و جێگایەکی پڕ بایەخ و مەترسیداری بووە لە قۆناغە مێژووییەکانی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورددا، بەتایبەت لە دەستپێکی چەرخی بیستەوە: بزووتنەوە و ڕاپەڕینەکەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی ١٨٧٩ ــ ١٩١٤-١٢-١/٢ و شۆڕشی شێخ ئەحمەدی بارزانی و ١٩٢٧ - ١٩٣٢ و بارزانیی ئەمر (یەکەم و دووەم ١٩٣٣ - ١٩٤٥)، وە بەحوکمی ئەوەی مامۆستا خۆی دەسەڵاتدار و سەرۆکی یەکە ئیدارییەکە بووە زۆر باش توانیویە زانیارییە فرەلایەن و هەمە چەشنەکان دەستخات و تۆماریان کا، بەتایبەت ئەگەر ئەوە بزانین کە شاکر فەتاح لە دوو سەردەمی جیاوازدا بۆتە قایمقامی ئەو دەڤەرە و لە ئەنجامی دڵسۆزی و خزمەتگوزاریی خۆیدا بۆ ئەتەوە و خەڵکی دەڤەرەکە، دانیشتووانەکە گەلێ ڕێز و خۆشەویستیان بەرامبەری بووە و لە ڕێنمایی و دەسگرتنی لە بەڕێوەبردنەکەیدا دریغیان نەکردووە، چونکە ئەویش هەر هەلێکی بۆ ڕەخسابێ لە دەستی نەداوە بۆ خزمەتکردنی قەزاکەیان... مامۆستا کەریم شارەزا بۆی گێڕامەوە[1]:

«سەرۆکی لقی هەولێری یەکێتی نووسەران بووم، مامۆستا ئێوارەیەک سەردانی کردین، لەگەڵ یەک دوو برادەری خەڵکی دەڤەری بادینان باسی خوێندنی کوردیمان دەکرد لەو ناوچانە. مامۆستاش گوتی: کە قایمقامی ئاکرێ بووم، ڕۆژێکیان نوری سەعیدی سەرەک وەزیرانی عێراق هات بۆ ئاکرێ، دەیویست باری ژیان و کاروباری قەزاکە بەچاو ببینێ، دەعوەتێکی باشم بۆ کرد کە لە ئاستی یەکێکی وەک ئەودابێ، لە گەڕانەوەیدا سەرو بیست دیناری بۆ کارگوزارەکان دانابوو، بۆ ئەرک و ماندووبوونیان، ئەوانیش هاتن پرسیان بەمن کرد، کە ئایا ئەو پارەیە وەرگرن یان نا؟. وتم: وەری مەگرن، خۆم دەتاندەمێ.

نوری پاشا پرسی: بۆ نایەڵی وەری گرن؟ ئەوە بەخشیشە و هەر بووە، ئەوانە ماندووبوون. پێم وت: پاشا، من لە جیاتی ئەمە داواکاریم هەیە دەمەوێ بۆمان جێبەجێ بکەیت. وتی: فەرموو. وتم: دەمەوێ ڕێگەی ئاکرێ - موسڵ قیرتاو بکەن و ئێرەش قەزایەکی کوردییە دەمانەوێ خوێندن لە قوتابخانەکاندا بەزمانی کوردی بێت.

نوری سەعید گورج وتی: هەر ئێستا ئەو داخوازییەی دووەمت جێبەجێ بکە، یاسای زمانە ناوخۆییەکانت لەبەر دەستدایە لە ١٩٣١ەوە، لە هەر کوێیەک کورد زۆرینەن با بەکوردی بخوێنن.

---

(١) مامۆستا کەریم شارەزا: هەولێر لە ٢٠٠٢/٨/٢٦.

ماموستا وتی: بۆسیەی نووسراوێکم دەرکرد بۆ هەموو ئاغا و موختارەکانی گوند و هۆزەکان تا لە قایمقامیەت ئامادەبن. تا پرس و رایان لەم بارەیەوە پێ بکەم. دوای دوو مانگیش بریاری بەغدا هات و دەستکرا بەقیرتاوکردنی رێگاکەی نێوان ئاکرێ و موسڵ».

ئەمە نموونەیەکە لە هەل بەدەستهێنانەکانی ئەو پیاوە بۆ خزمەتکردنی خەڵکەکە، جا بۆیە کتێبەکەیشی ژێدەرێکی بەنرخ و بەهێزی باوەرپێکراوە بۆ هەر یەکێک کە بیەوێ لەو دەڤەرە بکۆڵێتەوە یا توێژینەوەیەکی مەیدانی لەسەر ئەنجام بدات، وەیا بۆ قوتابیانی قۆناغی خوێندنی بالا.

خزمەتەکانی ماموستا ئالێرەدایە، کە بەراستی وێنەی پیاوێکی ئیداری ئاوا لەو شوێنانەی کاری تیا کردووە زۆر کەم و دەگمەنە.

دەمێنێتەوە کتێبی (یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی) کە لە رووی مێژووییەوە نرخ و بەهای لە باسکردن نایە؛ چونکە جگە لەوەی کە نووسەر خۆی وەک کاربەدەستێکی قەزای شێخان لەناو جەرگەی بابەتەکەیدا ژیاوە و لەگەڵ زۆر سەرچاوەی باوەرپێکراودا دوواوە، گەراوەتەوە بۆ زۆر ژێدەری تر لەم رووەوە. دیارە نووسین لەسەر ئێزدیەکان و مێژوو و بەسەرهات و ئەو ئاسۆر و نەهامەتیانەی بەدرێژایی مێژووەوە بەسەریاندا هێنراوە، لەلایەن داگیرکەرانی کورد و ناحەزانیانەوە، بەبیانووی نابەجێ، وە هەوڵدان بۆ دابرینیان لە نەتەوەی کورد... بایەخی کتێبەکە ئالێرەدایە کە ماموستا زۆر بوێرانە چۆتە ناو یەکەیەکەی باسەکانیەوە و بەئەمانەتەوە تۆماری کردوون.

***

هیوادارم بەم کۆششەی ئەمجارەش توانیبێتمان گیانی پاکی ماموستا ئاسودەکەین و ئەرکێکی بچووکیش کە لەسەر شانمانە بەرامبەری بەجێمان هێنابێ.

سوپاس و پێزانینیش بۆ هەموو ئەو ماموستا بەرێزانەی کە هیچ سێ و دوویان نەکرد لە دەستی یارمەتی درێژکردن بۆمان و حەز دەکەین لێرەدا ناوی ئەوانە تۆمارکەین وەک ئەمەکدارییەک بۆیان:

ماموستا خالید محەمەد خاڵ، ماموستا د. مارف خەزنەدار، ماموستا عەلاء نوری بابە عەلی قەرەداغی، ماموستا محەمەد سالح سەعید، ماموستا س. ع. شادمان، ماموستا شێخ محەمەد حاسلی، ماموستا شێخ سدیق مەحموود بەرزنجی، ماموستا کەریم شارەزا، ماموستا کەریم زەند، ماموستا مستەفا سەعید لە کالیفۆرنیاوە و چەند بەرێزی تر کە ناویان نەهێنراوە.

خوای گەورە نموونەیان زۆر کات و تەمەنیان درێژ کات بۆ خزمەتکردنی نەتەوەکەمان.

ئەحمەد

٢٠٠٢/١٠/٢٢

# شاکر فەتتاح لە بواری زماندا

لە ڕووی زمان و زمانەوانییەوە، مامۆستا تەقەللا و کۆششێکی چاکی داوە، هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە خەمی ئەم لایەنەی خواردووە، زانیوویە کە زمان پێناسی گرنگی هەر نەتەوەیەکە، هەروا پێشکەوتنی نەتەوەکەشی بەندە بەڕادەی زانین و ئاگاداربوونییەوە بەزمانە زیندووەکانی تری جیهان.

لەم ڕووەوە لە سەرەتای سییەکاندا، کە هێشتا قوتابی حقوق بووە، فەرهەنگۆکێکی کوردی – ئینگلیزی داناوە، بەشێوەیەکی ساکار و سادە، تا قوتابییانی سەرەتایی و ناوەندی لێی سوودمەند بن و هۆ و مەبەستی خۆیشی لەو پێشەکییەدا ڕوونکردۆتەوە کە بۆ ئەو فەرهەنگۆکەی نووسیوە.

لە سەرەتای شەستەکانیشدا دوو هەوڵی تری داوە؛ بۆ هاندانی فێربوون لەلایەن عەرەبەکانەوە کە کورد وەک نەتەوەیە لە تەکیاندا دەژی و (زمانیش هۆیەکە بۆ لە یەک تەگەیشتن لەیەکتری) چونکە عەرەبەکان زمانی کوردی نازانن و هەروا زۆر کوردیش عەرەبی نازانن.

لە ١٩٦١دا کتێبی (مامۆستا) ئامادە دەکات بۆ چاپ، کە بریتییە لە هەوڵدانێ بۆ فێربوونی هەردوو زمانەکە چ لەلای کورد و چ لای عەرەب، دەڵێ:

«شادمانم بەوەی پێشکەشی شاگردانی هەردوو زیانەکە: عەرەبی و کوردی بکەم، نووسراوەکەم کردووە بەسێ بەش: یەکەم بۆ وشەکان کە لە فەرهەنگێک ئەکات کراوە بە(٢٧) بابەتەوە، هەریەکەی لە کەرەسە و کاروبارێکی ژیان ئەدوێ، وەک ئەندامەکانی لەشی، گیانلەبەران، پەلەوەران، گژوگیا، کەلوپەلی ناو ماڵ، دین، خوێندنگا... تاد. تا شاگردان بتوانن لە کاتی پێویستا بەئاسانی سەیری بکەن. بەشی دووەم: بۆ گفتوگۆ دانراوە لە هەموو کاروبارێکی ژینی هەردوو نەتەوە ئەدوێ. بەشی سێیەم: دانراوە بۆ هەڵبژاردەی وێژەی کۆن و نوێی کوردی و عەرەبی، بەرە، بەرە لە سووکەوە تا گران».

جێی سەرنجە کە کتێبەکە لاپەڕەکانی کراوە بەدوو بەشەوە، چی بەکوردی لە لای ڕاستی نووسراوە، دەقاودەق بەعەرەبی لەو بەری چەپی نووسراوەتەوە.

دیسان لەساڵی ١٩٦٢دا، مامۆستا کتێبێکی تری داناوە هەر بەمەبەستی فێرکردنی زمانی کوردی بۆ عەرەبەکان، بەناوی (خوێندنەوەی نوێ)وە.

وا دیارە ئەو کاتە کە مامۆستا لە بەشی کوردی زانکۆی بەغدا وەک (وانەبێژ)ێک بابەتی خۆی دەوتەوە، لەلایەن دەزگا پەروەردەییەکانەوە ڕووی لێنراوە کە ئەو کارە بکات، چونکە کتێبەکە بۆ پلەی سەرەتایی نییە، بەڵکو بۆ ئەوانەیە کە ئاستی خوێندەواریان بەرزە، لە پێشەکی بابەتەکەیدا، مامۆستا دەڵێ:

«دڵنیاین کە مامۆستا بەڕێزەکان، پێش ئەوەی دەس بکەن بەگوتنەوەی ئەم نووسراوە بەشاگردە

عەرەبەکان، تێ ئەکۆشن بۆ ئەمەی دڵیان بنووسێن بەکورد و کوردستانەوە، بەزبانی کوردییەوە.
وامان بەباش زانی کە دەستووری زبانی کوردی بەجێ بهێڵین بۆ مامۆستاکان، بەشێنەیی هەر جارە تاوێک تەرخان کەن بۆ شارەزاکردنیان لە دەستوورەکە.
سێیەم هەنگاو وا بەباشی ئەزانین تا یەک دوو هەفتە نووسراوەکانی (ئەلف و بێی کوردی) کاک ئیبراهیم ئەمین باڵدار و (بابخوێنین)ی کاک نوری عەلی ئەمین بەشاگردە عەرەبەکان بخوێنن. تا ئاشنا کرێن بەپیتە کوردیەکان بەوشە کوردیەکان بەشێوەی نووسینی کوردی، بەسووکی و ڕەوان و ئاسان».

مامۆستا کتێبەکەی کردووە بە(٢٥) بابەتەوە کە لە هەریەکەیان باسێکی ژیانی کۆمەڵایەتی تێدایە لە شێوەی گفتوگۆکردندا و دوایی (ڕاهێنان) کە کۆمەڵێ پرسیارە لەسەر بابەتەکە، دوای ئەمە وشە قورسەکان و ماناکانیان بەعەرەبی لە بەرامبەریدا.

ئەم دوو کتێبەی مامۆستا لە کتێبخانەکەیدا پارێزراون و لە چوار دەفتەری ٦٠ لاپەڕەیدان و ئامادەی چاپکردنن، بەڵام لەبەر ئەوەی (بۆ ئێستامان) هەردوو بەرهەمەکە کەڵکێکی ئەوتۆی نەماوە، بەچاکمان زانی تەنیا بەڕاگوزارییەکی ئاوا بیخەینە بەرچاو.

ئەوەی جێی بایەخ و شیاوی پێشکەش کردنە، ئەو بابەتی (نرخی وێژەیی- النقد الأدبي) یەیەکە مامۆستا لە ساڵانی ١٩٦٢ هەتا ١٩٦٤ لە زانکۆی بەغدا بەقوتابیانی پۆلی سێ و چواری بەشی کوردی وتووتەوە، بۆیە لە دوو دەفتەری دەسنووسدا لە کتێبخانەکەیدا بەرچاومان کەوت و بۆ دڵنیایی لە هەندێ بابەتی ناویان و جیاکردنەوەیان باشتر خوێندنەوەیان پەنامان بردە دەفتەری یەکێ لە قوتابییەکانی مامۆستا لە ١٩٦٢-١٩٦٣، ئەویش مامۆستا محەممەد سەید عەلی بوو کە بەسوپاسەوە هەردوو دەفتەری ئەو بابەتەی خستە بەردەستمان و سوودێکی چاکمان لێ بینی و دوا بەدوای ئەم پێشەکیە دەیخەینە بەردەست.

مامۆستا وەک شارەزایەک لە زمانەکەدا لە زۆر لەو قۆناغانەی کە لێژنەکانی زمان و دانانی زاراوە و فەرهەنگی لەلایەن دەزگا پەیوەندیدارەکانەوە دامەزراین، بەشداری کردووە و چالاکانە کاری خۆی ئەنجام داوە تیایاندا، بەتایبەت لیژنەی (زاراوەی پارێزگاری سلێمانی) لە ١٩٧٠/٢/٢٢ (بۆ دانانی ئەو وشەو زاراوە کوردیانەی کە بەکارهێنانیان پێویستە لە نووسینی نێوان بەڕێوەبەرێتی و قوتابخانەکان لەلایەک و دەزگاکانی فەرمانڕەواییدا لەلایەکی تر) هەروا (لێژنەی وشە و زاراوە عەرەبییەکان و وەرگێڕانیان بۆ کوردی) لە ١٤/٣/ ١٩٧١.

دیسانەوە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو تەقەللا گەورەیەی مامۆستا لە ١٩٣٤دا داویە بۆ دانانی نامیلکەیەک بەمەبەستی فێرکردنی نووسین بەپیتی لاتینی و دوایی نووسینەوەی چیرۆکی (شۆغالی چەپخون) بەو پیتانە، ئەمە لە دوای بڵاوکردنەوەی کارەکەی مامۆستا تەوفیق وەهبی دێت کە (بۆ فێربوونی نووسین بەلاتینی- خوێندەواری باو) لە ١٩٣٣دا بڵاوی کردەوە، مامۆستا ئەو چیرۆکەی خستۆتە سەر پیتی لاتینی و ئامادەی چاپکردنی کردووە، لە ناو دەسنووسەکانیدا چاومان پێکەوت و

لەگەڵ ئەم بەشەدا وەک خۆی دەیخەینە بەرچاوی خوێنەر، بەڵام سەد داخ کە شێوەی نووسینەوەکەی (بەسەریەکەوەیە) کە ناتوانرێ بەباشی بخوێنرێتەوە.

دیسان بەشداریەکی بەرچاوی مامۆستا لە گۆڕین و دانانی کتێبە تایبەتەکانی بەپرۆگرامی خوێندنی قۆناغە جیاجیاکان لە کوردستاندا و کارکردنی لە لێژنەکان زمانی و زاراوەکانی (بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی) لە بەغدا، بەدرێژایی ئەو ساڵانەی کە ئەو دەزگایە ماوەی کار و بەرهەمی بۆ دەرەخسا.

گەواهی ئەمەش ئەو وتارەیە کە لە ١٩٢٨دا نووسیویە: «خوێندن بەزمانی کوردی» و بۆ ڕۆژنامەی ژینی ناردووە دەربارەی «خوالێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگ کە کاربەدەستی زانست بوو، چووبووە سلێمانی و پێی گوتبوون: خوێندن لە خوێندنگاکاندا بەزمانی عەرەبی بێ چاکترە لە کوردی... جا ئەم وتارەم لە دژی ئەم قسەیە نارد بۆ ڕۆژنامەی ژین بەڵام بڵاوی نەکردەوە.» [1] ... مامۆستا هەر لە سەرەتاوە بەگیان و دڵ بەرۆشی سەرخستن و بووژاندنەوە و پەرەپێدانی زمانی کوردی بووە.

## [illegible]

فەرهەنگۆک[2] «چەند ساڵ لەمەوپێش لە ئەستەمۆڵ تەماشەوە لە (تەرمن)دا هەندێ یادداشتم نووسیبوو کە تاسەی سلێمانی و هیوای خوێندەواران بوو... یەکێکی ئەمەبوو:

به چاومابێ ئەگەر تۆزێ لە تۆزی یاد سلێمانی
کە نوری طورە طوری نایەنی سورمەی سلێمانی

دووەمیشیان ئەمەبوو:

شەماڵ دێنێتە گوێم دەنگی منداڵانی قوتابخانە
نەشیدی میللی یان وەک زەمزەمەی لاهوتی ڕەحمانە
هیوام پێیانە ئەم دەستەی کوڕانە میشەعلێ هەڵکەن
لە تاریکی نەزانینا، بەزانستی، وەتەن دەرکەن

ئێستا وا بەرەبەرە ئەم هیوایەم دێتەدی؛ لاوانمان دەستە دەستە گوڵدەستەی تر (فندە؟) ئەکەنە شاباشی شایی شەوکەتی ئایندەی ئێمە؛ من ڕاستوڕەوان و بێ پەروا وتومە و ئەڵێم: هیچ میللەتێک بەتەقەوڕەقە و تەقەودەو نابێ بەکەس. جەسارەت و فیداکاریشی لە چەنبەری خوێندەواری و تێبینیدا نەبێ فیڕۆیە، بێ هودەیە.

---

(١) بڕوانە: فەلەکەدین کاکەیی و مەحمود زامدار- دەستنووسێکی شاکیر فەتاحی شەهید، وەزارەتی ڕۆشنبیری- هەولێر ١٩٩٨- ل: ١٨ وە ٨٢

(٢) ژیان- ڕۆژنامە: ژ ٣٩٩ لە ٨ مایس ١٩٣٤، ل (١، ٢).

بۆ ئەم فەرهەنگۆکە هیچ شتێ لەو (بەباڵابڕینە)ی پیرەمێردی ئەمر بەباشتر نازانین کە لەکاتی چاپ و بڵاو بوونەوەیدا لە (ژیان) بۆی نووسیوە و دەسخۆشی لێ کردووە.

هەزار سـواری زەرەپۆش ببـینم و دە ئەسـەری عـیلمی: دە ئەسـەرەکـەم لە لا پەسـەندترە، ئەخـوازەڵا یادگارێک کە ئێمە فێری زبانی ئەورووپا بکات.

چونکە ئێستا ڕێوشوێنی فەن و سنعەت کە میللەت دەوڵەمەند ئەکا، هەمووی بەزبانی ڕۆژئاوایە.

ئەمجارە (شاکر فـتاح) کە کوڕێکە جگەرگۆشەی ئەم خاکە و بەڕاستی هەمـوو شـتێکی چاکـە: (فرهنگوک)ی ڕێکخستووە لەسەر شێوەی (ئەحمدی)، لە ئینگلیزیەوە بۆ کوردی، شێوەیێکی جوانە.

لە بیرمە کە لێرە ئەمخوێند هەرچی کتێبێکی فارسی و تورکی بوو، ئەمەندە لۆغەتی ڕەقی عەرەبی تیابوو ئێمە ناچار ئەماین (کنز و قاموس واختری)[1] چی و چی لەبەرمان ئەکرد، بەڵام هیچیان بەقەد (نصاب الصبياني ظهيري فارابي)[2] خۆشتر نەبوو؛ چونکە بەشیعر بوو، بەمەقام لەبەمان ئەکرد. ئەو وەقتە فارسی باوبوو، هەموو ئەمانزانی و نووسین و خوێندنەوەمان فارسی بوو، دوایی کە فارسی باوی کەمبوو، (ئەحمدی) شێخ مارفی نۆدێ کە بۆ کاک ئەحمەدی کردبوو کەوتە برەو. بەڵام لە جیهاندا لە ئەحمەدی بەکارتر نییە. چونکە کوردی ئێستای شاکیریش هەر بەو شێوەیەی ئەحمەدی، ئینگلیزی داناوە.

یاخـوا بەرخـوردار بێ و زۆری تری وایشـمـان بۆ پێ بکا. ئەم فـەرهەنگۆکـە بۆ ڕەهبـەریی فـێربوونی ئینگلیزی زۆر بەکارە.»

-پیرەمێرد-

***

## پێشکەش

بۆ ئەو گیانە پاکانەی بەتەنگ خوێندەواریی منداڵانی وڵاتەکەی خۆیانەوە بوون.

بۆ احمدی خانی، بۆ شێخ مارفی نۆدێ، بۆ طاهر بەگی عثمان پاشای جاف.

بۆ ئەو سەروەرەی فێری (احمدی)ی کردم و کەڵکەڵەی دانانی ئەم فەرهەنگۆکەی خستە سەرمەوە، بۆ باوکم ئەم نامیلکەیەم پیشکەشە.

-ش. ف-

---

(١) (٢) دەربارەی ئەم دوو کـتـێـبـەی پیـرەمـێرد ناوی بردون، زۆر پرسم لە مـامـۆسـتـا ئاینییـە بەڕێزەکـان کـرد، بەتایبەت بەتەمەنەکانیان، خوا تەمەن درێژیان کات. سەرەنجام گەیشتمە ئەوەی کە:

أ- کنز و قـاموس و أختری: هەر کـتـێبـێکە بەفـارسی، ناوەکـەی (کنزی قـاموسی أختری)ە و فـەرهەنگێکی (فارسی- عربی) بووە کاتی خۆی قوتابی ئاینی بەکاری هێناوە و لەبەریان کردووە. دانەرەکەی نازانرێ.

ب- نصاب الصبيان ظهيری فارابی: ئەمەش فەرهەنگێکە بەفارسی:

(نصاب الصبـيـان) لەلایەن (أبو نصر الفـراهی)یەوە دانراوە؛ (فـەراهی) لە پەراوێزدا دەربارەی نووسراوەکە: شـارێکە لە نێـوان (سیـسـتـان و هەرات)دا لە ئەفغـانسـتـان. هەروەک ئەوی پێـشـوو (فـارسی- عـربی)یە، دانەیەکی دەسنووسی فۆتۆکراویم لەلای مامۆستای بەڕێز (نوری فارسی حەمەخان) چاوپێکەوت.

## ئینگلیزیی بۆ چ بخوێنین؟

هیچ حەلێک ڕۆژهەلات ئەوەندەی ئیمڕۆ تێکەلی لەگەلّ ڕۆژئاوادا نەبووە. لە هەر کووچە و پەنایەکەوە سەیر ئەکەی ئەورووپایی و ئەمریکاییێ بەلاتا تێئەپەڕن؛ لە هەر شارێکا لاتەکەیتەوە ئەبینی بەلای کەممەوە دوکانێ یان خانووێکی ڕۆژئاوایی تیایە.

ئەگەر ئەو قسەیەی «ڕۆژ لە بەیداغی ئینگلیز ئاواابێ» کە ئینگلیزەکان پێوەی ئەنازن؛ بیکەین بەئاگاداری قسەکەمان: هیچ گومانی تیا نییە کە تیپرەی ئەنگلۆ سەکسۆن ئیمڕۆ لە هەموو گەلەکانی تری ڕۆژئاوا زووتر لەگەلّ وڵاتی ڕۆژهەلاتدا لەتێکەلی دان؛ ئایا هیچ شارێک ئەبینی ئینگلیزی تیا نەبێ، یان بەشێکی کاروباریان دەستی ئینگلیز نەیگرێ؟ ئەگەر بڵاوبوونەوەی ئینگلیز لە جیهاندا بەم تەرحەبێ؛ بێ درۆ زبانیشیان بەو چەشنە بڵاوبۆتەوە

بۆ چ هیچ کەلوپەلێکی کڕین و فرۆتن هەیە بەم لە جێگاکانی گەشتەوە دروست کرابێ و هێترابێ- ناوونیشانەکەی بەئینگلیزی نەنووسرابێ؟

ئایا لەمڕۆدا لەمپەر و لەوپەری جیهاندا هیچ ئیشتمانێک هەیە لە قوتابخانەکە یا ئینگلیزیی بەمنالەکانی نەخوێنێ؟

بەهەموو توانامەوە ئەلێم: نا!

لە ئێمە بام یەکێ گەشتوگوزارێک بکا؛ بام لە کلاوەی زەمیندا هەچ کەلیکی ئەوی: بچێتە ناوی و هەچ شارێکی ئەوی ڕووی تێ بکا- بێ گومان ئەگەر ئینگلیزیی زانی، هیچ ناخۆشییەکی نایەتە بەر و لە هیچ لایەکادا نامێنی!

چونکو؛ لە زەمیندا: هەر کوچە و کەناریم بێ پشکنی لە هەر کەلێکا سەرنج بدەی: هەر لە پێشکەوتووەکانی ڕۆژ ئاواوە هەتا کێوییەکانی ئەفریقیا و ئوسترالیا؛ بەدەر نییە، ئەبێ چەند کەسێکی ئینگلیز یان چەند کەسێکی ئینگلیزیی زانی تیابێ، لەگەلّتا بدوێن و کاروبارت بۆ ڕێک بخەن.

لە بابەت ڕەنگاوڕەنگ نووسراوە[1] و ڕۆژنامە و گۆڤاری چاک چاک و نایاب و بەکەلکەوە، هیچ درۆی تیا نییە ئینگلیزیی لە هەموو زمانەکانی تری ڕۆژ ئاوا، بڵاوتر، پەلی هاوێشتووە، لە مرۆدا کەم گەلی پێشکەوتوو هەیە لەسەر ئاوازی ژێی تاری شیعرەکانی شکسپیر و بوێژ (شاعر)ە ناودارەکانی کەیان گۆرانی ئەوتبێ؛ کەمیان هەیە لە کانی دلّیاندا، بۆ ئەو جۆرە پیاوانە جێگای بەرز و بلّندیان نەکردبێتەوە.

گەورەبوون و هێز سەندن و بڵاوبوونەوەی زبانی ئینگلیزی بەم ئەندازەیە، بەڕاستی شتێکە سەری لێ سووڕئەمێنی چونکی بەم هێز و تەوانایە کە ئیمڕۆ ئەیبینین، پێش چوارسەد سالّ چرای زمانی ئینگلیزیی

(١) ڕەنگاوڕەنگ نووسراوە: کتب مختلفە، متنوعە.

هینده کـز بووە: نەک ئەمـەش کـە پرشنگ بۆ ولاتانی تر بهـاوێژێ، ئینگلتـەرەشی بەتەواوی ڕووناک نەکردۆتەوە! هێرشی ئادابی لاتینی و فەرانسزیی، زۆربەی تێکەلاوبوونی زبانی تیرەکانی گۆی دەریای ژووروو بەم زمانە، ئەمەندە بەهێز بووە، بەرتی زبانی ئینگلیزی نەداوە بەرکەوی و دەرکەوی و سەرکەوی!

لەبەر ئەمەیە کە ئەبینین ئینگلیزی بەو هەمـوو سووکیی و ئاسانی دەستوورەیەوە کە هەیەتی؛ بەهۆی کاریگەریی ئەو زبانانەوە، هێندە جیاوازی (شاذ) لە شێوەی نووسیار (إملا)ەکەیا پەیدا بووە، یەکێک زۆری لێ نەکۆڵیتەوە و کوششی تیا نەکا، بەئاسانی خوێندنەوە و نووسینەکەی بۆ داگیر ناکرێ، چە لە زمانی گەلەکانی ڕۆژئاواوە، چە لە زمانی هیندییەکانی ڕۆژهەلاتەوە ئەوەندە وشە (کلمة) و تیپ (أدات) و پیت (حرف)ی بێگانە لە ئینگلیزیدا ئەبینرێ لە فەرهەنگ (قاموس)ی زبانی ئینگلیزییدا بۆ وشەکانی خۆیان کەم جێگا ئەمێنێتەوە.

لەگەڵ ئەمانەشا هەمـووی، ئینگلیزیی بۆ کورد لە هەمـوو زبانەکانی تری ئەورویا سووکـتر و ئاسانتر و ڕەوانترە، جگە لەمەش کە کوردێک بەزوویی فێری ئەبێ؛ بەهۆی ئەو وشە بێگانانەوە کە تیایەتی، زبانی ئینگلیزیی: بۆی ئەبێتە ڕەهبەرێکی باش، ڕاستەوخۆ بەزبانەکانی تری ئەورویای ئەناسێ.

***

سا ئایا لەبەر ئارمانج (غـایە)ێکی سیاسی بێ، یان لەبەر نیـازێکی زانسـتی، ئایا لەبەر دلگیریی چاوئەندازە ڕەنگیـنەکـانی کـوردسـتـان بێ، یاخـود لەبەر مـیـوانپـەرسـتی و جوانمێـری و کـارڕەندینیی کـوردەکـان... ئینگلیـزەکان لە دەمێکەوە گەشـتـوگـوزاری کـوردسـتـان ئەکـەن، کـە ئەتوانم بڵـێم لە هەمـوو ڕۆژئاواییەکانی تر پتر تێکەڵی و ئـاسیاوییان لەگەڵ کوردەکانا هەیە و، چاکـتر شارەزای کردەوە و کار و زبان و هەڵسان و دانیشتنمانن.

لە ڕاستـیشا چەند کەسێکیـان هێندە بەتەنگ زمانەکەمانەوە بوون و ڕەنجیـان لەگەڵ تەئریخەکەماندا داوە – کـە بەو سـایەیەوە کـورد لە جـیـهـانی تەئریخ و زباندا جـێگایەکی بەرزی لەناو گـەلاندا گرتووە، لەسەرمان پێویستە تا ئەمینێین لە بیرمانیان دەرنەکەین و لە کانی دڵمانەوە سوپاسیان بکەین.

کـورد و ئینگلیـز، هەر وەک لەیەکـچـوونی ڕەنگ و بۆ و، پەلوپۆ و، بەژن و بالایان، هەندێک لە زاناکانی خۆیانی خستۆتە سەر ئەو بیرەی کە هەردووکیـان لە مێژەوە- جگە لە ئاریایەتی لەیەک تیرە بوون؛ هەروەها؛ لە یەکچوونی دەستووری زبانەکەیان گومەلەیەکی گەورەی وشەکانیان کە ئێستاش لەیەک جیا ناکرێنەوە، بڕوای پێ کردوون کە زبانەکەشیان لە پێشا یەک ڕەگ بووە، پاشان بەسایەی جیابوونەوە و ڕەوی بەرەو ڕۆژئاوای تیرە ئارییەکانەوە، بەم تەرحە جیاوازی یان کەوتووەتە ناو.

***

لەم قسانەوە هەمووی بۆمان دەرئەکەوێ:

لەم ڕۆژەدا کەوا پێویستـە لە خۆشـمان و لەوانیش بگەین و بزانین لە دەورویشـتـماندا چی هەیە و چی ڕوونەدا؛ دیسـانەوە لەم کاتەدا کە وا پێویـسـتمـانە لە سەرچاوانی فەن و زانسـتێکی ڕاستەقـینەوە بۆ

ئاودانی «وریابوونەوەی تازەمان»[1] ئاوی زانست و فەن هەڵیەنجین؛ ئەشێ جامی زانیینی زبانێکی ئەوروپایی بەکاربێنیین- ئەو زبانەش، لەپێش هەموویاندا ئینگلیزییە.

منیش کە ئەم نامیلکەیەم دانا: نیازم ئەوە بوو لە ئەرک و ئازاری وشە دۆزینەوە، لە فەرهەنگانی زبانانی بێگانانداا، تۆزێ، شاگردانی زبانی ئینگلیزیی ڕزگار بکەم!

ڕاستەوخۆ مانای وشە ئینگلیزییەکان بەزبانی کوردی بدۆزنەوە، نامیلکەکەشم، بەش بەش، بە: «دین، جیهان، خزمایەتی، ئەندام، میوە و درەخت و گوڵ، گیانلەبەر و پەرندە و مێش و مەگەز، ئالات، پیشەوەران، ژمارە، باس، تیپ...» دابەش کردووە، هەر بەشەی باسی شتێک ئەکا، تا هە چ حەڵێ، شاگرد ویستی مانای وشەیەکی کوردی یان ئینگلیزی بدۆزێتەوە، تەماشای ئەو بەشە بکا کە بەتایبەتی لەو بابەتەوە باس ئەکا، لەبەر هێنانەوە لەنگەر (وزن)ی شعر ناچار بووم تاکوتەرا جێگۆڕکێ بەچەند وشەیەک بکەم، لە وەدا تکای لێ بوواردن ئەکەم.

بەڵام لەبەر ئەمەی کە مەبەسی ڕاستەقینەم ئەوەبوو مناڵ بخەمە سەر هەوەسی کۆشش و هەوڵدان لە فێربوونی زبانەکەدا، حەزم کردک بەهۆی شتێکەوە کە دڵی کێش بکاتە سەر ئەو کۆششە، نامیلکەکەم برازێنمەوە لەبەر ئەمە نووسراوەکەم خستە شێوەی شیعرەوە، کە هیچ گومانی تیا نییە، مناڵ، بەبۆنەی ئەو ئاهەنگ و بەزم و ئاوازەوە کە لە شیعرەکاندا ئەی بینێ، زوورتر ئارەزووی فێربوون و لەبەرکردنی ئەو وشانە ئەکات و هەتایەت زبانەکەی لاشیرین ئەبێت.

هیوادارم؛ براکوردەکانم، نەخوێندەوارانی زبانی ئینگلیزی، بەم نامیلکەیە کەمەکێ کەلکەوەر بن.

لەسەر خوا.

لە قوتابییانی کلیەی - حقوق عێراق

۲۰ چلە «کانونی ثانی» ۱۹۳٤ شاکر فتاح

---

(۱) سالی بەر لەمە، واتە لە ۱۹۳۳دا مامۆستا (تۆفیق وەهبی) نامیلکەیەکی بۆ فێربوونی نووسینی کوردی بەلاتینی بەچاپ گەیاند و بلاوی کردەوە.

(خوێندەواریی باو- تۆفیق وەهبی، خاوەنی دەستوری زمانی کوردی، بغداد - دار الطباعه الحدیثه ۱۹۳۳).

ئەم نامیلکەیە (بریتییە لە چوار بەش:

۱- باسی چەشن و کاری تیپەکان، هەموو خوێندەوارێکی بەسەرنج دەتوانێ لێیەوە فێری بەکارهێنانی بێت.

۲- مەشق کردن.

۳- باسی نوسیار- إملا- بۆ ئەو مامۆستایانەی ئاگایان هەیە لە دەستوری زمانی کوردی.

٤- وێنەیە بۆ نووسیار.

لەبەر ئەوە بەکاری خوێندەوار و نەخوێندەوار دێت، بێجگە لەوە بەکاری ئەوانە یێت کە ئەیانەوێ فێری کوردی بن.)

(ئەم نامیلکەیەم لە کتێبخانە تایبەتییەکەی مامۆستا عەبدوڵلا جەوهەری خوالێخۆشبوودا دییەوە، لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی.)

**(ئاگاداریی)**

١- هەروەکو وتمان نووسیاری ئینگلیزی جیاوازی زۆرە. لەبەر ئەوە ئامۆژگاری شاگردان ئەکەین، چاک لە حوینجە و نووسینەکەی وورد بینەوە و شارەزای بین ئینجا دەست بکەن بەفێربوون و لەبەرکردنی وشەکان.

٢- لەگەڵ ئەوەشا، لەبەر ئەوانەی، کە ڕاستەوخۆ، مەراقی زوو فێربوونیان هەیە، ئەوا چەند دەستورێکی خوێندنەوەی تیپەکان و وشەکانمان لە خوارەوە نووسی، بەشکو- بەجەورێکی[1] تێکرایی، کەمەکێ فێری نووسین و خوێندنەوەیان بکا.

## (ئەلفبای ئینگلیزی (٢٦) تیپە)

| تیپەکان وەکو ئەخوێنرێنەوە | وەکو بەکار ئەهێنرێن |
|---|---|
| A «ئەی» [ئا]: | وەکو (Arm - ئارم)، (ی)ی کراوە ئەویش حەلێک کە تیپێکی بێ دەنگ (Consnant) (1) و (e)- یەکی ئەکەوێتە دواوە: وەکو (Change - چینج)، (make - میک). |
| B بی [ب]: | وەکو «Back» باک. |
| C سی [ک]: | وەکو «Car» کار.[2] |
| D دی [د]: | وەکو «Duck» دەک. |
| E ئی [ئی- یی کراوە]: | وەکو (Else - ئیلس) (ە): وەکو (Celebrate - سەلەبریت)، (یی کراوە): وەکو «Bench» بینچ. |
| F ئێف [ف]: | وەکو «Fort» فۆرت. |
| G جی [گ]: | وەکو «Gun» گەن.[3] |
| H ئێچ [هـ]: | وەکو Hound - هاوند. |
| I ئای «[ئای]: | وەکو «Bite» بایت) (ئی): وەکو (ink - ئینک) (ژێر): وەکو Brick - بڕک، Bit - بت (ی) وەکو Pink - پینک. |
| J «جەی» [ج]: | وەکو Jew - جوو. |

(١) جەورێک: شێوەیەک، تەرحێک، جۆرێک.

(٢) بەلام ئەگەر لە پاش (C) یەوە (y, i, e) هات بە(س) ئەخوێنرێتەوە وەکو (Circle - سێرکل)، (Centre، سێنتر)، (Cycle، سایکل)،

(٣) بەلام ئەگەر (y, i, e) لە دوایەوە هات، هەندێ جار بە(ج) ئەخوێنرێتەوە وەکو: (Germ - جیرم)، (Ginger - جینجەر)، (Gypsum - جیپسم).

K «کی» [ک]: Kite - کایت.

L «ئێل» [ل]: Lamb - لامب.

M «ئێم» [م]: Man - مان.

N «ئێن» [ن]: Noon - نوون.

O «ئۆ» [ئۆ- بەواوی کراوە]: وەکو Orchard - ئورچارد، (واوی کراوە): وەکو Boy - بۆی.

P «پی» [پ]: Pipe - پایپ.

Q «کیو» [کو]: Quite - کوایت، Queen - کویین.[1]

R «ئار» [ر]: Rust - ڕەست.

S «ئێس» [س]: Star - ستار.

T «تی» [ت]: Too - توو.

U «یو» [یو]: Cure - کیور، (ئە): وەکو- Unkle ئەنکل» (ە): وەکو Struck - سترەک.

V «ڤی» [ڤ]: وەکو: Very» ڤەری.

W «دەبل یو» [و]: White - وایت، Cow - کاو.

X «ئێکس» [کس]:[2] Ax» - ئاکس، Expel - ئیکسپیل، Taxation - تاکسیشن، Exact - ئێکزاکت.

y «وای» [ی]: وەکو: Yard - یارد، Copy - کۆپی، (ئای): وەکو: Cry - کرای، Type - تایپ.

Z «زیت» [ز]: وەکو: Zeal - زیل، Zinc - زینک.

جگە لەمانە چەند تیپێکی لێکدراویکەش هەن، دەنگێک ئەهێننە بوون:

(٤) - [چ - CH] وەکو Church - چەرچ.

(٥)- [چ - Tch] Catch - کاچ.

(٦)- [ک - Ck) Suck - سەک.

(٧)- [ج - Dge] Judge - جەج.

(٨)- [ف - PH] Geography - جیۆگرافی.

(٩) - [ش - SH] Shrub - شرەب.

(١) Q هەمیشە لەگەڵ (U)دا ئەبێ.

(١) کەم هەڵئەکەوێ X (لەسەری وشەوە) بەتەنیابێ؛ هەمیشە (e)ی لە پێشەوە ئەبێ، ئەگەر بکەوێتە ناوەڕاستی وشەوە ئەبێ تیپێکی دەنگداری پێشکەوێ.

(١٠)- [TH - ث، ذ] Three - ثری. Those» ذۆس.

(١١)- [TU - چ] picture - پیکچەر.

(١٢)- [tio - ش] Nation - نیشن،

(١٣)- [Lgh - ئای] Night - نایت، Thigh - ذای.

(١٤)- [ough] ئەگەر دوا کەرتی وشەیێ بە(ف) و ئەگەر بکەوێتە ناوەراستی وشەوە بە(0 - ئۆ) ئەخوێنرێتەوە، وەکو: Enough - ئینەف، Rough - رەف، Bought - بوت، Brought - بروت. (Augh)یش بە[ف] هەندێ جار ئەخوێنرێتەوە وەکو: Laughter - لافتەر.

(١٥)- (Kn - ن) وەکــو Knife - نایف، Knee - نی، لە (Vewel)ەکــان- بەلێکدراویی- هەندێ جـار (Vouxl)ێکی بەهێز و هەندێ جاریش تاقـە (Voueel)ێک دێتە بوون:

(١٦)- (ea) ئەبێتە [ئی، یی]: وەکو Eager - ئیگەر، Teacher - تییچەر.

(١٧)- (ai) ئەبێتە [e یی کراوە]: وەکو Hair - هیر، Chair - چیر.

(١٨)- (ee - یی): وەکو Strcet - ستریێت.

(١٩)- (oo - وو): Root - رووت.

(٢٠)- (ou - ئاو): Stout - ستاوت.

***

## (RELIGION- دیین)[1]

God بۆ خوایە، Prophet پێغەمبەر

Angef فریشتە، Majesty سەروەر

Eook بۆ نامەیە، Religion بۆ دیین

Paradise بەهەشت، Hell جێی ئاگرین

Satan شەیتانە، pray To نوێژکردن

Pious خواناسە، Fast رۆژووگرتن

Preacher مەلا، church یش (کلێسە)

Feast لە بۆ (جەژن)ە، Mosque یش (مزگەوت)

Niche قبلەی نوێژە، Wicked گوناهبار

Hermit خەڵوەتکێش، Poor بۆ (هەژار)

(١) دیین: وشەیەکی کوردییە: بە زبانی زەندیی Deene بۆ قانوون دانراوە، عەرب لە ئێمەیانەوە وەرگرتووە.

Islam ئیسلامه، zoaraster زەدەشت
christian گاوور، Handful پڕ له دەست
Qoran قورئانه، Gospel بوانجیل
The Bible تەورات، key له بوکلیل

## (WORLD- گێتی)

World گیتییه[1] Sky ئاسمان
Earth زەمینه، Stars ئەستێران
Mountain چیا، Hill بەگرد ئەڵێن
به ئاویش Water، بەڕۆژ Sun ئەڵێن
Moon لایان (مانگه)، Valley لایان (شیو)
Stream جۆگەیه، Half یش لایان (نیو)
Cloud بۆ هەوره، Snow بۆ بەفره
Sea بۆ دەریایه، Gigantic گەوره
Plain دەشته، River بۆ زێیه[2]
Spring سەرچاوه، Way, Road ڕێیه
Rain, Air با باران، Warm بۆ (گەرم)ه
Cold سارد، Solid ڕەق، Soft بۆ (نەرم)ه
Lakc بەگۆم ئەڵێن، I sland جزیره[3]
Pool بەحەوز ئەڵێن، Well یش بۆ (بیر)ه
East ڕۆژهەڵاته، North بۆ ژووروو[4]
West ڕۆژئاوایه، South بۆ (خواروو)
Rasy تیشکی ڕۆژه، Dark (تاریک)ه
Day ڕۆژ Nighs شەو Thin بۆ (باریک)ه

---

(۱) بەزبانی زەندیی: Geetaiye مانای «دنیا» بووه، پاشان بووه بەگیتی که دییسانەوه مانای جیهان یان دنیا ئەبەخشێ.

(۲) زێ: ڕووبارەکه له (River)ەوه نزیکتره.

(۳) کوردی سۆران به(جزیره) ئەلێن دورگه

(٤) ژووروو بۆ (شمال) خواروو بۆ جنوب دانراوه لەگەڵ ئەمەشا خۆمان (باکور) بەشمال ئەڵێن.

## (خزمایەتی RELATONSHIP)

Animal گیانلەبەر، Plants گژوگیا

Woman ئافرەتە، Different جیا

Man پیاو Girl کچ، Child (منال)ە

Sweet بۆ شیرین، Bitter بۆ (تاڵ)ە

Insects حەشەرات، Bird پەرندە

Tame بۆ ماڵییە، Fierce دڕندە

Human بەپیاو، Lad بە(کوڕ) ئەڵێن

Father بە(باووک)، Mother بە(دایک) ئەڵێن

Son ڕۆڵە Boy کوڕ، Daughter بۆ (کچ)ە

Big بۆ گەورەیە، Little بۆ (گچک)ە

Brother برا، Sister بۆ (خوشک)ە

Wet لەبو (تەڕ)ە، Dry بۆ (وشک)ە

Relation خزم، Frienb (هاودەم)ە

Husband بۆ (مێرد)ە، Gameیش بۆ (گەمە)

Servant مفردی، Wife بۆ (ژن)ە

Tree (درەخت)ە، Shrub (دەوەن)ە

Parent دایک و باوک، Uncle بۆ (مام)ە

Grand -Father باپیر، Cousin (کوڕمام)ە

Grand- Mother (نەنک)ە، Aunt بۆ (پور)ە

Descnbabts نەوە، Angry توورە

Nephew (برازا) هەم، (خوشکەزا)یە

Aunt (خاڵۆژن)ە، Sorrow سزایە[1]

Virgin کچێکە شووی نەکردبێ

Bachclor کوڕێکە کەوا بێ ژن بێ

Widow بێوەژن، Oivarce (طلاق)ە

Will (وصیت)ە، Only The (تاق)ە

(١) لای هەندێک وەکو لێرە شایێشان دراوە سزا بەخەفەت دائەنێن. بەڵام خەفەت لە پاش سزا دەردەکەوێ. چونکی سزا بەکوردی «جزاء عقوبة»ی من پێ ئەگرێتەوە. بێ گومان «جزاء» لە سزای ئێمە وەرگیراوە.

## (LIMBS ئەندام)[1]

Head (سەر)ە، Poey (لەش)ە

Brain مێشک، Black (ڕەش)ە

Eye (چاو)ە، Mouth (دەم)ە

Very (زۆر)ە، Little (کەم)ە

Nose (لوت)ە، Ear گوێیە

Wrist (مەچەک)ە، Foot یش (پێ)یە

Hair (قژ)ە، Tooth (ددان)ە

Finger پەنجە، Toungue (زبان)ە

Heart (دڵ)ە، Chest «سنگ»ە

Lip بۆ «لێو»ە، Colour «ڕەنگ»ە

Hand بۆ «دەس»ە، Stomach «ورگ»ە

Tos پەنجە پێ، Lever «جەرگ»ە

Knee ئەژنۆیە، Nail «نینۆک»ە

Blood «خوێن»ە، Ginn جنۆکە

Leg «قاچ»ە، Flesh «گۆشت»ە

Breath هەناسە، Dressed پۆشتە

Bone (ئێسقان)ە[2] Skin (پێست)ە

Jaw شەویلگە، وچان (Rest).

Wound (بریین)ە، Toweap گریان

Tear فرمێسک، Shoulder بۆ (شان)

To go ڕۆین، Speech قسە[3]

Shout (هاوار)ە، Inough بەسە

Tired ماندوو، To eat خواردن

---

(١) ئەندام: پەلوپۆ... (ئەندامەکانی لەش. ا. ب)

(٢) کوردی کرمانج بەئێسقان ئەڵێن (هەستی)، (ئیسک)یشی پێ ئەبێژێ هیچ دووریی یەکە وشەی (ئەسکەلە) و (ئەسکەلەت) لە (ئێسک)ەوە هاتبێ

(٣) قسە: لە نوسراوەی (زەندەوەستا)دا هەیە، جگە لەوە (Queston)ی ئینگلیزی کە هەر ئەوە ئەگەیەنێتەوە، بەتەواوی بەرپەرچی ئەوانە ئەداتەوە کە ئەڵێن لە (قصە)ی عەرەبییەوە هاتووە.

To sce بینین، To kill کوشتن

Careful وریا، Sleepy نوستو

To die مردن، Alife زیندوو

Sour (ترش)ە، Sweet شیرین

Drink بخۆرەوە، Honey هەنگوین

Learning بیستن، Visiting سەردان

Learnd زانا، To put دانان

To tadte چێشتن (تامکردن)، Smell (بون)ە

New تازە، Ancient (کۆن)ە

To beat لێدان، To know زانین

To wash شووشتن، To rain بارین

Face دەموچاو، Cheek بۆ (کوڵم)ە

Rib پەراسوو، Mucus (چڵم)ە

Eyebrow برۆ، Lash (برژانگ)ە

Bowols (ناو)ی (ریخۆڵان)ە

Chin چەناگە، Beard (ریش)ە

Mustache سمێڵ، Habit پیشە

Neck سپل، Revenge تۆڵە

Pharyn گەروو، Buck بۆ (پشت)ە

Sweat عەرەق،[1] Side (تەنشت)ە

Call (زراو)ە، Belly (سک)ە

Muscle ناوە بۆ (ماسولکە)

Kidney مانای (گورچیلە)یە

Pupil ناوی (بیل بیلە)یە

Joint جومگە، Lung بۆ (سی)یە

Thigh بۆ (ران)ە، Theft (دزی)یە

Phlegm بەڵغەم، Spittle (لیک)ە

Fat بۆ (بەز)ە، Abit تیپیکە

---

(١) عرقی لەش.

## (جلوبەرگ WEARING APPAREL)

Clothes جل، Vest سوخمەیە

Botton (قۆپچە) یان (دوگمە)یە[١]

Cloack جبە، Mantle عەبا

Felt (بەرگن)ە، Gown کەوا

Coat (چاکەت)ە، Suit دەستەجل

Veil پەچەیە، مەکوک Shuttle

Hat (کلاو)ە، Clog قبقاب

Leather (چەرم)ە، Cock کەڵەباب

Collar (یەخە) یان (ملیوان)

Wool (خوری)یە، Linen کەتان

Sewing- Machine مەکینەی دوورین

Stockings, Socks (گۆرەویی)یە

Glove دەستکێش، thread دەزوو

Beads ناوی (متو مورووو)

Pin (دەرزی)یە، Lining (بەر)ە[٢]

(کەفی سابوون)یش (Lather)ە

FaShion (باو)ە، Razor گوێزان

Brush فرچە، Ribbon قەیتان

Fez (فێست)ە، Turban (مێزەر)ە

Silk ئاوریشم، Damp یش (تەڕ)ە

Sleeves (چمک)ە یان (داوێن)ە

Fan یش ماناى (باوەشێن)ە

Drawers (شەرواڵ) یاخود (دەرپێ)

Slippers پاپووچ، کەوشی سەرپێ

Belt (پشتێن)ە، Chain (زنجیر)ە

---

(١) ڕەنگە (قۆپچە) لە (گۆپکە) وە هاتبێ، لە زاخۆ پێی ئەڵێن (پشکوک).

(٢) لێرەدا (بەر) وەک بەری کەوا بەکار ئەهێنرێ. (بطانە. ا. ب)

Salt ئەتلەس، Sword (شیر)ە[1]
Velvet قەیفە، Comb (شانە)یە
Cuffs لە بۆ (فەقیانە)یە
ژێرکراس (Undershirt)ە
Night- Gown (کراسی شەو)ە
Trousers (پانتۆل)ە
Migration یش لە بۆ (رەو)ە

***

Seissors مەقەستە یان برنگ
Neektie, Cravet بۆیباغ
Trousseau (جیازیی)یە
Cloth قوماش

***

Thimbke ئەموستیلەی دورین
Necklace لە بۆ (گەردانە)یە
Ear- ring یش (گووراە)یە
Sewing دوورین، Cutting برین

***

Anklet بەکوردیی (خلخاڵ)ە
Braceletیش بۆ (بازن)ە
Umbrella, parasol چەتر
Towel خاولی Pink (ئاڵ)ە[2]
Sponge (هەور)ە[3] Pocket گیرفان
Spectacles چاویلکەیە[4]
Whip قەمچییە، Stick گاڵۆک
Flannel لە بۆ (فانیلە)یە

---

(١) شیری برین. (شمشیر. ا. ب)
(٢) رەنگی ئاڵ- قرنفلی- وەبەمانای- رادیکالی معتدل- دێ (ا. ب)
(٣) هەور: گیانلەبەرێکی درەختیە لەبن دەریادا ئەژیی، ئەو هەورەیە کە شتی پێ ئەشۆری. (ئیسفەنج. ا. ب).
(٤) لە دەوری رەواندز بە(عەینەک) ئەڵێن چاویلکە.

## (HOUSEHOLD REQUIREMENT کەلوپەلی ناو ماڵ)

Building (خانوو)ە، Room ناوی (ژوور)ە

Hut (قۆخته)یه، Oven (تەنوور)ە

House (خانوو)ە، Passage (ڕاڕەو)ە

Corridor داڵان، Dream بۆ (خەو)ە

Ladder پەیژە، Verandahe هەیوان

Kitchen بۆ جێگای کردنی چێشتان (مەتبەخ. ا. ب)

Ceiling (بن میچ)ە، Window پەنجەرە

door دەر، یان دەرگا، Fight, war (شەڕ)ە

Holl دیوانخانە، Glass شووشەیە

Pillar کۆڵەکە، Quilt لێفەیە

Home (ماڵ)ە، Bath- room ژووری خۆشتن (حەمام)

Stable پشتیر[1] Lantern فانۆس

Stair- case مانای (پلیکانە)یە

Roof بۆ (سەربان)ە، Picture (وێنە)یە[2]

Well (بیر)، دیوار Wallی پێ ئەڵێن

بە Foundation (بنچینە) ئەڵێن

Shelf بۆ (تاق)ە، Hinge یش (دولایی)

Pump (ترۆمپا)یە، Sight بینایی

Lock کلۆم، Curtains مانای (پەردە)یە

Blanket پەتوو[3] Bag (توورەکە)یە

Bed پێ خەف، Pitcher مانای (مەسینە)

Cupboard (دۆلاب)ە، Cushion (سەرین)ە

Sheets (متیل)ە،[4] Frame چوارچێوە

Clock (سەعات)ە، Wax بۆ (مێو)ە[5]

---

(١) پشتیر: طویلة. (تەویلە - ا. ب).

(٢) وێنە: صورت، رسم، عکس.

(٣) پەتوو: بطانیە.

(٤) بەرگی دیوی ناوەوەی لێفە (ا. ب)

(٥) مێوی شانەی هەنگ، نەک دارمێو (ا. ب).

Satchel هەگبە، Mat حەسیر Rag بەرە
Carpet سوجادە، مەنجەل (Boiler)ە
Wick (پلیتە)یە، Candle بۆ (مۆم)ە
Cup فنجان، Bellows بۆ (مووشەدەمە)
Table- cloth سەرمێز، Table بۆ (مێز)ە
Mirror ئاوێنە، Strong بۆ (هێز)ە
Plate (دەوری)یە، Tray بۆ (سینی)
Scoop (گەوگیر)ە، Kettle بۆ (کەتری)
Fork (چنگاڵ)ە، Bowl بۆ (کاشی)
Glass (پەرداغ)ە Funnel راحەتی
**Knife چەقۆیە، Stove ئاگردان**
**Pestle, Mortar هەردوو: دەسکەوان**
Tea- pot (قۆری)یە، Broom بۆ (گەسک)
Wide بۆ (فراوان)، Narrow بۆ (تەسک)
Sieve بۆ (بێژنگ)ە، Basket سەبەتە
Tongs (مەقاش)ە، Match بۆ (شقارتە)
Coffee- pot (جەزوە)، Toigrind هارین
Balance تەرازوو، To Sweep ماڵین
Sauce- pan تاوە، Salt- cellar خوێدان
بە Sugar- Basin ئەڵێن (شەکردان)

**Animals گیانلەبەر**

Birds And بۆ پەلەوەر[1]
Insects بۆ (حشرات) مێروو. ا. ب
Mare (ماین)ە، Donkey (کەر)ە
Goat (بزن)ە، Sheep (مەڕ)ە
Horn (شاخ)ە،[2] Ox گایە
Cat پشیلە، Cow مانگایە

---

(١) پەرندە، باڵدار، مەل.
(٢) شاخی گیانلەبەر، .

کارژۆلە Kid، Flock (ڕان)ە[1]
Bear (ورچ)ە Ran (بەران)ە
Tiger پڵنگ، Dog بۆ (سەگ)ە
Jackal چەقەڵ، بەراز (Pig)ە
deer (ئاسک)ە، Camel حوشتر
Rabbit کەروێشک، Mule ئێستر
Colt جوانووە، Filly نۆما[2]
Ioo بۆ (سم)ە، Dance بۆ (سەما)
Baor (بەرازی دڕندە)یە
Lion شێرە، Self (بەندە)یە (خودی خۆی. ا. ب)
Rat (مشک)ە، Muoce مشکی بچووک
Bitch دێڵەسەگ، (کەڵەشێر)ە Cock
Hen (مریشک)ە، Chich جووجەڵە
Calf گوێرەکە، Ewe (مەڕ)ە
Cub بێچوە شێر، Fur (فەروە)یە
Sable لە بۆ (سمۆرە)یە
Monkey مەیموون، Elephant (فیل)ە
Dove (کۆتر)ە، mile (میل)ە
ئەسپ (Horse)ە، Wolf (گورگ)ە
Hound تانجی، Dress (بەرگ)ە

***

Turkey عەلیشیش، Hedgehog (ژیشک)ە
Tartedove قومریی، Cradle بێشکە
Eagle بۆ (داڵ)ە، Nightingale بلبل
Duck (مراوی)یە، To the Neck تامل[3]
Stork (لەقلەق)ە، Valture (هەڵۆ)یە

---

(١) رانە مەڕ.
(٢) بێچووی مێیە ماین، بەمانای (کچ)یش دێت. (ا. ب)
(٣) هەتا ئاستی مل. (ا. ب)

Hoopoo بۆ (پەپوسلێمانکە)یە

Partridge (پۆڕ)ە، Swan (سۆنە)یە

Goose لە بۆ (قاز)ە، Cause یش (بۆنە)یە (**)

Parrot تووتییە، Kite کولارە

Falcon بۆ (باز)ە، Rider (سوار)ە

***

Starling (ڕیشوڵە)یە، Sparrow چۆلەکەیە

Owl لە بۆ (کوندەبەبۆ)، Chicken (گەلەی جووجەلە)یە

Feather (پەڕ)ە، Bill (دەندووک)ە

Throat (قوڕگ)ە، Gum یش (پووک)ە

Bee (هەنگ)ە، Wasp زەردەواڵە

Sting چزوو، Dumb بۆ (لاڵ)ە

Snail هێلکە شەیتانۆکە

Leech (زەروو)ە، Hurryup زووکە، (خێرکە، گورجکە. ا. ب)

Flea (کێچ)ە، Bug مێشوولە[1]

Louse ئەسپێ، Ant مێروولە

Scorpion لایان (دووپشک)ە

Spider یش (جاڵجاڵۆکە)

Scolopendra (هەزارپێ)یە

Serpent (مار)ە، Female (مێ)یە

***

Warm بۆ (کرم)ە، Cocoon قۆزاخە

Moth (مۆرانە)یە، Ah (ئۆفو ئاخ)ە

Silkworm لە بۆ (کرمی ئاوریشم)ە

Locust کوللەیە، Saturday شەممە

Butterfly (پەپوولە)یە

Pup و Puppy بۆ (توولە)یە

---

(**) بەمانای: (سبب، علة، داع، قضية)ش دێت (ا. ب)

(١) لای ڕواندز: (پێشکە)شی پێ ئەڵێن.

Fly (مێش)ە، Wax (مێو)

Owner (خاوەند) یاخود (خێو)ە

## (TREES. FRUITS. AND FLOWEES) درەخت و میوە و گوڵ

Garden (باغچە)یە، Wood (دارستان)ە[1]

Branch لق و پۆپ، Orchard (بێستان)ە

Flower (گوڵ)ە، Rose (گوڵەباغ)

Grapes (ترێ)یە، Flag (بەیداغ)ە

Pear (هەرمێ)یە، Melon Water شووتی

Cuember خەیار، Apricot قەیسی

Cherry (گێلاس)ە، Peas لە بۆ (نۆک)ە

Fig بۆ (هەنجیر)ە، Kerchief دەسرۆکە

Seed (تۆو)ە ڕەگ، Root Shrul (دەوەن)ە

Leaf گەڵا، Peach قۆخ، Age بۆ (تەمەن)ە[2]

Park بۆ (تویکڵ)ە، Thorn بۆ (درک)

Pine سنەوبەر، Twig بۆ (برک)

Cak (داربەڕوو)ە، Walnut داری گوێز

Hawthorn گوێژ، Powerful بەهێز

Corn خەڵەیە، Crushed wheat ساوەر

Wheat گەنم Rye جۆ، Carrot بۆ (گێزەر)

Onion (پیاز)ە، Radish بۆ (تووڕ)ە

Mint نەعنا، Beet سلق، Red ڕەنگی (سوور)ە

Scent (بۆنی خوش)ە، Mulberry (توو)ە

Almonds (باوی)یە،[3] Surface بۆ (ڕوو)ە

Orange پرتەقاڵ، Lemon لیمۆیە

Quince بەهێیە، To you (بۆ تۆ)یە

لای ئەوان (هەنار) (Pomegranate)ە

---

(١) بەمانای (تەختە)ش دێت، یاشتی لە تەختە و دار کرابێ (ا. ب)

(٢) تەمەن: عمر، نالی بەکوردیی لە سونعو تەمەنی چواردە ساڵە دابو؟

(٣) لە هەولێر بە(بادام) ئەڵێن (باوی).

Olive (زەیتوون)ە، گەورە (Great)ە
Apple لایان (سێو)ە، Raisins (مێووژ)ە
Sunflawer یش (گوڵەبەڕۆژە)
Narcissus نێرگس، Bouquet دەسکە گوڵ
Lettuce (کاهوو)ە، Boiling بۆ (لەکوڵ)
Bringol باینجان، Lentils (نیسک)ە
Beans بۆ (پاقلە)یە، Stem (لاسک)ە
Beetroot چەوەندەر، Bamiah بامیە
Sumach بۆ (ترش)ە، Cumin زیرەیە
Millon (کاڵەک)ە، Tarnip (شێلم)ە
Rice (برنج)ە، Blace «قەڵەم»ە[1]
Tree «درەخت»ە، Cluster هێشوو
Dates (خورما)یە، Cotton بۆ (پەموو)
Sugar- cane لایان (قامیشی شەکر)
Plum هەڵووژە، Petter یش چاکتر
Bud بۆ (غونچە)یە، Vine بۆ (مێو)ە
Stoues «ناووک»ە،[2] Mountain (کێو)ە

## کانز و بەردی نرخدار (METALS AND PRECLOUS STONES)

Gold (زێڕ)ە، Silver (زیو)ە
Copper (مس)ە، Sand بۆ (لیو)ە[3]
Brass (زەرد)ە،[4] Iron ئاسن
zenc چینکۆیە، Huge مەزن[5]
Sulpher گۆگرد، Tar (قەتران)ە

---

(١) قەڵەمی گوڵ
«٢» ناووکی میوە. وەک: ناوکە بەهێ.
(٣): لە.
(٤) بەرەنگی زەردیش ئەڵێن: Yellow
(٥) گەورە.

Steel پۆلا، Mine (کان)ە

Magnet ناوی (موغناتیس)ە

Lead بۆ (مز)ە،[1] Rope (گوریس)ە

Gem (گەوهەر)ە، Ruby یاقووت

Emerald بەئینگلیزی (زمرووت)

Mercury جیوە، Coral مەرجان

Crystal بلوور، Heavy گران (قورس. ا. ب)

Turqnoise ناوی (پیرۆزە)یە

Lustre (شەوق و بریسکە)یە

## (GOUNTRY AND ITS PART وڵات و ئەوی لە ناویایە)

Country وڵات، Town (شار)ە

Street شەقام، Stick (دار)ە

Village (گوند)ە،[2] House خانوو

Market بازار،[3] Piea بیانوو

Palace (کۆشک)ە، Police پۆلیس

Clean (پاک)ە، Dirty بۆ (پیس)

Nation (گەل)ە،[4] Master سەردار

State دەوڵەت، Camp یش (هەوار)

(حکومت) لایان (Government)ە

King پاشایە، Desert (دەشت)ە

Hospital ناوی (خەستەخانە). نەخۆشخانە. ا. ب

Vesir وەزیر، Court (دیوان)ە

Officer (مأمور) یان (فەرمانبەر)

Brave ئازا، Bold دلاوەر

Office جێگەی فەرمانبەران

---

(١) مز: کوردیی پەتییە، مانای قورقوشمە.

(٢) دێ

(٣) بازێریشی پێ ئەڵێن

(٤) ملت. میللەت (ا. ب)

Order فەرمان، To give بۆ (دان)

Army لەشکر، Soldier عەسکەر

Migl. ty هێزدار، Warrior شەڕکەر

Capital پایتەخت، Ship (پاپۆڕ)ە

Alley کووچە، Grave (گۆڕ)ە

Restaurant مانای (چێشتخانە)یە

Museum (ئەنتیکەخانە)یە

Quarter گەڕەک، Boat (کەشتی)یە (بەلەم. ا. ب)

ئیجزاخانە Pharmacy یە، (دەرمانخانە ا. ب)

Harbour مانای (ئەسکەلە)یە

Swimming بەکوردی (مەلە)یە

## (پیشەوەران CRAFTSMEN)[1]

Peasant لادێیی، Printer چاپ گەر

Actor (ممثل)، Dancer سەماکەر

Book- Seller ، مانای (کتێب فرۆش)ە

Green- grocer (سەوزە فرۆش)ە

Book- Binder بۆ (جز و بەندکەر)ە

Masson بەنایە، Cook یش (چێشتکەر)ە

Carpenter دارتاش، Turner(خرات)ە

Tailor (بەرگدروو) یاخود «خیاط»ە

Butcher گۆشت فرۆش، Grocer بەقاڵ

Porter بەکوردی (هەڵگر)یان (حمال) (کۆڵ هەڵگر ا. ب)

Shepherd (شوان)ە، Cutler چەقۆگەر

Hunter (راوکەر)ە، Wizard جادووگەر

Tanner دەباغ کەر، Cobbler پینەچی

Coffee. shop keeper لە بۆ (قاوەچی)

Barber (سەرتاش)ە، Miller ئاشەوان

---

(١) صنعتكاران

Groom (مەیتەر)ە، Watchman پاسەوانە
Goldsmith (زەڕەنگەر)ە، Coavh, Cab (گالیسکە)یە
Shoe- maker کەوش دروو، Blacksmith (ئاسنگەر)ە
Gunsmith چەخماخ ساز، Shoe- blsck (بویاغچی)یە
Gardener بۆ(باغەوان)، Confectioner (حەڵواچی)یە
Sweeper گەسک لێ دەر، watchmaker سەعات چییە
Sculptor هەیکەل تاش، Politician سیاسییە
Copperamith بۆ (مسگەر)ە، Photographer (وێنەگر)ە[1]
Tinsmith تەنەکەچی، Plasterer (تەڕاو دەر)ە
Lawyer (محامی)، Engineer (مهندس)ە
Singer لە بۆ (گۆرانیبێژ)، pharmacist (إجزاچی)یە[2]

(حاجەت، ئالات TOOLS)

Serew (جەڕ)ە،[3] Saw (مشار)ە
Hammer چەکوش، Nail (بزمار)ە
Muttock (پاچ)ە، Axe (تەور)ە
Wheel ڕەوڕەوە، Greesy (چەور)ە
Valve دەرک، Wire (تەل)ە
Piug سەرقاپ، Hurry پەلە
Awl درەوش، Peg بۆ (مێخ)ە
Cutter برنگ، Root یش (بێخ)ە
Vice گیرە، Adze تەشوێ
Dhissl ئەسکەنە، Plane ڕەنگە
Anvil دەزگا، Late (درەنگ)ە
File بڕبەند، Furnace کوورە
Mould (قاڵب)ە، Angry توورە

---

(١) فتۆغرافچی
(٢) صیدلی. ا. ب
(٣) جەڕ: برغو (ا. ب)

Foreceps مانای (دەموقەلە)
Piston دەسک، Group گەلە
Crucible بۆ (بۆتە)یە
Fetter (پێوەند) و (کۆتە) یە

## قوتابخانە (SCHOOL)

قوتابخانە School، Puple (شاگرد)ە (قوتابی - ا. ب)
Teacher مامۆستا، Bridge بۆ (پرد)ە
Class دەرسخانە، Lesson بۆ (دەرس)ە
Teaching فێرکردن، Question (پرس)ە
chair بۆ کورسیە، Drawer چاوی مێز
To sit دانیشتن، Table, Desk مێز (ریحلە. ا. ب)
To Iearn فێر بوون، Listening گوێ گرتن
Stand up هەڵسان، To take وەرگرتن
To Write (نووسین)ە، Peneil بۆ (قەڵەم)
Paper (قاقەز)ە، کۆڵەگە Column[1]
Duster تەختەسڕ، Black-Board تەختە[2]
Inkstand (دوێت)ە، Difficult (سەختە)ە
مەرەکەب (Ink)ە، (Chalk)ە دەباشیر
Ruler ڕاستەیە، Old (کۆن) یاخود (پیر)
History تأریخ، Rubber (لاستێک)ە
Date هەم بۆ (خورما)، هەم بۆ (تأریخ)ە[3]
Arithmetic حساب، Algebra (جبر)ە
Physic فیزیایە، Page بۆ لاپەڕە
Number ژمارە، Failing دواکەوتن
English ئینگلیزی، Passin سەرکەوتن[4]

---

(١) ستوون
(٢) تەختەی ڕەشی نووسین،
(٣) تأریخی یەکەم دەرسی تأریخ. هی دووەم تاریخی ساڵ و مانگ و ڕۆژ... هتد
(٤) دوا کەوتن و سەرکەوتن لە تاقی کردنەوە (إمتحان)دا.

Geography ناوی (جوغرافیا)یه

Slow (هێواش)ه، Rapid (خێرا)یه

Drill بۆ (مەشق)ه، Language (زبان)ه

Science (زانست)ه،[1] Artist (فنان)ه

(هندسه) لایان Geometry یه

Drawing ڕەسم، Kurdish کوردییه

Grammer دەستوور، To read (خوێندن)ه

Exercise وەرزین،[2] Doiug (کردن)ه

Chemistry کیمیا، Football تۆپی پێ

Runing ڕاکردن، Alittie کەمی

Teaching- staff (دەستەی مامۆستایان)ه

Play ground (جێی یاریکەران)ه (یاریگه. أ. ب)

Examination تاقی کردنەوه

To Forget بۆ شت (لەبیر چوونەوه)

Dictation نووسیار[3] Duty فرمان

Clever زیرەک، Pretty جووان

Composition انشا، Reader خوێندەوار

Tidings دەنگوباس، Magazine گۆڤار[4]

Scout دیدەوان،[5] Picnes (سەیران)ه

Library ناوه بۆ (کتێبخانه)

Copy Book دەفتەر، Bell مانای (زەنگ)ه

Dictionary قامووس، Silent (بێ دەنگ)ه

Line ناوی (دێڕ)، Word بۆ (وشه)یه[6]

Phrase, sentdnce (گەلەی قسه)یه[7]

---

(١) زانست: (علم)ه.

(٢) وەرزین: لەش بزواندن، مەشق، سپور (لێرەدا- مەشق- یا - ڕاهێنان- ٥. أ. ب)

(٣) نوسیار: (املا)یه..

(٤) گۆڤار: (مجله)یه.

(٥) دیدەوان: (کشافه)یه

(٦) کلمه

(٧) جمله

Letter ماناى تيپ[1] Map ناوى (نەقشە)[2]
Blotting Paper (مەرەکەب هەلمژ)ە (ورق نشاف. ا. ب)
Pen- Knife قەلەمبڕ، Satchel کتێبدان[3]
Compass (پەرگال)ە، Recess بۆ (وچان)
Mark بۆ (نمرە)یە، Reward بۆ (خەلات)
Vacation پشوو، (لەبەر)یش Byheart
Recitation بۆ دەرس (گوێ لێ گرتن)ە
Runishment لایان (تەمێ کردن)ە
Spelling حوێنجە، Presence دیار
Monitor یەکەم، Absence نادیار
(شهادت) لایان (Cerstificate)ە
(بێ هەڵە) و (ڕاستی) (Corret), right)ە
Envelope (ظرف)ە، Permission ڕێدان
signature امضا، Ignorant نەزان
to study کۆشش، Behaviour ڕەووشت
Gum یش (جەوی)یە،[*] Failure نوشوست
Nourishment خۆرشت، Food بە(چێشت) ئەڵێن
To act بە(تمثیل)، Bread (نان) ئەڵێن
(ترجمة) لایان Translation
بۆ (تێگەیاندن) Explanation

---

(١) حرف
(٢) خريطه
(٣) هەگبەی کتێب. (جانتا. ا. ب)
(*) جەوی: کەتیرە، صمغ، بەماناى- بنێشت-یش دێت (ا. ب)

## (Time کات)[1]

Saturday شەمە، Sunday یەکشەمە

Friday هەینی،[2] Monday دووشەمە

Tueday سێشەمب، Wednesday چوارشەمب

کرمانج بەThursday، ئەبێژن (پێنجشەمب)

century سەد ساڵ، Year لە بۆ (ساڵ)ە

Next year دوا ساڵ، year Laet (پار)ە

Season (گونەر)ە،[3] Spring (بەهار)ە

Month مانگ، Day ڕۆژ، Evening ئێوارە

Autum (پایز)ە، Winter (زستان)ە

Summer (هاوین)ە، Morning (بەیان)ە

Week هەفتە، Night شەو، Midnight نیوەشەو

Noon (نیوەڕۆ)یە، Fortnight چواردە شەو

بە(پاش نیوەڕۆ): Afternoon ئەڵێن

To morruw بە(سبەی بەیانی) ئەڵێن

Forenoon چێشتەنگاو، Second (ثانیە)

Minute (دقیقە)، End بۆ (دوایی)یە

Day, Dawn Of Break (بەری بەیان)ە

Middle (ناوەند)ە، Heavy (گران)ە

Early (زوو)ە، Late (دواکەوتوو)ە

Beginning سەرەتا، Past (ڕابوردوو)ە

Always هەمرودەم، Present ئێستا

Aftewards پاشان، Future لەمەودوا

---

(١) Gathe: گاثە: بەزەندیی: (وقت)ی عەرەبی ئەگرێتەوە، پاشان بووە بە(کات)، ئینجا بە(سات)، (ساعە)ی عەرەبی کە مانای ژماردنی (کات)ە، هەر لەمەوە وەرگیراوە، چونکی لە کوردیا لە بریتی: (ساعە) ئەڵێن (سەعات) یاخود (سات).

(٢) کوردی ژوورو بە(جمعە) ئەڵێن (هەینی) یاخود (ئین).

(٣) موسم (وەرز. ا. ب)

## (VERBS (باس)[1])

Absorb (مژیین)ە[2]

Call (بانگ کردن)ە، Boil (کوڵان)

Add بۆ (خستنەسەر)، Advance پێشکەوتن

Arrest (گرتن)ە، Agree رێککەوتن

Acqure, Gain بۆ (دەستکەوتن)ە

Alter (گۆڕین)ە، Bury (ناشتن)ە

Bow نوشتانەوە، Borrow قرض کردن

Command فەرماندان، Crush وردکردن

Accumulate یش بۆ (کۆکردنەوە)

Count ژماردن، Cover شاردنەوە[3]

Accompany بۆ (هاودەمی کردن)

Cowpare (with)یش بۆ (بەر ئاوردکردن)ە

Bathe بۆ (خوشتن)، Blaze گڕگرتن

cheat خەڵەتاندن، Close داخستن

Alarm ترساندن، Cry up هەڵدان[4]

Dye (ڕەنگکردن)ە، Corrupt تێکدان

Cure, Heal هەردو: بۆ (چاکبوونەوە)

Fear (ترسان)ە، Stay مانەوە

Cook (چێشت لێنان)ە، Capturo (گرتن)

Connect withیش بۆ (پێوەبەستن)ە

Conduct, Lead بۆ (رێ پیشاندان)ە

Damage بەکوردی (زیان لێدان)ە

To beat بەزاندن، Cross تێپەڕبوون

---

(١) لە دەستـــوورەکـەی تۆفـیـق وەهبی بەگـدا لە بریتی (فـعل) دانراوە، (باس) لە (بحث)ی عـەرەبییـەوە وەرنەگیراوە.

(٢) هەر وشەیە (To)ی بخەیتە سەر مانای کوردییەکەی ئەگرێتەوە وەکو To Absorb: مژیین.

(٣) داپۆشین، پاراستن (ا. ب)

(٤) مدح: (پیاهەڵدان. ستایش. ا. ب)

Defeat شکاندن، Unite بۆ (یەکبوون)
Coudescend لە بۆ (واز لێ هێنان)ە
Depart کۆچ کردن، Guess (هەڵهێنان)
Delay دواخستن، Bribe بەرتیل دان
Heat گەرم کردن، Swallow قوت دان
Invent داهێنان، Lift بەرز کردنەوە
Grill برژاندن، Open کردنەوە
Follow دواکەوتن، Knock لە دەرگادان
Patch پینەکردن، Slip خلیسکان
Tease تووڕە کردن، Pour (ڕشتن)ە
Swell (ئاوسان)ە، Rub (لێک خستن)ە
Shave تاشین، Scold سەرزەنشت کردن
Roll خولانەوە، Err هەڵەکردن[1]
Wish (ویستن)ە، Weigh کێشان
Wager (گرەو کردن)ە،
Yield (خۆهاویشتنە لا)یە[2]
Wait یش (ئارام گرتن)ە،[3]
Debide (دابەش کردن)ە، Extinguish کوژاندنەوە
Excite (وروژاندن)ە، Distinguish جیا کردنەوە
Accept (قبول کردن)ە، Dislike حەز لێ نەکردن
Believe (باوەڕ کردن)ە، Disgrace ئابڕووبردن
Disperse بڵاو کردنەوە، Free (ئازاد کردن)ە
Squeeze بەکوردی: گوشین، Pick up بۆ (هەڵگرتنەوە)
Yawn لە بۆ (باوێشک دان)، Consult (پرس پێ کردن)ە
Whisper لە بۆ (چرپە چرپ)، Complete (تەواوکردن)ە

---

(١) غلط کردن.
(٢) تسلیم بوون.
(٣) چاوەڕوانی، دواخستنی کارێک (ا. ب)

## (NUMBERS ژماره)

One یەک، Two دوو

Three سێ، Blow فوو

Four چوار، Five پەنج

Six شەش، Labour ڕەنج

Seven حەوت، Eight هەشت

Nine نۆ، Basin تەشت

Ten دە، Twenty بیست

Thirty سی، لیستە List

Fourty چل، Sixty شەست

Fifty پەنجا، ژەنگ Rust

Seventy حەفتا، Hundred سەد

Eighty هەشتا، Ninty نەوەد

Eleven یانزەیە، Twelf دوانزەیە

Fourteen چواردەیە، Thirteen سیانزەیە

Sixteen شانزە، Seventeen حەڤدە

Fiffteen پانزە، Eighteen یش (هەژدە)

Ninteen نۆزدە، Thousand (هەزار)ە

Million بۆ (ملیون)، Burden بۆ (بار)ە(*)

Seventh (حەوتەم)ە، Second (دووهەم)ە

Twelfth دوانزەهەم، Third بۆ (سێ هەم)ە

Once بۆ (جارێک)ە، Twice بۆ (دووجار)

Double دووهێندە، Thrice بۆ (سێ جار)

Dozen دەستەیە، Fair (جووتێک)ە

Afourth چارەکێک، Third بۆ (سێ یەک)ە

First بۆ (یەکەمین)، Thirty one سی و یەک

Score (بیست دانە)، One by one یەک یەک

Single (تەنیا)یە (صفر) zeroo یە

**Fingle** وردە، **Rag** یش (پەڕۆ)یە

---

(*) کۆڵ و بار، قورسایی سەر شان (ا. ب)

## (PRONOUNS AND OTHER ARTCIES بۆ ناو[1] و پیتەکانی تر)

I من، You تۆ

He ئەو،[2] You بۆ

We مە،[3] You ئێوە

ئەوان: They، And وە

No نە،، Yes ئا

With لەگەڵ، So وا

How چۆن؟، لەسەر: On

Why بۆ؟، کەس[4] None

At لەسەر، For بۆ

His هی ئەو،[5] Yours هی تۆ

هی من Mine، حەلی When

بام بێن come Let them

What چی؟، That کە

مەی کە Don't do it

Is هەیە، Are هەن[6]

بۆ (کەن)[7] Which, that

There لەوێ، Here لێرە

Since لەوساوە، کوێ؟ (Where)

ئەمە This ، ئەوە That

These ئەمانە، کام ؟What [8]

---

(١) ضمیر بەکوردی (بۆ ناو)ی پێ ئەڵێن.

(٢) بۆ ژن ئەڵێن she.

(٣) مە: ئێمە.

(٤) هیچ کەس،

(٥) بۆ ژن: Her.

(٦)Was هەبوو، Were هەبوون.

(٧) That بۆ پیاو، Which بۆ گیانلەبەر و دار و بەرد بەکار ئەهێنرێ.

(٨) وەکو: کام شت؟

About له بابەت، After له پاشا
Also هەروەها، Atfirst له پێشا
Above لەسەروو، Again هەمیسان
Ago لەمەوپێش، Between له نێوان
All (گشت) یان (هەموو)، Aside بەتەنیا
Always هەمیشە، Behind لەدوا
Anew سەرلەنوێ، Against بەرامبەر
Beford له بەردەم، If یش بۆ (ئەگەر)
As وەکو، Besides (ئەوەی لێ دەچێ)
Below ژێر، له خوار، But بەلام، وەلێ
Already ئێستا، (له پێش پێی تۆ دا)
Although ئەگەرچی، Inside له ناوا
Away (له دوور)، Nothing هیچ نییە
At Iength, At Iat بۆ (دوایی)یە
Altogether گشتی، هەمووی، سەرتاپا
At Once کوتوپڕ، Till, Until هەتا
Round دەوروپشت، At Ieast لای کەمی
Some هەندێ، کەمی، Because له بەرئی
Beside لا، له کن، Beyond له ژووروو
Both هەردوو، By بە، Towards بەرەوڕوو
بۆی هەیە Perhaps ، Possibly ڕەنگە
Quickly خێرا، Sound بۆ (دەنگ)ە
Some times جارجار، Save جگە لەوە
Outside بەدەر، Since لەوساکەوە
From لە، Henceforth له ئێستاکەوە
Instead of یش (له جیاتی ئەوە)
Much زۆر More، (زۆریی) یاخود (زۆرتر)ە
(هەرگیز) بۆ Never، Least بۆ (کەمتر)ە
Too دیسانەوە، Near (نزیک)ە
Off له دوور Often، بۆ (چەند جارێک)ە

Down خوار، Underneath, Under له ژێر

Upward بەرەو ژوور، Hero بۆ (دلێر)

Yes بەڵێ، هێشتا Without, Yet بێجگە

Time (حەل) یان (کات)، Place بۆ (جێگە)

Carelessly بەبێ پەروا، Cowardly بەشێتانە

Certainly بەبێ گومان، Kindly برایانە

Amialy بەنازکی

Surely بەڕاستی

Barely بەرەنج، بەئەرک

Boldly بەبێ باکی

Scarcely بەگرانی

Slowly بەهێواشی

Entirely بەکۆمەڵە

Easily بەئاسانی

***

Apparentiy وەکو دیارە

Annually هەموو ساڵێ

Bustly بەرەنجی شان

Active (تەوانا) و (بەکار)ە

***

Vainly بەخۆڕایی

Urgently بەخێرایی

Usually بەپێی ڕەوشت

Entirely بەتەواوی

***

FERHENGOK

# AVOCABULARY
# of
# ENGLISH- KURDISH and KURDISH- ENGLISH

By

FATTAH SHAKIR

Rowanduz zarikirmanji 1934

## نووسینی بەلاتینی

-٥-هەوڵدانێکی شاکر فەتاحە بۆ نووسین بەپیتە لاتینییەکان.

لێرەدا چیرۆکی (شوغاڵی چەپخوون)ی تایبەت بەمناڵانی گۆڕیوەتە سەر ئەو جۆرە نووسینە.

Çîroq bo minalan
jimare: 7

ŞUXALÎ
çepxûn.

Danerî:
Qamil Ceylanî

Qurdî nûsî:
Şaqir Fettah.

[illegible]

Suleymanî

(١)

OURÊQÎ
çepxûn.
1. Şuẍal.

Şuẍal qurê qi çepxûn, yeqar çepxûn bu. Qurê qi dil-pîs, yeqar dil-pîs bu.
Male weş ...yan le Şuẍal ne eqird, çunqi yeqar

(٢)

Çepxûn, yeqar dilpîs bu.

ÇEPELÎ i ŞUẌAL.
2.

Şuẍal qurê qi çepel bu, zoriş çepel bu, çunqi beyaniyan dem u çaw i ne deşit.
Mês i şi eqirt u eyquşt.

(٣)

yayê azar i eda, lêi eda, u eyquşt. Ciye le we heq gian-le-ber ê qi beseymanî şi ber-dest biqewtaye azar i eda.
Îcû balinde beseymane qan î şi equşt u ... qan i eşqandin.

(٤)

bu. Lwa i lê hatibu nay
etwanî rast bibêtewe, her
ebû le cêga qe ya bi-
mênêtewe. Êş u azar i
nexoşî ye qeşi wa i
dil-teng girdibû: le tawa
desti eqird be giryan.
Belam sege qe. ra i
eqird. yarî i eqird, le
ser mêze qe i Şuẍal iş

(٩)

nebwaye nan i ne e-
xward.

Şuẍal

# PEŞÎMANEBÊWE

— 9 —

Ewr i pê çû ta Şu-
ẍal çaq bu we we.
Şuẍal iş le bîr i neçu-
bu we we qe sego qe i

(١٠)

Çî i be ser hêna bû.
Îtir lew roje we Şu-
ẍal i çepxîn qurêqi
jîr i dil-nerm i baş
i lê hate dere we.
Îtir lew roje we Şu-
ẍal le qes i ne eda,
azar i hîç gian le
ber ê qîş i ne eda.

(١١)

a b c ç d e f g
h (ḧ) i î ê j k l m
n o p q r s ş
t u û v w x (ẍ)
y z

Bilaw bûn e way am nûsîne
le Qurdistan da, rahaŷi gawa
ye bo bilaw girdinawy zaniet.

(١٢)

# نرخى ويژەيى -١-

بۆ پۆلى سێهەمى زانستگاى

وێژە «بەشى كوردى»

وەرگر و وەرگێڕى

شاكر فتاح

١٩٦٣-١٩٦٢

## هۆنراوەى كوردى

بەرهەمى وێژەيى بريتييە لە دوو شت:

١- هۆنراوە

٢- پەخشان

لەوێژەى كۆنى كورديدا پەخشان زۆر كەم نووسراوەتەوە.

لە برانەوەى سەدەى نۆزدەهەمەوە، پەخشان دەستى كردووە بەگەشەكردن، بەلام (هۆنراوەى هونەرى : الشعر الفني) سەرەتاى دەست پێكردنى ئەگەڕێتەوە بۆ هەزار ساڵ لەمەوبەر، كە لە شێوەى كرمانجيدا (عەلى تەرموكى)، لە شێوەى (گۆران: هەورامى)شدا (بابەتاهيرى هەمەدانى) هۆنراوەيان بۆ نووسيوينەتەوە. بڕواش وايە كە (هۆنراوەى فۆلكلۆر) كە بەهۆنراوەيەكى هونەرى ناژمێررێ، لە هۆنراوەى هونەريى ناوبراو كۆنترين.

ئينجا لەبەر ئەو بايەخەى (هۆنراوە) لە مێژووى وێژەكەماندا هەيەتى، هەمديسان لەبەر ئەو جێگا زۆرەى لەناو بەرهەمى وێژەييماندا داگيرى كردووە، پێويستە لێكۆڵينەوە لە هۆنراوەدا پێشبخەين، بايەخى گەورەتريشى پێ بدەين.

پێشينان، ناونيشانى هۆنراوەيان بە(كێشى) و سەروا (قافية) هەڵداوە. گوتوويانە: «هۆنراوە ئەو وتانەيە كە كێش و سەروايان هەيە». بەم پێيە، ئەبێ فەرهەنگەكەى شێخ مەعروفى نۆديى كە ناوى (ئەحمەدى)يە بەهۆنراوە دابنرێ. ئاشكرايە ئەمە قسەى هەڵبەستراوە، نەك هۆنراوەى ڕاستەقينە.

هۆنراوەى ڕاستەقينە سەرەڕاى هۆنينەوەى وشەكانى ئەبێ ئەم كەرەستانەشى تيابێ، ئەگينا بەهۆنراوەى هونەرى دانانرێ: (سۆز، بير، ئەنديشە و ساز و ئاواز).

پێشينان كە وەك سەرەوە لە هۆنراوە دواون، تەنيا سەرنجيان لە ديمەنى دەرەوەى هۆنراوە داوە. تەماشاى كەرەستەكانى ترى هۆنراوەيان نەكردووە، وەك : (سۆز، بير و ئەنديشە).

هەروەها ئەگەر پەخشانێکیش پڕ بێ لە کەرەستەکانی هونەر وەک: (سۆز، بیر و ئەندێشە) پێی نابێژرێ هۆنراوە، پێی ئەبێژرێ (پەخشانی هونەری: النثر الفني)، پێی نابێژرێ (هۆنراوە)، چونکی کەرەستەی ساز و ئاوازی تیا نییە وەک: (کێش و سەروا ڕێکوپێکی وشەکان و ناسکی و ئاوداریان) کە گرنگترین کەرەستەی هونەرین بۆ هۆنراوەی ڕاستەقینە.

کەواتە پێش ئەمەی لە (نرخی وێژەیی: النقد الأدبي)ی هۆنراوەوە بدوێین، بام هەندێ لە کێشی هۆنراوەی کوردییەوە بدوێین، ئینجا لە سەروای هۆنراوەی کوردییەوە.

## کێش: الوزن

* کێش لە هۆنراوەی بێگانەدا: لە هەموو زبانەکانی جیهاندا هۆنراوە هەیە، هەر زبانەش بەپێی سروشتی تایبەتی خۆی، جۆرە ساز و ئاوازێکی هەیە؛ جیاوازە لە ساز و ئاوازی هونەری پەخشان. ساز و ئاوازی هۆنراوە (کێش: وزن)ی پێ ئەڵێن.

کێشی هۆنراوە، لە زبانە پێشکەوتووەکانی جیهاندا، لەسەر بنچینەیەک دامەزراوە، ئەو بنچینەیەش ئەوەیە کە وشەکان، دەنگەکانیان، دەستەکراون، لەناو ئەم دەستە و ئەو دەستەدا پشوویەک ئەدرێ؛ ئەم دەنگە دەستە دەستە کراوانە پێیان ئەڵێن: (پێ: Foot: تفعیلة)، بەواتایەکی تر لە چەند برگە (مقطع)ێکی دەنگ (پێی هۆنراوە: تفعیلة الشعر) پەیدا ئەبێ. ئەمەش لە هەموو زمانێکا وەک یەک نییە، بەڵکو جۆێ جۆییە، هەر زبانە پێی تایبەتی خۆی هەیە لە هۆنراوەکانیدا، جیاوازە لەوانی تر.

### پێی هۆنراوە لە زبانی یۆنانیدا:

لە هۆنراوەکانی زبانی یۆنانی کۆنی لاتینیدا، بایەخیان داوە بەکورتی و درێژی برگەکان، بۆ ئەمەی (پێی هۆنراوە)یان لێ دروست بکەن. لە یەک پێدا: دوو برگەی درێژ، یاخود برگەیەکی درێژ و دوو برگەی کورت، یاخود دوو برگەی کورت و برگەیەکی درێژیان کۆکردۆتەوە.

چەند پێیەکی ئاوەهایان لە دێڕێکا ڕیز کردووە؛ لەمانە جۆرە کێشێکی هۆنراوەیان بۆ خۆیان داهێناوە. پێوانەی درێژی و کورتی برگەشیان لەسەر ئەم شێوازە داناوە:

١- برگەی درێژ: المقطع الطويل:

أ- یان لە پیتێکی مات (حرف صامت) و پیتێکی بزێوی درێژ (حرف متحرك طويل) پەیدا ئەبێ، وەک: ژا، ژوو، ژیی.

ب- یاخود لە دوو پیتی مات و پیتێکی بزێو لە ناوەڕاستی هەردووکیاندا پەیدا ئەبێ، وەک: باز، بەز، ڕیز، تۆز. لێرەدا پیتە بزێوەکە کورت بێ یان درێژ مەبەس نییە.

جـ- یاخود لە پیتێکی مات و پیتێکی بزێو و دوو پیتی مات پەیدا ئەبێ، وەک: بەرز، ئارد، ماست.

د- یاخود لە پیتێکی مات و پیتێکی بزێوی کورت و پیتێکی (لێکدراو: مرکب) پەیدا ئەبێ، وەک: جە-نگ، ڕە-نگ، پە-نگ.

٢- برگەی کورت:

برگەی کورتیش لە پیتێکی مات و پیتێکی بزێوی کورت پێک دێ. وەک: بە، لە، وە.

وشەی (پەڵە): بریتییە لە دوو برگەی کورت: یەکێکیان (پە) یەکێکیشیان (ڵە). هەروەها وشەکانی: خەلە، تەڵەییتی.

**هۆنراوە لە زبانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و روسیدا:**

لەم سێ زبانەدا، پێی هۆنراوە، لەسەر بنچینەی کورتی و درێژی برگە دروست ناکرێ، لەسەر بنچینەی (سووکی) و (گرانی)ی برگە دروست ئەکرێ؛ لەم سێ زبانەدا، قورساییەکی قسە هەیە، ئەخرێتە سەر کەرتێکی دیاریکراوی وشەیەک لە وشەکانی، پێی ئەڵێن:

(لەنگەر: إرتكاز: تەکیە: ئەکسەنت)[1].

لە کێشی ئەم زبانانەدا (برگەی لەنگەردا: المقطع الأرتكازي) جێگەی برگەی درێژ ئەگرێتەوە. هەروەک برگەی (بێ لەنگەر)یش جێگەی برگەی کورت ئەگرێتەوە.

لە ئینگلیزیدا چوار جۆر کێشی هۆنراوە هەیە، (پێ)یەکانیان بەم جۆرەی خوارەوە لە برگەی (سووک) و برگەی (گران) دروست ئەکرێن:

١- برگەی گران + برگەی سووک

٢- برگەی سووک + برگەی گران

٣- برگەی گران + برگەی سووک + برگەی سووک

٤- برگەی سووک + برگەی سووک + برگەی گران

**پێی هۆنراوە لە زمانی فەرەنسیدا:**

جۆرێکی تر لە کێشەکانی هۆنراوە لە زبانی فەرەنسیدا بەرچاو ئەکەوێ.

فەرەنسی هەرچەندە لە بنچینەدا ئەچێتەوە سەر زبانی لاتینی، بەڵام چونکە زۆر گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە ڕووی (پێی هۆنراوە)وە لە زبانی لاتینی جیابۆتەوە، لە پێوانەدا برگەکانی زبانی فەرەنسی لە یەکتری نزیک بوونەتەوە، هەروەها (لەنگەری دەنگ)یشیان لەسەر لاچووە، لەبەر ئەوە کێشی هۆنراوە، لە زبانی فەرەنسیدا، لەسەر ساز و ئاوازێکی تریەدار (إيقاعي) ناڕوات، وەک زبانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و ڕووسی. بەڵکو لەسەر ساز و ئاوازێکی خاوتر و ڕەووانتر ئەڕوا.

بەواتایەکی تر، لە زبانی فەرەنسیدا (کێشی هۆنراوە) لەسەر بنچینەی (درێژی و کورتی)ی برگە، یاخود لەسەر بنچینەی (سووکی) و (گرانی)ی برگە دانەمەزراوە. بەڵکو لەسەر (ژمارەی برگە) دامەزراوە، بێ ئەمەی تەماشای درێژی و کورتیی برگەکان بکرێ.

---

(١) ئەم زاراوانە بەپێی ڕیزکردنەکەیان سەربەزمانی: (کوردی، عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی)ن.

بۆ وێنە: لە کێشی (ئەسکەندەری)دا کە کێشێکی تایبەتی هۆنراوەی زمانی فەرەنسزیە، (١٢) برگە هەیە. هەر سێ برگەی خراوەتە (پێ)یەکەوە، واتا چوار پێ، کە ئەکاتە دووانزە برگە ئەکەوێتە دێرە هۆنراوەیەکەوە، ئەوەندە هەیە، بۆ ئەمەی جۆرە ترپە (إیقاع)یەکی سووکەڵە لە ساز و ئاوازی (هۆنراوە)کەدا پەیدا ببێ، لەنگەرێکی دەنگ (الارتکاز الصوتی) ئەخرێتە سەر (دوابرگە)ی هەموو (پێ) یەکو هەموو (دوا برگە)ی (دێرە هۆنراوە) یەک.

ئەم لەنگەرە (لەنگەری هۆنراوە)ی پێ ئەڵێن، بەڵام جیاوازە لەو لەنگەرەی کە لە هەندێ زماندا ئەخرێتە سەر برگەی ناو وشە. سەیرکەن ئەمە دێرێکی هۆنراوەی ئەسکەندەرییە، پێیەکان و برگەکانی وا دروست ئەکرێن:

| پێ (١) | | | پێ (٢) | | | پێ (٣) | | | پێ (٤) | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| برگە | برگە | برگە | برگە | برگە | برگە | برگە | برگە | برگە | برگە | برگە | برگە |
| ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢ | ٣ |
| | | لەنگەر (١) | | | لەنگەر (٢) | | | لەنگەر (٣) | | | لەنگەر (٤) |

دێرەکە بریتیە لە: ٤ پێ

١٢ برگە

٤ لەنگەر

*** کێشی هۆنراوە لە زمانی کوردیدا:**

لە هۆنراوەی تازەی زمانی کوردیدا دوو ڕێچکەی جیاوازی کێشی هەیە:

١- ئەو بوێژانەی لەسەری ئەڕۆن کە پەیڕەویی بوێژە کۆنەکانمان ئەکەن کە لە سەردەمی زۆر کۆنەوە لە ڕێگای وێژەی فارسییەوە هەندێ دەریایان لە کێشی (عروض)ی عەرەبی وەرگرتووە.

کێشی عەرەبی، وەک زاناکانی عەرەب و ڕۆژهەڵاتناسەکان ئەڵێن لەسەر بنچینەی (درێژی و کورتی برگە) دروست بووە؛ واتا وەک کێشی هۆنراوەی زمانی یۆنانی کۆن و لاتینی وایە.

٢- ڕێچکەی بوێژە تازەکانمان کە لەسەر بنچینەی (ژمارەی برگە) ئەڕوا، بێ ئەمەی تەماشای درێژی و کورتی برگەکان بکرێ، واتا وەک کێشی هۆنراوەی زمانی فەرەنسزی وایە.

هۆی گرتنی ئەم ڕێچکەیەش، پەرەسەندن بەهێز بوونی گیانی کوردایەتی بوو لەناو ڕۆشنبیرەکانی کورددا. بوێژەکانمان گەڕان بەدوای کێشی تایبەتی نەتەوەیی کوردا، لەم پێناوەدا ڕەنجیاندا، تەقەلایاندا، دوایی ئەو کێشەیان دۆزیەوە.

لەمەدا فۆلکلۆر: وێژەی نەتەوەییە ڕەنگینەکەی گەلی کورد لە لایەکەوە، کێشە (دەبرگەیی)یەکەی

هۆنراوەی (شێوەی گۆران: هەورامی)ش لەلایەکی ترەوە، لەگەڵ هونەرە بەرزە جوانەکەی (مەولەوی)، یاریدەیەکی زۆری ئەو بوێژانیەدا، بۆ گەیشتن بەئامانجەکەیان، لە چاو نالەباری کارەساتی جیهاندا، لە ماوەیەکی چل پەنجا ساڵی کەما، توانیان بەدوو ئەنجامی زۆر گرنگ بگەن:

١- چەند جۆرێکی کێشی نەتەوەیی ڕەسەن بۆ هۆنراوەی کوردی دۆزرایەوە.

٢- بەلێکدانی (پێ)یەکانی ئەو کێشانەش، چەند جۆرە کێشێکی تازە داهاتوو هێنرایە کایەوە.

بەم ڕەنگە لەسەر بنچینەی کۆنی کێشی کوردی، دووەم جۆری کێشی هۆنراوەی کوردی دامەزرا، کە ئەتوانین ناوی بنێین (کێشی بڕگەیی).

*** زبانی کوردی و کێشی بڕگەیی:**

بۆ ئەمەی ڕادەی پەیوەندی کێشی بڕگەیی بەهۆنراوەی کوردییەوە تێ بگەن، پێویستە سەرنج بدەینە دوو شت:

١- سەرنج بدەینە ئەو بەرهەمەی کە ئێستا لە وێژەی شێوەی (گۆران) و فۆلکلۆری نەتەوەییدا بەدەستەوەیە.

٢- سەرنج بدەینە ئەو سەرچاوە کۆنانەی کە زبان و وێژەی کوردی ئێستایان لێ پەیدا بووە.

وێژەی (گۆران: هەورامی) کە لەناو کوردی عێراقدا لقی (هەورامی)یان زۆرتر ناسراوە، تاقە کێشێکی هەیە کە هی هۆنراوەی هونەریشە و هی هۆنراوەی نەتەوەییش (فۆلکلۆر).

ئەم کێشە کە ناسراوە بە(کێشی دە بڕگەیی) = ٥ + ٥، ئەم کێشە، کێشی هۆنراوەی نەتەوەیی هەموو شێوە کوردیەکانە. هۆنراوە هونەرییەکانی (مەولەوی) و هەموو بوێژەکانی تری شێوەی (گۆران) لەسەر ئەم کێشە هۆنراونەتەوە، لەم ڕووەوە بام لێکۆڵینەوەیەک لەم هۆنراوە (گۆران)یەدا بکەین:

چۆن دیوانەی شـــۆر// ئازیز نەســـەردا
شەتاو سەرهۆر گرت // وە دەشـتـو دەردا

ئەگەر بەدەنگێکی بەرز ئەم دوو دێڕە بخوێنینەوە، بۆمان دەرئەکەوێ کە (لەنگەر: إرتكاز)ێک ئەکەوێتە سەر وشەی (شۆر) لە دێڕی یەکەم و سەر وشەی (گرت) لە دێڕی دووەمدا، دوابەدوای ئەو دوو لەنگەرەش دوو جار پشوودان، لە خوێندنەوەدا ڕوو ئەدا، دیسانەوە ئەو لەنگەر و پشوودانە لە بڕانەوەی هەردوو دێڕەکانیشا ڕوو ئەدا. واتا، دوابەدوای وشەکانی (سە-دا) و (دە- دا) هەستیان پێ ئەکرێ.

ئەم شوێنی پشوودانانە، شوێنی دیاریکردنی (پێ)یەکانی هۆنراوەکەن.

دێڕی یەکەم لە دوو پێ پێکهاتووە، پێی یەکەم (چون دیوانەی شۆر)، پێی دووەم (ئازیز نەسەردا).

دێڕی دووەمیش، هەروەها لە دوو پێ دروست بووە: پێی یەکەم (شەتاو سەر هۆر گرت)، پێی دووەم (وە دەشت و دەردا).

ئەم هۆنراوەیە لە دوو دێڕە، هەر دێڕەی بریتییە لە دوو پێ، هەر پێیەی بریتییە لە پێنج بڕگە؛ کەواتە

هەر دێڕەی بریتییە لە (دە برگە). بەواتایەکی تر، کێشی ئەم هۆنراوەیە (دەبرگەیی)یە.

لێرەدا هەمیسان بۆمان دەرئەکەوێ کە گوێ نەدراوەتە (کورتی) و (درێژی)ی برگەکان کە ڕیزکراون لەناو پێیەکاندا.

هەروەکو دەرئەکەوێ، (یەکەم پێ) لەم هۆنراوەیەدا لە پێنج برگەی درێژ پێک هاتووە، برگەی کورتی هیچ تێ نەکەوتووە.

چۆن دێـوانەی شـــــۆر// ئازیز نەســـــەردا

١٠ ٩ ٨ ٧ ٦ ٥ ٤ ٣ ٢ ١

شـــەتاو ســـەر هۆر گـرت // وە دەشـــتـــو دەردا

١٠ ٩ ٨ ٧ ٦ ٥ ٤ ٣ ٢ ١

کەچی بەرامبەر بەو، لە دێڕی دووەما، (پێ)ی یەکەم برگەی یەکەمی کورتە، چوار برگەکانی تریشی درێژن.

هەروەها لە دێڕی یەکەما، (پێ)ی دووەم تەنیا برگەی سێهەمی کورتە، چوارەکەی تر درێژن. کەچی بەرامبەر بەو لە دێڕی دووەما، پێی دووەم جگە لە برگەی سێیەم، برگەی یەکەمیشی هەر کورتە.

هەروەها ئەبینین کە لە دێڕی یەکەما تەنیا یەک برگەی کورت هەیە کەچی لە دێڕی دووەما سێ برگەی کورت هەیە.

هەر لەم جۆرە کێشی دە برگەییە، گەلێ هۆنراوەی تریشمان بەرچاو ئەکەوێ، کە جیاوازی ڕوونەدا لە ناوەند ژمارەی برگەی کورت و برگەی درێژ لەناو پێیەکاندا. هەروەها جیاوازی ڕوونەدا لە ناوەند جێگای برگەی کورت و درێژدا لەناو ڕیزە برگەی دوو پێی بەرامبەردا.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەروەکو فـۆلکلۆری (شـێـوەی گـۆران) ئەگـرێتـەوە، هەروەها فـولکلۆری هەمـوو شێوەکانی تری زمانی کوردی ئەگرێتەوە، لە کێشی دە برگەیی و هەموو جۆرە کێشەکانی تردا.

لەپاش کێشی دەبرگەیی، کێشی هەشت برگەیی (٤ + ٤) و حەوت برگەیی (٤ + ٣) لە فۆلکلۆری کوردیدا باون، لێکۆڵینەوەکەی سەرەوە ئەم دوو کێشەش ئەگرێتەوە، بەڵام کێشی (حەیران) و (لاوک) پێویستـە لەم لێکۆڵینەوەیە بەدەرکەین. بۆ ئەمەی لە دوارۆژدا بەتایبەتی لەلایەن شارەزایانی شێـوەی کرمانجییەوە، لێیان بکۆڵرێتەوە، بۆی هەیە (لەنگەر) جێگایەکی گرنگی گرتبێ لە ساز و ئاوازیاندا.

## ئاوڕێک بۆ پاشەوە

ئێستا، لای ڕۆژهەڵاتناسەکان، گومان نەماوە کە زمانی کوردی یەکێکە لە خێزانە زبانەکانی ڕەگەزی ئاری و لە زبانی فارسی ئێستا کۆنترە. تەنانەت ئەوانەی لە شێوەکانی زبانی کوردی شارەزاترن، باوەڕیان بۆ ئەوە ئەچێ کە زبانی کوردی لە بابەتی خزمایەتیدا لەگەڵ شێـوە زبانەکانی (پەهلەوی) پەیوەندیی لە (فارسی) بەهێزترە.

هەروەها بەرامبەر بەزبانە کۆنەکانی پێش (پەهلەوی)ش، هیچ نەبێ، ئەوەندەی زبانی فارسی ئێستا مافی هەیە خزمایەتی و نزیکی خۆی بنوێنێ.

جا لەبەر ئەوەی ئێمە سامانی وێژەیی زۆر کۆنی کوردیمان لە بەردەستدا نییە، مافمان هەیە، بۆ لێکۆڵینەوە، سەیری سامانی وێژەیی زبانە کۆنەکانی ئێران بکەین؛ تا بەهۆی ئەمەوە چۆنیەتی کێشی هۆنراوەی کوردیمان بۆ دەرکەوێ.

خۆش بەختانە، لەو زبانە کۆنانەی ئێران، دوو زبانیان کۆمەڵێک هەڵبەستیان لەپاش بەجێ ماوە:

١- زبانی پەهلەوی، بەهەموو شێوە ناسراوەکانییەوە.

٢- ئەو شێوەی زبانەیەکە لە نووسراوی (ئاڤێستا)دا بەشی (گاتەکان)ی پێ نووسراوەتەوە.

لە سایەی ڕەنج و تێکۆشینی ڕۆژهەڵاتناسە پسپۆڕەکانەوە کە لەم دوو زبانەدا داویانە، ڕێگای لێکۆڵینەوەی ئێمە بۆ ئەوەی (کێشی کوردی) بدۆزینەوە، سووک و ئاسان بووە.

## هۆنراوەکانی ئاڤێستا

بەزبانی ئاڤێستا، وشەی (گات) واتاکەی (سرود) یاخود (گۆرانی)یە. (چس تشتی) واتای (هۆنراوە) ئەگرێتەوە، (ئەفسمەن): جووت دێڕی هۆنراوە، (وچ): واژە: وشە ئەگرێتەوە.

جا پسپۆڕەکانی (ئاڤێستا) دەستووری هۆنینەوەی هەر پێنج بەشەکەی (گاتەکان) یان بەم جۆرە دۆزیوەتەوە:

١- بەشی (ئاهو نەڤایتی)یە کە بەپەهلەوی (ئەهنوتگات)ی پێ ئەڵێن. ئەم بەشە بریتییە لە هۆنراوەیەک لەسەر کێشی (١٦) برگەیی: (٧ + ٩)، ئەم بەشە بریتییە لە حەوت (ها: فصل: کەرت)

٢- بەشی (ئۆشتا ڤایتی)یە کە بەپەهلەوی (ئۆشتۆگات)ی پێ ئەڵێن. ئەم بەشەش بریتییە لە پێنج (ها: فصل: کەرت) لەسەر کێشی (١١) برگەیی: (٤ + ٧).

٣- بەشی (سپنیتا مینیو)یە کە بەپەهلەوی (سپند مزگات)ی پێ ئەڵێن. بریتییە لە هۆنراوەیەک چوار (ها: فصل: کەرت)ە، ئەمیش لەسەر کێشی (١١) برگەییە: (٤ + ٧) وەستان یاخود لەنگەر لەپاش برگەی چوارەمە.

٤- بەشی (ڤۆهۆغ شاترا)یە کە بریتییە لە هۆنراوەیەکی یەک (ها: فصل: کەرت)ی لەسەر کێشی چواردە برگەییە: (٧ + ٧) وەستان یاخود لەنگەر لەپاش برگەی حەوتەمەکە لە ناوەڕاستایە. لەم بەشەدا، هەر سێ دێڕە هۆنراوەیە سەروا (قافیة)یەکی هەیە.

٥- بەشی (ڤاهیشتۆ هیشتای)یە، کە بریتییە لە هۆنراوەیەکی یەک (ها: فصل: کەرت)ی، لەسەر کێشی (١٩) برگەیی: (٧ + ٧ + ٥). وەستان لە پاش برگەی حەوتەم و برگەی چواردەهەم.

## سەرنجێک لە گاتەکانی زەردەشت

١- وەک ئەبینین، کێشی هۆنراوە، لەم گاتانەدا چوار جۆرە:

(١٦) برگەیی، (١١) برگەیی، (١٤) برگەیی، (١٩) برگەیی.

بەڵام بەناوی (یەشت)ەکانەوە بەشێکی تر لە (ئاڤێستا)دا هەیە. وەک نووسراوی (پاڕانەوە و نزا: صلوات و دعاء)ی زەردەشتی وایە. لەوەدا بەشی زۆری کێشی هۆنراوەکان (٨) برگەییە ناوبەناوێکیش کێشی (١٠) برگەیی و (١٢) برگەییان تیا ئەبینرێ.

٢- لە هەشت برگەییەکاندا، پشوودان، یاخود وەستان ئەکەوێتە ناوەڕاستەوە (٤ + ٤)ە، هەندێ جاریش ئەکەوێتە پاش برگەی سێیەم (٣ + ٥) یان برگەی پێنجەم (٥ + ٣) جارجارێکیش ئەکەوێتە پاش برگەی دووهەمەوە (٢ + ٦).

٣- کێشە (دە برگەیی)یەکان لە بارەی وەستانەوە دوو جۆرن؛ وەستان یان لە ناوەڕاستدا ئەبێ (٥ + ٥) یاخود لە پاش برگەی چوارەمەوە ئەبێ (٤ + ٦).

٤- بەڵام کێشە (١٢) برگەییەکان لە بابەت وەستانەوە چوار جۆرن، یا لە بابەت پشوودانەوە؛ وەستان یا لە پاش برگەی سێیەم دەست پێ ئەکات (٣ + ٩)، یان لە پاش برگەی چوارەم (٤ + ٨) یان لە پاش برگەی پێنجەم (٥ + ٧) یان لە پاش برگەی هەشتەم (٨ + ٤).

٥- لە هۆنراوەکانی (ئاڤێستا)دا، وەک پسپۆڕەکان دەریان خستووە، بنچینەی (کێش) لەسەر چۆن یەکی ژمارەی برگە بووە، جگە لەوەیش لە هەموو دێڕە هۆنراوەیەکدا ناوبەناو شوێنی وەستان یان پشوودان هەبووە، بەڵام بوێژ ئازاد بووە، بەپێی دڵی خۆی ئەو شوێن وەستانانە لەملا و لەولادا بگۆڕێ.

## هۆنراوەکانی زمانی پەهلەوی

لەبارەی وێژەی زبانی پەهلەوییەوە، ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ (کریستن سن) ئەڵێ: «ئەو کەسەی کە بۆ یەکەمجار هەستی بەهەبوونی هۆنراوە کرد لە زبانی پەهلەویدا (ئاندریاس) بوو، ئەم زانایە لە بەردە نووسراوەکانی (شاپوری یەکەم) لە (حاجی ئاباد)ی ئێرانەوە، توانی پەی بەرێ بەوە، کە ئەم یادگارەی زبانی پەهلەوییە، هی سەردەمی ساسانییەکانە و بریتییە لە هۆنراوەیەکی هەشت برگەیی یاخود حەوت برگەیی، تەنانەت جێگای لەنگەری ناو دێڕە هۆنراوەکانیشی تیا نیشانە کراوە».

جگە لەم بەردە نووسراوەی حاجی ئاباد لەناو دۆزراوەکانی (نورڤان)یشدا، لە تورکستانی ئاسیای ناوەڕاست، ژمارەیەک لە نووسراو و نووسینەکانی (مانی)یەکان کەوتە دەست زانا ڕۆژهەڵاتناسەکان.

لەناو ئەم نووسینانەدا گەلێ (سرود و پارچە هۆنراوە) کەوتە دەست هەرچی بەردە نووسراوی حاجی ئاباد بوو، بەئەلف و بێی پەهلەوی نووسرابووەوە کە پێی بزێوی تیا نییە.

لەبەر ئەوەش خوێندنەوەی دروست و تەواو بەم ئەلف و بێیە زۆر گرانە. بەڵام (پاش جێماو)ی مانییەکان بەئەلف و بێی ئاشوری نووسرابووەوە، جۆری ئاخافتنی بنجی وشەکانی گەلێک باشتر ئەدا بەدەستەوە.

ئەم دۆزینەوەیە یارمەتییەکی باشی پسپۆرەکانیدا لە لێکۆڵینەوەی بنج و بناوانی هۆنراوەی زبانی پەهلەویدا.

زانای فەرەنسزی (نیڤەنیست) زۆرتر لە هەموویان تیکۆشا بۆ دەرخستنی هۆنراوەی پەهلەوی و کۆڵینەوە لە چۆنیەتی هۆنینەوە و رێکخستنی... ئەم زانایە بۆ یەکەمجار لە بابەت دانراوەی (درەخت ئاسوریک)ەوە دەستی بەلێکۆڵینەوە کرد، ئەمە نامەیە کە بەزبانی پەهلەوی.

وا دەرئەکەوێ کە لە بنجینەدا بەزمانی (پەهلەوی ئەشکانی): (پارثییەکان) نووسرابێتەوە. بەلام لەپاشا لە سەردەمی (ساسانییەکاندا) دەستکاری کراوە و دەمێکی درێژی بەسەردا رۆیشتووە، (نیڤەنیست) لە ناوونیشانەی نامەکە و لەم واتەیەی کە بەدەم بزنەوە زوو زوو دووبارە ئەبووەوە:

(ئیوم ئەپەرتر هەچ تو درەخت ئاسوریک): واتاکەی: (هەم لەبەرتر لە تۆ درەختی ئاسوریک).

باوەڕی بۆ ئەوەی ئەچوو کە ئەم نامەیە سەرتاپا (هۆنراوە)بێ.

ئینجا لەم سەرەتایەوە کەوتە رێ. توانی بەشێکی زۆری واژەکانی نامەکە دابەش بکات بەسەر ژمارەیەک لە دێرە هۆنراوەکانی (۱۱) برگەییدا.

بەلام ئەمەی کاتێک بۆ کرا کە هەرچی وشە و واژەی تێ هەڵکێشی سەردەمی ساسانییەکان هەیە، بەپێی دەستووری پێوانەکانی زانستی (زباننناسی) هەمووی لە بنجی دەرهاوێشت. دیارە تا ئەمەی بۆ پێکهاتووە، رەنجێکی زۆری داوە، بەم رەنگە بنچینە (ئەشکانی)یەکەی لە وێنەی هۆنراوەیەکی درێژا پوختە کردووە و دەریخست.

لە پاش دوو ساڵ (بنڤەنیست) هەر ئەم رێبازەی لە نامەیەکی تری پەهلەویدا بەکار هێنا کە ناوی: (ئەیاتکار زریران) بوو نامەی سێهەم کە هەر ئەم رێبازەی بۆ گرت ناوی (جاماسب نامگ) بوو. لە نامەی (ئەیاتکار زریران)دا ئەم جوت دێرەی هۆنراوەیەش کە لە خوارەوە پیشان دەدرێ، وەک دێرە هۆنراوەکەی (درەخت ئاسوریک) لەسەر کێشی یانزە برگەیی دانراوە:

«زەمان ئوزو مەندتر هەچ هەردو دامان». واتاکەی: (زەمان و زەمەندتر لە هەردوو دنیا)

«زەمان هەنداچک ئوکاری داتستان». واتاکەی: (زەمان ئەندازەی بنکەکانی گشت شتان)

جگە لەم کێشە، لە هۆنراوەی (مانی)یەکانی (تورفان)دا کێشی (٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠) برگەییش هەیە. شارەزاکان، ئەم کێشە (١١) برگەییە، بەسەرچاوەی ئەو کێشە (عروض)یە دائەنێن کە (فیردەوسی) شاهنامەی پێ هۆنیوەتەوە: (دەریای موتەقاریبی هەشتی مقصود).

هەروەها بنڤەنیست لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیا، کە بەراوردێکی کێشی هۆنراوەی زمانە کۆنەکانی ئێران ئەکات لەگەڵ هی فۆلکلۆری (فارسی تازە). ئەنجامی قسەکەی ئەگەیەنێتەوە سەر (زمانی کوردی)ش، ئەگەرچی ئەویش وەک گەلێ کەسی تر بەهەڵەدا ئەچێ و شێوەکانی زبانی کوردی، لەگەڵ شێوە زبانێکی فارسیدا تێکەڵ ئەکا، وەک بیەوێ ئەمانیش بەشێوە زبانێکی فارسی دابنێت. بەلام بۆمانی روون ئەکاتەوە:

که (کێشی هۆنراوەی کوردی لەسەر بنچینەی برگەیی دامەزراوە، هیچ پەیوەندییەکی بەکورتی و درێژی برگەوە نییە) بنڤەنیست ئەڵێ: «یادگاری زەریران، هەروەک لە مێژووی وێژەی ئێرانیدا بووە بەهۆی پێکەوە بەستنی سەردەمی (ئاڤێستا) و سەردەمی (دەقیقی) و (فیردەوسی).

هەروەها لە بابەت ڕێبازی هۆنینەوەشەوە سنووری نیشانەکردووە لە ناوەند (کێشی هۆنراوەی ئاڤێستایی) و (کێشی هۆنراوەی فۆلکلۆری فارسیی تازە)دا. ناوونیشانی بنچینەیی و گرنگی ئەم سێ جۆرە کێشە: (کێشەکانی ئاڤێستایی) (پەهلەوی) (فولکلۆری فارسی)، ئەوەیە کە هەرسێکیان لەسەر بنچینەی (ژمارەی برگە) دامەزراون، نەک (چەند) و (چۆنی) برگە، هەروەها لە هۆنراوەی شێوە زیانەکانی (کوردی، گۆران، هەورامی، خۆراسانی)دا کێشەکان بریتین لە (ژمارەی برگە) نەک چەندیی و چۆنیی برگە.»

لە بارەی سەروا (قافیە)وە، بنڤەنیست سەرنجمان ڕائەکێشێ و ئەڵێ: «لە هەردوو نموونەی هۆنراوەکانی (یادگاری زەریران) و (پارچە هۆنراوەکانی تورڤان)دا زۆربەی پارچەکان پێنج خشتەکین، سەروای دێرەکانی یەکەم و سێیەم وەک یەکە. هەروەها سەروای دێرەکانی دووەم و چوارەمیش یەکە، بەڵام دێری پێنجەم سەروایەکی جیاوازی هەیە.»

## ئەو کێشە برگەییانەی ئێستا باون

لە پێشەوە وتمان کە لە (وێژەی نەتەوەیی کوردی)دا کێشی هەرەباو (دە برگەیی: ٥ + ٥)یە. ئەوەبوو وێنەمان لە هۆنراوەکانی مەولەوی هێنایەوە. لە پاش (دە برگەیی) لە وێژەی نەتەوەیی فۆلکلۆریدا، کێشی (هەشت برگەیی: ٤ + ٤) دێت، دوای ئەویش (حەوت برگەیی: ٤ + ٣)، لە تاکە تاکەی هەڵبەستی (لاوک) و (حەیران)یشا ئەتوانین کێشی (یانزە برگەیی): (٦ + ٥ = ٤ + ٤ + ٣) بدۆزینەوە.

بوێژە تازەکانمان لە ماوەی ئەم دەستە ساڵانەی دواییدا، لە بەرهەمی هونەریاندا، ئەم جۆرە کێشانەیان هەموو ژیاندۆتەوە، جگە لەوەش چ بەچاولێکەری بێگانە، چ لە ڕێگای داهێنانەوە، چەند جۆرێکی تازەش، کێشیان دۆزیوەتەوە.

وا لە خوارەوە، یەکە یەکە، لەو جۆرە کێشە برگەییانە ئەدوێین، کە تا ئێستا، لە شێوەی سۆرانیدا هۆنراوەیان لەسەر دانراوە:

### ١- کێشی دە برگەیی ٥ + ٥

ئەم کێشە لە هۆنراوەی کوردیدا ئەوەندە باوە، زۆر بەئاسانی دەتوانرێ ناوی لێ بنێ (کێشی نەتەوەیی گەلی کورد).

هەروەک لە زمانی فەرەنسیزیدا کێشی ١٢ برگەیی پێی ئەڵێن (ئەسکەندەری) دانراوە بە(کێشی نەتەوەیی گەلی فەرەنسزی).

یان وەک لە زمانی ئینگلیزیدا کێشی (ئەیامبیک) دانراوە بەکێشی نەتەوەیی بۆ ئینگلیزەکان، وەیا کێشی یانزە برگەیی ٦ + ٥ دانراوە بۆ تورکەکان.. پیاو بچێتە هەر کوێرێکی ژن یان پیاوەوە لەناو کوردەواریدا لە هەموو کێشێک زۆرتر گوێی لەم کێشی دە برگەییە ئەبێ لە هۆنراوەدا، هیچ هۆنراوەیەک نییە، ئەوەندەی هۆنراوەی ئەم کێشە لە (چیرۆک، گۆرانی، شیوەن، بەستە و لای لایە)ی کوردیدا بەکار بهێنرێ، هیچ هۆنراوەیەک نییە ئەوەندەی هۆنراوەی ئەم کێشە بۆ بوێژەکانی کورد بەئاسانی رێک بخرێ.

دێرە هۆنراوەکانی کێشی دە برگەیی، بەزۆری لە دوو پێی پێنج برگەیی دروست ئەبن بەڵام دروستیشە دێری هۆنراوە لە سێ پێی پێنج برگەیی بهۆنرێتەوە؛ وەک لەمەی خوارەوە:

مەلی سەر بنچک، پەلوپۆ رەنگین، خۆ من هەڵۆ نیم

٥ ٤ ٣ ٢ ١ ٥ ٤ ٣ ٢ ١ ٥ ٤ ٣ ٢ ١

لێم مەفڕن بەجووت، مەفڕن ئاخر، پێتان بڵێم چیم

منیش وەک ئێوە، لە دنیای گەورە، گەردێکم بچووک

ناشتوانم بۆ خۆم، بفڕم بخوێنم، بەباڵ بەدەنووک

٥ + ٥ + ٥

٢- کێشی هەشت برگەیی ٤ + ٤

کێشی هەشت برگەیی لە وێژەی نەتەوەیی کورددا زۆر باوە، واش دێتە بەرچاو هەتا بەرەو ناوچەی (شێوەی کرمانجی) برۆی باوی زۆرتر ئەبێ. بەپێچەوانەی کێشی دە برگەیی کە لەناو جەرگەی (شێوەی گۆران)دا یەکجار لە برەودایە. دێری هۆنراوەی ئەم کێشە لەسەر دوو پێی چوار برگەیی دامەزراوە، زۆربەی بەرهەمی بوێژە تازەکانمان بەم کێشە و (بەجۆرە دەستکاری کراوەکانی ئەم کێشە) هۆنراوەتەوە.

ئەم پارچەیەی خوارەوە، وێنەیەکی ساکاری ئەم کێشەیە:

وەنەوشەی بەن درک خزاو چاوی رەشی کردەوە، دیی

٨ ٧ ٦ ٥ ٤ ١ ٢ ١ ٤ ٣ ٢ ١+٤ ٣ ٢ ١

نێرگسە جاڕ بەهەزار چاو پێ ئەکەنێ؛ زەرد و سپی

٤ + ٤ ٤ + ٤

٣- کێشی حەوت برگەیی ٤ + ٣

لە وێژەی نەتەوەیی کوریدا برەوی کێشی حەوت برگەیی، لە پاش کێشی هەشتی دێت، لەبەر نزیکی ساز و ئاوازەکەی لە (کێشی هەشت برگەیی)، لە هۆنراوەی نەتەوەیی (فۆلکلۆر)دا هەندێ جار تاکە تاکەی لەناو دێرە هۆنراوەکانی (کێشی هەشت برگەیی)دا بەرچاو ئەکەوێ.

لەم ساڵانەی دواییدا ژمارەیێکی زۆر هۆنراوەی تازەی لەسەر دانراوە.

هۆنراوەی لای خوارەوە نموونەیەکیەتی:

هەرچەند کـــە ئەیدی ئاوا
کــەشــتی بۆ گــەرداو ئەڕوا
هــەزاران هــاوار بــکــرێ
کەس نییە ڕێی ڕاست بگرێ
ناچار خــۆی سەرخۆش ئەکرد
هەســتی فــەرامــۆش ئەکــرد
جــار جــار زۆر پەست ئەبوو
کەمێکیش بەدەمەست ئەبوو

| داخی دڵـــی خــۆی ئەڕشت | | به جسوێن، توانج، ســەرزەنشت |
|---|---|---|
| ٨ ٩ ٩ ٩   ٥ ٦ ٧ | | ١ ٢   ٣ ٤   ٥ ٦ ٧ |
| ٤ + ٣ | | ٤ + ٣ |
| (٧) | = | (٧) |

## کێشی هۆنراوەی عەرەبی

هۆنراوەی عــەرەبی، هەتا مــاوەی ســەد ســاڵیش پتــر له پاش پەیدابوونی ئیــســلامــەتی کــێــشی بۆ نەدۆزرابووەوە. بوێژەکانی عــەرەب، لەسەر کێشی ئەو هۆنراوانەی له ناودا بوون، بەپێی سروشتی زبانی عــەرەبی، هۆنراوەیان دائەنا. بەڵام زبانزانێکی زانای عــەرەب (خــەلیل ئەحــمــدی فــراهیــدی)[1] کــه له (١٠٠ هـ)دا لەدایک بووە، توانی له پاش ڕەنج و تەقەللایەکی زۆر هەر لەو هۆنراوە عەرەبیانەوە که لەبەر دەستیا بوون، کێشەکانی هۆنراوەی عەرەبی بدۆزێتەوە و لەسەر بنچینەیەکی زانستی دایان بمەزرێنێ.

بنچینەکەش بریتییه له پیتی بزێو (حرف متحرک) و پیتی مات (ساکن).

دوای وردەکارییەکی زۆر توانی هەموو هۆنراوەی عەرەبی له (١٥) جۆر کێشیدا جێ بکاتەوە؛ ناوی نان (بحر: زرێ)[2] یاخود (البحور القروضية = ؟)[3].

(١) خليل بن احمد الأزدي: سيد أهل الأدب، اول من استخرج العروض، علم سيبوية والأصمعي وغيرهما، من أئمة العربية، توفي في البصرة، له كتاب (العين) وهو أول قاموس عربي- المنجد في الأعلام، ط ٢٦ دار المشرق بيروت ١٩٧٣ ص ٢٧٣-

(٢) له ڕاستیدا (زەریا- دەریا) له بارترە، وەک ئێستا بەرامبەر ئەو زاراوەیە (دەریا) بەکاردێ. (زرێ) مانای خۆی هەیە، دەوترێ: زرێ پۆش.

(٣) مامۆستا بەرامبەرەکەی ئاوا هێشتۆتەوە، که (دەریا عەروزییەکان) بووایه باشتر بوو.

ناوی زرێکان ئەمانەن: (طویل، مدید، بسیط، وافر، کامل، هزج، رجز، رمل، سریع، منسرح، خفیف، مضارع، مقتضب، مجتث، متدارك).

هێشتا خەلیل خۆی مابوو کە (أخفش)[1] ناوێک پەیدا بوو، (زرێ)یەکی تری داهێنا بۆ کێشی هۆنراوەی عەرەبی، بەوەوە زرێکان بوون بە(١٦) زرێ.

بەلام خەلیل ئەمەی پەسەند نەکرد، لەگەڵ ئەم هەموو تەقەللایەشدا، ئەم کێشانە، بەتەواوەتی هۆنراوەکانی عەرەبیان پێ نەدەکێشرا، کەموکوڕیان دەرکەوت، خەلیل خۆی ناچار بوو (٢٢) (زحافه؟)ی داهێنا بۆ ئەمەی ئەو کەم و کوڕیانەی پێشووی پێ پڕ بکاتەوە.

(زحاف) بریتییە لە گۆڕین و کەم کردنەوە و زۆرکردنی پیتی بزێو و پیتی مات لە کێشەکاندا، گوتی: هەر هۆنراوەیەکی عەرەبی لەم زەحافانەی تێ کەوێ دروستە.

(زانستی عروض) لای عەرەب وەک زانستەکانی تری (صرف، نحو، بلاغة) رێگای گۆڕان و پێشکەوتنی بەستووە لە زبان و هۆنراوەی عەرەبی؛ لەبەر ئەوە بوێژانی عەرەب گەلێ تەنگ و چەڵەمەی زانستییان هاتۆتە پێش، بوێژە تازەکانیان ئەیانەوێ هۆنراوەکانیان لەسەر ساز و ئاواز بڕوا تا بتوانێ لەگەڵ پێویستی شارستانێتیدا بڕوا بەڕێوە.

ئەمەش پێویستی بەئازادی بوێژ هەیە لەو کێشانەدا، کەچی (عروض)ی خەلیل رێگای هۆنراوە هۆنینەوە تەنگ ئەکاتەوە و سنوور بۆ بوێژ دائەمەزرێنێ کە نابێ لێی تێپەڕ بکات.

کێشی عەروزی عەرەبی تەرازوی هۆنراوەی (فارسی) بووە، بێگومان لە کێشانی هۆنراوەی فارسیدا بەعەروز کە کێشی زبانێکی جوێیە لە فارسی: لە دەستوور و چەشە و ساز و ئاواز و خوێندنەوەدا، گەلێک ئەرک هاتۆتە بەر بوێژە فارسەکان، ناچار بوون، زۆر جاران دەنگی پیتە فارسییەکان بگۆڕن بۆ ئەمەی لە کێشەکانی عەرووزدا دابڕێژرێن. جا بۆ ئەوەی لە لاسایی کردنەوەی عەروزی عەرەبی لانەدەن، هێناویانە هەندێ زرێی تازەیان داهێناوە لەسەر شێوەی خەلیل بۆ ئەوەی هۆنراوەیان بەئاسانتر بۆ دابنرێ، زرێکانیان ناوناوە (غەیب یان - جدید- قریب، مشاکل) دیسانەوە زەحافەکانی خەلیل بەشی نەکردوون؛ هێناویانە (١٣) زەحافی تریان داهێناوە.

هەروەکو سەرنج دراوە، فارسەکان هەندێ زرێیان زۆرتر بەکارهێناوە، ئەوانەش ئەو زرێیانەی کە (بەش: نسبت)ی بڕگە درێژەکانیان زۆرتر تیایە وەک: (رجز، رمل، هزج، متقارب) و ئەو زرێیانەی کە لەوانەوە دەریان هێناوە.

کەچی بەپێچەوانەی فارسەکانەوە، بوێژە عەرەبەکان زرێکانی وەک: (طویل، مدید، کامل، وافر) یان زۆرتر بەکار ئەهێنا.

---

(١) (سعید بن مسعدة- أخفش- قوتابی- سیبەوەی- بووە، ماوەیە لەگەڵ خەلیل دابوو، کتێبێکی هەیە بەناوی -معاني القرآن- سەربە موعتەزیلەکان بوو، لە ساڵی ٢١٥ ک. دا لە دنیا دەرچووە) . هەروا (الاخفش/ لغة: الصغیر العین في سوء بصرها.)

هەروەک لەوە پێش پیشانماندا، زبانی کوردیش لە زبانی فارسی و ئێرانییەکانەوە نزیکە، بوێژەکانی کورد، چ لەبەر ئیسلامەتی چ لەبەر تێکەڵیشیان بەفارسەکان و وێژەی فارسی، لە فارسەکانەوە تووشی ئەم زرێ عەروزیانەی عەرەبی بوون.

ئەوەندە هەیە، بوێژانی کورد، تەنیا لە وەچەکانی ئەم زرێ عەرەبیانەوە کێشیان پەسەند کرد، وەک زرێکانی: (هزج، رمل، رجز) لەگەڵ کەمێک لە وەچەکانی زرێی (سریع) و (بسیط).

ئەتوانین لێرەشا بگەینە ئەنجامێک، ئەویش ئەوەیە کە کێشی عەروز ئەگەرچی بۆ زبانی عەرەبی دەست ئەدا، بەڵام کەڵکێکی ئەوتۆی بۆ زبانی کوردی و فارسی نییە؛ لێرەدا بەپێویستی ئەزانین هەندێ جیاوازی هۆنراوەی زبانی کوردی و عەرەبی پیشان بدەین:

١- لە زبانی کوردیدا بەشی برگەی درێژ زۆرترە لە برگەی کورت.

٢- لە هۆنراوەی کوردیدا، لەنگەری برگەیی، لەناو وشەیەکدا بەدەگمەن دەست ئەکەوێ.

٣- پیتە ڕاکشاوەکان (حروف المد) لە زبانی کوردیدا کورتن.

٤- لە دەنگی هەندێ پیتی زبانی کوردیدا، کۆمەڵەی ساز و ئاواز کەمترە لەهی زبانی عەرەبی.

## سەروا «قافیة»

سەروا: بەو وشانە ئەڵێن کە ئەکەوتە دوایی دێرە هۆنراوەکانەوە، بەمەرجێ:

لەکێش و ئاوازدا لەیەک بچن، پیتی دواییشیان یەکبێ؛

جاری وا هەیە دێرە هۆنراوەکان، لە پارچە هۆنراوەکەیدا هەموویان یەک سەروایان ئەبێ، جاری واش هەیە لە پارچە هۆنراوەیەکدا، هەردوو دێرەی سەروایەکی ئەبێ، جاری واش هەیە لە کۆمەڵە هۆنراوەیەکدا کە کرابێ بەچەند پارچەیەکەوە، لەهەر پارچەیەکدا جۆرە سەروایەک ئەبێ.

سەروا، مەرجێکی گرنگ و پێویستە بۆ هۆنراوەی کوردی، ئەو هۆنراوانەی لە بەردەستماندان، هیچیان بێ سەروا نین.

هەندێک بروایان وایە کە سەروا لە عەرەبەوە داهاتووە، نەتەوەکانی تر لە عەرەبیان وەرگرتووە؛ ئەمانە ئەڵێن لە کۆندا هۆنراوەکانی (سانسکریتی، یۆنانی، لاتینی، ئاوێستا، پارتی، پەهلەوی) سەروایان نەبووە.

هەروەها لە زبانی ئینگلیزی کۆندا، لە جیاتی سەروا (ئاواز) لە هەندێ (پیت)دا بووە. زۆربەی هۆنراوەکانی شکسپیریش لە چیرۆکە شانۆییەکاندا بێ سەروا بوون، هەروەها هۆنراوەی نەتەوەیی کۆنی زبانی ڕووسیش بێ سەروا بووە.

ئەم زبانانە لە پاشدا سەروایان تیا پەیدا بووە... بەڵام بۆ هۆنراوەی کوردی بەڵگەمان بەدەستەوە نییە، کە لە کۆنا بێ سەروا بووبێ، یاخود سەروادار بووبێ، ئەوەندە هەیە وەک لە بابەتی (هۆنراوەکانی زبانی پەهلەوی)دا پێشانماندا، بەپێی وتەی زبانزان بنڤەنیست، لە پەهلەوی کۆندا، هۆنراوەکان سەروایان

هەبووە، بەڵگەی ئەم قسەیەش هەردوو پارچەکەی (یادگاری زەریران) و (پارچە هۆنراوەکانی نورڤان)ە، کە لە هەردووکیاندا (سەروا) هەبووە، کەواتە ئەو بیروباوەڕەی کە لە سەرەوە پیشان درا لە بابەت نەبوونی سەرواوە لە زمانە کۆنەکانی (هیند و- ئەورووپایی) و (هیند و- ئێرانی)دا کە زمانی پەهلەوی و کوردی دووانن لەوان، درۆ دەرچوو.

ئەوە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە، دوور نییە هەموو زمانێک لە پێشا هۆنراوەکانی بێ سەروا بووبن، پاشان بەهۆی پێشکەوتنی هونەری و وێژەوە لەو زمانانەدا، بەرە بەرە سەروا پەیدا بووبێ. بەلام ئەمە ناچێتە دڵەوە کە ئەم هەموو زمانانە سەروایان لە عەرەبییەوە وەرگرتبێ، چونکە زۆربەیان، بەتایبەتی زمانی کوردی، وێژەیان لە وێژەی عەرەبی کۆنترە و، شارستانێتی نەتەوەکانیان لە شارستانێتی عەرەب لە پێشترە.

ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست نەبوایە، ئەبوو، لە وێژەی کوردیدا، تەنیا شێوەی سەروای عەرەبیمان بدیایە. کەچی لە وێژەی نەتەوەییماندا (فۆلکلۆر)، سەروای کوردی ڕەسەن و خۆماڵی ئەبینین کە هیچ پەیوەندییەکی بەشێوەی سەروای عەرەبییەوە نییە، بۆ بەڵگەی قسەکەمان، کە بوێژەکانی کورد بەوپەڕی ئازادییەوە تەنیا لەبەر دەربڕینی بیروباوەڕی خۆیان بەکاریان هێناوە لە: (بەیت، لاوک، حەیران، هۆنراوە ئایینییەکانی یەزیدییەکان)دا کە شان بەشانی (کێشە خۆماڵییەکانمان ڕۆیشتوون).

هەروەها ئەو (سەروا جووت)ە بەنموونە ئەهێنینەوە کە لە (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانیدا بەکار هێنراوە.

لەگەڵ ئەمەشا پێی لێ ئەنێین کە بەشێکی گەورەی هۆنراوەی کوردی لە دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی بەناو کوردەواریدا، لەسەر شێوەی (سەروای عەرەبی) هۆنراوەتەوە.

(یەکێتی سەروا) لە هۆنراوەی کوردیدا، شێوەیەکە لە عەرەبی وەرگیراوە. لەم لایەنەوە ئەبینین کە گیانی هۆنراوەی عەرەبی لە سەروادا، زۆرتر ئاشکرا و دیارە، نەک لە کێشیدا.

بوێژی کورد لەم بابەتە سەروایەدا، هەموو دێڕە هۆنراوەکانی، لەسەر یەک کێش و یەک سەروا ڕێک ئەخات، واتا دوایی هەموو دێڕە هۆنراوەکان بەیەک سەروا ئەبڕێتەوە، وەک (بێخود) ئەڵێ:

دڵم مفتونی چاوی دولبەرێکی نوکتە پەردازە

کە محضی حوسنە، عینی شوخیە سەرچاوەیی نازە

لەم هۆنراوە دڵدارییەدا، سەروای دێڕەکان ئەم وشانەن:

(پەردازە، نازە، ممتازە، تازە، ئەندازە، ڕازە، إعجازە، بازە)

بەکورتی: ئەگەرچی هۆنراوەی کوردی (یەکێتی سەروا)ی لە عەرەبییەوە وەرگرتبێ، بەلام (سەروای جووت) و (سەروای بزێو و ڕەنگاوڕەنگ) هی کەس نییە هی خۆیەتی.

### * وشەکانی سەروا

بۆیان هەیە، سەرواکان، یەک پیت بن، یان زۆرترین یان چەند پیتێک و وشەیەک بن لە هەموو دێڕە هۆنراوەیەکدا دووبارە ببنەوە، وەک: جا، مەرحەبا، وەفا

گوڵ، چقڵ، چڵ، دڵ

خەڵات، نەجات، بەرات، نەبات

ژیایەوە، کوژایەوە، شکایەوە

سەیرانت دەوێ، کوێستانت دەوی

صبایی ڕاست و چەپی، سەمائی ڕاست و چەپی

بوێژەکانی کورد، هەموو جۆرە پیتێکیان کردووە بەسەروا، تەنانەت، پیتە عەرەبییەکانیش وەک (ق، ص، ض، ط، ظ، ث، ذ) هەروەها لە (پاش سەروا) دا: (ناو، پاش ناو، فەرمان، ڕستە، ولژە)یان بەکار هێناوە، وەک (شەو، ڕۆژ کوڕ، کچ، کورد، محەمەد، دۆست، کەمتر، زیاتر، بەس، نوور، ڕەنگینە، زوو، حرام، ڕوح، ئەکا، کرد، نەکەی، ناکەم، ئەکرد، چوون، چووم، شکا، نابەم، ڕۆیی، دڵی من، ئەم شەو، یا ڕەسولی الله، ئۆف و ئاخ، زلفی یار، تا مردن، بێ تۆ، چیبکەم، ماهی نەو، ڕاست و چەپ، لە هیچ)

### * گیروگرفتەکانی سەروا

سەروا، هەرچەندە پێویستییەکی گرنگە بۆ هۆنراوە، بەڵام لە جۆری (یەکێتی سەروا)دا، هەندێ جار ئەبێتە گیروگرفتێک بۆ بوێژ، بەتایبەتی ئەگەر هۆنراوەکان زۆربن و لە چامە (قصیدة)یەکی درێژ کۆبووبنەوە، بوێژ بەهۆی خەریک بوونییەوە بەدۆزینەوەی سەرواکاندا زۆر جار بیروباوەڕەکەی بەناچاری بەکزی و کەموکوڕی دەرئەبڕێ، یاخود گەرمایی هەستەکەی سارد ئەبێتەوە. ئەو ساکەش چامەکەی باش دەرناچێ؛ نە جوان ئەبێ نە کاریگەر نە بەهێز نە کەڵکدار.

جا لەبەر ئەم خەوشانەیە کە هەر لە زووەوە لە هەموو زمانێکا، تەنانەت لە عەرەبیشدا، بوێژەکان زۆر جار وازیان لە یەکێتی سەروا هێناوە و پەنایان بردۆتە بەر (سەروای جووت) یاخود (سەروای ڕەنگاوڕەنگ و بزێو) یاخود (سەروای سەربەست)، بۆ ئەمەی بەهۆی گیروگرفتی سەرواوە، هۆنراوەکانیان لە کەڵک نەکەوێ.

خۆشبەختانە، بوێژە کوردەکانیش، چ لەوەدا کە چوونەتەوە سەر ڕێ و شوێنی باووباپیریان، چ لەوەشدا کە ئەیانەوێ بەهۆی هۆنراوەوە: (ئاوات و ئازار و پێویستی گەلی کورد) دەربڕن و نەتەوەی کورد ئاراستەکەن بۆ گرتنی ڕێگای پێشکەوتن.

بۆیە لەم ساڵانەی دواییدا بەزۆری هۆگری: سەروای جووت، سەروای ڕەنگاوڕەنگ و بزێو، سەروای سەربەست بوون، کە لە ڕاستیدا بریتین لە کەلەپووری وێژەیی باووباپیریان... ئەوەندەی نەماوە بوێژانی

کورد هەروەک دەستبەرداری: وشەی بێگانە و نووسیاری بێگانە و کێشی بێگانە بوون، ئاواش دەستبەرداری سەروای بێگانە بن، بۆ ئەمەی وێژەی کوردی بەرەو تەواوی و بڵندی و جوانی بڕوات، هەروەها بۆ ئەمەی بەو ئامانجە پیرۆزە بگات کە کوردەواری پێویستییەتی.

## سەرنجێکی کورت لە هۆنراوەی کوردیدا

١- هۆنراوەی نەتەوەیی هەموو شێوەکانی زمانی کوردی بەکێشی خۆماڵی واتا (کێشی برگەیی) کێشراون.

٢- بەشێکی زۆر لە هۆنراوەی هونەریی کلاسیکی شێوەی هەورامی بەکێشی خۆماڵی (برگەیی) کێشراون.

٣- بەشێکی زۆر لە هۆنراوەی هونەری کلاسیکی شێوەی کرمانجی سەروو و خواروو (سۆرانی و بادینی) بەکێشی عەروزی عەرەبی کێشراون.

٤- ئەو کێشانەی بەخۆماڵیمان داناون لە هۆنراوەی زمانی کوردیدا کێشانیان بە(کێشی برگەیی)، ڕووداوێکی (ئایدۆلۆژی)یە، ئەگینا ئەگەر بمانەوێ بەکێشی عەروزی عەرەبی بیانکێشین، ئەکێشرێن.

٥- هۆنراوەی هونەری تازەی کوردی لەسەر کێشە خۆماڵییە برگەییەکان دامەزراوە، کە لە کێشی هۆنراوەی نەتەوەیی (فۆلکلۆر)ی کوردی وەرگیراون... پاڵەوانانی ئەم کۆڕە ئەمانەن: پیرەمێرد، گۆران، لە شێوەی کرمانجی خوارووداو، جگەرخوێن و بوێژەکانی کوردی سۆڤیەت لە شێوەی کرمانجی سەروودا... ئەمەش لەم سەدەی بیستەمدا دەستی پێکرد.

٦- لە حەیران و لاوک و هەندێ لە بەیتەکان و پاڕانەوە (دوعا) ئاینییەکانی یەزیدییەکاندا، کە نموونەی هۆنراوەی نەتەوەیی کوردن، چ کێش، چ سەروا: ڕەنگاوڕەنگن، بزێون، سەربەستن، ئەمەش دیاردەیەکی بنچینەیی مێژوویی زمانی کوردییە. هۆنراوەی کوردی تازە لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەیەوێ بگەڕێتەوە سەر ئەو یاسا ئازادە کۆنە، وە ڕزگاری ببێ لە دەست (یەکێتی کێش و سەروا) کە لە بێگانەوە تووشی بووە.

٧- حەیران و لاووک، لە لایەن (کێشی و سەروا) وە لە (بەیت) سەربەست ترن.

٨- لە حەیران و لاوک دا خەمی سەروا زۆرتر خوراوە لە کێش.

## وێژە

هەر نووسینێک بەهۆی شێوەی دارشتنەکەیەوە دڵ و دەروونمان ببزوێنێ، یاخود هەستمان پێ بکات بەجوانی، ئەوە (وێژە)ی پێ ئەڵێین.

جۆرەکانی هۆنراوە

هەر لە سەردەمی یۆنانییە کۆنەکانەوە سێ جۆرە هونەری گەورەی هۆنراوە داهاتووە:

١- هۆنراوەی داستان (شعر الملحمي)

٢- هۆنراوەی لاساییکردنەوە (شعر التمثيلي)

٣- هۆنراوەی گۆرانی (شعر الغنائي)

هۆنراوەی داستان لەناو چووە، هۆنراوەی لاسایی کردنەوەش، لاسایی کردنەوەی پەخشان جێگای گرتۆتەوە، بەڵام (هۆنراوەی گۆرانی)، بەزیندوویەتی ماوەتەوە، تاقە هۆنراوەیەکیشە کە لە ڕۆژئاوادا حەزی لێ بکەن و گەشەی پێ بکەن و تاوبەناو تازەی بکەنەوە و باوی تیا دابهێنن.

### ئاینەکانی وێژە «مذاهب الأدب»

ئاینەکانی وێژە زۆرن، بەڵام دووانیان لە هەموویان گرنگترن:

١- ئاینی کلاسیکی

٢- ئاینی ڕۆمانتیکی

ئەم دوو ئایینە هەموو دەم لە شەڕوشۆڕدان، ئاینی کلاسیکی توانیی (هۆنراوەی لاسایی کردنەوە) بگەیەنێتە ئەوپەڕی سەرکەوتن.

کەچی (هۆنراوەی گۆرانی) لای کلاسیکییەکان نەگەیشتە ئەو پلەیە.

بەڵام ئایینی ڕۆمانتیکی (هۆنراوەی گۆرانی)ی گەیاندە پلەیەکی ئەوتۆ کە لە کۆڕی مرۆڤایەتی و هونەردا، (هۆنراوەی لاسایی کردنەوە) لای ڕۆمانتیکییەکان نەیگەیشتبوێ.

مایەوە سەر (هۆنراوەی داستان)، ئەمە نە لە لای کلاسیکییەکان سەری گرت و نە لە لای ڕۆمانتیکییەکان وە نە لە لای ئایینە تازەکان.

### هۆنراوەی داستان

ئەو هۆنراوەیەیە کە دەنگوباسی شەڕوشۆڕ و پاڵەوانی و پاڵەوانان بەشێوەیەکی سادە و سووک و ڕەوان ئەگێڕێتەوە. هەر لەسەرەتای مرۆڤایەتییەوە هۆنراوەی داستان گەشەی کردووە.

- (ئەلیادە، ئۆدیسە) دوو هۆنراوەی داستانن، (هۆمیرۆس)ی ئەمر، بوێژی بەناوبانگی یۆنانی دایناون. لە هەردووکیاندا هۆنراوەی ئاوازەی تیایە، سادەییەکەی چاوبەستمان ئەکات، جوانییەکەش کە وەک جوانیی منااڵ وایە، دڵمان کێش ئەکات.

- له سەردەمی پێنجەمی پێش زایندا (بزسترانۆس) فەرمانداری (ئەتینا) فەرمانیدا بەپێکهێنانی لیژنەیەک لە بوێژەکان بۆ نووسینەوەی ئەم دوو داستانە (ئەلیاذە) و (ئۆدیسە).

هۆمیرۆس گۆرانیبێژێکی کوێر بوو، ناوبانگی وا دەرکردبوو کە ئەو دوو داستانەی بەگۆرانییەوە دەخوێندەوە و کەمانچەکەشی لەگەڵا لێ ئەدا، بۆیەکا ئەو دوو داستانەیان بەهی ئەو دائەنا.

دوو داستانەکە باسی ئەو شەڕە خوێنینە ئەکەن کە لە ناوەندی سەدەی دەهەم و یانزەهەمی پێش زایندا قەوماوە لە ناوەند یۆنانییەکان و تەروادەییەکاندا؛ ئەمیش لەسەر ئەوەبووە کە (پاریس) شاهزادەیەکی تەروادەیی (هیلانە)ی ژنی (مەنیلاس) شای یۆنانی فڕاندووە. لەو دەمەدا کە بەناو زرێدا گەشتێکی ئەکرد بۆ خاکی یۆنان. دانراوەکانی هۆمیرۆس بەسەرچاوەیەک دائەنرێن بۆ هەموو چیرۆکە لاسایی کردنەوەکان لە جیهاندا.

(ڤرجیل)یش کە بوێژێکی ڕۆمانی بوو داستانێکی بۆ هاونیشتمانەکانی خۆی دانا، ناوی نا (ئەنیادە)، لە ئەنیادەدا سەرگوزەشتەی باپیرە گەورەی ڕۆمانییەکان (ئەیتوسی) پاڵەوانی گێڕاوەتەوە، کە چۆن شاری ڕۆمای دامەزراندووە و چۆن شەڕوشۆڕی کردووە و خۆی خستۆتە تەنگوچەڵەمەوە، لەم جیهان و لەو جیهاندا. بەڵام وێژەوانانی جیهان ئەلیاذە و ئۆدیسە یان پێ باشترە لە ئەنیادەی ڤەرجیل.

هەر لەسەردەمی ڕاپەڕینی ئەوروپاییەکانەوە (سەدەی پانزەهەم) تا سەدەی نۆزدەهەم، گەلێک بوێژ هەوڵیاندا داستان دابنێن، بەڵام بۆ هیچ کامیان سەری نەگرت. مرۆڤایەتی تەنیا ئەم داستانانەی بەدڵا چوو:

١- ئەلیاذەی هۆمیرۆسی یۆنانی

٢- ئۆدیسەی هۆمیرۆسی یۆنانی

٣- ئەنیادەی ڤەرجیلی ڕۆمانی

٤- میهراتای هیندی

٥- ڕمیانای هیندی

٦- شاهنامەی فیردەوسی فارسی

٧- مەم و زینیی ئەحمەدی خانی کوردی

لە سەردەمی ئێستادا هونەری وێژە، داستانی بۆ (وێژەی نەتەوەیی = فۆلکلۆر) بەجێ هێشتووە. بەڵام داستانە نەتەوەییەکانیش بەرە بەرە لەناودا نەمان، چونکە بوێژە خاوەن کەمانچە گەڕۆکەکان بەرە بەرە لەناو چوون، ئەو گیانە پاکە منالییەی ناو مرۆڤایەتی وا دیارە لەناو چووە... چونکە مرۆڤایەتی گۆڕاوە، هۆی ڕابواردنی زۆر بووە لەبەر ئەوە دڵ و دەروونیشی بەو پێیە گۆڕاوە و ئاڵۆزاوە.

## هونەری وێژەی لاسایی کردنەوە «فن الأدب التمثيلي»

ئەم هونەرە لای یۆنانییەکانی کۆن بەهۆنراوە بوو، لاسایی کردنەوە لای ئەوان وابوو:

١- گفتوگۆ (بەهۆنراوە)

٢- گۆرانی (بەهۆنراوە)

٣- هەڵپەڕین و سەما

٤- ساز و ئاواز (مۆسیقا)

لە سەردەمی ڕاپەڕینی ئەوروپاییەکانەوە (سەدەی پانزەهەمی پاش زاین) وێژەوان و بوێژەکانی ئەوروپا لە شوێن پێی (وێژەی یۆنانی کۆن)ەوە ئەڕۆیشتن، بەڵکو بابەتی چیرۆکە لاسایی کردنەوەکانیان لەوەوە وەرئەگرت... لە پێشدا (گفتوگۆ) و (گۆرانی)یان لە چیرۆکەکانیاندا کۆ ئەکردەوە، بەلام کە (کلاسیکی) دامەزرا (هونەری لاسایی کردنەوە) کە بەگفتوگۆوە بەندە لە (گۆرانی) جوێ بۆوە. لە دواییدا (چیرۆکی لاسایی کردنەوە) جوێ بووەوە لە (لاسایی کردنەوەی گۆرانی).

ئێستا (لاسایی کردنەوەی گۆرانی و ساز و ئاواز) وەک (ئۆپێرا) و (ئۆپێرا کومیک) و (ئۆپەرێت) لە بابەتی وێژە و مێژووی وێژە دانانرێن، لە بابەتی (ساز و ئاواز) و مێژووی ساز و ئاواز دائەنرێن.

***

لە سەردەمی تازەدا کەم وێژەوان هەیە کە چیرۆکی لاسایی کردنەوە بەهۆنراوە دابنێ، تەنانەت ڕۆمانتیکییەکانیش چیرۆکی لاسایی کردنەوە بەهۆنراوە دانانێن. نووسینی (پەخشان) لە چیرۆکی لاسایی کردنەوەدا جێگای هۆنراوەی گرتۆتەوە.

ئەمیش لەبەر ئەوەیە کە (وێژەی لاسایی کردنەوە) بەهۆی پەیدابوونی (مەرگەسات: دراما)وە بەرەو (ڕووداو: واقعیە) ئەڕوا کە لە بریتی خونکار و سەرۆکەکان، بەتەنگ چارەکردنی دەرد و ئازاری گەلەوەیە.

## هۆنراوەی گۆرانی «الشعر الغنائي»

بریتییە لە هۆنراوەی (چامە: قصیدة) و (پارچەکان: مقطوعات). لای ڕۆژئاواییەکان هەر لەکۆنەوە بووەتە جۆر جۆر، هەر جۆرەی مۆسیقییەکی تایبەتی خۆی هەبووە، لەناو خۆیدا بابەت (موضوع) و (خۆیەتی: الذاتیة)ی کۆ ئەکردەوە.

کەچی هۆنراوەی کوردی زۆرتر خۆیەتی تیا دەرئەکەوت.

هۆنراوەی گۆرانی لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواشدا گۆڕانی بەسەردا هات، لە گۆرانییەوە بوو بە(خوێندنەوە) پاشان بوو بە(خوێندنەوەی بێ دەنگ). بەلام هۆنراوە هێشتا کەرەسەی مۆسیقای لەناو خۆیدا گل داوەتەوە، کە بریتییە لە (کێش: وزن، تریە: إیقاع، تێک و پێکی دەنگ: الأنسجامات الصوتیة)، بەڵکو ئەتوانم بڵێم: تا دێت نرخی هۆنراوە گرانتر ئەبێت.

هۆنراوە، لای (نیشانەگەر: رمزیین)ەکان، لەپێش هەموو شتێکا بریتییە لە ساز و ئاواز، ئەوان ئەڵێن: هۆنراوە ڕاز و نیازێکە ئەکەوێتە دڵی گوێگرەوە، بەهۆی ساز و ئاوازەوە، پتر لە دەربڕینی ئەو ڕاز و نیازە بەوشەکان. ئەم دەمە، هۆنراوە زۆری نەماوە کە هەمووی لە بەشی (هۆنراوەی گۆرانی)دا جێی بێتەوە.

**هۆنراوە ،شعر،**

لای یۆنانییەکانی کۆن، واتای هۆنراوە (دروستکردن: خلق) و (داهێنان: إبداع)ی ئەگرتەوە. (ئەرستوو) ئەیگوت:

«هۆنراوە بریتییە لە نواندنی سروشت یاخود کارەساتی ژیان بەڕەنگی ئەوەی هەیە و رووی داوە پیشانی بدات، هەروەها ئەوەی کە پێویستیشە ببێ یاخود ڕەنگە ببێ دەری بخات»

لێرەدا (مێژوو) لە (وێژە) جیا ئەبێتەوە، چونکە (مێژوو) بابەتی تاک و تایبەتی ئەگێرێتەوە، بەستراوە بە(دەم: زمان) و (جێگا: مکان)ەوە.

بەڵام وێژە بابەتی گشتی ئەگێرێتەوە، خەمی بابەت (موضوع) ئەخوات، نابەستریێ بەدەم و (جێ)وە.

هونەرمەند، سروشت ڕاستەوڕاست ناگوێزێتەوە ناو بەرهەمەکەی بەڵکو کاریگەریی سروشت و ژیان لە دڵ و دەروونیا ئەگوێزێتەوە ناو بەرهەمەکەی.

کەواتە واتای (دروستکردن: خلق)ی یۆنانییەکان و واتای (نواندن: محاکات)ی ئەرستۆ لەیەک جیاوازنین، ئەگەر بێتو لە هۆنراوە بدوێین.

ئەرستۆ لە نووسراوەکەیدا (هۆنراوە: الشعر) لە بابەت (هۆنراوەی لاساییکردنەوە) و (هۆنراوەی داستان)ەوە ئەدوێ، بەڵام لە بابەت (هۆنراوەی گۆرانی)یەوە قسەناکات. تەنیا ناوی ئەبات.

ئەمەش ڕەنگە لەبەر ئەوەبێت کە (پێشبینی: نظریة)ی (نواندنی سروشت و ڕووداوی ژیان: محاکاة الطبیعة وواقع الحیاة) لەگەڵ (هۆنراوەی لاساییکردنەوە) و (هۆنراوەی داستان) ڕێک ئەکەوێ، نەک لەگەڵ (هۆنراوەی گۆرانی)دا. یاخود لەبەر ئەوەبێ کە ئەرستۆ هۆنراوەی گۆرانی بەبابەتی ساز و ئاواز داناوە نەک بابەتی وێژە.

(ڕاستی پەرستی کلاسیکی: الفلسفة الکلاسیکیة) خۆی بەبیروباوەڕی ئەرستۆوەی بەستەوە هەروا بە(پێشبینی نواندن: نظریة المحاکاة)ەکەیەوە، لەبەر ئەوە بەتەنگ هۆنراوەی لاساییکردنەوەوە بوو، بەجۆرێکی نایابیش بەرهەمی لێ پێک هێنا.

بەڵام (پێشبینی و ڕۆمانتیک: النظریة الرومانسیة) ڕاستبووەوە لە پێشبینی کلاسیکی. خۆیشی نەبەستەوە بەبیروباوەڕ و پێشبینی ئەرستۆوە، بریاری دا کە: «هۆنراوە بریتییە لە دەربڕینی هەستی دڵ و دەروون، نەک نواندن سروشت یاخود ڕووداوی ژیان».

لەبەر ئەوە لە (هۆنراوەی گۆرانی)دا سەرکەوت.

بەهۆی ڕۆمانتیکییەکانەوە بنچینەی ڕاستی پەرستی هەموو هونەرێک بەتایبەتی (هونەری هۆنراوە) زۆری گۆڕا. لە (نواندن: محاکاة)ەوە بوو بە(دەربڕین: التعبیر)، هەروەها بەهۆی ڕۆمانتیکییەکانەوە (هۆنراوەی گۆرانی) پەرەی سەند و بەهێز بوو، بەڵام (هۆنراوەی بابەتی: الشعر الموضوعي) گەڕایەوە دواوە، بەتایبەتی لە هونەری لاسایی کردنەوەدا، بۆ ئەمەی جێگای خۆی بەجێ بهێڵێ بۆ (پەخشان).

وێژەوانانی یۆنانی کۆن (پێش ئەرستۆ) هەمیسان وەک ئەرستۆ خۆی، بڕوایان وابوو کە بنچینەی

هۆنراوه وەک هەموو هونەرەکانی تر (نواندنی سروشت: محاكاة الطبيعة)يه. بوێژی گۆرانی یۆنانی کۆن (سامدیندس) ئەیگوت: «وێنه هۆنراوەیەکی بێ دەنگه، هۆنراوەش وێنه-ڕسم- یەکی دەنگداره».

ئەم قسەیه ڕاسته له (هۆنراوەی پێ ناسێن: الشعر الوصفي)دا، بەڵام له (هۆنراوەی دەروونی: الشعر الوجداني)دا ڕاست نییه. له پاش پەیدابوونی ڕۆمانتیکییەکان هۆنراوه. بوو به(پێویستی بۆ دەربڕین) نەک (ئارەزووی دڵ بۆ نواندن).

ڕاستی پەرست (تۆلستۆی) ئەڵێ: «بوێژ بەرهەمی ئاوازه پێک ئەهێنێ بۆ ئەمەی بیدابه گوێی ئەم و ئەودا، تووشی ئەو هەستی دەروونییەی خۆی بکات کەوا دەری ئەبڕێ».

ڕاستی پەرست (کروچی) ئەڵێ: «هۆنراوه دەروون سارێژکردنه، بێ ئەمەی گوێ بدرێته ئەوانەی گوێی لێ ئەگرن».

له ڕاستیدا« هۆنراوه دەربڕینی هەستی دەروونییه، بۆ ئەمەی بوێژ دەردی دڵی خۆی پێ سارێژ بکات، یاخود بۆ ئەمەی گوێ گران تووشی دەردی دڵی خۆی بکات.

بوێژ لەباری خۆیدا، دوو دەروونی هەیه، یەکێکی دەروونی خۆی و یەکێکیش دەروونی کۆمەڵەکەی، بوێژی خۆ ئاسایی ئەم هەستی دوو دەروونەی پێکەوه دەرئەبڕی، چونکه بوێژ له ڕابردووی خۆی و گەلەکەی، له ئێستای خۆی و ئێستای گەلەکەی، دروست بووه، هەروا هیوای دوارۆژی خۆی و گەلەکەی.

کەواته ئەبێ هەستی دەروونی خۆی و هەستی دەروونی گەلەکەی دەربڕێ، ئەبێ ئاوات و ئازار و هیوای گیانی خۆی دەربخا، هەروەها ئەبێ ئاوات و ئازار و هیوای گەلەکەشی دەربخا.

## کەرەستەی هۆنراوه «عناصر الشعر»

کەرەستەی هۆنراوه چواره:

١- هەستی دەروونی (عاطفة)ی ڕاست و ڕەوان.

٢- بیروباوەڕ (فكر)ی ورد و بەهێز.

٣- خەیاڵ (خيال)ی ناسک و بەرز و جوان.

٤- ساز و ئاواز: کێش، سەروا، وشەی ناسک و ڕێک و پێک، فنسەی کورت و کاریگەر.

ئەم چوار کەرەستەیه لەهەر هۆنراوەیەکدا بوو، هۆنراوەکه جوان و بەهێز و بەرز و کاریگەر ئەبێ، له دڵی گوێ گراندا.

## هۆی دەربڕین و شێوەکانی «وسائل التعبير وطرائقة»

توێژەرە ڕومانتیکییەکان ڕاستەوڕاست ئەوی له دڵ و دەروونییاندایه دەری ئەبڕن، بەشێوەی گێڕانەوه کە بێ پێچ و پەنا، دڵ و دەروونی خۆیان دەرئەخەن، هەچ ڕاز و نیازێکیش له دڵ و دەروونییان دابێ پێشانی خوێندەواران و گوێگرانی ئەدەن.

بەڵام بوێژە نیشانەگەرەکان (الشعر الرمزيون)، ئەوی له دڵ و دەروونییان دایه ڕاستەوڕاست دەری

نابن، بەوێنە و نیشـانە پێشـانی ئەدەن. بوێژی یۆنانی کۆن (سـامونیدس) ئەیگوت: «وێنە هۆنراوەیەکی بێ دەنگە. هۆنراوەش وێنەیەکی بەدەنگە».

## کۆڕی هۆنراوە «مجالات الشعر»

نرخزان (ناقد)ی ئەڵمانی گەورە (سنج: Lasing) ئەیگوت: «هۆنـراوە کۆڕێکی تایبەتی خۆی هەیە، نابێ لەوە تێپەڕ بکات»، بەڵام نرخزان و ڕاستی پەرستە تازەکان ئەڵێن:

«بوێژ مـافی هەیە بچێتە هەموو کۆڕێکەوە، بێ ئەمەی لەوە بترسێ کە لە هێزی دەربڕین و کـارتێکردنا لە هـاوڕێکانی خـۆی، واتا لە هونەرمـەندەکـانی تر وەک وێنەگـر و پەیکەرتاش و سـازلێـدەرەکـان پاش بکەوێ!»

## وێنەی هۆنراوە «الصورة الشعرية»

زۆرجار وێنەی هۆنراوە بەند ئەبێ بە(خوازە: و لێکچوون: تشبية) و (خواستن: إستعارة).

هەندێ ئەڵێن مەبەس لەوێنەی هۆنراوە ئەوەیە کە گفتوگۆ لەگەڵ هەستدا (حواس) بکات

هەندێکیش ئەڵێن مەبەس لە وێنەی هۆنراوە ئەوەیە کە گفتوگۆ لەگەڵ گیاندا بکات.

هەندێک ئەڵێن (تشبية) لە ناوەند (مشبة) و (مشبقبة)دا ئەبێ کاتێ بکرێ کە شتێکی وەک یەک هەبێ لە سەروسیمای هەردوو لایاندا.

هەندێکیـشی ئەڵێن (تشبـيـة) لە ناوەند (مـشبـة) و (مـشبـقبة) دا ئەبێ لەسـەر بنچینەی کـارتێکردنی هەردوو لایان بکرێ لە دەروونداا.

مەبەس لە وێنەی قسە (التصوير البياني) ئەوەیە کار بکاتە دڵ و دروون، نەک شت بگێڕێتەوە.

ساز و ئاوازی هۆنراوە، زۆر گرنگە لە دەربڕینی هەستی دەروونیدا.

بوێژە نیشانەگەرەکان ئەڵێن: «ساز و ئاوازی هۆنراوە پێویستە بۆ دەربڕینی هەستی دەروون».

ڕۆمـانتـیکییـەکان ئەڵێن: «سـاز و ئاوازی هۆنراوە تەنیـا بریتـییـە لە هۆیەک لەو هۆیانەی کـە هەسـتی دەروونیی پێ دەرئەبڕێ».

## کلاسیکی و ڕۆمانتیکی

سـەردەمی حەڤـدەهەمی پاش زاین سـەردەمی کـلاسـیـکی وێژەیی هونەرییـە، چونکە ڕاسـتی پەرسـتی ئەرسـتـۆ گەش و بەزەبر و زەنگ بوو، لە سـەرەتای جـوڵەی ژیانەوەی زانسـتی (مـبدأ حـرکـة البـعث العلمي)یەوە کە لە سەردەمی پانزەهەم و سەردەمی ڕاپەڕیندا دەستی پێ کردبوو.

بەڵام ڕاسـتی پەرسـتی (ئەفـلاتوون) لە پەنادا خـۆی شـاردبووەوە، لە سـەردەمی نۆزدەهەمـدا، ڕۆمانتیکییەکان ژیاندیانەوە و جێگایان بۆ کردەوە.

ڕاسـتی پەرستی ئەرسـتۆ: (نواندنی سـروشت و ژیان) بنچـینەی کـلاسیکی وێژەیی هونەریە. ڕاسـتی

پەرستی ئەفلاتوون: (سروش: الوحي والألهام) بنچینەی ڕۆمانتیکی وێژەیی هونەریە.

ڕۆمانتیکییەکان ئەڵێن: «هۆنراوە سروشێکی خواییە لە خواوە دێتە بەرگوێی بوێژ. سەرچاوەکەی بریتییە لە پێویستی مرۆڤ بەدەربڕینی هەستی دەروونی خۆی کە بەهۆی سروشت و ژیان و خواوە بزوێنراوە. ئارەزووی نواندنی سروشت نابێتە سەرچاوەی جوڵەی وێژەیی و هونەری، وەک ئەرستۆ ئەڵێ».

لەبەر ئەمە (پێشبینی نواندن: نظرية المحاكاة) بەسەر ئاینی کلاسیکیدا زاڵ بوو، هیچ هۆنراوەیەک لەم ئاینەدا گەشەی نەکرد، (هۆنراوەی بابەت: الشعر الموضوعي) نەبێ کە بریتی بوو لە هۆنراوەی لاسایی کردنەوە، کە لەلایەن هەندێ بوێژە گەورەکانی فەرەنساوە نووسرابوونەوە. بەڵام هۆنراوەی گۆرانی، کز بوو و، بەرهەمی کەمبوو. سەردەمی کلاسیکی سەردەمی حەڤدەهەمە.

لەگەڵ ئەمەشا، لە پرانەوەی سەردەمی هەژدەهەمدا هۆنراوەی گۆرانی گەشەی کرد، لەسەر بنچینەی کلاسیکی (پێشبینی نواندن).

ئەویش لەو کاتەدابوو کە وێژەی فەرەنسزی ببووە وێژەیەکی جیهانی، لەو پشووەدا هۆنراوەی گۆرانی لە (بابەت: الموضوع)ەوە ئەدوا، بەڵام لە شێوەی یۆنانی کۆندا دارێژرابوو.

ئەمەش بوێژێکی لاوی فەرەنسزی (ئەندرێ شینێ) ناو دایهێنا، بانگیدا بۆ (کلاسیکییەکی نوێ) کە بیروباوەڕی تازە لە بەرگێکی یۆنانی کۆندا پێشان بدرێ. ئەم بوێژە لاوە چەند پارچە هۆنراوەیەکی دانا، ناوی نا (سەربەستی)؛ لەسەر زبانی دوو شوان (بابەتی سەربەستی: موضوع الحرية)ی پێشان ئەدا، لەگەڵ ئەمەشا هەستی دەروونی خۆیشی لەسەر زبانی هەردوو شوانەکە دەرئەبڕی.

ئەم هۆنراوەیە ناوبانگی زۆر دەرکرد، چونکە هەم بیروباوەڕی گەلی تیا دەرخرابوو، هەم لە شێوەیەکی هۆنراوەی کلاسیکیشدا بەجوانی و سادە و ڕەوانی پیشان درابوو؛ بەواتایەکی تر (ئەندرێ شینێ) کلاسیکی و ڕۆمانتیکی لە هەڵبەستەکەیدا کۆکردبووەوە و هەست و ئارەزووی هەموو ئازادیخواهانی جیهانیشی دەربڕیبوو.

هۆنراوەی گۆرانی هەر لە کۆنەوە تا ئێستا، لە هەموو سەردەمێکا بەزیندوێتی مایەوە؛ چونکە لە سەرچاوەی پێویستی دەربڕینی هەستی دەروونییەوە هەڵقوڵاوە.

بەڵام ئەوەی ڕۆمانتیکییەکان پێکیان هێناوە ئەوەیە کە سەرچاوەی (سروش: الوحي والألهام)یان بەیەکەم سەرچاوە داناوە بۆ بەرهەمهێنانی ئەو کۆمەڵە هۆنراوە گەورەیەی کە بوێژەگەورەکانی جیهان بۆیان بەجێ هێشتووین.

هۆنراوە لەسەرەتای مرۆڤایەتییەوە کەوتۆتە ناوەند دوو پێشبینییەوە، یەکێکیان (کلاسیکی) ئەوی تریان (ڕۆمانتیکی) یاخود (کارەساتی ڕووداو) و (ڕۆمانتیکی). سوکرات بڕوای وابوو کە (سروش) سەرچاوەیەکە بۆ هۆنراوە، ئەفلاتوونیش لەمەدا پشتگیری سوکراتی ئەکرد، بەڵام ئەرستۆ بڕوای وا نەبوو کە سروش سەرچاوەیەکە بۆ هۆنراوە، ئەو بڕوای وابوو کە ئارەزووی نواندنی سروشت و ژیان، بەواتایەکی فراوان، سەرچاوەی هۆنراوەیە.

ئەم پێشبینیانە بوونە تۆوی (ڕۆمانتیکی) و (کلاسیکی)، ئیمڕۆیش پێیان ئەڵێن (ڕۆمانتیکی) و (ڕووداو).

پاشەجار پێشبینی ڕۆمانتیکی (پێویستی بۆ دەربڕینی هەستی دڵ و دەروون) زاڵبوو بەسەر پێشبینی کلاسیکیدا: (ئارەزووی نواندنی سروشت و ژیان) کە لە (بابەت: موضوع)ەوە ئەدوێ.

تەنانەت ئەم (دەروون: وجدان، نفس، ذات) زاڵبوو بەسەر هەموو هۆنراوەیەکی ڕۆمانتیکیدا هەتاکو (هۆنراوەی پێناسین و بابەتی: الشعر الوصفي الموضوعي).

ڕاستی پەرست (ڤیکۆ) ئەڵێ: «بابەتی وێژە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، هەمووی، بەرە بەرە گۆڕا، لە پیاهەڵدانی خواکانەوە هاتەسەر پیاهەڵدانی پاڵەوانەکان، پاشان هاتە سەر پیاهەڵدانی مرۆڤ»

## ئاینی نیشانەگەری «المذهب الرمزي»

ئاینی ڕۆمانتیکیش لە ئاینی نیشانەگەری جیا ئەبێتەوە. ئەمیش بەهۆی شێوەی دەربڕینی هەستی دڵ و دەروونەوە، ڕۆمانتیکی بەشێوەیەکی شت گێڕانەوە[1] ڕاستەوڕاست هەستی دڵ و دەروونی دەرئەبڕێ.

بەڵام (نیشانەگەری) بەشێوەی لابەلا، بەوێنە و بەنیشانە هەستی دڵ و دەروونی دەرئەبڕێ.. ئەمیان بەئاشکرا دەری ئەبڕێ، ئەویان لەژێر پەردەوە دەری ئەبڕێ.

ئەگەر لە نیشانەگەرێک بپرسیت: بۆچی دەربڕینی ئێوە لەژێر پەردەوە ئەبێ؟. لە وەرامدا پێت ئەڵێ:

– چونکە زۆر هەستی دەروونی هەیە، بەقسە پێشان نادرێ، ئێمە ناچارین بەوێنە و نیشانە، هەمووی یاخود هەندێکی، پێشان بدەین. کە زۆر خوێندەوار بیروباوەڕ و هەستەکانی ئێمە لەناو تارماییدا ئەبینی و بەئاستەم تێیان ئەگات![2]

١٩٦٢/١٠/٢٥

---

(١) شێوازێکی ڕاپۆرتی– أسلوب تقريري.

(٢) مامۆستا لە کۆتایی ئەم باسەدا، لە دامێنی لاپەڕەکەوە نووسیویە: (تا ئێرە هی پۆلی سێهەمە).

# نرخی ویژەیی -٢-

بۆ پۆلی چوارەمی زانستگای ویژە

بەشی کوردی

وەرگر و وەرگێری

شاکر فتاح

١٩٦٣-١٩٦٢

## نرخی ویژیی چییە؟

### بەکورتی مێژووی نرخی ویژەیی

**لای یۆنانییەکان:**

نرخی ویژەیی لەگەڵ ویژەدا پەیدا بووە، یۆنانییەکان هەر لە زووەوە خاوەنی زمانێکی پاراو و هەستێکی ناسک بوون. کە هۆنراوەی بوێژێکیان چاوپێ ئەکەوت، بیروباوەڕی خۆیان دەربارەی دەرئەبڕی، لە بابەت وشە و واتا و کێش و دارشتنیەوە ئەدوان و بڕیاری خۆیان لەسەری پێشان ئەدا.

بەڵام ئەمە بەشێوەیەکی ساکار ئەکرا، هێشتا دەستوورێکی وای نەبوو کە نرخزان لەسەری بڕوا.

پاشان نووسینەوەی (ئەلیادە) و (ئۆدیسە) هاتە پێشەوە، لەسەر ئامۆژگاری (سۆلۆن)[1]، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی (نرخ دانان و لێکۆڵینەوە و بژار) لە هەردوو چیرۆکەکەدا بکرێ، بۆ ئەمەی وەک هۆنراوەیەکی ناوازە پەسەندبن لای یۆنانییەکان، کە ئەوە تەواو بوو ئیتر ماوە نەما بۆ کەس کە دەستکاری ناوەرۆکیان بکات.

کە سەدەی پێنجەمی پێش زاین دەستی پێ کرد و هۆنراوەی لاسایی پەیدابوو و لە ئەتینادا جێگیربوو، نرخ دانانی ویژەیی پێشکەوت، فراوان بوو، لێکۆڵینەوەشی زۆرتر تیا ئەکرا. (نرخ دانانی ویژەیی) نوێشی لەمەوە پەیدابوو؛ کە فەرمانڕەوایی یاسایەکی دانا بۆ بڕیاردان لەسەر ئەو چیرۆکانەی هەموو ساڵێک بوێژەکانی یۆنانی پێشکەشی فەرمانڕەواییان ئەکرد، بۆ پەسەندکردنی ئەوانەی کە بەکەڵکی گشتی دێن، تا لاسایی بکرێنەوە.

دیارە ئەو لێژنەیەش کە فەرمانڕەوایی دایناوبوو بڕیاریان لەسەر بدات، ناچاری لێکۆڵینەوە و سەرنجدان

---

(١) سۆلۆن Solwn – ٦٤٠ – ٥٥٠ دەورووبەری ٥٥٠ پ. ز. یاسادانەرێکی ئەسینایی بوو، یەکێکە لە حەکیمەکانی یۆنانی، باری باج و سەرانە سەندنی لەسەر شانی داماوان و هەژاران سووک کرد، گەلێ یاسای چاک و سەرفرازکەری لە سەردەمەکەیدا دانا و جێبەجێ دەکران.

و نرخ دانانی وێژەیی ئەبوون، بۆ ئەمەی کام چیرۆکیان بەکەڵک بێت ئەوەیان پەسەند بکەن.

فەرمانڕەوایی تەنیا شێوەی دەرەوەی نرخ دانانەکەی دیاریکردبوو، گوێی نەدابووە ناوەڕۆکەکەی، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کە بوێژەکان بایەخ بدەن بەچیرۆکەکانیان، بەربەرەکانێی یەکتریش بکەن. لەوەدا کە (بابەتەکان) و (واتاکان) و (شێوەی نووسینەکان) یان قاڵکراو و پوختە و پەسەندبن.

ئەمانە هەموو لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی پ. ز پەیدابوو.

کە یۆنانی گەیشتە نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەم، ژیان لە زۆر ڕووەوە گۆڕابوو، بەتایبەتی (هۆش: فکر). بەهۆی پێشکەوتنی (ڕاستی پەرستی: فەلسەفە)یەوە لەگەڵ دەسەلاتی (سۆفسەتاییەکان)دا کە ئەیانویست بەهۆی (وتار: خطابة)ەوە کار لە دڵی ئەم و ئەو بکەن... پێشکەوتن بەرپابوو.

ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی لە (وتار، شێوەی نووسین و ناوەرۆکی و واتای) هەروا (پەیوەندی وتاربێژ بەگەلەوە) بکۆڵنەوە، هەرچی هونەریش بوو وەک: وێنەکێشان، ساز و، ئاواز، ئەوانیش هونەرمەندی و شارەزایی و ئاوازەیی تیا دەرکەوت.

جگە لەوە، بیروباوەڕی ڕاستی پەرستیش پەیدابوو، مرۆڤایەتی لە (بتپەرستی و کەلەپووری بیری یۆنانی)ی دوو دڵ ئەکرد. بەرەیەکیش پەیدابوو دانیان نەئەنا بەوەی پێشوویاندا، پاشان ئەم بەربەرەکانێیە کە لەناوەند هەردوو بەرەی سەدەی پێنجەمدا پەیدابوو؛ گڕی سەند، تا بوو بەهۆی پەیدابوونی دەستەیەکی (تازە پەروەران: المجدون) لەوێژەدا، بەتایبەت لە (وێژەی مەرگەسات).

گەلێک بابەتی نرخی وێژەیی نووسرانەوە کە بەرەنگاریی پێشینانیان ئەکرد، لە بابەت بیروباوەڕیانەوە دەربارەی واتای لاسایی کردنەوە و شێوەی نووسینەوەی وشەو واژەکانی و بابەت و ناوەرۆکەکانی، یەکێک لەوانە چیرۆکی (بۆقەکان) بوو کە (ئەریستۆفان) لە ٤٠٦ی پ. ز. دایینابوو.

بەپاڵ ئەم نرخی وێژەییەوە کە وێژەوانەکانی کۆن و تازەی یۆنانییەکان هێنابوویانە ناوەوە، جۆرێکی کە لە نرخ دانان پەیدابوو، پێشکەوتووتر بوو، ئەوەی ڕاستی پەرستەکان هێنا بوویانە بەرهەم، هەر ئەم جۆرە نرخ دانانەبوو کە وێژەی یۆنانی و ڕۆمانی پێوەی ئەژیان، هەر ئەمیش بوو کە کاری کردە سەر وێژەی عەرەبی کۆن و وێژەی ئەورووپایی تازە.

ئەمە لە (وشە و واتاو بابەت)ی ئەکۆڵیەوە، ئەلیادە و ئودیسەشی کردبوو کۆڕی[1] لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە. ڕاستی پەرستەکان کە سەرنجیاندا هۆمیرۆس هاوڕێکانی، (خواکان) بەپێچەوانەی هۆش پێشان ئەدەن؛ جا دەستەیەکیان هوروژمیان بردەسەر (هۆنراوە) و بێزارییان دەربڕی بەرامبەری، بەڵام دەستەیەکی تریان، لەسەر هۆنراوە یان دەکردەوە و ئەیانگوت: «چەقەیدی هەیە، هۆنراوە خواکان لە شێوەیەکی ئەندێشەیی وا جواندا پێشان بدات، پێویستە بەو ڕەنگەبێ»، بەڵام هەردوو دەستەکە پێیان لەوە ئەنا کە لە هۆنراوەدا جوانییەک هەیە کە چاوەستی هەموو کەسێک ئەکا، کەواتە دەبێ ڕازی ئەم جوانییە تێ بگەین. سەرنجیاندا، جوانی لە کێشدا دەرئەکەوێ؛ دەستیان کرد بەلێکۆڵینەوەی کێشەکان و

---

(١) ڕاستتر: تەوەری، میحوەری

پەیوەندی هەریەکـەیان بە(واتا) و (بابەت)ی تایبـەتی خـۆیەوە، سـەرنجـیـاندا جـوانی لە (زیان)دا دەرئەکـەوێ، چونکە زیانی هۆنراوە و بوێژ جـوێیـە لە زیانی ڕەمـەکی، پڕیەتی لە ناسکی و جـوانی و ڕازاوەیی، ئەم سەرنجانەیان نووسی... لەکاتی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا کە لە (زیان)دا ئەیانکرد لە بابەت تاک و تەرای وشەکانەوە و لێکدراوەکانیەوە.

بۆ یەکەمجار لە مێژووی ژیانی مرۆڤایەتیدا (زانستی زیان)(*) پەیدا بوو، پاشان کە لێکۆڵینەوەکە فراوانتر بوو لە بابەت (واژە، ڕستە)کانەوە، زانستی واتا (علم المعانی) پەیدا بوو.

بەتەنیشت ئەمانەشەوە ڕاپەڕینێکی (سیاسی) لە هەر چوار لای یۆنانستـانەوە پەیدا بوو، بووە هۆی پەیدابوونی گـەلێک بەرەنگاری و چەندوچوونکردن لەگەڵ یەکدا، لەبەردەم دادگـادا، ئەمـەش پێـویـستی بەگـفتـوگۆ و وتـاردان و لەسـەرخـۆ کـردنەوە هەبوو، لەمـەوە وتار پێـشکەوت، (پەخـشـان)یش دەرکـەوت، چونکە کەڵکی کۆمەڵایەتی و گەوهەری هونەری تیابوو.

لەم کاتەدا سۆفسەتاییەکان کەوتنە جووڵە جووڵ، ئەمانە لە ڕەوشتیاندا بو، دانیان نەئەنا بەڕاستیدا بەدوای ئەوەدا ئەگەڕان: (خۆشی لەوە ببینن) کە کار لە کۆمەڵ بکەن بەهۆی دڵنیاکردنیانەوە، بێ ئەمەی گوێ بدەنە ئەنجامی کردەوەکەیان.)

ئەمـەش هەڵیکبـوو بەکـەڵکی ئەمـە ئەهات کـە بەتەنشت لێکۆڵینەوەی هۆنراوە و (نرخ پێـدان)یەوە، لێکۆڵینەوەش لە (وتـار)دا بکرێ و لەهەمـوو ڕوویەکـیـشـەوە نرخی پێ بدرێ. کـە سـوکرات لە بڕانەوەی سـەدەی پێنجـەمـدا پەیدابوو -ئەویش لە پێـشـدا سـۆفسـتـایی بوو- ڕاسـتی شـتـومـەکی دامـەزراند و دەریخـسـت، ئـایینی مـامـۆسـتـاکـانی خـۆی ڕووخـاند، گـوتی: «زیان پاراوی- بلاغە، بەیان- هونەرێکە ڕاستی دەرئەخات» بۆ ئەم مەبەستەش ڕێگەی گفتوگۆی گرتەبەر.

دوای ئەو (ئەفـلاتوون) خـاوەنی پێـشبـینی (نموونە: مـثل) لە ڕاسـتی پەرسـتـیـدا، پەیدابوو و گـوتی: «وێژە یان قسە هونەرێک نییە مرۆڤ دای بهێنێ و دروستی بکات. بەڵکو نیاز و خوریەیەکە بەدڵا دێت: دەروونی پاک پەی بەڕاستی شت ئەبات، پاش ئەوە بەهۆی هۆنراوە، پەخشان، ڕاستی پەرستییەوە لەم و لەوی ئەگەێنێ، مـرۆڤـیش پێـویـسـتی بەزمـانێـکی پاراو هەیە، بۆ ئەمـەی ئەوەی لە دڵـیـایە بیگەیەنێ بەهەموو کەس».

قسـەلای ئەفـلاتوون دوو بەشـە، بەشـێکی لەخـۆیەوە هەیە، هونەری ئێـمـەی تیا نیـیـە، ئەویش هێـزی دەروون و پاکژیەتی کە ئەتوانێ پەی بەڕاستی شت بەرێ و نیاز وەرگرێ.

بەشەکەی تری قسە: دەستکەوتە، واتا ئەو هونەری زیان پاراویەیە کە قسـەکـەر ئەینوێنێ، بەجۆرێکی وا کە کار لە دڵی گوێگر و خوێندەواربکا.

لای ئەفـلاتوون (نرخی وێژەیی) بریتـیـیـە لە زانسـتی دەروون و کـاروباری دەروون و هێـز و هەڕەتی دەروون، بۆ ئەمەی بکرێ بەبنچینە بۆ قسەی ڕەوان (الکلام البلیغ).

---

(*) مەبەس لە: زانستی زیان (علم النحو)ە... (ش. ف)

کە گەیشتینە سەدەی چوارەمی پ. ز، چاومان بەئەرستۆ ئەکەوێ؛ ئەو راستی پەرستەی کە هەرچی راستی پەرست و بوێژ و زبان زانەکانی پێش خۆی نووسیویانە و خوێندونیەتەوە، لەناو مێشکیا تواندویەتییەوە، بەڵکو قاڵ و پوختەشی کردون و تەواویشی کردون... نووسراوەنە مرەکەی دائەنێ بەناوی (وتار و هۆنراوە)وە کەتا ئێستاش یەکە سەرچاوەیە لە زانستگا بڵندەکانی جیهاندا. بۆ ئەوانەی کە بەدوای (بنچینەی قسەڕەوانی و نرخی وێژەیی)دا ئەگەڕێن.

## پەیدابوونی نرخی وێژەیی لەزبانی کوردیدا

### هی کۆن- هی تازە

داخەکەم، هەتا ئێستا نووسراوێکی کوردیمان لەبەر دەستا نییە کە لە بابەت نرخی وێژەییەوە نووسرابێتەوە، تا بتوانین بزانین پێوانەی نرخی وێژەیی لە کۆن و تازەدا لە زبانی کوردیدا چۆن بووە و چۆنە. هەروەها بەڵگەیشمان بەدەستەوە نییە کە بتوانین بڵێین؛ نووسراوێکی کوردی لە بابەت نرخی وێژەییەوە نووسراوەتەوە و لەناوەچووە؛ بەڵام بەڵگەیەکیشمان بەدەستەوە نییە کە بتوانین بڵێین: نووسراوێکی کوردی لە بابەت نرخی وێژەییەوە نەنووسراوەتەوە.

لەگەڵ ئەمەشا بەپێی یاسای گشتی وێژە، لە ناو هەرگەلێکا پەیدابووبێ، شان بەشانی ئەو نرخی وێژەییش لەناو ئەو گەلەدا پەیدا بووە؛ بەوێنە، وێژەی یۆنانی کۆن لە سەدەی پێنجەمی (پ. ز)دا لە (ئەتینە)دا دامەزرا. شان بەشانی ئەو نرخی وێژەییش هەر لەو سەدەیەدا پەیدابوو، چونکە ئەو (چیرۆکە لاسایی)یانە خۆیان نرخدانانێک بوون بۆ ژیان و کاروباری ژیان، ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی کە نرخی وێژەیی بۆ ئەو وێژەیە پەیدابێ و شان بەشانی ئەو گەشە بکا و پەرە بسێنێ، ئەم نرخی وێژەییە لە ئەنجامدا کاری کردە سەر وێژەی (یۆنانی و رۆمانی و عەرەبی کۆن و وێژەی ئەورووپایی نوێ).

کەواتە لە زبانی کوردیشدا ئەبێ بەتەنشت پەیدابوونی وێژەکەیەوە (کە هۆنراوە و پەخشان)ە نرخی وێژەیی پەیدا بووبێ.

بەڵام هەروەک بەشێکی یەجگار گەورە لە هۆنراوە و پەخشانەکانی وێژەی کوردی، بەدەست کارەساتی ناهەمواری رۆژگارەوە لەناوچوون، هەروەها دوور نییە ئەگەر نووسراوێکیش هەبووبێ لە بارەی نرخی وێژەیی کوردییەوە، لەبەر ئەو هۆیە لەناو چووبێ.

ئەگەر سەرنجێک بدەین لە مێژووی نەتەوەی کورد: ئەبینین کە نزیکەی سێ هەزار ساڵ پتر لە پێش زایندا فرمانڕەوایی و شارستانێتی هەبووە، بەواتایەکی تر شارستانێتی نەتەوەی کورد نزیکەی دوو هەزار ساڵ پێش شارستانێتی یۆنانییەکان کەوتووە کە مێژووی وێژەیان لە هەزار ساڵ پێش زاین تێپەڕ ناکا.

کەواتە وێژەی کوردیش کە پەیوەندی بەشارستانێتی یەکەیەوە هەیە ئەبێ مێژووەکەی بەدوو هەزار ساڵ پێش وێژەی یۆنانییەکان کەوتبێ.

هەروەها ئەگەر سەرنجێک بدەین لەو بابەتانەی کە لە ناوەرۆکی چیرۆکە نەتەوەییەکانی زبانی کوردیدا

هەیە، وەک ناوێ: (بازگەردانی، چەرخ و فەلەک، سیمرغ، جادوو) کە جۆری تێگەیشتن و بیرکردنەوە و شارستانێتی کوردمان پیشان ئەدەن، تێ ئەگەین کە مێژووی وێژەکەی، بەتایبەتی پەخشانەکەی ئەگەرێتەوە بۆ دوو سێ هەزار ساڵ یان پتر لە پێش زایندا.

کەواتە بەم پێیە نرخی وێژەیی زبانی کوردیش مێژووەکەی ئەگەرێتەوە بۆ ئەو سەردەمە کە لە سێ هەزار ساڵ پ. ز. کوردەکان فەرمانڕەوایی و شارستانێتی یان بووە.

جا هەروەک لەمەوپێش وتمان (نرخی وێژەیی)ی کوردیش وەک زۆربەی بەرهەمە وێژەییەکانی کوردی، کارەساتی سامناکی ڕۆژگار کە دوژمنانە بەرامبەر کورد ڕوویداوە، لەناوی بردووە.

لەگەڵ ئەوەشا کە کوردەواری، ئایا لەبەر کارەساتی ڕۆژگار بووبێ یان لەبەر نەخوێندەواریی، یاخود لەبەر کەمتەرخەمی خۆیان کە نەیانتوانیوە زۆربەی بەرهەمە وێژەییەکانیان بەنووسراویی بپارێزن، بەڵام توانیویانە بەهەزاران چیرۆک و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و مەتەڵ و کۆمەڵە هۆنراوەمان لە سنگی خۆیاندا بۆ بپارێزن لەگەڵ نرخی وێژەیی ئەو بەرهەمانەدا.

ئەگەرچی ئەو هۆنراوانەی لەبەر دەستدایە تەمەنیان لە هەزار ساڵێک پتر نییە، بەڵام وەک لەمەو پێش پێشانماندا پەندی پێشینان و چیرۆکە کوردیەکانمان تا نزیکەی پێنج هەزار ساڵێک ئەگرێتەوە.

ئەوی بەنووسراوی لە کوردیدا، لە نرخی وێژەیی بەرهەمە کوردیەکانمان و زبانەکەمان دوایێ، بەپێی ئەو هۆنراوە و پەخشانانەی لەبەر دەستماندان، ناودارەکانیان، ئەمانەن:

| | | |
|---|---|---|
| ١- ئەحمەدی خانی | ١٦٥٠- ١٧٠٦ | بەهۆنراو |
| ٢- حاجی قادری کۆیی | ١٨١٥- ١٨٩٢ | بەهۆنراو |
| ٣- نالی | ١٧٩٧- ١٨٥٥ | بەهۆنراو |
| ٤- سالم | ١٨٠٠- ١٨٦٦ | بەهۆنراو |
| ٥- کوردی | ١٨٠٩- ١٨٤٩ | بەهۆنراو |
| ٦- شێخ ڕەزای تاڵەبانی | ١٨٣٥- ١٩٠٩ | بەهۆنراو |
| ٧- ئەمین فیضی | ١٣٩٩هـ | پەخشان |
| ٨- شێخ نوری شێخساڵح | ١٨٩٢- ١٩٥٩ | بەهۆنراوە و پەخشان |
| ٩- ڕەفیق حلمی | ١٨٤١- ١٩٥٦ | بەهۆنراوە و پەخشان |
| ١٠- علاءالدین سجادی | - ١٩٥٢ | بەهۆنراوە و پەخشان |

جگە لەمانە، لەم ڕۆژنامە و لەو ڕۆژنامەیشدا، گەلێک وتار لە بابەت (نرخی وێژەیی) و (نرخی وێژەیی کوردی)یەوە لەلایەن هەندێ نووسەران و وێژەوانانەوە نووسراونەتەوە، لەم چەرخەدا، وەک: (گۆران، مەعروف خەزنەدار، محرم محەمەد ئەمین، دکتۆر کامەران بەدرخان، دکتۆر جەلادەت بەدرخان، ڕەوشەن بەدرخان، ئەسرین محەمەد، ساڵح زەکی بەگ، گیوی موکریانی، حوسێن حوزنی، شێخ سەلام، ئەمین زەکی بەگ، پیرەمێرد).

ئەمانە هەموویان، یان بەجۆرێکی گشتی باسی وێژەیی کوردیان کردووە، یان لە چەن ڕوویەکەوە باسی هەندێ لە بوێژ و نووسەرە کوردەکانیان کردووە، یان تێکەڵ لە هەردوو بابەتیان نووسیوە و نرخیان بەوێژەکانیان داوە. بەڵام هیچیان لەسەر بنچینەیەکی زانستی بەتەواوەتی و لە هەموو ڕوویەکەوە کێشانەی وێژەی کوردی یاخود وێژەی ئەو وێژەوانەیان نەکردووە، وەک ئێمڕۆ لەناو (نرخزان)ەکانی ڕۆژئاوادا باوە، لە ڕاستیدا وێژەی کوردی پێویستی بە(لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ) و (شیکردنەوەیەکی ورد) و(لێکدانەوەیەکی فراوان) و (بژارێکی پوختە) هەیە، لەگەڵ بەستنەوەی بەرهەمەکان بەمێژووی ژیانی وێژەوانەکان و ناوچەی کوردستان و کاروباری کۆمەڵایەتی کورد و ئەو کارەساتانەی کە لە هەر چوارلای کوردستاندا ڕوویداوە لە تەمەنی بوێژ و نووسەرەکاندا.

هەروەها پێویستی بەپێشاندانی ڕێگای پێشکەوتنی وێژەی کورد و گەشەکردن و پەرەسەندنی هەیە، لەگەڵ تیژکردنی هونەرمەندانی کورد بۆ فەڕ بەخشین بەزبان و وێژەی کوردی.

لەگەڵ ئەمەشا ئەو تێکۆشینانەی ئەو بوێژ و نووسەرانە کردوویانە لە بابەت نرخدان بەوێژەی کوردی و نرخ دان بەژیانی کوردەواری و دۆزینەوەی هۆی دواکەوتنی وێژەی کوردی و هۆی پێشکەوتنی کوردەواری و وێژەکەی.

هەنگاوێکی گەورەن بۆ داهاتنی نرخی وێژەیی لە زبانی کوردیدا لەسەر بناغەیەکی زانستی و گەشەکردن بەوێژەکە و پەرەسەندنی، هیواش هەیە لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا هەچ کەموکورییەک هەیە لەم ڕووەوە تەواو بکرێ، تا نرخی وێژەیی کوردیش بگاتە ڕیزی زبانە پێشکەوتووەکانی جیهان.

## نرخی وێژەیی چییە؟

لێکۆڵینەوەی بەرهەمی وێژەییە، ڕوونکردنەوەیەتی، پێشاندانی گەوهەرەکانییەتی، پێشاندانی هونەرەکانییەتی، پێشاندانی هۆی جوانی و ناشرینیەتی، لێکدانەوەیەتی، شیکردنەوەیەتی، بەراوردکردنێتی لەگەڵ بەرهەمی تردا، بژارکردنێکی، بڕیار لەسەر دانە بەپێشاندانی (نرخ و پلەی) وێژەکە، هەروەها وریاکردنەوەی خوێندەواریشە بۆ شتی باش و پەسەند وە شتی خراپ و ناپەسەند لە وێژەکەدا.

لەگەڵ یاریدەدانیان لە تێگەیشتن و نرخ دانانی وێژەکە.

هەروا چاکترین ڕێگا پێشان بدرێت بۆ (بیرکردنەوە هەست دەربڕین و پێشاندان) بۆ گەیشتن بە(بەرزترین ئامانج) لە وێژەدا. پەیوەندی نرخی وێژەیی: بەدووشتەوە بەندە:

١- نرخزان (ناقد)

٢- نرخ بۆدانراو (منقود) یاخود بەرهەمی وێژەیی.

نرخزان: یاخود نرخدانەری وێژەیی ئەبێ تیژبین بێ، زیرەک و دڵتەڕێکی زرنگ بێ، ئەبێ بتوانێ لەگەڵ وێژەواناندا هاودڵی بکات، ئەبێ دووریشبێ لەو شتانەی کە کاری خراپ لە دەروونی بکەن و بڕیاری نادروستی پێ بدەن، ئەبێ لە وێژەو زانستدا خوێندەواری تەواوبێ، شارەزاییەکی زۆری هەبێ لەوێژەدا لە

مێژووی گۆڕانی وێژەدا، لە پەیوەندی وێژە بەهونەرەکانی ترەوە.

ئەبێ ئەوەندە مەشقی لەوێژەدا کردبێ کە بتوانێ باش لە بەرهەمی وێژەکە تێبگا و لێیشی بکۆڵێتەوە. بۆ ئەمەی بتوانێ بڕیارێکی ڕاست و دروست و دادپەدوەرانەی لەسەر بدات.

سەرنج: هەندێک هەن بۆ وشەی (نقد)، (ڕەخنە)یان داناوە لە بریتی (نرخ دانانی وێژەیی) یاخود (نرخی وێژەیی). لام وایە وشەی (ڕەخنە) جگە لەوەی لە کوردی ناکات، واتاکەشی دوورە لە واتا و مەبەستی (نقد: نرخی وێژەیی)ەوە: وشەی ڕەخنە واتاکەی هەر پێشاندانی کەموکوڕی و خەوش و نەنگییە، ئەوەش لە وێژەوان ناوەشێتەوە، لە پیاوی بەدخوو و دڵڕەش و ناپاک ئەوەشێتەوە بەڵام (نرخ دانانی وێژەیی) پڕ بەپڕی وشەی (نقد)ە کە بەواتای ئەم چەرخە بڕیاری لەسەر دراوە، بەڵکو ئەتوانم بڵێم لە وشەی (نقد)یش پڕ واتاترە بۆ ئەو مەبەسەی بۆ (نقد) دانراوە.

## چێشکەی وێژەیی

* چێشکەی وێژەیی چییە؟ بریتییە لەو هێزەی کە (نرخ و پلە)ی بەرهەمی وێژەیی پێ دەرئەخرێ، وە ئەتوانین بەهۆی ئەوەوە چەند و چۆنی (تقدیر)ی جوانی دەربخەین، خۆشی لە جوانی وەرگرین، ئەو جوانیەش بەپێی توانامان لە کردەوە و قسەو بیرماندا دەربخەین.

چێشکەی وێژەیی شتێکە تێکەڵ لە تەزوو (عاطفە) و هۆش و (هەست پێکردن)، بەڵام تەزووی لە هەموویان زۆرتر تیایە.

* بەشەکانی چێشکە: لە لایەکەوە کراوە بەدوو بەشەوە:

١- چێشکەی باش، یان جوان، یان تەواو.

ئەوەتا کە بەرهەمی چاک لەهی خراپ جوێ ئەکاتەوە.

٢- چێشکەی خراپ، ئەوەتا کە فڕی بەسەر چاک و خراپەوە نییە.

خاوەن چێشکەی باش، کەمن. هەموو دەم ناچار ئەبێ چێشکەکەی خۆیان لە دەرد و نەخۆشی بپارێزن.

لەلایەکی تریشەوە چێشکە کراوە بەدوو بەشی ترەوە:

١- چێشکەی بەرجەستە، ئەوەیە کە پەیوەندی بەشتی هەستپێکراوەوە بێ وەک: خواردەمەنی، ڕەنگ، دەنگ، بۆن، چاوئەنداز.

٢- چێشتکەی واتایی، ئەوەیە کە پەیوەندی بەئەندێشە و بیر و ڕەوشت و خوو و ئایین و یاسا و دەستوورەوە بێ.

دیسانەوە، کراوەتەوە بەدووبەشی ترەوە:

١- چێشکەی نەکردن (الذوق السلبي)، ئەوەیە کە پەی بەجوانی ئەبات و ئەیچێژێ، بەڵام ناتوانێ ئەو پەیبردنە دەرببڕێ و لێکی بداتەوە و ڕازەکانی دەربخا.

٢- چێشکەی کردن (الذوق الأيجابي)، ئەوەیە کە پەی بەجوانی ئەبات، لە ناشرینی جیای ئەکاتەوە، لە

بەرهەمەکەدا شوێنی جوانی و ناشرینی دەرئەخات، ڕازی هەردووکیشیان دەرئەخات، ئامۆژگاری خۆیشی دەرئەبڕێ.

جگە لەوانە چێشکەیان کردووە بەسێ جۆری ترەوە:

١- چێشکەی گشتی: ئەوەتا هەمـوو کەسێک لە نەتەوەیەکا، لە شارێکا، لە هۆزێکا، لە ناوچەیەکا، دەربارەی شتێک یەک چێشکەیان هەیە.

٢- چێشکەی تایبەتی: ئەوەیە کە جگە لە جێگەی گشتی، هەریەکە چێشکەیەکی تایبەتی خۆی هەیە و کەسی تر لەگەڵیا نییە.

٣- چێشکەی جیهانی: ئەوەیە کە هەموو جیهان تیا هاوبەشن، لەبەر سروشتی مرۆڤایەتی خۆیان کە حەز لە جوانی ئەکەن و چێشکەی جوانی ئەکەن: ڕەوشتی جوان، کردەوەی بڵند، سروشتی ڕەنگین، وێژەوانە گەورەکان وەک: شکسپیر و هۆمەر و ئەحمەدی خانی... ئەمانە هەموو لەو بابەتانەن کە خوێندەوارانی هەموو جیهان خۆشیان ئەوێن و بەسەرسوڕمانەوە سەیریان ئەکەن.

* گۆڕانی چێشکە: چێشکەی وێژەیی؛ بەپێی (کات و جێگا و ڕەگەز و پەروەردەکردن و کەس) ئەگۆڕێ. مێژووی چێشکەی وێژەیی بەتەنیشت مێژووی وێژە و نرخی وێژەییەوە ڕۆیشتووە و گۆڕاوە.

* پێکهێنانی چێشکە: ئەگەر یەکێک لە خۆیدا چێشکەی وێژەیی نەبێ، پێی پەیدا ناکرێ، بەڵام ئەگەر هەر تۆزێکیش چێشکەی هەبێ، ئەتوانرێ بەهۆی خوێندەواری و پەروەردەکردنی وێژەییەوە ئەو چێشکەیە باشتر و جوانتر و بەهێزتر بکرێ. تا وای لێدێ ڕازی جوانی و ناشرینی بەرهەمی وێژەیی دەربخات.

(چێشکەی جوان) بەم جۆرە بەهێز و گەشەی پێ ئەکرێ:

١- ڕێگای نەکردن: وەک خۆپاراستن لە خوێندنەوەی وێژەی خراپ، لە بینینی چاو ئەندازەی هۆنەری ناشرین، لە یانە و مرۆڤ و ناوچەی پڕ لە قسەی پڕوپووچ و کردەوەی نەنگ... ئەویش بۆ ئەمەی چێشکەکە بریندار نەبێ و دەردی کاریگەری تووش نەبێ.

٢- ڕێگای کردن: ئەویش هۆگر بوون بەو شتانەوەیە کە چێشکە گەشەی پێ ئەکات پێی پووختە ئەبێ، بۆ ئەمەی پەی بەرێ بەجوانی و ناشرینی، بەوردی هەست بەشت بکات، بەتوندی و دروستی بڕیاریش بدا، ئەم ڕێگایەش دوو پلەیە:

أ- پلەی گشتی: ئەویش ئەوەیە کە پیاو بەباشی خۆی بگەیەنێتە هونەرە جوانەکان، تێیان بکات، چێشکەی بکات، چاوئەندازانی ناوازە و ڕەنگین تەماشا بکات؛ سروشتی بن یا دەستکرد، خۆی ڕابهێنێ بەپۆشینی جوان و ڕێکوپێک و خاوێن، بەیاساوە، بەکردەوەی باش و ژیانی کۆمەڵایەتی باشەوە، بایەخیش بدا بەخوێندەوارییەکی ڕاستەقینە...

ئەمانە هەموویان جوانی ئەخەنە ناو دەروونەوە، چێشکەش ئامادە ئەکەن بۆ وەرگرتنی وێژەی بڵند و چێشتنی، چاولێکردنی وە خۆ دوورخستنەوە لە هەموو شتێکی ناشرین و نەنگ.

ب- پلەی تایبەتی: ئەویش ئەوەتا کە ڕاستەوڕاست خوو بداتە خوێندنەوەی چاکترین بابەتی وێژەیی لە هۆنراوە و پەخشان، بەڵام خوێندنەوەکەشی وا بێ کە کەڵکی لێ وەرگیرێ، واتا هەوڵ بدات کە لێی تێ بگات، گەوهەرەکانی لە یەک جوێ بکاتەوە، پەیوەندی ناو گەوهەرەکانی و ڕازی ڕاستی و هێز و جوانی هەر یەکەیان بۆ دەرکەوێ، پاشان لە گیانی وێژەوانەکە و هۆش و کەسێتیشی تێ بگات، شتێ لە بەسەرهاتی ژیانی تا زوو بچێتە دڵیەوە و تێی بگات.

ئەمیش ئەوە ئەگەیەنێ کە چێشکەی وێژەیی، نرخی وێژەیی پەروەردە ئەکات، گەشەی پێ ئەکات، وە نرخی وێژەیش چێشکەی ڕاستەقینە پەروەردە ئەکات و پێی ئەگەیەنێ.

* نرخ و کەڵکی چێشکەی وێژەیی: چێشکەی باش داردەستی نرخزانە، بەهۆی ئەوەوە پەی بەجوانی و بەرهەمی وێژەیی ئەبات، کەموکوریی تێ ئەگات، بەرهەمەکە لێک ئەداتەوە ڕازی جوانی و ناشرینییەکەی دەرئەخات. دیسان بەهۆی ئەوەوە ئەتوانین چاکترین ڕێگا پێشان بدەین بۆ بەرهەمهێنانی کاریگەرترین بەرهەمی وێژەیی... بەهۆی چێشکەی باشەوە بەرهەمی وێژەیی باش پێک ئەهێنرێ، بیرەکان پوختە ئەکرێن و بڵند ئەکرێنەوە، وشەکان بەجوانی ڕێک ئەخرێن تا دڵ کێش بکەن و کار لە دەروون بکەن.

هەروا کارێکی گرنگ ئەکات لە ژینی بیروباوەڕ و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی، چاکبینی و هۆگری زیند و ئەکاتەوە، کامەرانی ئەخاتە ژیانەوە.

جاری واش هەیە چێشکەی وێژەیی پێش هۆش ئەکەوێت لە بڕیاردان بەسەر بەرهەمی وێژەییدا.

## نرخی وێژەیی زانستەیان هونەر؟

تا ئێستا لە ناوەند زانیارییەکاندا هەر مقۆمقۆیە کە ئایا (نرخی وێژەیی) زانستەیان هونەر؟، لە ڕاستیدا نە ئەتوانین بڵێین ئەم بابەتە بەتەواوی (زانستی نرخی وێژەیی)یە، نە ئەشتوانین بڵێین (هونەری نرخی وێژەیی). ئەم نرخی وێژەییە ئەکەوێتە ناوەند زانست و هونەرەوە، بەڵکو ئەتوانین بڵێین (هونەرێکی ڕێکخراوە)، بەواتایەکی تر: لە سەرێکەوە زانستە و لە سەرێکی تریشەوە هونەرە.

داهاتنی زانستێک بەناوی (زانستی نرخی وێژەیی)یەوە شتێکی (پەیدانەبوو: مستحیل) نییە، ئەوەندە هەیە بەگران دروست ئەبێ، ئەبێ دەستوورەکانیشی ساکار و کەم بن و لە باریشیاندا هەبێ کەم و زۆر بەپێی پێویست بکشێن.

چونکە هیچ دەستوورێکی گشتی ئەم هەموو چێشکە ڕەنگاوڕەنگانە، نرخزانە هەڵکەوتووانە و جۆری هونەری وێژەییانە ناگرێتەوە، لەبەر ئەوە، پێویستە ئەم پێڕەوەیە زانستییە کە دائەنرێ بۆ نرخی وێژەیی، تەماشای ئەم بەرهەڵستانەی تیابکرێ. پێویستە دەستوورەکانی کەم و ساکاربن؛ چونکە نرخی وێژەیی تەنیا دان بەو دەستوورە کەم و ساکارانەدا ئەنێ، ئامانجیشی بەرهەمی وێژەییەکەیە، نەک وێژەوان. بەتەنیشت ئەم دەستوورانەشەوە ئەبێ دان بنرێ بەچێشکەی (نرخ زان)دا، بەهەست و تەزووی نرخ زاندا، کە ئەبێ نرخ زانەکە پێش ئەمەی بڕیارەکەی خۆی لەسەر بەرهەمەکە بدا باش لێی بکۆڵێتەوە و تێی بگات.

ئەم دەستووری نرخی وێژەییانە، هەر چەندە ناتوانن هەستمان بەجوانی پێ بکەن ناشتوانن دەروونمان بەجۆرێکی وا بووروژێنن کە پشتیان پێ ببەستین بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکە و نرخ دان پێی؛ بەڵام یارمەتیمان ئەدەن لە پوختەکردن و قاڵ کردنی هەستەکانماندا، ڕێگا پێشان ئەدەن بەچێشکەکانمان، هەروا بڕیارەکانیشمان دەربارەی بەرهەمەکە نزیک ئەخەنەوە لە ڕاستی و دروستی و تەواوی.

هەرچەندە نرخی وێژەیی بەپێی نرخ زان ئەگۆڕێ، بەڵام هەندێ جار چێشکەی هەموو لایەک لە جیهاندا لەسەر بەرهەمێک یاخود هی وێژەوانێک یەک ئەگرێ؛ بەرهەمەکانی: شکسپیر و هۆمەر و ئەحمەدی خانی لە هەموو دەمێکا لە هەموو گەلێکا لەلایەن هەموو نرخ زانێکەوە پەسەندن.

هەروەها هەرچەندە نرخزان و وێژەوانان لەسەر (یەکێتی کات و جێگا) ڕێک نەکەوتوون، بەڵام هەموو لایەک لە جیهاندا لەسەر (یەکێتی بابەت) لە چیرۆکی لاساییدا لە هەموو دەمێکا ڕێک کەوتوون؛ هەر لە سەردەمی یۆنانییە کۆنەکانەوە تا ئیمڕۆ.

کەواتە لەگەڵ ئەوانەشا شتێکی گشتی مرۆڤایەتی وا هەیە کە هەموو چێشکەیەک پەسەند بکا، جا لەمانەوە چەند یاسایەک بۆ نرخی وێژەیی دەردەهێنین، وەک: ئەگەر بمانەوێ بڕیار بدەین بەسەر ئەو تەزوانەدا کە لە بەرهەمێکدا ئەیانبینین، دەبێ تەماشای ئەم دەستوورانە بکەین (ڕاستی، هێز، بڵندی)، ئایا ئەمانە لە تەزووەکەدا هەن یان نا؟

ئەگەر بمانەوێ بڕیار بدەین بەسەر ئەو ئەندێشانەدا کە لە بەرهەمێکی وێژەییدا ئەیبینین، ئەبێ تەماشای ئەم دەستوورانە بکەین: (جوانی، ڕێک و پێکی، سازبوون لەگەڵ هەستدا، توانای هەست پێکردن- شعور-) ئایا ئەمانە لە ئەندێشەکەدا هەن یانا؟

هەروەها شێوەی نووسینیش: بەپێی دەستوورەکانی: (سووکی و ڕەوانی، هێز و جوانی) بڕیاری بەسەردا ئەدرێ. ئەو ساکە ئەو تاقیکردنەوانەمان کرد، ئەتوانین بڵێین هۆنراوەکە (بەرهەمەکە) کاریگەرە یان نا؟ پەخشانەکە باوەڕ ئەخاتە دڵمانەوە یان نا؟، وتارەکە کار ئەکاتە دڵمان، باوەڕمان پێ ئەهێنێ بەئامانجەکانی یان نا؟.

بەم ڕەنگە نرخی وێژەیی دائەنێین... بۆ بەرهەمە وێژەییەکان.

## فرمانی نرخی وێژەیی

نرخی وێژەیی بەکەڵکی وێژەوانان و خوێندەواران و وێژەدێ.

* بەکەڵکی وێژەوانان دێ چونکە:

١- بەرهەمەکانیان ڕوون ئەکاتەوە بۆ خوێندەواران، بۆ ئەوەی بەئاسانی تێی بگەن هەروەها ئاشنایەتی پەیدا بکەن لەگەڵ وێژەوانەکان.

٢- وێژەوانەکان شارەزا ئەکات لە ڕاستی و هەڵەیان، ڕێگایان پێشان ئەدا بۆ پێشخستنی بەرهەمەکانیان.

۳- وێژەوانەکان شارەزا ئەکات لە بیروباوەڕی خوێندەواران دەربارەی بەرهەمەکانیان، یارمەتی لەناوەند خوێندەواران و وێژەوانانندا پەیدا ئەکات بۆ کەڵکی وێژە و کەڵکی گشتی.

* هەروەها نرخی وێژەیی بەکەڵکی خوێندەواران دێ، چونکە:

۱- یارمەتی خوێندەواران ئەدا لە تێگەیشتنی بەرهەمی وێژەیی و نرخەکەی.

۲- ڕێگای خوێندنەوەی باشیان پێشان ئەدا.

۳- یارمەتیان ئەدات لە هەڵبژاردنی نووسراوانی خۆشی و بەکەڵک.

* بەکەڵکی وێژەش دێ، چونکە.

۱- وێژە بەهێز ئەکا و پێش ئەخا، چونکە وێژەوانان ئەخاتە سەر هەوڵ و تێکۆشین بۆ پێشخستنی بەرهەمەکانیان.

۲- ڕێگا پێشان ئەدات بۆ زیندووکردنەوە و پێشخستنی و بەرزکردنەوەی وێژە و گەشەپێکردنی.

۳- دۆست و ئاشنا بۆ وێژە زۆر ئەکات، پایەی بڵند ئەکاتەوە، نرخی پێ پەیدا ئەکات، دەسەڵاتی بۆ پەیدا ئەکات، جێی بۆ ئەکاتەوە لەناو زانست و هونەرەکاندا.

بەکورتی (نرخی وێژەیی) پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە کەڵکی بۆ وێژە و وێژەوانان و خوێندەواران و کۆمەڵ هەیە، نابێ پشتگوێ بخرێ.

## هەندێ ئەندازەی نرخی وێژەیی

لەوەپێش وتمان: هەتاکو ئێستایش نرخی وێژەیی بەیەکێ لە زانستە خاوەن تاقیکردنەوەکان دانانرێ. وەک (زانستی سروشت، کیمیا، ژمێرکاری -الریاضیات-) ئەمیش لەبەر ئەوەیە کە ئەم زانستانە بابەتین، لە شتومەک و کۆمەڵە و ژمارە بکۆڵنەوە، وەک هەن، بەوردییەکی وەها کە دوورین لە دەسکاری تەزوو و چێشکە: مزاج.

بەڵام نرخدانانی وێژەیی دوو لای هەیە: لایەکی بابەتی گشتییە، کەینە و بەینەی ڕێزمان و زبان پاراوی و هەندێک لە چێشکەی گشتی ئەگرێتەوە، لایەکیشی (خۆیەتی: ذاتي) ئەگرێتەوە، پاڵی داوە بەچێشکەی تایبەتی، مەگەر بەدەگمەن ئەگینا کەسی تر لەگەڵیا هاوبەشی نییە.

لەبەر ئەوە نرخی وێژەیی کەوتۆتە ناوەند زانست و هونەرەوە، وە بەسێ شتەوە بەستراوە:

۱- بەزانستی وێژەییەوە.

۲- بەو بەرهەمی وێژەییەوە کە کەسێکی تر دایناوە.

۳- بەکەینە و بەینەی (هونەر)ی و (دەروونی) و (ڕاستی پەرستی)یەوە.

بێینەوە سەر (ئەندازەکانی نرخی وێژەیی)، ئایا چۆنیان دابمەزرێنین؟

ئێمە ئەڵێین: بنچینەی هەرە گرنگی نرخی وێژەیی ئەو چێشکە تایبەتییە کە بەپێی مرۆڤ ئەگۆڕێ، تۆ بڵێی لەو ئەندازە دامەزراوە دیاریکراوانەی کە بۆمان داناون، سەرکێشی نەکەن؟

وەرامی ئەمە ئاوایە: لای زانستی نرخی وێژەیی جێگای مقۆمقۆ نییە، هەموو نرخزانەکان ڕێز لە زیان و دەستوورەکانی ئەگرن. هەروا پێکەوە ئەڵێین کە وێژەی بڵند لە هەڵەی بیرەوە دوورە، بەڵام یارۆی چێشکە بۆتە بابەتی مقۆمقۆ و گیروگرفت لە ناودا.

پێویستە بزانین کە ئەندازەکانی نرخی وێژەیی یا دەستوورەکانی، وەک ئەوانەی زیان و زیان پاراوی وردنین، بەڵام گشتین، هەموو چێشکەیەک ئەگرنەوە، ئەکشێن بۆ هەموو چێشکەیەک. بەڵکو ئەتوانین بڵێین:

«دەستوورەکانی نرخی وێژەیی، بریتین لە لێکۆڵینەوەی چێشکەی تەواو لە ڕوونکردنەوەی ئەملا و ئەولادا کە پێڕەوی کردنی» لەبەر ئەوە بەزۆری مەزانە کە دەستوورەکانی نرخی وێژەیی کەم بن، گشتی بن، بکشێن. لەهەر شتەش شتێکیان تیابێ، بۆ ئەمەش ئەگەڕێین کە (جوانی و هێز و ڕۆشنی) لە وێژەدا پێک بهێنن و بیکەن بەچاکترین و تەواوترین و کاریگەرترین هونەر لە ژیاندا.

ئەمانە دەستوورەکانی نرخی وێژەیی باوی ناو فەرهەنگن، جا لەبەر ئەوەی وێژەی کوردی لە هەندێ ڕووەوە لە وێژەی فەرهەنگی جیاوازە، دوور نییە کە دەستوورەکانی نرخی وێژەیی فەرەنگیش لە هەندێ شوێندا نەگونجێن کە ئەندازەی وێژەی کوردییان پێ بگرین.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە زۆر بیروباوەڕ و ڕەفتاری کوردەواری لە هی فەرهەنگەکان ناکات، لەبەر ئەوە چێشکەی هەردوو لاشیان لە هەندێ شوێندا جیاواز ئەبێ. کەواتە هەموو جارێک و لە هەموو شوێنێکا ناشێ وێژەی کوردی بەئەندازەی نرخی وێژەی فەرهەنگی بکێشین.

(ڕاستی تەزوو)، (جوانی ئەندێشە)، (ڕەوانی شێوەی نووسین)، ئەمانە هەموو لە دەستوورەکانی نرخی وێژەیین.

هەر وێژەیەک ئەمانەی تیابێ بەبڵند و ئەمر ئەژمێرێ. ئینجا ئەبێ پرس بە(چێشکەی باش)یش بکەین، بزانین چی بەباش ئەزانی لە بابەت بەرهەمی وێژەییەوە، پێشانی بدات، بەڵام بۆ ئەمەی ئەم (چێشکەی باش)ە بەهێزبێ و هەڵەش نەکات پێویستە هەندێک لە زانستەکانی:

(دەروون، جوانی، ساز و ئاواز و ڕاستی پەرستی). بخوێنینەوە وەپێڕەویان بکەین.

ئێمەلە شوێنی خۆیدا گوتمان: گەوهەرەکانی وێژە چوارن: تەزوو (عاطفە) ئەندێشە (خیال) بیر (فکرە) و ساز و ئاواز یاخود واژە یان (وێنە).

وا لەمەودوا بۆ هەر یەکێ لەم چوار کەرەستانە، دەستوورەکانی نرخی وێژەیی پێشان ئەدەین، لەگەڵ چۆنێتی و واتای ئەو کەرەستانە. بەڵام ئەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە ئەم ئەندازانە تێکڕایین، یاخود ڕوونکەرەوەن، یارمەتی نرخزان ئەدەن، چێشکەی قاڵ ئەکەن بۆ ئەمەی بتوانێ (دوا بڕیاری هونەری)ی خۆی لەسەر بەرهەمە وێژەییەکە بدات.

* سۆز «عاطفه»[1]

سۆز چییه؟، بریتییه له بزوتنی دڵ و دەروون. له نرخی ویژەییدا له سێ جۆره سۆز ئەکۆڵینەوه:

١- سۆزی ویژەوان

٢- سۆزی خوێندەوار

٣- سۆزی زەلامەکانی ناوچیرۆک[2].

که وتمان ئەبێ سۆز ڕاستەقینەبێ، مەبەستمان ئەوەیە: ویژەوان جارێ ئەبێ له دڵی خۆیدا هەستی بەدڵ تەنگی یاخود سەرگەرمی یاخود سەرسوڕمان کردبێ، ئینجا داواش له ئێمه بکات که هەست بەو سۆزه بکەین.

کەوتمان: چیرۆکەکه هەستی بەهێز و گرنگی تیادەرئەکەوێ. مەبەستمان ئەوەیە: ئەو (سۆز)انەی تیایەتی، بەهۆی زەلامەکانییەوه، بەهێز و هەرەتەوه پێشان ئەدرێن.

بەڵام ئەگەر وتمان: ئەم نامەیه یا ئەم چامەیه؛ دڵتەنگی، سەرگەرمی، ناوازەیی تیا دەرئەکەوێ. مەبەستمان ئەوەیە: ئێمه که دەستەی خوێندەوارین نامه و چامەکه ئەو سۆزانه له دڵماندا ئەبزوێنێ. لەگەڵ ئەمەشا وا باشه سەری خۆمان گێژ نەکەین، تەنیا لەو ئەندازانه بدوێین که پەیوەندییان بەخوێندەوارەوه هەیه.

کەواته (سۆزی ویژەیی) بریتییه لەو هێزەی که ویژه له دڵ و دەروونی خوێندەواراندا ئەیبزوێنێ. له ڕاستیدا خوێندەواران بریتین له نرخ دانەران، لەبەر ئەوه که وترا (سۆز) مەبەس له (سۆزی خوێندەواران)ه سۆزی خراپ: پێویسته بزانین که لەناو سۆزەکاندا دوو جۆره سۆز هەن، که زۆربەی خوێندەواران و نرخ زانانی ویژه بەسوزی ویژەییان دانانێن:

١- سۆزی تایبەتی: وەک سۆزی چاوبرسێتی و ڕاکردن له مەیدان و تۆڵەسەندن، سۆزی ستایش کردن بەمەبەستی کەڵکی تایبەتی[3]. ئەم سۆزانه پەسەند نین، چونکه دەروون هان ئەدەن بۆ خۆپەرستی و سووکی و پەستی.

---

(١) دەبێ ئاگادارین که مامۆستا کەمێ لەمەوپێش (تەزوو)ی بۆ (عاطفة)بەکارهێناوه.

(٢) (زەلامەکانی ناو چیرۆک)؛ دیاره مەبەستی: کەسایەتی و پاڵەوانەکانی ناو بەرهەمه ئەدەبیەکەیه، چونکه تەنیا (چیرۆک) کەسایەتی و پاڵەوان ناگرێته خۆ، له چیرۆکه شیعر و چامه و پەخشانی هونەریشدا کەسایەتی و پاڵەوان خۆیان دەنوێنن و بەدیار دەکەون.

(٣) ئەگەر له رووکاری زانستی دەروونناسییەوه بڕوانینه ئەم دیاردانەی که مامۆستا بە(سۆز) یان دادەنێ، هەموو (پاڵنەر- دافع)ن و هەرکام له مانەش هۆکارێکی دەرەکی خۆی هەیه بۆ وەرگرتنی ئەو هەڵوێستانه، بۆ نموونه (ڕاکردن لەمەیدان- پاڵنەری ترس و مانەوه) هۆکاری سەرەکییه. جا زاراوەی (سۆز- عاطفه) له خۆیدا بۆ ئەو بزاوتنه دەروونییه ناسکەیه که هەست وەک پەرەیەکی تەنک دەلەرێنێتەوه سا بەباری نێگەتیڤی دابێ یا پۆزەتیڤی، (سۆز) هەرگیز پاڵنەر نابی بۆ (تۆڵه سەندنەوه) و کاری توندوتیژ و ناقۆڵا.

٢- سۆزی ناخۆشی: وەک سۆزی چاوپیسی (حسد)، سۆزی وەڕسبوون، زۆرداری و بۆڵە بۆڵ. چونکە فرمانی وێژە دڵخۆش کردن و خەم ڕەواندنە نەک دڵتەنگکردن. هەروەها دەروون پوختەکردنە نەک پیسکردن.

کەواتە بەرهەمی وێژەیی بڵند، ئەبێ خۆی لەو دوو جۆرە سۆزانەی سەرەوە بپارێزێ. بەڵام ئەو دووانەی سەرەوەی لێ دەرکەوی ئیتر هەموو سۆزێک بەکاری وێژەی نەمردێ. لێرەدا لەبیرمان نەچێ کە ناوبانگ دەرکردن جیایە، زیندوێتی وێژەیش جیایە؛ چونکە بۆی هەیە، وێژەکە ناوبانگ دەرکات بەڵام تاسەر بەزیندوێتی نەمێنێتەوە.

ئەندازەکانی سۆز: پێنج ئەندازە هەیە کە سۆزی پێ بپێورێ یاخود نرخی بۆ دابنرێ:

١- ڕاستی سۆز: دەبێ لەکانی دڵی وێژەوانەوە هاتبێتە دەرەوە، ئەگینا ڕاست نابێ و کارناکاتە دڵ، پێشینان و تویانە: «دڵ ئاوێنەی دڵە»

٢- هەڕەتی سۆز: سۆزی وێژەوانەکە ئەبێ بەهێز و هەڕەت بێ، تا شێوەی نووسینەکەشی بەهێزو هەڕەت بێ، ئەگینا کاریگەر نابێ لە دڵی خوێنەر.

٣- تینی سۆز: سۆزەکە ئەبێ لە سەرەتای بەرهەمەکەوە تا دوایی وەک یەکبێ لە هێز و هەڕەت و کاریگەریدا.

٤- هەمەڕەنگی سۆز: ئەبێ وێژەکە چەند جۆرە سۆزێک لە دڵ و دەروونی خوێندەواردا ببزوێنێ، کەم وێژەوان هەیە گەیشتبێتە ئەو پایەیە، مەگەر یەکێکی وەک شکسپیر.

٥- بڵندیی سۆز: وێژەکە ئەبێ سۆزی بڵند لە دڵ و دەروونماندا ببزوێنێ. دەرکەوتووە کە ئەو سۆزانەی واتا ئەیان بزوێنێ بڵندترن لەو سۆزانەی کە کێش و سەروا و شێوەی نووسین ئەیان بزوێنێ.

هەروەها دەرکەوتووە کە سۆزی واتایی بڵندترە لە سۆزی هەستی، ئەو وێژەیەی کە دەماری مەردایەتیمان ئەبزوێنێ بۆ ڕاپەڕاندنی فرمانی خۆیەتی کۆمەڵایەتی بڵندترە لەو وێژەیەی کە هەستمان سارد ئەکاتەوە و لە ژین دوورمان ئەخاتەوە.

وێژەی پەسەند، ئەوەتا کە پڕ بێ لە سۆزی زیندووی بڵند وەک دڵسۆزی و خۆشەویستی و دادپەروەریی گشتی و یەکێتی مرۆڤایەتی و ئاشتی جیهانی.

* ئەندیشە «خیال»

ئەندیشە چییە؟، ئەو هێزە دەروونییەی کە لە وێنەیەکی وێژەیی و کاریگەردا سۆزی وێژەوان پێشان ئەدا، کەرەستەی نووسەر و بوێژ و وتاربێژ و چیرۆک نووسە. ئەندێشە لەو کارەساتی ژیانەوە پێک دێ کە لە مێشکی وێژەواندا کۆبوونەتەوە.

جۆرەکانی ئەندیشە: سێ جۆرە:

١- ئەندیشەی داهێنان (الخیال الأبتکاري) ئەوەتا لە کارەساتەکانی کۆنەوە شتێکی تازە بابەت دابهێنێ.

٢- ئەندێشەی پێکەوەنان (الخيال التأليفي)ئەوەتا کە لە وێنەی شتێکی هەست پێکراوەوە یەکێکی تری واتایی پێک بهێنرێ، بەو مەرجەی هەردوو وێنەکە لەگەڵ یەک ڕێک کەون و بسازێن و لەیەک بچن.

وەک: ئەتوانین لە چاوئەندازەی درەختێکی ڕووت و قوتی ناو کەشی زستاندا، وێنەی کزی و بەسەزمانی و سەرگەردانی مرۆڤمان بیرکەوێتەوە؛ بەدەست زۆرداریی زۆردارانەوە.

٣- ئەندێشەی لێکدانەوە (الخيال التفسيري) ئەوەیە کە جوانی لێک بداتەوە واتای بڵندی لێ دەربهێنێ، وەک ئەو واتایانەی لە فراوانی و قووڵی و سامناکی زریوە دەرئەهێنرێ.

ئەم سێ جۆرە ئەندێشەیە، لەیەک جوێ نابنەوە، بەڵکو پێکەوەن، بەهەموویشیان سۆزی وێژەوانان ئەنوێنن، لە وێنەیەکی وادا کە کار بکاتە دڵی خوێندەواران و گوێگران.

کەڵکی ئەندێشە: ئەندێشە هەروەک بەکەڵکی وێژەوان و نرخ زانی وێژەیی دێ، هەروا بەکەڵکی مێژووزانیش دێ، چونکە هەر ئەندێشەیە کە ڕاستییەکانی مێژوو ڕوون بکاتەوە و تەواویان بکات، گیان و سەردەمیشیان بۆ زیندوو بکاتەوە.

ئەندێشە و سۆز یەجگار بەیەکەوە بەندن؛ بەهۆی ئەندێشەوەیە کە سۆز بەبەرجەستەیی پێشان ئەدرێ، ئەگەر سۆز ڕاست و بەهێزبێ، ئەندێشەش ناوازە ئەبێ، ئەگەر سۆز ناساز و خۆ هەڵبەست بێ، ئەوا ئەندێشە کز و پووچ ئەبێ.

ئەندازەی گشتیی ئەندێشێەی وێژەیی:

١- هێزی داهێنان.

٢- هێزی لەیەکچوونی وێنەی هەستپێکراو وێنەی ئەو سۆزانەی کە لە دەروونندا ئەیان بزوێنێ.

٣- پێشاندانی سروشت بەجوانی، بەجۆرێکی وا کە وامان لێ بکات حەزی لێ بکەین، لە جوانییەکەی وردبینەوە، لە ڕازی جوانییەکەی بگەین.

٤- وێنەیەکی نوێی وێژەییمان پێشان بدات.

٥- (واتا) وەها پێشان بدات، وەک هەستی پێ بکرێ و بەبەرجەستەیی ببینرێ و بنوێنێ.

بەکورتی ئەبێ ئەندێشە لە توانایدا هەبێ کە سۆز لە شێوەیەکی پڕ لە ڕاستیی و هێز و جوانی دا پێشان بدات.

* ڕاستی - بیر «الحقيقة - الفكر»

دەربارەی وێژەی گشتی:

مەبەس لەبیر: گەوهەری هۆشە، ڕاستی و دروستییە کە بنچینەن بۆ هەموو وێژەیەکی بەنرخ، ئەگەر تەماشای وێژەی گشتی بکەین وەک (مێژوو) و (نرخ دانانی وێژەیی)، ئەندازەکانی نرخی وێژەیی ئەمانەن:

١- ئەبێ ڕاستییەکان زۆربن.

٢- ئەبێ ڕاستییەکان تەواوبن.

٣- ئەبێ ڕاستییەکان ڕۆشنبن. هەموو نووسەرێک، سا مێژووناسبێ، یان نرخزان، نووسەری کۆمەڵایەتی بێ، یان هی فڕوفێڵ[1]؛ پێویستە لە بەرهەمە نووسراوەکانیا دوو شت کۆ بکاتەوە:

١- ڕاستییەکان زۆربن و دروست بن و ڕۆشنبن.

٢- شێوەی نووسینەکەشی بەهێز و جوانبێ، بۆ ئەمەی کار لە دڵی خوێنەر بکات.

گەوهەری سۆز، پێویستە یارمەتی گەوهەری بیر بدات، بۆ ئەمەی وێژەکە ڕەنگین و کاریگەر بێ. ئەگین بەرهەمەکە وێژەیەکی نرخدار و جوان ناژمێررێ.

دەربارەی وێژەی تایبەتی:

بەڵام دەربارەی وێژەی تایبەتی وەک (هۆنراوە، چیرۆک) ئەڵێین؛ هەندێ ئەندازەی نرخی وێژەییان ئەمانەن:

١- چەندێتی بیرەکان

٢- تازەیی بیرەکان

٣- ڕاستیی بیرەکان

٤- نزیکی بیرەکان لە ڕووداوی ژیانەوە.

فرمانی وێژەوان: بەکورتی ئەبێ وێژەوان خەمی ئەوە بخوات کە ڕاستییەکان بەدروستی و دڵسۆزیەوە لە شێوەیەکا بنوێنێ، ئەو شێوەیە چەند لەو ڕاستیانەی تیابێ ئەوەندە نرخی هونەریی بەرز ئەبێتەوە. پێویست نییە ئەو وێنەیەی وێژەوان دروستی ئەکات، زۆر بەوردی لەو ڕاستیانە بکات، هەر ئەوەندەی لەسەرە کە لە شێوەیەکا بیان نوێنێ و لێکیان بداتەوە.

پێویستە وێژەوانان بزانن، کە نرخی وێژە لەوە دایە، کە کارەسات و ڕووداوی ژیان بکرێن بەهۆیەک بۆ لێکدانەوە و ڕۆشنکردنەوەی یاساکانی ژیان و سروشتی ڕەگەزی مرۆڤایەتی.

## شێوەی نووسین «الصورة»

شێوەی نووسین یاخود وێنەی وێژەیی: ئەو هۆیەیە کە بیر و سۆزی وێژەوان ئەگوێزێتەوە بۆ دڵ و مێشکی خوێندەواران و گوێگران.

بنچینەی شێوەی نووسین، ئەندێشەیە. وێژەوان بەهۆی وێنەی وێژەییەوە دەروونی خۆی پیشان ئەدا.

* بزواندنی سۆز: بۆ ئەمەی سۆزی خویندەواران و گوێگران ببزوێنرێ:

١- ئەبێ زبانی شێوەی نووسین خۆماڵی و سووک و ڕەوانبێ، دووربێ لە وشەی وشک و ڕەق نەزانراو و نەبیستراو، هەروەها ئەبێ لە شێوەی نیشانەگەری یاخود پێشنیازدا پیشان بدرێ، نەک ڕاستەوڕاست.

٢- ئەبێ واژە ڕستەکە بەپێی سۆزەکەبێ، بۆ سۆزی کورت و ناونجی واژەی سووک و کورت و جوان بەکار بهێنرێ. بۆ سۆزی قووڵ و ئەمریش کە پەیوەندی بەژیان و سروشتی مرۆڤایەتییەوە هەبێ، واژەی

(١) مامۆستا (فڕوفێڵ) بەرامبەر «سیاسەت» بەکاردێنێ.

ڕاست و دروست وێنەی وێژەیی قاڵکراو دابنرێ.

٣- ئەبێ وێنەی وێژەییەکە پڕ بێ لەو وشانەی کە واتایان قووڵە و ئەزرنگێنەوە لە گوێدا، واتای تریان لێوە ئەوەشێتەوە، لەگەڵیەکا باش ڕێک ئەکەون، ئەویش بۆ ئەمەی زوو کار لە سۆز بکەن.

٤- ئەبێ وشەکان واتاکان بەتەواوەتی پڕ بکەنەوە، بۆ ئەمەی هەست و هۆشی وێژەوان بەتەواوەتی دەرخەن، هەروەها ئەبێ ئەندێشەکانیشی پڕ بەپڕی وشەکان بن.

* **پەیوەندی گەوهەرەکانی وێژە:** بیر و سۆز پێکەوە بەستراون و سازاون.

هەروەها وێنەی وێژەیی یاخود زبان لەگەڵ ئەندێشەدا پێکەوە بەستراون و سازاون، زبان بیر بەباشی پیشان ئەدا، بەڵام ناتوانێ، هەموو دەم سۆزی بێ سنوور بەباشی پێشان بدا.

لەبەر ئەوە وێژەوان ناچار ئەبێ بەوێنەیەکی وێژەیی ئەو سۆزە پێشان بدات.

بنچینەکانی وێنەی وێژەیی دوو شتن: (ئەندێشە) و (واژەی پڕ لە ساز و ئاواز).

* گەوهەرەکانی ئەندێشە و واژە: هەندێ لە گەوهەرەکانی ئەندێشە بریتین لە (لێک چوون: تشبیة) و (خواستن: استعارة) و (درکە: کنایة) و (دژبوونی: طباق) و (جوانی بایس: حسن التعلیل).

بەڵام گەوهەرەکانی واژە بریتین لە: کورتی وشە، جوان زرنگانەوەی وشە لە گوێدا، لە دووری وشە لە هەڵەکانی ڕێزمان و زبان پاراییەوە، لە جوان هۆنینەوەی وشەو و جووتبوونی لەگەڵ واتادا. بەڵام جاری وا هەیە لە توانای زباندا نییە کە بەتەواوی سۆز دەربڕێ.

* **ئەندازەی نرخی وێژەیی بۆ وێنەی وێژەیی:** ئەوەیە کە بتوانێ بەتەواوی (بیر) و (سۆز)ی وێژەوان دەربڕێ، لەمەوە تێ ئەگەین کە بەرهەمی بەنرخ ئەوەتا کە بەهێز و ناسک بێ. هێزەکەی بۆ ئەمەیە کە خوێنەر وریا بکاتەوە و واتای شەنگ و زیندوو بخاتە مێشکیەوە. ناسکیش بۆ ئەوەیە کە سۆزێکی ڕاستەقینە و تەواو لە دڵی خوێنەردا زیندوو بکاتەوە.

هەروەها گیانیش بەبەر بیرەکاندا بکات و بەگەشیەوە دەریان بخات.

* **وێژەی بەهێز و نەمر:** ئەم دووانە لەمانە پێکدێ؛

١- سۆزی ڕاست و بیری دروست.

٢- ئارەزوویەکی دڵسۆزانە بۆ گوێزانەوەی (سۆز و بیر) بۆ (دڵ و هۆشی) خوێندەوار وەکو هەن، بەتەواوی.

٣- توانای زبان پاراوی کە لە دروستکردنی (وێنەی وێژەییدا) دەرئەکەوێ.

* **واتای وێنەی وێژەیی:** دوو واتای هەیە؛

١- ئەوەی کە لە (ئەندێشە و واژە)دا دەرئەکەوێ.

٢- لە (یەکێتی بەرهەم)ەکەدا دەرئەکەوێ.

* یەکێتی بەرهەمی وێژەیی: ئەمە بەمجۆرە پێکدێ:

١- لە بەرهەمەکەدا کەم و کووڕی ڕوونەدا.

٢- لە ناوەند بەشەکانیا هۆگرێ هەبێ.

٣- بەشەکانی لەگەڵیەکا ڕێککەون.

* ئەندازەکانی شێوەی نووسین: ئەمانەن:

١- نووسینەکە ڕۆشنبێ.

٢- نووسینەکە بەهێزبێ.

٣- نووسینەکە جوانبێ

ئەمەشمان لەبیر نەچێ کە (بابەت و وێژەوان)یش لەم سێ ئەندازەیە کار ئەکەن.

١٩٦٣/٣/١٩

## پەخشان[1]

«بەو واتایە ئەڵێن کە هەست و هۆش لە شێوەیەکا پیشان بدا و نەشبەسترابێتەوە بەکێش و سەرواوە».

* لەیەکچوونی پەخشان و هۆنراوە:

لەمەوپێش لە هۆنراوە دواین، لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە (هۆنراوە و پەخشان) هەردووکیان وێژەن، چونکە هەردووکیان هەست و هۆشمان پێشان ئەدەن، تەنانەت هەندێ هونەری پەخشان هەیە وەک:

(چیرۆک، پێناسینی خەیاڵی- الوصف الخیالي-، نامەی دەروونی- الرسائل الوجدانیة) لە وێنە و کاریگەریدا زۆر نزیک ئەبنەوە لە هۆنراوەی گۆرانی؛ چونکە هەردوو لایان بەشێوەیەکی هونەرمەندی لە ژیان ئەدوێن، بەسۆز و ئەندێشەوە.

* جیاوازی پەخشان و هۆنراوە:

لەگەڵ ئەوەی سەرەوەشا، پەخشان و هۆنراوە لە هەندێ ڕووەوە لە یەکتری جوێ ئەبنەوە:

١- ڕووی مێژوویی: هەروەکو دووانی ڕەمەکی[2] پێش هۆنراوە کەوتووە، هەروەها هۆنراوەش لە مێژوودا پێش پەخشان کەوتووە، هۆی ئەمەش هۆنراوە زبانی سەرەتایی مرۆڤایەتی بووە، ئەو دەمەی کە هێشتا ئادەمیزاد بەسۆزێکی سروشتییەوە ئەژیا. بەڵام کە لە تێگەیشتن و پێ گەیشتن و شارستانێتیدا پێشکەوت، هۆشی پێگەیشت؛ ژیر بوو، ئینجا ناچاربوو پەنا بەرێتە بەر (پەخشان) بۆ ئەمەی بیروباوەڕی خۆی پێ دەربڕێ، هەروەکو لەوەپێش پەنای بردبووە بەر (هۆنراوە) بۆ ئەمەی هەستی دەروونی خۆی پێ دەربڕێ.

---

(١) لە دەستنووسەکەیدا ئەم بەروارەی لە لاوە نووسراوە: ١٤/ ١١/ ١٩٦٢

(٢) دووانی ڕەمەکی: قسە و گفتوگۆی ئاسایی

لەمەوە تێ ئەگەین کە پەخشان زبانی (هۆش)ە بەڵام هۆنراوە زبانی دڵ و دەروونە، هەروەها تێ ئەگەین کە پەخشان بریتییە لەو زبانە پاک و پوختەیەی کە پێویستی ژیانێکی پێشکەوتووی تێ گەیشتوو دەرئەبڕێ. نەک ئەو گفتوگۆ ڕەمەکییەی کە لەناو ئەم و ئەودا هەیە.

چونکە گفتوگۆ ڕەمەکییەکە پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە و پێش پەخشان کەوتووە

٢- ڕووی بابەتی: پەخشان بابەتی هۆشە، لەبەر ئەوە زۆرتر ئارەزووی شت گێڕانەوە و ڕوون کردنەوە ئەکات. بەڵام بابەتی هۆنراوە بابەتی وێنەکێشان و کارتێکردنە، چونکە بابەتی هەستی دەروونە، ئەمەش ئەوە ئەگەیێنێ کە پەخشان زۆرتر لە گفتوگۆ (جدل) و شت گێڕانەوە (تقرير) و کاروباری ئایینی و فرۆفێڵ بازی (سیاسی) و کۆمەڵایەتی و وتارانی زانستیدا دەرئەکەوێ، کەچی هۆنراوە زۆرتر لە لاواندنەوە (رثاء) و پیاهەڵدان (مديح) و گلەیی و پەشیمانی و بابەتی دەروونی تردا دەرئەکەوێ.

٣- ڕووی واتای (معنوي): لە هۆنراوەدا سۆز یەکەم کەرەستەیە و بیر دووەمە. بەڵام لە پەخشاندا؛ بیر یەکەم کەرەستەیە و سۆز دووەمە. لە پەخشاندا سۆز بەکار ئەهێنرێ بۆ ئەمەی گرنگی و هەڕەتی ژیان بخرێتە ناو بیروباوەڕەوە، بەو مەبەسەی تێگەیشتنیی ئاسان بکرێ و بەزوویی بخرێتە ناو دڵ و دەروونەوە. واتای هۆنراوە بەستراوە بەجوانی و کاریگەرییەوە، لەبەر ئەوە بەکورتی پێشان ئەدرێ، بەڵام هی پەخشان بەدرێژی پێشان ئەدرێ چونکە ئامانجی فێرکردن و کەڵک بەخشینە.

٤- ڕووی وێنەیی (صوري): لێرەدا دووشت پێشان ئەدەین؛ ئەندێشە و شێوەی: الاسلوب. هەرچی ئەندێشەیە لە هۆنراوەدا بەپێی ئەو سۆزەی تیایەتی کەم و زۆر ئەبێ، پاش ئەوە بەهۆی کەرەستە بەهێزەکانی خۆیەوە وەک -استعارة- و تەشبیهی ڕەوان و خۆپێشاندانێکی جوان - بەهەڕەت و هێزەوە دڵ و دەروونی خوێندەواران ئەبزوێنێ.

بەڵام ئەندێشە لە پەخشاندا کەمتر و کزترە، چونکە لە پەخشاندا شت ڕوون ئەکرێتەوە، تەشبیه و قسەی ڕاست و ڕەوانیشی زۆرتر تیایە، ئەمە باسی (ئەندێشە).

بەڵام شێوە: الاسلوب، لە هۆنراوەدا بریتییە لە کێش و سەروا و ئاسکیی وشەکان و دوورییان لە نەکڵۆکی و ڕەمەکێتی و سنووری زانستی، هەروەها بریتییە لە کورتی (واژە: عبارة)کان و ڕزگاریان لە دەستوورەکانی زبان لە هەندێ کاتا.

بۆ ئەوەی ئەم جیاوازییە باشتر تێبگەین، ئەوەندەی بەسە کە تاکە هۆنراوەیەک بکەین بەپەخشان.

٥- ڕووی ئامانجی (الناحية الغائية): وەک لەمەپێش پێشانماندا، مەبەس لە پەخشان زۆرتر کەڵک بەخشین و فێرکرنە، چونکە پڕە لە بیروباوەڕ و پێشبینی دامەزراو، بەڵام مەبەس لە هۆنراوە کارتێکردن و دڵخۆش کردنە، چونکە هۆنراوە خۆی وا دروست بووە کە زۆرتر هونەری تیا بێ، پڕ تریشبێ لە هەستی ڕاست و ئەندێشەی جوان و دەربڕینی ورد و ڕەنگین.

بەکورتی، هۆنراوە و پەخشان لە سەرێکەوە لەیەک نزیکن، لە سەرێکیشەوە لەیەک جوێ ئەبنەوە، چامەیەک و چیرۆکێک دوو نموونەی باشن کە جیاوازی ناوەند هۆنراوە و پەخشان پێشان بدەن.

## بەشەکانی پەخشان

لەڕووی سروشتی گشتییەوە ئەکرێ بەدوو بەشەوە:

١- پەخشانی زانستی

٢- پەخشانی هونەری

ئەوەی مەبەستی پێشاندانی ڕاستییەکانی هۆش و بیروباوەڕە پاک و پوختەکانبێ، پێی ئەڵێن: پەخشانی زانستی، وەک: ڕاستی پەرستی، ژمێرکاری، زانستی سروشت، دەرمانگەریی-کیمیا- ئەوی لەم بەشەن:

وتارە، مقۆمقۆ -جدل-، لێکۆڵینەوە -بحوث-، نووسراوی زانستی.

ئەو پەخشانەش مەبەستی زیندووکردنەوەی سۆزبێ، یاخود کارتێکردن بێ لە دەروون، پێی ئەڵێن: (پەخشانی هونەری) وەک: نامەی دەروونی، دوان: خطابة، پێناسینی وێژەیی: الوصف الأدبي.

لە میانی ئەم دوو بەشەشدا، جۆرە هونەرێکی پەخشانی تر هەیە، لە سەرێکەوە لە پەخشانی زانستی ئەکات، لە سەرێکی تریشەوە لە پەخشانی هونەری، ئەویش پێی ئەڵێن (پەخشانی زانستی گشتی) یاخود (پەخشانی هونەری گشتی). لەم جۆرەدا مەبەس دەربڕینی ڕاستییەکانە بەڵام بەیارمەتی (سۆز)، بۆ ئەمەی ڕاستییەکان بەهێز و ڕەنگینییەوە دەرکەون، وەک: مێژوو، نرخی وێژەیی و فەروفیلبازی (سیاسە).

لێرەدا نرخزان بەپێی ئەو پێوانانەی سەرەوە چی بخرێتە بەردەم پێوانەیان ئەکات. دەری ئەخات کە ئەو پەخشانە لەکام بەشیانە.

*** جیاوازی پەخشانی زانستی و هونەری:** پەخشانی هونەری تێکڕا هەر چوار کەرەستەکەی تیایە؛ سۆز، بیر، واژە، ئەندێشە.

بەڵام پەخشانی زانستی هەر تەنیا (بیر، واژە)ی تیایە، ئەگەر جار جارێک (تشبیة، استعارة)ی تیا ببینرێ؛ ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ڕوون بکرێتەوە دوایی پێشان بدرێ نەک بەجوانی برازێنرێتەوە و کاریگەربێ.

*** بەشەکانی پەخشان لای ڕۆژئاواییەکان:** ڕۆژئاواییەکان پەخشان ئەکەن بەچەند بەشێکەوە، وەک: وتار، چیرۆک، مێژوو، ژیننامە، پێ ناسین: وصف... بنچینەی ئەم دابەشکردنەش ئەوەیە کە پەخشان کاتێ کە لەشت ئەدوێ دوو ڕێگا ئەگرێ:

١- لەو شتانە ئەدوێ کە بەزۆری بەئەندامەکانی هەست هەستیان پێ ئەکرێ، واتا ئەو شتانەی کە ئەبینرێن. ئەبیسترێن. بۆن ئەکرێن و پاشان ئەخرێنە مێشکەوە و (بیر) لێیان ئەکۆڵێتەوە. لەمەشەوە دوو هونەر پەیدا بووە: یەکێکیان پێناسین: وصف، یەکێکیشیان سەرگوروشتە: ڕوایە. جیاوازی ئەم دووانەش ئەمانەن:

پێناسین وەک وێنەگرتن و وێنەکێشان وایە، چاوئەنداز: مشاهد و کارەسات بەماتی پیشان ئەدا. بەلام سەرگوروشتە ئەو چاوئەنداز و کارەساتانە بەبزێوی: متحرک، پێشان ئەدا، ئاراستەبوون بۆ ئامانجێکی تایبەتی. سەرگورشتە وەک سینەما کارەسات و کردەوەکان بەشێوەیەکی رێک و پێک و لە دوای یەک پێشان ئەدا.

(پەخشانی پێناسین) وەک: نووسراوانی گەشتوگوزارەکان. (پەخشانی سەرگوروشتە) وەک چیرۆک، مێژوو و ژیننامە.

٢- لەو شتانە ئەدوێ کە بەبیرێکی رێک و پێک هەست پێ ئەکرێن، چونکو لێکیان ئەداتەوە، نرخیان بۆ دائەنێ، لێیان ئەکۆڵێتەوە، هەروەها بەڵگە ئەدۆزێتەوە بۆ چەسپاندنی بیروباوەڕێک یا پێشبینییەک، ئەمەش بۆ هەموو جارێک بەکار ناهێنرێ بەڵکو بۆ زۆربەی جاران، لێرەدا گێڕانەوە و مقۆمقۆ دوو بابەتی گرنگن لەم جۆرە پەخشانەدا.

ئەمانەش لەگەڵ یەکا جیاوازیان هەیە، پەخشانی گێڕانەوە بەشێوەیەکی مات و بێ دەنگ لە شتەکە ئەدوێ؛ مەبەسەکەی وەک مەبەسی لێکۆڵینەوە و نواندنی پێشبینی: نظریة، وایە.

بەلام پەخشانی مقۆمقۆ بەشێوەیەکی بزێوانە لە شتەکە ئەدوێ، بۆ ئامانجێکی چەسپاندن ئاراستە ئەبێ، بۆ ئەوە ئەگەڕێ شتێک بکرێ.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە پەیوەندی بەو ئایین و باوەڕانەوە هەیە کە دەماری مرۆڤ ئەبزوێنن و کاریش ئەکەنە سەر رەوشتی.

ئەوانەی لە دەستەی (گێڕانەوە) ئەژمێرێن، ئەمانەن: نرخی وێژەیی، وتار، هەندێ نووسراو. ئەوانەی لە دەستەی (مقۆمقۆ) ئەژمێررێن: گفتوگۆ: مناظرة، دوان: الخطابة، بۆ هەریەکێ لەم هونەرانە، وێژەی ئەوروپایی، شێوە و دەستوورێکی نووسینی بڕیار داوە.

* **بەشەکانی پەخشان لای کوردەواریی:** دابەشکردنی پەخشان لەلای خۆمان هەر چەندە لەسەر بنچینەی سروشتی قسەکانە کە لەیەک جیاوازن بەلام لەگەڵێ رووەوە لە دابەشکردنی پەخشانی رۆژئاوایی ئەکات، زبانی کوردی هەر لە کۆنەوە پەخشانی هەبووە، بەڵکو زۆر کەس لەو باوەڕەدایە کە پەخشان لە زبانی کوردیدا پێش هۆنراوە کەوتبێ، بەپێچەوانەی زبانی رۆژئاواییەکان کە هۆنراوەیان پێش پەخشانیان کەوتووە.

لە ڕاستیدا ناتوانین ئەمە. بچەسپێنین کە کامیان لەپێشەوە بووە.

بەلام ئەوی ئەچێتە مێشکەوە ئەوەیە کە هۆنراوە و پەخشان هەردووکیان شان بەشانی یەکتر پەیدا بووبن و پێشکەووتبن.

هۆی ئەم باوەڕەش ئەوەیە کە سەرچاوەی هەردوو جۆرە وێژەکە (هۆنراوە و پەخشان) دڵ و دەروون و هۆشی کوردەوارییەکە خۆیەتی، لە گەڵ سروشتەکەی کوردستان و ئەو کارەساتانەی کە لە ژیانی کوردەواریدا رووی داوە، بەلام شارستانێتی لە هەر پلەیەکا بووبێ بۆ کورد، بەو پێیە دڵ تەڕان و خاوەن

هۆشانی کوردەواری توانیویانە هەستی دڵ و دەروون و هۆشی خۆیان دەربڕن. بەپەخشان بووبێ یاخود بەهۆنراوە.

پەخشان لە زبانی کوردیدا بەم بابەتانەوە بەشکراوە: (پەندی پێشینان، قسەی نەستەق، چیرۆک، داستان، مەتەڵ، بەیت)... بەیتەکان زۆرتر لە پەخشان ئەکەن تا هۆنراوە، هەندێکیشیان تێکەڵن لە پەخشان و هۆنراوە هەندێکیشیان بریتین لە هۆنراوەی پەخشان.

ئەمانە هەموو بەرهەمی پەخشانی کۆنی کوردین، هەریەکەیان شێوە و دەستووری نووسینی تایبەتی خۆی هەیە. لەگەڵ هی ئەم چەرخەدا جوتییە. ئەمانە زۆربەیان دەمبەدەم ئەکەوتن و لە سنگدا ئەپارێزران، نە ئەنووسرانەوە، تا لەچەرخی نۆزدە و بیستەم لەلایەن وێژەوانانی کورد و رۆژهەڵات ناسەکانەوە کۆکرانەوە و نووسرانەوە و لە چاپ دران و بڵاوکرانەوە. بەڵام گەنجینەی پەخشانی زبانی کوردی هێشتا زۆری ماوە بدۆزرێتەوە و بنووسرێتەوە و لەچاپ بدرێ.

داخەکەم چەرخی کە چ ڕەفتارگەلێکی لەناو بردوون. لەم چەرخی بیستەمەدا چ لەسەر شێوەی کوردەواری، چ لەسەر شێوەی رۆژئاوایی گەلێک نووسراو: وتار، نامە، دوان، چیرۆک، ژیننامە، گەشتنامە، داستان، چیرۆکی لاسایی، گفتوگۆ، مقۆمقۆ لەلایەن وێژەوانانی کوردەوە نووسراونەتەوە. بەڵام ئەمە چەند ساڵێکە شێوەی نووسینە کوردییەکان بەرەو شێوەی رۆژئاوایی ئەچن چ لە ئاهەنگ و چ لە ناوەرۆک و چ لە ئامانجدا، ئەمیش لەبەر ئەوەیە کە کوردیش وەک هەموو رۆژهەڵات لە سەرچاوەی رۆژئاواوە زانست و هونەر وەرئەگرێ، بۆیەکا بەشەکانی پەخشانی رۆژئاواییش خەریکن بەرە بەرە جێگیر بین لە پەخشانی کوردەواریدا. لەگەڵ ئەمەشا گیانی کوردایەتی و هەستی کوردایەتی لەناو ئەو بەرهەمە پەخشانانەدا رۆژ بەرۆژ گەشە ئەکەن و بەهێز و هەرەتەوە خۆیان پێشان ئەدەن و پێویستی و ئازار و ئاواتی کوردەواری لە جیهان تێ ئەگەیەنن.

## مێژووی جووڵانی پەخشانی کوردی

لە برانەوەی سەدەی نۆزدەهەمەوە ئەم مێژووە دەست پێ ئەکات، کە یەکەم رۆژنامەی کوردی لە ئەستەموڵ ۱۸۹۷ لە چاپ درا، رۆژنامەکە ناوی (کوردستان) بوو[1]، هەرچەند گیان و ئامانجی پیرۆز و بەرز بوو بەڵام نووسینەکانی پڕ بوون لە وشەی بێگانە، نووسیارەکەی - إملاء، لەسەر دەستووری نووسیاری فارسی و تورکی و عەرەبی بوو، پیتەکان دیسانەوە لە شێوەدا عەرەبی بوون. ناوەرۆکەکەشی لە ڕووی وێژەوە بەپێت و بەهێز نەبوو.

---

(۱) لێرەدا مامۆستا کەوتۆتە هەڵەیەکەوە کە دەبێ ڕاست بکرێتەوە: یەکەمجار کە ناوی سەرەتای رۆژنامەگەری کوردی ببرێ، لە ۱۹٦۸دابوو، کە د. مارف خەزنەدار لە رۆژنامەی (برایەتی)دا لە بەغدا باسێک و وێنەیەکی لاپەڕەیەکی رۆژنامەی (کوردستان)ی بڵاوکردەوە کە لە ۲۲ نیسانی ۱۸۹۸ لە قاهیرە دەرچووە، لەلایەن (میقداد مەدحەت بەدرخان)ەوە... دوای ئەوە لە ئارشیفی ئاکادیمی زانستی لە (لینینگراد)ی ئەو رۆژانەی دیبویەوە. لە ئەستەموڵ رۆژنامەی (کورد) لە ۱۹۰۷ وە (ڕۆژی کورد) لە ۱۹۱۳ دەرچووە.

جووڵەی نووسراوانی کوردی، یاخود پەخشانی وێژەیی کوردی لە پێشدا زۆر کز و سست بوو. لە پاشدا بەتایبەتی لەم بیست سی ساڵی دواییەدا، ڕۆژ بەڕۆژ بەهێز ئەبوو. ئەگەر کارەساتی ڕۆژگار بەرەنگاری نەتەوەی کوردی نەکردایە، ئێستاکە سامانێکی زۆر گەورە لە وێژەی پەخشانی نوێی کوردیدا پەیدا ئەبوو، هەر بەم ٦٥ ساڵی دواییەش ئەمانتوانی تۆڵەی هەزاران ساڵانی پاشکەوتوویی وێژەکەمان بکەینەوە.

هۆی پاشکەوتوویی وێژەی پەخشانی کوردی ئەمانەیە:

١- دوژمنایەتی ئەو فەرمانڕەوایانەی کوردستانیان خستۆتە ژێر چنگیانەوە، بەرامبەر بەکورد و بەزیانەکەی.

٢- کەمتەرخەمی زۆربەی زانا و وێژەوانەکانی کورد بەرامبەر بەزیانی کوردی و زانیاری کوردی، لەبەر کەڵکی ناپوختە و خۆپەرستی خۆیان.

لەکاتێکا کە ئەمانە بەهەزاران نووسراوی گرنگ و بەنرخیان بەزیانەکانی فارسی، تورکی، عەرەبی، دائەنا، پشتیان ئەکردە گەلەکەی خۆیان، یەک نووسراویان بەزیانی کوردی دائەنا.

٣- کەمتەرخەمی گەلی کورد، بەرامبەر وێژەوانان و زیانەکەی خۆی.

٤- گرفتاریی گەلی کورد بەدەست چەرخی کەج ڕەفتارەوە، بەدەست نەخوێندەواری و هەژاری و نەخۆشیەوە. کە وێژەوانەکان لەپێش هەموو کەسێکا بەرچەپۆکیان ئەکەوتن.

لەگەڵ ئەمانەشا پێویستە بڵێین کە هەموو سووچێکی کوردستان وەک یەک گرفتار نەبوو، هەمو دەمێکیش وەک یەک سەرگەردان نەبووە، لەو پشووە مێژووییانەدا کە کوردستان سرەوتێکی تێ ئەکەوت و کزەبایەکی سەربەستی بەلادا تێ ئەپەڕی، خوێندەوارانی کورد بەهەموو هێز و هەڕەتیانەوە تێ ئەکۆشان بۆ پەرەپێدان و گەشەپێکردن و بەرزکردنەوەی پەخشانی کوردی.

لە ئەنجامی ئەم هەوڵ و تەقەللایانەدا، لەم ٦٥ ساڵەی دواییەدا، نزیکەی دوو هەزار نووسراوێک لە چاپ دران، نزیکەی ٥٠٠ یان بەپیتی عەرەبی نووسراونەوە، نزیکەی ١٥٠٠ یشیان بەپیتی لاتینی نووسراونەتەوە لە یەکێتی سۆڤیەت و سوریادا، ئەمانە هەرچەندە هەموویان بەنووسراوی وێژەیی ناژمێررێن، بەڵام بەپێی چەشن، نەک بەپێی ژمارە، هەنگاوێکی گەورەبوون بۆ پەرەپێدان و گەشەکردن و بەرزبوونەوەی وێژەی پەخشانی کوردی.

لەم ماوەکەمەدا بەم ئەنجامە بەنرخانە گەیشتین:

١- شێوەی نووسینی کوردی سێ جۆرە لاتینی بۆ دانرا، بەزەهمی زۆری پەخشانی کوردی بەلاتینییەکەی کوردی یەکێتی سۆڤیەت چاپکراوە، کەمێکیش بەهی سوریا، ئینجا بەهی عێراق، بەمە دەرگایەکی پان و فراوان بۆ زیانی کوردی کرایەوە کە ڕزگاری بێ لە دەست ئەو تەنگوچەڵەمەیەی لە ئەلف و بێی عەرەبییەوە تووشی بووە. بۆ پێشکەوتنی زیانی کوردیش لە دوارۆژا ڕێگایەکی گرنگی کرایەوە.

٢- لە عێراقدا گۆڕانێک هێنرا بەسەر ئەلف و بێی عەرەبیدا تا هیچ نەبێ بۆ سەردەمێک بتوانرێ زیانی کوردی لەو تەنگ و چەڵەمەیە ڕزگارکرێ، ئەمەش هەنگاوێکی ترە بۆ پێشکەوتنی وێژەیی کوردی.

٣- چەند دەستوورێک بۆ زیانی کوردی دانرا. هەروەها چەند فەرهەنگێک.
بەمەش بنچینەی زیانی کوردی تاسەر توندو بەهێزکرا، وێژەی کوردیش کەڵکێکی زۆری لێ وەرگرت.

٤- نووسینی کوردی بژارکرا، لە وشە بێگانەکان لە جێگای ئەوان وشەکانی کوردی بیستراو یاخود هەڵبەستراو دانران[١]، بەمەش وێژەکەمان یەجگار بەهێز و بەرز و جوان و ڕازاوە دەبوو. کە هێشتا نە تورکەکان، نە فارسەکان ئەمەیان بۆ نەچۆتە سەر.

٥- بەو نووسراوە گرنگ و بەنرخانەی لەلایەن هەندێ زانا و وێژەوانە گەورەکانمانەوە دانران بنچینەیەکی بەهێز تاسەر بۆ (مێژووی کورد) بۆ (وێژەی کوردی) بۆ (زیانی کوردی) بۆ بووژاندنەوە و پەرەسەندن و گەشەکردن و بەرزبوونەوەی زیان و وێژەی کوردی و چارکردنی گیروگرفتی نەتەوەی کورد دامەزرا.

٦- بۆ هەمو جیهان دەرخرا کە زیانی کوردیش زیانێکە گرنگ و ناسک و ڕەوان، لە توانایا هەیە وەک هەموو زیانێکی پێشکەوتووی جیهان هەموو بابەتێکی زانستی و هونەری و پیشەیی و وێژەیی پێ بنووسرێتەوە. ئەو وتار و نووسراوانەی کە لە بابەت: وێژە، مێژوو، نرخی وێژەیی، ژیننامە، فروفێلبازی: سیاسەت، چیرۆک، داستان، زانست، هونەر، ڕاستی پەرستی، خواپەرستی، پیشەوەری... یەوە لەم سالانەی دواییدا نووسراونەوە لە کوردستانی عێراق و یەکێتی سۆڤێیت و ئێران و سوریادا، بەڵگەن بۆ ئەمە، کە ئەگەر بهێلرێ و چاودێری بکرێن، خوێندەوارانی کورد لە توانایاندا هەیە، وەک هەموو خوێندەوارانی سەرزمین. وێژەی زیانەکەی خۆیان دەربخەن و سەربخەن و پێشبخەن.

بەڵێ ئەمە ڕاستە، ئەم بەرهەمانە بەتایبەتی بەم پچڕ پچڕیە و لەناو ئەم گێژەڵووکەی کارەساتانەدا، یەجگار کەمن لە چاو پێویستی نەتەوەیەکی گەورەی وەک کوردا کە لە پانزە ملیۆن پترە... بەڵام هیوای زۆر بەو گیانی گەورە و بەهێزە هەیە کە لەناو کوردەواریدا پەیدا بووە.

بێگومان ئەو گیانە پەخشانی کوردی ئەگەیێنێتە ئەوپەڕی چاکی و پاکی و جوانی و بڵندی.

(١) دەبوو ڕستەکە ئاوا بووایە: لە جێگەی ئەوان وشەی بیستراو و یاخود هەڵبەستراوی کوردی دانران.

# چیرۆک

## مێژووی چیرۆک

شێوەی چیرۆک گۆڕانی زۆر بەسەردا هاتووە، ڕێچکەی ئەو گۆڕانە لەداستانەکان و سرودە ئاینییەکان و چیرۆکە نەتەوەییەکاندا ئەبینین کە هەر گەلە بەشی خۆی لەمانە هەیە.

لای یۆنانییەکان ئەلیادە و ئۆدیسە، لای ڕۆمانییەکانی ئەنیادە، لای هیندییەکان ڤیدا و مهابهاراتا، لای ئێرانییەکان شاهنامە، لای کوردەکان مەم و زین ئەبینین کە ئەمانە هەموو چیرۆکبوون، بەهۆنراوەیەکی جوان و ڕەنگین هۆنراونەوە، بەتەنیشت ئەمانەشەوە چیرۆکە نەتەوەییەکان بەپەخشان نووسرابوونەوە، وەک چیرۆکە کوردییەکانی: شاه ڕوخ و گوڵ ڕوخ، میوان و خانەخوێ، لەپاش چەند سەد ساڵێک لای یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان چیرۆکی گەشتوگوزار و پاڵەوانیی: مخاطر[1] داهاتن، ئینجا ئەو چیرۆکانەی ئیسۆپی یۆنانی و کلیلە و دەمنەی هیندی و مام ڕێوی کوردی.

لە ئەورووپادا تا ماوەیەکی دوور چیرۆکی پاڵەوانیی ماوەی بەهونەرەکانی تری چیرۆک نەئەدا، ناوەرۆکەکانی بریتی بوون لە بابەتی ئەندێشە، و هەڵبەستراو و دێو و درنج و جنۆکە و ئەو وشانەی کە بڕوا ناکرێ بقەومێن، پاش ئەوە چیرۆکی سوار چاکی داهات، کە لە ڕێژگاوی: خرانە و خۆشەویستیدا نوقوم بووبوو، داستانی (گۆرانی ڕۆلان) نموونەیەکە لەو چیرۆکانە، ئینجا دانتی (کۆمیدیای خوایی) بەزمانی ڕەمەکی ئیتالیایی دانا کە بابەتەکانی دەربارەی ئاین و نەتەوە بوون، لە دوای ئەو (سەرڤانتسی)ی ئیسپانیایی پەیدا بوو کە چیرۆکی (دۆن کیشۆت)ی دانا، ئەم چیرۆکە ئەمەندە ڕووداوی ژیانی تێخستبوو بەڕاستی بەیەکەم نموونەی چیرۆکی نوێ دائەنرێ، دوای ئەم گەلێ چیرۆکی تر دەرکەوتن کۆمەڵایەتییان ئەنوواند. ڕەوشت و کرداری گشتیان کێشانە ئەکرد و، نرخیان بۆ دائەنان، بەم ڕەنگە چیرۆک لە تافی ئەندێشەوە تێپەڕی و چووە تافی ڕووداوی هەست پێکراوەوە، بگرە لە سەدەی حەڤدە هەمەوە دەستی کرد بەشیکردنەوەی سۆز و دەروون، بەڵام هێشتا بەتەواوەتی ڕزگاری نەبووبوو لە دەس بابەتی پاڵەوانی.

کاتێ گەیشتینە سەدەی نۆزدەهەم، چیرۆک خەمی چینەکانی کۆمەڵ و تاک و تەراکانی ناوکۆمەڵ و مافی خوارویانی ئەخوارد، لە فەرەنسە و ئینگلتەرە و ڕووسیا و ئیسکاندینا و یادا، چیرۆک ڕاپەڕینێکی جوانی کرد، تا ئەهات چیرۆک بەرەو پێشکەوتن ئەچوو، لە پێشدا چیرۆکە ڕۆمانتیکییە کۆمەڵایەتییەکان پەیدابوون، پڕ بوون لە سۆزی کسپەدار، پاشان (بلزاک) هاتە پێشەوە، بەخۆی و کۆمەڵە چیرۆکە ناوازەکانییەوە کە ناوی نابوو (کۆمیدیای مرۆڤایەتی). نووسەرە ڕووسەکانیش لە پێشاندانی ژیانی ئادەمزادیدا چەند هەنگاوێک چیرۆکیان بردە پێشەوە، زۆری پێ نەچوو چیرۆک بەهەموو بارێکی خۆشی و تەنگانەوە ژیانی گرتەوە، سنگی خۆیشی بۆ وەرگرتنی هەمو گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتی و شیکردنەوەی

---

(١) ڕاستتر: مغامرات.

دەروون بردە پێشێ و فراوانکرد. تا وای لێهات لەم سەردەمەدا بوو بەگرنگترین لقی وێژەیی مرۆڤایەتی، کانی ژیانی ئادەمیزاد و ڕازی دەروونی ئاگادار و نا ئاگاداری بۆ دەرخستین. هەروەک بووبێ بەکانگایەکی زانستی مرۆڤ. هەستمان دەبا بەلای مرۆڤدا: بەگیروگرفتەکانی، بەدیوی دەرەوە و ناوەوەی، هەم بەتەنیایی هەم لەناو ئەو کۆمەڵەدا کە تیایەتی، دیارە ئەمەش بەهۆی ئەو نووسەرە بلیمەتانەوە پێک هاتووە کە لە ڕۆژئاوادا پەیدا بوون و ژیانی مرۆڤیان پشکنیووە و لە هەموو بارێکدا تاقیان کردۆتەوە و لە ڕاز و نیاز و زۆرانبازی مرۆڤ لەگەڵ ژیان و مردنا تێگەیشتوون.

## مێژووی چیرۆکی لاسایی

پێش هەموو گەلێک، یۆنانییەکان هونەری چیرۆکی لاساییان بەهەموو بابەتێکیەوە، دامەزراند. ئەو کاتە سەدەی پێنجەمی پ. ز بوو کە بەهونەرمەندیی (ئیسکۆلۆس و سۆفۆکلیس و یۆریپید)ەوە هونەری مەرگەسات: التراجيدي، گەیشتە ئەوپەڕی تەواوی.

بەلام هونەری گەمە و پێکەنین: الكوميديا ، بەهۆی هونەرمەند (ئەریستۆڤان)ەوە گەلێک پێشکەوت، هی مەرگەسات لەسەر بنچینەی چیرۆکە هەڵبەستراوەکان و سەرگوروشتە خواکان دائەمەزرا. بەلام هی گەمە و پێکەنین لەسەر بنچینەی گیروگرفتەکانی ژیان و نرخ دانان بۆ کۆمەڵ و پێشاندانی کۆمەڵ دائەمەزرا، چیرۆکی لاسایی گەمە و پێکەنین بەتەواوەتی لە دەست کارەساتی ڕوونەدا و ڕزگاری بوو. لەسەر دەستی (میناندر)دا لە براندەوەی سەدەی چوارەم و سەرەتای سێ هەمی پ. ز دا، واتا ئەو شتانەی کە بەبیردا نایەن بقەومێن، لە چیرۆکی گەمە و پێکەنین دوورخرانەوە. ئیتر بابەتی چیرۆکی گەمە و پێکەنین بوو بەژیانی ڕۆژانەی نەتەوە و ڕەوشت و خوویان و کەم و کووڕی کۆمەلایەتیان.

پاش یۆنانییەکان، ڕۆمانییەکان هاتنەکایەوە، ئەمانیش پەیڕەوی یۆنانییەکانیان کرد، نە لە نموونەی چیرۆکە لاساییەکانیاندا نە لەوێنە و دەستووریاندا، لێیان جوێ نەبوونەوە. لە هەندێ مەرگەساتدا هیچ شتێکیان نەخستە سەر؛ بەلام لە هونەری گەمە و پێکەنیندا گەشەیان پێ کرد.

ئینجا سەدەکانی ناوەڕاست پەیدا بوون، شانۆی بتپەرستانەی یۆنانی و ڕۆمانییەکان بەهەموو ڕەنگ و ڕوو و کردارێکیەوە لەناودا نەما و خۆی شاردەوە، لە جێی ئەو شانۆیەکی کزی ئایینی هاتە ناوەوە.

هەندێ چیرۆکی لاسایی ڕیوەڵەی لەسەر پێشان ئەدرا، ڕەنگ و بۆی وێژەیەکی ڕاستەقینەیان پێوە دیارنەبوو، زۆرتر لە کۆڕی کەنیسەکاندا لاسایی ئەکرانەوە، کەم ڕێ ئەکەوت کە لە ژیانی (پیر: قدیس)ەکانیان بەولاوە لە هیچی تر بدوێن. پاشان سەردەمی ڕاپەڕین دا هات، بەهەموو هێز و هەرەتێکیانەوە ئەوروپاییەکان دەستیان دایە زیندووکردنەوەی کەلەپووری یۆنانی و ڕۆمانی و گۆڕییانە سەر زبانە تازەکانی خۆیان. ئەوروپاییەکان کە شارەزای (وێژەی لاسایی کۆن) بوون (وێژەی لاساییە ناوڵجی )یەکەی خۆیان فڕێ دا و هۆگری چاولێکەری یۆنانی و ڕۆمانییەکان بوون. دەستیان کرد بەدانانی چیرۆکی (مەرگەسات و گەمە و پێکەنین) بەزبانە ڕەمەکییەکانی خۆیان پاشان لەسەر شانۆکانیشیان لاساییان کردنەوە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ شێوەی یۆنانی و ڕۆمانی و سەدەکانی ناوەڕاست.

لە ئیتالیادا، جوولەیەکی نرخی وێژەیی گورج و گۆڵ بەفراوانی دەرکەوت، بنچینەکەی لەسەر ئەوە

دامەزرا کە چاولێکەری نموونە شانۆییەکانی کۆن بکرێ، دەستوورەکانیان پێشان بدرێ، پێڕەویان بکرێ بەو یاسایانەوە کە نرخ زانەکان لە بارەی چیرۆکی شانۆییەوە دۆزیویانەتەوە، وەک هەرسێ یاسای (یەکێتی: کات، جێگا، بابەت). ئیتالیا فەرەنسەشی خستە سەر ئەم ڕێیە، ڕەنگە هەر ئەم پاڵپێوەنانەش بووبێ، کە فەرەنسەی والێکرد لە ئینگلتەرە بەپەرۆشتربێ بۆ بەکارهێنانی ئەو دەستوور و کرداری شانۆییانە. بەتایبەت لەسەردەمی کلاسیکدا.

ڕاستیەک هەیە کە لە سەردەمی ڕاپەڕیندا فرمانی خواکانیان (إزادة الألهة) گۆڕپەوە بەڕاستییەکانی دەروونی مرۆڤایەتی، بەڵام لە (مەرگەساتدا) هێشتا هەر لە سەرچاوەی مێژووی کۆن و چیرۆکە هەڵبەستراو (الاساطیر)ە کۆنەکانەوە بابەتیان دەرئەهێنا، چیرۆکە لاساییەکان دوورخرابوونەوە لە ژیانی ئاسایی مرۆڤ، بایەخیان بەچینە بەرزەکانی کۆمەڵ ئەدا، وەک سەرۆک و خونکار: (ملک)ەکان، کەچی چیرۆکی لاسایی گەمە و پێکەنین بەپێچەوانەی ئەو بابەت و زەلامەکانی لە ژیانی نەتەوە و تاک و تەرای نەتەوەوە دەرئەهێنا. زیانی مەرگەساتەکان هۆنراوەیەکی ناسک و بڵند بوون، بەڵام زیانی گەمە و پێکەنینەکان وەک زیانی ڕۆژانە وا بوون.

لای (راسین) هۆنراوە گەیشتە ئەوپەڕی ڕۆشنی. کەچی لای (مۆلیێر) پەخشان بەکار ئەهێنرا، هەندێ جاریش هۆنراوە و پەخشان، بەو مەبەسەی لە ژینی مرۆڤ نزیکتر بێتەوە، چونکە لەسەر زیانی زەلامەکانی خۆی ئەو کۆمەڵە چیرۆکە کە لاسایی ئەکرانەوە، بەو زیانە نووسرابوونەوە کە زیانی گەل بوو؛ لە زیانی چیرۆکەکەدا هۆنراوە و هەڵبەستراو هەبوو، لە زیانی ڕەمەکیدا ئەو هونەرە نەئەبینرا.

گرنگترین شت کە خاوەنی بیروباوەڕی کلاسیکی لە سەردەمی نوێدا لە سەری ڕێککەوتن کە نەکرێ ئەوە بوو کە لە چیرۆکی لاساییدا بەشەکانی گۆرانی لابرێن.

لە چاخی یۆنانییەکاندا و لەو پشووانەدا ئەکەوتنە ناوەند پەردەکانەوە هەڵپەرکێ و گۆرانی و ساز و ئاواز هەبوو. (ئیسکلۆلۆس) لە چیرۆکە مەرگەساتەکانیدا بایەخی زۆری بەگۆرانی و هەڵپەرکێ و ئاوازدا بوو. کەچی (سۆفۆکلیس) و (یوریپیدس) لە چیرۆکە مەرگەساتەکانی خۆیاندا هەڵپەرکێ و گۆرانی و ساز و ئاوازیان بەکەرەستەیەک دائەنا لە چیرۆکەکانیان، لەگەڵ ئەوەشا هەر بەکاریان ئەهێنان.

لەسەردەمی ڕاپەڕیندا، هەندێ بوێژ، ویستیان جۆرێکی نوێ لە چیرۆکی لاسایی داپهێنن، کە لەشێوەی هونەرێکی ساز و ئاوازی سەربەخۆدابێ، ناویاننا (ئۆپێرا).

ئۆپێرا لەپێش هەموو شتێکا بایەخ بەگۆرانی دەدا، گفتوگۆیەکی سەر شانۆی تێ ئەخرێ، بەڵام تەنیا بەکەڵکی ئەم گۆرانیە دێت، کەواتە گۆرانی و ئەو ساز و ئاوازەی کە پێیەوە ئەنووسێ، هەردووکیان کەرەستەی ئەم هونەرە تازەیەن. هەرچۆنێک بێ، چیرۆکی لاسایی لەدەست بەشە گۆرانییەکانی ڕزگاری بوو، تەنیا پەروای بەگفتوگۆی لاسایی ڕووت بوو.

کلاسیکییەکانی فەرەنسە هەر بەم دەستوورانەوە نەنووسان، ئەیانویست چیرۆکەکانی خۆیان بنووسێن بەسێ یاسای، یەکێتی: کات و جێ و بابەتەوە، دیوارێکیشیان خستە ناوەند هونەری مەرگەسات و هونەری بەزەمەساتەوە، مەرگەساتیان دانا بۆ نواندنی ژیانی گەل. نەیان ئەهێشت ئەو دوو جۆرە چیرۆکە

تۆزێک تێکەڵ کرێن، تەنانەت یەجگار بایەخیان ئەدا بەمەرگەسات و بەزبانەکەی و بەهۆنینەوەکەی کە ئەبوو سەرواکانی جووت یاخود بەرامبەر بوونایە (لەبیرمان نەچێ کە شکسپیر ئەم بەندەی شکاند و بەسەروای ئازاد چیرۆکەکانی خۆی ئەنووسیەوە.)

بەڵام لە سەدەی هەژدەهەمدا جووڵەی بیر پەرەی سەند و گەشەی کرد، ڕاستی پەرستەکان چاوێکیان خشاندەوە بەسەر بیری یۆنانی کۆندا، لە بازرگان و پیشەوەر و فەرمانبەر و خاوەن بیرانیش، چینێکی ناوانجی پەیدا بوو، کەوتە ناوەند گەل و سەرۆک و خونکارانەوە... ئەمانە هەمووی بوو بەهۆی گۆڕانی مەرگەسات بۆ ئەمەی ژیانی ئەم چینە تازەیە بنوێنێ. هەروەها بوو بەهۆی تێکەڵکردنی (مەرگەسات و بەزمەسات) بۆ ئەمەی ڕووداوی ڕاستەقینەی ژیان بدات کە تێکەڵە لە خۆشی و ناخۆشی. لەوەپێش شکسپیریان کردە بەڵگەی ئامۆژگارییەکەیان، مایەوە سەر ڕۆمانتیکییەکان، ئەوانیش پشتگیری ئەم نرخ دانانەیان کرد لە شۆڕشەکەیاندا بەرامبەر بەکلاسیکییەکان. وە ماوەیان دا لە مەرگەساتەکانیاندا بەزمەسات یاخود پێکەنین بکەوێتە ناوەوە. بەڵام بەئەندازەیەک کە تێکی نەدا، ئەو کاتە سەدەی نۆزدەهەم بوو، کە جگە لە تێکەڵکردنی مەرگەسات و بەزمەسات (مەرگەساتی نوێی)یشی تیا پەیدا بوو، مەرگەساتی نوێ لە دوای پەیدابوونی هەردووکیان کاریان کردبووە ناخی چیرۆکی لاسایییەوە. مەرگەساتی نوێ بەهونەرمەندیی وێژەوانەکانەوە لە (مەرگەسات)ەوە دەرهێنرا؛ بایەخ نادات بەژیانی خونکار و سەرۆک و خانەدانەکان. بایەخ ئەدا بەژینی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ بەگیروگرفتەکانیان بەکاروبارەکانیان بەتاک و تەراکانی کۆمەڵ.

ئا بەم ڕەنگە چیرۆکی لاسایی گۆڕا، بەهۆی ئەو تەماشاکەرانەوە کە تەماشایان دەکرد، هەروا بەهۆی ئەو گۆڕانە فراوانەوە کە تووشی ژیانی ڕۆژئاوایییەکان بوو لەم سەردەمی تازەیەدا. واتا:

هەروەکو لە ئامانجدا (مەرگەسات لەگەڵ بەزمەسات) بوون بەیەک. هەروەها لە شێوەی نووسینیشدا یەجگار لەیەک نزیکبوونەوە. تەنانەت ئەو دیوارەش کە بەهۆی کلاسیکییەکانەوە پارێزرابوو لە ناوەند هەردووکیاندا، لەم سەردەمی تازەیەدا ڕووخێنرا، ئیتر هەردوو جۆرە چیرۆکە لاسایییەکان بۆ کەڵکی کۆمەڵ تێ ئەکۆشان، شێوە و ئامانجیان وەک یەکی لێ هات.

## جیاوازی ناوەند چیرۆک و چیرۆکی لاسایی

١- چیرۆک پێویستی بە(شانۆ) نییە، بەڵام چیرۆکی لاسایی پێویستی بەشانۆیە، بێ شانۆ ناگات بەمەبەستێ، چونکە بنچینەکەی لەسەر کۆمەڵێک گوێگرە کە بەهۆی لاسایی کەرەکانەوە، نووسەر بتوانێ بیروباوەڕی خۆی بخاتە مێشکیانەوە. بەڵام چیرۆک لەسەر زبانی یەکێک ئەنووسرێ، چۆن بخوێنرێتەوە، کەی بخوێنرێتەوە و لە کوێ... ئەشێ، وەک چیرۆکی لاسایی نییە کە لە کاتێکی دانراو جێگایەکی زانراو بۆ کۆمەڵێک گوێگر پێشان بدرێ.

٢- چیرۆک بۆی هەیە لەهەر شێوەیەکدا بێ بنووسرێتەوە، وەک: ڕۆژانە، یادنامە، پێ لێنان، گەشتوگوزار، نامە. بەڵام چیرۆکی لاسایی بەتەنیا شێوەیەک ئەبێ نابێ بنووسرێتەوە ئەویش شێوەی گفتوگۆیە.

٣- چیرۆک بۆی هەیە بەکورتی بنووسرێتەوە یا بەدرێژیی، ئەندازەی بۆ نییە. بەڵام چیرۆکی لاسایی نابێ لە سەد لاپەرە تێپەڕ بکات، ئەبێ ئەویش بکرێ بەچەند (پەردە)یەکەوە، نابێ لە پێنج پەردە تێپەڕ بکات، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە نە گوێگر لە وزەیدایە لە سێ کات پتر تەماشا بکات و گوێ بگرێ، نە لاسایی کەرەوەکانیش لە وزەیاندایە لە سێ کات پتر لاسایی بکەنەوە و چاوەڕوانی بکەن.

٤- ئامانجی چیرۆکنووس پێشاندانی ژیانە بەهەموو لکێکییەوە بەگەورە و بچووکی و گرنگ و بێ فەڕەیەوە، بەکارەساتی سامناک و بێ سامیەوە، بۆ ئەمەی بەشێنەیی و زرنگییەوە ژیانمان تێ بگەیێنێ و بۆ ئەو شتەی کە مەبەستیشیەتی دڵ و دەروونمان ببزوێنێ.

بەڵام ئامانجی چیرۆکنووسی لاسایی تەنیا پێشاندانی سوچێکی ژیانە، هەڵی دەبژێرێ پاشان بەجۆرێکی گرنگ و جوان و کاریگەرەوە پێشانمانی ئەدا، بۆ ئەمەی بەتوندیی کار لەدڵ و دەروونمان بکاو بمانوروژێنێ بۆ مەبەستێکی تایبەتی.

٥- ماوەی چیرۆکنووس فراوانە، نەبەستراوە بەکات و جێگاو بابەتەوە، ئازادە هەرچۆنێکی ئەوێ ئەتوانێ چیرۆکەکەی بنووسێ. بەڵام ماوەی چیرۆکنووسی لاسایی تەنگە، بەستراوە بەجێگاو بابەتەوە، بەئامازەیەکی کەمی لاساییکەرەوە کە ئەبنە پاڵەوانەکانی چیرۆکەکە، بەستراوە بەکارەساتی گرنگ و بەنرخ و کاریگەرەوە کە ئەبێ زۆر بەوردی لە ژیاندا هەڵیان بژێرێ، بەستراوە بەجۆری نووسینەکەوە کە هەر ئەبێ لە شێوەی گفتوگۆدابێ، دوور لە درێژەپێدان. کورت و ناژک و کاریگەر، بەستراوە بە(پێشاندان، کارەسات، تەنگ و چەڵەمە و چارەکردنی). بەستراوە بەدروستکردنی شەڕ و شۆڕ و بەرەنگاری لەناو پاڵەوانەکاندا تا یەک لەدوای یەک کارەساتی ناکاو و سامناک پێشاندات؛ تا کار لە دڵ و دەروونی تەماشاکەران و گوێگران بکات، بەستراوە بەهەڵبژاردنی (بابەت و کارەسات و پاڵەوان)ەوە، تا بیروباوەڕی خۆی بەگورجی و کاریگەری فڕێ داتە مێشکی گوێگران و تەماشا کەرانەوە.

٦- چیرۆک نزیکترە بەگەل لە چیرۆکی لاسایی، چونکە هەر لە زووەوە بابەتی گەل بووە، ئازار و ئاواتی پێشان داوە، بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە، توانی زۆر بەوردی ژیانی گەلان پێشان بدات. لەبەر ئەوە چیرۆک خۆشەویستی زۆرترە لە هی لاسایی واتا خوێندەواری زۆرترە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە چیرۆک هەموو سوچێکی ژیان و مرۆڤ و سروشت پێشان ئەدات، بەڵام هی لاسایی تەنیا سوچێکی گرنگ و بەنرخی ژیان و سروشت و مرۆڤ پێشان ئەدات.

٧- لە چیرۆکدا هەموو شتێک بەدرێژی باسی ئەکرێ؛ بەهێمنی بۆ تێگەیشتن، بەڵام لە هی لاساییدا بەڕاز و نیاز و نیشانەگەریی دڵ و دەروونی تەماشاکەران ئەبزوێنرێ، ئەویش بەکوت و پڕی و کورتی و گورجی، کەواتە هەست بزواندن لە چیرۆکدا کەمتر سست ترە وەک ئەوی تر.

٨- هونەری چیرۆکی لاسایی گرانترە لە هونەری چیرۆک، هەرچەندە هەردووکیان لە ڕووی ڕەوتی مێژووییەوە گرنگی و مەزنی و کۆڕی خۆی هەیە بۆ کەڵکی مرۆڤایەتی، بەڵام چیرۆکی لاسایی هەر تەنیا چیرۆک نییە، چیرۆکیشە و چیرۆکێکی لاسایی گرێداریشە.

## شێوەی چیرۆکنووسین

١- دارشتنی: چیرۆکنوس لە نووسینی چیرۆکەکەیدا ئازادە لە چ شێوەیەکدا بیەوێ ئەتوانێ دایڕێژێ، ئەتوانێ بیخاتە شێوەی: ڕۆژانە، یادنامە، پێلێنان، نامەکاری، گەشتنامە، گێرانەوەی سەرگوروشتە، لەسەر زبانی: چاوئەنداز شاهد عیان، یا یەکێک لە زەلامەکانی ناو چیرۆکەکە یا زبانی نووسەر خۆی.

٢- پێشان دانی: سەربەستە لە پێشاندانی ناوەرۆکی چیرۆکەکەیدا، ئەتوانێ لە یەکەم کارەساتییەوە دەست پێ بکات پاشان یەک لە دوای یەک کارەساتەکانی تریش بگێڕێتەوە، ئەشتوانێ لە دواترینیانەوە بێ و پاشان ڕووناکی بکاتەوە کە چۆن بەو ئەنجامە گەیشتوون. هەروا ئەتوانێ لە تافێکی دیاریکراوی ژیانی پاڵەوانی چیرۆکەکەیەوە دەست پێ بکات، پاشان بەرەو پاش بڕوا تا پێشانمان بدات کە چۆن ئەم تافە پەیدابووە، هەروەها چۆن ڕوویانداوە.

٣- بنچینەی چیرۆک: چیرۆکنووس ئەتوانێ بایەخ بەکارەسات بدات لە پێش زەلامەکاندا، واتە کارەساتەکان بکاتە بنچینەی چیرۆکەکە، زەلامەکان بەبۆنەیانەوە کردەوە و ڕەوشت و خوویان پێشان بدات، ئەبێ کارەساتی وروژێنەر و گرێداری ڕێکوپێکیان تا فرێ بدات تا خوێندەوار ببزوێنێ بۆ تەواوکردنی، چیرۆکنووس ئەتوانێ لەسەر ئەم دەستوورە بڕوات: لە چیرۆکی گەشتوگوزار و جەربەزەیی: مغامەرە و تاواندا.

هەروا ئەتوانێ ئەم شتانە بکاتە بنچینەی چیرۆک: پاڵەوانێکی چیرۆکەکە، چەند پاڵەوانێکی یەک دەنگی چیرۆکەکەی.

٤- کەرەستەی چیرۆک: ئەتوانێ کەرەستەی چیرۆکەکەی لە کارەساتی ئیمڕۆوە وەرگرێ، یا لە کارەساتی مێژوو، لە کاروباری کۆمەڵێکی دیاریکراو و گیروگرفتەکانی ژیان، لە مرۆڤایەتی بدوێ کە بایەخ بەکانگای ژیانی مرۆڤ و گەوهەرەکانی ئەدات، هەروا دەتوانێ بایەخ بدات بەدەروون، بەشیکردنەوەی دەروونی زەلامەکان وە چۆنێتی بزوتنی هەستیان بەرامبەر بەو کارەساتانەی لێیان ئەقەومێ، یا لە بەرچاویاندا دەقەومێ.

٥- دروستکردنی چیرۆک: دەبێ چیرۆکنووس زۆر بایەخ بدات بەدروستکردنی چیرۆکەکەی، دەبێ بەشەکانی باش بەیەکەوە بسازێنێ، بگونجێنێ، بنووسێن تا لە هەموویانەوە چیرۆکێکی تەواو دروست ببێ، چونکو چیرۆک ئەبێ ژیان نیشان بدات بەهەموو کەرەستەیەکی ڕوودا و مرۆڤایەتییەوە، بەهەموو هەستێکی دەروونی و تاسەی دڵ و پرشنگێکی هۆشیەوە، ئەویش بەشێوەیەکی وا جوان و گرنگ و بڵند کە خوێندەوار بەتاسوقەوە بیخوێنێتەوە و خۆرشتی گیان و دڵ و هۆشیانی لێ وەرگرن، چونکە ئاشنایەتی لەگەڵ ژیان و ڕووداو و هەستی خۆیاندا هەیە.

٦- ئامانجی چیرۆک: نابێ دڵخۆشکردنێکی سەرپێی خوێندەوار ئامانجی چیرۆکنووسبێ، بەڵکو بەهۆی ئەو کۆمەڵەوە کە لێی ئەکۆڵێتەوە بکاتە بنج و بناوانی ڕاز و نیاز و ڕاستی مرۆڤایەتی، ئینجا ئەو گەوهەرە بەنرخانەی ژیان و مرۆڤایەتییەمان بۆ دەرخات کە لە گەنجینەی وێژەدا تاسەر بمێننەوە، بۆ ئەمەی ئادەمیزاد تا ئەمێنێ کەڵکیان لێ وەرگرێ. یاخود بۆ ئەمەی کۆمەڵەکەمان لەم ژیانە

دەمدەمیەوە بگوێزرێتەوە بۆ ژیانێکی زیندوو و تاسەر بڵند، نابێ چیرۆکنووس بەوە وازبهێنێ کە ژیان وەک ئەیبینێ لە چیرۆکەکەیدا پیشانی بدات. بەڵکو ئەبێ هەندێک لە هونەرمەندیی و زرنگی و بلیمەتی خۆیشی بخاتە سەر، بۆ ئەمەی بەهۆی چیرۆکەکەیەوە کۆمەڵ ئاراستەی ژیانێکی چاکتر و خۆشتر و بڵندتر بکات.

چیرۆکنووسی شارەزا ئەتوانێ لە ساکارترین رووداوی ژیان چیرۆکێکی ناوازە و رەنگینمان بۆ هەڵبەستێ، کە دڵمان کێش کات و گەشکەدارمان بکات و بمانخاتە سەر ئەو رێگا باشانەی کە بۆ ژیانێکی باشتر و پڕ کامەرانیترمان ئەبات.

٧- زیانی چیرۆک: هەموو چیرۆکنووسێک ئەبێ شێوەی خۆی هەبێ لە دەربڕینی بیروباوەڕ و هەستی خۆیا؛ جوێ بێ لەهی تر.

ئەمەش بەهۆی مەشقکردنێکی زۆرەوە بۆی پەیدا ئەبێ، ئەبێ شێوەی نووسینەکە سووک و ناسک و رەوانبێ، شەنگ و شۆخ زیندوو پڕ ئاهەنگ بێ، نزیکبێ لە دڵ و دەروونی خوێندەوارەوە، نزیکبێ لە تێگەیشتنەوە، گیان و سەردەمی ژیانی چیرۆکنووسەکە و خۆیەتی تیا دیاربێ، چەن شتێکی تازە داهاتووی دەستی چیرۆکنووسەکەشی تیابێ، بۆ ئەوەی تەڕی و تازەیییەک بدا بەوێژەکە و بەرهەمی وێژەیی، زمانی رەمەکی بەکاری چیرۆک نایەت، چونکە پلەی هونەری چیرۆکەکە ئەهێنێتە خوارێ، چیرۆکنووسێ هونەرێکی بڵندی جوانی پڕ لە گیروگرفتە. بەڵام چیرۆکنووسی زرنگ و بەکار و تێکۆشەر ئەتوانێ فێری ببێ و بەکاری بهێنێ، چیرۆک لە هەموو هونەرەکانی تری وێژە لە رووداوی کۆمەڵایەتیمان نزیکترە، لە نەتەوەوە نزیکترە.

ئێمە ئەمانەوێ چیرۆکنووسەکانمان ئەم رووداوە کۆمەڵایەتییانە بەهۆی چیرۆکەکانیانەوە دەربڕن؛ بەڵام دەربڕینێکی وا کە جوان و رازاوەبێ، پڕ بێ لە ساز و ئاوازی گیانیی وا کە کار لە دڵ و دەروون و گیانمان بکات و ئاراستەشمان بکات بۆ چاکەی گشتی.

## شێوەی نووسینی چیرۆکی لاسایی

١- هەڵبژاردنی بابەت: چیرۆکنووس پێویستە بابەتێکی باش هەڵبژێرێ بۆ چیرۆکە لاساییەکەی کە پڕ بێ لە زۆرانبازی و بەرەنگاری و شەڕ و شۆڕ، کارەساتی تازە تازە و رووداوی لەناکاوی لێ پەیدا ببێ، ئەتوانێ بابەتەکەی لە چیرۆکە هەڵبەستراوەکانی نەتەوەیی یا لە مێژوو، لە کارەساتی شۆڕشەکان، لە ژیانی رۆژانەی گەلەکەی خۆی و گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتی و کاروبارەکانی نەتەوەکەی هەڵبژێرێ.

٢- شێوەی پێکهێنانی: خاوەن چیرۆک پێویستە پێڕەوییەکی ورد و باش دابنێ بۆ دروستکردنی چیرۆکەکەی؛ بۆ دابەشکردنی بەسەر چەند بەشێکا، نە کەمبێ نە زۆر بەڵام لە (٥) بەشی یاخود پەردە تێپەڕ نەکات، هەروەها چاوئەندازەکانیش وەک بەشەکان کەمبن لەگەڵ یەکا رێککەون و لەنگەر بگرن، هەریەک ئەوی پێشووی تەواوکات، پێویستە زەلامەکان رەوشت و خوو و کرداریان دیاریکرێ بۆ ئەمەی کە لاساییەکە دەستپێکرا وەک مرۆڤی راستەقینە زیندوویی پیشان بدەن،

ئەبێ ژمارەی زەلامەکانیش لە ئەندازە دەرنەچێ، کاتی لاسایی کردنەوەکە کەمبێ، لە سێ کات تێپەڕ نەکات، جێگای لاسایی کردنەکە یەکبێ نەگۆڕێ، بۆ هەر پەردەیەکیش وەک چیرۆکەکە بەگشتی سەرەتا و ناوەڕاست و دوایی، دیاریکرێ، وەک یەک لەش هەر پەردەیەک لەگەڵ ئەوی پاش و پێشی خۆی ڕێککەوێ و بەشێک لە چیرۆکەکە تەواوکات. ئەبێ لە شێوەی گفتوگۆشدا چیرۆکەکە دابڕێژرێ.

٣- زبانی چیرۆک: ئەبێ زۆر کورت و پڕ واتا و جوان و ئاسان و ئاهەنگدار و کاریگەربێ. پێویست نییە هەموو شتێک بەئاشکرا دەرخرێ، مەبەسی زۆر ئەوەیە کە دڵ و دەروونی گوێگران و تەماشاکەران ببزوێنرێ. لەبەر ئەوە زۆرتر ئەبێ بایەخ بدرێ بەو وشانە. بەو توانج و پلارانە. بەو تەوسانە. بەو نیشانەگەریانە کە سۆزی دڵ و دەروون گڕتێبەرئەدەن لە شێوەی کوتوپڕ و ناکاو و گورج و گۆڵدا.

خاوەن چیرۆک ئەبێ هونەر زۆر بنوێنێ؛ لە گفتوگۆکاندا بۆ ئەمەی هەست بزوێن و نیاز بەخش و ئاراستەکەربن بەرامبەر تەماشاکەران.

ئەگەر چیرۆکەکە لە جۆری مەرگەسات بوو ترس و سام و ڕاچەنین و داچڵەکین بەزەیی بخەنە دڵی گوێگرانەوە، ئەگەر لە جۆری بەزمەساتبوو، خوتوکەی پێکەنین و دڵخۆشی و تیز پێکردن بخەنە دڵەوە.

پێویست بەوتن ناکات کە بڵێم ئەبێ وشەکان لە تێگەیشتنی گوێگر و دڵ و دەروونییەوە نزیک بن، تا بەزوویی کاری لێ بکەن.

## چیرۆکی کورت

کورتە چیرۆکیش جۆرە چیرۆکێکە داڕشتنی تایبەتی خۆی و شێوەی نووسینی تایبەتی خۆی هەیە، بەکورتی ئەنووسرێ، لە بابەت تاکە بیرێکەوە یاخود تاکە کارەساتێکەوە، یا لەبابەت کەسێکەوە ئەدوێ بەڵام بەشێوەیەکی ئاشکراو سووک و ئاسان. لەم هونەرەدا، دەستەیەک نووسەر و وێژەوانان پێگەیشتن، توانیان ڕووەکانی ژیان جیا بەجیا لە شێوەیەکی باش و جواندا دەربخەن، بایەخیان بەکورتیی و وێنەی وێژەیی کاریگەر ئەدا، هۆی پەیدابوونیشی ژیانی پڕوچڕی ئەمڕۆیە کە ماوە بەزۆر کەس نادا چیرۆکی درێژ بخوێنێتەوە، لەبەرئەوە زۆر کەس ئێستا هۆگری ئەم کورتە چیرۆکانە بوون، کە بێجگە لە خۆشیەکەیان کات کەمتر لە خوێندەوار داگیر ئەکەن.

ڕۆژنامەکان ئەم جۆرە چیرۆکانە زۆرتر بەکار ئەهێنن، چونکە بەکەڵکیان دێن، لەگەڵ ئەمەشا چیرۆکی درێژ هێشتا پەسەندە و جێگای خۆی بەجێ نەهێشتووە، چونکە لەگەڵ سەردەمدا ئەسازێ، بەشی زۆری بابەتەکانی وێژەشی تیا جێ ئەبێتەوە، لە خۆیدا جوانی هۆنراوە و ڕاستیی ژیانیش کۆ ئەکاتەوە، لە هەموو هونەرێکی تر پتر کاروباری ژیانمان، بەرجەستە و واتایی، بەئاشکرا بۆ دەرئەخا.

## نرخی وێژیی بۆ چیرۆک چۆن دائەنرێ

لە دوو ڕووەوە نرخی وێژەیی بۆ چیرۆک دائەنرێ:

١- لەڕووی کەرەستەی چیرۆکەکەوە کە بریتییە لە (پێرەوی چیرۆکەکە) و ئەو (زەلامانەی لە چیرۆکەکە)دا سنوور بۆ ئەو پێرەویە دائەنێن و ڕەنگی بۆ ئەڕێژن.

هەروا بریتییە لەو بابەتەی کە بۆ چیرۆکەکە هەڵ ئەبژێرێ، ئەمەش بەوە کێشانە ئەکرێ کە تا چ ئەندازەیەک هەستی دڵ و دەروون ئەبزوێنێ؟

دەستووری بەرز و پیرۆز بۆ ژیان ئەدۆزێتەوە؟ ئامانجەکانیشی تا چەند نەژاد و بڵندن؟. گرنگترین پێوانەی سۆزیش هێزێتی، پلەیەتی.

نرخی وێژەیی تەماشای ئەوە ناکات کەرەستەی چیرۆکەکە پڕ بێ لە جەربەزەیی و تەنگوچەڵەمە و کردەوەی نەبینراو و نەبیستراو (اعمال شاذة)، بەڵام ڕێز لەو کەرەستەیە ئەگرێ کە دڵمان خۆش ئەکات؛ بەپیشاندانی ڕەوشت و خوو و کردەوەی بڵند و پەسەند. هەروەها بەنواندنی ژیانی مرۆڤ لە سوچە گرنگەکانییەوە، دیسان نرخی وێژەیی ڕێز لەو کەرەستەیە ئەگرێ کە ئەو کارەسات و زەلام و کردەوانەی هەڵیان ئەبژێرێ لەوانەبن کە ڕاستترین سۆز و بڵندترین سۆز لە دڵ و دەروونماندا بوروژێنێ.

٢- لە ڕووی نووسینی چیرۆکەکەوە: هەرچەندە نرخی وێژەیی ئەمەی داناوە بۆ ئارەزووی نووسەرەکە خۆی، بەڵام ئەویش ئەبێ زەلامەکانی بەهەموو هێز و هەرەتێکیانەوە فرمانەکانیان ببینن، ڕەوشت و خووی خۆیان دەربخەن، دڵمان کێشکەن تا چیرۆکەکە کۆتایی دێ، دوور بەدوور لە دوایانەوە بڕۆین. هەروەها ئەبێ تێمانگەیێنێ کە ئەو پاڵەوانانە چی خستوینیەتە گەڕ؟ ئەمەش لە زبانی پاڵەوانەکان خۆیان و کردەوەکانیان بەدەرکەون، نەک لە زبانی نووسەر خۆیەوە.

چیرۆکنووسی شارەزا لە چیرۆکەکەیدا دوو شت کۆ ئەکاتەوە: (بڵندی هۆنراوە، نواندنی ڕووداو). (نەژادترین کردەوە و ڕەوشت) و (ڕاستترین سۆز) لە کردەوە و کار و زبانی مرۆڤدا پیشان ئەدا، بۆ ئەمەی چەند نموونەیەک بخەینە مێشکمانەوە و بۆشمان نەیەتەدی. با م نرخزانی وێژەییش لە بیری بێ:

«کە هونەر بریتی نییە لە ژین، بەڵکو بریتییە لە وێنەیەکی پوختەکراوی ژین، لە کێشانەی ژین بەوردی لەسەر بنچینەی هەڵبژاردنێکی باش و لێکدانەوەیەکی ڕاست.»

## دڵداری لە چیرۆکدا

لە زۆر چیرۆکدا، دڵداری بەشی گرنگی کەرەستەکەیەتی، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە دڵداری سۆزێکە لە هەموو کەسێکا هەیە، کەس نییە بەدڵداری دڵی نەکرێتەوە، چاوی بەجوانی بەژن و باڵاو ڕوو نەگەشێتەوە، یا ئاخ نەخوازێ بۆ تافی کوڕێنی یا کچێنی خۆی و حەز لە هێز و هەرەتی لاوان و هەست و بزوت و گەشی ڕووخۆشی یان نەکات.

ئینجا دڵدارییەک کە لەناوەند کوڕ و کچی جواندا ڕوو بدات زۆرتر دڵی خوێندەوارانی چیرۆک کێش ئەکات. دڵداری ئەگەر ئاسایی و ڕاستبێ، دەروون پاک ئەکاتەوە، سەر بڵند ئەکاتەوە، نەژادترین ڕەوشت ئەبەخشێ، خاوەنەکەشی ئەگەیێنێ بەپایەی هەرە بڵند لە ژیانا؛ دڵداریی سۆزێکی پیرۆزو بەرزە، پیاوو ژن بەرەو گەورەیی ئەبات، ئەندێشە زیندوو ئەکاتەوە، کارگوزاریی قاڵ و پوختە ئەکات. لەبەر ئەوە بۆ پیشاندانی دڵداریی ڕۆشنبیری و ئەندێشەیەکی جوانی پێ ئەوێ.

دڵداریی لە دڵ و دەروونماندا هەستێکی لاوێتی زیندوو ئەکاتەوە، لەبەر ئەمە یاریدەی چیرۆکنووس

ئەدا لە دانایی پێڕەویی چیرۆکەکەیدا. چونکە دوور نییە ئەو دڵدارییە بگاتە ئەنجامی مارەکردن. دووریش نییە ژن و مێردێتییەکە ببێتە سەرگەردانییەک بۆ کوڕ و کچەکە، ئەوساکە چیرۆکنووس ناچارە چیرۆکەکەی بگەیێنێتە ئەنجامی دوایی.

لەگەڵ ئەمەشا ئەگەر دڵداریی تەنیا کەرەستەی چیرۆکەکە بێ و هۆی دروستکردنی بێ، ئەوا چیرۆکەکە نرخێکی وێژەیی گەورە وەرناگرێ، هێزێکی گرنگی ئەمری نابێ...؛ چونکە وێژەی مەزن ئەوەیە مرۆڤایەتی پیشان بدا بەهێز و توانا و تێکۆشانە گەورەکانیەوە، وەک (سۆزی بەهێز، خواستی پۆڵایی، کارەساتە فراوانەکان).

چیرۆکی دڵداریش کە کوڕ و کچەکەی. بچووک بن، هەرچەندە شتێکی جوانە و دڵی خوێنەوار ڕائەکێشێ، بەڵام ئەو دوو پاڵەوانە ئەوەندە جیهانیان تاقی نەکردۆتەوە کە فێری ژیریی و کاردروستی و ڕاستبینی (صدق النظر) و هەستی قووڵ ببن، لەبەر ئەوە سەرمایەیەکی وێژەیی گەورە لەسەر زمانی ئەو دووانە بۆ چیرۆکنووس نایەتەکایەوە، لێرەدا نووسەر تووشی گیروگرفتێکی وێژەیی دێ، بۆ ئەمەی لەمە ڕزگاری ببێ؛ دێنێ دڵدارییەکە ئەخاتە ناوەند کچێکی تازە تەمەن و پیاوێکی دنیا دیدەوە. لە کچەکەدا گەرمایی لاویی هەیە، لە پیاوەکەشا دروستیی پیاو، کچە هەرچەندە گەورە نییە بەڵام بەجوانییەکەی پرشنگ ئەدا بۆ گەورەیی. واتا نیاز ئەخاتە دڵی پیاوەکەوە کە بۆ گەورەیی تێکۆشێ.

نووسەر دڵداریی و پاڵەوانەکانی دڵداریی ئەکات بەهۆیەک بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیان و پیشاندانێکی ڕاستەقینەی ژیان... هەروەها نووسەر ئەهێنێ:

دڵداری ئەخاتە ناوەند دوو پاڵەوانی تێگەیشتووەوە، بۆ ئەمەی لە چیرۆکەکەیدا دوو شت کۆ بکاتەوە: شارەزاییەکی تێگەیشتووانە لە ژیان، وە سۆزێکی گشتی خۆشەویست.

جاری واش هەیە چیرۆکنووس دڵداریی لە شێوەیەکی ناسازدا پیشان ئەدا، بەرەنگاری یاساکانی کۆمەڵایەتی ئەکات، بۆ ئەمەی زەبروزەنگ و مەرگەساتەکانی دڵدارییەکە دەرخات.

جاری واش هەیە دڵداریی ئەخاتە شێوەیەکی دڕندەیی و ئەنگەوە، ڕەوشت و خوو لەناو ئەبات، ژن لە شێوەیەکی هەرزان و تاڵاندا پیشان ئەدات؛ وەک بابەتی بازرگانی، ئەکڕێت و ئەفرۆشرێ. یاخود پیاو ئەخاتە شێوەی گیانلەبەرێکی شێتەوە. هەستی خۆی پیس ئەکات و پیاوەتی خۆی کەم ئەکاتەوە.

ڕووداوە دڵدارییەکە هەر چۆنێک بێ، پێویستە چیرۆکنووس لە شێوەیەکی وادا دایڕێژێ کە دڵ و دەروونی خوێندەواران و گوێگران پاککاتەوە؛ کردەوە و ڕەوشتیان بڵندکاتەوە، ڕێگای گەورەییان پیشان بدات، هێز بدا بەدڵیان و مێشکیان پڕ کات لە هیوا و ئاوات و نیازی بڵند بۆ پاشەڕۆژ.

ئەم دەستوورە نەک هەر بۆ (دڵداریی) ئەبێ بۆ بابەتی (نیشتمانپەروەریی) و (پیاوەتی) و (مرۆڤایەتی) و (تووڕەیی) و (بەزەیی پیاهاتنەوە) و هەموو سۆزێکی تریش کە چیرۆک ئەیخاتە دڵ و دەروونی خوێندەوار و گوێگرەوە، بەکار بهێنرێ، بۆ ئەمەی چیرۆکەکە بەکەڵکی گوێگران و خوێندەواران بێت و بەمەبەستی وێژەیی خۆیشی بگات.

# نموونەی پەخشانی کوردی

«شیکردنەوە و نرخی وێژەییان»

(١)

(چیرۆکی شاروخ و گوڵروخ)- مێژووی ئەدەبی کوردی- عەلائەدین سەججادی. ل ٨٩ «دوو برا هەبوون، یەکێکیان ناوی (بالی)بوو، یەکێکیان ناوی (بارام) بوو.

لەبەر هەژاری و بێ نەوایی هەستان، سەری خۆیانیسان هەڵگرت و کەوتنە ولاتان، هەتا چوونە شارێکەوە. سەیریان کرد ئەم شارە هەمووی بەرگی ماتەمی پۆشیوە و کز و مەلولن. پرسیان ئەوە بۆ چ خەڵکی ئەم شارە ڕەشپۆشی بوون؟ وتیان: بەڵێ دوێنێ پادشای ئەم شارە مردووە و کەسیش لە شوێنی بەجێ نەماوە. لە زەمانێکی زۆر کۆنەوە لەم شارەدا بۆ دانانی پادشا: بازگەردان بووە، باز نیشتبێتەوە سەر هەر کەسێکەوە کردوویانە بەپادشا. ئێستەش ناچار ئەبێ سەرلەنوێ دەست بکەنەوە بەبازگەردان.

لە پاش چل ڕۆژی تر دیسان باز ئەگێڕنەوە بۆ ئەوە یەکێک بکەن بەپادشا. ئەمانیش هەروا بۆ خۆیان لەوێدا مانەوە بۆ ئەوە ئەو ڕۆژی بازگەردانە ببینن، کە چۆن باز ئەسووڕێتەوە و ئەنیشێتەوە بەسەر یەکێکەوە!؟»

***

لەم چیرۆکەدا، کە دیارە زۆر کۆنە، ئەم وشانە ئەبینین کە ئێستاکە بەکار ناهێنرێن، لەبەر گۆڕانی ڕەوشت و کردار و شارستانێتی، وەک: (بازگەردان، چەرخ و فەلەک، سێو خواردن بۆ سک و زا، تەلیسم، جادوگەری، قسەکردنی ڕێوی، لەشکری پەلەوەر و گیانلەبەر، سیمرغ، شاری گومەتە).

نووسینی چیرۆکەکە زۆر سووک و ڕەوانە. دڵی پیاو کێش ئەکا بەکارەساتە ڕەنگاوڕەنگ و سەیر سەیر و ناکاو و گرنگەکانی، بەپاڵەوانە نەبیستراو و نەبینراوەکانی، لە لایەکییەوە ڕەوشتێکی پاک و پوختەمان بۆ دەرخات، لەلایەکی تریشەوە ڕەوشت و خوویەکی زۆر نامەردانە و فڕوفێڵاویمان بۆ دەرئەخات. بەڵام ئەنجامی چیرۆک بەسەرکەوتنی پیاوی چاک و پاک و کردەوە جوان دوایی دێت. بەدوو پیاو خراپ ژێر ئەکەوێ. بەشادمانی و ئاشتی و دۆستایەتی و پەشیمانی لە گوناهـ و پێکگەیشتنی شاروخ و گوڵروخ و سەندنەوەی شایەتی و ئازادی بۆ شاروخ گەلەکەی ئەبڕێتەوە.

پیاو هەست بەخۆشییەک ئەکات لە بەرەنگاری کردنی زۆرداری و بەدکرداریدا، گێڕانەوەی مافی مرۆڤایەتی و سەر نەنگری بوونی پیاوخراپی بێ ئامان و سەرکەوتنی پیاوچاک و دادپەرست و سەربەرز دڵی خوێندەوارانی ئەم چیرۆکە خۆش ئەکات. چونکە هەستی دڵی کوردایەتی دەرئەبڕێ بەرامبەر ئەو گیروگرفتە کۆمەڵیانە کە هەموو دەم لەکۆڵی نەبۆتەوە و تێکۆشاوە بۆ چارکردنیان. ئەم چیرۆکە خووڕەوشت و ناو دڵ و دەروونی کوردەواری زۆر بەجوانی و ڕووناکی پێشان ئەدا، لەبەر ئەوە نرخێکی وێژەیی بڵندی هەیە، چ لە شێوەی نووسینەکەدا، چ لە شێوەی داڕشتنەکەیدا وە چ لە ئامانجەکەیدا، لەبەر ئەوە بەچیرۆکێکی وێژەیی نەتەوەیی کوردیی پەسەند ئەژمێرێ.

## (٢)

## (میوان و خانەخوێ)

-مێژووی ئەدەبی کوردی- عەلائەدین سەججادی ل: ١٢٤ «جارێک سێ کابرای کورد ئەچن بۆ شوێنێکی دوور بۆ کاسبی، چەند ساڵێکیان پێ ئەچێ و هەریەکە سی دراوی ئەو دەورە پەیدا ئەکەن و ئەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، دنیا زستان ئەبێ، شەوێ ڕێیان لەو کوێستانە ئەکەوێتە گوندێک و ئەبن بەمیوانی ماڵێک.. زۆر ماندوو ئەبن، دوویان خەویان لێ ئەکەوێ، یەکێکیان هەرچەندە ئەکا لەبەر پەژارەیی خۆی خەوی لێ ناکەوێ، هەڵئەستێ ئەچێتە گوێ ئاگردانەکە، کە خاوەن ماڵەکە ڕیشە سپییەکەی شۆڕکردۆتەوە بەسەریا ئەمیش وەکو ئەو کزۆڵە ئەکا!... گەلێ دائەنیشێ هیچیان دەنگ ناکەن.

دواجار میوانەکە ئەڵێ: مامە بۆ چ قسە ناکەی؟، ئەویش ئەڵێ: کەسی مامی من قسە بەپارە ئەکەم!، ئەڵێ: قسەیەک بەچەند؟، ئەڵێ: بەدە پارە!، کوڕە لەبەری گران ئەبێ، لە پاشان زۆر تامەزرۆی قسە ئەبێ، ئەڵێ: ها مامە ئەوە دە پارە قسەم بۆ بکە!...، پارەکەی لێ وەرئەگرێت و ئەڵێ: کەسی مامی ئەگەر دنیا زستان بوو بەفر لە زەویدابوو، ڕێت کەوتە شوێنێک و شەوتیامایتەوە، بەیانی کە هەستایت دنیا ساماڵە هیچ هەور بەعاسمانەوە نییە بەڵام کزە بای دێت، ئەگەر دەریشیان کردیت نەکەی لەو ماڵە دەرچیت تا کزە باکەی لەسەر ئەچێت!...، ئەمەی گوت و بێدەنگ بوو!...

***

ئەم چیرۆکە نموونەیەکی زۆر بڵندی پەخشانی کۆنی کوردییە، ڕەوشت و خووی کوردەوارییی، کەژی کوردستان لە زستاندا، پلەی زرنگی ڕیش سپیانی کورد، ئامۆژگاریی بەرز و بڵندی کورد، کارەساتی تەنگ و ناپەسەندی کۆمەڵایەتی و چارکردنیان کە لەکانی دڵی کوردەوارییەوە دێتە دەرێ، لەگەڵ سەرکەوتنی دەسپاکی ژیری و هێمنیدا، بەسەر ناپاکی و بەدخوویی و سەرچڵیدا پێشان ئەدا.

نووسینەکە سووک و ڕەوانە، هەرچەندە وشە و واژەی بێگانە و ناسازی تیایە، کارگوزاریی پاڵەوانەکانی و ڕەنگاوڕەنگی کارەساتەکانی لەگەڵ ئەو شتانەدا کە لەناکاو ڕوو ئەدەن و سەر لێیان سوڕ ئەمێنێ، هەروەها پێکهاتنی ئاواتی هەموو دەمەی کوردەواری کە لەناوبردنی زۆرداری و بەدکرداری و سەرخستنی دادپەروەری و کردەوەی بڵندە، دەرئەخا.

چیرۆکەکە چ لەشێوەی داڕشتنی و زمانەکەیا چ لە بابەت و مەبەسەکانیا، چ لەو ئامۆژگارییە بڵندانەدا کە پێشانمان ئەدا، دڵ و دەروونی کوردەواری و گیروگرفتی کۆمەڵایەتیمان و چارکردنی پێشان ئەدا. لەبەر ئەوە پیاو هەست بەخۆشییەک ئەکات لە خوێندنەوەیدا، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی پیاوی ژیر و کردەوە بڵندی تیا سەر ئەکەوێ.

چیرۆکەکە، نموونەیەکە لەوێژەی کۆنی نەتەوەییمان، بەچیرۆکێکی بڵندی وێژەییمان ئەژمێرێ.

(٣)

قسەی پێشینان

(هاوڕێتی مناڵ- شاکر فتاح- ل: ٣٩)

١- چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوەوە.
٢- کابە بڕوخێنە و دڵی مەرەنجێنە.
٣- پرسابە و زانابە.
٤- شەڕ لە بێکاری چاکترە.
٥- ئەو جێیە خۆشە کە دڵ پێی خۆشە.
٦- قسە لە پاش حەو کێو ئەگاتەوە بەخێو.
٧- سەر بۆ سەربڕین نەک بۆ سەر زەنشت.
٨- کانییەک ئاوت لێ خواردەوە بەردی تێ مەخە.
٩- برا لەپشت برابێ مەرگ مەگەر لەلای خوابێ.
١٠- پاروو لەدەمدا کەوت بۆ کۆش باشە.
١١- ئەوەندەی بەڕەی خۆت پێت ڕاکێشە.
١٢- زۆر ببیە بام لەکەم بکەی.
١٣- دۆست ئەوەتا ئەتگرێنێ، دوژمن ئەوەتا پێت پێ ئەکەنێ.
١٤- بۆیە پێت ئەڵێم کاکە، کە چۆلەکەم بۆ بگری.

(٤)

مەتەڵ

(هاوڕێی منال- شاکر فتاح. ل: ٦١)

ئەمە چییە؟:

١- هەر ئەڕۆیت و نایگەیتێ؟
٢- بەسێ برا کلاوێکیان هەیە؟
٣- ئەملا پەرژین ئەولا پەرژین، تیایەتی کۆترێکی نەخشین؟
٤- دەسی پیائەنێی دەم دائەچەقێنێ؟
٥- قەڵای گەچین، ڕێ نییە تێی چین؟
٦- کۆتکە دارێکە و ناوبژی کەری شارێکە؟
٧- هەناسە ئەدا، خاک ئەخوا، گیانلەبەر ئەخوا، دارئەخوا، کەچی کە ئاوی ئەدەیتێ ئەمرێ؟ [1]

---

(١) دیارە، ڕستەکان (ڕستەی پرس) نین، بەڵام ئەو نیشانە پرسانە نیشانەن بۆ ئەوەی ئەو ڕستانە مەتەڵن و داوای وەڵام دەکەن (هەڵهێنانیان).

(٥)

## قسەی نەستەق

(فۆلکلۆر)

١- بانێکە و دوو هەوا.

٢- لە پاش باران کەپەنەک.

٣- سەگی کوونە ماسی باسی جرتاوا ئەکا.

٤- دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە.

٥-ماڵی خۆنە خۆر بۆ چەکمە بۆر.

٦- تۆبەی گورگ مەرگە.

٧- قسە هەزارە و دووانی بەکارە.

٨- تۆبەی گورگ مەرگە.

٩- چووم بۆ سمێڵ ریشم نایەبانی.

١٠- بەتەمای دراوسێ بی، بێ شێو سەر ئەنێیتەوە.

(٦)

## مام ڕیوی

(هاورێی مناڵ- شاکر فتاح- ل ٤٣)

«مرهێلکە بۆ وەستاکە، وەستاکەوش کا. بۆ کیژکا، کیژ چۆپیکا. لە کانی کا. کانی ئاودا. بۆ داردا، دار گەڵادا. بۆ بز دا. بز شیردا. بۆ داپیرە دا، داپیر کلکە قوڵێم بداتەوە.»

(٧)

## کۆمەڵی دەستەبرا

(هاورێی مناڵ- شاکر فتاح- ل: ٧) لە ١٩٣٣دانووسراوە، لە ١٩٤٨ لە چاپدراوە.

«بابەگیان... سلێمانی: ١/ خەرمانان/ ١٩٦٠

ئەوەتی تۆ چوویتە شەقلاوە بۆ سەرپەرشتی کاروبارت، من خەریکی کۆششم، بەسایەی خواو سەری تۆوە، لە تاقیکردنەوەدا بەیەکەم دەرچووم، مامۆستاکانیش بەبۆنەی لێ بوونەوەی تاقیکردنەوەوە ئاهەنگێکی گەورەیان لە خوێندنگادا کرد. هەرچی کەسوکاری شاگردەکان و پیاوی گەورە و زانست و تێگەیشتوانی شار هەیە، بەژن و پیاوەوە بانگ کرا بوون».

(٨)

انجمن اديبان

(امين فيضى- استەمول- ربيع الأول سنە ١٣٣٩)

«مقدمە

ادباو شعـراى كـورد زورن. لاكن آثاريان بەتواوى جـمع و تاليف نكراو. من نيـتم كرد كـە بعـضى لە اشعار كورد بابان طبع و نشربكم تا بزانرى ملك بابان چند منبع فيض و ذكايە.

لشعر هر شاعرى چند پارچەييكم انتخاب كرد. لو منتخبان رسالەى (انجمن اديبان)م هينايە وجود. بم وسيلیە طالبان و راغبان كميک خلاص بون لە شعر نوسينو لسر دفتر پارچە پارچە.»

(٩)

قسەى چاپ كرو بلاو كر

(كومەلە شعرى حاجى قادرى كويى-عبدالرحمن سعيد- بەغدا ١٩٢٥)

«هموكس دزانى كـە ملت بەتاريخ و ادبياتيـەوە خوى دنوينى، و بواصـتـە ئەم دو چک گـوريە و هميش ژين و سربخويى خوى ڕاگرتو وايدكرى. بلام بو گيشتن بم هيوايە لازم تاريخ ادبياتى بيگرى و آگادارى بكرى. امش بچاپ كردنو مومكن دبى. چونک لچاپ ندرى برابوردنى زمان دفوتى.

بلى! وكو اودباو حكماى كورد زور كارشيان (آثار) لە ژماردن نايى، بلام لەبەر فقيرى و جور زمان- هموش نبى- گليكى فوتاو و بم ترح نسل حازر كوردان لگنج علم و معـاقى اودباو حكمـاى پيشودا بى بەش كراو. ولسر گوزشتى (حاجى) وهاديار كە اشـعـارى زوربوە بلام لبر اوێ كە لچاپ ندراو ديسان فوتاون. حيف و مخابن!... لگل امشدا براستى آواتم اخواست كە اشعارى ام ملتپرورى پر عزم و متانت كوبكمو لچاپى بدم».

(١٠)

ميرانى سۆرانى

(ميژووى ميرانى سۆران -حسين حزنى- ڕەواندز ١٩٣٥)

«دەمەويست بەدوور و درێژى ميژووى ميرانى سۆرانى ڕەواندز لە چاپ بدەم وە بەگەلێک وێنەى كێو و شار و قەلا و كونگرە و پردەكان و آثارى سۆران برازێنمەوە، بەلام چەندە تەقەلامدا، بۆم ڕێک نەكەوت، هێندێک چت بوونە بەرهەلست لەبەر ئەوە پێم نەكرا درێژە بەميژووى ئەم بنەمالە گەورەى كوردى سۆرانە بەم كە لەهەمـوو لاپەڕەيكى ديرێک (ميـژوو)ياندا هەزاران سەربەرزى و گەردان فرازى كـوردى تێدايە و شـايانى هەمـوو سپـاسـێک و پێـدا هەلگوتنێكن. تنوكى ڕەش و ڕەخنە لەسـەر هيچ لاپەڕەيكيـاندا پەيدانابێ، ويەكسەر بەآزادى و آرەزويكى خاوێنەوە بەبێ دەسيسە فەرمان ڕەواييان كردوە.»

(١١)

پێشکەش

(بەرگی دووەمی شعر و أدبیاتی کوردی- ڕەفیق حلمی بغداد١٩٥٦)

«بوێژەکان و ئەدیبەکانی کورد، بەرامبەر بەقەومی خۆیان پێویستییەکی گەورەیان لەسەرە. مێژوو لە دوارۆژا لەناو (وێژە) و (وتار)ەکانی ئەوانا بۆ هۆی دواکەوتن، وە یا پێشکەوتنی کورد ئەگەڕی، لەبەر ئەمە ئەبێ ئێمەیش وشیار بین و ڕێی ئەوەیان نەدەین کە سەرمایەکانیان بەفیڕۆ بدۆڕێنن، واتە پێویستە لە (وێژە) و (وتار)ەکانیان وردبینەوە و سەرنجیان بدەینێ تاکو بیانکەین بەرانبەری قەومەکەیان. بەم ڕەنگە ئەو پێویستەی لە سەریانە سووک ئەبێ و بەجێی ئەهێنن و لە ڕاست پرسینەوەی مێژوودا شەرمەسار نابن، ئینجا لەبەر ئەمەیە کە ئێمە ئەم نامیلکەیە پێشکەشی ئەو خوێنەرە بەڕێزانە و بەتایبەتی پێشکەشی ئەو لاوانە ئەکەین کە لە باریانا هەیە خزمەتی قەومەکەیان وە وڵاتیان بکەن و نرخێک نادەن بەچرپە چرپی هەندێ کەس کە لەجیاتی تێ بکۆشن و یارمەتی خۆیان پێشکەش خاوەن تەقەلاکان بکەن- تەنیا بەتوانج و ڕەغنەی پووچ و عەزم شکێن کە لە بناغەی یەکێتییان ئەکەن!»

(١٢)

حاجی لە حەج هاتەوە

(خانزاد- جمال عبدالقادر بابان- بەغدا ١٩٥٧)

«لەتەلارە دوو نهۆمەکەی ماڵی کاکلی حاجی مەحمو عەشاماتێکی زۆر لە خەڵکی دێیەکە گرد بووبوونەوە، هەر کەسە تەکانی ئەدا بۆ پێشەوە و هەوڵی ئەوەی بوو کەلەبەرێک بخاتە قەڵەباڵغەکەوە تا خۆی بگەیەنێتە دەستە پیرۆزەکانی مام کوێخا و ماچیان بکات بەهۆی گەڕانەوەیەوە لە ماڵی خوا، بەڵام هەریەکێک لەوانەی بەپێوە وەستابوون هەنگاوێکیان نەئەنا بۆ پێشەوە تا شەش هەنگاویان ئەبردنەوە دواوە لە کاتێکا کە لێشاوی خەڵکەکەیەقی ئەدایەوە بۆ پاشەوە. خۆ بۆنی هەناسە و چەرە دوکەڵی جگەرە و قەندە و سەبیل کە لەگەڵ بۆنی خەڵوزی نەگەشاوەی چا لێنانا و دوکەڵی داری تەڕی خۆش نەکراوی چێشت لێ نانا تێکەڵاو ئەبوون، بەمە زۆربەی خەڵکەکە تەنگەنەفەس ئەبوون و نارەقیان ئەڕشت. بەڵام کێ گوێی ئەدایە خۆی؟»

(١٣)

ڕێگای کامەرانی

(هیوا- ژمارە-١- بەغدا ١٩٥٧ شاکر فتاح)

«کامەرانی یان سعادت ئەوەیە مرازی هەموو لایەکمانە. کەس نییە بۆ کامەرانی تێنەکۆشێ، لە ڕاستیدا هەموو کردەوە و کارێکمان ڕووە و کامەرانی ئەچێ، ئەگەر ژین کامەرانی لێ بکەیتە دەرێ ئەبێتە دۆزەخ کە لە مردنیشی خراپترە، کەواتە کامەرانی ئامانجی هەموو کەسێکە و نیازی هەرە نازداری هەموو گیانلەبەرێکە، بۆ هەر بابەتێکی ژیان تێکۆشین هەر شتومەکێ پەیداکەین، بەهەر جۆرێک

بجولێینەوە مەبەسمان گەیشتن بەکامەرانییە.

کەواتە کامەرانی ئاواتی ژیانە، نیشانەی زیندوێتی و سەرکەوتن و بەرکەوتنە لە ژیانا، بەڵکو جوانی ژین و گیانی ژیانە».

(١٤)

کوردایەتی

(کوردایەتی - کامل ژیر - بەغدا ١٩٦٠)

«کوردایەتی بیروباوەڕە و بەرزترین بیروباوەڕمانە. کوردایەتی ئامانجە و ئامانجی نزیک و دوورمانە. کوردایەتی ڕژێمە و ڕژێمی گونجاوی پاشەڕۆژمانە، کوردایەتی: یەکسانییە و هەموو کوردێک لە سایەیدا چوون یەک ئەژین.

کوردایەتی مرۆڤایەتییە و بەیەک چاو ئەڕوانێتە هەموو نەتەوەکانی سەر زەمین. کوردایەتی: ڕاستییە و ڕاستییەکی مێژوویی چەسپیوی هەمیشەیی نەمری بێ هاوتایە. کوردایەتی: بزووتنەوەیە و بزووتنەوەیەکی بێ وچانی ڕێکوپێکی ئازادی خوازانەی هەتا هەتایە.

کوردایەتی: خواپەرستی و بێ زیانی و ئاشتیخوازی و دۆستایەتیی دۆست پەروەرانە. کوردایەتی چالاکی و جەربەزەییە، لە خۆبوردن و فیداکاری و بەرپەرچدانەوەی زۆردار و داگیرکەر و هێرشی هێنەرانە.

کوردایەتی: سەربەستی و سەربەخۆیی و خۆشەویستی و ڕەوشتپاکی و بەختیاریی ژیانە...

ئەم دیوانە پێشکەشە بەشاگردانی ئەم بیروباوەڕە پیرۆز و جوانە».

(١٥)

لەنگەری پێشکەوتن

(ڕۆژی نوێ- ژمارە-٥- ساڵی-٢- ئاب ١٩٦١ شاکر فتاح)

«ئەی کاربەدەستانی جیهان! ئێوباڵمان بەئەستۆتان، گەلی کوردیش وەک گەلی خۆتان تەماشاکەن. لە دۆستایەتیمان کەڵک وەرئەگرن، نەک لە دوژمنایەتیمان.»

(١٦)

دوا تکام

(ژیانێکی پڕ ئەندێشە- پاکیزە ڕەفیق حلمی. بەغدا ١٩٦١)

«کوردی خۆشەویست

ئەم سکاڵایە... چەند ساڵێکە لە دڵمدا دەکوڵێ! ... تا لەم دواییەدا بەتەواوی جۆشی سەند، بەبۆنەی کۆچی دوایی باوکمەوە هەڵچوو... وا ئەوەی توانیم بۆم خستنە ئەم چەند لاپەڕەیەوە... بەڵکو دڵی ئێوەش بخرۆشێنێ، هەستی کوردایەتیتان ئەوەندەی تر ببزوێنێ.

ئێوەش...! کوردایەتی بکەن وەک من... بێ پەرستن! خۆتانی بۆ بەخت کەن، خوێنی گەرمی پڕ جۆشی پاکی بۆ بڕێژن، بەڵکو...! داری سەربەستی ببوژێتەوە لە کوردستانی ئازیزدا و بێتەوە بەر. بەڵکو...!».

پەیمانگای بڵندی زبان

بەشی کوردی

نرخی وێژەیی- پۆلی چوارەم

تاقیکردنەوەی دوایی -١-

ماوە: سێ کات

پ١/ جیاوازی ناوەند چیرۆک و چیرۆکی لاسایی بنووسە.

پ ٢/ هۆی پاشکەوتوویی وێژەی پەخشانی کوردی چییە؟

پ ٣/ سۆز چییە؟

ئەندازەکانی نرخی وێژەیی سۆز چین؟

پ٤/ نرخێکی وێژەیی (لە بابەت ئەندێشەوە) بۆ ئەم بەرهەمە دابنێ: (ماڵمان باخ، ژوورمان ژێر چنار، قالیچەمان سەوزەگیا بوو... بۆن و مێخەکمان گوڵەباخ، گۆرانی بێژمان بلبل و قومری، ساز و ئاوازمان دەنگی قاز و قولنگ. تافە تافی تاڤگە، خوڕەی ئاو، ورشەی گیا، دەنگی شەکانەوەی لقی چنار بوو. چراخانمان مانگ و ئەستێرە، باوەشێنکەرمان لقی شۆڕەبی بوو).[1]

شاکر فتاح

١٩٦٤/٥/٨

(١) نموونەی پرسیاری تاقیکردنەوەکانی مامۆستا، کە لە ناو دەفتەری موحازەراتەکانیدا پاراستبوونی.

## مێژووی پرۆژەی خوێندەواری کورد

نوسینی: شاکر فتاح

لە بابەت مێژووی (پرۆژەی خوێندەواری کورد) و (ژیانی خۆم)ەوە گەلێک جار مامۆستایان و خوێندکاران و شاگردان و رۆژنامەنووسان و رۆشنبیران داوای زانیارییان کرد، بەرە بەرە یادنامەکانی خۆم بلاوبکەمەوە. لەبەر ئەوە بەپێویستم زانی نووسراوێکی وا پێشکەشی خوێندەوارە خۆشەویستەکانم بکەم، تا ئەوانەی دڵیان بەنووسراوەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد) داچووە، یاخود بەپێی پیشەکەیان پێویستییان بەم جۆرە زانیارییە هەیە، بتوانن بیکەن بەسەرچاوەیەک بۆ خۆیان و، کەڵک و خۆشیی لێ وەربگرن. ئەم (٥٧) ساڵە بەسەر دامەزراندنی ئەم (پرۆژە)یەدا تێپەڕیوە.

لەسەر بنچینەی ئەو بڕوانامانە (وثائق)ی لەبەردەستمدان ئەم یادنامەیەم نووسیوەتەوە. ئەگەر کەموکورییەکی هەبوو، تکایە ببەخشن. لە ڕاستیدا (نەتەوەی کورد) داماوی (نووسراوخانەیەکی گەورە)یە کە هەموو لکێکی (خوێندەواری) بگرێتەوە. منیش خەبات بۆ ئەوە دەکەم کە کەلێنێک لەو داماوییە پڕ بکەمەوە، خودا یار بێ و یارمەتیی دۆستان لە ئارادابێ، (پرۆژەی خوێندەواری کورد هەر لە گەشەکردن و پەرەسەندندا دەبێ یا بەو ئامانجە دەگات لە خودام دەوێ بەو ئامانجەم بگەیێنێ، چونکە بەبێ خوێندەواری هیچمان سەرناگرێ.

ئەمەندە و ڕێز و سوپاسی گەرم و گوڕم بۆ ئەو دەسگایانەی یارمەتی یان داوم پێشکەش دەکەم.

شاکر فتاح

خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد

سلێمانی ١٨/٣/١٩٨٤

## پرۆژەی خوێندەواری کورد چییە و چ ئامانجێکی هەیە؟

(١)

مەبەس لە (پرۆژەی خوێندەواری کورد) ئەوەیە: بەهۆی وتار- خوێندنەوە و، وتار نووسین و، نووسراودانان و، نووسراو پەرچڤەکردن و بلاوکردنەوەیانەوە، مێشکی هاونیشتمانە کوردەکان ڕۆشن بکرێتەوە و ئاراستەیش بکرێن بۆ ئەمەی بەکەڵکی (کورد) و (کوردستان) بێن و مرۆڤایەتی هەروەها مەبەس لە (پرۆژەی خوێندەواری کورد) ئەمەیە: دەستی یارمەتی درێژ بکات بۆ هەموو خوێندەوارێک و، بۆ هەموو دەسگایەکی خوێندەواری و، بۆ هەموو کوردێکی داماو و لێ قەوماو کە هەڵبگرن یارمەتی یان بدرێت و، لەوانەیش بن بەکەڵکی (کورد و کوردستان) بێن و مرۆڤایەتی، ئامانی ئەم پرۆژەیەیش پێشکەشکردنی خۆرشتی گیان و، زاخاوی مێشک و ڕۆشنکردنەوەی دەروونە بۆ (خوێندەوارانی کورد) بزواندنی دەماری مەردایەتیی (خوێندەوارانی کورد)ە بۆ فرمانکردن، لە کۆڕی نیشتمانپەروەریدا بۆ (پێشکەوتنی کوردەواری).

هەروەها گەشەکردن بە(وێژە) و (زمانی کوردی)یە، کە پەل بۆ ناو هەموو و زانست و هونەرێک بهاوێژێت و تێیدا بلاوبێتەوە. دروستکردنی (خوێندەواریەکی بلاو) و (نووسراوخانەیەکی نوێ)یە، کە بۆ هەموو لکێکی ژیان کەلکی لێ وەربگیرێت.

پرۆژەکە بریتییە لە (۱۱۹) نووسراوی هەڵبژاردە و ناوازە، لە بەرهەمە هەرە گرنگ و هەرە بەناوبانگەکانی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات، کە دابەش کراون بەسەر (۲۰) زنجیرە نووسراوی جوێ جوێدا.

نووسراوەکان بەپوختەی خوێندەواریی کۆن و نوێی جیهان دەژمێرێن.

نووسراوەکان هەموویان لەلایەن (شاکر فتاح) خۆیەوە گۆڕاونەتە سەر زمانی کوردی و عەرەبی بەشێوەکی وەهایش نووسراونەتەوە کە هەموو کەس بەئاسانی تێیان بگات و، خۆشی و کەلکیشیان لێ وەربگرێت. تەنیا لەسەر خواستی هەندێک ڕۆشنبیران، ئەو نووسراوانەی خۆیشم دامنابوون کە بریتین لە (٤٦). نووسراو، لە نووسراوانی پرۆژەکە دانران. بەهەموویانەوە دەبێتە (١٦٥) نووسراو لە (٢٠) زنجیرەدا.

## مێژووی پرۆژەی خوێندەواری کورد

**(٢)**

هەر چەندە ئەم پرۆژەیە لە ساڵی ١٩٦٧دا ناوی نرا: (پرۆژەی خوێندەواری کورد) و، لە پایزی ئەو ساڵەوە سەرلەنوێ بلاوکرایەوە، بەلام لە ڕاستیدا سەرەتای دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٧ چونکە لە ساڵی ١٩٢٧دا بوو کە یەکەم وتاری خۆم لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا لە شاری (سلێمانی)دا بلاوکردەوە، لەژێر ناوی (هاواری وەتەنە خۆشەویستەکەمان)دا. ئەوساکە تازە تەمەنم لە چواردە ساڵی تێپەڕی کردبوو. شاگردێکی پۆلی شەشەمی خوێندنگای سەرەتایی یەکەمی سلێمانی بووم. ئەوساکە نووسراوانی کوردی لە ڕێزەی نەبوواندا بوو بەزەییم بەنەتەوەکەماندا دەهاتەوە، کە نووسراوەکانمان وا بەجگار کەم بوون. لەبەر ئەوە بەپێویستم زانی، منیش بەشی خۆم لەم مەیدانەدا خەبات بکەم تا سامانی نەتەواتییمان لە کۆڕی خوێندەواریدا بێتە بەرهەم و گەشە بکات و پەرەبستێنێت.

هەر لەوساڵەدا دوو نووسراوم: (گۆرانیی کوردی) و ژمێر و هەڵهێنانی هەندێک مەتەڵی ژمێر) هەروەها (١٥٠) چامەیشم لە بەرهەمی بوێژەکانمان: (نالی) و (سالم) و (کوردی) و (حەریق) و (غەریق) کۆکردەوە و ناردم بەدیاری بۆ خوداڵێخۆشبوو (داماوی موکریانی) لە ڕەواندز کە لە گۆڤارەکەیدا چاپیان بکات.

هەروەها زۆربەی چامەکانی بوێژی بەناوبانگ (مستەفا بەگی کوردی)یشم کۆکردەوە و، ناردم بۆ خوداڵێخۆش بوو (کاک فەتحوڵلا ئەسعەد) بەدیاری، لەسەر خواستی خۆی، کە لەسەر ئەرکی خۆی چاپیان بکات.

له سالّی ۱۹۲۸یشەوە دەستم کرد بەنووسینی گەشتنامەکانم لە بابەت ناوچەکانی (کوردستان)ەوە کە هاوینان بۆیان دەچووم. لە سالّی (۱۹۳۰)یشەوە دەستم کرد بەنووسینی (بیرەوەری) و (یادنامە)کانم. لەسالّەکانی ۱۹۳۲ و ۱۹۳۳ و ۱۹۳٤یشدا گەلێک وتارم لە گۆڤارەکانی (هاوار) و (دیاریی لاوان) و (یادگاری لاوان) و ڕۆژنامەی (ژیان)دا بلاوکردەوە. یەکەم نووسراویشم کە بریتی بوو لە چیرۆکی (خانووی تازە) لە سالّی ۱۹۳۳دا چاپ کرد و بلاوکردەوە.

ئەم چیرۆکە بۆ مندالآن دانرابوو. لە عەرەبییەوە گۆڕیبوومە سەر زمانی کوردی ئیتر لەوە دواوە هەر گۆڤار و ڕۆژنامەیەکی کوردی دەرچوو بێت و داوای وتاری لێ کردبم بۆم ناردووە. لەوانە گۆڤارەکانی (گەلاوێژ) و (نزار) و (هیوا) و (ڕۆژی نوێ) و (هەتاو) و (ڕووناکی) و (بەیان) و (ئەستێرە) و (برایی) و (برایەتی) و (کاروان) و (شەفەق) و (ڕزگاری) و ڕۆژنامەکانی (ژین) و (هەولێر) و (زبان) و (برایی: التآخي) و (خەبات)... بەنموونە دەهێنمەوە.

لە سالّی ۱۹۳۱دا نووسراوخانەیەکی تایبەتیم لە مالّی خۆماندا دامەزراند، ناوم نا: (نووسراوخانەی گولزاری کوردستان). بەرە بەرە هەرچیم دەستکەوت لە گۆڤار و نووسراو و ڕۆژنامەی کوردی، لە چاپکرا و، دەستنووس لەم کون و لەو قوژبن، لەم مالّ و دووکان و لەو مزگەوت لەو نووسراوخانەیەمدا کۆم کردنەوە. لە پایزی سالّی ۱۹٦۷دا ناوی پرۆژەکەمم لە ڕۆژنامەی (برایی: التـأخي)دا، ژمارە (۲۹) و (۳۰) بلاوکردەوە، ناوم نا: (پرۆژەی خوێندەواری کورد).

لە سالّی ۱۹٦۸دا نووسراوخانەیەکم لە بازاڕدا دامەزراند بۆ هەمووان، ناوم نا: (نووسراوخانەی پرشنگ). لە سالّی ۱۹۷۱دا نووسراوخانەکەم گواستەوە بۆ گۆشەیەکی جیاکراوە لە خانووەکەی خۆمدا لە (سلێمانی). بەلآم ناوەکەیم گۆڕی و کردم بە(نووسراوخانەی پرۆژەی کورد). هەر لەسەرەتای تێکۆشانمەوە تا ئێستا (۱٦۵) نووسراوم هێناوەتە بەرهەم. لەمانە (۱۱۹) نووسراویانم لە زمانی ترەوە کردووە بەکوردی (٤٦) نووسراویشیان هی خۆمن، خۆم دامناون لە هەموویان تا ئێستا (٦٤) نووسراو چاپکراوە بێجگە لەمانە تا ئێستا پتر لە (۲۰٤) وتاریشم بەکوردی و عەرەبی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بلاوکردۆتەوە. (۱۱۲) وتاریشم لە (ڕادیۆی کوردی)دا لە (بەغدا)دا (٦) وتاریشم لە (تەلەفیزیۆنی کوردی)دا لە (کەرکوک)دا بلاوکردۆتەوە. لە (٦) نووسراویشدا کە بۆ (بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردی: المديرية العامة للدراسة الكردية) پەرچڤە کراوە هاوبەشیم کردووە.

ئامانجی هەرە گەورەی پرۆژەکەم ئەمەتا هەموو نووسراوەکانم لەچاپ بدات. بەلآم داخەکەم چاپکردن ئەمەندە بەگران دەست دەکەوێت و بەگرانیش دەکەوێتە سەر پرۆژەکە، دەرفەتێکی زۆر تەنگ و تەسکم پڕ تەنگ و چەلّەمەم بۆ ماوەتەوە و کە نووسراوەکانی تێدا چاپ بکەم. لە ڕاستیدا چاپکردنی ئەم هەموو نووسراوانەم مەگەر هەر لە دەست دەسگایەکی چاپەمەنیی نیشتمانی بێت کە بیگرێتە ئەستۆی خۆی. لەگەلّ ئەمیشدا هەر هیوام بەخودایە کە کارم بۆ ئاسان بکات لەسەر دەستی کاربەدەستە بەڕێزەکانی کوردستاندا. چونکە وەک زانیوم کۆشش لە ئارادایە کە دەسگای (ڕۆشنبیری و لاوان) لە ناوچەی (فەرمانداریی خۆیی کوردستان)دا، چاپخانەیەکی گەورە لە شاری (هەولێر)دا دابمەزرێنێ، بۆ

یارمەتیدانی چاپەمەنیی کوردی. کاشکی ئەم ئاواتە زوو بهاتایەدی. تا منیش و کەسانی تریش لە گیروگرفت و بارە ناهەموارە ڕزگارمان ببووایە. تا نەتەوەکەمان و نیشتمانەکەمان زووتر و زۆرتر تیشکی خوێندەوارییان تێدا بلاوببووایەتەوە چونکە (خوێندەواری) کە (زانیاری) و (کردەوەی بلند)یش دەگرێتەوە تەنیا بنچینەیەکی سەرگرتنی هەموو کارێکی پەسند و بلندە و، بێ ئەویش هیچ کارێکمان سەرناگرێت و پێک نایەت.

پێش ئەمەش ئەم بەشە لە نووسراوەکەمدا تەواو بکەم، بەپێویستی دەزانم سوپاسێکی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە عەرەبییانە بکەم کە وتارەکانمیان بلاوکردۆتەوە، هەروەها پێشکەش ئەو دەسگا ڕۆشنبیرییە کوردییانە بکەم کە ئێستا لە کاردان وەک: (دەسگای خوێندنی کوردی) و، (دەسگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی)، (دەسگای ڕۆشنبیری و لاوان) و (دەسگای زانکۆی سلێمانی) و (دەسگای تەلەفزیۆنی کوردی) و (دەسگای ڕادیۆی کوردی) کە هەریەکەیان بەپێی توانا یارمەتیی پرۆژەکەمیان داوە و، تا ئەندازەیەکیش بەرهەمەکانمیان بلاوکردۆتەوە. بێجگە لەوە لە کانگای دلیشمەوە لە خودا داوا دەکەم زۆرتر سەریان بخات لەم کارە پیرۆزانەیاندا کە کەلکێکی زۆری هەیە بۆ نەتەوەکەمان و نیشتمانەکەمان.

## ناوی زنجیرەی نووسراوەکانی پرۆژەی خوێندەواری کورد

(پرۆژەی خوێندەواری کورد) نووسراوەکانی بەسەر (٢٠) زنجیرەدا دابەش کراون کە ئەمانەن:

١- ئایینی
٢- زرنگکاری (سیاسی)
٣- وێژەیی
٤- زانستی ڕەگەز (علم الجنس)
٥- دادپەروەران
٦- زانستی خۆناسین (علم النفس)
٧- تەندروستی
٨- لەبەردەم دادگاهدا
٩- هونەرەکانی ژیان
١٠- زانستی پەروەردەکردن (علم التربیة)
١١- ژیانی هونەرمەندان
١٢- خۆش ڕابواردن (التسلیة)
١٣- ڕاستی پەرستی (الفلسفة)
١٤- زمان
١٥- نیشتمانپەروەران
١٦- کار و پیشە

١٧- دوارۆژی مرۆڤایەتی
١٨- گۆڤار و رۆژنامە
١٩- گەشتوگوزار
٢٠- زانستی گشت لایی، یاخود (زانیاریی هەموو جۆرە)

## ڕستەی ناوی ئەو نووسراوانەی
## دامناون لە ساڵەکانی ماوەی (١٩٢٧)ەوە تا (١٩٨٤)

(٥)

تا ئێستا (٤٦) نووسراوم داناوە کە ئەمانەن:

١- ژمێر هەڵهێنانی هەندێ مەتەڵی ژمێر: ساڵی ١٩٢٧
٢- گۆرانیی کوردی: ساڵی ١٩٢٧
٣- گەشتی شاربازێر: ساڵی ١٩٢٩
٤- گەشتی پێنجوێن: ساڵی ١٩٣٠
٥- یادنامەی: ساڵی ١٩٣٠
٦- یادنامەی: ساڵی ١٩٣١
٧- یادنامەی: ساڵی ١٩٣٢
٨- گەشتی سوریە و لوبنان: ساڵی ١٩٣٢
٩- گەشتی هەڵەبجە و هەورامان: ساڵی ١٩٣٢
١٠- یادنامەی: ساڵی ١٩٣٣
١١- گەشتی سرۆچک: ساڵی ١٩٣٣
١٢- فەرهەنگۆک بەکوردی و ئینگلیزی: ساڵی ١٩٣٤
١٣- کۆمەڵە رۆژنامەی خورماڵ: ساڵی ١٩٤٠
١٤- کۆمەڵە رۆژنامەی باسەرە: ساڵی ١٩٤٢
١٥- کۆمەڵە رۆژنامەی چەمچەماڵ: ساڵی ١٩٤٦
١٦- پرشنگ: ساڵی ١٩٤٧
١٧- شەبەنگەبەرۆژ: ساڵی ١٩٤٧
١٨- گەورە پیاوان: ساڵی ١٩٤٨
١٩- هاوڕێی منال: ساڵی ١٩٤٨
٢٠- فێربوونی زمانی کوردی و عەرەبی: ساڵی ١٩٤٩
٢١- کۆمەڵە رۆژنامەی ئاکرێ: ساڵی ١٩٥٠
٢٢- نووسراوی ئاکرێ (بەعەرەبی): ساڵی ١٩٥١

٢٣- ئافرەتی کورد: سالی ١٩٥٨
٢٤- ژینی نوێ: سالی ١٩٥٩
٢٥- ئاوێنەی ژینم: سالی ١٩٦٢
٢٦- خوێندنەوەی باو: سالی ١٩٦٢
٢٧- هاواری پێشکەوتن/١: سالی ١٩٦٣
٢٨- چیرۆکی مەم و زین لە تەرازوودا: سالی ١٩٦٩
٢٩- یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی: سالی ١٩٦٩
٣٠- زێوەر: سالی ١٩٧٢
٣١- مەلا کاکە حەمە: سالی ١٩٧٢
٣٢- بێکەس: سالی ١٩٧٢
٣٣- داماوی موکریانی: سالی ١٩٧٢
٣٤- حاجی قادری کۆیی: سالی ١٩٧٢
٣٥- بیرەوەری و یادگار: سالی ١٩٧٢
٣٦- ژن هێنان لەناو کوردەواریدا: سالی ١٩٧٣
٣٧- گیروگرفتەکانی ڕۆشنبیریی کوردی و شێوەی چارەکردنیان: سالی ١٩٧٧
٣٨- المرأة الكردية: سالی ١٩٧٧
٣٩- هاواری پێشکەوتن/٢: سالی ١٩٧٧
٤٠- مشاكل الثقافة الكردية وطرق معالجتها: سالی ١٩٧٧
٤١- خودای هەزاران: سالی ١٩٧٨
٤٢- مێژووی پرۆژەی خوێندەواری کورد: سالی ١٩٧٩
٤٣- گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی و شێوەی چارەکردنیان: سالی ١٩٨٠
٤٤- ئاهەنگی ڕۆشنبیران: سالی ١٩٨٠
٤٥- خەباتی ڕۆشنبیران: سالی ١٩٨٣
٤٦- ڕێگایەک بۆ پێشکەوتن: سالی ١٩٨٤

## ڕستەی ناوی ئەو نووسراوانەی کردوومن بەکوردی (١٩٣٣) لە ساڵەکانی ناوەند و (١٩٨٤) دا

(١)

لەم ماوەیەدا (١١٩) نووسراوم کردووە بەکوردی کە ئەمانەن:

* ئایینی: ٢٥ نووسراوە:

١- مووسا: دانالی
٢- کۆنفۆچیۆس: هەنری تۆماس
٣- عیسا: فۆلتۆن ئۆسار
٤- ڕابیعەی عەدەوی: کامیل موحەمەد کامیل
٥- شێخ محەممەد عەبدە: عوسمان ئەمین
٦- ڕۆژ و فرمان: هەسیود
٧- بوودا: ئەحمدول شەنتەناوی
٨- محەممەد: محەممەد بەدرەدین خەلیل
٩- ئایینی بەهائی: سەلمان حەلیم
١٠- زەردەشت: ئەحمەدول شەنتەناوی
١١- ئینجیلی یووحەننا بەکوردی
١٢- ئینجیلی یووحەننا بەعەرەبی
١٣- ئینجیلی لۆقا بەکوردی
١٤- ئینجیلی لۆقا بەعەرەبی
١٥- ئینجیلی حەتتا بەکوردی
١٦- ئینجیلی حەتتا بەعەرەبی
١٧- ئینجیلی مەرقۆس بەکوردی
١٨- ئینجیلی مەرقۆس بەعەرەبی
١٩- کردەوەی نێرراوان
٢٠- زامەکان
٢١- خەوەکەی یووحەننا
٢٢- زەبوور
٢٣- پەندەکان
٢٤- تەورات بەکوردی
٢٥- تەورات بەعەرەبی

(٢)

* زرنگکاری «سیاسی»: ٩ نووسراو:

٢٦- نووسەرانی شۆڕش: سەلامە مووسا

٢٧- هەریەک جیهانە: وێندل ویلکی

٢٨- (کۆمار)ی ئەفلاتوون: ئەفلاتوون

٢٩- رزنگ کاری: ئەرەستوو

٣٠- ڕیشیلیۆ: ڕیشیلیۆ

٣١- شاهزادە: نیکۆلۆمیکیاڤیللی

٣٢- بیروباوەڕی سەربەست لە زرنگکاریدا: بەرناردشۆ

٣٣- یوتۆپیا: تۆماس موور

٣٤- پەیمانی کۆمەڵایەتی: ژان ژاک ڕۆسۆ

(٣)

* ویژەیی: (١) نووسراوە:

٣٥- هەڵبژاردەی چیرۆکی هیندی: محەمەد عیتانی

٣٦- مەم وزین- ئەحمەدی خانی: محەمەد سەعید

٣٧- گرۆزی: ئەلبەرتۆ مۆراڤیا

٣٨- پیاوی چارەنووس: بەرنادشۆ

٣٩- دۆن کیشۆت: سێرڤانتس

٤٠- ئەلیادە: هۆمیرۆس

٤١- ئۆدیسە: هۆمیرۆس

٤٢- بەزمی خودایی: دانتی

٤٣- بەلقیس کچەشای سەبەء: ساڵی ١٩٣٣

٤٤- خانووی تازە/ کامیل گیلانی: ساڵی ١٩٣٣

٤٥- چیرۆک بۆ منداڵان/ کامیل گیلانی: ساڵی ١٩٣٣

(٤)

* زانستی ڕەگەز: (٥) نووسراوە:

٤٦- زیندویی ڕەگەز: بەرنار ماکفادن

٤٧- دڵداری و ژن و مێردیی: محەمەد فائیقول جەوهەری

٤٨- دڵداری، ڕەگەز، ناپاکی: لویس بیش

٤٩- سۆسان ئەنتۆنی: هەنری و داناتۆماس

٥٠- جوانیی ئافرەت: لویس ستانلی

(٥)

* دادپەروەران: (٥) نووسراوە:

٥١- ئەبراهام لینکۆلن: قەدری قەلعەچی
٥٢- جەمالەدینی ئەفغانی: قەدری قەلعەچی
٥٣- مەدحەت پاش: قەدری قەلعەچی
٥٤- سەلاحەدینی ئەییووبی: محەمەد سەبیح عەبدولقار
٥٥- ژیانی ئەهرۆ: ئەهرۆ

(٦)

* زانستی خۆناسین: (١٦) نووسراوە:

٥٦- هونەری سرەوت بەخۆدان: وێلفرید نۆرثفیلد
٥٧- سامانێک بۆ دابەش کردن: ڤاش یۆن
٥٨- ڕێگای سەرکەوتن: والتەر .ب. پەتکین
٥٩- ترس: و. ج. ماکیرایذ
٦٠- کلیلی کەسایەتی: ڤەرجینیاکایس
٦١- نیاز بەخشین بەخۆ: ولیەم فیلدینگ
٦٢- نواندنی موگناتیسی: ئەبومیدیەنولشافیعی
٦٣- خەولێکدانەوە: سیگمۆند فرۆید
٦٤- زانستی خۆناسین دەبێتە ڕابەت: ڕیجبنیالد وایلد
٦٥- چۆن دەنوویت: نۆرڤیلد
٦٦- خۆت بپارێزە لە خەم: جۆن کەنەدی
٦٧- نەمێنێ شەرمنی: س. ھ. تیر
٦٨- هەست بەکەم و کووڕی کردن: ولیم والش
٦٩- نەمێنێ ماندوێتی: ماری یانیۆن ڕای
٧٠- دەمارتوندی: ویلفرید نۆثفیلد
٧١- هونەری دۆستایەتی: س. ھ. تیبر. ب. أ.

(٧)

* تەندروستی: (٥) نووسراوە:

٧٢- لە خاکی رووتەکاندا: لوی شارل ڕوایێە
٧٣- باش بخۆو خۆش بژی: ج. ف. سکۆتس کلارک
٧٤- شێوەی ژاپۆنی: مامۆستا کۆلینگرگ
٧٥- ڕێگاکەی من: ج. ب. مۆڵلەر
٧٦- لە خاکی رووتەکاندا: ڕۆجێە سالاردین

(٨)

* لە بەردەم دادگاهدا: (٦) نوسراوە:

٧٧- سۆکرات: ئەفلاتوون

٧٨- راسپۆتین: پاتریک هاستینگر

٧٩- کوشتویتی یان تاوانبار نییە؟: ئەدگار لیست گارتن

٨٠- چەند و چوون کردن لەگەڵ ولتەر رالیدا: سێرپاتریک هاستینگر

٨١- چارلسی یەکەم: سێرپاتریک هاستینگر

٨٢- کەینەو بەینەکەی دریفوس: و. ت. ستید

(٩)

* هونەرەکانی ژیان: (٧) نووسراوە:

٨٣- هونەری کاروفرمان کردن: ئەندریَ مۆرِوا

٨٤- هونەری ژیانی خێزانی: ئەندریَ مۆرِاو

٨٥- هونەری کامەرانی: ئەندریَ مۆرِوا

٨٦- هونەری پێشەوایی: ئەندریَ مۆرِوا

٨٧- هونەری خۆش رابواردن لەتەمەنی پیریدا: ئەندریَ مۆرِوا

٨٨- هونەری دڵداری: ئەندریَ مۆرِوا

٨٩- هونەری ژنهێنان: ئەندریَ مۆرِوا

(١٠)

* زانستی پەروەردەکردن: (٦) نووسراوە:

٩٠- کیژە هەرزەکارەکانمان: پزیشک سۆزان برونییە

٩١- گیروگرفتی رێککەوتنی ژن و مێردی: فەرناند ئیزانبیر

٩٢- گیروگرفتی هەرزەکاری: پزیشک ژۆلیێت بۆتۆینێە

٩٣- کاتێ برا و خوشکەکان بەگژیەکدادەچن: پۆلیت کۆهن

٩٤- ئارەزووی دزی کردن لە دڵی منداڵان چۆن دەردەهێنین؟: ماریان رۆدۆرف

٩٥- ئیمیل: ژان ژاک رۆسۆ

(١١)

* ژیانی هونەرمەندان: (٥) نووسراوە:

٩٦- مۆزار: هەنری تۆماس

٩٧- میکیل ئەنجیلۆ: هەنری تۆماس

٩٨- عومەر خەییام: مانویل کۆمرۆف

٩٩- مەریەمی مەجدەلی: ڤرانک سلۆتەر

١٠٠- ڤۆلتێر: داناولی تۆماس

(١٢)

* خۆش ڕابواردن: (٤) نووسراوە:

١٠١- دەست خوێندنەوە: حیلمی محەمەد

١٠٢- یاریی جادوگەری: خەلیل سابا

١٠٣- لێک دانەوەی خەو: هەربەرت هەسپرۆ

١٠٤- پێکەنین بۆ ژین: شاکر فتاح

(١٣)

* ڕاستی پەرستی (الفلسفة): (١) نووسراوە:

١٠٥- گفتوگۆی گەورە پیاوان: پاول ئەرنست

(١٤)

* زمان: (٢) نووسراوە:

١٠٦- خوێندنەوەی نوێ - بەرلتز: شاکر فتاح ١٩٣٤

١٠٧- گفتوگۆ بەئینگلیزی و کوردی - بەرلتز: شاکر فتاح ١٩٤٣

(١٥)

* نیشتمانپەروەران: (٤) نووسراوە:

١٠٨- دیڤالێرا: سین ئۆفۆلین

١٠٩- گاریبالدی: هەنری تۆماس

١١٠- لویس پاستێر: دانالی

١١١- مادام کوری: دانالی

(١٦)

* کار و پیشە: (٣) نووسراوە:

١١٢- بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم: ئەحمەد عەبدولئاخیرو ئەحمەد عیوەز سەلامە

١١٣- بەخێوکردنی هەنگ: موحیەددین شەریف دۆغرەمەچی

١١٤- باخچە ڕێکخستن: بەسیمە زەکی ئیبراهیم

(١٧)

* دوارۆژی مرۆڤایەتی: (٥) نووسراوە:

١١٥- جیهان لە سالی ٢٠٠٠ هەمدا: بەرتراند ڕەسل

١١٦- پێش بینیی گەشەکردن: چارلس داروین

١١٧- سالی یەکەم: ڕۆبێر دیودۆنییە

١١٨- چارەی دلداری (چیرۆکی جیهان لە سالی دووهەزارەمدا): هـ. ج. وێلز

تێبینی:

لەم ڕستەیەدا (٥) نووسراوی لێ دەربچێ کە لە ساڵەکانی (١٩٣٣) و (١٩٣٤)دا بەرچڤەم کردوون و، لێرەیشدا دەستنیشانم کردوون، ئیتر نووسراوەکانی تر کە بریتین لە (١١٤) نووسراو لە ناوەند ساڵەکانی (١٩٦٣) و (١٩٧٧)دا، واتا لە ماوەی (١٤) ساڵدا پەرچڤەم کردوون.

## ڕستەی ناوی ئەو نووسراوانەی لەگەڵ لیژنەکاندا کردوومن بەکوردی

(٧)

من ئەم نووسراوانەم لەگەڵ لیژنەکاندا بۆ (بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردی: المديرية العامة للدراسة الكردية) کردووە بەکوردی:

١- دروستی (الصحة) بۆ پۆلی پێنجەمی سەرەتایی ساڵی ١٩٧١دا.

٢- زاراوەی زانستی (المصطلحات العلمية) لە ساڵی ١٩٧٢دا.

٣- جوغرافیای سروشتی: بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ویژەیی- ١٩٧٣.

٤- مێژووی شارستانێتیی عەرەبی ئیسلامی: بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی ویژەیی ساڵی ١٩٧٤.

٥- پەروەردەی نیشتمانی: بۆ پۆلی سێهەمی ناوەندی ساڵی ١٩٨٣.

## چاپکراوانی نووسراوەکانی پرۆژەی خوێندەواری گورە
## لە ساڵی (١٩٣٣) وە تا ساڵی (١٩٨٤)

(٨)

لەم ماوەیەدا (٦٤) نووسراوم چاپ کردووە کە ئەمانەن:

١- چیرۆکی خانووی تازە: کامیل کیلانی: لە ساڵی ١٩٣٣

٢- فەرهەنگۆک: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٣٤

٣- چیرۆک بۆ منالان: کامیل کیلانی: لە ساڵی ١٩٣٥

٤- پرشنگ: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٤٧

٥- شەبەنگەبەرۆژ: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٤٧

٦- گەورەپیاوان: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٤٨

٧- هاوڕێی منال: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٤٨

٨- ئافرەتی کورد: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٥٨

٩- ژینی نوێ: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٥٩

١٠- زەردەشت: ئەحمەدول شەنتەناوی: لە ساڵی ١٩٦٧

١١- سۆکرات: ئەفلاتوون: لە ساڵی ١٩٦٨

١٢- گاریبالدی: هەنری تۆماس: لە ساڵی ١٩٦٨
١٣- دیڤالێرا: سین ئوفۆلین: لە ساڵی ١٩٦٨
١٤- لویس پاستێر: دانالی: لە ساڵی ١٩٦٨
١٥- مادام کوری: دانالی: لە ساڵی ١٩٦٨
١٦- چیرۆکی مەم و زین لە تەرازوودا: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٦٩
١٧- کۆماری ئەفلاتوون: ئەفلاتوون: لە ساڵی ١٩٦٩
١٨- یەزیدییەکان و ئاینی یەزیدی: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٦٩
١٩- چارلسی یەکەم: پارتریک هێستینگز: لە ساڵی ١٩٧٠
٢٠- سۆسان ئەنتۆنی: هەنری و داناتۆماس: لە ساڵی ١٩٧٠
٢١- ڤۆلتێر: دانالی و تۆماس: لە ساڵی ١٩٧٠
٢٢- عومەر خەییام: مانوێل کۆمرۆف: لە ساڵی ١٩٧٢
٢٣- مەلا کاکە حەمە: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٢
٢٤- داماوی موکریانی: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٢
٢٥- گەشتی شارباژێر: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٢
٢٦- گەشتی سرۆچک: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٢
٢٧- گەشتی پێنجوین: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٣
٢٨- گەشتی هەڵەبجە و هەورامان: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٣
٢٩- زێوەر: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٤
٣٠- بێکەس: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٤
٣١- مشاكل الثقافة الكردية وطرق معالجتها: شاكر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٨
٣٢- گیروگرفتەکانی رۆشنبیریی کوردی و شێوەی چارەکردنیان: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٨
٣٣- المرأة الكردية: شاكر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٨
٣٤- حاجی قادری کۆیی: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٨
٣٥- یوتۆپیا یاخود بەهەشتی سەرزەمین: تۆماس مورو: لە ساڵی ١٩٧٨
٣٦- زرنگ کاری: ئەرەستوو: لە ساڵی ١٩٧٩
٣٧- خودای هەژاران: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٩
٣٨- هاواری پێشکەوتن (ج): شاکر فتاح: لە ساڵی١٩٧٩
٣٩- ژنهێنان لەناو کوردەواریدا: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٧٩
٤٠- جیهان لە ساڵی ٢٠٠٠هەمدا: بەرتراند رەسڵ: لە ساڵی ١٩٨٠
٤١- ئاکرێ (بەعەرەبی): شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٨٠
٤٢- کۆگرەی منداڵان: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٨٠
٤٣- کاتێ برا و خوشکەکان بەگژیەکدا دەچن: پۆلین کۆهن: لە ساڵی ١٩٨٠

٤٤- ئارەزووی دزی کردن لە دڵی منداڵ چۆن دەردەهێنین؟: ماریان رۆدۆرف: لە ساڵی ١٩٨٠:
٤٥- گیروگرفتی هەرزەکاری بۆ تۆ نییە: پەزیشک ژۆلێیت: لە ساڵی١٩٨١
٤٦- مۆزار: هەنری تۆماس: لە ساڵی ١٩٨٢
٤٧- میکیل ئەنجیلۆ: هەنری تۆماس: لە ساڵی ١٩٨٢
٤٨- پەیمانی کۆمەڵایەتی: ژان ژاک رۆسۆ: لە ساڵی ١٩٨٢
٤٩- ریشیلیۆ: ریشیلیۆ: لە ساڵی ١٩٨٢
٥٠- زانستی خۆناسین دەبێتە رابەرت: ریجینالد وایلد: لە ساڵی ١٩٨٢
٥١- سامانێک بۆ دابەش کردن: ڤاش یۆنغ: لە ساڵی ١٩٨٢
٥٢- رێگای سەرکەوتن: والتەر.ب. پەتکین: لە ساڵی ١٩٨٢
٥٣- هونەری سرەوت بەخۆدان: ویلفرید نۆرثفیلد: لە ساڵی ١٩٨٢
٥٤- گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردی و شێوەی چارەکردنیان: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٨٣
٥٥- کوشتوێتی یان تاوانبار نییە؟: ئەدگار لیست گارتن: لە ساڵی ١٩٨٣
٥٦- ئاهەنگی رۆشنبیران: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٨٣
٥٧- رۆژنامەی خورماڵ: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٨٣
٥٨- رۆژنامەی چەمچەماڵ: شاکر فتاح: لە ساڵی ١٩٨٣
٥٩- هونەری ژیانی ژن و مێردی: ئەندرێ مۆروا: لە ساڵی ١٩٨٣
٦٠- هونەری دڵداری: ئەندرێ مۆروا: لە ساڵی ١٩٨٣
٦١- ئەلیادە: هۆمیرۆس: لە ساڵی ١٩٨٣
٦٢-ئۆدیسا: هۆمیرۆس: لە ساڵی ١٩٨٣
٦٣- سێروولتر رالی: سێر پاتریک هاستینگز: لە ساڵی ١٩٨٣
٦٤- ئیمیل: ژان ژاک رۆسۆ: لە ساڵی ١٩٨٤

## ئەو وتارانەی لە تەلەفزیۆنی کوردیی کەرکووکدا بلاوم کردوونەتەوە

(٩)

لە ناوەند ساڵەکانی (١٩٧٠) و (١٩٨٠)دا (٦) وتارم بلاوکردۆتەوە کە ئەمانەن:

١- زێوەر: لە ساڵی ١٩٧٠دا
٢- مەلا کاکە حەمە: لە ساڵی ١٩٧٠دا
٣- بەیادی جەژنی ١١ی ئادار و نەورۆزەوە: لە ساڵی ١٩٧١
٤- بەیادی جەژنی ١١ی ئادار و نەورۆزەوە: لە ساڵی ١٩٧٢
٥- بانگەوازێک بۆ یارمەتی دانی کۆمەڵی نەخۆشییەکانی سنگ: لە ساڵی ١٩٧٧
٦- خۆباڵاوتن و هەڵبژاردن بۆ کۆری یاسادانانی ناوچەی فەرمانداریی خۆیی کوردستان: لە ساڵی ١٩٨٠

سەرنج:

(شاکر فتاح) وتارێکی بێ شوماری خوێندووەتەوە لە کۆڕە گشتییەکاندا و لە کۆبوونەوەکانی کۆمەڵی زانستی کوردانەدا و، کۆنگرەکانی مامۆستایان لە شەقلاوەدا و، لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی گەلدا لە سلێمانی و هەڵەبجە و، لە کۆبوونەوەکانی مامۆستایانی ناوچەی سلێمانیدا و، لە یانەکانی فەرمانبەرانی دهۆک و شێخان و ئاکرێ و زاخۆ و شەقلاوە و چەمچەماڵدا، لە کۆبوونەوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورددا لە سلێمانی و هەولێر و دهۆک و، لە کۆڕەکانی زانکۆی سلێمانیدا و گەلێک شوێنانی تر وەک، کۆڕەکانی ئەنجوومەنی یاسادانان، کۆڕەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە سلێمانیدا...

بەڵام داخەکەم لە کاتی خۆیاندا ناوی وتارەکان و ڕۆژیان تۆمار نەکراون لەبەرئەوەی حەزم کرد تەنیا بەشێوەیەکی گشتیی و تێکڕایی پەنجەیان بۆ بکێشم. لەگەڵ ئەمەیشدا لە کاتی خۆیدا ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان و عەرەبییەکان لە بەشێکی زۆری ئەو ووتارانە دەدوان و ناویان دەبردن و ناوەڕۆکیشیان بڵاودەکردنەوە.

ش. ف

## ناوی ئەو وتارانەی لە ڕادیۆی کوردیی بەغدادا بڵاوم کروونەتەوە

لەناوەند ساڵەکانی (١٩٧٥) و (١٩٨٠)دا، (١١٢) وتارم لە ڕادیۆ کوردییەکەی بەغدادا بڵاوکردۆتەوە، کە ئەمانەن:

١- نیشتمان: لە ساڵی ١٩٧٥دا
٢- قەڵەم: لە ساڵی ١٩٧٥
٣- ئێمە و گەورەکانمان: لە ساڵی ١٩٧٥
٤- بۆ خانەدانەکان: لە ساڵی ١٩٧٥
٥- من و تۆ: لە ساڵ ١٩٧٥
٦- مودیربەگ: لە ساڵی ١٩٧٥
٧- مام شێخ: لە ساڵی ١٩٧٥
٨- جوانیی ئافرەتی کورد: لە ساڵی ١٩٧٥
٩- بەرگ و پۆشەنیی ئافرەتی کورد: لە ساڵی ١٩٧٥
١٠- مامۆستای ئافرەت: لە ساڵی ١٩٧٥
١١- دڵداری و ژن و مێردی لەناو کوردەواریدا: لە ساڵی ١٩٧٥
١٢- ژینی خێزانی لەناو کوردەواریدا: لە ساڵی ١٩٧٥
١٣- وولبەرفۆرس: لە ساڵی ١٩٧٥
١٤- هۆرد: لە ساڵی ١٩٧٥
١٥- بەرخەکە: لە ساڵی ١٩٧٦دا

١٦- زۆرداری بەرۆژ: له سالی ١٩٧٦
١٧- راپەرینی گەل: له سالی ١٩٧٦
١٨- گوندی ئازاد: له سالی ١٩٧٦
١٩- خەبات بۆ سەربەستی: له سالی ١٩٧٦
٢٠- دوژمنی خوێندنگا: له سالی ١٩٧٦
٢١- حەپسەخانی نەقیب: له سالی ١٩٧٦
٢٢- قالی چن: له سالی ١٩٧٦
٢٣- دیدەوان: له سالی ١٩٧٦
٢٤- سەربەرزیی ژنێک: له سالی ١٩٧٦
٢٥- سەربەستی: له سالی ١٩٧٦
٢٦- نزیک بوونەوەی نووسەرانی کورد و عەرەب لە یەکتری مایەی پێشکەوتنمانە: له سالی ١٩٧٦
٢٧- ئاوازی هەژار: له سالی ١٩٧٦
٢٨- خۆشەویستیی ژیان: له سالی ١٩٧٦
٢٩- هاودەم: له سالی ١٩٧٦
٣٠- سۆلاف: له سالی ١٩٧٦
٣١- تاسەی نیگایەک: له سالی ١٩٧٦
٣٢- ناسکە قسە: له سالی ١٩٧٦
٣٣- فەرمانداریی خۆیی کوردستان: له سالی ١٩٧٧
٣٤- مێژووی برایەتیی کورد عەرەب: له ساتی ١٩٧٧
٣٥- بزووتنەوەی وێژەیی کوردی: له سالی ١٩٧٧
٣٦- گۆرانیی نیوەڕۆ: له سالی ١٩٧٧
٣٧- کورد و کوردستان: له سالی ١٩٧٧
٣٨- سولتان سەلاحەدین: له سالی ١٩٧٧
٣٩- نەورۆز: له سالی ١٩٧٧
٤٠- سەیران: له سالی ١٩٧٧
٤١- سەمەنی: له سالی ١٩٧٧
٤٢- مەڕ: له سالی ١٩٧٧
٤٣- گەزۆ: له سالی ١٩٧٧
٤٤- ترێ: له سالی ١٩٧٧
٤٥- بەفر: له سالی ١٩٧٧
٤٦- هەرەوەزی دار مازوو: له سالی ١٩٧٧
٤٧- ژینی تایبەتی: له سالی ١٩٧٧

٤٨- ماڵ ڕێک خستن: له ساڵی ١٩٧٧
٤٩- قسەی پێشینان: له ساڵی ١٩٧٧
٥٠- شاگردی سەرکەوتوو: له ساڵی ١٩٧٧
٥١- ڕاوکەری ئەستێران: له ساڵی ١٩٧٨- ١٩٧٩
٥٢- خانووی تازە: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٥٣- گوڵچین و گورگ: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٥٤- شوعالی چەپخوون: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٥٥- مام ڕێوی: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٥٦- پیرۆز و هەنگ: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٥٧- کۆترو بێچووەکانی: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٦٨- مریشکە سوورە بچکۆلە: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٦٩- پرچ زێڕین: له ساڵی ١٩٧٨- ١٩٧٩
٦٠- وورچەکەی کورەکاژاو: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٦١- بەرازەکەی شارەزوور: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٦٢- قاڵی چن: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٦٣- ئەوی بەرهەمی نەبێت نان ناخوات: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٦٤- کۆنگرەی منداڵان: له ساڵی ١٩٧٨- ١٩٧٩
٦٥- منداڵەکانمان یاریدەی خێزانەکانیان دەدەن: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٦٧- ژیانی لادێ پڕە لە خۆشی و وەرزشی بەکەڵک: له ساڵی ١٩٧٨- ١٩٧٩
٦٨- میوە خۆشەکانی کوردستان: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٦٩- ماسییش سەرچاوەیەکە بۆ ژیان: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٧٠- هاوینەهەوارە جوانەکانی کوردستان: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٧١- کارگەی هەنگوین هەنگ بەڕێوەی دەبات: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٧٢- جلوبەرگی کوردی: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٧٣- دەستکرد لەناو کوردەواریدا مایەی دڵخۆشییە: له ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩
٧٤- ئاوریشمیش سەرچاوەیەکی ژینمانە: له ساڵی - ١٩٧٩
٧٥- سامانەکانمان بەجگار زۆرن: له ساڵی - ١٩٧٩
٧٦- بازاڕی کوردستان لە مێژەوە لە گەڕدایە: له ساڵی - ١٩٧٩
٧٧- زمانی کوردی زمانێکی خۆش و پڕ ئاهەنگ و پەسەندە: له ساڵی - ١٩٧٩
٧٨- مەڕ گیانلەبەرێکی باش و بەکەڵکە: له ساڵی - ١٩٧٩
٧٩- گەزۆ: له ساڵی - ١٩٧٩
٨٠- بەفریش سامانێکە بۆ خۆی: له ساڵی - ١٩٧٩

٨١- خۆشەویستی: لە سالی - ١٩٨٠
٨٢- گەورە کێیە؟: لە سالی ١٩٨٠
٨٣- چاک بە و چاکە بکە!: لە سالی ١٩٨٠
٨٤- جوانی بەخشینێکی خودایییە: لە سالی ١٩٨٠
٨٥- پیاوێ پیاوەبێ قومار ناکات: لە سالی ١٩٨٠
٨٦- خۆشی ببەخشە نەک ناخۆشی: لە سالی ١٩٨٠
٨٧- خوازەلۆکی: لە سالی ١٩٨٠
٨٨- دادپەروەری: لە سالی ١٩٨٠
٨٩- بیروباوەڕی دیوکراتی: لە سالی ١٩٨٠
٩٠- چاکەخوازی: لە سالی ١٩٨٠
٩١- خۆشەویستی، نەک پوولپەرستی: لە سالی ١٩٨٠
٩٢- ئەم سامانەت لەکوێ بوو؟!: لە سالی ١٩٨٠
٩٣- پارە بەفیرۆ بەخت مەکەن: لە سالی ١٩٨٠
٩٤- خەلکت خۆشی بوێ، خەلک خۆشی دەوێی: لە سالی ١٩٨٠
٩٥- لە چیرۆکی ئادەم و حەوا چی تێ دەگەین؟: لە سالی ١٩٨٠
٩٦- لە چیرۆکی هابیل و قابیل چی تێ دەگەین؟: لە سالی ١٩٨٠
٩٧- لە چیرۆکی ئیبراهیم چی تێ دەگەین؟: لە سالی ١٩٨٠
٩٨- لە چیرۆکی یوسف چی تێ دەگەین؟: لە سالی ١٩٨٠
٩٩- لە چیرۆکی قاروون چی تێ دەگەین؟: لە سالی ١٩٨٠
١٠٠- لە چیرۆکی داوود چی تێ دەگەین؟: لە سالی ١٩٨٠
١٠١- لە چیرۆکی سولەیمانی و بەلقیس چی تێ دەگەین؟: لە سالی ١٩٨٠
١٠٢- شاهکارێک لە شاهکارەکانی عیسا: لە سالی ١٩٨٠
١٠٣- شاهکارێکی محەممەد: لە سالی ١٩٨٠
١٠٤- لاپەرەیەکی پرشنگدار لە مێژووی سەلاحەددیندا: لە سالی ١٩٨٠
١٠٥- لاپەرەیەکی پرشنگدار لە مێژووی کەریم خانی زەندا: لە سالی ١٩٨٠
١٠٦- یەکەم مامۆستامان خودایە: لە سالی ١٩٨٠
١٠٧- ئیسلامەتی هەر بەقسە پێک نایەت نیازی پاک و کردەوەی بلندیشی دەوێ: لە سالی ١٩٨٠
١٠٨- ئیسلامەتی دەستوورێکە بۆ فەرمانداری: لە سالی ١٩٨٠

## ڕستەی ناوی وتارەکانم کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوم کردوونەتەوە(*)

(١٢)

لەناوەند ساڵەکانی (١٩٢٧) و (١٩٨٤)دا لە (٢٠٤) ووتارم پتر بلاکردۆتەوە بەلام هەر ئەمانەم بۆ دۆزراوەتەوە:

| ناوی وتار | ناوی ڕۆژنامە و گۆڤار | ژمارەی | ڕۆژی |
|---|---|---|---|
| ١- هاواری وەتەنە خۆشەویستەکەمان | ڕۆژنامەی ژیان: سلێمانی | ٥٢ | ١٩٢٧-٢-٣ |
| ٢- خوێندن بەزمانی کوردی | ڕۆژنامەی ژیان: سلێمانی(١) | | ١٩٢٨ |
| ٣- هاوار | گۆڤاری هاوار: شام | ٦ | ١٩٣٢-٨-٨ |
| ٤- گەشتێک بەسەر باڵی پەڕەندەی خەیاڵەوە | ژیان: سلێمانی | | ١٩٣٣ |
| ٥- فرمێسکی مەم | ژیان: سلێمانی | | ١٩٣٣ |
| ٦- شەو | ژیان: سلێمانی | | ١٩٣٣ |
| ٧- پێککەیشتن | ژیان: سلێمانی | | ١٩٣٣(**) |
| ٨- مام وورچ | یادگاری لاوان: بەغدا | | ١٩٣٣ |
| ٩- جەمیل سدقی زەهاوی(٢) | ژیان | ١ | ١٩٣٤ |
| ١٠- فرمێسکی کاکە مەم | دیاریی لاوان: بەغدا | ١ | ١٩٣٤ |
| ١١- دانشتن بەبن کورسی | دیاریی لاوان: بەغدا | ١ | ١٩٣٤ |
| ١٢- ژینێکی بەرز | دیاریی لاوان: بەغدا | | ١٩٣٤ |
| ١٣- نامەیەکی کراوە بۆ عەلی کەمال بەگ(٣) | ژیان: سلێمانی | | ١٩٣٥ |
| ١٤- نامەیەکی کراوە بۆ عەلی کەمال بەگ | گۆڤاری ڕۆناکی: هەولێر | | ١٩٣٦ |
| ١٥- کاژی بکلێف | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ١ | ١٩٣٩ |
| ١٦- ئاوازی هەژاری | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغدا | ٤.٣ | ١٩٤٢ |
| ١٧- بەندی دەوڵەمەندی | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغدا | ٦.٥ | ١٩٤٢ |
| ١٨- هاودەم | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغدا | ٨.٧ | ١٩٤٢ |
| ١٩- سەیران | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغدا | ٤ | ١٩٤٣ |
| ٢٠- سەرێکی هەیە و هەزار سەودا | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغدا | ١٢ | ١٩٤٣ |
| ٢١- بووک و خەسوو | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ٥ | ١٩٤٤ |
| ٢٢- دەس پاکی | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ٧ | ١٩٤٤ |

(*) پەراوێزی ڕستەی ناوی وتارەکانم لە لاپەرە ١٤٧ی ئەم کتێبە دانراون.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٣- چەقاوەسوور | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ١٢ | ١٩٤٤ |
| ٢٤- گرامەفۆنەکەم چۆن کری؟ | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ٢ | ١٩٤٥ |
| ٢٥- مام شێخ | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ٦ | ١٩٤٥ |
| ٢٦- هەر بژیت ئەی دوژمن | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ٤ | ١٩٤٧ |
| ٢٧- بەهەشتی ژین | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ٨ | ١٩٤٧ |
| ٢٨- مەشکە | گۆڤاری گەلاوێژ: بەغداد | ١١ | ١٩٤٨ |
| ٢٩- بۆخانەدانەکان | رۆژنامەی کوهستان - تاران | ٨٤ | ١٩٤٧ |
| ٣٠- ئافرەتی کورد | گۆڤاری نزار: بەغدا | ٢ | ١٩٤٨-٤-١٥ |
| ٣١- ئافرەتی کورد | گۆڤاری نزار: بەغدا | ١٣ | ١٩٤٨-٤-٣٠ |
| ٣٢- خانووی کوردەواری | گۆڤاری نزار: بەغدا | ١٤ | ١٩٤٨ ١٠ -٢٢ |
| ٣٣- مەلاکاغان | گۆڤاری نزار: بەغدا | ١٥ | ١٩٤٨ -١٠-٣١ |
| ٣٤-لە کونێکەوە سەیرکە | گۆڤاری نزار: بەغدا | ١٧ | ١٩٤٨-١١-٣٠ |
| ٣٥- رەووشت و خوو | گۆڤاری نزار: بەغدا | ١٦ | ١٩٥١ |
| ٣٦- ضريبة الرأس | جريدة المثال: الموصل | ٩، ١٠، ١١ | ١٩٥١ |
| ٣٧- سكان قضاء عقرة | جريده الايام: بغداد | ٤٦ | ١٩٥١-١-٥ |
| ٣٨- عقره ستصبح مصيفا منظما ممتازا | جريدة الفجر: الموصل | ٢١ | ١٩٥١-٤-٢٨ |
| ٣٩- مجتمع قضاء عقرة | جريدة الايام: بغداد | ٥، ٦، ٧ | ١٩٥١ ٥-٥ |
| ٤٠- في مصائف عقرة | جريدة المثال | ٣١ | ١٩٥١-١١-٢٢ |
| ٤١- المدارس المتوسطة الحالية لاتفي بالحاجة | جريدة المثال | ٣٧ | ١٩٥٢ ٢-١٥ |
| ٤٢- فلتحي ياعدوا | جريدة المثال | ٧،٨ | |
| ٤٣- الصديق | جريدة المثال | ٣٩ | ١٩٥١-٢-٢٩ |
| ٤٤- الحق والحقيقة | جريدة المثال | ٤٠ | ١٩٥٢-٣-٧ |
| ٤٥- الى ابناء الذوات | جريدة المثال | ٤١ | ١٩٥٢-٣-١٤ |
| ٤٦- الزواج السعيد | جريدة المثال | ٤٢ | ١٩٥٢-٣-٢١ |
| ٤٧- الوطن[٥] | جريدة المثال | ٤٣ | ١٩٤٢-٣ -٢٨ |
| ٤٨- القلم | جريدة المثال | ٤٤ | ١٩٥٢ -٤-٤ |
| ٤٩- سبع صنايع والبخت ضائع | جريدة المثال | ٤٧ | ١٩٥٢-٥-٩ |
| ٥٠- الثقافة في قضاء عقرة | جريدة اربيل: (هەولێر) | ٢٢ | ١٩٥٢-٥-١٢ |
| ٥١- هەواڵی شەقلاوە | جريدة اربيل (هەولێر) | ٢٣ | ١٩٥٢ ٥-١٩ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥٢- بیری سەربەست: | جريدة اربيل: (هەولێر) | ١٠٢ | ١٩٥٣-١-١٣ |
| ٥٣- پێبکەنە | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٠٧ | ١٩٥٣-٢-١٧ |
| ٥٤- زانستی گشت لای: | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٠٨ | ١٩٥٣-٢-٢٤ |
| ٥٥- رازی سەرکەوتن | ڕۆژنامەی هەولێر | ١١٠ | ١٩٥٣ -٣- ١٠ |
| ٥٦- هاوینەهەوارەکانمان | ڕۆژنامەی هەولێر | ١١١ | ١٩٥٣-٣-١٧ |
| ٥٧- بەرتیل | ڕۆژنامەی هەولێر | ١١٥ | ١٩٥٣-٣-٢٥ |
| ٥٨- بام فێربین لە ژینەوە | ڕۆژنامەی هەولێر | ١١٧ | ١٩٥٣-٤-٢٨ |
| ٥٩- بام پێبکەنین | ڕۆژنامەی هەولێر | ١١٨ | ١٩٥٣-٥-٥ |
| ٦٠- بەختیاری، خەفەت، ترس | ڕۆژنامەی هەولێر | ١١٩ | ١٩٥٣-٥-١٢ |
| ٦١- دەستووری سەرکەوتن | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٢١ | ١٩٥٣-٥-٢٦ |
| ٦٢- کۆمەڵی چاکان | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٢٩ | ١٩٥٣-١٠-١٥ |
| ٦٣- ئافرەتی کورد کلۆڵن | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٣٠ | ١٩٥٣-١٠-٢٢ |
| ٦٤- خاوەن کچ لە خودا بترسن! | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٣١ | ١٩٥٣-١٠-٣٠ |
| ٦٥- خانمەکەم ژنێکی باش بە! | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٣٢ | ١٩٥٣-١١-٥ |
| ٦٦- ئافرەت بۆ چ خراپ دەبێ؟ | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٣٤ | ١٩٥٣-١١ -١٩ |
| ٦٧- محەمەد (د خ) | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٣٧ | ١٩٥٣-١-٧ |
| ٦٨- چۆن دەوڵەمەند دەبین؟ | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٣٨ | ١٩٥٣-١٢-٢١ |
| ٦٩- لاسایی کردنەوە:مەلای مەزبوورە و جوولەکەکە | ڕۆژنامەی هەولێر | ١٤٠ | ١٩٥٣-١٢-٢٨ |
| ٧٠- مصائبنا متي تنال الأصلاح | جريدة العاصفة: الموصل | ٤ | ١٩٥٣ -٦-٢٩ |
| ٧١- مووچەی فەرمانبەران | ڕۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١١٨٤ | ١٩٥٤-١-٢٨ |
| ٧٢- کاتی فرمان بینینی فەرمانبەران | ڕۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١١٨٥ | ١٩٥٤-٢-٤ |
| ٧٣- الاقطاعي رقم (١) | جريدة المثال: الموصل | ٨٦ | ١٩٥٤ -٤-١٥ |
| ٧٤- المتشيخ | جريدة المثال: الموصل | ٩٠ | ١٩٥٤-٥-١٣ |
| ٧٥- الاقطاعي رقم (٢) | جريدة المثال: الموصل | ٩١ | ١٩٥٤-٥-٢٠ |
| ٧٦- الاقطاعيان رقم (٣) و (٤) | جريدة المثال: الموصل | ٩٢ | ١٩٥٤ -٥ -٢٧ |
| ٧٧- القرابة، الوطن | جريدة الصياد : بغداد | ١٢ | ١٩٥٤-٥-٢٩ |
| ٧٨- الاقطاعي رقم (٥) | جريدة المثال: الموصل | ٩٣ | ١٩٥٤-٦-٦ |
| ٧٩- ناودارەکان: ئەمین زەکی | ڕۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١٢٠٣ | ١٩٥٤-٦-١٧ |
| ٨٠- شرف المرأة | جريدة اخبار اليوم: بغداد | ٦١ | ١٩٥٤-٦-٢٣ |
| ٨١- خروف؟! | جريدة المثال: الموصل | ٩٦ | ١٩٥٤-٦-٢٤ |
| ٨٢- الحب الرخيص | جريدة المثال: الموصل | ٩٧ | ١٩٥٤-٧-١ |
| ٨٣- شجاعة امرأة | جريدة المثال: الموصل | ٩٨ | ١٩٥٤-٧-٨ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨٤- المصائف العراقية | جريدة عالم اليوم: بغداد | ٢ | ١٩٥٤-٧-٨ |
| ٨٥- مطاليب الشعب | جريدة عالم اليوم: بغداد | ٣ | ١٩٥٤-٧ -٩ |
| ٨٦- طبيب، مدرسة، متوسطة | جريدة عالم اليوم: بغداد | ٢ | ١٩٥٤-٥-٣٠ |
| ٨٧- حوزنیی موکریانی | گۆڤاری هەتاو: هەولێر | | ١٩٥٤-٦-١٦ |
| ٨٨- پیرەمێرد | گۆڤاری هەتاو: هەولێر | | ١٩٥٤ |
| ٨٩- ئەمین زەکی بەگ | گۆڤاری هەتاو: هەولێر | | ١٩٥٤ |
| ٩٠- برابارزانییەکانمان | گۆڤاری هەتاو: هەولێر | ١٢٤٢ | ١٩٥٥-٣-٢٤ |
| ٩١- کچەرەکانمان تاکەی وابێننەوە؟ | گۆڤاری هەتاو: هەولێر | ٥ | ١٩٥٧-٣-٥ |
| ٩٢- ژین | گۆڤاری هەتاو: هەولێر | ٨ | ١٩٥٧-٣-٢٦ |
| ٩٣- بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | ٧ | ١٩٥٧-٣-١٩ |
| ٩٤- مجتمعنا: مجتمع عدائي | جريدة الوقائع: الموصل | ١١ | ١٩٥٧-٤-١٦ |
| ٩٥- اوقاف فراغنا | جريدة الوقائع: الموصل | ٤١ | ١٩٥٧-٥-٩ |
| ٩٦- خير الناس انفعهم للناس | جريدة الوقائع: الموصل | ٤٣ | ١٩٥٧-١١-١٨ |
| ٩٧- الجمال | جريدة الوقائع: الموصل | ٦٢ | ١٩٥٧-٥-٢٣ |
| ٩٨- السرور قوة | جريدة الوقائع: الموصل | | ١٩٥٧ ٩ -٢٦ |
| ٩٩- سازو ئاوازی کوردی | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | | ١٩٥٧-١٠-٣ |
| ١٠٠- گەورە کێیە؟ | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | | ١٩٥٧-١٠-١٠ |
| ١٠١- گۆرانی و ساز و ئاواز لە ئاکرێدا | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | | ١٩٥٧-١٠-١٧ |
| ١٠٢- خوشەویستی نیشانەی پێشکەوتنە | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | | ١٩٥٧-١١-٧ |
| ١٠٣- ببەخشن | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | | ١٩٥٧-١١-١٤ |
| ١٠٤- ژینی کوردەواری:ئافرەتی کورد:(سەربلند) | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | | ١٩٥٧-١١-٢٨ |
| ١٠٥- ئافرەتی کورد: (قاڵی چن) | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | | ١٩٥٧-١٢-١٥ |
| ١٠٦- ڕێگای سەرکەوتن | گۆڤاری هیوا: بەغدا | ١ | ١٩٥٧-٧- |
| ١٠٧- ڕێگای سەرکەوتن | گۆڤاری هیوا: بەغدا | ٢ | ١٩٥٧-٨- |
| ١٠٨- مێژووی ئاکرێ | گۆڤاری هیوا: بەغدا | ٣ | ١٩٥٧-٩ - |
| ١٠٩- جوانی | گۆڤاری هیوا: بەغدا | ٤ | ١٩٥٧-١٠- |
| ١١٠- ڕەوشەن بەدرخان | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١٣٧٧ | ١٩٥٨-١-١٦ |
| ١١١- ئافرەتی کورد: (دیدەوان) | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١٣٨٠ | ١٩٥٨-٢-٦ |
| ١١٢- کارتێکردنی پرۆژەکانی ئاواکردنەوەی عێراق لە ژیانی گەل و دەرەوەدا | گۆڤاری پەیام: بەغداد | ٣٨٣ | ١٩٥٨-٢-١٥ |
| ١١٣- بەرخەکە | گۆڤاری هیوا: بەغدا | ٩ | ١٩٥٨-٢- |
| ١١٤- زانیاریی کوردستان و جوغرافیای | رۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١٤٧٣ | ١٩٥٩-٩-١٧ |

کوردستان دوو ئاواتی گرنگی نەتەوەی کوردن.

| ١١٥- گۆرانیی کرێکار | گۆڤاری نەورۆز: سلێمانی | ١ | نەورۆزی ١٩٥٩ |
|---|---|---|---|
| ١١٦- وتارێک بۆ کۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی کورد(٧) | ڕۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١٥٥٦ | ١٩٦٠-٩-٨ |
| ١١٧- گلەیی لە کێ بکرێ؟ | گۆڤاری شەفەق: کەرکووک | ١٣ | ١٩٦٠-٢- |
| ١١٨- لە نەورۆزدا چی بکەین؟ | گۆڤاری ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ١ | گولانی ١٩٦٠ |
| ١١٩- یەکێتیی نووسەرانی کورد | گۆڤاری ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ٢ | ١٩٦٠-٥- |
| ١٢٠- گوندی سووتاو | ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ٣ | ١٩٦٠-٦ - |
| ١٢١- ئاگرێ | ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ٤ | ١٩٦٠-٧- |
| ١٢٢- فرمانی دواکەوتوو | ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ٩ | ١٩٦٠-١٢- |
| ١٢٣- چی هەیە لە گۆڕێ؟ | ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ١٠ | ١٩٦٠-١١- |
| ١٢٤- خۆشەویستی | گۆڤاری ڕۆژی نوێ | ٢٠ | ١٩٦١-١-١٥ |
| ١٢٥- پیشەسازی لە کوردستاندا | شەفەق: کەرکووک | ٣ | |
| ١٢٦- هاوینەهەوارەکانی کوردستان | گۆڤاری ڕۆژی نوێ | ٤ | ١٩٦١-٦- |
| ١٢٧- لەنگەری پێشکەوتن | گۆڤاری ڕۆژی نوێ | ٥ | ١٩٦١-٧- |
| ١٢٨- ئاوات | گۆڤاری ڕۆژی | ١١ | ١٩٦١-٨- |
| ١٢٩- جوانی | ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ١٢ | ١٩٦١-٢- |
| ١٣٠- پرۆژەی خوێندەواری کورد | گۆڤاری ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ٢٩ | ١٩٦١-٣- |
| ١٣١- نیشتمان | ڕۆژی نوێ | ١٧ | ١٩٦٧-١٢-٢ |
| ١٣٢- شۆڕشی هیندستان (پەرچڤەی) | گۆڤاری ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ٢٠ | |
| ١٣٣- جوانی | ڕۆژی نوێ | ٢١ | ١٩٦٧-٩-٩(١) |
| ١٣٤- پرسە | گۆڤاری ڕۆژی نوێ: سلێمانی | ٢٢ | ١٩٦٧-٩-٣٠ |
| ١٣٥- مێژووی یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی | ڕۆژنامەی برای: بەغدا | ٤ | ١٩٦٧-١٠-٧ |
| ١٣٦- چارەیەک بۆ خوازەلۆکی | ڕۆژنامەی برایی: بەغدا | ١، ٢، ٣ | |
| ١٣٧- دەنگ نەرمی نیشانەی پێشکەوتنە | ڕۆژنامەی برایی: بەغدا | ١ | ١٩٦٨-١٠-١٤ |
| ١٣٨- میوانداری نەک قبوول | گۆڤاری سلێمانی | ٥ | ١٩٦٨-٩- |
| ١٣٩- شۆڕشی گەورەی کورد موژدەی پێشکەوتنی بەدەمەوەبوو | /سلێمانی: گۆڤاری سلێمانی | ٧ | ١٩٧-١٢-١٠ |
| ١٤٠- هاوینەهەوارەکانی کوردستان | ڕزگاری: سلێمانی | ٩ | ١٩٦٩-١٢-١٤ |
| ١٤١- زمان بڕین نەک خەتەنەکردن | ڕۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١ | پاییزی ١٩٧٠ |

---

(١) لەو بەروارەدا گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) نەبووە، دەبێ هەڵەی چاپبێ.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٤٢- دادگاهێک بۆ شارەوانی | سلێمانی | ٢١ | ١٩٧٠ |
| ١٤٣- بام مامۆستاو شاگرد بین تا دەمێنین | ڕۆژنامەی ژین: سلێمانی | ٢ | ١٩٧٠-١٠- |
| ١٤٤- ژن ژیانە نەک ژان | گۆڤاری سلێمانی | ٨ | ١٩٧١-٢-١١ |
| ١٤٥- نوێژی دوایی | سلێمانی: سلێمانی | ١٣ | ١٩٧١-٤-١ |
| ١٤٦- جەژن بۆ ژیانە، نەک ژان | گۆڤاری برایەتی: بەغدا | ٢ | ١٩٧١-٥-٦ |
| ١٤٧- ڕەوشت یان زانست؟ | گۆڤاری برایەتی: بەغدا | ٤ | ١٩٧١-٥-٣١ |
| ١٤٨- دۆست بین چاکترە یان دوژمن؟ | ڕۆژنامەی ژین: | ٣ | ١٩٧١-٦-٢١ |
| ١٤٩- پێ نەزانین تاکەی؟ | سلێمانی | ٢ | ١٩٧١-٧-٢٠ |
| ١٥٠- بەخشین، نەک پچڕین! | گۆڤاری پاشکۆی برایەتی | ١ | ١٩٧١-٤- |
| ١٥١- ڕاستە ڕەشەبا دایەنێکی خراپمانە؟ | ڕۆژنامەی ژین: سلێمانی | ١ | ٩٧١-٥- |
| ١٥٢- ڕاوکەری ئەستێران | ئەستێرە: سلێمانی | | بەهاری ١٩٧٢ |
| ١٥٣- ئەنجامی نازداری | پاشکۆی برایەتی | ٣ | ١٩٧٢-٩- |
| ١٥٤- پرسە | پاشکۆی برایەتی | ١٣ | ١٩٧٣ |
| ١٥٥- وتووێژێک لەگەڵ مامۆستا شاکر فتاحی ئەدیبدا/پاشکۆی برایەتی | | ١٣ | ١٩٧٠/١٠/١١ |
| ١٥٦- چەند پرسیارێک لە مامۆستا شاکر فتاح/پاشکۆی برایەتی | | ١٣ | ١٩٧٤ |
| ١٥٧- مریشکە سوورە بچکۆلە | مامۆستا: سلێمانی | ١٧ | ١٩٧٤-٣- |
| ١٥٨- نەورۆز | گۆڤاری دەنگی مامۆستا | ١٧ | ١٩٧٤-٣- |
| ١٥٩- سەیران | دەنگی مامۆستا: سلێمانی | ١٧ | ١٩٧٤-٣- |
| ١٦٠- سەمەنی | گۆڤاری پەروەردە و زانست، بەغدا | ١٧ | ١٩٧٤-٣- |
| ١٦١- گەزۆ | پەروەردە و زانست: بەغدا | | ١٩٧٤-٣- |
| ١٦٢- ترێ | گۆڤاری ئەستێرە: بەغدا | | ١٩٧٤-٩- |
| ١٦٣- مەڕ | | | ١٩٧٤-٩- |
| ١٦٤- خانوو | | | ١٩٧٤-٩- |
| ١٦٥- باخچەی ماڵ | | ٢ | ١٩٧٤-٩- |
| ١٦٦- ماڵ ڕازاندنەوە | | ١ | ١٩٧٤-٩- |
| ١٦٧- نووسراوخانە | | ٢ | ١٩٧٤-٩- |
| ١٦٨- ساز و ئاواز و گۆرانی | ڕۆژنامەی ژین: | ٣ | ١٩٧٥ |
| ١٦٩- گاڵتەوگەپ و قسەی خۆش | سلێمانی | ٤ | ١٩٧٥ |
| ١٧٠- چۆن ڕابوێرین؟ | گۆڤاری نووسەری کورد | ٥ | ١٩٧٥-٦- |
| ١٧١- سینەماکانمان | بەغدا | ١ | ١٩٧٨ |
| ١٧٢- خانووی تازە | گۆڤاری ئەستێرە: | | ١٩٧٨ |
| ١٧٣- کوردستان و سوشیالیستی | بەغدا | | ١٩٧٨ |

| ناونیشان | بڵاوکراوە | ژمارە | ساڵ |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٧٤- كردستان والاشتراكية | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | ١٩٧٨ |
| ١٧٥- دیموکراتیی شۆڕشگێرانە | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | ١٩٧٨ |
| ١٧٦- الديمقراطية الثورية | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | ١٩٧٨ |
| ١٧٧- جووڵەی ئافرەتی کورد | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | ١٩٧٨ |
| ١٧٨- حركة المراة الكردية | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | |
| ١٧٩- منالی کوردیش شاهێکە بۆ خۆی | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | |
| ١٨٠- الطفل الكردي ملك غير متوج | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | ١٩٧٩ |
| ١٨١- گیروگرفتەکانی ڕۆشنبیریی | | | ١٩٧٩ |
| کوردی و شێوەی چارەکردنیان | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | ١٩٧٩ |
| ١٨٢- صفحات مشرقة من تاريخ مكافحة الامية في كردستان | گۆڤاری ئۆتۆنۆمی هەولێر | | ١٩٧٩ |
| ١٨٣- کوتک دەزانێ قۆناغ لە کوێیە! | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | ١٩٧٩ |
| ١٨٤- پەرچڤەکردنی نووسراوانی جیهانی بە زمانی کوردی | گۆڤاری بەیان: بەغدا | | ١٩٧٩ |
| ١٨٥- ترجمة الكتب العالمية الي اللغة الكرديه | گۆڤاری ئۆتۆنۆمی - هەولێر | | ١٩٧٩ |
| ١٨٦- ژیانی هەروەزی | بڵاوکراوەی ئۆتۆنۆمی | ١ | ١٩٧٩ |
| ١٨٧- سعادتنا من سعادة اطفالنا | -هەولێر- | ١ | ١٩٧٩ |
| ١٨٨- قاڵی چن (چیرۆکە) | گۆڤاری ئۆتۆنۆمی -هەولێر- | ١ | ١٩٧٩ |
| ١٨٩-اعياد اذار وطدت الاخوة العربية الكردية | -هەولێر- | ٢ | ١٩٧٩ (السنة الخامسة) |
| ١٩٠- نەورۆز | | ٣ | |
| ١٩١- کۆمەڵی دیدەوانی | | ٣ | ١٩٧٩ |
| ١٩٢- لاسایی کردنەوەی گەزۆ | | ٣ | ١٩٧٩ |
| ١٩٣- المراة الكردية | ئۆتۆنۆمی -هەولێر- | ٣ | ١٩٨٠ |
| ١٩٤- ڕەنج نەدەیت نان ناخۆیت | گۆڤاری نووسەری | ٤ | ١٩٨٠ |
| ١٩٥- منداڵەکانمان یاریدەی خێزانەکانیان دەدەن | ئۆتۆنۆمی: (هەولێر) | ٤ | ١٩٨٠ |
| ١٩٦- المراة الكردية | (هەولێر) | | ١٩٨٠ |
| ١٩٧- ژن هێنان لەناو کوردەواریدا بۆتە | ئۆتۆنۆمی: (هەولێر) | | ١٩٨٠ |
| ١٩٨- گیروگرفت و ژان پێویستە چارەی بکرێ | ئۆتۆنۆمی: (هەولێر) | | ١٩٨٠ |
| ١٩٩- المراة الكردية ٣ | ئۆتۆنۆمی: (هەولێر) | | |
| ٢٠٠- المراة الكردية ٤ | ئۆتۆنۆمی: (هەولێر) | | |
| ٢٠١- جیهان لە ساڵی دوو هەزارەمدا (پەرچڤە | ئۆتۆنۆمی: (هەولێر) | | |
| ٢٠٢- (اكري او قضاء عقرة) ١ | ئۆتۆنۆمی: (هەولێر) | | |
| ٢٠٣- کاتێ کە برا و خوشکەکان بەگژ یەکدا دەچن | ئۆتۆنۆمی: (هەولێر) | | |

ئۆتۆنۆمی: (هەولێر)

٢٠٤- اکری/٢ ئۆتۆمی: (هەولێر)

٢٠٥- عيد المراة العالمية ئۆتۆنۆمی: (هەولێر)

٢٠٦- ئارەزووی دزی کردن لە دڵی منداڵ چۆن دەردەهێنین؟ ئۆتۆنۆمی: (هەولێر)

٢٠٧- اکری/٣ ئۆتۆنۆمی: (هەولێر)

٢٠٨- گیروگرفتی هەرزەکاری ئۆتۆنۆمی: (هەولێر)

## ئامارەکان

(١) خوالێخۆشبوو (ئەمین زەکی بەگ) کە کاربەدەستی زانست بوو، چوو بووە سلێمانی و پێی گوتبوون، خوێندن لە خوێندنگاکاندا بەزمانی (عارەبی) بێ چاکترە لە کوردی، جا ئەم وتارەم لە دژی ئەم قسەیە نارد بۆ ڕۆژنامەی ژین بەڵام بڵاوی نەکردەوە.

(٢) داخم لە ژینی جمیل صدقی زەهاوی بوو، نەک شینی، بڵاونەکرایەوە.

(٣) علی کمال کە نوێنەری کوردبوو لە کۆڕی نەتەوەدا، بەرپەرچم دایەوە.

(٤) ونشرتة جريدة (القافلة)-حمص- سوريا بعددها (١٦٢) في ١٩٥٢/٣/١٣ بعد ان تصرفت فية بعض التصرف ونشرت ايضا في جريدة (اخبار اليوم) بغداد / عدد (٣٩) في ١٩٥٤/٥/٢٥.

(٥) ونشرت هذا المقال ايضا جريدة (اربيل) في عددها (٦٥) الصادر في ١٩٥٢/٤/١، وكذلك جريدة (الصياد) بغداد في عددها المرقم (١٠) في ١٩٥٤/٣/١٢.

(٦) ونشرت ايضا (الوطن) في نفس العدد (١٠) ١٩٥٤

(٧) لەکۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی کورددا لە شەقڵاوە خوێندمەوە بەناوی وێژەوانانی کوردەوە لە سلێمانی.

(٨) بەهەڵە لەهەندێ جێیدا چاپ کرابوو، ڕاستمان کردەوە، لەوکاتەدا قایمقامی (زاخۆ) بووم، ئەم بابەتە خرابوە (گرەو)ەوە و، من بەیەکەم دەرچووم... (٢٥) دینار پاداشم وەرگرت.

(٩) ئەو وتارانەی کە ئامادەکراون و نەنێرراون بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، یاخود نێرراون بەڵام بڵاونەکراونەتەوە لێرەدا ناویان نەنووسراوە (یەکێکیان نەبێ)!![١]

***

(١) وەک لە لیستەکەدا دەردەکەوێ، بەتایبەت لە کۆتاییدا، بێ سەروبەریەکی پێوە دیارە، چ لە ناوی گۆڤارەکان و چ لە ژمارە و بەرواری دەرچوونیاندا، جا ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمتەرخەمی هەڵەچن لە (ڕۆشنبیری نوێ) کە لیستەکەی کاتی خۆی بڵاوکردۆتەوە، هەروا لەو کتێبەی کە مامۆستا فەلەکەددین کاکەیی و مەحموود زامدار ئامادەیان کردبوو (دەستنووسێکی شاکر فەتاحی شەهید) کە وا دیارە هەردوولا یەک سەرچاوەیان هەبووە.

## ڕازەکانی تری پرۆژەی خوێندەواری کورد

(١٣)

بێجگە لەو ڕازانە (خزمەتانە)ی لەمەوپێش لێ یان دواین (پرۆژەی خوێندەواری کورد) ئەم ڕازانەیشی پێشکەشی نەتەوەی کورد و جیهان کردووە:-

١- بۆ ئەم نووسراوخانە گشتییانەی کوردستان هەر یەک پێنج سەد نووسراو و گۆڤاری گرنگ و بەکەڵکی کوردی و عەرەبی و زمانانی تری بەدیاری پێشکەش کردووە:-

أ- نووسراوخانەی گشتیی سلێمانی- لە ساڵی ١٩٦٤دا.

ب- نووسراوخانەی چاودێری کردنی نەوجەوانانی سلێمانی - لە ساڵی ١٩٨١دا.

ج- نووسراوخانەی گشتیی چاودێری کردنی کچانی سلێمانی- لە ساڵی ١٩٨٢دا.

د- نووسراوخانەی گشتیی چەمچەماڵ - لە ساڵی ١٩٧٦دا.

هـ- نووسراوخانەی گشتیی کۆیسنجەق - لە ساڵی ١٩٧٧دا.

و- نووسراوخانەی گشتیی هەولێر- لە ساڵی ١٩٧٨دا.

ز- نووسراوخانەی گشتیی دهۆک- لە ساڵی ١٩٧٨دا.

ح- نووسراوخانەی گشتیی زاخۆ - لە ساڵی ١٩٧٨دا.

ط- نووسراوخانەی گشتیی ڕەواندز - لە ساڵی ١٩٧٩دا.

ی- نووسراوخانەی گشتیی مەخموور - لە ساڵی ١٩٧٩دا.

ک- نووسراوخانەی گشتیی هەڵەبجە - لە ساڵی ١٩٨٠دا.

ل- نووسراوخانەی گشتیی ڕانیە - لە ساڵی ١٩٨٠دا.

لە هەر یەکێک لەو نووسراوخانانەدا گۆشەیەکیان بەناوی خاوەنی پرۆژەکەوە بۆ تەرخان کراوە. تا لە دوا ڕۆژیشدا بتوانێت پەیتا پەیتا نووسراوانی گرنگ و بەکەڵکی تریان بۆ بنێرێت.

٢- ئەم نووسراوخانانەی لەم جێگایانەدا دامەزراندووە:

أ- لە خوێندنگای سەرەتایی گوندی (ئەترووش)دا کە لە لادێی (مزووری) دایە، نووسراوخانەیەکی، لە ساڵی ١٩٣٦دا بۆ شاگردەکان دامەزراند: نووسراوانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزیی تێدا دانا.

ب- لە خوێندنگای سەرەتایی گوندی (پێدە)دا کە لە لادێی (مزووری)دایە، لە ساڵی ١٩٣٦دا بۆ شاگردەکان دامەزراند: نووسراوانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزیی تێدا دانا.

ج- لە یانەی فەرمانبەرانی (شێخان = عێن سفنی)دا لە ساڵی ١٩٥٠دا.

د- لە یانەی فەرمانبەرانی (ئاکرێ)دا لە ساڵی ١٩٥١دا.

هـ- لە یانەی فەرمانبەرانی (شەقلاوە)دا لە ساڵی ١٩٥٣دا.

و- لە یانەی فەرمانبەرانی (دهۆک)دا سەر لە نوێ ساڵی ١٩٥٦دا.

ز- لە بەشی کوردیی زانستگای وێژەی بەغدادا ساڵی ١٩٦٢دا.

٣- بەدیاری کۆمەڵە نووسراوانی بۆ ئەم نووسراوخانانە پێشکەش کردووە:-

أ- نووسراوخانەی (ناوازگاه = متحف)ی سلێمانی لە ساڵی ١٩٦٤دا.

ب- نووسراوخانەی (کۆڕی زانیاریی کورد) لە بەغداد ساڵی ١٩٧٢دا.

ج- نووسراوخانەی (گەڵاڵە) ناوچەی ڕەواندز ساڵی ١٩٧٣دا.

د- نووسراوخانەی (ماینز) لە ئەڵمانیادا ساڵی ١٩٧٤دا.

هـ- نووسراوخانەی زانکۆی (سۆربۆن) لە پاریسدا ساڵی ١٩٧٤.

ز- نووسراوخانەی (بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی کوردی) لە بەغدادا ساڵی ١٩٧٧دا.

ح- نووسراوخانەی (ئەنجوومەنی یاسادانانی کوردستان) لە بەغدادا ساڵی ١٩٧٧دا.

ط- نووسراوخانەی (بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی کوردی) لە بەغدادا ساڵی ١٩٧٢دا.

ی- نووسراوخانەی (دەسگای ڕۆشنبیری و لاوان) لە هەولێردا ساڵی ١٩٨١دا.

٤- بێجگە لەمانە، بەکۆمەڵ و بەتاک تاک، نووسراوەکانی خۆی، بەناوی دیاری و ڕێزگرتنەوە پێشکەشی گەلێک وێژەوانان و زانایان و ڕۆشنبیرانی کورد کردووە چ لە کوردستاندا، چ لە دەرەوەی کوردستاندا.

٥- هەر دەسگایەکی ڕۆشنبیریی کوردی یاخود هەر مامۆستا و خوێندکارێک، هەر خاوەن ڕۆژنامە و گۆڤارێک هەر کەسێک یان هەر دەسگایەکی زرنگکاری، یاخود خوێندەواریی جیهان، داوای یارمەتییەکی لێ کردبێت، لە کۆڕی ڕۆشنبیریدا و بۆ کورد کەڵکی هەبووبێت بێ پارە بەخۆڕایی، یارمەتیی داوە.

٦- گەلێک جار، بەتێکۆشان و پارەبووبێ یان بەنووسین، یارمەتیی کڵۆڵ و داماو و لێ قەوماوانی کوردی داوە. ئەمانە نموونەی ئەو یارمەتییانەن:-

أ- لە ساڵی ١٩٣٦دا، پارەی کۆکردەوە لە خوێندکارە کوردەکان لە بەغدادا و، دوکانێکی چێشتخانەی بچووکی بۆ دوو شاگردی هەژار و داماوی کورد کردەوە و دامەزراند کە یەکێکیان (کۆیی)بوو، ئەویتریشیان (ڕواندزی). هەردوو شاگرد بەمزی ئەو چێشتخانەیە ژیان تا لە دەسکاکانی میریدا فرمانیان دەستکەوت و دامەزران.

ب- لە ساڵی ١٩٥٧دا (٣٥) دیناری خۆی پێشکەش کرد بۆ یارمەتیدانی لێ قەوماوانی لافاوی (سلێمانی) بێجگە لەوە خانووەکەی خۆیشی بۆ ماوەی ساڵێکی خشت تەرخان کرد بۆ حەواندنەوەی شەش خێزانی هەژاری سلێمانی بەخۆڕایی، کە ئەوساکە کرێی ساڵانەی خانووەکە دەیکردە (٢٤٠) دینار.

ج- لە ساڵی ١٩٦١دا کچێکی داماو و لێ قەوماوی بێ باوکی چوار ساڵیی گرتە ئەستۆی خۆی کە بەخێوی بکات. تا بیست ساڵی خشت بەپەروەردەکردن و پێگەیاندنیەوە خەریک بوو، تا خوێندنی ئامادەیشی پێ تەواو کرد و کردیە فەرمانبەری میری لە فەرمانداریی خۆیی کوردستاندا.

د- لە ساڵی ١٩٦٠دا (١٧٠) کەس برا کوردەکانی ئێرانمان بەئاوارەیی لە دەست شاهی ئێران ڕەویان کرد

و هاتنە شاری سلێمـانی. خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کـورد، فریایان کەوت ( ١٣٠٠ ) دیناری بۆ کـۆکـردنەوە لەگـەڵ لیـژنەیەکـدا کـە پێکی هێنابوو بۆ ئەو مـەبەسـە، هەروەها چەند خـانوویەکی بەئاووکارەبای خۆڕاییەوە لە کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار بۆ وەرگرتن و دامەزراندن.

٧- هەروەها «پرۆژەی خوێندەواری کورد»، پاراستنی مـافی زۆر لێکراوانی کـوردی خسـتبووە ئەسـتۆی خۆی، چ بەدەم، چ بەپێنووس، چ بەخەبات و تێکۆشـان. لەسەر ئافرەتان و منداڵان، پەککەوتووان و وێژەوانان و، کارگەران و جووتیارانی کوردی دەکردەوە. هانەی کـاربەدەستانیشی دەدا بۆ دەسـتگیرۆیی و چارەکردنی گیروگرفتەکانیان، لە شێوەیەکی چاکە خوازانە و، دادپەروەرانەدا ئەمەیش لە چیرۆکەکان و وتارەکان و نووسراوەکانیدا دیارە بێجگە لە کردەوەکانی.

## بیروباوەڕی بوێژان و زانایان و ڕۆشنبیران بەرامبەر پرۆژەی خوێندەواری کورد

(١٤)

لەلایەن گـەلێک بوێژ و زانا و هونەرمـەند و ڕۆشنبیرانەوە نامەی ئافـەرین و پەسەن کـردن بۆ (پرۆژەی خوێندەواری کورد) هات و، لە گەلێک ڕۆژنامە و گۆڤاریشدا وتاریانم خوێندەوە. گیانی پاکی کوردایەتی و برایەتی و مرۆڤدۆسـتـیـیـان کـاریان تێ کـردم و تیـژیشـیـان کـردمـە سـەر پەرەپێـدانی بەرهەمـەکـان و گـەشـەپێکردنیـان هەندێ دەسگای ڕۆشنبـیـریش وەک (بەڕێوەبەرایەتیی خـوێندنی کـوردی) و (بەڕێوەبەرایەتیی گشـتـیی ڕۆشنبـیری و بڵاوکـردنەوەی کـوردی) و (ڕادیۆی کـوردی) و (تەلەڤـیـزیۆنی کـوردی) و (ئەمینداریتیی گشـتـیی ڕۆشنبـیری و لاوان) و (یەکێـتیی گشـتـیی ئافـرەتانی عێـراق) و (زانکۆی سلێمـانی) و (کـۆڕی زانیـاریی عـیـراق بەشی کـوردی) بێـجگە لەوەی پشـتـگیـریـان کـردم، فرمانیان بۆ پرۆژەکە پەیدا کرد و یارمەتیشیاندا.

لەبەر ئەوەی بەپێویسـتی دەزانم گوڵدەسـتەی سـوپاس و نەوازشم پێشـکەشی هەموویان بکەم. نامـەو وتارەکانی ئەو خوشک و برا بەڕێزانەم لە ناوازەگاهی نووسراوخانەکەمدا بەدەستی ڕێزەوە پاراستووە، تا لە ڕۆژی خۆیدا کەڵک لە بیرو باوەڕەکانیان وەربگیرێ، یاخود هەموویان بڵاوبکرێنەوە، بۆ کەڵکی گشتی لێـرەدا لەو بەڕێزانە داوای بەخـشین دەکـەم کـە ناوی هەمـوونامـە و وتارەکـانیـان بڵاوبکەمـەوە یاخـود ناوەرۆکـەکـانیـان پێشـکەش بکەم تەنیـا بۆ نموونە ناوی هەندێکیـان دەخـوێنمـەوە بۆ ئەمـەی خوێندەوارە بەڕێزەکـانمان ئاگـادار بکەم لە هەسـتی پاکی ئەو خـوشک و برا گـەورانە و ئەو دەسگا بەڕێزانە بەرامـبـەر پرۆژەکەیان:-

١- وتاری کاک فەتحوڵلا ئەسعد فەرمانبەرێکی نیشتمانپەروەر لە دادگاهی سلێمانیدا.

- ڕۆژنامـەی (ژیان)، ژمـارە (٥٦)، ڕۆژی ١٩٢٧/٣/٣- سلێـمـانی لە بابەت ( ٥٠ ) چامـەی دیوانی (مستەفا بەگی کوردی)یەوە کە بۆم کۆکردبووەوە و بۆم ناردبوو.

٢- وتاری سەید حوسێن حوزنیی موکریانی لە گۆڤاری (زاری کرمانجی)دا.

لەڕەواندز، ژمـارە (١١) ی ڕۆژی ١٩٢٧/٩/١٤. لە بابەت ( ١٥٠ ) چامـەی بوێژەکـانمانەوە و دوو

نووسراوی خۆمەوە کە بۆم کۆی کردبووەوەوە بۆم ناردبوو بەدیاری.

٣- نامەی محەممەد ئەمین زکی، مێژوونووسی بەناوبانگی کورد لە ڕۆژی ١٩٤٧/١٢/١٨دا، لە بابەت نووسراوانی (پرشنگ) و (شەبەنگە بەڕۆژ)ەوە.

٤- نامەی بەڕێوەبەری زانستیی ناوچەی کەرکووک ژمارە (٤٠٣/٢٨) لە ڕۆژی ١٩٤٢/١/٢٠دا، لە بابەت بەخشینی پارە و نووسراو و دیارییەوە کە پێشکەشی شاگردەکانی (خوێندنگای قادرکەرەم)م کردبوو.

٥- وتاری (دوکتۆر طه حسین)، وێژەوانی بەناوبانگی میسر لە گۆڤاری (الکاتب المصری)ی قاهرەدا، ژمارە (١٤) لە ڕۆژی -/١٩٤٦/١١دا لە بابەت وتارەکەمەوە کە لە گۆڤاری (الثقافة الحدیثة) کە لە (کاظمیة) لە ساڵی ١٩٤٦دا دەرچوو بوو و لە (ئافرەتی کورد) دوواپووم.

٦- نامەی مامۆستا (محەممەد عەلی عەونی) وێژەوان و مێژوونووسی بەناوبانگی کورد، لە قاهیرەوە، لە ڕۆژی ١٩٤٧/٦/٢٩دا، لە بابەت نووسراوی (پرشنگ)ەوە.

٧- نامەی مامۆستا (عەبدولمەجید حەسەن)، بەڕێوەبەری دەسگای زانستیی سلێمانی، ژمارە (٦٧٠٤) لە ڕۆژی ١٩٤٧/١٢/٢٧دا، لە بابەت نووسراوی (شەبەنگەبەڕۆژ)ەوە.

٨- وتاری دوکتۆر (محەممەد فائق ئەلجەوهری) لە گۆڤاری (الریاضة البدنیة)- القاهرەدا، ژمارە /٨١١ و ڕۆژ /١٩٤٨/٩، کە خاوەنی پەیانگای (وەرزش) و (پەروەردەکردنی لەش و هۆش و گیان)ە لە میسردا لە بابەت نووسراوی (گەورە پیاوان)ەوە.

٩- نامەی دوکتۆر (ناجی الاصیل)، بەڕێوەبەری گشتیی بەجێ ماوی کۆن (المدیر العام للأثار القدیمة)، ژمارە (٢٠٥٨/٢٥/١٤) لە ڕۆژی ١٩٥١/٩/١٦دا لە بابەت نووسراوی (ئاکرێ: عقرة)وە.

١٠- وتاری دوکتۆر (کامل بصیر)، ئەندامی کارا لە کۆڕی زانیاریی عیراقدا/ بەشی کوردی، لە ڕۆژنامەی (التآخي) ژمارە ( ) و ڕۆژی (١٩٦٧/١٠/٢٠)[1] دا لە بابەت نووسراوی (ئافرەتی کورد)ەوە.

١١- چامەی بوێژی نیشتمانپەروەر (میرزا سعیدی بەرگدروو) لە سلێمانی لە قەیسەریی وەسمان پاشادا، لە ڕۆژی ١٩٧٠/٢/١٨دا لە بابەت نووسراوی (یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی) ەوە.

١٢- نامەی مامۆستا (ئیحسان شێرزاد) سەرۆکی کۆڕی زانیاریی کورد و کاربەدەستی شارەوانییەکانی عێراق، ژمارە (٢٢٤) و ڕۆژی ١٩٧١/١١/٢٥ لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

١٣- وتاری مامۆستای نیشتمانپەروەر (مستەفا نەریمان) ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کورد، لە ڕۆژنامەی (العراق)دا ژمارە (٢٠٤)ی ڕۆژی ١٩٧٦/٧/٢١ لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

---

(١) ئەم بەروارە دەبێ هەڵەبێ، چونکە نە کۆڕی زانیاری کورد ئەوکاتە هەبووە و نە د. کامیل سەرۆکی بووە.

١٤- وتاری مامۆستا (عبدالستار کاظم)، نووسەری نیشتمان پەروەر و ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان لە رۆژنامەی (العراق) دا، ژمارە ( ) و رۆژ (١٩٧٧/٥/٢٦)، لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

١٥- وتارەکانی مامۆستا (عەلائەدین سجادی) لە (گۆڤاری نزار)دا: ژمارە (٤) ی رۆژی ١٩٤٨/٥/١٥ و، ژمارە (٦) ی رۆژی ١٩٤٨/٦/١٥ و ژمارە (١٩)ی رۆژی ١٩٤٨/١٢/٣١ لەبابەت نووسراوەکانی (پرشنگ) و (شەبەنگەبەرۆژ) و (گەورەپیاوان) و (هاورێی منال)ەوە، کە ئەو خۆی خاوەن و سەرنووسەری گۆڤاری (نزار) بوو.

١٦- نامەی خوالێخۆش بوو (سەعید قەزاز) لە رۆژی ١٩٤٧/٧/١دا لە بابەت نووسراوی (پرشنگ)ەوە، کە لە (کورت)ەوە ناردبووی ئەو دەمە ئەو پارێزگاری خاکی (کووت) بوو.

١٧- نامەی مامۆستا (رەفیق حلمی) لە رۆژی ١٩٥٦/٦/٦دا لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

١٨- وتاری مامۆستا (جەمیل بەندیی رۆژبەیانی) لە رۆژنامەی (ژین)دا، ژمارە (١٢٠٥)ی رۆژی ١٩٥٤/٧/١ ، لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

١٩- وتاری مامۆستای ئایینی (شیخ مستەفا قەرەداخی) لە گۆڤاری (سلێمانی)دا، ژمارە (٦)ی مانگی دەهەمی سالی ١٩٦٨ لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد) بەتایبەتی (پرسە هەلگرتن) کە نووسەر پێشنیازی بۆ کردبوو.

٢٠- نامەی خاتوو (مەنال یونس عەبدولرەزاق) سەرۆکی یەکێتی گشتیی ئافرەتانی عیراق، ژمارە (١٧٣٩/٢٣٨) لە رۆژی ١٩٧٨/٤/٨دا لە بابەت بایەخدانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە بە(کێشەی ئافرەتی کورد) لە سالەکانی پێش (١٩٥٠) وە هەتا ئیمرۆ (سالی ١٩٧٨).

٢١- نامەکانی پارێزگارەکانی (سلێمانی) لە سالانی (١٩٦٤-١٩٨٠)دا لە بابەت دیارییەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە کە بۆ نووسراوخانە گشتییەکانی (سلێمانی) و (چەمچەمال) و (هەلەبجە) و (رانیە)ی ناربوون.

٢٢- نامەکانی پارێزگارەکانی (هەولێر) لە سالانی (١٩٧٨-١٩٨٠)دا لە بابەت دیارییەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە کە بۆ نووسراوخانە گشتییەکانی (هەولێر) و (کۆیسنجەق) و (رەواندز) و (مەخموور)ی ناردبوون.

٢٣- نامەیەکی پارێزگای (دهۆک) لە سالی (١٩٧٨)دا لە بابەت دیارییەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە کە بۆ نووسراوخانە گشتییەکانی (دهۆک) و (زاخۆ)ی ناردبوون.

٢٤- نامەکانی ئەمیندارە گشتییەکانی کاروباری کۆمەلایەتی لە هەولێر لە سالانی (١٩٨١) و (١٩٨٢)دا لە بابەت دیارییەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە کە بۆ دەسگاکانی چاودێری کردنی (نەوجەوانان)و (کچان) و (دایەنگاە)کەیان لە سلێمانیدا ناردبوونی.

٢٥- وتاری دەستەی نووسەرانی (ڕۆژنامەی هەولێر) ژمارە (٢٢) ی ڕۆژی ١٩٥٢/٥/١٢ لەبابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

٢٦- وتاری مامۆستا (عەبدولباست یونس) خاوەنی ڕۆژنامەی (الفجر) لە (موصل)دا، ژمارە (٤٧)ی ڕۆژی ١٩٥١/١/١٩ لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە لە (ئاکرێ)دا.

٢٧- وتاری مامۆستا (فەریق عەزیز عەقراوی) خاوەنی ڕۆژنامەی (الایام)ی بەغداد، لە ڕۆژنامەکەیدا ژمارە (٣٠)ی ڕۆژی ١٩٥١/٩/١٩ لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

٢٨- وتاری مامۆستای خوێندنگای دووەمینی (موصل)، ژمارە (٩٢٠)ی ڕۆژی ١٩٥٠/١١/٣ لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە لە (ئاکرێ).

٢٩- نامەی سەرۆکی زانکۆی سلێمانی ژمارە (١٨٢٨٢/٤٤/٧)ی ڕۆژی ١٩٧٩/١٢/٣، لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

٣٠- وتاری (ڕۆژنامەی هاوکاری)، ژمارە (٥٠٢)ی ڕۆژی ١٩٧٩/١٢/٣، لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

٣١- وتاری مامۆستا (عەبدولغەنی عەلی یەحیا) لە ڕۆژنامەی (عێراق)دا ژمارە (١٨٨٦)ی ڕۆژی ١٩٨٢/٤/١٩ لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە، بەتایبەتی لە بابەت (پرۆژەی کۆگرەی منداڵان)ەوە.

٣٢- نامەی (جویس بلۆ) مامۆستای زمانی کوردی لە (زانستگای سۆربۆن)دا کە لە شاری (باریس) دایە، پایتەختی (فەرەنسە)، لە ڕۆژی ١٩٨٠/٩/١١دا لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

٣٣- نامەی دوکتۆر (جەمال نەبەز) مامۆستا لە (زانکۆی بەرلین/ بەشی کوردی) لە لە ڕۆژی ١٩٨١/١٠/١٤دا لە بابەت بەرهەمەکانی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە.

٣٤- نامەی (پارتی دیموکراتی کوردستان) لە بەغداوە، ژمارە (٥١١)ی ڕۆژی ١٩٧٩/١١/٦، لە بابەت نووسراوی (مێژووی پرۆژەی خوێندەواری کورد) و بەرهەمەکانی تری پرۆژەکەوە.

٣٥- نامەی مامۆستا (ئەحمەد شەریفی) لە شاری (مەهاباد)ەوە کە لە (کوردستان ئێران) دایە، لە ڕۆژی ١٩٧٩/٤/١٥دا لە بابەت نووسراوەکەمەوە (یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی) و بەرهەمەکانی تری (پرۆژەی خوێندەواری کورد).

# چیرۆک و پەخشان

## هاواری وەتەنە خۆشەویستەکەمان[1]

کوڕ: دایە چییە؟ ئەوەندە بۆچی ڕەنگ زەرد و عاجزی؟

دایک: ڕۆڵە بڕۆ هەقت چییە بەسەرمەوە، تازە خەبەرت بۆتەوە هەواڵم ئەپرسی؟

کوڕ: ئاخر بڵێم چی، ئەرێ وەڵلا تازە لە خەو هەستاوم، توخوا عاجزیەکەت چییە بیڵێ!

دایک: ڕۆڵەگیان هاوارە، بۆ خاتری شیری دایکت، هەموو ناو جەرگم سووتاوە. بووە بەکۆی زوخاڵ و جەرگم لەت لەت بووە ڕەنگم زەرد بوو، دڵم هەڵقرچا لەبەر بێ خوێنی و هەناسەم لێ بڕا، دەرگام لێ کەرەوە لەم ژووورە تاریکەم ڕزگارکە. هەر هیچ نەبێ مۆمێ، چرایەک داگیرسێنە و بەدۆزەرەوە لەم دەلیا تاریکە بێ بنەدا تا بتوانم بەری پێی خۆم ببینم، خۆم ڕزگارکەم لەمە.

تۆزێ هەناسە بدەم تا نەختێ خوێنەکەم سووربێتەوە، هەموو سییەکانم شەقار بووە لەبەر بێ هەوایی. ئاخ ئەم هاوارە هی سەد ساڵەمە لێت دەکەم، تازە خەبەرت دەبێتەوە؟

کوڕ: دایە لە قسەکانت نەگەیشتم، دەرگاکردنەوە و چراداگیرسان و جگەر لەتبوون و هەوا و هەناسەدان چییە؟ بەمعەمما پێم مەڵێ!

دایک: ئای ئای! ئەوە ئیشی ئەوەیە منت لەبیر ناکەومەوە، ئەگەر وانەبوایە من ئەمە سەد ساڵە هاوار دەکەم دەڵێم لە ڕێی خودادا دەرمانێ دەردمی بێ سارێژکەم!

کوڕ: دایە قسەکانت زەریفە! بەڵام بەکوردی پێم بڵێ، یەعنی بەبێ چاڵ و چۆڵ. دەرمانی دەردت چییە بیڵێ.

دایک: دەرمانی دەردم ئەمەیە وەکو وتم؛ لەم ژووورە تاریکە وەک (جهل) بێ کە ئەمە سەد ساڵە تیاگیرم خواردووە بەچرایەکەوە کە وەکو (معارف) بێ، بیهێنەرە ناوی و ڕووناکی کەرەوە، تا بەرپێی خۆم ببینم و خۆم ڕزگارکەم لە دەستی.

کوڕ: ئەی هەوا. هەناسەدان یەعنی چی؟

دایک: بەخوا بڵێم چی، ئەویش هەر معارفە معاریف، بۆنەی دەرهێنانی من معاریفە بووژانەوەم هەر معاریفە. یەعنی ئەگەر هەر لەم جەهلەدا بمهێڵینەوە دەمرم، زاتەن هەموو لەشیشم بووە بەداسک و دەرزی و گیانم تیا نەماوە، چونکە ئێستا ئەوەندە کاربۆنم هەڵمژیوە کە هەردوو سیەکانم خوێنەکەی لە بریتی ئەمەی کە سووربێ چونکە هەواکە کاربۆنە و ڕەشە، ڕەشی کردووە؛ ئەوەتا بووە بەکۆی زوخاڵ،

---

(1) ژیان، ڕۆژنامە، ژ ٥٢، ساڵی ٢، پێنجشەممە ٣ شوباتی ١٩٢٧، سلێمانی ل: ١ - ٢ (شاکر فتاح، هاواری وطنە خۆشەویستەکەمان).

ئەگەر بێتو بەهۆی چراکەوە کە (معارف)ە لە مێم دەرهێنی ئەوسا هەوایەکی ساف کە وەکو معاریف بێ هەناسە دەدەم، ئۆکجسینەکەی وەردەگرم، خوێنەکەم پێی سوور دەبێتەوە و خوێنەکە دەنێرم بۆ گشت لەشم تا هەرچی چڵکێکی کاربۆنە وەکو (جهل) بێ لەگەڵ خۆی بێنێ و بەهەناسەیەک فڕێی بدەمە دەرەوە، ئینجا ئەوسا قەڵە و دەبمەوە وەک جاران ڕەنگم سوور دەبێتەوە و دەتوانم لەناو هاوڕێکانما سەرهەڵبڕم.

کوڕ: معارف وەکو چی؟

دایک: بۆچی ڕۆڵە تۆش وەکو من پەردەی جەهالەت بەری چاوی گرتوی؟ ناوت نازانم هەر بەناو پێت دەڵێم. ڕۆڵە من ناوم (وطنە). ئەیکە لەبیرت نەچێتەوە.

کوڕ: ئەرێ بەخوا دایە! منیش لە (هیجران ئەمای تۆ)[2] لەم زیندانە قوڵە و لەم ژوورە تاریکە دای، پەردەیەکی ڕەش بەچاو و بەدڵما هاتووە و هەتاوەکو بەزمانیشما، ناوەکەتم لەبیر چۆتەوە، ناتوانم و زمانم گۆناکا هەر ناویشت بڵێم، پێی ناوێ ئەمنیش ناوم (میللەتە).

شاکر فەتاح

ئەمە یەکەم بەرهەمی ئەدەبی و هونەری مامۆستایە کە لە (ژیان)دا لە شوباتی ١٩٢٧ بڵاوی کردۆتەوە... پارچە پەخشانێکی هونەرییە، بەڕێنووسێکی ئەو سەردەمە نووسراوە و ئێمە بۆ زیاتر تێگەیشتنی خوێنەر گۆڕیومانەتە سەر شێوەی نووسینی ئێستا.

نووسەر هەوڵی زۆری داوە خۆی لە وشە بیانییە باوەکانی ئەو سەردەمە ببوێرێ و بەرهەمەکەی تازە گەریەکی پێوە دیاربێ، چ لە شێوەی داڕشتن و سەبکدا و چ لە جۆر و بابەتی ناوەرۆکدا.

بەڵام لەگەڵ ئەو تەقەللایەشدا (ناچار) هەر پەنای بۆ زۆر وشە و زاراوەی بەکارهاتووی ئەو سەردەمە بردووە.

لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە هەرچەند تەوەرەکە باوی ئەو ڕۆژانە بوو، (نەخوێندەواری و نەزانین)؛ زۆربەی شاعیران و نووسەرانی ئەو کاتە بەدەوریدا بابەتەکانیان خولدەدا، بەڵام مامۆستا ویستوویە لە بەرگێکی تازەی (زانست ئامێز)دا باسەکە بخاتە ڕوو، هەروا هێماو ڕەمز لەو بابەتەدا بەکاربێنێ (بەڵام لەم لایەنەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە چونکە هەر خۆی گرێی ڕەمزەکانی کردۆتەوە و لە ڕێڕەوی خستنەڕووی باسەکەیدا بەوشە و دوو وشە لێکی داونەتەوە):

(لەم ژوورە تاریکە وک -جهل- بێ... بەچرایەکەوە کە وەکو -معارف-بێ... هەوایەکی ساف کە وەکو -معارف-بێ... هەرچی چڵکێکی کاربۆنە وەکو -جهل-بێ... دایە. ناوەکەت چییە؟ -ڕۆڵە من ناوم- وطن-ە.... کوڕ: ئەمنیش ناوم -میللەت-ە).

ئا بەم شێوەیە نووسەر گرێ و هێماکانی بۆ خوێنەر حەل دەکا و دەیانکاتەوە، لە کاتێکدا وا شیاوتر بوو

(٢) لە نەسڵەکەدا وا چاپکراوە: (... لە هجرانی امای تو لم زندانە...).

کە لە سیاقی خوێندنەوەی بابەتەکەدا خوێنەر خۆی بگەیشتایە ئەو ئەنجامە... بەڵام خۆ دەبێ بار و ئاستی رۆشنبیری و دەرککردنی خوێنەری ئەو رۆژانەش لەبەرچاوگرین.

خۆ بەکارهێنانی ئەو رووپۆشە زانستییەش ئەوە دەگەیەنێ کە نەوەی تازەپێگەیشتووی دەرچوو لە قوتابخانە رەسمییەکاندا، مێشک ئاودراو بەزانیاری زانستی سەردەمەکە، دەبێ بەرهەمەکەی ئەو تازەگەریەی تێدابێ.

(مرۆڤێکی گیرخواردوو لە دەوروبەرێکی داخراوی تاریکدا و، هەوایەکی پیسی تێربوو بەکاربۆن کە ژەهرێکی راستەوخۆیە بۆ کۆئەندامی هەناسەدان و لەوێشەوە بۆ خوێن و دواجار ئەندامەکانی تری لەش...)

لەمەیاندا دەتوانین مامۆستا دانێین بەخاوەنی دەستپێشکەریەک لە رەخساندنی بابەتی زانستی وەک (راستییەکی موجەرەد) و بۆ بەرهەمێکی هونەری ئاراستەیی.

## (ئاینده) له چیرۆکێکدا...

کە مامۆستا قوتابی پەیانگەی بروممانا دەبێ بۆ زمانی ئینگلیزی، لە لوبنان، ساڵی ١٩٣٢، لە یادنامەکەی ئەو ساڵەیدا، بەبەرواری ٩/١/١٩٣٢ دەنووسێ:

(خوا هەڵناگرێ سەر مامۆستاکەمان و ئەوانی تریش لە ئینگلیزیدا زۆر لەگەڵمان خەریکن، بەتایبەت نووسین و هەڵبەست.

«میستەر ناش» لە سێ شت کە بۆ ئینشا دابووینێ یەکێکیان ئەمە بوو: باسی ئەو شتانە بکە کە لەناو ساڵی ١٩٥٠ و ساڵی ٢٠٠٠دا دادەهێنرێن.

منیش ئەمەم بەشتێکی زۆر خۆش هاتەپێش لەبەر ئەوە هیچیانم نەنووسی ئەمە نەبێ.

ناش کە خوێندیەوە گەلێ چاکێتی و خۆشێتی (شتە داهێنراوەکانی) پێشاندا، بەڵام گوتی: لە تاقیکردنەوەدا ئاگات لە خۆتبێ قسەکە مەخەرە ناو دوو کەسەوە. هەر لە خۆتەوە قسەیان لێبکە.

چونکە من بیرەکەم وا پێشاندابوو کە دوو کەس (رۆستەم و بارام)، لە کوردستانەوە بەفرۆکەیەک کە بەئەلەکتریک دەروا بەشەش سەعات دەگەنە (نیۆیۆرک)، خواردنیان بۆ ئەو رۆژە درێژە (سێ دەنک چێشت دەبێ)، لە رێ کە بەسەر بۆداپێستا(*) تێپەر دەبن، دەبینن هاوینە. کەچی بەمەکینە باران لە ئاسمان دەهێننە بوون. لەناو دەریای ئەتلانتیکدا چەند کەسێک دەبینن بەرووتی بەپێوە بەسەر ئاوەکەوە یاریدەکەن، پێتاوێکی کەشتی ئاساییان لە پێدایە، لە ژێریانەوە لەبنی دەریاکەدا کۆشکێک هەیە خەڵک کە لە ئەمریکا و ئەوروپاوە دێن لەوێ لادەدەن.

پاشان نزیک بەئەمریکا بەناوچەی (پاپۆرە ژێر ئاوینەی)[1] ئەمریکا دەگەن، کە ئەویش خانوویەکی گەورەیە لە بنکی دەریاوە.

---

(*) بۆداپست: پایتەختی وڵاتی مەجەرستان: هەنگاریایە.

(١) تحت البحر (ش. ف.)

لە نیـویۆرک بەئاسـمـانەوە خـانووی (شێـر و پاشـا)[1] دەبینین کـە لەلایەن (حکوومـەتی یەکـبووەی کوردستـان Unitedstate of Kurdis)ەوە نێرراوە تا فەننی خانوو دروسـتکردنی کورد لەو (وێنەگاھ - معرض)ی عالەمەدا پێشان بدا.

کە دادەبەزن، دەچن ئەو لەشە چڵکنەیان بەتیشکی ڕۆژ کە بەسایەی مەکینەیەکەوە وای لێدەکرێ پیاو پاک بکاتەوە، لە خـانوویەکی شـووشـەدا خـۆیان پاک دەکـەنەوە. چای ئەو ڕۆژەیان بەسـایەی (پرێمـزی تیشکی ڕۆژ)ەوە دەکوڵێنن.

ئەو شـەوە لە هەمـوو ئەمریکادا زەماوەندی یادکـردنەوەی (ئەدیسـۆن) دەبێ. لە ئاسـمـاندا پەردەیەکی سینەمایی گەورە بەسایەی غازەوە دروست دەکرێ، وێنەی سێ دووریی تیا دەبینرێ.

کـە پیـاو لێی تێک دەچێ بزانێ ئەمـە سـینەمـاییـە یاخـود پیـاوی ڕاسـتـەقـینەن لەوێدا یاریی دەکـەن. سینەماکەی ئەمەندە گەورە دەبێ هەموو ئەمریکای ژوور و چاویان لێدەبێ.

بەیانی (بارامیان) لە ڕۆژنامەی قسـەکـەردا هەواڵ دەخوێنێتـەوە، لەگەڵ ژنەکـەیا (مـێردێ) بەتەلەفـۆنی وێنەگر قسە دەکا. کوڕەکەی هۆمـەر) بانگ دەکەن، خۆی پێشـاندەدا، کـوڕەکەی گوێی لە جووڵانەوە و گۆرانی باوکی دەبێ، هەتاوەکو چاوی لەو پۆلە مەلانەوە دەبێ کە بەئاسمانەوە دەبن؛ بەباوکی دەڵێ: بابە بەباڵەکانتەوە بفرە ئەوانە مەلن، لە بیرت نەچێ لەگەڵ ئەو مەلانەدا (نووسراوەیەکی گۆرانی قسـەکەرم) بۆ بێنی. ئێستە خوا ئاگادارتبێ بفرە، بەڵام بەیانی چێشتەنگاو نان ناخۆم هەتا تۆ نەیەیتەوە).

***

زۆر بەداخەوە، هەرچەندە لەناو نووسراو و پاشماوەکانی مـامۆستادا گەڕام ئاسەوارێکی یا دەقی ئەسڵی ئەو نووسـینە (چیرۆک)ە سەرەتاییەی نووسینی مـامۆسـتـا نەدیەوە، کە بەگێـڕانەوەکەی خۆیدا دەردەکەوێ دەقی چیرۆکێکی ئەندێشـاوی زانستییە، نووسـەر جڵەوی خەیاڵی خۆی بەفـەزایەکی فراوان و بەربڵاودا بەرەڵڵا دەکات، هەموو ئەو پێشهاتانەی باسیان دەکات لە ڕۆژی ئەمرۆماندا هاتونەتەدی.

ئەم جۆرە نووسینە پێشبینی ئامێزەی مامـۆستا، پڕاوپڕ چیرۆکێکی بیری زانستییە (الخیال العلمي) کە لەو سـەردەمـەدا ئاوا پێشـبـینی داهاتنی ئەو جۆرە ژیانەی لە نێـوان سـالانی ١٩٥٠ - ٢٠٠٠دا کردووە؛ کورتکردنەوەی ماوەی نێوان کوردستان و نیویۆرک بۆ شەش سەعات، بارانی دەستکرد، خلیسکان بەسەر ئاودا، کـە ئێـسـتـا وەرزشـێکی باوی بەربڵاوە، ژیان لەژێر دەریادا، حکوومـەتی یەکـبووی کوردسـتـان - هەرچەندە حکوومەتەکە یەکبوونییە! بەڵام بەشێکی خەونەکەی هەر هاتۆتەدی-، بەکارهێنانی تیشـکی خۆر وەک وزە یا بۆ چارەسەرکردن،ساڵوگەڕی ئەدیسـۆن، پەردەی سینەما یا (شاشە)یەک کە وێنەکان سێ دووری (الأبعاد الثلاث)یان هەبێ کە ئەمە وێنەی بەرجەستە (مجسم)ە ئێستا هەیە، ڕۆژنامەی قسـەکەر و چۆن بارام باوکی تیـا دەبینێ و هەروا باوکـیـشی کـە دەقـاودەق ئەمـە (ئەنتـەرنێت)ی ئەمـڕۆیە، (نووسراوەی گۆرانی قسەکەر) کە پێشبینیە بۆ (CD کاسێت)ی ئێستا.

---

(١) ئەو خانوو لە کوردستانەوە گوێزراوەتەوە ئەمریکا (ش. ف.).

بەڕاستی بەم بەرهەمەی مامۆستا کە بەداخەوە هەر لێرەدا باسی دەکات و دەقەکەیم لەناو کتێبەکانیدا چاو پێنەکەوت، دەتوانین دانێین بەیەکەم چیرۆکنووسێکی کورد کە لە بواری بیری زانستیدا نووسیویە و زۆربەی بۆچوونەکانیشی ئەمڕۆ هاتوونەتەدی.

## ئاواتی دڵ

«گەشتێک بەسەر باڵی پەرندەی خەیاڵەوە»

(لە ڕەشەمێی ۱۹۳۳دا نووسراوە لە ۲ی نەورۆزی ۱۹۳۳دا لە سلێمانی لە ڕۆژنامەی -ژیان-دا لە چاپ درا. سلێمانی)

لە پاش ئەمەی زەمین بەباری خۆیا سوورا...

لەپاش ئەمەی تیشکی ڕۆژی ڕاستیی تاریکیی پێچوپەنای زەویی بۆ ڕووناک کردەوە...

لە پاش ئەمەی لەسەر باڵی پەرندەی خەیاڵم فڕییم. ئاسمانێکی بێ پایانم بڕیی، ئینجا دابەزییم، بەخوام سپارد و بەجێم هێشت...

لەو کونەوە بەسەربەرشتیی ڕووناکیی ڕۆژی ڕاستییەوە بەو ڕێگا چاڵوچۆڵەدا ڕۆیشم...

لە ڕێگادا تەماشای ئەم لا و ئەولای خۆمم ئەکرد...

لە ڕێگادا شتی وام ئەدیی سەرم سوور ئەما، واقم ورئەما!.

ئینجا کە لە کون و قوژبنی ڕاستەقینەی زەوییدا کنەم کرد و باش ئەم لا و ئەولایم پشکنی...

ئینجا کە لە بنوبنچینەی کردەوەکانی نەوەی ئادەم گەیشتم و تاقیم کردنەوە...

هاتمەوە بەر دەرکی کونەکە... دەمێکی دوور و درێژ مات و بێ دەنگ ڕاوەستام... پاشان ئاهێکی ساردم هەڵکێشا و سەرم هەڵبڕی ڕووم کردە ئاسمان چەندێک لە ئەستێرەکان وردبوومەوە:

سەرنجم دایە کردگاری دەستی پەروەردگار...لەبەرخۆمەوە ئەمگوت:خوا!... ئەبێ ئەستێرەکانی کە وابن؟!

گوایە مەبەس لە دروستکردنی ئادەم: خستنەوەی ئەم تەرحە گیانلەبەرانە بوو؟

گوایە ئەم جوانییەی گەردوون، ئەم خاکە زێڕینەی زەمین، ئەم هەموو گوڵ و نەستەرییانە، ئەم هەموو میوە و میوەهاتە و ئەم هەموو دڕندە و پەڕندانەت بۆ داناون...

ئەمانەت هەموو بۆ خۆشی و دڵشادیی ئەوان دروست کردووە... ئەمانەت هەموو بۆ تێربوونی سکی ئەوان هێناوەتە بەرهەم...

گوایە هێشتاش: ئەبێ بەرچاو تەنگ بن؟

لەسەر پارووبەک بەگژیەکدا بچن؟

لەسەر بستێ زەویی چاوی یەک دەرهێنن!؟

قەلاچۆ لەیەکتر بخەن...؟!!

***

منیش هێشتا رووم لە ئاسمان بوو، هەرچەند بیرم ئەکردەوە و سەرم ئەهێنا و سەرم ئەبرد لە سەرەوکاری ئەمە نەئەگەیشتم! بەڵام پەرندەی خەیاڵم وەک ئاگای لەم کەینە و بەینەیە بووبێ و ویستبێتی ئەوەندە بەمەوە خەریک نەمێنم، زوو کارێکی وام بۆ بکا ئەمەم لە دڵا بەگرێ نەمێنێتەوە لە پڕ دای لە شەقەی باڵ و لەبەر دەما وەستا و پێی گوتم:

«وەرە سەر باڵم بتگەرێنم، هێشتا تینم تیاماوە، شوێنێک هەیە ئەیزانم، مەگەر هەر ئەو شوێنەبێ ئەمەت بۆ دەرخا، هەر ئەو شوێنەشە...».

بەڵام هێشتا ئەو لە قسەی خۆی نەبووبووەوە من گوتم:

«ئەوێیش بارەگای پەروەردگارە... بابڕۆین».

***

کە گەیشتینە بارەگای پەروەردگار، تەماشام کرد ئاسمانێکە فراوان، بێ پایان...

لەو لەشە تیشکینیەی فریشتانەی خوا بەولاوە هیچیکەی تیا هاتوچۆ نەدەکرد هەر فریشتەیە سەرسامی کردەوەیەک بوو!

- کردەوەی نەوەی ئادەم-

هەر فریشتەیەک ئەهات لە زەمینەوە ئەهات... وەک تێسکەی تفەنگ ئەو ئاسمانە بێ پایانەی ئەبڕی...

وەک ڕۆژی ئاگرینێ ئەو ناوەی ڕووناک ئەکردەوە...

هەریەکە دڵ بریندارێ بینینی کردەوەی بەدی کوڕە ئادەمێک بوو!

وەک گەوهەری شەوچرا هەر هەناسەیە پۆلێک ئەهاتن... بەهەزاران... بەملیۆن...

پۆلێک فریشتە: هەموو گریان و هاواری بێ کەس و هەژارانی سەر زەمین یان هێنابووە بەر تەختی پەروەردگار...

***

ئەو ئەستێرە بێژمارانەش کە لەو ناوەدا خولیان ئەخوارد، بەفەرمانێک کە لە تەختی ئاگرینی پەروەردگارەوە ئەهات: هەموو هاتبوونەتە جۆش، هاتبوونە خرۆش...

ئەوانیش هەریەکە هەواڵێکی ناخۆشیان پێشان ئەدا، هەواڵێکی ناخۆشی سەر زەمین.

هەموو یا باسی مردن بوو، یا کوشتن بوو، یان سەربڕین...

***

لە پاش کشانی ئەو ئەستێرانە: بەهەزاران گیانی گیانلەبەران، لە زەوییەوە ئەهاتنە ئاسمان...

ئەیان زریکاند، ئەیان قیژاند، ئەیان ناڵاند...

لەبەر تەختی ئاگرینی پەروەردگارا ئەلالانەوە: چەشنی مەرێکی بێ زمان، چەشنی باڵدارێکی بێ تاوان...

یەکی ناڵەناڵی نەخۆشی لە برسا مردنی بوو...

یەکێ شین و زاریی کوڕە کوژراوی بێ تاوان و کچە مردووی بەسەزمان و هەتیوباریی بوو...

یەکێ لەبەر سەرما و ڕەشەبا و بەفروباران: چرقەچرقی دانی بوو...

یەکێ ئاهە ئاهی ناخۆشیی ناو زیندان -زیندانی دەستی دەم بەدان و بەدانوانی بوو...

یەکێ دڵشکاوی ڕوو هەڵماڵراوی ژنان و گەورەکچانی بوو... یەکێ هەناسە ساردی ڕەنجەڕۆیی کار و فرمانی بوو...

یەکێ خەفەتباری دووریی لە کەسوکار و ئاوارەیی لە وڵاتی بەناوبانگی بوو...

یەکێکیش ناڵە ناڵی زۆرکردن و دەستبەسەریی و بێگاری دەستی گەورانی بەدکارانی بوو...

***

ئیتر من حەپەسام، برستم برا، نەمئەزانی بەکوێدا بڕۆم و بەکوێدا دەرچم، لەهەرلایەکەوە ئەمڕوانی:

بروسکەی ناڵە ناڵێک بوو...

لەهەر شوێنێکەوە سەرنجم ئەدا:

ڕەشە دووکەڵی ناخی دەردی دەروونێک بوو ئەچوو بەئاسماندا...

بۆ هەر کوێیەک ڕووم وەرئەگێرا:

کڵپەی ئاگری ئاهی سک سووتاوێک بوو...

بۆ هەر شوێنێک ئاوڕم ئەدایەوە:

شریخە و زریکە و هاواری دڵ داخورپاوێک، سەربڕاوێک بوو...

لەهەر لایێ گوێم ئەگرت:

قیژە بوو، زریکە بوو، ناڵەناڵ بوو، ئۆف و ئاخ بوو، شیوەن و قوڕپێوان بوو!

جاربەجارێکیش کە قینی خوایی ئەهاتە جۆشی: بروسکەیەکی ئەدا ئینجا هەورە تریشقەیەک دەستی پێ ئەکرد؛ لەهەر چوارلای ئاسمانەوە دەنگی ئەدایەوە. پاشان هەر ئەوەندەت ئەزانی ئاگرێکی بێ سامان لەسەر زەمینەوە کڵپەی ئەکرد، گڕی ئەگەییە کەشکەشان... بەجارێ ماڵی هەزاران گوناهبارانی وێران ئەکرد...

بەهەزاران خانوومانی تێک ئەدا...

بەملیار شارانی نوقمی ئاو ئەکرد... وڵاتی سەرەوژێر ئەکرد!

***

ئیتر ئەوەندەم نەمابوو زادەترەک ببم، بەجارێ هێزی ئەژنۆم شکا، بەتەرحێک داچڵەکیم ئەمگوت: «ئەوا بەندی جەرگم بەربووەوە» موچوڕکی وام بەلەشا ئەها: لە تەوقەسەرمەوە ئەڕۆیشت و لەگەڵ ئەموستی پێمەوە ئەچووە دەرەوە!

***

لەگەڵ ئەوەشا پەرندەی خەیاڵم لەو جێگا سامدارەی ڕزگار کردم و بردمیە ئاسمانێکی بێ پایانی کەوە...

بەهەموو کوڵی دڵمەوە ئەمگوت:

«تووبی خوا ئەگەر بمبەیتەوە سەر زەمین!

«بێشەڵستانی نێش و ئازار... جێی گوناهکاران، دەشتی کوشتار...

«بام لەم گوڵستانی گیانانەدا وەک مەلێکی ناوچەوان بەرز و سەر ئازارە بژیم... دووربم لە ئاگرستانی لەشداران...»

***

بەڵام هێشتا لە قسەکەم نەبوو بوومەوە، شریخەیەک هات: لەخەو و خەیاڵی کردم، گەزێک بەئاسمانیا بەرزکردمەوە، کە ڕوانیم:ئەوا لە زەمیندا... ئەوا لە نزیکەوە کوڕە ئادەمێک لەسەر دۆڕاندنی مشتە دراوێک برایەکی خۆی داوەتە بەر دەمانچە! لە کاژەڵەی سەری دابوو، گیانی لەلەشی جیا کردبووەوە!!

## ژینێکی بەرز[1]

### نموونەی کوردی پەتی

(سکاڵای پیرەمێردێکی بەختیار)

گوڵچین کچە جوتیارێکە، لەگەڵ ئەوەشا من لام لە کچە شایەک گەورەترە، لە پەرییەک جوانتر، لە فریشتەیەک نازەنینترە!

گوڵچین منی بەدڵا چووم[2]:

چونکی من شارییەکم سەر و سامان و خانمانم هەیە. منیش ئەوم بەدڵا چووە، چونکە ئەو لادێکە[3] ئازا و دڵپاک، کچە خانێکە سەربەست، سڵ لە کەس ناکا!... لەبەر ئەوە کە سەری دۆستایەتیمان بەست... دەمێکی دوور و درێژمان پێکەوە ڕابووارد... لەو دەمەدا ئەو حەزی لەوەم کردبوو، کە چەشنی پەروانە بۆی سووتابووم لەگەڵ ئەوەشا لە داوێن پیسی خۆم دوور ئەخستەوە، بەچاوی دۆست تەماشام ئەکرد... منیش حەزم لەوەی ئەو کردبوو کە هە چ هەلێکی بۆ هەڵکەوتایە، کار و فرمانی خۆی بەجێ نەهێشت و ڕای ئەکردە لام، قسەی خۆشی دڵپاکانەی لادێیانەی[4] بۆ دەکردم، کە لە شارەوە ئەهاتم دیاری متومور و ئاڵووالام بۆ دەهێنا، ئەویش کە ئەهاتە شار نۆبەرەی ڕێواس و گێلاس، گوڵ و گوڵەباخ، هەنجیر و ترێی بۆ ئەهێنام...

---

(١) دیاری لاوان؛ بەغدا ١٩٣٤، ل ٧٩ - ٨٥.

(٢) ڕاستتر: منی بەدڵاچووبوو

(٣) ڕاستتر: لادێیەکە

(٤) لادێییانەی

ئەمبیست لەهەر شوێنێک لێم ئەدوان لەسەر ئەکردمەوە، ئەویش ئەی بیستەوە، هەر لایەک ئەچووم پاکی و بێ باکی و لەش سووکی ئەوم ئەگێڕایەوە، لەبەر ئەوە ساڵ تێ وەرنەگەڕایەوە تیشکی دڵخوازی دڵی هەردکمانی ڕووناک کردەوە، ئەوی بەبیری منا ئەهات بەبیری ئەویشا ئەهات! کە نیازی چوونە لایم ببووایە ئەو شەوە خەوی پێوە ئەدیم.

هەرچیم بویستایە بەهی خۆی ئەزانی، هەرچیش بەدڵی ئەوا بچوایە بۆم پەیدا ئەکرد...

لەمنەوە ڕەنجدان بوو، لەویشەوە پێزانین، لەمنەوە دڵسۆزی بوو، لەویشەوە پەیمان ڕاگرتن، لەمنەوە ئازایی بوو، لەویشەوە سەربەستی، خۆشیم خۆشی بوو، تاڵیم ترشی، ئەوی من حەزم لێ ئەکرد ئەو ئەوەی پەسەند ئەکرد...

بەکورتی دوولەش بووین: و گیانێک، دوو سەر بووین و هۆشێک، دوو سنگ بووین و دڵێکمان هەبوو!

ئیتر وەکو لە خواییەوە خرابێتە دڵمانەوە، هەردووکمان دڵمان ئەخرۆشا!!... بۆ ئەوە ئەخرۆشا! ببینە جووتێک ژیانمان پێ برازێنینەوە، ئەو ببێتە گوڵێک لەشەوا بگەشێتەوە بۆن ببەخشێ، منیش ببمە بلبلێک بەڕۆژیش بەسەر چڵەوە بەدیارێوەبم!

کار وابوو هەر ئەمەندەی مابوو لە دەم بترازێ!...

ڕۆژێک لە ڕاو ئەهاتمەوە، وەک ڕۆژان بەگوێ چەمەکەدا ڕۆیشتم، کە لام کردەوە، دیم گوڵچین گوڵی ئەچنی... کە دیی هات بەپیرمەوە، دابەزیم کەروێشکەکانم دایە، ئەویش دەسکە گوڵێکی ڕەنگینی دامێ... دەستە ناسکەکانیم گوشی و چووینە بن دارسێوێکەوە، لەسەر سەوزەگیاکە لە گوێ چەمەکە دانیشتین، تەماشای وێنەی یەکترمان لە ئاوەکەدا ئەکرد.

ڕۆژ تارایێکی زێڕینی بەسەر ئەو دار و درەختانەدا دابوو، شەماڵ شنەی ئەکرد، لقی دارەکانی ئەشەکانەوە، ورشە ورشی بەگیا خستبوو، ئەو چەم و ئاوە بلورینەش بەسەر ئەو بەردانەدا تافە تافی ئەکرد،... چاوئەندازەی ڕازاوە بوو، گەورەیی و جوانی بەهاری دەردەخست، نموونەیەک بوو لە دەستکردی دەستی پەروەردگار.

وتم گوڵچین! وتی بەڵێ، وتم: تەماشای دەسم کە، ئەم گوڵەباخە بۆ تۆ، ئەو لاولاوەش بۆ من، سەیرکە ئەم چەمە چەن ڕوون و پاکە، سەیرکە ڕۆژ چەن ڕووناکە، سەیرکە بلبل لەسەر چڵ بەسەر گوڵدا ئەخوێنێ، چڵی ژیانم تاقە گوڵێکی پێوەیە، ئەویش تۆی، منیش بلبلێکم بەسەریەوە بۆ تۆ ئەخوێنم... لە جیهاندا ئەگەر تاقە گوڵێکی گیان بەخش ببێ ئەوە تۆی، منیش لاولاوێکم بەدەورتا ئەگەڕێم و هەڵ ئەگەڕێم، لە دەردی دەوروپشتت ئەپارێزم! تا ئێستا پاکی دۆستایەتیمان لە دەروونی ئەو چەمە خاوێنتر بووە، لەمەودواش زیانی دەستگیرانیمان لە تیشکی ئەو ڕۆژە جوانتر، ڕۆشنتر، زێڕینتر ئەبێ!

«ئێستا من حەزت لێ دەکەم» کچەیش لە پاش تاوێک بێ دەنگی، دەستی خستە دەستمەوە و کەمەکێ بەو چاوە نێرگسانە تێم وردبووەوە... ئینجا بەو دەمە نوقڵییوە وتی:

«منیش... حە... زت... لێ... ئەکەم» ئیتر قسە هەر ئەوەبوو، دەستم بەسرا، ورتەی نەما، چاو و لێو کەوتنە قسەکردن.

***

مەلا کاری بۆ سازاندین، ئینجا نۆرەی شەوی پەردە بوو.

ماڵمان باخ، ژوورمان ژێر چنار، قاڵیچەمان سەوزەگیا بوو... بۆن و مێخەکمان گوڵەباخ، گۆرانیبێژمان بلبل و قومری، ساز و سەمتورمان دەنگی قاز و قولینگ، تافە تافی تاڤگە حەوزەی ئاو، ورشەی گیا، دەنگی شکانەوەی لقی عەرعەر بوو... چراخامان مانگ و ئەستێرە بوو، باوەشێن کەرمان لقی شۆڕەبی بوو. بێ دەنگی هەموو لایەکی داگیرکردبوو. کەس لەوێ نەبوو ئێمە نەبین[1]. لە زەریای دڵداری بێگەردا نقوم بووین، نووستین تا بەیان... ئێستەیش... ئەوا پیر بووین، دامان کەل بوو، سەرمان سپی بوو، پشتمان کۆمایەوە، لەگەڵ ئەوەشا تا ئێستا ناخۆشێکمان نەکەوتۆتە ناو، نە ئەو بەتۆراوی باوانی خۆی دیوە، نە منیش بەسەرزاری و پاشملە سەرشکێنەی ئەوم کردوە و لێی دوام، هێشتا هەر دۆستە خۆشەویستەکانی جارانین، ئێستەیش حەزم لێ ئەکا و کاری یەکتر شەوانی پایزمان بەئاهەنگ ڕۆژ ئەکردەوە، ڕۆژانی بەهاریشمان بەسەیران ئاوا کردەوە و لەم دەمەدا لە زستانا بەلای ئاگری نێڵەنێڵی کورەوە دڵمان بەئاوازی ساز و سەمتوری مناڵەکانمان ئەکردەوە، لە هاوینیشا چاومان بەیاری و گەمەیان ئەگەشانەوە. ئیتر بەختیاری ئێمە بەسە کە لە ماڵمانا ناوی دش و هێوەرژن[2] نەبووە، لە دەریشەوە ناوی

---

(١) وا دیارە مامۆستا لە چاپی (یادگاری لاوان)دا دوای ئەم ڕستەیە ئەو بەشەی لە دەسنووسی (خۆشخوانی)دا کە ساڵی ١٩٣١ نووسیویە، لای بردووە، هەر بۆ ئەمانەت، وا لێرەدا دەینووسینەوە: «چووینە سەر جێگایەکی سەوزەگیای نەرمان دانیشتین، بەدەستێکم ئەو قەدە عەرعەرەیم گرت. دەستەکەی تریشم خستە سەر ئەو شانە نەرم و شلەی. بەلەشم ئەو لەشە بلوورینییە گەرم و نەرمەیم پێوا... ئینجا (هەناسەکەم زولفەکەی لادا) و دەمم خستە سەردەمی. ئینجا لە درزی لێوەوە گیانم ناردە کن دڵی. ئینجا دەم بەسترا، زمان پەکی کەوت...» ئینجا چاو و لێو، لەش و هۆش دەستیان کرد بەقسەکردن. «شەوبۆی سەری سونبولی زولفی لەسەری دام»، مەستی کردم لەشم فڕیی، هۆشم چوو، تا خەوم لێکەوت. لەگەڵ ئەو لەشە تەڕ و پڕە خڕ و پڕە، ئەو سنگ و مەمکە نەرمۆڵە، لەگەڵ ئەو چاو نێرگسەی لێو ئەتڵەسە، بەبەرچاوی تریفەی مانگەشەو و جریوانەوەی ئەستێرانەوە، لەبەردەمی چریکەی بلبل و گەشانەوەی گوڵا، بەتەنشت خوڕەی ئاو و هاژەیەوە، لە ژێر شنەی گەڵای درەخت و لەناو ورشەی گیادا تا بەیان نووستم».

ئەم بەشە لە بڵاوکردنەوەکەی یادگاری لاواندا لابراوە، دیارە لەو ڕۆژەدا ئەم دیمەنە تا ڕادەیەک سێکسییە ڕۆمانسیانەیان بەلاوە باش نەبووە، بۆیە گۆڕیویە بەو دێڕەی لە دواییدا نووسیویە: «لە زەریای دڵداری بێگەردا... تا بەیان). هەر لەو دەسنووسەیدا مامۆستا ئەم بەروارەی لەسەر داناوە:

(سلێمانی: ١٩٣٣/٤/٣)

(٢) دش: بەمانا خوشکی مێرد. هێورژن: هێور؛ بەمانا براژنی مێرد یا دوو بووک مێردەکانیان برابن یەک هێوەری ئەوی ترە.

بێگانه و خزمان نەزانیوه...

خواش بەو سەرەوه ئاگاداره کە دڵ و دەروونی ئێمه لە ئاوێنەی کردەوەی منالەکانمانا دیاره:

شێرۆیان -دڵنەرمی و لێ بووردنی و نازکی و ڕێکوپێکی لە دایکیەوه. لە منیشەوه ڕاستگۆیی و پەیمانداری و ئازایی و ڕاستیی و ڕەوانی فێر بووه- بێ گومان ئەویش سبەی ڕۆژ لەگەڵ هاودڵی خۆیا وا ڕێک ئەبێ...

خۆشە بۆ ئێمە کە کزەی جەرگی خۆمان ئەبینین لە خۆمان ئەچێ. بۆ کاروباری کۆمەڵ و نیشتمانەکەی ئەکۆشێ، دڵی ئەم و ئەو ڕائەگرێ، زانین بڵاو ئەکاتەوه، بەبێکەس و هەژاران ئەخوێنێ. دەرمانی دەردی بیماران ئەکا...

وا دیاره شێرۆش وەک پێشووی من. بای دڵداری دڵی باوەشێن ئەکا، هەڵبەت فریشتەی حەز لێکردن بەگوێیا چرپاندووه. ئاخۆ حەزی لە کێ کردووه... حەزی لە هە چ کەسێ کردووه پیرۆزی بێ.

خوا بکەم بەخۆشی پێک بێت... خۆشیەکەشی تا سەر بێ.

ش.ف.

## شەبەنگەبەڕۆژ

کۆمەڵە چیرۆکێکی پێکەنین هێنەره، ئامانجی:

پێکهێنانی گیان و کرد و کۆششێکی مەردانەیه بۆ پێشکەوتنی کوردەواری

***

* گۆڤاری (گەلاوێژ) لە پێشەکیەکیدا بۆ چیرۆکی شەبەنگەبەڕۆژ (مدیر بەگ)، ئاوا باسی کتێبەکە دەکات: «نووسەر بەناوی -شەبەنگەبەڕۆژەوه- نووسراوێکی داناوه، لە شێوەیەکی پێکەنین ئاوەردا، لە هەموو گیر و چەوتییەکی ژیانی کۆمەڵایەتیمان دواوه، بەم مەبەسە کە کار بکاتە دڵی کاربەدەستانمان، تا لە ڕووی دڵسۆزی و نیشتمانپەروەرییەوه بکۆشن، چینەکانی هەموو ڕەنگەی کۆمەڵایەتی (طبقاته مختلفەی اجتماعی) بخەنەوه سەر ڕێی ڕاست و دروست وه بەکۆمەڵە نیشتمانە خۆشەویستە پاشکەوتووەکەمان پێش بخەینەوه»[1]

* مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ، هەر لە گەلاوێژدا، دوای چاپ و بڵاوبوونەوەی کۆمەڵە چیرۆکی (شەبەنگەبەڕۆژ)، دەربارەی نووسینێکی بڵاوکردۆتەوه:[2]

---

(١) گەلاوێژ - گ: ژ (١٠) س (٤) تشرینی یەکی ١٩٤٣، ل ٦٤.

(٢) گەلاوێژ - گ: ژ (٢) س (٩) شوباتی ١٩٤٨، ل ١٥ - ١٧.

وا دیاره جیاوازییەک بووه لە نێوان مامۆستا و شێخی خاڵدا دەربارەی جۆری گۆکردنی وشەی (شەبەنگ - شەبەند) کە (الطیف) دەبەخشێ، مەسەلەش دەنگی - پیتی (نگ)ە کە هێشتا نیشانەیەکی دیاری بۆ دانەنراوه لە پیتە عەرەبییەکانی ئێستا پێی دەنووسین.

## شەبەندەبەڕۆژ

سلێمانی - شێخ محەممەدی خاڵ

شەبەندە بەڕۆژ، چەند مەقالەیەکی جوانی ڕەنگاوڕەنگی شیرینە وەک (شەبەندە بەڕۆژ) خۆی ئەنوێنێ وە بۆ هەریەکێک بەڕەنگێک خۆی پێشان ئەدا، خاوەنەکەی بەرو دوا هەمووی لە گەلاوێژ پەخشان کردووە (جگەرەکێشان) و (دادگاهی سەرچنار)ی نەبێ، هەر مقالەی جۆرە نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی پێشان ئەدا، تا چارەیەکی بۆ بدۆزیتەوە.

١- مدیر بەگ: باسی ئەمە ئەکا کە هێندێک لە مدیری ناوچە (ناحیە)کان بەبێ بەرتیل ئیش بۆ کەس ناکەن، هەروەک دەست درێژی ئەکەن بۆ ماڵی مەردوم، دەستدرێژیی نامەردانەی تریش ئەکەن، وا ڕوویان هەڵماڵراوە داوای زین و ئەسپ و تفەنگ و خورج و سەماوەر و هەزاران شتی تر ئەکەن، ئینجا ئەگەر مەردووم شتی دانێ ئەوا غەدر ئەکەن لە دەوڵەت بۆ میللەت و، ئەگەر هیچی نەدانێ ئەوا غەدر ئەکەن لە میللەت بۆ حکوومەت، تا لە پاش چەند ساڵێ خانووبەرەی لێ ڕائەکێشن وە ئەبن بەخاوەن دارایییەکی وا کە هەرگیز لەبن نەیەت. سا مەگەر خوا ئاه و نزولەی هەژاران سەرەنگریان کا و گلۆڵەیان بخاتە لێژی.

٢- مام شێخ: باسی فروفێڵی شێخە درۆزنەکان ئەکا کە دینیان کردووە بەفاقە بۆ ڕاوی دنیا، ئاییێ ئەگەر بۆ خوایە ئیتر ئەم دەهۆڵ و زوڕنا و شەق وەشاندن و هەڵپەڕینەی بۆ چییە؟. بەڵام شێخە درۆزنەکان، کوشتەی دنیان، هەر دنیایان دەسکەوێ با لە سایەی کەرەشینیشەوە بێ، هەروەک سەگی سپی بۆ بارخانەی لۆکە خراپە ئەم شێخە درۆزنانەش وانە، بەسای ئەوانەوە گەلێ شێخ خوێندەواری خواپەرستی بەڕاستیش بەدناو بوون، نەک ئەمان بەڵکو دینیشیان بەدناو کردووە.

٣- مامۆستا بیژەن: باسی ئەمە ئەکا کە گەورە ئەبێ بەچاوی سەنگین و گران تەماشای بچووکی خۆی بکا وەزمانی لەگەڵیا شیرین و ناوچەوانی لەگەڵیا ڕوون بێ، جنێوی پێ نەدا، ناوی بەسووکی نەبا، ئەگەر خوانەخواستە گەورە لەگەڵ بچووکا خراپ بوو ئەو حەلە چە گوناهێکی تیایە؟، ئەگەر ئەو بچووکە لە پەردەیەکی شەرم و هێمنیدا ئیشێکی وا بکا کە گەورەکەی بێدار بکاتەوە بەهەڵەکەی.

٤- بووک و خەسوو: باسی ئەمە ئەکا کە بووک لەگەڵ خەسووی خۆیا هەمیشە خراپ ئەبێ، سامەگەر بەدەگمەن، وە بەهەر جۆرێ لە دەستی بێ ئازار و سزای ئەدا، بەڵام ئەبێ کوڕەکەی مەردبێ وە دایکی نەدا بەدەم ژنەوە.

٥- دەستپاکی: باسی ئەوە ئەکا کە هەر کەسێ دەسپاکبێ بەپاداشی خۆی ئەگا، وە هەر کەسێکیش دەستپیسبێ تۆڵەی خۆی ئەبینێ، ڕۆڵە و جگەرگۆشە ئەگەر ئەنگ و دەستپیسییەکی بۆ پێویستە باوک چاوی لێ ئەقوچێنێ وەزوبەزو تەمێی بکا تا جارێکی تر کاری ناشیرین نەکا.

٦- جگەرەکێشان: باسی خراپی جگەرە و باسی ئەمە ئەکا کە مەردوم ئەگەر خۆی کارێکی خراپی کرد ئیتر هەزار جار بەم و بەو بڵێ ئەم کارەی کە من ئەیکەم خراپە ئێوە مەیکەن، کەس بەگوێی ناکا، وە

باسی ئەوە ئەکا کە باوک ئەبێ منالی خۆی بەنەرم و شل پێ بگەیەنێ نەک بەتوندوتیژی.

٧- گرامەفۆنەکەم چۆن کرێ: باسی ئەمە ئەکا کە مەردوم نابێ وشکو برنگ و پڕوپوچ پەرست بێ، وە هەرچی لەوەختی باووباپیریا نەبوو ئەویش نەیەوێ، هەزاران شتی وا هەیە ئەمڕۆ داهاتووە کەچی زۆرباش و بەکەڵکە، هەروەک هەزاران شتی واش هەیە کە لەوەختی باووباپیرا بووە کەچی خراپ و بەکەڵکە، (غرامەفۆن) یا (ڕادیۆ) بۆچی ئەبێ خراپ بێ؟ وە ئایین دەخلی چییە بەسەر ئەم شتانەوە؟ تاکەی ئایین کوتەکی دەستی نەخوێندەوارێ؟

٨- چەقاوەسوو: هەرچەند باسی رژدی کوردێک ئەکا بەرامبەر بەمیوانێکی، بەڵام بەتێکڕایی ئەمەش ئەگەیەنێت کە کورد هەموو ئازا و مەرد و نان بدە و سەربەرز و دەست و دڵ فراوانن.

٩- سەرێکی هەیە و هەزار سەودا: باسی ئەمە ئەکا کە پێویستە بۆ هەموو کەسێک لەجیهانا ئەمەندە ئیش بگرێتە دەست کە بۆی هەڵسوڕێ، چونکە کە لە ئەندازەی خۆی زیاتر بوو بەدان ئەکەوێ.

١٠- دادگاهی سەرچنار: چەن ئامۆژارییەکی جوانن لە پەردەیەکی گاڵتە و پێکەنینا بۆ ئەوەی هەموو کەس بیخوێنێتەوە، وە لێی پەند پەزیر و بەهرەمەندبێ.

### سەرەتا

نووسراوی (شەبەنگەبەڕۆژ)، ئەگەرچی لە سەروسیما و بەژن و باڵادا جوتییە، بەڵام لە ڕاستی و ئامانجا لەگەڵ نووسراوی (پرشنگ)دا یەکە. لێرەدا، هەژار و زۆرلێکراو و لێقەوماوەکان ئەبینێ، بەدڵێکی بەتین وە چاوێکی دووربینەوە، بەهێزێکی مەردانە و سەرێکی هونەرمەندانەوە، بەڕوویەکی خۆش و دەمێکی بەپێکەنینەوە، لە زۆردارەکان هەڵئەسنە سەرپێ، وە تا سەر ئەنگریان نەکەن وە ئازادی و شادمانی و کامەرانی خۆیانیان لێ نەسێننەوە وازیان لێ ناهێنن. ئەوەی لەم (شەبەنگەبەڕۆژ)ەم ئەوێ بۆم بهێنێتەدی وریاکردنەوەی دڵ و دەروون و بزواندنی دەست و باز و دەماری هونەرمەندی و مەردایەتییە لە کۆڕی نیشتمانپەروەریدا بۆ پێشکەوتنی کوردەواری.

کە نووسراوی (پرشنگ)م لە چاپ دا و بڵاوم کردەوە. لە برا شیرینەکانمەوە گەلێ یارمەتیم دی. وە لە گەلێ لاوی بەنرخەوە نووسراوی پیرۆزبایی و ستایش و ئامۆژگاریم بۆ هات کە هەتا هەم لەسەر ئەم ڕێگایە بڕۆم. گەلێکیش موژدەی دامێ کە (پرشنگ) کاری خۆی کردووە بەئامانجی خۆی گەیشتووە. جا ئەمانە هەمووی منی تیژکردە سەر پێکهێنان و بڵاوکردنەوەی ئەم (شەبەنگە بەڕۆژ)ە. لەبەر ئەوە

بەپێویستی ئەزانم کە لە کانی دڵمەوە سوپاسی برایەتی و گیانی نیشتمانپەروەرییان بکەم. وە ئاواتەخوازم لە خوا کە (شەبەنگە بەرۆژ)یش وەک (پرشنگ) لە دڵیانا جێی خۆی بگرێ، وە ئەو ئامانجەی کە بۆم داناوە پێی بگات.

شاکر فەتاح
قائیمقامی سلێمانی

## مدیر بەگ

... مدیر بەگ بێ چاوێنی بێ، کە بڕۆی توند ئەکرد، پیاو نەبوو بوێری لە بەردەمیا بوەستێ!... لەگەڵ ئەمەشا ئەوی بەدڵی ئەو ببزوایەوە و دەمی شیرین کردایە، ئەگەر هەزار دەرد و ئازاریشی بوایە، بەدەمیەوە پێئەکەنی و ئەیگوت: «کوڕە ئادەی! جگەرەی بۆ بێنن. ئادەی چای بۆ بێنن. ئادەی قاوە!».

بەڵام قوڕبەسەر ئەوەی دەست قوچاو بوایە لە عاست مدیر بەگا. ئەگەر پاشاش بوایە، نەئەهێڵرا بێتە ژوورەکەی!... ئەگەر کاروباری حکوومەتیشی بکەوتایە لای، ئەوە قاو نەدرا، تەریق ئەکرایەوە، هەر هیچ نەبوایە ئەمەندە کاروبارەکەی دوا ئەخرا، کابرا وەڕس نەبوو لە گیانی خۆی، وە ناچار ئەبوو کە واز لە کاروبارەکەی خۆی بێنی، هەتا خوا مدیر بەگی بەلایەکا بۆ تەفروتونا ئەکرد!... بەڵام چی بێ لە تۆ نهێنی بێ، کچ و ژنانی جوان کاروباریان زوو ڕاهی ئەکرا!... چونکە مدیر بەگ دڵی تەڕبوو، وە دڵتەڕی خۆی بەفیزەوە ئەنواند لەبەر ئەوە، بەناوی خۆشەویستییەوە، تا چەند ڕۆژێک لە ماڵی خۆیدا میوانداری نەکردنایە، کاروبارەکەی بۆ ڕاهی نەئەکردن!؟

مدیر بەگ حەزی لە هەموو شتێک ئەکرد!... کە بچووایە شوێنێک ئەیگوت: «بەخوا پیرۆزتان بێ، زینی ولاخەکەتان جوانە! خورجی بارگەکەتان شایانی تەماشاکردنە! سەماوەرەکەتان بۆ دیوەخانی پیاوی گەورە دروست کراوە ئاغا ئەم ئەسپە نایابەت لە کوێ بوو؟... ئەی کوێخا تۆ ئەم تفەنگە دانسقەیەت بەچەند کڕی؟... باوکم بەخۆڕاییم ناوێ. بەچەندی ئەدەی پارەکەت بدەمەوە»!

ئیتر ئەبوو کوێخا ئەو شتانەی پێشکەش بەمدیر بەگ بکردایە، ئەگینا بەرەنگاری پشم و قینی ئەبوو!... ئەوسا خوا نەبێ کەس لە دەستی ڕزگاری نەئەکرد!... سا یان مەڕەکانی خراپ ئەژمارد، یان دەغڵ و دانی بەزۆر ئەدایە قەڵەم. یا خەڵکی ئاواییەکەی لێ هەڵئەگێڕایەوە...

سا ئەگەر لە بنی عەردیش بوایە دەردی سەرییەکی بۆ ئەدۆزیەوە وە وازی لێ نەئەهێنا تا بەناخی عەردا ئەیبردە خوارەوە!

بەڵام ئەگەر کابرا پیاوانە بهاتایە پێشەوە و بیگوتایە: «بەگم سەروماڵ هی کێیە، پێشکەشت بێ»، ئیتر ئەو کابرایە لای مدیر بەگ لە پێش ئەبوو. سەری ببڕیایە، ماڵی بدزیایە، هەموو شتێکی سەری ئەگرت. وە هەموو تکایەکی بۆ ئەچووە سەر. بام حکوومەت و خەڵکیش تیا بچوونایە قسەی هەر بەجێ ئەبوو. ئینجا کە کوێخا ئەیگوت: «قوربان هەڵیگرە پێشکەشتبێ»! مدیریش بانگی ئەکردە پیاوەکەی خۆی ئەیگوت: «هەتیو بارام! ئائەوە بخەرە خورجەکەوە تا ئەڕۆینەوە!...». لەبەر ئەمە، خوا ڕاگیراوی کا،

لە سایەی مدیر بەگەوە، کردەوەی دەست بڵاویی ناوچەکەی داگیر کرد بوو هەتاکو مام چەوەندەریش بەچەوەندەرەکانی خۆی وازی نەئەهێنا شێلمیشی ئەبەشیەوە!

***

لە پڕ خوا نووسەر (کاتب)ێکی عەنتیکەی بۆ مدیر بەگ ڕەوانە کرد. نووسەر دەس و دامێن پاک و سەرڕاست، تورت و توند، بلیمەتێک بوو بۆ خۆی. ڕۆژێک کابرایەک هاواری هێنا، گوتی: «مدیر بەگ خوا بتهێڵێ بفەرموو ئەسپەکەت بگرنەوە، هەموو قەرسیلەکەمی خوارد»!... مدیر بەگ گوتی: «مردوت مرێ نابێ قسەیەکی ڕێکوپێک بکەی. ئەسپی من چۆن قەرسیلی ئێوە ئەخوات؟ بۆ چ وەک وڵاخەکانی خۆتان نارەسەنە؟!. هەستە بڕۆدەرێ ئەگینا گاڵ ئەدەم هەزار شەقت تێهەڵدەن»!. نووسەری بلیمەت کە ئەمەی دی، دەستبەجێ نووسی بۆ گوێزانەوەی خۆی بۆ ناوچەیەکی تر. نووسی: «ئەگەر لە مانگانەکەم سەیەکیشی ببڕن، هێشتا هەر ئەوەم پێ خۆشترە کە لە دەست ئەم مدیرە ڕزگارم بێ!...» گوتیان: «بۆ چ وا نانی خۆت ئەبڕی؟» گوتی: «خزمە ئەم بارە بەکەس هەڵناگیرێ. بەڵکو سبەینێ خۆیشی هات ماڵەکەمی تاڵان کرد. ئەوسا کە پێم بڵێ: بۆ چ وا ئەکەی بێنە کەلوپەلەکەم بدەرەوە. بەبیرتانایەت کە پێم بڵێ: من ڕەسەنم چۆن ماڵی تۆ ئەبەم؟ خوا یەکە و نەبووە بەدوو لێرە نامینمەوە. وە لەمە بەولاوە یەک ڕۆژ لەم تەنگ و چەڵەمەیەدا خۆم ناهێڵمەوە!...».

***

زۆریی پێ نەچوو مدیر بەگ، خانوو و ماڵی ڕازایەوە. پڕ بوو لە شتومەکی ڕەنگاوڕەنگ. گیرفانەکانی کە جاران کێچ (سەوزەڵە گیانم)ی تیا ئەوت لە پارەی ئەم و ئەو پڕبوونەوە. پۆشتە و پەرداخی ڕووی کردە خێزانەکەی. بەیانیان لەبەر دەنگی بارەباری کاوڕ و بەران و قوقە قوقەی کەڵەشێر و حەپە حەپی سەگان، لەبەر حیلەحیلی ئەسپ و زەڕە زەڕی نێرەکەران، کە لادێییەکان بەدیاری بۆ ماڵی مدیر بەگیان ئەهێنا، لەگەڵ هەچە هەچەی لادێیی و بگرە و بەردەی کەنیزەک و کاباندا، گوێی پیاو کەڕ ئەبوو... تەپ و تۆز کۆڵان و ڕێگای داگیر ئەکرد. پیاو ڕێی بۆ نەئەمایەوە کە بچێتە لای مدیر بەگ!. خۆ لەبەرە و قالیچە و خورجی نایاب نایاب و دەمانچە و خەنجەر و تفەنگی چاک چاک و ئەسپ و توولە و تانجی ڕەسەن و چالاکدا کەس نەبوو خۆی لە قەرەی ماڵی مدیر بەگ بدا. بەڕاستی ئەم شتانە مدیر بەگی لە خۆی بایی کردبوو. ئەوەندەی تر فیزی پێ پەیدا کردبوو. کەس نەیئەتوانی بەئارەزووی ئەو هەڵنەپەڕێ! کەس ڕایەی نەئەکەوت بەشتێکی بڵێ ناشیرینە. یان لە کردەوەیەکی ڕەخنە بگرێ!.

ڕۆژی دە جار بتدیایە، دەبوو بتگوتایە: «بەسەری تۆ، لەبەرەو ڕووی خۆت نەبێ بڵێم دانیشتووی، هێشتا وڵاخی وەک هینەکەی تۆم لەژێر کەسا نەدیوە! مەگەر لای سەرکردە فەرەنگەکە ئەم دووربینەم چاو پێکەوتبێ!... خۆ دەمانچەکەت بەخوا هێشتا باوکی متەسەریفی بەقەد خۆیەوە نەدیوە!...» کە ئەمەت نەگوتایە ئیتر ئەوە بەشت ئازاردان و بەندیخانە بوو... بەڵام ئەگەر وات بگوتایە، ئەوە نازت ئەکێشرا، چات بۆ تێ ئەکرا، جگەرەت ئەدرایە، ئەبوویتە هاودەم و هاونان و خوانی!

***

شەوێکی تۆف و باران، کابرایەکی زۆرزان بۆ مدیر بەگ نان و چێشتێکی نایاب دروست ئەکا. گەلێک پیاوی گەورە گەورە بانگ ئەکا لە پاش خواردنەوە و سەرگەرم بوون دەماری مدیر بەگ ئەبزوێنی. باسی ئەسپ و سوارچاکیی بۆ ئەکاتەوە، لە پاشا دەست ئەکا بەهەڵدانی سوارچاکیی مدیر بەگ وە ڕەسەنی ئەسپەکەی. لێت ناشارمەوە بەتەرحێکی وا هەلی ئەدا، مدیر بەگ هەر بەوشەوە سەرماوبارانە ئەنێری بەشوێن ئەسپەکەیا، بۆی زین ئەکەن. بەمبەر و بەوبەری شەقامەکەوە میوانەکان ڕائەوەستێنی وە ئەڵێ: «سەیرم کەن چۆن غار بەم ئەسپە ئەکەم». مدیر بەگ ئەوەندە بەناو قوڕ و چڵپاو و بەردەلانیدا غار ئەکا... کاتێک ئەزانن لە ئەسپەکەی کەوتۆتە خوارەوە، ئەسپ بەرەڵا بووە، مدیر بەگیش دەس و پلی تێک شکاوە.

***

زۆری پێ نەچوو ئەسپەشێی مدیر بەگ تۆپی. لە ترسا فرمانبەر و خەڵکەکە دەستە دەستە ئەهاتن بەپرسەیەوە. کە ئەهاتن ناچار ئەبوون هەر کەسە باسی چاکەیەکی ئەسپەشێ بگێڕێتەوە. بەڵام ئەو چاکەیەی کە مدیر بەگ خۆی بۆی ئەگێڕانەوە کەسیان نەیان گوتبوو وە نەیان بیستبوو!...

گوتی: «ئەسپەشێ ئەمەندە نەژاد و ڕەسەن بوو کە کۆچی دوایی کرد، خۆم چاوم لێ بوو، ڕووی کردە قیبلە و دەسی کرد بەگریان. فرمێسک خوڕخوڕ بەچاویا ئەهاتە خوارەوە!... منیش لەبەر ئەم ڕەسەنییەی، ئەسپەشێم پاک پاک لەسەر تەختەیەک شت وەبەرگم لەبەر کرد، وە لەبەردەم خانووەکەما گۆڕێکم بۆ هەڵکەند و ناشتم. بۆشی پاڕامەوە لە خوا ئەگەر باوەڕناکەن ئەوێش کێلی گۆڕەکەیەتی ببینن!».

***

چەندساڵێک بەسەرچوو. مدیر بەگ هیچ کڕین و فرۆشتنێک نەما نەیکا، مەڕ بەخێوکردن نەبێت. لەبەر ئەوە کە گوتیان ئەوا (شاە) بەناوچەکەی ئەوا تێئەپەڕێ، دەستبەجێ کردیە سەردێهاتەکان لەهەر گوندە کاوڕێکی هێنا بەناوی ئەوەوە کە لەبەرپێیا سەری بڕێ... بەم فێڵە حەفتا هەشتا سەر کاوڕێکی کۆ کردەوە. سەچوارێکی لەبەردەم (شاە)دا سەربڕی. کاوڕەکانی تریشی ناردە ماڵەوە، لەوێ ڕیزە ئاخوڕی بۆ هەڵبەستن. تا دانی بەشوان. بەم ڕەنگە مدیر بەگ گەلە ڕانێکی باشی لە کاوڕ و بەران بەخۆڕایی پێکەوەنا و هەموو ساڵێ کۆڵێ ڕوون و خوری لێ ئەفرۆشت.

***

مدیر بەگ ئینجا چاوی بڕییە دز و جەردەکان. لەگەڵ ئەوانیشا خۆی پێک خست و ماڵی دزی و تاڵانی دابەش کرد. پاشان لەگەڵ قۆڵچی و مەئمووری ئیستهلاکەکان و خاوەن زەوی و زارەکانیشا پەیماننامەی دزی و هاوبەشیی دامەزراند.

***

چەند ساڵێکی پێ چوو، چەرخی فەلەک بەباری ڕاستی و دروستیا سووڕایەوە. گلۆڵەی مدیر بەگ کەوتە لێژی. ناوچە تێکچوو. دز و درۆزن زۆر بوون. مەترسی لە هەموو لایەکیا پەیدا بوو. داد و فەریاد

لە گشت لایەکەوە هەڵسا. ئینجا یەخەگری مدیر بەگ تاک و تەرا پەیدابوون. خێزانەکەی لێی تەکینەوە. کچەکەی دەستی کرد بەدەستبازی لەگەڵ ئەم و ئەو. فرمانبەر و هەندێ لە خەڵکی ناوچەکە لێی ڕاستبوونەوە. دەردی سەری و خەفەت و سزا سەری تێکرد. ئەرک و ئازاری نەخۆشی هەراسی پێ هەڵگرت. هەرچی دەستکەوتبوو هەمووی بەفیڕۆ لەناو بردەوە!؟

زۆری پێ نەچوو ئەمانە دەم سەردارەکانی مدیر بەگ کەوتنەوە. ئێوارەیەک لە تەنگی بانگی شێواندا، لەناکاو مدیر بەگ بەفەرمانێکی کوتوپڕ، دەسی لە فرمان کێشرایەوە. کە بەیانی لادێییەکان بۆ نوێژ هەڵسان، تەماشیان کرد ئەوا مدیر بەگ بەخۆی و دوو بار کەلوپەلی ناوماڵەوە، بەکزولەیی کۆچ ئەکاتەوە بۆ شار!

پاشان زانییان کە مدیر بەگ پارەی چوونەوە شاری نەبووە، بەناچاری گەلێک شتومەکی ناوماڵی فرۆشتووە، کە هەندێک لەو شتانە تەختی نووستن و دانیشتن و هەندێ چیوینە و مسینە و سەعاتی باخەڵی بووە و ئەسپەکەی!...

بەم ڕەنگە ئەنجامی مدیر بەگ بەکاری ئەندازە سزا بەخشە گەیشت بەڵام هەر چۆنێک بێ، مدیر بەگ بەکاری مدیرەکانی تر هات. چونکە ئەم سەرئەنجامە ناشیرینەی چاوی گەلێک مدیرانی ترساند. وە لە گەلێکیشیانی گەیاند: «کە ئەگەر گەل و نیشتمان ئاوارە و بێچارەش بن، خوایەک بەو سەرەوە هەیە کە لە ڕۆژی تەنگانەدا بکەوێتە فریایان. دەستی پیرۆزی نیگەهبانییان بەسەرا بکێشێ. تەخت و تاجی ئازادی و زیندەگانییان دووبارە پێ ببەخشێتەوە وە تۆڵەی چەند ساڵانەیان لە ناکەس بەچەو زۆرداران و نەیاران بۆ بکاتەوە!...».

## مام شێخ

کابرایەکی لادێیی نابوت ئەبێ. ئەچێتە تەکیە لای شێخێک. شپرزەیی و کەساسیی خۆی تێئەگەیێنێ. شێخەکەش کەرەشینێکی پێ ئەبەخشێ. کابرا ئەڕوا بەم لاو بەولادا. چەند دەشت و بیابانێک ئەبڕێ. زۆری پێ ناچێ کەرەکەشی ئەتۆپێ. تێروپڕ بەسەر کەرەشینا ئەگری. پاشان گۆڕێکی بۆ هەڵئەکەنێ و تیایا ئەنێژێ. ئینجا بەم سەر و بەوسەری گۆڕی کەرەشینەوە چەند کێلێک دائەمەزرێنێ. وە ڕۆژ تا ئێوارەی بەسەر گۆڕەکەدا ئەگری و ئەپاڕێتەوە لە خوا. ڕێبوار کە لێی ئەپرسن: «ئەوە بۆ چ ئەگریت؟» ئەڵێ: «براگەل چی بێ لە ئێوە نهێنی بێ باوکم پیاوێکی یەجگار نوێژکەر و خواناس بوو. لە سامانی جیهانا هەر ئەوم هەبوو. خوا ئەویشی لێرەدا بردەوە بۆ خۆی. بەم ڕەنگە منیش بێکەس و کەساس ماومەتەوە بۆ خۆم. هیچ دەرەتانێکم نییە ئێرە نەبێ. چاوم لە خوا و دەستی ڕێبوارەوەیە. ئەڵێم بەڵکو ئەمە خوایە، دڵیان نەرم ببێ، شتێکم بدەنێ، پێوەی بەڕێوە بچم». ڕێبوار گەلێکیان دڵیان پێی ئەسووتێ. تێکرا هەر کەسێ بەوێدا ئەڕوا شتێکی ئەداتێ. کابرا وردە وردە ئەبووژێتەوە. پارە و مارەی گەلێک بۆ کۆئەبێتەوە. زۆری پێ ناچێ بەسایەی گۆڕی کەرەشینەوە ڕوو ئەکاتە دەوڵەمەندی. ئینجا گومەزێکی گەورەی نایاب بەسەر گۆڕی کەرەشینەوە دروست ئەکات. وە ناو گومەز و سەر گۆڕی کەرەشین بەپوپەشمێن و فەرش و ئاوێنە و شتی تازە و ناوازە ئەڕازێنێتەوە. بەم تەرحە، لەو چەقی ڕێیەدا، گۆڕی

کەرەشین ئەبێتە شتێکی سەیر، وە بەرە بەرە ئەچەسپێتە دڵی لادێییەکانەوە: «کە خاوەنی ئەم گۆڕە پیاوێکی خواناس و گەورە و چاک بووە. وە کابرای لادێییش کە بەسەر ئەم گۆڕەوەیە، چونکە لە خویا پیاوێکی نوێژکەر و خواناس و بێ دەنگە، وە شەو و ڕۆژ تەزبێحی بەدەستەوەیە و ناوی خوادێنێ، بێگومان ئەمیش هەر ئەچێتەوە سەر کردەوە و ڕەوشتی باوکی خۆی هەر لە ئێستاوە شێخێتی لەناوچەوانیا نووسراوە. دوایی هەر ئەبێتەوە بەشێخێک وەک باوکی، کە لەناو گومەزە گەورەیەدا کۆچی دوایی کردووە»!...

زۆری پێ نەچوو، سەرگوزەشتەی شێخی ناو گومەز بەهەموو لایەکا بڵاوبووەوە. دوایی کابرای لادێیی کرا بەشێخ!. ڕۆژ نەبوو لە هەموو لایەکەوە، لادێییەکان، دەستە بەدەستە، بەدەستی پڕ لە دیارییەوە نەیەن بۆ دیەنیی گۆڕی شێخ و شێخی تازە لەناو ئەو گومەزە تازەیەدا. کابرای لادێیی، یاخود بڵێین (شێخی کەرەشین)، زۆرزان بوو، ئەیزانی لەگەڵ لادێییەکاندا چۆن بدوێ و بەدەوروپشتیاندا بێت و، خۆی لایان خۆشەویست کات و، شێخێتی خۆی بچەسپێنێتە دڵی هەموو لایەکیانەوە.

ئەوەندەی پێ نەچوو، شێخێتییەکەی ناوی دەرکرد. سایە و مایەی لە ئەندازە دەرچوو. وە بووەیە کە شێخ و یەکە دەوڵەمەندی ئەو ناوە!.

***

بەڵام پیاو هەرچەندە خراپیش بێ، چونکە لە بنچینەدا خوا بەپاکی دروستی کردووە، دوایی هەر ئەبێ بچێتەوە سەر ڕێی چاکە. وە هەر ئەبێ ڕێی چاکە بگرێتەوە و وە هەر ئەبێ (دەروون)ی لێی بێتە زوبان و، لەسەر خراپە لێ پرسینەوەی لەگەڵا بکات. لەبەر ئەوە (شێخی کەرەشین)یش، لە پاش ئەوەی کە خۆشیی سایە و مایە و پایەی شێخێتییە درۆکەی ئازاری زەللەی جارانی لەبیر ئەباتەوە، دەروونی ڕائەچەنێ و وریا ئەبێتەوە و لێی دێتە زوبان و پێی ئەڵێ: «تۆ ئەزانیت بەچەفروفێڵو و چاو و ڕاوێک، ئەم هەموو خەڵکە دڵپاکە بەسزمانانە ئەڕوتێنێتەوە؟ ئەزانی خوا لە ڕۆژی دواییدا، لەسەر ئەمە، بەچە دەردێکت ئەبا؟ هەستە. هەتا زوو بچیت درەنگە. بچۆرە کن شێخەکەت. ئەم کجینە و بەینەیەی خۆتی بەنهێنی بۆ بگێڕەرەوە. بەڵکو ئەو چارەیەکت بۆ بدۆزێتەوە و لەم تەنگوچەڵەمەیە ڕزگارت کات».

(شێخی کەرەشین)یش بەگوێی دەروونی ئەکات. دەست بەجێ ئەچێ دیارییەکی گران بۆ شێخ ئەبا. لەوێ تێروپڕ سکاڵای دەردی خۆی بۆ ئەکات. سەرگوروشتەی خۆی بۆ ئەگێڕێتەوە. (شێخی گەورە) کە تەماشا ئەکات، نانی خۆی لەمەدایە کە (شێخی کەرەشین) و خەڵکەکە بەو تەرحە بمیننەوە: دەم ئەنێتە بناگوێی کابرا و پێی ئەڵێ: «خوابتگری، واز لە خۆت بێنە. خوا ئەم هەموو نیاز و جیازەی پێ بەخشیویت، بۆ چ بەدەستی خۆت نانی خۆت ئەبڕی؟ تازە ئەم هەموو سەروسامانە، لە کوێ بۆ تۆ کۆ ئەبێتەوە؟. چۆنت خواردووە هەروا بیخۆ. چۆنیشت ڕابوواردوە هەروا ڕابوێرە. زمانی خۆت ببڕە. جارێکی تر ئەمە لای کەس نەڵێی. ئەگینە پارچە پارچەت ئەکەن!».

(شێخی کەرەشین)یش ئەڵێ: «ئاخر ئەمە نانی دزی و درۆزنییە، سایە و مایەی فروفێڵ و دەستبڕینە... کەرەشینێک چۆن ئەبێتە شێخ؟ تەکیە چۆن بەسەر کەرەشینێکەوە ئەکرێ؟ خوا چۆن لەمە دەست بەردار

ئەبێ؟...». شێخیش ئەڵێ: «خوا لە ناوی دەمت دا وس بە! ئاخر ئەم تەکیە و خانەقایەی منیش هەر لە سایەی دایکی ئەو کەرەشینەی تووە هاتۆتە بوون».

کابرا دەست ئەکاتەوە بەشێخێتییەکەی خۆی. شێخی گەورەش ئەوەندەی تر هۆگری شێخێتییەکەی خۆی ئەبێتەوە وە هەردووکیان، لە سایەی گۆڕی هەردوو کەرەشینەوە، ئەوەندەی تر دەوڵەمەند ئەبن. وە هێندەی تر پایەدار و دەستدار ئەبن، بەڵام هەردووکیان بەسەرهاتی پێشووی خۆیان لەبیر ئەچێتەوە. وە لە بڕێتی ئەمەی لە کردەوەی خراپی پێشووی خۆیان پەشیمان بنەوە و بەرامبەر بەخوا بڕیارێکی ڕاستەقینە بدەن کە ئیستر توخنی کاروباری خراپ نەکەون و لە کرداری باش بەولاوە هیچی تر نەکەن، تا خوا لەگوناهیان خۆش بێ. بەشێخێتییە درۆکەیشیا تێر ناخۆن، لە خۆبایی ئەبن. وە لەژێر پەردەی شێخێتیدا دەست ئەکەن بەزۆر و زۆرداری، گیانو سامان و ئابڕوی گەلێ کەس پایەماڵ ئەکەن و وە هەرچی خوا حەزی پێ نەکات لەژێرەوە ئەوە ئەکەن!؟.

***

لەو حەلەدا کە هەردوو شێخ گفتوگۆ نهێنییەکەی خۆیان ئەکرد: گەلێ لە دەس و پێوەند لە درزی دەرگاوە گوێیان لێ بوو، گەلێکیشیان ئاگایان لە بنچینەی شێخێتی هەردوو شێخ بوو. بەڵام چونکە لە وەرزی ئەوسایان چەور بوو، وە شێخەکانیش هێشتا زۆرداریيان لێ نەکردبوون، لەو حەلەدا بێ دەنگییان بەباشتر ئەزانی، لەبەر ئەوە هیچیان لە شێخەکان نەکرد. بەڵام لە پاشا کە دییان ئەوا خەڵکەکە خەریکن لە شێخەکان ئەکەونە تەقەوە بەرە بەرە خۆیان لێ ئەکێشنە دواوە. وە دیاری و دەرامەتیان کەوتۆتە کزی. وە شێخەکانیش زۆرداریيان لێ ئەکەن، ئەمانیش گەلێکیان لە هەردوو شێخ تەکینەوە و دەستیان کرد بەڕاز دەرخستنیان بۆ ئەم و ئەو، تا ڕاستیی شێخێتیی هەردووکیانیان لە هەموو خەڵکەکە گەیاند. خەڵک وریابوونەوە. لە ژێرەوە دەستیان کرد بەپشکنین و تاقی کردنەوەی شێخێتیی ئەم شێخانە. کە سەرنجیان دا و بۆیان دەرکەوت: هەرچی ئەوان ئەیکەن لە دەست هیچ دڕندە و پیاوخراپێک ناوەشێتەوە، ڕۆژێک هەموو قسەیان کرد بەیەک. وە بەجارێک هورووژمیان بردە سەریان. دار و بەردی هەردوو تەکیەکەیان تێک دا، وە سەری هەردوو گۆڕەکەیان هەڵدایەوە. ئینجا کە سەرنجیان دا، قسەی بەردەستەکانی شێخەکان دەرچوو، وە لە هەردوو گۆڕەکەدا ئێسک و پروسکی کەرەشینیان دۆزیەوە، شێخەکانیشیان پارچە پارچە کرد، وە ماڵەکانیان تالان و زەویوزار و دوکان و خانووەکانیان داگیر کردن!... بەڵام لەسەر ماڵی تالانی لێیان بوو بەمقۆمقۆ. نەیان ئەزانی چی لێ بکەن! یەکێک ئەیگوت: «بام بیبەشینەوە بەسەرخۆمانا. یەکێکی تر ئەیگوت: «بام بیسووتێنین و لەناوی بەین». یەکێک دەیگوت: بی بەشینەوە بەسەر بێکەس و هەژاراندا». لەناو هەموویاندا یەکێک هەبوو، هەرچەندە بێ ماڵ و مناڵ و وڵات و نابوت بوو بەڵام ئەوەندە چاوتێر و دڵتەڕ و گەش و ڕۆخۆش و جوامێر و قسەخۆش و پیاوێکی سەیر بوو، لادێییەکان بەدڵ خۆشیان ئەویست وە بەپیاوچاکیان ئەدایە قەڵەم. لەبەر ئەوە هەموو جارێ لە شتی وەهادا ڕاوێژیان بەو ئەکرد.

ئینجا کە خەڵکەکە هاتنە لای پرسی پێبکەن، لێیان ڕاپەڕی، پێی گوتن: «هەرچییەک من پێتان بڵێم

بەقسەم ئەکەن؟ هەموو دەستیان کرد بەقاقای پێکەنین و پێیان گوت: «بەڵێ بەقسەت ئەکەین». گوتی: چونکو ئەم گەنج و سامانە لە سایەی گۆڕی کەرەشینەوە کۆبوەتەوە بۆ هەردوو شێخ، وە چونکو ئەم گەنج و سامانە لە ئێوە بەفرۆفێڵ و دەست بڕین سێنراوە: پێویستە هیچی پێ نەکرێ کەرەشین نەبێ. سا چەند کەرەشینی، پێ کرا بام پێی بکڕی. من بەهەریەکەتان کەرەشینێک ئەدەم». گوتیان: «ئەی بۆ خۆت؟». گوتی: «من چونکو وەک ئێوە بەم شێخانە هەڵنەخەڵەتاوم وە هیچم نەداونەتێ، هیچ وەرناگرم. بەڵام لە بریتی ئەو شتێکتان پێ ئەڵێم بەگوێم بکەن». گوتیان: «فەرموو. هەرچی تۆ بیڵێیت بەسەرچاو بەگوێت ئەکەین». گوتی: «من ناڵێم شێخێتی خراپە. بەڵام ئەڵێم پێویستە شێخێتی ڕاست لە شێخێتی خراپ جیاکەنەوە، وە هەرچی گوتی من شێخم کوتوپڕ بڕوای پێ نەکەن. کردەوەی بخەنە ژێر تاقی کردنەوە و پشکنینەوە، بزانن، شێخێتییەکەی تەنیا بۆ خوایە، وە لە سایەی شێخێتییەکەی ئەوەوە ڕۆژ بەڕۆژ هەژاری و نەخوێندەواری و زۆرداری و نالەباری لەناو گەل و نیشتمانەکەتاندا کەم ئەبێتەوە، وە ئێوە ڕۆژ بەڕۆژ ئەکەونە خۆشی و کامەرانی و پێشکەوتنەوە. ئەوا بەشێخێتییەکەی بڕوا بکەن، وە هەتا ئەتوانن یارمەتیی بدەن. ئەگینا ئەگەر بۆتان دەرکەوت کە مەبەستی لە شێخێتی تەنیا دەوڵەمەندی و پایە بڵندی و خۆشگوزەرانی خۆیەتی وە بەتەنگ گەل و نیشتمانەکەیەوە نییە». ئەوا پێویستە بڕوای پێ نەکەن، وە وەک ئەم شێخی کەرەشینانەی لێ بکەن». ئینجا کە کابرای ڕووتە لە قسەکەی بووەوە، پێی گوتن: «قسەکەم باشە؟». گوتیان «قەت قسە لەمە جوانتر نەبووە. هەتا ئەمرین و ڕەوشتی پێ ئەکەین». گوتی: «کەواتە هەر کەسە کەرەشینێکی پێشکەش ئەکەم. بەڵام ئێوەیش سوێندم بۆ ئەخۆن: کە هەرچی کەرەشینی وەرگرت شێخێتی پێوە نەکات؟!». گوتیان: «سوێند ئەخۆین».

زۆری پێ نەچوو، کەلوپەل و سامانی هەردوو شێخ فرۆشرا. وە هەتا بڵێیت کەرەشینی پێ کرا. ڕۆژی دابەشکردن، دەرودەشت پڕ بوو لە کەرەشین، تەپ و تۆزی چوارناڵە و دەنگی زەڕەزەڕی کەرەشینەکان ئەگەیشتە ئاسمان. وە لە پاش سوێندخواردن، ئەو هەموو کەرەشینانە بەسەرپەرشتی کابرای عەنتیکەوە بەسەر لادێیەکاندا دابەش کران... منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ. بەڵام ئەوەندە ئەزانم، کە لەو ڕۆژەوە تا ئیمڕۆ، لەو ناوەدا شێخێتی پەیدا نەبووەتەوە!؟.

***

## مامۆستا بێژەن

دوژمنی گیانت بێ! هەرچی گوێی لە گۆرانی گوتنی (چەکۆ)ی هاوڕێم بگرتایە، ئەبوو تا سە ڕۆژ گوێی بزرنگایەوە و پەزیشک (دکتۆر) گوێی دەرمان کردایە ئینجا چاک ئەبووەوە! لەبەر ئەوە هەرچەند بمانزانیایە (چەکۆ) نیازی گۆرانی گوتنی هەیە: یان لۆکەمان ئەخنینە گوێمان، وەیان هەریەکە بەلایەکا خۆمان دەرباز ئەکرد!. بەڵام دڵنیابە کە عود لێدانەکەی منیش، هەزار بەردیدا بوو بەپشت گۆرانی گوتنەکەی (چەکۆ)دا. برای باوکیشم لابوایە، کە عودم لێ ئەدا هەموو لەشی گرژ ئەبوو. وەدانەکانی دەستیان ئەکرد بەقرچەقرچ! ئێستاش لەبیرمە کە پشیلەیەکی زۆر چەقاوەسووم بەلێدانێکی ئەو عودە

ریاز کردا. ئەگین هیچ شتێک چارەی مام پشیلەی نەئەکردا. لەبەر ئەوە شتێکی ئاشکرا بوو، کە من(*) و چەکۆ ببینە هاودەمێکی گیانی بەگیانی!

***

بەڵام هەر من و چەکۆ نەبووین کە لە خوێندنگای ماڵیدا (مدرسەی داخلی) نانمان ئەخوارد و ئەخەوتین. گەلێکی تریشمان لەگەڵا بوو. هەرچەند ئەمانە لە ترسی گۆرانی گوتنەکەی چەکۆ و عود لێدانەکەی من، کۆڵان بەکۆڵان، لێمان پەرەوازە ئەبوون. بەڵام کە عود و گۆرانی لە ئارادا نەبوونایە، لە دەورمان گرد ئەبوونەوە، وەک برا بەقسەی خۆش و بەزم و ڕەزم و سکاڵا بۆ یەککردنەوە شەومان بەسەر ئەبرد. بەڕاستی کەم کۆمەڵی شاگردانم دیبوو، کە ئەوەندەی دەستەی ئێمە دۆست و یەکدڵ و یەک زمان بووبن!.

ڕۆژێ لە ڕۆژان مامۆستایەکمان بۆ هات. ناوی (بێژەن) بوو. چونکە خۆی ناشی و نەزان بوو، هە چ پرسیارێکمان لێ ئەکرد، لە بریتی ئەمەی تێمانگەیینێ، تووڕە ئەبوو، بەڵکو گەلێ جار جنێو و قسەی زۆر ناشیرینی پێ ئەگوتین! ئێمەیش چونکو، ئەو گرژومۆن بوو، ئەوەندەی تر ڕقمان لێی ئەبووەوە!. جگە لەوە، ئەمان بیستەوە، کە لەم لا و لەولاش گەلێک جوێن و قسەی خراپمان پێ ئەڵێ!. لەبەر ئەوە شاگردەکانی، ژووری ئێمە کۆمەڵێکیان بەست. وە هەموو پێکەوە چەند بڕیارێکیان دا، کە چەند کاروبارێک هەڵسووڕێنین، بەڵکو (مامۆستا بێژەن) لە جوێندان و لە قسەی خراپ و تووڕەیی بخەین! بەڵام ڕەنجمان بەبا چوو. وە هەرچییەکمان کرد سەری نەگرت. وە (مامۆستا بێژەن) لە سەرزەنشتکردن و رووشکاندن و جوێندان و تووڕەیی خۆی نەکەوت!.

شاگردەکان لە دەست (مامۆستا بێژەن) وەرس بوون. کەوتنە ئەوەی لەتاو ئازاری گیانی خۆیان شتی ناشایستەی دەربارە بکەن. ئەوەندەی نەمابوو، شتی ناشیرین لە شاگردەکانەوە ڕووبدات، وە ئابڕووی دەستەکەمان بچێت!. لە پڕ (من و چەکۆ)ی هاوڕێم، لەناو شاگردەکانت دا سەرمان بەرز کردەوە. وە هەردووکمان بەیەک دەنگ ئەمەمان پێگوتن: «براگەل. مامۆستا بێژەن هەرچەندەی خراپیش بێ، ئێمە کە شاگردین، جوان نییە شتی وەهای دەربارە بکەین کە ئابڕووی ژوورەکەمان بچێت. وە پاشەجار ڕوومان نەیەت بەخۆمان بڵێین شاگرد. ئەگەر ئێوە بەهەردووماندا ڕانەپەڕموون ئێمە تۆڵەی ئێوە لە مامۆستا بێژەن ئەکەینەوە. بەڵام وایشی ئەکەینەوە کە ئابڕووی کەسمان نەچێت. وە سەر مامۆستایش پێمان بڵێ دەستان خۆش بێت. بەڵام تکاتان لێ ئەکەین، کە ئێوە هیچ دەربارەی مامۆستا بێژەن مەکەن. وە ئەمە بخەنە سەر ئەستۆی ئێمە. ئینجا ئەگەر ئێوەمان دڵخۆش نەکرد، هەر چەکمان پێ ئەڵێن دەمتان خۆش بێت».

هاوڕێکانیشمان بەیەک دەنگ گوتیان: «باشە ئەوا ئێمە وازمان هێنا لە مامۆستا بێژەن. بزانین ئێوە چی ئەکەن؟». بەم ڕەنگە، تەمێکردنی مامۆستا بێژەن کەوتە سەر ئەستۆی من و چەکۆ. جا سەیر کە چیمان بەسەرهێنا!.

---

(*) مەبەس لە وشەی (من) نووسەر نییە. تەنیا بەئارەزوو وەها دانراوە. لە شوێنەکانی تریشا وشەی (من) هەروەها بەئارەزوو بەکاهێنراوە (ش. ف).

مامۆستا بێژەن و مامۆستایەکی تر لە ژوورێکابوون. هەموو شەو تا درەنگ ئەکوشان. خوێندنەکانی سبەینێیان ئامادە و ڕەوان ئەکرد. بەڵام ئێمە بەپێچەوانەی ئەوان، شەوی هەینی (جمعە)مان بۆ بەزم و ڕەزم دانابوو. لەبەر ئەوە تا درەنگ ئاهەنگ و زەماوەندمان ئەکرد ئینجا ئەخەوتین. پێڕەوی خوێندنگاکەشمان وەهابوو، کە لەو شەوەدا سەربەست ئەکراین، هەر چۆنێکمان ڕابواردایە، کەس لێی نەئەپرسینەوە!.

لەبەر ئەوە شەوی ئەو هەینییە، هەر لە بانگی شێوانەوە، چەکۆ قورگی خۆی پاککردەوە، منیش عودی خۆم ساز کرد. وە چووینە بەر ئەو هەیوانەی کە ژووری مامۆستا بێژەن و هاوڕێکەی لە پشتەوە بوو. وە کوتوپڕ دەستمان کرد بەگۆرانی و بەزمی خۆمان!.

هەرچەند مامۆستا بێژەن پەنجەرە و دەرگای داخست و، کون و قوژبنی ژووری کون بڕ کرد و، گوێی خۆی بەلۆکە ئاخنی، کۆششی بۆ نەکرا و کەڵکێکی نەگرت!. لەگەڵ ئەمەشا فیزی نەیهێنا کە پێمان بڵێ بۆچی وا ئەکەن؟!. بەڵام لەو حەلەدا کە من و چەکۆ خەریکی ئەوەبووین تۆزێ پشوو بدەین. مامۆستا بێژەن سەرێکی هەیوانەکەی دا وە بەبەردەماندا پیاسەیەکی بۆ کرد. بەڵام ئێمە نەمان هێشت بکاتە ڕاستی ئێمە، گورج بەهەرچی هێز و تەوانایەک کە تیاماندا بوو دەنگمان هەڵبڕی وە بەعود و گۆرانی شاباشمان کرد!. بێژەن خۆی گەیاندەوە ژوورێ. دەنگمان نزم کردەوە. بێژەن هاتەوە دەرێ. دەنگمان بەرز کردەوە. بێژەن خۆی هاوێشتە ژووری. بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو پەتی پچڕی. هاتەوە سەرمان. گوتی: «ئاخر ئێوە هیچ لەمە بیرناکەنەوە کە من تێئەکۆشم؟». گوتمان: «ئەی مامۆستا خوا هەڵئەگرێ ئێمە لە هەفتەیەکا هەر ئەم شەوەمان هەبێ و تۆزێکیش ڕانەبوێرین؟». گوتی: «ڕابواردن باشە. بەڵام هیچ کوێتان نەدۆزیەوە ئەم بەردەم ژوورەی من نەبێ؟». گوتمان: «ئەم بەر هەیوانە نەبێ، هیچ کوێیەک هەیە ئەوەندە ئەشئە بەپیاو ببەخشێ؟ مامۆستا ئەبوایە تۆ شاباشت بکردینایە ئەمەندە گۆرانیمان بۆ گوتووی. لە شوێنێکی تر بوایە ئەمەت بەپارەش دەست نەئەکەوت. مامۆستا سوپاسی خوا بکە خوا. با خوا لەم ناز و جیازەت بێ بەش نەکات!». گوتی: «خوا ئەم نان و جیازەم لێ ببڕێ. ئەمە باشە ئێوە سەربەستی لە من بار ئەکەن؟».
گوتمان: «تۆیش ئەتوانیت لەم شەوەدا سەربەستی لە ئێمە بار بکەیت ئێمە بەپێی ڕەوشتی خوێندنگاکەمان سەربەستین. وە لە ئەندازەی سەربەستی خۆماندا هەرچییەک ئەکەین تا بەیانی لێمان ناپرسرێتەوە!».
مامۆستا بێژەن بەتووڕەییەکەوە بەجێی هێشتین. وە هەتا گەیشتە ژوورەکەی خۆی، لە بۆڵەبۆڵ و وردە جنێو، درێغی لێ نەکردین. بەڵام من و چەکۆیش بەگۆرانی و عود لێدان درێغیمان لەو نەکرد، وە جارێکی تریش دار و بەردی خوێندنگاکەمان هێنایەوە لەرزە، ئەها دەرکەوت! کاتێکمان زانی مامۆستا بێژەن بەخۆی و سەرمامۆستاکەمانەوە هاتەوە سەرمان!. بەڵام سەرمامۆستاکەمان، وەک مامۆستا بێژەن نەبوو. پیاوێکی زرنگ و تێگەیشتوو، جوامێر و کارگوزار بوو. دەمێک بوو لە کەینە و بەینەی ئێمە و مامۆستا بێژەن گەیشتبوو. کە هاتە پێشەوە لەبەری هەڵساین ئەویش نەیکردە نامەردی بەڕوویەکی گەش و خۆشەوە چاکو چۆنی لەگەڵ کردین. وە بەزۆر گۆرانی و عودێکی پێ لێداین!. من و چەکۆش وەختبوو لە خۆشیانا گەشکەداربین. لەبەر ئەوە تا بڵێی کۆششمان کرد کە گۆرانی و عودێکی پاک و پوختەی

لەسەرخۆی بۆ، بلێین. چەکۆ قورگی پاککردەوە. و دەسەسڕێکی پچکۆلەی خستە ناو دەستی. منیش تەلەکانی عودەکەم بەزۆر و بەخواهیش بادا. چەکۆ دەسی کرد بەگۆرانی گوتن و منیش دەستم کرد بەعود لێدان. لە پێشەوە دەنگێکی نەرم و نزم ئەهات بەلام دەسەسڕ هەناسەی چەکۆی سوار کرد. تینی دایە خۆی. کاتێکم زانی دەسەسڕ لە دەمی چەکۆ دەرپەڕی. وە وەک گوللەدای لە سەروچاوی مامۆستا بێژەن. دەنگ دەرچوو. بەلام دەنگ چە دەنگی؟ مالی بەقورگیری. گوتی هەموومانی کەڕ کرد! منیش وامزانی فنی مۆسیقی وای پێ ئەوێ کە منیش بەقایم دەست بیزوێنم. کاتێکم زانی دوو سەتەلی عود تەقی. کلیلێکی دەرپەڕی. دای لە شووشەی پەنجەرەی ژوورەکەی مامۆستا بێژەن، شکاندی. کە بێژەن، ئەمەی دی، گری تێ بەربوو. لە قینا تووکی سەری ڕاست بووەوە. دەسی کرد بەجنێودان و قیڕەقیڕ. بەرچاوی تاریک بوو. ئەوەی لەبیرچووەوە کە لەگەل سەر مامۆستاکەماندایە. لە داخا بەقایم پێی دا بەزەویدا. بەلام پێی کەوتە سەر کلکی توتکە سەگەکەی مامۆستا. توتکە سەگ دەسی کرد بەقوڕەقوڕ. بەلام لە عەزرەت. ئیشی کلکەکەی وەرگەڕایەوە و بەقاچی مامۆستا بێژەنا نووسا. بێژەن کەوتە هاوار هاوار. شاگردەکان لە دەورمان کۆبوونەوە. لەگەل ئەوەشا من و چەکۆ هەر لە گۆرانی و عود لێدانی خۆمان نەکەوتین. بەلام سەرمامۆستا و شاگردەکان لە پێکەنینا لە هۆش خۆیان چوون!. بەلام من و چەکۆ شێوەی میوانداری خۆمان تێک ئەدا: کە زانیمان کەس پێمان نالێ دەستتان خۆش بێ. خۆمان بۆ خۆمان دەسمان کرد بەچەپلەلێدان.

***

ئینجا سەرمامۆستا ڕووی تێکردین. گوتی: «پێم نالێن ئێوە لەبەرچی ئەم مامۆستایەی خۆتان ئەمەندە ئازار ئەدەن؟» گوتمان: «ئێمە ڕایەمان ناکەوێ مامۆستا خۆمان ئازار بدەین. ئێمە بۆیەکا گۆرانی بۆ ئەلێین و عودی بۆ لێ ئەدەین کە دلی خۆشکەین!». بەلام کە سەرئجامدا سەرمامۆستا حەز بەم گالتەیەمان ناکا، وە خەریکە لە وەرامەکەمان تووڕە بێ، پێمان گوت: «ڕاستت ئەوێ پێت بلێین؟». گوتی: «ئا ڕاست بڕۆن مەترسن». گوتمان: «مەبەسمان، لەمە، ئەوەبوو کە خۆیشت بێیت بەچاوی خۆت بمانبینی کە هەموو دەم مامۆستا بێژەن چیمان پێ ئەکات!. جا ئەگەر پێت خۆشە مامۆستا بێژەن جوێنمان پێ بدات، ئەوا ئێمەیش، جاروبار، دلی خۆمان بەم عود و گۆرانییە خۆش ئەکەین. وە ئەگەر پێشت ناخۆشە جوێنمان پێ بدات، تۆ گەورەی هەموومانی، ئێمەش و ئەویش تەمێ بکە!».

کە ئەمەمان گوت مامۆستا بێژەن ئەوەندەی تر تووڕە بوو. بەلام سەرمامۆستا بێدەنگی کرد، وە لەگەل خۆیا بردیە مالەوە. بەئێمەشی گوت: «چاوەڕوان بن تا ئەنێرم بەشوێنتانا». لە پاش هەندێک، سەرمامۆستا، من و چەکۆ. و هەموو هاوڕێکانمانی بانگ کردە مالەوە. لە پاش ئاهەنگ و بەزمێکی خۆش و شەوچەرە خواردنێکی نایاب، ئێمە و مامۆستا بێژەنی ئاشت کردەوە. وە بڕیاری بەهەردوو لاماندا کە بێ دلی یەک نەکەین، وە لەگەلە یەکا چاک و دلسۆز و بەنەوازش بین. ئیتر لەو شەوەوە مامۆستا بێژەن وازی لە جنێودان هێنا. وە هیچ پرسیار و گوفتارێکیشیمان لەگەلا ئەکرد لێمان تووڕە نەئەبوو، وە بەجوانی وەرامی ئەداینەوە. ئێمەش ئیتر بیرای بیرای ئاهەنگ و زەماوەندی وا بۆ مامۆستا بێژەن

بگێڕین. وە ئیتر وازمان لە بەزمی شەوی هەینی هێنا!. بەڵام لە بیرت نەچێ، کە لەو شەوەوە شاگردەکانی هاوڕێمان، من و چەکۆیان کرد بە(ڕیش سپی)ی خۆیان، وە ئیتر بۆ هەر کاروبارێک کە وەها بوایە، خۆیان ئەدایەوە دەست ئێمە.

## بووک و خەسو

... (ئازیزخان) کە ئەچێتەوە دەرەوە بۆ چەرچێتی بەژنەکەی ئەڵێ: «هەتا پێت ئەکرێ بەدەورووپشتی دایکمابێ و دڵی مەیەشێنە». بەڵام هێشتا کابرا ئەوەندە لە ماڵ دوورناکەوێتەوە، بووکە زۆر لە خەسو ئەکات کە جوجەڵە هەڵبێنێ!. خەسوی بەسەزمان لە ترسی بووک ناچار ئەبێ بەسەرچەند هێلکەیەکا کڕ ئەکەوێ، وە لەسەریان هەڵناسێ تا هەڵیان ئەهێنێ وە جوجەڵەیان لێ دێتە دەرەوە!. پڕپۆڵە و دان و ئاوپێدانیشیان لەوێ بووەستێ، جوجەڵەکان چونکە دایکی خۆیان نابینن، پیرێژن بەدایکی خۆیان دائەنێن، خەسو بۆ هەر کوێیەک ئەچێ جوکەجوک دوای ئەکەون. کە نوێژ ئەکات ئەچنە سەر بەرماڵەکەی. کە نان ئەخوات ئەچنە سەر سینییەکەی کە ئەشنوێ، ئەچنە ژێر لێفەکەیەوە وە لە باخەڵی پیرێژندا نەبێ، بەدڵ خەویان لێ ناکەوێ!. کە کابرای چەرچی ئەگەڕێتەوە ماڵێ، وە دایکی بەوتەرحە ئەبینێ، ئەڵێ: «دایە ئەمە چییە؟». داپیرەی بەسەزمان، لە ترسا ناوێرێ بڵێ: «ژنەکەت وای بەسەرهێنام» ئەڵێ: «ڕۆڵە ئەوە جوجەڵەکان دایکیان مردووە. منیش چونکە بەخێوم کردوون، لەبەر ئەوەیە کە دوام ئەکەون».

ئەمجارە کە کابرای چەرچی ئەچێتەوە دەرەوە، بووکە، پەڵپی کڵاودوورین لە خەسوی ئەگرێ!. بەوەش وازناهێنی، ڕۆژێک مەیموونەوانێک بەوێدا ڕائەبوورێ، بووکە خەسوەکەی خۆی پێ ئەفرۆشێ. وە پێی ئەڵێ کە خەسوەکەی هەم هەڵپەڕین ئەزانێ وە هەم گۆرانی گوتن! مەیموونەوان، شار بەشار و دێ بەدێ بەپیرێژنی بەسەزمان ئەکات. وە هەر کوێیەک ئەچێ، چەشنی مەیموون هەڵی ئەپەڕێنێ. بەوەش وازناهێنێ، بەزۆر گۆرانیشی پێ ئەڵێ!. وا ڕێک ئەکەوێ، ڕۆژێ لە شارێک، ئازیزخانی چەرچی تووشیان دێ کە تەماشا ئەکات ئەوا کابرایەک دایکی وەک مەیموون هەڵ ئەپەڕێنێ و ئەم گۆرانییەی پێ ئەڵێ: «من دایکی ئازیزخانم. جوجەڵە هەڵهێنان دەزانم. بۆم بێنن ساوەر و پیرخەنیلە. دەسم لە هەویرە. هەر ئەوەندەم لەبیرە». کابرای چەرچی زۆر بەزەیی بەدایکیا دێتەوە. هەرچی چۆنێک ئەبێ، بەزۆر و بەخواهیش، بەپارە و بەتکا دایکی لە کابرای مەیموونەوان ئەکڕێتەوە. کە کەینە و بەینەی ئەو چەند وەختە لە دایکیەوە تێ ئەگات، دایکی ئەخاتە سنووقێکەوە و ڕووەو ماڵ ئەڕواتەوە.

بێینەوە سەر ژنی ئازیزخان. کە دایکی ئازیزخانی مێردی ئەفرۆشێ بەو مەیموونەوانە، دەست بەجێ بزنێک سەرئەبڕێ وە لە ماڵی خۆیاندا ئەینێژێ پاشان لەناو دەرودراوسێکانیا ئەیکا بەچاوەڕوا و ئەڵێ: «خەسووم مردووە» وە لەناو ماڵی خۆماندا ناشتوومە. وەرن بەپرسەوە»!. بەم فێڵە خۆی لە دەست دەم و زمانی دراوسێکانی ڕزگار ئەکات. بەڵام ئەوەندە نابات مێردەکەشی دێتەوە. کە لێی ئەپرسی: «دایکم کوا؟». ئەڵێ: «بەخوا چی بێ لە تۆ نهێنی بێ، دەسم شکێ، خوا بردیەوە بۆ خۆی. ئەوەیش گۆڕەکەیەتی لەناو ماڵەکەدا». مێردەش ئەڵێ: «دەبچوو دەرودراوسێکان کۆبکەرەوە. من ئەم دایکی خۆمە لە گۆڕە دەرئەهێنم. وە ئەیبەم لە شوێنێکی باشتر ئەینێژم». ژنە ئەڵێ: «مەکە توبی خوا. ئەوەک شتێکی خراپمان

بەسەر بێت». مێردەش ئەڵێ: «خوایەکە و نەبووە بەدوو. ئەبێ من ئەم دایکی خۆمە لەم گۆڕە دەربهێنم». کە گۆڕە هەڵئەداتەوە، تەماشا ئەکات ئەوا بزنێکی نێژراوە!.

مێردە سەیرێکی ژنە ئەکات. ژنە ئەڵێ: «مێردەکە نەمگوت دەست لە کاری خوا مەدە، ئەم گۆڕە هەڵ مەکەنە. نەوەک شتێکی خراپمان بەسەر بێت؟». مێردەش ئەڵێ: «شتی خراپی چیمان بەسەر بێت. هەی وا وا لێ کراو!. دایکی من کەی مردووە؟ ئەوەتا زیندووە لەم سندووقەدا! جوجەڵەت پێ هەڵهێنا. کردت بەمەیموون. هەرچی پەنگی جیهانە بەسەرت هێنا. ئێستایش بزنێکت خستۆتە ئەم گۆڕەوە. ئەڵێی مردووە؟». ئازیزخان ئەوە ئەڵێت و سەری سندووقەکە هەڵ ئەداتەوە. دەروردراوسێ دایکی ئازیزخان بەزیندوویتی لە سندوق ئەهێننە دەرەوە. کە تەماشا ئەکەن ئەوا پیرێژن چاوی زەق ئەکاتەوە. هێشتا بەرگەی ژیانێکی دە سالیی تر ئەگرێ. ئازیزخانیش ناکاتە نامەردی: تا ئەتوانی ژنەکەی شلکوتی مەرگ ئەکات. پاشان بەرەڵلای ئەکات وە لە ماڵ ئەیکاتە دەرەوە، ئینجا دایکەکەشی ئەخاتەوە سەر ماڵ و منداڵی خۆی. دوایی ڕوو ئەکاتە دایکەکەی و پێی ئەڵێ: «ئاخر ئەمە گوناهی خۆت بوو هاتەوە ڕێت. چەند جارم پێ گوتیت کە ئەچینە خوازبێنی کچان، لەخوابترسە وە بەدوو قسەی ڕەنگین و پیاڵەچایەکی شیرین تەفرە مەخۆ؟ تەماشای دواڕۆژی من بکە چاوت لە خزمایەتی و دەوڵەمەندی و پایەداری و ناوبانگی باوکی کچەوە نەبێ. چاوت لە کردەوە و ڕەوشتی جوان و دڵ و دەروونی پاک و خاوێن و سەروسیمای ناسک و نازداری کچەوەبێ. تا نەزانیت کچێک لە هەموو بابەتێکەوە لەگەڵما یەک ئەکەوێ و بەدڵەوە ئەبەسترێ بۆمی مەخوازە...» پیرێژنیش ئەڵێ: «ئەوا لەسەر ئەمجارەدا، ئەگەر جارێکی تر شتی وەهام کرد سەرم بتاشە. پەیان بێ یان کچ پێشانی خۆت بدەم و پێتی بناسم، یاخود بتگۆڕم جلوبەرگی ژنانەت لەبەرکەم و لەگەڵ خۆما بتبەم بۆ خوازبێنی. هەتا خۆت نەڵێی باشە بۆتی نەخوازم»!.

## دەسپاکی

مام هۆمەر، هەرچەند لە منالیا عەنتیکە و قسەخۆش بوو، بەڵام کە بکەوتایە تەنگ و چەڵەمەوە زۆر سەری لێ تێک ئەچوو. وە هەرچی یەجگار خراپ نەبوایە لە دەسی نەئەوشایەوە!. جارێک مام هۆمەر لەناو برسێتی ئەمەندە شپرزە ئەبێ، ناوەستێ گوێچکەنانێ بخوا تا چێشت پێ ئەگات، دەس ئەکا بەمەنجەڵە گەرم و لە کولەکەی ماڵی باوکیا، وازناهێنێ تا سەلکە مریشک دەرئەهێنێ!. سەلکە مریشک گەرم و داغ و کاڵ و نە کولێو ئەبێ. بەڵام هۆمەر گوێی ناداتە کاڵ و کولێو و سارد و گەرمی. سەلکە مریشکی بۆ ناجورێ. گوێی نادات، سەلکە مریشک بەتەواوەتی قوت ئەدا!. بەڵام چەقوت دانی؟ چاوێکی مام هۆمەر ئەنووسێنێ. وە چاوەکەی تری لە تاوا دەرئەپەرێ!. مام هۆمەر وەک سکی گری گرتبێ، هاوار ئەکات: «ئاوم بگەیێنێ» کوندەیەک ئاوی ئەکەن بەدەما، تا چۆڕبڕی ئەکات وازناهێنێ!. هۆمەر کلپەی دەروونی ئەکوژێتەوە. بەڵام دەنگی نزگەرەی ئەگاتە کەشکەشانی فەلەک. نزگەرەی دوابڕاو هۆمەر بەدەردێک ئەبات، تا دووسە ڕۆژیش وەک کەلەشێری سەربارەدار، بەهەرچی ئەگەیشت، ئەی قرتاند بەسەریا!.

***

هۆمەر لە دوکانی باوکیا کاری ئەکرد. هەرچەند باوکی بچوایە بۆ نوێژ ئەوی بەسەر دوکانەکەیەوە دائەنا. باوکی ڕۆژێ ویستی تاقی بکاتەوە. بەدزی هۆمەرەوە پولێکی فڕێدایە ناو دوکانەکەیەوە و چووە دەرەوە بۆ نوێژ. ڕۆژەکەی گەرم بوو. هۆمەر تینوێتی تەنگی پێ هەڵچنی بوو. دڵی چووە سەر شەربەتی مێوژ. بەڵام ڕۆژانەکەی خۆی لەناوبردبوو. هیچ چارەی نەمابوو ئەوە نەبێ کە چاوبگێڕی بەدوکانەکەدا، بەڵکو پولێک بدۆزێتەوە و بیدا بەشەربەت. لە پڕ ئەو پولەی بەدی کرد. هەڵیگرت و دای بەشەربەت. بەم ڕەنگە هۆمەر دەماخی خۆی تەخت کرد!.

بەڵام زۆری پێ نەچوو باوکی هاتەوە. کە هەستی کرد هۆمەر پولەکەی دۆزیوەتەوە و شەربەتی پێ کڕیوە، دەم و دەست دوکانی داخست، هۆمەری خستەپێش خۆی و ڕووی کردەماڵەوە.

هۆمەری بەسەزمان کاتێکی زانی ڕووت و قووت کرایەوە وە بەکۆڵەکەی هەیوانەکەی ماڵی خۆیانەوە بەسترایەوە. ئینجا دەم و چاو و سەر وگوێلاکی بەدۆشاو و هەنگوین سواخ درا، مێش و مەگەز و زەردەواڵە تێی ئالان. ئەمەش بەهەرجا بەڵام ئەوی دڵی هۆمەری تەنگ کردبوو، کۆکردنەوەی خاووخێزان و کەسوکار بوو لەسەری، بۆ سەیری!. باوکی هۆمەر کردیە هەرا. جگە لەوە کە هەر تاوە ناتاوێ زرمەی لە بناگوێی هۆمەر هەڵئەساند و ئەم هەموو مێش و مەگەز و زەردەواڵەیەی لێ ئەوروژاند و دابوویە بەر هەتاو (فێنکی بێتەوە؟)، خزمەکانیشی لەسەر کۆکردبووەوە، تێزیان پێ کرد و فێزیان بەسەرا ئەکرد و پێی پێ ئەکەنین، هۆمەر دەسی کرد بەزیڕەزیڕ. دەنگی ئەگەیشتە ئاسمان. دوای ئاخ و ئۆف و پەشیمانییەکی زۆر، دڵی مامی نەرم کرد. مامی بۆی پاڕایەوە کە ئەمجارە باوکی بیبەخشی، ئەگەر دەسپیسیەکی تری لێ ڕوودا ئەوسا هەر چییەک ئەکا بیکا. خزمانیش هەموو تکایان بۆ کرد. باوکی بەخشی وە هۆمەر لە پەند پێدان ڕزگار کرا پاشان سەر و لەشی شۆڕا. بەڵام تا درەنگێ هۆمەر، لە شەرما، ڕووی نەئەهات بچێتە دەرەوە. دوایی هاتەوە دوکان. لە کردەوەی خۆی پەشیمان بووەوە. وە ئیتر لەو ڕۆژەوە لیرەشی بدیایە دەسی بۆ نەئەبرد. پارێزگاری ئەکرد تا باوکی ئەهاتەوە دوکان، ئینجا دەیدایەوە دەستی. باوکیشی کە ئەم دەسپاکییەی لە هۆمەر بینی، ئیتر دەستی کردەوە بەلاواندنەوەی، تا ئەهات نازی زۆرتر ئەگرت. وە هەر ڕۆژە نارۆژێ ئافەرین و شاباشی ئەکرد. زۆری پێ نەچوو دەسپاکیی مام هۆمەر دەنگی دایەوە. وە لە پاش چەند ساڵێک بووە یەکەم بازرگانی شاری خۆی. بەڵام هەموو جارێ ئەیگوت: «ئەم سەر و سامانەم هەموو لە سایەی خوا و پەروەردەکردنی باوکمەوەیە»![1]

---

(١) ئەم چیرۆکە دەبوو - بەپێی ناوەرۆک و ئەنجامی- لەو چیرۆکانە بووایە کە تایبەتە بەمناڵان، بەڵام بەپێی ڕێوشوێن و پرەنسیپە پەروەردەیی و ڕێنماییەکانی زانستی دەروونناسی ئەمڕۆ، گەلێ مەترسیدار و ناشیاوە کە بۆ مناڵانیشبێ... خوێنەری وریا لەسەرنجدانی لە ناوەرۆکەکەی ئەمەی لەلا دەرەوێتەوە.

## جگەرەکێشان

لە منداڵیا، فەرهاد، بەقەد عزرائیل لە باوکی ئەترسا. گرژ و مۆنی باوکی لەوێ بووەستێ، تووڕەیی و قسە ناشیرینەکانی لە هەموو خەیاڵێکی فەرهادی ئەدا. هەرچەندە فەرهاد، لە خۆیا، عال و ساڵ نەبوو، بەڵام لە ترسی باوکی بووبووە فریشتەی سەر زەمین. لەگەڵ ئەوەشا، کە ئەهاتە سەر باسی جگەرە نەخواردن، چونکی باوکی خۆی جگەرەی ئەخوارد هەرچی ئامۆژگارییەکی فەرهادی ئەکرد بەبا ئەچوو! کە شیرەشیرێ ئەکرد بەسەر فەرهادا، وەک گوێزی بۆ بژماردایە وا بوو. سەرتان نەیەشێنم ئاخری فەرهاد فێری جگەرە خواردن بوو. هەر ئەوەندە دەستی بکەیشتایە قووتووە جگەرەکەی باوکی، جگەرە بەحاڵ لە دەستی ڕزگاری ئەبوو. ئەگەر تفەنگیشیان پێوە بنایە، ئەبوو، یەک دوانێکی هەر لێ بکێشایە!. هەرچەند باوکی بچووایە بۆ دەستنوێژ شتێ، تا ئەهاتەوە سەری، فەرهاد جگەرەیەکی لە قوتووەکەی پەنا ئەداو بەسەرخۆشییەکەوە ئەیکێشا. ئەگەر بەدەمیشیەوە نەمایە بۆ جگەرەکێشانێکی تر جگەرەیەکی تری ئەخستە گیرفانیەوە، وە تا باوکی لە نوێژ ئەبووەوە ئەچووە بن پاسارێکەوە، قاچی لێ ئەخستە سەر قاچ، وە وەک بەرزەکی بانان بەفیزێکەوە ئەویشی ئەکێشا. بەڕاستی تا باوکی لەسەر جگەرەخواردن ئازاری ئەدا، فەرهاد زۆرتر دڵی بەجگەرەکێشاندا ئەچوو. کە ئەشی خوارد بەدزییەوە، وەک لەشکری ڕۆمی شکاندبێ، قسە شکاندنی باوکی ئەوەندە لاخۆش بوو لە ڕاستیا. فەرهاد لە دڵا ئەم جگەرەکێشانەی، بەسەرکەوتنێکی سەیر ئەدایە قەڵەم!. فەرهاد ئەوەندەی پێ نەچوو، بیری بەلای هەزار لای تریشا چوو. ئینجا جگەرەی بەلووت ئەکێشا. جارێکیان، دوو جگەرەی خستە هەردوو کونەلووتەکانیەوە وە هەردووکیانی بەجارێک کێشا. کاتێک زانرا فەرهاد هەناسەی سوار بوو، ئەگینا لە دەست شەپازلەکانی باوکی قوتار نەئەبوو. جارێکیان، هەرچەندی کرد و کۆشا فەرهاد، جگەرەی بەردەست نەکەوت. هێنا هەندێ توتنی کردە ناو گوڵە هەنارێکەوە و پوشکەیەکی بەبنەکەیەوە قایم کرد و ئاگرێک خستە سەر دەمەکەی. کە تەماشای کرد جگە لەوەی جگەرە دووکەڵی بۆ ئەکات، ڕەنگ و بۆیەکی یەجگار جوان و ڕەنگینیشی هەیە، ئیتر سەری تێ کرد، وە هەتا قەڵاچۆی لە گوڵە هەناری باخەکە نەخست وازی نەهێنا. کە باوکی سەرنجی دا، نە بارەش لە ئارادا هەیە و نە گوڵە هەناریش لەبن دارەکاندا کەوتووە. کەوتە پرس و پشکنینەوە، دوایی بەم کەینە و بەینەیەی فەرهادی زانی، وە لەسەر ئەوە جارێکی تریش تۆزی لە بناگوێی هەڵساندەوە. فەرهاد، تا چەند ڕۆژێک، وازی لە دووکەڵکردن هێنا. بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو، چووە وزەی نێرگەلەکەی ماڵی پووری، وە ئەوەندەی کێشا تا لە هۆش خۆی چوو. لەوە پاش حەز لێکردنی جگەرە وا لێ کرد، ناچارما قوتوی بۆ هەڵگرێ. لە بستێک چیت و کەرتێک مقەبا و تۆزێ جەوی و دەرزی و دەزویەک، فەرهاد، قوتوویەکی جگەرەی پێکهێنا. بەڵام ئەوەندە فێڵبازی کرد لەگەڵ باوکیا، چەواشەی کرد: هێنای تا یەک دوو ڕۆژ لەباتی جگەرە، لەبەر چاوی ئەو، قەڵەم و قەڵەمبڕ و لاستیکی تێ کرد و، قوتووەکەی خستە ناو باخەڵی سەڵتەکەیەوە. لە پاشا جگەرە و شقارتەی تێ کرد وە هەر هەڵێکی بۆ هەڵکەوتایە دەماخی خۆی بەجگەرەکێشان تەخت ئەکرد. بەوەش وازی نەهێنا. ئینجا خووی دایە جگەرەی هەموو ڕەنگەی ئەورووپا. پاشان سەری کردە سەر سیغار و چروت و سەبیل وقەندەوە دوایی بایدایەوە سەر نێرگەلە.

بەلام چە تەرحە نێرکەلەیەک؟ لە گولاودانێکی بچووک و لاسکە هێرۆیەکی کونکراو و لەتە توێکلە گوێزێک ویستێ پوشکە و هەندێ میوە و چۆڕێک ئاو و تۆزێک توتن و پشکۆیەک ئاگر، نێرگەلەیەکی جوانکیلانەی بچکۆلانەی خنجیلانەی پێک هێنا. نێرگەلە تام و بۆنی خۆشی توتنەکەی لەوێ بوەستێ، فلقە فلق و کەش و فشەکەی، بەتەرحێک فەرهادی گەشکەدار کردبوو، لەبەرچاویا لە سینەمایەک خۆشتر بوو.

فەرهاد، ئەمانەی هەموو بەدزی باوکیەوە ئەکرد. لە ترسی باوکی فێری گەلێ درۆو فروفێڵ و کاروباری نهێنی و زیان بەخشی و نالەباری بووبوو کە گەورە بوو و سەربەستی وەرگرت لە باوکی، ئینجا بەئاشکرا هەموو جۆرە جگەرەیەکی ئەکێشا. بەلام کە تامی سەربەستیی چێشت و هەستی بەسەربەخۆیی و هێز و دەسەلاتی خۆی کرد، وردە وردە لە خراپە گەڕایەوە و کردەوە و ڕەوشتی جوان و مەردانەی گرتەوە. ئینجا لە خۆیەوە لە خراپی جگەرە گەیشت وە لە پڕ بڕیاری دا کە لە جگەرەکێشان وازبهێنێ وە ئیتر وازی لێ هێنا.

هەمـوو جارێ کـە باسی جگەرەکـێشـان ئەکرایەوە، فـەرهـاد، بەباوکی ئەگـوت: «بابە! ئەگـەر خـۆت جگەرەت نەکـێـشـایە، وە ئەوەندە زەبر و زەنـگ و زۆرداریت بەسـەرا نەنوانـدمـایە، قـەت من فـێـری جگەرەکێشان نەئەبووم. وە ئەگەر ئەمەندە سەربەستیت لە من نەبردایە بەست، منیش هێندە دڵم بۆ دزی و درۆزنی و کاری نهێنی نەئەخرۆشا. ئەگەر بتهێشتایە تەنیا دووسە جارێک جگەرە لەبەردەمتا بخۆم، هەر لەبەر تامە تاڵ و بۆنە ناخۆشەکەی کە دەم و دانم و دەس و پەنجەمی لە کەلک ئەخست، من لە خۆمەوە وازم لە جگەرەکـێشـان ئەهـێنا. منـاڵ شاهەنشاهێکە و سەربەست و زەبر بەدەست. ئەگەر نەهێڵرێ زۆر لە کەس بکا، خۆ ئەبێ نەشهێڵرێ کە کەس زۆری لێ بکا. مناڵ کردەوەیەکی خواییە پاک و پوختە و بەرز و پیرۆز. پێویستە هەموو پیاوێک کرنۆشی نەوازشی بۆ بکێشی. وە لە بریتی ئەمەی بکرێ بەدیل و بەندە، یان بهێـڵرێ ئەو خەلک بکا بەدیل و بەندەی خۆی، پێـویسـتـە بەنەرم و نیـانی و شیـرینیـیەوە، باوک و مامۆستا، پێشرەوی و سەربەرشتی بکەن وە ڕایبهێنن کە بەجـوانی و ڕێکوپێکی سەربەسـتی و هێز و دەسەلاتی خۆی بەکاربێنی. ئەوەتا من، هەتا سەربەستی و سەربەخۆییم بەزۆری خۆم ئەسەند، وە هەستم بەدەسەلات و هێزی خۆم نەکرد، لە خراپە نەگەڕامەوە، وە وازم لە جگەرەکێشان نەهێنا!».

باوکیشی گوتی: «کوڕم خوا هەڵناگری دەمەقاڵێت لەگەڵا بکەم. بەخواراست ئەکەیت قسەی تۆیە بەلام من چی بکەم کە هەموولایەکی ژیان لەسەر بنچینەی زۆرداری و نەخوێندەواری دامەزراوە؟!. داخەکەم لە دەسم چوو. خراپەم زۆر لەگەڵ کردیت. تکادارم کە ببەخشی. مەگەر دڵی خۆم بەوە بدەمەوە کە لەگەڵ خۆتا، کوڕە پچکولەکەت، وەها پێ بگەیێنم کە خۆت حەزی پێ ئەکەی». زۆری پێ نەچوو باوک و کوڕ، کوڕە بچکۆلیان لەسەر شێوەی نوێ پێ گەیاند. لە سەرەتاوە سەربەستی جگەرەکێشـانیان دایە. مناڵ لە پاش چەند جـارێک جگەرەکێشـان لەبەردەمیـاندا، جگەرەی لەبەرچاو کەوت وە ئیـتر ناوی نەهێنایەوە!. هەر لەسـەر ئەو شـێـوەیەش مناڵ پێ گـەیێنرا، وە کـە گـەورەبوو، لەناوبانگی چاکی و کـارگـوزاری و نیشتمانپەروەریدا باوی لە هەموو هاوڕێکانی سەند!.

## گرامەفۆنەکەم چۆن کڕی[1]

... کاکم هەرچەندە قورئانیش بوو کە ئەیخوێند، بەڵام ئەوەندە دەنگی ناخۆش بوو، یان هەردوو گوێی خۆمم بەلۆکە قایم ئەکرد، وە یاخود بەلای کەمەوە هەزار هەنگاوێک لە ماڵ دوور ئەکەوتمەوە، تا خۆمم لە دەست گوێگرتنی دەنگی ڕزگار ئەکرد!. وام لێ هاتبوو، هەرچەند بەبرا بچکۆلەکەمی بگوتایە: «ئادەی قورئانەکەم بدەرێ». دەم و دەست پەلاماری کەوشەکانم ئەدا و خۆم دەرباز ئەکرد!. لام وایە هەر لەبەر ناخۆشی دەنگی کاکم بوو، کە من دەنگی خۆمم بەدڵا چوو بوو. ئەگین وەک لە هاودەمەکانی خۆمم بیستبوو، دەنگی منیش لەوانە نەبوو کە ئاواتی بۆ بخوازرێ. واتا هەر لەبەر ئاهی سوێند بوو کە پێیان ئەگوتم دەنگ خۆش!؟. لەگەڵ ئەمەشا کاکم هەر شەوێک دەستی بپەرژایە گۆرانیی هەمەڕەنگەی پێ ئەگوتم. ئەیگوت: «ئەم گۆرانیانە خۆشن، چونکە کوڕێنی خۆمم ئەخەنەوە بیر!؟».

***

کە شایی خەتەنە سۆرانیان بۆ کردم، لە شارەکەدا کەم کەس گرامەفۆنی هەبوو. لەبەر ئەوە کە گرامەفۆنێکیان بۆ شاییەکەم هێنا. وەختبوو لە خۆشیانا بیخۆم. بەڵام داخەکەم، زۆری پێ نەچوو، گرامەفۆنیان بردەوە. وە هەرچەندە هەڵپە و هاوارم کرد بۆیان نەهێنامەوە. لەبەر ئەوە هەتا بڵێی دڵم چوو بەگرامەفۆنا. وە ئەوەندە بەمەراقیەوە ئەنووستم، لە خەویشما بەشەو هەر لە گرامەفۆن کڕین خەریک ئەبووم!.

جا چونکە کاکم ئەوەندە حەزی لە دەنگی خۆش و گۆرانی ئەکرد، لام وابوو، هەر ئەوەندەیی بڵێم کە گرامەفۆنێکم دۆزیوەتەوە، گورج بۆم ئەکڕی وە لەو نەخۆشییەدا دڵم ناشکێنی. کەچی داخەکەم بەهەڵەدا چووم. هەر ئەوەندەم خۆش بوو تا لام ئاشکرا کرد. دوژمنی گیانت بێ، زمانی بەتەرحێک لێ کردمەوە و بەجۆرێک دەستی لێ دامە هەڕەشەکردن، وەختبوو لە عاستی خۆم ببم بەتنۆکێک ئاو. کە دایکم لەسەری کردمەوە قیژاندی بەسەریا پێی گوت: «هەمووی تۆ خوی هەتیوەکەت خراپ کردووە. من بەم ڕیشی سپییەوە وەختی گرامەفۆن کڕینمە؟ ئینجا نۆرەی ئەمەمە خەڵک پێم بڵێن ماڵەکەی کردووە بەلۆتی خانە؟ ئایا نازانی هەر ماڵێک گرامەفۆنی تیابێ فریشتە ڕووی تێ ناکات؟ وەڕووت و نابووت ئەبی و ئەکەویتە سەر ساجی عەلی؟!». ئەمجارە کە دایکم بەرپەرچی دایەوە، کاکم دەسی کرد بەجوێندانی. ئەوەندەی نەمابوو هەڵسیتە سەرپێ، وە توکی سەری بڕوتێنیتەوە!. بەڵام لەم ناوەدا هەر من تیا چووم. چونکە ئیتر لەو ڕۆژەوە کاکم ڕووی نەئەدامێ. منیش نەم ئەوێرا توخنی ئەو بکەوم!. بەڵام نەنکم زۆرزان بوو. کە ئەو

---

(١) ئەم چیرۆکەش لە (گەلاوێژ) ژ (٢) س(٦) شوباتی ١٩٤٥ لەلاپەرە (٤ - ١٢)دا بلاوکراوەتەوە.

ئەچووە دەرەوە هەمـوو جـارێ دڵخـۆشی ئەدامـەوە. ئەیگوت: «کـوڕم خـەفـەت مـەخـۆ. خـۆت خـۆش بی گرامەفۆنیشت ئەبی. من دەردی کاکت ئەزانم چییە. بەخوا نە لەبەر خوا و نە لەبەر نە هاتنی فریشتەی خوایەتی کە گرامەفۆنت بۆ ناکڕی. وە نە لەقسەی خەڵکیش ئەترسێ، ئێستا ئەگەر یەکێ گرامەفۆنێکی بۆ بنێری بەدیاری دەستی مـاچ ئەکـات. وە لە خـۆشیـان پێی ناکـەوێتـە عـەرد. وە شـەو و ڕۆژ لە لێـدانی ناکەوێ! ئینجا ئەگەر بەقسەی نەنکی خۆت ئەکەی، لەمەودوا، هەر ڕۆژە هەندێ لە ڕۆژانەکەتم بدەرێ بۆتی کۆ ئەکەمەوە، تا زۆر ئەبێ. ئەوسا بەو پوڵە و بەهەندێ پوڵی دایکت گرامەفۆنێکی خنجیلانەی پێ ئەکڕین!.

بەڕاستی قسـەی نەنکم زۆر پێ خۆش بوو. ئەم پیرێژنە زۆر ژیر بوو. گەلێ جار لە تەنگ و چەڵەمەی وەهای ڕزگار کردبووم. لەبەر ئەوە بێ پەروا جڵەوی خۆم دایە دەستی. زۆری پێ نەچوو پوڵێکی باشی پێ کۆکردمەوە. بەڵام دیسانەوە بەشی کڕینی گرامەفۆنێکی نەئەکردا. لەبەر ئەوە بەم لا و بەولادا تەقەلام دا گرامەفۆنێکی کۆنەم دۆزیەوە. هەرچەندە پیرەگرامەفۆن لە تەمەنی نەنکیشما نەبوو، بەڵام من لام لە ساز و سەمتورێکی شاهانی گەلێک خۆشەویست تر بوو!.

لەو چەندانەدا، کاکم هەستی بەکۆمەڵی یەکێتی من و دایکم و نەنکم کردبوو. لەبەر ئەوە دیکتـاتۆریی خۆی لە مـاڵدا ئاشکرا کرد. ئیـتر لەو ڕۆژەوە هەر کەسێ ناوی گۆرانی و گرامەفۆنی بهێنایە، یان بەدار، یان بەزار، شلکوتی مـەرگی ئەکرد. خـۆ من لە ڕسـتـەی ڕەشی کـاکـما سـەر دەسـتـەبووم. قـەت مـەپرسـە. بەجارێک تۆقـاندوومی!. دوایی چووم بەلای دایکـمـەوە. ئەو پارەی زۆر بوو. سـەرت نەیەشێنم ئەوەندە دەستم ماچ کرد و هێندە سوێندە گورگانەم بۆ خوارد کە ئیتر هەرچی ئەو بیڵێ بەقسەی بکەم و قەت بێ دڵی نەکەم، تەفرەم دا، وە بەڵێنم لێ سەند کە لە پارەی گرامەفۆنەکە هەرچی مایەوە ئەو بیدا. بەڕاسـتی ئەمـەندە لە دڵپـاکی و خـۆشـەویسـتی دایکم دڵنیـا بووم، بێ خـەم، پاڵم دایەوە، وە ئیـتـر ئەو شـەوە بەخۆشییەوە نووستم تا بەیان.

سەرت نەیەشێنم. دوایی من و دایکم و دوو کارەکەر چووینە مـاڵی خاوەن گرامەفۆن. دەسـتـمـان کرد بەلێدان و کڕینی گرامەفۆنەکەی. بەڵام چی بێ لە تۆ نهێنی بێ، ئەوەندە پەلەی کڕینیم هەبوو، هەرچەند دایکم بیگوتایە بەوەندە پێم بفرۆشە، من ئەوەندەی ترم بۆ ئەخستنە سەر بەڵام کە تەماشام کرد دایکم لێم مۆڕ ئەبێتەوە، ترسام کە لە کڕینی گرامەفۆنەکە پەشیمان بێتەوە، ناچار بووم دەستم کردەوە بەمـیـچکە مێچکە!. سا بەدەست ماچکردن بێ یان بەپاڕانەوە، گرامەفۆنم بەنرخێکی گران بەدایکم کڕی!. هەرچەند کـە لەژێریشـەوە کـسـپـە لە جگەرمـەوە ئەهات بۆ ئەو نرخە گرانە کـە دامـانێ، بەڵام کـە بیری ئـاهەنـگ و زەماوەندی پیرە گرامەفۆنم ئەکردەوە، ئەو نرخەم لەبەرچاو نەئەهات!.

لە کورتی بیبڕمەوە: لە سایەی سـەرپۆش و بەرمـاڵ و چارۆگە و کۆڵوانە و سەبەتەوە مام گرامەفۆنمان وەها شـاردەوە، کە هێنامـانە ماڵەوە، نەک کـاکم کەسی تریش هەسـتی پێ نەکردین. بەپەلە تا ئەوان هاتنە ژوورەوە من یەغدانێکی کۆنی باپیرم هەبوو، پاکم کردەوە و پیرە گرامەفۆنم تیا شاردەوە و کلیل و کلومی یەغدانم کرد. ئیتر هەر خوا خوای ئەوەم بوو کاکم لە ماڵ بەدەربێ، تا تێروپڕ گرامەفـۆنەکەم لێ بدەم. لێت

ناشـارمەوە تا مـانگێکیش گرامـەفـۆنم بێ بۆرپیـە لێ ئەدا. کـەلێـشم ئەدا پەنجـەرە و دەرگـاکـانم توند دائەخست و کەلوقوژبنی ژوورەکەم باش کونبڕ ئەکرد. کاکم بلیمەتێک بوو بۆ خۆی. قەت مەپرسە. وەک دێوو درنج سامـێکی هەبوو لە مـاڵێـدا، هەر لە دوورەوە زەندەقی پیـاوی ئەبردا. لە ترسی کـاکم خاوەن گرامەفۆنیش کە ناسیاومان بوو ئامۆژگاریان کردبوو کە لای کەس نەڵێ گرامەفۆنەکەی بەنێمە فرۆشتووە. بەڵام کـاکم تۆزێک لە هەڕەشـە و گـوڕەشـەی خـۆی سـاردبووبووەوە. گـەلێکمـان بەگـوێیـدا دا کـە ئەو ناسـیـاوەمـان گـرامـەفـۆنێکی باش و قـەوانی قـورئانی دەنگ خـۆشی هەیە. لەبەر ئەوە تا جەژن ئێـمـە بەهەمووومان توانیمـان کاکم بهێنینە سەر ڕێ. وە ئەو گرامەفۆنە بۆ جەژن لەو ناسیاوەمان بخوازین. بەڵکو تۆزێ گوێی لە قەوانی دەنگ خۆشی قـورئان بگرین. ناسـیـاوەکەشمـان -خـاوەن گرامەفۆنەکەمـان- ڕۆژ بەڕۆژ لەم کەینە و بەینە ئاگادار ئەکرد. ئیـتر هەر ئەوەندەی پێ چوو کرا بەجەژن. بۆ سبەینێ منت ئەبینی پیرە گرامەفۆن لێ ئەم. وە کاکم بەدڵ گوێی لە قەوانی قورئانەکە ئەگرێ. وە ئەڵێ ئەمجارەیش لێی دەرەوە و دەرزییـەکـەی تازە کـەرەوەا. مـنیش ئەوەندەم قـەوانی قـورئـان بۆ لێدا وەڕسم کـرد، تا خـۆی ناچار بوو گوتی: «ئەی قەوانەکانی تر چین؟!» ئەنکم زەردەخەنەیەکی کرد. دایکم دایە قاقای پێکەنین. بەڵام من نەمهـێشت کاکم بەم تیـزە پێ بزانی، گورج قەوانێکی (مثنویی فـارسی)م بۆ خسـتـە سەری. پاش ئەوە قەوانێکی (بەرزاوی)شم بۆ لێدا. لەژێرەوە سەیرێکی کاکم کـرد. خەریک بوو ئەگەشـایەوە. وا دیار بوو کوڕێنی خۆی کەوتبووەوە بیر. بەڕاستی توکەی سمێڵی ئەهات.

هەر ئەوەندەم زانی قـۆڵی لێ هەڵکرد و قاچی خسـتـە سەر ئەژنۆی. دەسـتێکی خسـتـە سەر قـاچی و بەدەسـتـەکـەی تریشی کـڵاو و جـامـانەکـەی هێنـایە سەر لووتی. ئینجا ئانیـشکی دادا بەسـەر ئەژنۆی. چەناگەی خستە ناو مستیەوە و دەستی کرد بەگۆرانی گوتنا. منیش کە زانیم کاکم گۆرانی ئەڵێ، قورئان خوێندنە ناخۆشەکەیم کەوتەوە بیر. گورج پەلاماری کەوشەکانم دا و خەریک بووم ڕابکەم. بەڵام ئەنکم تونگ چکی کەواکەی ڕاکێشام و دایناممەوە. ئینجا بەگوێیا چرپاندم: «ئەکەی بڕۆی. وەختی ڕۆیین نییە. دان بەخۆتا بگرە. ئەوەندەی ئەماوە کۆمەڵی خۆمان سەرکەوێ. کاتێکت زانی جلەوی کاکیشتمان کەوتە دەست. دانیشە مەڕۆ. گرامەفۆنی خۆت لێ بدە» بەڕاستی ئەنکم ژنێکی تێگەیشتوو بوو نازانم چۆن وا دەماری کاکمی ناسیبووا. ئەوەندەی پێ نەچوو کاکم هاتە سەربار وە لە پاش جەژن -کە بەفڕوفێڵ وامان تێگەیاندبوو کە گرامەفۆنەکەمان ناردۆتەوە ماڵی خاوەنی- تکای کردەوە کە بچم گرامەفۆنەکە لە ماڵی ناسـیـاوەکـەمـان بخـوازمـەوە. زۆری پێ نەچوو قـەوانەکـانی تریشی یەک بەیەک پێ لێ دام، وە ئەوەندە گیرۆدەی دەنگی پیرەگرامەفۆن بوو بوو، کە من دیار نەئەبووم خۆی لێی ئەدا.

ڕۆژێک هاتمەوە. کـە سەیرم کـرد ئەوا پیـرە گرامەفـۆن یاخی بوو. دەسکەکـەی با ئەدەم بانا خـوا. بەزۆر بای ئەدەم دەسکەکەی ئەگەڕێتەوە توند ئەدا لە دەستم، مەچەکم ئەشکێنی، دوایی ناچار بووم سنگێکم بۆ داکوتا. وەکە دەسکەکەیم با ئەدا گورج بەگوریسـێک دەسکەکەیم بەو سنگەوە ئەبەستەوە. بەم تەرحە لە دەست خـاوبوونەوەی زەمبـەلەک و شەڕوشۆڕی دەسکەکـەی ڕزگارم بووا دەسـتم کرد بەلێدانی، بەڵام کە سەرنجم دا، لە جیـاتی دەنگ، قەوانەکە زیڕەی دێ. تومەز ئەمە کـاکم ویستبووی میناکەی پاککاتەوە،

ئەمەندە فوی لە کونە لووتییەوە (جێ دەرزییەکەی) پیا کردبوو باغەی میناکەی تەقاندبوو.

هەرچی چۆنێک بێ، بەقاقەز و جەوی میناکەیشم چاککردەوە. بەڵام کە سەیرم کرد، چونکە دەورییەکەی بەخێرا خولی ئەخوارد، کام قەوان دەنگی زڕ بوو، وەک دەنکی منالی لێ ئەهات. پاشان ئەمەندە خاو ئەبووەوە، دەنگی ژنیش بوایە وەک هی پیاوێکی پیری لێ ئەهات، کە دەسکەکەیم بائەدایەوە، دەنگەکە ئەبووەوە بەدەنگی منال. کە تۆزێ دەستم لێ بەر ئەدا. دەنگەکە ئەبووەوە بەهی پیرەمێرد. دوایی ناچار بووم (کۆمەڵی دیموکراتی - من و نەنکم و دایکم) کردە سەر کاکم وە بەهەر پلار و توانجێک بوو، چەند پولێکمان لە دەست کردەوە. کاکم ئەو شەوە لە داخی ئەو پارەیە نانی نەخوارد. وەتا چەند سەعاتێک بەوداخەوە تلایەوە تا خەوی لێکەوت. بۆ ڕۆژی دوایی، تا توانی قەوانی پێ لێ دام. وا دیاربوو ئەیویست تۆڵەی ئەو چەند پولە بکاتەوە. بەڵام لەم وەختە تەنگ و چەڵەمەیەدا، نەنکم لەگەڵ من و دایکما دەنگی کرد بەیەک. دامانناا: «ئەگەر کاکم نەهاتە سەر ڕێ و لاساریی لەگەڵ کردین، هەرچییەکی لێ کردین لێی بکەینەوە. وە هەر چییەکیشی پێ گوتین پێی بڵێینەوە». وە چەند قسەیەکیشمان ڕێکخست کە بەکاکمی بڵێین. نەنکم لە پێشەوە، من و دایکیشم لە دوایەوە، بەمەشقی سە کەسی ڕۆیشتین تا گەیشتینە ژووری کاکم. ئینجا نەنکم پێی گوت: «ئەمەی تۆ ئەیکەی بۆ ئێمە باش نییە. ماڵەکەت تەواو لە تام خستووە. ئێرەت کردووە بەلۆتیخانە. شەو و ڕۆژ گرامەفۆن!. جا ئیتر چۆن خوا چاوی لەسەرمان ئەبێت چۆن فریشتە ڕوومان تێ ئەکات. وە چۆن نانمان نابڕێ و ناکەوینە سەر ساجی عەلی». ئینجا ڕوویشی کردە من و گوتی: «هەستە کوڕە هەستە، هەر ئێستە ئەبی ئەم گرامەفۆنە بەریتەوە ماڵی خاوەنی. ئیتر نامەوێ بیهێننتەوە بەم ماڵەدا». هێشتا نەنکم قسەی خۆی تەواو نەکردبوو من پیرەگرامەفۆنم فڕاند و گەیاندمە سەر پلیکانەکان. بەڵام کاتێکم زانی کاکم بەسەری قوتین و پێی خاوس، بەهەڵەداوان گەیشتە سەرم وە گرامەفۆنی پێ گێڕامەوە سەرێ! گوتی: «نەنکت هەزار قسەی وا بکات بەخوا نەبێ گرامەفۆنم هەر بۆ لێدەی». نەنکیشم گوتی: «کەواتە لە قسەی خەڵک و لە فریشتە نەهاتن و لەنان بڕین و لە دڵی خوا شکاندن ناترسیت». کاکم گوتی: «نا!». نەنکم گوتی: «کەواتە ئەگەر بەخۆڕاییش دەستکەوتبێ تووڕە نابی!». کاکم گوتی: «پەشیمان بوومەوە!». نەنکم گوتی: «ئەی ئەگەر گرامەفۆنەکە لە چوار مانگ لەمەوپێشەوە بەدزی تووە بەپارەی براکەت و دایکی کڕابێ ئەڵێی چی». کاکم گوتی: «ئەڵێم سەد جار پیرۆزمان بێت!». کاکم ئەوەی گوت و لە خۆشیانا دەسی کرد بەبازدان و هەڵپەڕین!. ئینجا نەنکم دەستی کردە قاقای پێکەنین و بەمن و دایکمی گوت: «هەرچییێکم گوت نەهاتە دیی...؟».

گوتمان: «بەڵێ». پاشان هەرسێکمان بەکاکمان گوت: «خوا هەر ئەو خوایەیە کە چروکی پیاو فێری خواناسین ئەکات. وە ڕەوشت و خۆی چاکی پێ ئەگری و زمانی تەڕوپاراوی پێ پەیدا ئەکات و شەڕ و شۆڕ و تووڕەیی فێر ئەکات. ئاخ ئایین و دین و ڕەوشتی چاکی بەسەزمان!. چەند خراپە و دزی و درۆزنی و شەڕ و شۆڕ و جوێن و زۆر و ستەم لەژێر پەردەی پاکی ئاسکی ئێوەدا ئەکرێ!». کاکم سەری داخست. ئێمەش هەموومان پێکەنین. بەڵام کاکم گوێی نەدایە، لە شەرما دەسی کرد بەگرامەفۆن لێدان. بەڵام تا

ئەو قەوانێکی خستە سەر، من سنگێک و گوریسێک و هەندێ جەوی و چەند پارچە قاقەزێکم بۆ ئامادە کرد و خستمە بەردەمی!. کە ئاوڕی دایەوە، دایە پرمەی پێکەنین. ئاشتێکی کردم و ناوچەوانی ماچ کردم. وە چو دەستی نەنکم و دایکیشمی ماچ کرد. بەڵام تا ئەو سەری هەڵبڕی، کیسە باخەڵەکەیم دەرهێنا، کە تەماشای کرد ئەوا پیشەکی پارەی چاککردنەوەی گرامەفۆنەکەی لێ دەرئەهێنم، زوو لە مەبەستم گەیشت. دەست بەجێ گرامەفۆنەکەی بۆ بەجێ هێشتم. ئیتر لەو ڕۆژەوە، بیرای بیرای کاکم بتوانێ بێ دڵیمان بکات و (دیکتاتۆری)مان بەسەرا بکات. وە ئیتر کاروباری ماڵ بەهونەرمەندی و ژیری نەنکم و پوڵی من و دایکم و هێزی (کۆمەڵی دیموکراتی ڕاستەقینە)ی هەرسێکمانەوە، بەجوانی و پەسەندی و شادمانی هەڵئەسووڕێنرا.

## چەقاوەسو

میوانداری لە کوردەواریدا ئەمەندە باوە کەس ناوبانگی بەدەست بڵاوی دەرناچێ، تەنیا چروک و دەست قوچاوەکان لەناویادا ناو دەرئەکەن. بۆ پیاوەتی و بەدەورووپشتا هاتنی میوان ناسیاوبی یان نەناسیاو، هەژارەکانیش وەک دەوڵەمەندەکان میوانداریبیان گەیاندۆتە ئەوپەڕی چاکی. هەتا گەلێ جاری وا بووە کە خانەخوێ خۆی دووچاری قەرد و نابوتی کردووە، بەڵام میوانی لە ماڵ دەرنەکردووە. خەڵکی دێی (ئەتروش)یش هەروەها سەرگەردانی دەستی میوانداری بوون. بەوەخت و بێ وەخت، جگە لە پۆلیس و فەرمانبەرانی حکوومەت، ئەگەر میوانێکی زۆریش ڕووی بکردایە ماڵە گەورەیەک هەمیسانەوە بەسەر ماڵەکانی تری ئەتروشا دابەش ئەکران. لەبەر ئەوە خەڵکی دێی (ئەتروش) گەلێکیان کەوتبوونە ساجی عەلی. وە لەبەر بەدخوویی هەندێ میوانی ناچیزە گەلێکیان لە میوان وەڕس بووبوون، وە گەلێ جار سکاڵای دەردی خۆیان بۆ ئەم و ئەو ئەکرد. سەرت نەیەشێنم جارێکی تریش نزیکەی پانزە بیست کەسێک لە کرێکاری تەلگراف بەسەر ماڵەکانی ئەتروشا دابەش کران. هەرچەندە کەسیان بەخەڵکی دێیەکە ناسیاو نەبوون. بەڵام گشتیان میوانداریبیان کرا یەکێکیان نەبێ. کە ئەویش تووشی ماڵێکی بێ دەست و لە میوان وەڕس بووبوو، بەڵام چەقاوەسو. لە کورتی بیبڕمەوە، خانەخوێ بەکابرای کرێکاری گوت: «میوانداریت ناکەم بڕۆ بڕۆ بۆ ماڵێکی تر».

کابراش پێی گوت: «بەخوا خۆشت بێ و ناخۆش، تازە بەم درەنگ وەختە سەر بەماڵی کەسا ناکەم ماڵی تۆ نەبێ». لەم قسەیەک و لەو قسەیەک، دوایی لێیان بووە چەقەچەق. تا ئەو جنێوێکی بەکابرای کرێکار ئەدا، ئەم دوانی پێ ئەدایەوە. ئینجا لە پاش ئەمەی هەردوولا بەقاوقیژ دەنگیان نووسا، کابرای کرێکارم کرێکار، لە خاوەن ماڵ چەقاوەسوتر دەرچوو، سەری کرد بەماڵا. هەرچەندە خاوەن ماڵ پاڵی پێوە ئەنا و ژنەکەی قسەی پێ ئەگوت و منداڵەکانیشی دامێنیان ڕائەکێشا، بەڵام کرێکار لە جێی خۆی نەئەبزوت. ئەو دانیشتنەی دانیشت، لێی هەڵنەسا تاکو بەیانی. کابرای خاوەن ماڵ گوتی: «گیانت دەرچێ، نە پێخەفت ئەدەمێ نە تیکەیێ نان». کرێکاریش پێی گوت: «شەقیش بەری، نانیشت ئەخۆم و پێ خەفیشت لێ ئەسێنم، خۆ خۆم بۆ تۆ ناکوژم. وە خۆیشم لەسەرمانا ڕەق ناکەمەوە». ئەمجارەیش

لەمەوە قسەیەک و لەوەوە قسەیەک لێیان بووەوە بەشەڕ و هەڵلا، تێروپڕ جوێنیان بەیەکتر دایەوە. وە هەتا لە پەلوپۆکەوتن لەیەکیان دا. خاوەن ماڵ و منداڵەکانی تا درەنگ نانیان نەخوارد. بەڵام کرێکار وەڕس نەبوو. هەر دانی بەخۆیا گرت هەتا ئەوان ناچاربوون نانیان هێنایە پێشەوە بیخۆن. هەرچەندە خاوەن ماڵ و منداڵەکانی تامی تامییان ئەدا و پێیان ئەگوت: «بەخوا بشمری چێشکەی ناکەیت» بەڵام کرێکار هەر پێئەکەنی، هەتا هەڵی لێ هەڵکەت، لەپڕ پەلاماری نان و چێشتەکەی دان وە بەهەڵپە هەڵپە دەستی کرد بەخواردنی. هەر چەند کە ئەمانیش هەڵمەتیان ئەبردە سەریو سەروگوێلاکیان ئەکوتا و کەلوپەلیان ڕائەکێشا، بەڵام لە چەند گوێچکە نانێک و سە چوار تیکە چێشتێک بەولاوە هیچیان لە دەست دەرنەهێنا. ئینجا کە مامەی کرێکار تێری خوارد، بەپێکەنینێکەوە ڕووی تێ کردن و گوتی: «ئافەرین بۆ خانەخوێ کانم، ئەوەندە ئازان بەزۆر نەبی، نان دەرخواردی میوانی خۆیان نادەن. بەخوا - نۆشی گیانیم بێ- نانەکەتان خۆش بوو. یاخوا ئەو دەس و پەنجەیە خۆش بێ کە دروستی کردووە».

زۆری پێ نەچوو لەسەر چایش لێیان بووەوە بەشەڕ. سەروگوێلاکی یەکتریان شکان. هێشتا هەر نەئەبەزین. کابرای کرێکار ناوی خوای لێ ئەهێنا، هەر چایەک خانەخوێ بۆ خۆی و منداڵەکانی تێی ئەکرد، ئەم گورج ئەی فڕاند و ئەی خواردەوە. یان نەیئەهێشت ئەوان تامی بکەن ئەیڕژاند، هەتا وای لێ کردن بەناچاری لەگەڵیا ئاشتبوونەوە و ئیتر چا کەیان پێکەوە بەئاسوودەیی خواردەوە.

لەگەڵ ئەمەشا کە کاتی نووستن هات بێخەفیان نەدایە. کابرا وەختبوو لەسەرمانا زیرە بکا. بەڵام خۆی ڕاگرت تا ئەوان خەویان لێکەوت. ئینجا چوو بەئەسپایی لێفەکەی لەسەر لادان وە دۆشەک و سەرینێکی لەژێر دەرهانین. شەڕ هەڵگیرسایەوە. بەڵام تازە لە پەلوپۆکەوتبوون وە بەتەواوەتی بڕستیان بڕابوو. ئەمجارە پێیان نەکرا ئەوەندە لەسەری بڕۆن. زوو بەزوو ئاشت بوونەوە و ڕێککەوتنەوە و هەردوولا نوستن تا بەیان. کە سبەینێ خەبەریان بووەوە و تێروپڕ سەیری چروچاو و سەر و پۆتەلاکی یەکتریان کرد، هەردوولا، قاقا، دەستیان کردە پێکەنین. ئینجا پێکەوە، بەیەک دەنگ، بەیەکیان گوت: «بەڵێ ڕاستە، خانەخوێی وا چەقاوەسو، میوانی وا چەقاوەسوی ئەوێ!». بەڵام لەو ساوە تاکو ئێستا، ئیتر ببڕای ببڕای، جارێکی تر (ئەتروش)، میوانداری وەهای تیا ڕوو بداتەوە!.

## سەرێکی هەیە و هەزار سەودا

میرزای خورماڵی، یەکێک بوو ئازا و وریا، چوارپەل قەوی، کارگوزار و خۆشزار. سەری لە هەموو کاروبارێ دەرئەچوو. هە چ کار و فەرمانێکیشی پێشان درایە تێی هەڵئەچوو. لەگەڵ ئەمەشا نانی شەوی نەبوو! پاسەوانی دوکانەکانی خورماڵی ئەکرد، لەگەڵ ئەوەشا بتکوشتایە تفەنگی هەڵ نەئەگرت. سەریشت ببڕیایە چرای بەو گوزەرەدا هەڵئەئەگیرساند. سا خۆی و خوای خۆی ئەگەر ئارەزووشی نەبوایە، گوێی نەئەدایە هۆشیاری. خرپ خەوی لێ ئەکەوت تا بەیان!. لەگەڵ ئەمەشا پاسەوان (حەسحەس) بوو وە بیست دوکاندار ترو تفاق و کەلوپەلیان بەو سپاردبوو بیانپارێزی. بانگێڕ بوو لەگەڵ ئەمەشا تا باران خۆشی نەکردایەوە نە ئەچووە سەربانەکان بیانگێڕێ و وە هەتا دڵۆپە و چۆڕاوگە کەلوپەلی ناوماڵ و

دوکانەکانی ئەشتایەوە، حەزی بەئازاردانی سەربانەکان نەئەکرد. ئەگەر لێت پرسیایە «بانەکەمت بۆ چ نەگێراوە؟». ئەیگوت: «چاوەکەم! بۆچی من شێت بووم بەو شەوە هەمووتان لەخەو هەراسان کەم!».

هەتا بڵێی چیرۆکی خۆش خۆشی لەبەر بوو. دڵتەڕ بوو، وە حەزی لە شتومەکی جوان ئەکرد. لەگەڵ ئەمەشا، هەر کەس ژنەکەی میرزای بدیایە، دڵی ئەگیرا، وە تا سە ڕۆژ نانی پێ نەئەخورا. کە لێت پرسیایە: «خوا بتگرێ بۆ چ ملی خۆت بەپەتەوە کردووە؟». ئەیگوت «چی بکەم لە کۆڵم نابێتەوە. تا من بەرەڵلای ئەکەم، ئەو مارەم ئەکاتەوە».

پینەچی بوو. لەگەڵ ئەمەشا کە پێت ئەگوت: «میرزا ئا ئەو کەوشەم بوو پینەکە»، تا نیوەڕۆ بەدوی دەرزی و درەوشەکەیا ئەگەڕا ئینجا ئەیدۆزیەوە!.

خۆ سەریشت هەڵکەندایە، وازی لە خانوو دروستکردنی خۆی نەئەهێنا. بەڵام تا قوڕی بۆ دیوارەکەی تر ئەگرتەوە دروستی کات، دیوارەکەی پێشووی هەرەسی ئەهێنا. وە تا ئەمی هەڵئەچنیەوە قوڕەکەی وشک ئەبووەو و لە کەڵکی دیوار دروستکردن ئەکەوت.

هەر بیزانیایە برسیتە، دەست بەجێ چوار شیش کەبابی بۆ دروست ئەکردیت. بەڵام دوژمنی گیانت بی، مەگەر ئارەقەت بکردایە بەمەزەی ئەگین هەموو دەمت ئەسووتا، وە هەموو ناو دەمت بلوقی ئەکرد.

نانەوانەیەکیش بوو وێنەی لە ڕۆم و عەجەما نەبوو. بەڵام هەر ئەوەندەت خۆش بوو تا بایەک بەر سەمونەکەی ئەکەوت. بۆ چ ئەگەر دارتاشیشت بهێنایە سەری، پارچەیەکت لێ ئەکردەوە!.

خۆشت بکردایە بەدارا، میرزا نەی ئەهێشت بەکەس ئاو بهێنیت، بەڵام ئەگەر لە تێنوانا کوێر بوویتایە ئینجا تا دوو ڕۆژ لەسەریەک تێر ئاوت نەئەخواردەوە، ئەبوو دوو ئەوەندەی نرخی ئاوەکە پارەت بدایە بەخەڵک، بەدویا بگەڕانایە تا میرزایان بۆ ئەدۆزیتەوە، ئینجا ئاوت دەستگیر ئەبوو. کە ئاویشی بۆ ئەهێنای، تا ئەیگەیاندە لات، تنەکەکانی هیچیان تیا نەئەما!.

میرزای غەفور، هەموو ڕۆژ ئەم حەوت پەندەی ئەنواند بەسەزمان، هەر لەبەیانییەوە هەتا ئێواری، وە هەر لە ئێوارەوە هەتا بەیانی خۆی ئەتەقاندەوە کەچی ئەوەندەی دەست نەئەکەوت کە خۆی و خانمەکەی تێری پێ بخۆن و بڵێن ئۆخەی!. لەبەر ئەوە میرزا بڕوای بەخوا کەم مابوو!. خۆ پیر و پیاوچاکان هەر بەبیریشیا نەئەهاتن! لەگەڵ ئەمەشا کە کاری بکەوتایە ئەوان، دەستی ئەکردەوە بەنوێژکردن. بەبیری خۆی چەواشەی ئەکردن، تا لە فەرمانەکەی ئەبووەوە. کە فرمانەکەی جێبەجێ ئەبوو، ئیتر بیرای بیرای هەر ناویشی نەئەبردن!.

ڕۆژێک میرزا قاچی دەسی کرد بەئاوسان. کە تەماشای کرد ئەوا ڕۆژ بەڕۆژ خراپتری لێ دێت، دەستی کردەوە بەنوێژکردن و تەزبێح بەدەستەوە گرتن و خواناسین. دوای چەن ڕۆژێک چووە سەر شەخسێک لە نزیک خورماڵەوە. پەیمانی دا، ئەگەر شەخس چاکی بکاتەوە سویجگەرێکی بۆ بکا بەخێر، وە لە ڕێی خوادا بیبەشێتەوە. لەوێ چەند ڕۆژێک نوست زۆری پێ نەچوو. چاک بووەوە. بەڵام کە هاتەوە بۆ ماڵەوە و سوێجگەرەکەی کڕی، ڕووی کردە لای شەخسەکەوە و دەنگی هەڵبڕی، گوتی: «بۆ چ من کەربووم سویجگەر بۆ تۆ بکەم بەخێر؟ ئەی خۆم و منالەکانم چی بخۆین». ئەوەی گوت و بیرە سویجگەری

بەخاتوونی ژنی لێ نا بەچێشت و دەسی کرد بەخواردنی. بەڵام زۆری پێ نەچوو قاچەکەی ئاوسایەوە. ئەمجارە چووەوە سەر شەخسەکە و رووی تێ کردەوە. گوتی: «بابە ئەمجارە چاکم بکەرەوە، پەیان بێ جگە لە سویجگەر سەر و پێیە گەیشت بۆ ببەشمەوە!». بەڵام قاچ چاک نەبووەوە. وە تا چەند مانگێک نەیخست و پزیشک (دکتۆر) دەرمانی نەکرد و میرزاش وازی لە فروفێڵی خۆی نەهێنا و ڕێگای ڕاستی نەگرت و «خۆی بەیەک فرمانەوە بەند نەکرد و خۆی تیا قاڵ نەکرد»، قاچەکەی چاک نەبووەوە و خوا دەروی دەرامەت و خۆشگوزەرانی و کامەرانی لێ نەکردەوە!.

ڕاستت ئەوێ ئەم میرزایە، تا لە چووختێتی خۆی وازی نەهێنا، من و فەرمانبەرەکانی تری خورماڵ، لە خۆمان زۆر ئەترساین کە کار و فەرمانمان لە دەست بکاتەوە و نانمان ببڕێ!. چونکە یەکێک ئەم هەموو کاروبارە، ڕۆژی بەپەنجا فلس کەمتر بکات و و ڕاپیەڕینێ، بەزۆرت نەئەزانی کە بچیتە سەر حکوومەت، بڵێ: «من پەیان ئەدەم هەموو کار و باری مدیر و قۆمیسەر و مامۆستا و فەرمانبەری گومرگ و نیستهلاک مانگی بەدوو دینار ڕاپەڕینم!».

بەڵام لە سایەی خواوە میرزای خورماڵی کەوتە سەر ڕێی ڕاست. ئەم پەیاننامەیەی لەگەڵ حکوومەت نەکرد. ئێمەیش نانمان نەبڕا وە لە دەستی ڕزگارمان بوو. وەکو وتمان میرزا لە لەش و هۆشا رووی کردە چاکی. وە ئیتر لەو ڕۆژەوە میرزا لە خۆشیانا نەئەچووە ماڵەوە وە لە گوزەری دوکانەکاندا لەسەر تەخت ئەنوست. بەڵام چە تەختێک... تا تەختێکی بۆ خۆی بەکردن دا، هەشت کورسی بچکۆلەی لە چایخانەکەی خورماڵ ئەخواست، وە بەتەنشت یەکەوە دای ئەنان، ئینجا لەسەر ئەوانە ئەنوست!. کە لێیان ئەپرسی: «بۆ چ بەم تەرحە ئەنوویت؟» ئەیگوت: «خوا پێداو ئەبێ وا بخەفێ. بەڵام ئێوە ئەم پەندە نازانن. ئەگەر لەسەر یەک تەخت بنووم خەبەرم نابێتەوە. بەڵام چونکو ئەم تەختە هەشتە کەرتە، هیچ نەبێ یەکێکی لەژێرما ئەجووڵێتەوە. ئەوسا منیش زوو زوو خەبەرم ئەبێتەوە.وە باشتر ئاگام لە دوکانەکان ئەبێ. دڵنیابن هاکا تفەنگیم کڕی. وەهاکا چرایشم لە گوزەری دوکانەکان داگیرساند. ئەوسا ئێوە ئازان بەمیرزای خورماڵی پێبکەنن!».

## دادگاهی سەرچنار

لەخەوما سەیران بوو. خەڵکی سلێمانی بەدەستووری جارانیان هەرچی پیاوی کە دڵتەڕ و ئەرباب و دەست بڵاو و جەنگاوەر و نیشتمانپەروەر و گاڵتەوگەپ کەربێ، کۆیان کردبووەوە. وە لەسەر ڕێدانی حکوومەت، حکوومەتێکی جمهورییان پێکەوە نابوو، بەم مەرجە، لە خاکی کوردەواریدا تا پێنج ساڵ هەرچی فەرمانێک بدا بۆی بهێنرێتە جێ، وە هەرچیش بکات لێی نەپرسرێتەوە. سەیرانی ئەمجارەیان لە هی جاران گەلێک بەئاهەنگتر و گەلێ شۆخ و شەنگتر و تەمەن درێژتر، وە حکوومەتەکەشیان گەلێک بەزەبر و زەنگتر و کار دروستتر و بەکارتر بوو. لە گشت لایەکەوە ئەدیب و شاعیر و پیاوی زانست و فەن و لاوچاک و نیشتمانپەروەر بانگ کرابوون. (حاجی قادری کۆیی)یان کردبووە (سەرۆکی جمهوری سەرچنار). بەڵام لە هەموو خۆشتر و جوانتر و بەگۆبەندتر دادگاهە (محکمە)کەی بوو کە دروست بووبوو لە (کفر ئەحمەد) و (مەلا حەمدوون) و (فایەق بێکەس) و (ئەحمەدی خانی) و (مەلا قانع) و (زیوەر

ئەفـەندی) لەمـانە دۆسـەیەکیـان دانرابوون و داد پرسین و سکالا نووسین، بەگـەلەش هەمـوویان لەسـەر شتێک دەموودەست بڕیاریان ئەدا. پاشان ئەو بڕیارە لەلایەن (سەرۆکی جمهوریەتی سەرچنار)ەوە پەسەند ئەکرا. ئینجا بەهۆی هێز و دەسەلاتدارانی جمهوریەتەوە بەسەر گوناهبارەکاندا ئەنوێنرا. وا لە خوارەوە ریزێک لەو گوناهباریی و بڕیارانە کە لە بیرماماون ئەخەمە بەرچاو.

## جاسوس

گوناهباریی: ئەمانە لەژێر پەردەی دنیا جاسوسی ئەکەن بەسەر گەل و نیشتمانەکەی خۆیانەوە.

بڕیار: نیوەی ڕوویان ڕەش کرێ، نیوەشی سپی. جلوبەرگیشیان هەر بەو ڕەنگە.

## تەمەڵی

- ئەم زەلامە تەمەڵ و تەوەزەلن. ماڵ و منداڵی خۆیان بەخێو ناکەن، ژنەکانیان بەخێویان ئەکەن.

- پێویسـتـە هەردوولایان لای پزیشک (دکـتـۆر)ێک دەسـتکاری کـەین. پیـاوەکـانیـان بکرێن بەژن، ژنەکانیشیان بکرێن بەپیاو. ئەوساش هەرلایە فەرمانی خۆی ببینێ.

## کۆڵکە خوێندەوار

- ئەمانە فریان بەسەر خوێندەوارییەوە نییە. کەچی نووسراو ئەنووسنەوە و بلاوی ئەکەنەوە.

- چل تۆپ گەلا جگەرەیان بۆ بکرێ و نووسـراوەکانیـان پێ بکرێ بەبنە جگەرە و ئەم گەلا جگەرانەیان پێ پڕکرێتەوە.

## دەنگ ناخۆش

- ئەمانە گۆرانی نەزان و دەنگ ناخۆشن. کەچی قەوانیان دەرکردووە.

- قـەوانەکـانی خـۆیان پێ بـکرێتـەوە و پێـیـان بکرێ بەدوگـمـە. جگە لەوە تا دوو مـانگ ترشی سماقیشیان دەرخوارد درێ تا دەنگیان ئەنووسێ.

## کەش و فش

- ئەم فـەرمـانبـەر و دەوڵەمەندانە، لە خـۆیان بایی بوون و لە خەڵک لووتیان گەیاندۆتە ئاسـمـان. چە بەزمان وە چە بەکردەوە، بەبێ گوناه دڵی خەڵک ئازار ئەدەن.

- تا مانگێک هەموو ڕۆژ دەرمـانێکی وایان بدرێتێ کە بایان لێ بەربێتەوە و خەڵک پێیان پێبکەنێ. وەتا سە مانگیش بکرێن بەشوانی عەلیشیش تا لە کەش و فشی خۆیان ئەکەون.

## شاگردی خوێرەبی

- ئەم شاگردانە فریان بەسەر خوێندنەکانیانەوە نییـە. هەر لە خوێرێتی خەریکن. لەوپەڕی سـاڵیشـا بەقوپیەکردن و تکاکردن لەم و لەو لە تاقی کردنەوە خوێندنەکانیاندا دەرئەچن.

- بکرێن بەشـاگـرد زەڕەنگەر تا چەند مـانگێک. پاشـان تاقـیکردنەوەی سـاڵی هەڵگیـرێ. لە خوێندنگاکاندا، شاگردان هەموو ڕۆژ تاقی کرێنەوە.

## ناکۆکی ناو ماڵ

- ئەمانە لەگەڵ ژن و منالی خۆیاندا هەڵناکەن. لەسەر هەموو شتێک چەقەچەق و شاتەشات ئەکەن. ژنەکانیان لێ جیاکرێنەوە. هەر چەکیشیان هەیە بەسەر منالەکانیاندا دابەش کرێت. خۆیشیان بکرێن بەسەگەوان تا دێنەوە سەربار.

## خوێندەواری بێ کەڵک

- ئەم خوێندەوارانە ئەنووسراوێک ئەنووسنەوە خەڵک کەڵکی لێ وەرگرێ. نەهەوڵێکیش ئەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و پێشکەوتنێکی گشت لایی.
- بکرێن بەقەتارچی.

## دزی و جەردەیی

- ئەمانە خەریکی دزی و جەردەیین.
- پێویستە حکوومەت فیری پێشەوەری و کار و فەرمانی بەکەڵکیان کات هەر یەکەش بەپێی توانا و ئارەزووی خۆی فەرمانێکی بەکەڵکی بۆ بدۆزێتەوە تا پێوەی بەرێوە بچێ.

## فەرمانبەری خراپ

- ئەم فەرمانبەرانە هەر لەبەزم و ڕەزم و گیرفان پڕکردنی خۆیان خەریکن. خەڵکەکەیان بەجنێودان و بەرتیل سەندن و زۆرداریی وەڕس کردووە.
- هەرچیەکیان هەیە لێیان بسێنرێتەوە. وە بەنرخی ئەو شتانە ڕێگای ناو شار و دێهاتەکانی پێ بکرێتەوە و تەخت کرێ. خۆیشیان کرێکارییان پێ بکرێ لەو ڕێگایانەدا تا تەواو ئەبن.

## دەوڵەمەندی نارەسەن

- ئەم لاوانە لە باوک و کەس و کاریانەوە پارەیەکی زۆریان بۆ بەجێ ماوە. بەڵام لە بریتی ئەمەی کار و فەرمانی بەکەڵکی پێ هەڵسوڕێنن و، بەختی کەن بۆ کەڵکی گشت لایی، ئەچن بەخواردنەوە و داوێنپیسی و قومار و خوێڕێتییەوە لە ناوی ئەبن.
- ماڵیان تاڵان کرێ. زەویەکانیان زەوت کرێ. بەنرخی ئەو شتانە خەستەخانەی لەش و هۆش بکرێتەوە. خۆیشیان دەماری نێرێتییان ببڕی. کرێکارییان پێ بکرێ لەو خەستەخانانەدا تا تەواو ئەبن. پاشان لەو خەستەخانەشا تیمار کرێن تا چاک ئەبنەوە.

## خوێندەواری نالەبار

- ئەمانە خۆیان بەخوێندەوار و تێگەیشتوو دائەنێن کەچی کەسیان لەگەڵ یەکا پاک نین. وە لە هەوڵی ئەوەدان کە یەکتر ڕیسوا و سەرگەردان بکەن.
- هە چ نووسراوێک نووسیویانەتەوە بسووتێنرێن. پاشان گشتیان بخرێنە بیرێکی قوڵەوە، تا لەمیان دێنە دەرەوە. بخرێنە بیرێکی قوڵترەوە. تا فێری نازی یەکگرتن و یارمەتیدانی یەکتر ئەبن.

## خزمی زۆردار

- ئەمانە بەناوی خزمایەتییەوە، هەتا ئەم هەتیوانەیان پێگەیاندووەس سەرمایە و زەوی و زارەکانیان لێ داگیرکردوون و ئێستا نایاندەنەوە.

- هەرچییەکیان هەیە بدرێ بەو هەتیوانە. خۆیشیان بکرێن بەتونچی تا باوەڕ بەخوا ئەهێننەوە.

## داوێنپیسی

- ئەم ئافرەتانە داوێنپیسی ئەکەن. وەک زانراوە هەندێ لەتاو بەزۆردان بەشوو و زۆرداریی مێرد و باوکەکانیان، وە هەندێکیش لەبەر نەدان بەشوو لەبەر پولپەرستی گەورەکانیان، وە هەندێکیش لەبەر دەست کورتی تووشی ئەم خوە ناشیرینە بوون. لە بەندیخانەی ژناندا فێری پیشەوەری و خوێندەواری بکرێن. پاشان هەر کەسیان بەدڵی خۆیان بدرێن بەشوو وە پارەی باوک و مێردە پیشەوە خراپەکانیان بدرێتە دەست خۆیان و مێردە تازەکانیان کار و فەرمانی بازرگانیی پێ هەڵسووڕێن

## دۆستایەتی درۆ

ئەمانە دۆستایەتی بۆ سایە و مایە ئەگرن لەگەڵ پیاوی گەورە و دەوڵەمەندا. کە کاروباریان نامێنێ بەکەس، دەست ئەدەنە دوژمنایەتی.

- بکرێنە سەگەوان، تا لەوانەوە فێری دۆستایەتی و چاکەدانەوە ئەبن.

## گرانجانی

- ئەم دوکاندارانە لە کێشانە و کڕین و فرۆشتنا گزی ئەکەن، بەگرانیش شت ئەفرۆشن.

- بەسەرمایەکانیان دوکان بۆ دز و جەردە و پیاوچاکان دانرێ. خۆشیان بکرێن بەجووتیار تا فێری ڕاستی و دروستی ئەبن.

## زۆری سەردار

- ئەم سەردارانە بەدی ئەکەن لەگەڵ ژێر دەستەکانیاندا. هەر خەریکی زۆردارین. نە خزمایەتی ئەخوێننەوە نە هاوزمانی نە هاوخوێنی.

- بکرێن بەحوشترەوان. تا فێری ڕام کردنی خەڵک و کەڵکداری ئەبن.

## وەستای ناشی

- ئەمانە لە کار و فەرمانی خۆیاندا ناشێن و زیان بەخەڵک ئەگەیێنن.

- یان ئەوەتا سەرلەنوێ بخرێننەوە بەوەستا تا بەتەواوی فێری پیشە و فەرمانەکانیان ئەبن. یان بکرێن بەبۆیاخچی تا زوو ناشیتییان دەرکەوێ و فێری خەڵک هەڵنەخەڵەتاندن ئەبن.

## لاسایی ڕۆژئاوایی

– ئەمانە هەر لاسایی ڕۆژئاواییەکان ئەکەنەوە لە شتی پڕوپوچا ، کەچی فیز بەسەر خەڵکا لێ ئەدەن و قیزیان لێ ئەکەنەوە.

– چەند ساڵێک لەلادێدا بهێڵرێتەوە تا باووباپیری خۆیان بیر ئەکەوێتەوە.

## دووڕوویی و بەدخوویی

– ئەم مەلا و متقاعدانە قەت بەفەرمانێکی جوانەوە خۆیان خەریک ناکەن. هەمووده‌م خەریکی هاتوچۆی چایخانە و دیواخانەکانن بۆ قسە گێڕانەوە و خەڵک بەگژیەکا کردن و قسە بەخەڵک گوتن.

– ئەمە دەردی برسێتی و بێ کار و فەرمانییە. پێویستە حکوومەت موچەیەکی باشیان بۆ ببڕێتەوە و بیانکانی بەمامۆستای خوێندنگا شەوییەکانی دێهاتەکان. جگە لەوە دەسەڵاتێکی باشیشیان پێ ببەخشێ بۆ ڕێکوپێک خستنی ژیان و کاروباری لادێیەکان. ئەوسا لە خۆیانەوە دەمکوت ئەبن و بەکەڵکی خەڵکیش و خۆشیان دێن. لە ئێستا بەدواوە ناهێڵرێ هیچ فەقێیەک لە مزگەوتا بخوێنێ تا شان بەشانی خوێندنەکەی فێری پیشەیەک نەبێ لەسەر دەستی وەستایەکا.

لە متقاعدەکانیش چوونە چایخانە و دیواخانان بەربەست کرێ، هەتا کار و فەرمانێکی بەکەڵک و خۆیان ئەدۆزنەوە.

## کچانی

– ئەم کوڕانە یەجگار خۆیان تاس و لوس ئەدەن. بەسمێڵ تاشین و چاکەتی کورت و شتی ئاڵووالا لەبەرکردنەوە باویان لە کچ سەندووە. نە گوێ ئەدەنە خوێندن و نە گوێ ئەدەنە باوک و دایکیان. هەموو دەم لە دوی شتی سووک و نامەردانە ئەگەڕێن.

– بکرێن بەشاگرد کەبابچی و شاگرد ئاسنگەر و کاروانچی و خەڵوز دروستکەر. تا دەماری پیاوەتی تیایانا پەیدا ئەبێتەوە.

## دەوڵەمەندی بێ قەدر

– ئەم دەوڵەمەندانە لە عاستی بێ دەست و هەژاراندا دەست قوچاون مەگەر زەبریان پێ گەیاندرابێ، یاخود شەرمەزار کرابن لەبەردەم خەڵکا ، ئەگینا ئەگەر بۆ کەڵکی خۆیان نەبووبێ، قەت یارمەتیی بێکەس و هەژاریان نەداوە و فەرمانێکی باشی گشت لایییان نەکردووە.

هەموو دەم بۆ ئەوە گەڕاون کە بەفرۆفێڵ هاونیشتمانەکانیان بڕوتێننەوە.

– پێویستە سە بەشی سەرمایەکانیان لێ بسێنرێ. وە بەو پارەیە چەند خوێندنگایەک بکرێتەوە کە منالانی بێکەس و هەژارانیان بەخۆڕایی تیا پەروەردەکرێ تا فێری خوێندەوارییەکی تەواو و پیشەوەرییەکی بەکەڵک ئەبن. هەرچی زەویوزار و خانوو دوکانێکیشیان هەیە لێیان داگیر کرێ و بکرێ بەدەستمایە بۆ ژیاندنی ئەو خوێندنگایانە.

هەر دەوڵەمەندەشیان چۆغەیەکی سوور بنرێ بەسەرشانیانەوە. وە تا خەڵکی ئەڵێن کە بەڕاستی کردەوە و ڕەوشتی مەردانە و نیشتمانپەروەرانەیان گرتووە چۆغەسوورەکان لە شانیان نەکرێتەوە.

## پزیشکی نەشارەزا

– ئەم پزیشکە دانسازانە، لە بریتی دانی کلۆر، دانی تەواوی چەند کەسێکیان بەهەڵە کێشاوە. ئەمانەی تریش بەپارەیەکی زۆر نەبێ کەس چاک ناکەنەوە. هەژارەکان ڕەنجەڕۆ و، دەوڵەمەندەکانیش وەڕس بوون بەدەستیانەوە.

– هەر کەسێ بەهەڵە دانی تەواوی کێشراوە گازێکی بدرێتە دەست دانی پزیشکەکە بکێشێتەوە. بەپارەی پزیشکەکانی تریش خەستەخانەیەک بکرێتەوە بۆ هەژاران. چوونە لای هەر خاوەن دووکانێکیش بۆ شت کڕین، شتیان بەدوو نرخ پێ بفرۆشرێ تا بەڕاستی و دروستی فێری فەرمان بەجێهێنانی خۆیان ئەبن.

## سەربەستی

– ئەم هەتیوانە، لە کۆڵاناندا، هەموو دەم خەریکی جرتکەندن و قاوقیژ و شەڕە جنێون. لە نیوەشەوا بەدەنگێکی بەرزی ناخۆش گۆرانی ئەڵێن و خەڵک لەخەو و ماندووحەساندنەوە ئەکەن.

–لەژێرەوە، هەموو ڕۆژ، تا چارەکێک بایان تێکرێ، تا لە جرتکەندن ئەکەون. خوێندنگایەکی مۆسیقیشیان بۆ بکرێتەوە کە تیایا فێری مۆسیقە و گۆرانی گوتنێکی جوان و ڕێکوپێک ئەبن، وە تا لە قاووقیژ و بێ شەرمی و جوێندان واز ئەهێنن.

## دەس بڕین

– ئەمانە هەندێکیان بەبەرگ و پۆشەنی و سەروسیما، هەندێکیشیان بەناو و ناوبانگ دەستی خەڵک ئەبڕن و زیان بەهەستی گشت لایی ئەگەیێنن.

– جارێ لە پێش هەموو شتێکا پاش ناو و ناوبانگی خێزان و هۆز وەک (سەید، شێخ، حاجی، مەلا، بەگ، پاشا، ئەفەندی، ئاغا، میر سوڵتان) هەڵگیرێ. تەنیا ناوی ئە و ناوی باوکی ئەبرێ بەڕووتی. بەڵام بۆ نەوازش ئەتوانن بەیەکتر بڵێن (کاک). دووەم نەهێڵرێ کەس بەمێزەر، کەشیدە، شالی سەوز، ڕیش، پرچ و بابەتی کەش و فشەوە بسووڕێتەوە.

سەیەم چونکە گەڵێک جار پەچە و عەبا ئافرەتی خراپ ئەشارێتەوە. ئەمانەش نەهێڵرێ بپۆشرێن.

هەروەها چەک و خشڵ لەناو ژناندا و، خەنجەر و شیو تیر و تفەنگ لەناو پیاواندا و زەرگ و شمشێر و سەربڕین و شاپلیتە خواردن و مار و دووپشک گرتن و بەردکرۆشتنی لەناو دەروێشاندا هەڵگیرێ.

نیتر سوێند نابێ بخورێ. هەموو کەسێکیش ئەبێ دەفتەرێکی خۆ پێناسینی پێ بێ کە وێنە و ناو و تەمەن و کار و پیشە و شوێنی تیا ناو برابێ. ئەوی ئەمانە نەکات لە خاکی جمهووریەت دەرنەکرێ.

## نەپوختەیی

- ئەم کەبابچی و چێشتکەر و چایچییانە دوکانەکانیان ناپوختە و نارێک و بێکن. شاگردەکانیان چڵکن و بڵکنن. کڕیار تا لە دوکانەکانیاندا شتێک ئەخۆن، گەلێک قێز و بێزیان لێ ئەکاتەوە و پەشیمانی لە هاتن ئەنوێنی.

- خوێندنگایەکی بۆ بکرێتەوە فێری دڵتەڕی و پاک و تەمیزی و ڕێکوپێکی و کردەوەی شیرینیان کات لەگەڵ خوێندەواری.

وە لەلایەن لێژنەیەکی خوێندەواری دڵتەڕەوە هەمیوو دەم سەرپەرشتی کرێن تا خەڵک وایان لێ دێ ئاوات بخوازن کە بێنە دوکانەکانیان.

## بیانو کەیبانو

- ئەم کایبانوانە دڵی مێردەکانی خۆیان دەرهێناوە بەپەڵپی زۆر و بیانوی گەورە گەورە گرتن. لەبەر ئەوە مێردەکانیان نابوت کردووە و ناوخێزانیان پڕ کردووە لە ئاژاوە و ناخۆشی.

- خشڵ و بەرگ و پۆشەنیی کوردی لەناو ژنان و پیاواندا هەڵگیرێ. پێویستە هەردوولا بەرگ و پۆشەنیی ڕۆژئاوایی لەبەرکەن بۆ ئەمەی ژن و پیاو لە دەردی یەکتر بگەن، پێویستە فێری فەرمانی یەکتر کرێن. وە هەر مانگە سە ڕۆژ ژن فەرمانی پیاو وە پیاو فەرمانی ژن ببینێ. ئیتر نابی کەس کارەکەر و ڕەنجبەر و نۆکەر ڕاگرێ. پێویستە ژنیش وەک پیاو فەرمان بکا وە دەستکەوتی هەردوو بەخت کرێ بۆ ماڵەکە. بۆ ئەمەی بەم ژیانە ڕابێن پێویستە خوێندنگایان بۆ بکرێتەوە.

## یانەی ژنان

- ژنان کۆڵانیان کردووە بەیانە. هەر ژنە لەبەر دەرگای خۆیا دائەنیشێ. بەچەقە چەق و قاووقیژ و گفتوگۆ لەگەڵ ژنەکانی ترا سەر لە ڕێبواران و ماڵە دراوسێکان ئەشێوێنن.

- یانە و خوێندنگایان بۆ بکرێتەوە کە فێری ڕابواردنێکی جوان و ڕێکوپێک و بەکەڵکیان بکا.

## باخچەی منداڵان

- ئەم منداڵە وردانە بەیاری کردن و قاووقیژ و جنێودان و شەڕەشەق و بەردهاوێشتن لە کۆڵانەکاندا ڕێبوار و ماڵانیان لە گیانی خۆیان وەڕس کردووە.

- بەپارەی حکوومەت و پارەی باوکەکانیان چەند باخچەیەکی منداڵانیان بۆ بکرێتەوە کە لەوێدا هەموو جۆرە یاری و بابەتی یاریی منداڵانەیان بۆ دامەزرێنرێ وە لەژێر سەرپەرشتی چەند مامۆستایەکی شارەزا و چاکا ڕاهێنرێن و خەریک کرێن بەڕابواردنێکی خۆشی بەکەڵکەوە.

## خوێزملۆک

- ئەمانە بەخوازملۆکی هەموو لایەکیان هەراسان کردووە. وە گەلێ نەخۆشی لەش و هۆش و کردەوەی خراپیان بڵاوکردۆتەوە.

- چەند هەژارخانەیەک بکرێتەوە و بۆ پەککەوتە و داماوەکان. تیا بەخێو بکرێن وە بەپێی توانایان فێری پیشەوەری و کار و فەرمانی بەکەڵک کرێن.

بەڵام خوازەڵۆکە چوار پەل قەویەکان بکرێن بەشاگرد ئاسنگەر و دارتاش و خانوو دروستکەر تا فێری نان پەیداکردنێکی پاک و خاوێن ئەبن.

## باج

- خەڵک هاواریەتی لە دەست باجی حکوومەتی کە ژمارەی لە (١٥٠) تەرح تێپەڕ ئەکات جگە لەوەی کە بۆتە بۆنەی پەیدابوونی دزی و جەردەیی و بارکردنی سەربەستی لە خەڵک. گەنجینەی بەخت و وەخت و پارەی حکوومەتیشی وێران کردووە.

- بەم مەرجە کە دەستکەوتی حکوومەتی کورت نەهێنێ، هەموو باجەکان هەڵگیرا، یەک باج نەبێ کە ئەویش بەپێی سەرساڵانە لە هەموو خێزانێک ئەسێنرێ.

## ژینی ناخۆش

- تێکڕا هەموو هاونیشتمانەکان هاواریانە لە دەست هەژاری و زۆرداری و نەخوێندەواری و نەخۆشی و ناخۆشی ژیانیان.

- پاش فەرمانێکی بیست ساڵی لە کن حکوومەت بەهەر مامۆستا و عەسکەر و پۆلیسێک ئەگەر شاری بێ خانوویەکی نایاب، وە ئەگەر دیهاتیش بێ خانوویەک و پێنج هەکتار زەویی بەرا و ببەخشرێ. جگە لەوە بەپارە و سەربەرشتیی حکوومەتەوە هاوبەشی (شرکت)ێک بەرێوە ببرێ، وە دەستکەوتەکەی ساڵ بەساڵ دابەشکرێ بەسەر ئەوان و ئەو فەرمانبەرانەی کە لە دانگی ئەواندان.

بۆ هەموو پیاوێکی زانست و فەن خانوویەکی نایاب و ساڵانەیەکی شایستە ببڕێنرێتەوە.

زەوییوزاری ئەمیری بەسەر کۆچەر و متەقاعد و لێقەوماوەکاندا دابەش کرێ بەم مەرجەی هەر کەسە لە پێنج هەکتار کەمتری بەرنەکەوێ.

ئاوی پاک و ئەلەکتریک و رێگای ئۆتۆمبێل بۆ هەموو شار و دێهاتەکان لەگەڵ دادگا و خەستەخانەیەکی تەواو بۆ هەر ١٠,٠٠٠ کەسێک پێک بهێنرێ.

بانک لە هەموو ناوچەیەکا بکرێتەوە، وە ماکینەی کشتوکاڵ بەکرێی کەم بەهەموو دێهاتییەکان بدرێ.

بۆ بێ کار و فەرمان کارخانەی خواردەمەنی و کەلوپەلی ناوماڵ و پۆشەنی بەپارە و سەربەرشتی حکوومەت دامەزرێنرێ. مانگانەی تەقاعدی هەڵگیرێ. لە پاش پرسش و لێ وردبوونەوە، هەموو ساڵێ، لەناو هەموو چینەکانی کۆمەڵدا کێ بەیەکەم و دووەم و سێهەم دەرچوو لە کارگوزاری و کەڵک بەخشی و کردەوە جوانیدا بەخششێکی پەسەندی بدرێتێ. خوێندنگاە. ئەبێ کاربەدەستان و سەرۆک و کوێخاکان لە پێناوی خوێندەوار و کارگوزار هەڵبژێرێن.

بۆ هەر چینە و کۆمەڵ و دەستەی کار و فەرمانێک رۆژنامە و گۆڤاری حکوومەتی دامەزرێنەری بۆ

پێگەیاندن و شارەزاکردن و ڕاپەڕاندنیان لە کار و فەرمانەکانیاندا. تا ئازاری کەسێک نەدا بەبێ تاوان، هەموو کەس لە گفتوگۆ و نووسین و کۆبوونەوە و کۆمەڵ پێک هێناندا سەربەست کرێ.

بەندیخانەکان بخرێنە سەر شێوەیەکی نوێ. واتا: کۆشکی هەرەخۆش و نایابیان بۆ دروست کرێ. وە لەوێدا بۆ پێگەیاندن و چاککردنەوەی لەش و هۆشی بەندییەکان خەستخانەی لەش و خەستەخانەی هۆش و سینەما، یاریخانە، نووسراوخانە، تیاترۆ، مۆسیقەخانە و خوێندنگای پیشەوەری و خوێندەواری و باخچەی ڕەنگینیان بۆ دامەزرێنرێ.

وە لەژێر سەرپەرشتیی پزیشکی زرنگ و شارەزا و زانایانی زانستی خۆناسین (عالم النفس)ەوە ئوستادانی پێخوێندن و پێگەیاندن کاروباری بەندیخانەکان هەڵسوڕێنەری.

بۆ دڵخۆشی و پێگەیاندن و بەرهەمهێنانی دڵتەڕی هاونیشتمانەکان، لە هەموو ناوچەیەکا دائرەیەکی گەورەی دەسەڵاتداری حکوومەتی دامەزرێنرێ کە بۆ پێکهێنان و هەڵسوڕاندنی هاوینەهەوار و باخچەی گشت لایی، نووسراوخانە، وەرزشخانە، سینەما و تیاترۆ و مۆسیقاخانە بکۆشێ.

***

ئەم بڕیارانە هەر قسە و نووسین نەبوون. مەردانە و گورج و گۆڵانە لەلایەن وەزارەتەکانی حکوومەتی جمهوریەتی سەرچنارەوە بەجوانی و ڕێکوپێکی پوختەیی بەجێهێنران. ژینێکی گشت لایی پڕ گوشایش و خۆشی و سەربەستی هاتبووە بوون. خەوەکەم زۆر خۆش بوو.

کە خەبەرم بووەوە، چاوم نوقاندەوە و سەرم بەسەرینەکەوە نووساندەوە کە خەوەکەم تەواوکەم، بەڵام داخەکەم خەوم لێ نەکەوتەوە!.

## چیرۆک

### ئەنجامی ئەلزداری

کوردایەتییەکمان ئەوێ لەسەر بنچینەی خواناسی و
دیوکراسی و سۆسیالیستی و دادپەروەری دامەزرابێ
هەرگیز لەو ئامانجە لانادەین!

(جووکل)... تاقانە کوڕی باوک و دایکی خۆی بوو... باوک و دایکەکەی ئەوەندەی هەرچوار کچەکەیان نازیان ئەکێشا و ئەیانلاواندەوە... هەرچییەکی ئەگوت، بۆیان جێبەجێ ئەکرد... هەرچییەکی ئەکرد، چاویان لێ ئەپۆشی... (جووکل)یش کە ئەم ناز و جیازەی بەخۆیەوە ئەدی، لە خۆیبایی ئەبوو. هەرچی دڵی بیویستایە و خوا حەزی پێ ئەکات، پەلپی لێ ئەگرتن و داوای لێ ئەکرن... ڕقی ئەگرت و مانی ئەگرت... ئەیڕژاند و ئەیپژاند و ئەیشکاند... ئەگریا و ئەیقیژاند، وازی ئەهێنا، هەتا ئارەزووەکەی دڵیان بۆ بەجێ ئەهێنا... (جووکل)یش کە ئەم ناز و جیازەی درابوویە، وەنەبێ، برا گەورەی منداڵەکان بووبێ... وەنەبێ جوان و شەنگ و شۆخ و کردەوە شیرین بووبێ... بەپێچەوانەوە. دووچاری بەقوولا چووی پچکۆلەی پشم و قیین و، لووتێکی درێژی قۆقز و ناشیرین و دەموچاوێکی درێژکۆلە و ناقۆڵای بەد فەساڵی پێوەبوو، لەگەڵ پشتێکی کۆماوە و دەمێکی زلی ناپەسەنددا... کەچی لەگەڵ ئەم هەموو ئێسک قورسی و شێوە ناشیرینەیشدا، ئەچوو جلوبەرگی فش و فۆڵی لەبەر ئەکرد. بەو نیازە کە سامی زۆر تربێ و کەش و فشی زۆرتر پێوە بکات. ئەمەیش ئەبوو بەهۆی ئەوەی کە پیاو ئەوەندەی تر ڕقی لێ هەڵئەستا! لەناو ددانە گرە نارێک و پێکەکانیشیەوە، کە پێنەکەنی، یاخود بەکۆڵ قسەی ئەکرد، لە کاتی نانخواردندا لیکی ناو دەمی ئەهاتە دەرەوە... یاخود پارچە چێشت لە دەمی دەرباز ئەبوو، پیاو ئەوەندەی تر بێزی لێ ئەکردەوە و، دڵی لێی تێکەڵ ئەهات... ئەوەندەیش نازیرەک و کەمتەرخەم بوو، بۆ دڵ ڕاگرتنی کەسانی تر، هەر بەو پەنجە پیسەوە کە بەناو لووتی خۆیدا ئەکرد، ئەچوو خواردەمەنیشی پێ ئەخوارد، هەروەها خواردەمەنیشی ئەگرت بەدەستەوە و پێشکەشی هاودەمەکەی خۆی ئەکرد! (جووکل) هەموو دەم خۆپەرستی لێ ئەتکا... هەموو دەم دڵی پڕ بوو لە پشم و قیین... دەم و چاویشی پڕ بوو لە نیشانەی چاوپیسی و چاوچنۆکی و چڵێسی... بەڵام هەرچی خوویەکی ئەنگ و کردەوەیەکی ناپیاوانەی هەبوو، لە زمانە لاڵەکەیەوە دەرئەکەوت کە هەرگیز نەئەسرەوت! خۆشترین کات بەلای (جووکل)ی لاڵەپە ترەوە، ئەوەبوو کە چوارکەس گوێی لێ بگرێ و لە پاشملە، بەو زمانە لاڵەوە کە هەیبوو، خراپی لە کەسانی تر بدوێ... کە دەنگوباسی ناخۆش و پڕ شوورەیی و ئابڕووچوونی ئەم و ئەو بگێڕێتەوە!

(لاڵەپەترە) کانگای خراپە و بێ فەڕی بوو... هەرگیز چاکیی کەسی بەدەمدا نەئەهات مەگەر کەڵکێکی بۆ خۆی تیا بوایە!... (لاڵەپەترە) هەر بەد سروشت و بەدڕەوشت نەبوو نا زیرەک و ناڕاست و درۆ هەڵبەستیش بوو... ئەو هەر بەتەنگ ئەوەوە بوو قسە بکات... سا قسەکەی سەروگوێلاکی ئەمی ئەشکاند، یاخود ئابڕووی ئەوی ئەبرد، یان خێزانێکی لەیەک بەرئەدا، یان دۆستی لەیەک ئەکرد،

مەبەستی نەبوو!... ئەو هەر ئەوەی ئەویست کە لە کۆڕی دانیشتوواندا خۆی ببینێ و خۆی بنوێنێ و خۆی گەورە بکات... لە خۆپەرستی و پووڵپەرستی خۆی بەولاوە هیچ ئامانجێکی تری نەبوو!...

***

(جووکل) چاوچڵێسی و نامەردی و چاوتێبڕین و چاو پێهەڵهێنان و قسە دزیینەکەی لە باوکیەوە فێر بووبوو... لووت بەرزی و خۆنوواندن و کەش و فشەکەیشی لە دایکیەوە فێر بووبوو... دایک و باوکی ناشی و نەزان کە بریتی بوون لە (ماڵە دەوڵەمەندێکی ناوەنجی) ئەمەندە لە پەروەردەکردنی منداڵەکەیاندا نازکێشانیان بەکارئەهێنا، کوڕەکەیان لەکەڵک خست! تەنانەت کە گەورە بوو و خوێندنی بەرزیشی تەواو کرد، هەروەک منداڵێکی تاوانبار مایەوە. ئەو هەمموو خوێندنەی کە خوێندبووی و ئەو هەموو تەمەنەی کە بەختی کردبوو لە فەرمانداریيدا هیچیان بەکەڵکی نەهاتن هەتا ئەهات خراپەی زۆرتر لە دەست ئەوەشایەوە. هەتا ئەهات کەسانی تر زۆرتر ئازاریان لەدەست ئەچێشت!...

لەناو گەڕەکەکەدا، دوو سێ ماڵە دەوڵەمەندی تریش هەبوون. خزمی ماڵی باوکی (جووکل) بوون... باوکی (جووکل) هەرچەند زۆر نزیکیش بوو بەوان، بەڵام لەژێرەوە پێشی لێ ئەخواردنەوە و چاوی پێ هەڵنەهێنان و، بەربەرەکانێشی لەگەڵدا ئەکردن ئەوان هەرچییەکیان بۆ کوڕەکانی خۆیان بکردایە، باوکی (جووکل) کە هەمموو دەم چاوی تێ بڕیبوون و چاویشی پێ هەڵنەهێنان، ئەوەی بۆ (جووکل)ی لاڵە پەترەی ئەکرد. هەردەم لەلەیەکیان لەگەڵ (جووکل)دا ئەناردە دەرەوە. لە پشتیەوە ئەرۆیشت. بای ئاغایەتی یان ئەخستە لەش و هۆشیەوە. تەنانەت کە (لاڵەپەترە) چووە سەرپێشاویش ئەبوو نۆکەرەکەی دوای کەوتایە تا بەردەرگای پێشاوەکە و، لەودیو دەرگاکەوە چیرۆکی بۆ بکردایە، تا لە خۆ پاککردنەوەکەی خۆی ئەبووەوە!...

جا ئەم خووە ناشیرین و ئەنگ و ناپەسەندانە، کە ئەو دایک و باوکە ناشییانە فێری (جووکل)یان ئەکرد، وای لێکرد کە تەمەنیشی لە پەنجا ساڵی تێپەڕی کرد هەر بەمناڵی مایەوە!... خۆپەرستی و کەش و فشە (ئاغایەتی) و پووڵپەرستی (دەوڵەمەندانە)ی هەر پێوە مایەوە! ئێستاکەیش کە (جووکل) بڕوات بەلایەکدا تا یەک دوو کەسی لەگەڵدا نەبێ، دڵی ئۆخەی ناکات! تا پێش هاوڕێکانیشی نەکەوێت، یاخود لەسەرووویانەوە دانەنیشێ دڵی ئاو ناخواتەوە... هەتا ئۆتۆمبێلیشی لێ هەڵکەوتبێ، پێی شوورەییە بەپێ بڕوات... کە سواری ئۆتۆمبێلیش بوو، بەپارەی خۆی بێ، نایەوێ سواری بێ... (جووکل) هەروەک لە مناڵیی خۆیدا مابێ و ئێستاکەیش هەر بەئۆتۆمبێلی بڵێ (عووعە) وایە!... لای ئەو سواربوونی ئۆتۆمبێل، بەهەر جۆرێک دەستی بکەوێ، مەرجێکە بۆ کامەرانیی... کەچی لەگەڵ ئەوەیشا کە دایکی پارەی کڕینی ئۆتۆمبێلێکی بۆ ڕەوانە کرد، پارەکەی خوارد، نەیدا بەئۆتۆمبێل!... دڵی بڕوایی نەدا ئۆتۆمبێل بەپارەی خۆی بکڕێ و سواری ببێ!.

***

(لاڵە پەترە)، کوێرایی دائەهات، لە کورە دەوڵەمەندەکانی تر کەمتر بێ... بەڵام لە ڕووکەشا، نەک لە گەوهەری کاردا. لەبەر ئەوە بۆ ئەمەی ساڵ بەساڵ، لە خوێندنگادا دەربچێ، بەتەنگ ئەوەوە نەبوو، کە

قۆپیە نەکات!... کە لە مامۆستاکانی نەپارێتەوە بۆ دەرچوون!...

لەبەر ئەوە شاگردە هەژارەکان ڕقیان لێی ئەبووەوە... هەروەها ڕقیان لەکاربەدەستانی خوێندنگاکەیشیان هەڵئەسا، کە ڕێیان ئەدا بەیەکێکی کەودەن و گەوج و نازیرەک و بەدخوو، دەربچێ و شان بەشانی شاگردە زیرەک و تێکۆشەرەکان بوەستێ لە دەرچووندا... شاگردەکان ئەمەیان بەزۆرداریییەکی گەورە دائەنا. بەکەتنێکی گەورەیان دائەنا، کە شاگردی چاک و شاگردی خراپ لەیەکتر جیا نەکرێتەوە!. کە شاگردی دەوڵەمەندی خراپ لەگەڵ شاگردی چاکی هەژاردا، بخرێنە تای تەرازوویەکەوە!... باوک و کەسوکاری (لاڵە پەترە)یش، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بەئاشکرا ئەیانزانی ئەو شاگردێکی خواروخێچ و بێ کەڵک و ناڵەبارە بوو، کەچی ئەوانیش شەرمیان لە خوا و دادپەروەری نەئەکرد، ئەچوون بۆی تێئەکۆشان و، لە تاقیکردنەوەدا، بەناڕەوا سەریان ئەخست!؟ لە کۆمەڵایەتییەکەیشماندا کەسێ نەبوو، بەرەنگاری ئەم بارەبێ... یاخود هەبوو بەڵام کەس گوێی لێ نەئەگرت... یاخود ئەگەر گوێیشیان لێ بگرتایە، بەهۆی فەرمانڕەواییەوە تووشی دەردی سەرییان ئەکرد!...

بەم ڕەنگە دەوڵەمەندی و، خووی ناهەمەمواری دەوڵەمەندی و، یاسای زەویداریی و، ئەو فەرمانڕەواییەی کە بۆ پاراستنی ئەم دوو جۆرە یاسایە دانرابوو، شیرازەی خوێندەوارییان لەناو نەتەوەکەماندا تێک دابوو.

لەبەر ئەوە کۆمەڵایەتییەکەمان، هەتا ئەهات، ئازار و زیانی لەدەست ئەم چینی دەوڵەمەند و زەویدارانە و فەرمانڕەواییەکەیان، زۆرتر ئەچێشت!...

***

کاتێکمان زانی (لاڵە پەترە) خوێندنگای هەرە بەرزی بۆ تەواو کرا! ئینجا نۆرەی باوکی بوو کە بەهەموو هێز و توانای خۆیەوە، بەیارمەتی خزمە دەوڵەمەندەکانییەوە کە ئەوانیش لە دانگی خۆیدا بوون، تێبکۆشێ بۆ دامەزراندنی (لاڵە پەترە) لە فەرمانێکی گرنگی فەرمانڕەواییدا. زۆری پێ نەچوو ئەمیش سەری گرت!...

(لاڵە پەترە) جێگایەکی گرنگی لە هەژارە بەکار و خوێندەوارەکان داگیرکرد... (لاڵە پەترە) لە خوای ئەویست ڕۆژێکی وای بۆ هەڵبکەوێ و ببێتە کارگێری ناوچەیەک... فەرمان بدات و فەرمانی بەجێ بهێنرێ... باڵباز کڕنووشی بۆ بکێشی و هەرچێ ئارەزوویش بکات بۆ جێبەجێ بکات!. بەڵام کاروباری لادێییەکان دوا ئەکەوت، مافی ئەم و ئەو ئەخرایە ژێر پێوە زۆرداری لەم و لەو ئەکرا، دزی و درۆزنی بۆ ئەو و بەناوی ئەوەوە ئەکران (لاڵە پەترە) بەتەنگەوە نەبوو!

دیاری و بەرتیل خۆش بێ، لایەنگیری و تکاوپاڕانەوە خۆش بێ، بۆ باوکە دەوڵەمەندەکەی و کەسوکارە دەوڵەمەندەکانی گران نەبوو، کە ساڵ بەساڵ (لاڵە پەترە) لە پایەی فەرمانبەرییدا پێش بخەن و جێگای فەرمانبەرە چاکەکانی پێ لەق بکەن!. کەچی سەدانیش لەو فەرمانبەرە چاکانە. بەرزبوونەوەیان دوا ئەخرا و لەبەرزبوونەوە بێ بەش ئەهێڵرانەوە... یاخود تووشی پشم و قینی کاربەدەستانی خراپ

نەبوون، هەر لەبەر ئەوەی کە ئەوان ڕاست بوون و پێیان شەرم بوو، بەرتیلیان بدەنێ و پشی پشییان بۆ بکەن، دووچاری تەفروتوناکردن و دەرکردن و بەندیخانە نەبوون!...

***

(لالە پەترە) کە نموونەیەک بوو لە هەزاران کوڕە دەوڵەمەندی خراپ، کە بەهۆی نازگرتنی بێ ئەندازەویانەوە لە منالێیدا، خراپ پێ گەیێنرابوون، تا سالانی ساڵ ئازاری گەیاند بەنەتەوەکەمان و زیانیشی بەخشی بەنیشتمانەکەمان!...

بەلام هەموو شتێک ئەندازەی خۆی هەیە. کە لەوە ترازا سەرەوژێر ئەبێتەوە...

یاسای کۆمەلایەتییەکەیشمان کە لەسەر بنچینەی (سەرمایەداری) و (زەویداری) دامەزرابوو، ئەمەندە لێرەشا بووەوە، کەتن و ڕیسوایی ئەمەندە لێ پەیدابووبوو، کاسەی دڵی نەتەوە لەوە بەولاوە ئاخ و داخی تیا جێ نەئەبووەوە... کاسەکە پڕ بوو بوو... سەرڕێژی ئەکرد... کاتێک زانرا (شۆڕشی گەورەی گەل) دەستی پێ کرد. ئەو یاسا ڕزیوەی لەناو برد... ئەو دەزگا و دووکانی (زەویداریی)یەی[1] تێک و مەکان دا... یاسایەکی سۆشیالیستی وای دامەزراند کە لە سنووری دادپەروەر نەچێتە دەرەوە. کە بایەخ بدات بەزانست و هونەر و کردەوە و ڕەوشت پاک و بلند بۆ کەلکی گشتی... هێز و دەسەلاتی (زەویداریی) و (سەرمایەداریی) نە ناویان ما و نە نیشان؛ هەروەها دەستدرێژیی و زۆر و ستەم و چەوساندنەوەیش لە ئارادا نەمان...

لە (فەرمانڕەوایی)یە تازەکەدا، (لیژنە)یەکی زانا و هونەرمەند و نیشتمانپەرست دانرا... بەشێنەیی و لەسەرخۆوە لیژنەکە دەستی کرد بەپرس و لێکۆڵینەوە لە بابەت ئەو فەرمانبەرانەوە کە کاری گرنگیان کەوتبووە دەست... لەسەر بنچینەیەکی زانست و دادپەروەری، لێکۆڵینەوەی خۆیان بەئەنجام گەیاند، لەسەر ئەم ئەنجامە، بژارێکی گرنگ لەناو فەرمانبەرەکاندا کرا... هەرچی خراپ بوو، لە فەرمان دەستیان کێشانەوە و ئاراستەی دادگاهیان کردن... تا سزای دادپەروەرانەی خۆیان بدرێتێ!... لەجێی ئەوانیش لەو کەسانەیان دانا، کە بەزانایی و کارامەیی و دەسپاکی و دڵسۆزی بەناوبانگن. لە ئەنجامی ئەم کارەدا، زۆربەی کوڕە دەوڵەمەندەکان کە لە منداڵیدا بەنازداریییەوە پەروەردە کرابوون و لە گەورەییدا بوو بوونە تاوانبار و زۆردار و خوێنی نەتەوەکەمانیان ئەمژی، دەرکران و سزا دران... یەکێک لەوانەیش (لالە پەترە) بوو. کە ئەویش کوڕە دەوڵەمەندێکی خوێڕیی زیانبەخشی وەک ئەو فەرمانبەرانە بوو، کە لە پاش دەرکردنیش لە فرمانەکەی تاوان و کەتنەکانی ئەمەندە زۆر بوون هەرچی سامانێکی هەبوو تالان کرا کەچی هێشتا بەشی سزادانەکەی نەکر. لەبەر ئەوە دادگاە ناچاربوو، بۆ چەند ساڵێکیش خستیە بەندیخانەوە، بەمەرجێ سەرلەنوێ لە (خوێندنگای بەندیخانە)دا پێی بخوێننەوە و پێشی بگەیێنەوە، بەڵکو ئەمە خوایە ببێتە ئەندامێکی بەکەلک و بەفەڕ بۆ گەلەکەی خۆی!...

***

[1] زەویداری: إقطاعي.

بەم ڕەنگە (خۆپەرستی) و (پوولپەرستی)ی دەوڵەمەندانە لە شێوەی ئازگرتنی بێ ئەندازەدا، لە منالێکی ساوای بێ گوناه، درندە و تاوانبارێکی پێ گەیاند، کە بەسالانی ساڵ زیانی بەخشی و کەتنی کرد و تاوانی نواند لەناو نەتەوەکەماندا...

هەروەها بەم ڕەنگەیش ئەو جۆرە پێگەیاندنی منالە بوو بەهۆی بێزاری و وەڕسبوونی گەل، لەدەست یاسای (زەویداریی) و (سەرمایەداریی) و ئەو (فەرمانڕەوایی)یەی کە پشتگیرییان ئەکات!. (شۆڕشی گەورەی نەتەوە) بۆ ڕزگاری لە دەست (زۆرداریی) و (هەژاری) و (نەخۆشی) و (نەخوێندەواری) بەرپابوو...

یاسای کۆنی هەڵتەکاند و، لەجێی ئەویش یاسایەکی (دیموکراتی)ی وای دامەزراند کە سەر بە (سۆسیالیستی)بێ، نەک بە(زەویداریی) و (سەرمایەداریی)... واتا (نەتەوە) هەموو ئەندامەکانی لە (ڕەنج) و (بەرهەم)دا هاوبەش بن، نەک لایەک بچەوسێتەوە بۆ لایەکی تر... (سۆسیالیستی) یەکەیشی لەسەر بنچینەیەکی (دیموکراتی) دابمەزرێ، نەک (دیکتاتۆری)... هەروەها یاساکە لە هەموو بڕێکیشیا لە سنووری (دادپەروەری) تێپەڕ نەکات... واتا -بسازێ لەگەڵ (خواناسی) و (کردەوە و ڕەوشتی پاک و بڵند)دا... نەک لەگەڵ (خوانەناسی) و (زۆرداری)دا... بەواتایەکی ڕۆشنبیر- لەجیاتی ناشی و نەزان بەدکردار، خوێندەوار و نیشتمانپەروەر و کارامە بکات بەفەرمانبەر و سەردارو فەرماندار... هەروەها لەباتی پیاوی بەد و بێ فەڕ و خراپیش پیاوی زانا و هونەرمەند و بەکەڵک، بەری ڕەنجی هەزاران ساڵەی نەتەوە بخوا و، دادپەروارنەیش ماف و ئەرک دابەشی بکات بەسەر ئەندامانی نەتەوەدا...

***

سەرنجێک لە چیرۆکەکە:

مامۆستا ئەم چیرۆکەی لە؛ وەرزی یەکەمی ڕۆشنبیری زانکۆی سلێمانیدا پێشکەش کردووە، کە لە ١٥ ئازار بۆ ١٥ مایسی ١٩٧٣ی خایاندووە.

لەگەڵ سادەیی و ساکاریی شێوازی خستنەڕوویدا، کە تا ماوەیەک هەست دەکەیت چیرۆکەکە تایبەتە بەمندالان، بەزمانێکی ڕەوان و ئاسان دارێژراوە، وەک تاقیکردنەوەیەکی بەرجەستەی ژیانی خۆیبێ و پێیدا تێپەڕیبێ ئاوایە، یا پاڵەوانەکە لێیەوە نێزیک بووە و قۆناغ بەقۆناغ لەگەڵیدا بووە و دیقەتی پلەکانی گۆڕانی ژیانی داوە. هەروەها لە جۆرە ئاواتە خواستنێکیش دەکا کە مرۆڤ بەخەیاڵ حەز بەو کۆتاییە دەکات بۆ هەموو کاربەدەستێکی ناڕاست و پیاوخراپی نالەبار.

نووسەر دەیەوێ کاردانەوەی پەروەردەکردنی خراپی ناو خێزانمان پیشاندات کە تا چ ڕادەیەک کاریگەرە لەسەر هەڵسوکەوت و دوارۆژی مرۆڤ، بەتایبەت ئەو کەسە ئەگەر خاوەنی ئەو سیمایە بێ کە لە سەرەتادا بۆ پاڵەوانەکە (جووکل)ی دەکات؛ لە ناشیرینی هەڵکەوتنی جەستەیی و کارکردنە سەر دەروونی وە ئاڵۆزاندنی بەرەو هەقکردنەوە لەو (کەمی - نقص)ەی هەستی پێدەکات، خۆ باری دارایی باش و دەسرۆیی خێزانەکەشی ئەوە فاکتەرێکی لەباری ڕەخساوە بۆ ئەو قەرەبووکردنەوەیە... هەر بەم توانا

باشەیەوە هەرچی (کەم و کورییەکی دەروونی هەیە لە جەستە و فیکریدا) بەخەڵکەکەی ژێردەستی دەڕێژی، پلەوپایەی وەزیفە دەکاتە پەیژەیەک بۆ بەرزبوونەوە و گەیشتن بەدەسەڵاتی زیاتر لە کۆمەڵدا. دیارە ئەمەش لە ژێر سایەی ڕژێمێکی دوور لە دادپەروەری، داسەپاوی دواکەوتوومە زەمینەیەکی لەبار دەخولقێنێ بۆی و بۆ بەرەڵلایی و لێنەپرسینەوە. نووسەر لە ڕووی دەروونییەوە دوو ڕەوتی دژ بەیەک لە پاڵەوانەکەدا دیاری دەکات؛ بەرزکردنەوە (تصعید) کە تەواوکردنی خوێندن و گەیشتن بەپلە وەزیفەکەیە. داچوون (تسفیل) کە بوغرایی و زۆرداری و چەوتیە لە کارە ڕۆژانەکانیدا.

بەڵام (وەک وتم) ئاواتەخوازییەکەی بەو (شۆڕشی گەورەی گەل)ە دێنێتەدی کە (لەپڕ) بەرپا دەبێ و سەرجەم یاسا و نەریتە خراپەکانی پێشوو هەڵدەتەکێنێ و باوڕەوشێکی شۆڕشگێڕانەی دیموکرات و یەکسانی دێنێتە کایەوە؛ لە سایەی ئەم ڕەوشە نوێیەشدا پاڵەوانەکەی بەسزای خۆی دەگەیەنێ؛ (دەستبەسەرا گرتنی سامان و موڵک و بەندیخانەی ئیسلاحی)ش بۆی. تا سەرلەنوێ بیکەنەوە بەئەندامێکی سوودبەخش بۆ نەتەوەکەی. دیارە ئەم سەرەنجامەش لەگەڵ ڕێبازی (لاعنف)ی نووسەر خۆیدا هاوتەریبن و دەگونجێ، ئەگینا چاوەڕوان دەکرا کە (سزا شۆڕشگێرانەکە) توندتربێ... کە ئێمە حەز بەوە ناکەین و حوکمەکەی نووسەرمان بەلاوە شیاو و لەبارترە.

ئەوەی جێی پرسیارە؛ نووسەر ئەو (شۆڕشی گەورەی گەل)ەی ڕاستەوخۆ دەستنیشان نەکردووە؛ ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ یا شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کورد وە یا ١٧ - ٣٠ تەمووزی ١٩٦٨؟ (بەپێی تێڕوانینی ئەو ڕۆژەی ١٩٧٣). دەستنیشان نەکردنەکە دەگەڕێتەوە بۆ:

١- حەزی دەکرد شۆڕشی کورد بوایە بەڵام ئەو شۆڕشە لەو قۆناغەدا نەبوو کە دەستکاتە دامەزراندن و گۆڕین و بنیاتنانی تازە.

٢- شۆڕشی ١٩٥٨یش هەرچەندە لە سەرەتادا هەوڵی ئەو چاکسازییانەی دەدا و تا ڕادەیە کردیشنی، بەڵام بەلای مامۆستاوە نە (تەواو)بوون و نە لەئاستی خۆزگە و ئاواتەکاندا بوون... جگە لە دیاردەی توندوتیژییە بێ سەروبەرە لە ڕادەبەدەرکەش (هەر لە یەکەم ڕۆژەیەوە) کەسانی وەک ئەوی لێ تۆرانبوو، بۆیە ڕاستەوخۆ ناوی ئەمیش نابات.

٣- دەمێنێتەوە ١٧ - ٣٠ی تەمووزی ١٩٦٨ کە نووسەر مەبەستی نەبووە.

جا سەربەستی لەمەدا، داوەتە دەست گوێگر یا خوێنەر... خۆی سەرپشکبێ.

نووسەر بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ، لە کۆتاییدا دێتەوە سەر شێوازی وتار ئامێز و ڕاڤەکردنی مەبەست و خواستەکانی؛ یانی بزانێ یان نا چیرۆکەکەی لێدەبێتە وتارێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ئەمەش لە بەشی کۆتایی دایە، کە پاڵەوانەکە دەوری نامێنێ و قەڵەم دەکەوێتە دەست نووسەر.

هەرچەندە بەدرێژایی چیرۆکەکە پاڵەوان لە پشت پەردەوەیە و نادیارە، خوێنەر بەوەسف و باسی نووسەردا دەیناسێ، بەڕاناوی کەسی سێهەم باسی لێدەکرێ... بەمەش بوعدی سێهەمی لە چیرۆکەکەدا ون کردووە، جا هەر لە تەوەری شێوازە تەقلیدیەکەی چیرۆکی چلەکاندا خۆی دەبینێ، کە ئەمە دەڵێم دەبێ بزانین ئەو چیرۆکە بەرهەمی حەفتاکانێتی... بەلانی کەمەوە.

# لێرە و لەوێ

## ناسکە قسە

(سلێمانی حوزەیران ١٩٣٣)

هەر شتێ رووبدا، پاڵەوانەکانی: لە گوڵ و چڵ و بلبل و چقڵ بەدەر نین. ئەمانیش هەریەکە دەرگایەکی ئەکەنەوە.

***

«ئەوی شینبێ شین ئەپۆشێ؛ کەچی شین پۆشی من لە خۆشیایە!»

***

«ژیین: بێ ژنی ژێر ژانە.»

***

«شیرین بەو شیرینییەی خۆیەوە، لەگەڵ فەرهاددا شیرینی پێکگەیشتنی نەچێشت - مرد.»

***

«لە کوردا مەردی وا هەیە وەکو بەرد، کەچی هەر بەشی: دەردە و ئاهی سەرد!»

***

«تۆ نەرمی دڵرەقی، بەڵام من رەقی دڵ نەرمم.»

***

رەنجەڕۆ ئەڵێ: «ئەوی من ئەیچێنم ئەیچنن، ئەوی منیش ئەیچنم ئەیچنن».

***

«سەماوەر ئەسیرێنێ، دلاوەر ئەزیرێنێ، ئەو لەبەر جۆشی ئاگر، ئەمیش لەبەر جۆشی دڵ».

***

«دوگمەی سوخمەکەیم ترازاند، نازی کرد، دەسم برد بۆ مەمکی، گازی کرد، خەریک بووم ماچی کەم گازی گرت.»

***

«شاناز دڵنەوازیم ناکا، بەڵام ناوازە بەناز و جیازە.»

***

«گەردنت بێ گەرد، وێنەت ئاوێنە، بالات والا، بالاگەردانی سەرتبم بۆ چ بەشت ناو عەرد و بەربوو؟!»

***

کلاولار وتی: «بۆ چ ئەوەندە ئەپرسی؟» وتم: «گیانەکەم دوور لە هەوارم، خەفەتبارم، بۆیە ئەوەندە پرسیارم».

***

«خواستم، گواستمەوە، جێی خۆش بوو، پێی خۆش بوو، دڵ یەک بوو، لای یەک بوو، لەبەر ئەوە، ژیاین، ماڵمان ژیاند، مناڵمان ژیاند، وڵاتمان ژیاندا...»

***

«گەڵا وەک پڵپڵەی پشتە سەر و گێل گێلە و گەردانەی سەر و پۆتەڵاکی یار، لق و پۆپی دار ئەڕازێنێتەوە.»

***

«دووڕوو، بەسەرزاریی، زارییەتی، لە پاشملە، تلی لیلییەتی.»

***

«لێرە تێر برسیترە لە برسی، خوێندەوار بەهاوارترە لە نەخوێندەوار.»

## هاوار!!

(سولەیمانی لە تەمووزی ١٩٣٢دا لە گۆڤاری هاواردا لە شام لەچاپ درا)

***

هاوار!... گوایا چە ناوێک لەمە جوانتر بۆ ڕۆژنامەیەکی ئێمڕۆی کورد ڕێک ئەکەوێ؟

هاوار: لە چاوی هەموو کوردێکا دەخوێندرێتەوە، هەتاکو داروبەردی وڵاتەکەشمان دەقیژێنێ: هاوار!... هاوار!...

هاوار: دووکەڵێکی ڕەشی ئاهونالەی لێ قەوماوانی کوردە لە دەروونی سالحییەوە[1] دێتە دەرەوە...

هاوار: ئاوازێکی توند و کاریگەرە، لە کۆمەڵە گۆڕی مردووانی ئەیوبی و بەدرخانییەوە[2] دێتە دەرێ...

هاوار: نالەیەکە لە شوێنێک دێتە دەرەوە، ناوەڕاستی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە، شوێنی دوارۆژی عالەم[3]، بەڵام جێی شینی ئێستای کورد...

هاوار: نەمامێکە بەدەستێکی زانا لە زەوییەکی بەپیتا نێژراوە؛ بەڵام بۆ ئەمەی بەروبووم بدا دەبێ چاودێری بکرێ تاگەورە دەبێ... ئینجا بەهەموو هێزی خۆمەوە دەقیژێنم: هاوار دێنمە بەر ئەو کەسانەی دوو پوولێکیان لە گیروفاندایە: کەرتێکی بۆ ژیانی ئەم گۆڤارە دابنێن.

هاوار دێنمە بەر ئەو بوێژ و نووسەرانەمان، بۆ ئەو زانا و تێگەیشتووانەمان، کە پەردەی زەمانە لە گۆشەی پەنهانیدا شاردونیەوە؛ خۆیان دەرخەن، قەڵەم بخەنە کار بەنووسینێ توزێ یارمەتیی ئەم ڕۆژنامە نەونەمامە بدەن...

***

(١) صالحیە: ئەو گەڕەکەیە کوردەکانی دیمەشقی لێ نیشتەجێن، هەروا گۆڕی سەلاحەدینی ئەیوبیشی لێیە.

(٢) مەبەست لە سەلاحەدین و خانەوادەی بەدرخانیانە.

(٣) بەو پێیەی کە لەڕۆژی قیامەتدا ئادەمیزاد لەشام حەشر دەکرێن و خوای گەورە لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکات.

هاوار دێنمە بەر ئەوانەی کە یارمەتیی پووڵ و نووسینیان پێ ناکرێ. بکۆشن ئەم گۆڤارە بەناو گەورە و بچووکی کورداندا بڵاوبکەنەوە. هاوار دێنمە بەر ئەوانەی کە هەر هیچیان پێ ناکرێ، هەوڵ بدەن ئەم (کۆمەڵە)یان دەستکەوێ بیخوێننەوە، یاخود بەخەڵکی بخوێننەوە تا لە خۆیان و لە خەڵک بگەن!...

چونکی ئەم گۆڤارە هەر پیتە(قسەیەی)ی بەدەستی یەکێکی زانا و تێگەیشتوو نووسراوەتەوە، هەر قسەیەی لە دڵێک هاتۆتە دەرەوە، بەناسکی وەک پەڕەی گوڵ، بەقایی (بۆ پاراستنی خۆشەویستی کورد) وەک سنووقی پۆڵا وەهایە... هەر بیرەی لەمێشکی یەکێک هاتۆتە دەرەوە، کورد و کوردستان وەک هەیکەلێکی گەورە و بڵند هەمیشە لە پێش چاویانە، لەخەودا بەوەوە خەریکە، لە بێداریشدا هەر بەوەوە خەریکە.

چونکی ئەم گۆڤارە هی یەکێکە بێچووی گەورەترین و پایەدارترینی خانەدانی کوردە؛ خانەدانێک نەوە و نەتەوەیان بۆ پێگەیاندن و تێگەیاندنی کورد خەریک بوون...

***

ئۆ هاوارا... ئەزانم لە کوێوە دێیت و لە قوڕگی کێ دێیتە دەرەوە!... ئەگەر لەشیش لە شوێنی خۆی نەتوانێ بجوولێ، بەخوا گیانی هەموو کوردپەروەرێک؛ لەسەر و خواری کوردستانەوە دەفڕێتە لات، ئەو دەنگە بێ هێزەت بەهێز دەکا... دەبێ ئەو دەنگە ڕاست و کاریگەرەت بەگوێی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بچێ!... دڵی مردوو و زیندووی ڕاستپەرستی پێ ڕاچەنێ! ئێشی زامی چەند سەد ساڵەی کوردی بەسەزمانیان تێگەیێنێ!![1]

## فرمێسکی کاکە مەم[2]

غوونەی کوردی پەتی

زین...!

باڵاگەردانی سەرت بم! تۆ کێیی؟ فریشتەیت یان پەریت؟...

زین...!

جگەرسۆزەکەم، تۆ لە چیت؟ لە تیشکی مانگ دروستکراوی، یان لە کزەبای بەیان؟...

ڕاستە؟ نێرگس لەبەرچاوی کاڵتا، سێو لەبەر کوڵمی ئاڵتا، بنەوشە لەبەر ئەگریجەی خاوتا، خونچە لەبەر لێوی ئاڵتا، بلوور لەبەر گەردنی پاکتا، سنەوبەر لەبەر کەمەرتا، عەرعەر لەبەر باڵاتا، سەرشۆڕ و شەرمەزارن؟

---

(١) هاوار - ک، ژ (٦) س ١٩٢٣، ل (١)، دیمەشق. شام.

(٢) دیاری لاوان، بەغدا ١٩٣٤، ل ٢٢ - ٢٤.

بەم دەستکاری و چیرۆکێکی و هەروەک خۆی. بەڵام لە دەستنووسی (خۆشخوانی) خۆیدا، لەلای سەرەوەی نووسیویە [illegible] ١٩٣٣ لە (ژیان)دا چاپکرا). دیسان لە (پرشنگ)یشدا. ل ٢٦دا بڵاوکراوەتەوە.

راستە؟ سەرکردان بەلەشکریانەوە. شازادان بەنۆکەریانەوە. سەرداران بەهۆز و دەست و پێوەنیانەوە. چاوەڕوانی زەردەخەنەیەکتن؟

زین...!

ڕاستە؟ لە ئاسکیتا گوڵ، لە ڕۆشنیتا ڕۆژ، لە زۆرداریتا شاە پەنجە لە پەنجەت نادا؟...

ڕاستە لەگەڵ ئەو هەموو حەزلێکردنە پاک و خاوێنەمانا، لەگەڵ ئەو هەموو دڵسۆزییەی تۆ و ئازاییەی منا لەگەڵ ئەو هەموو جوانییەی تۆ و ئازاییەی منا، لەگەڵ ئەو هەموو جوانیەی تۆ و قەهرەمانیەی منا، لەگەڵ ئەو هەموو میوان نەوازیەی براکانی تۆ و لاوچاکی منا، لەگەڵ ئەو هەموو نزیکبوونەوەی پێک گەیشتنەمانا:

دەستی بەدکار کەوتنە کار، هەردووکمانی لەیەک کرد، منی بەگل دا و تۆشی بەئاهوناڵە سپارد؟!

زین...!

ڕاستە لەو دەمولێوە نوقلیەت. لەو سنگە گەرم و نەرمە و مەمکە خڕوپڕەت، لەو لەشە نەرم و نۆڵەت، لەو قەدە باریکە و باڵا بڵندەت، لەو دڵە ناسک و نازدارەت بێ بەش بمێنمەوە... بڕیت؟

زین...!

باڵاگەردانی سەرت بم! تۆ کێیی؟ فریشتەیت یان پەریت؟...

زین...!

جگەرسوزەکەم، تۆ لە چیت؟ لە تیشکی مانگی دروستکراوی، یان لە کزەبای بەیان؟...

ئایا لە پاش ئەم هەموو ڕەنج و کوێرەوەرییە؛ بەشمان دڵسۆتان بێ؟، لەش سووتانبێ. جگەر سووتان بێ؟

جگەر سووتان...؟

## ژینی نوێ

(پێویستە تێکۆشین بۆ (ژینێکی نوێ): دووربێ لە ئازار و هاوار. پڕبێ لە ئازادیی و کامەرانی. دامەزرابێ لەسەر بنچینەی زانست و هونەر و دادپەروەریی. جا ئەم نووسراوە ڕێگای ئەو ژینەمان بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە...)

## ژینی نوێ

تینوو، کە خەو ئەبینێ، لەسەر چاوە ئاوێکی سازگار ئاو ئەخواتەوە... برسی، کە خەو ئەبینێ، لەسەر نان و خوانێکی ئاوازە، ئاشتا ئەکا... شڕوپڕ، کە خەو ئەبینێ، بەبەرگ و پۆشەنیەکی ڕازاوەوە، خۆی پۆشتە ئەکاتەوە... زۆر لێکراویش، کە خەو ئەبینێ، دوژمنەکەی وا بەسێدارەوە گیانەلاو ئەدا؛ هەروەها کوردیش، لەم گێژاوی سەرگەردانی و پەرێشانییەدا خەو بە(ژینێکی نوێ)وە ئەبینێ، دووربێ لە ئازار و هاوار، پڕبێ لە ئازادیی و کامەرانی... دووربێ لە زۆرداری و هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری. پڕبێ

لە خۆشەویستی و ئاسایش و یارمەتی و دادپەروری.

هەمووشمان بڕوامان وایە کە هۆی ئەم هەموو ناخۆشییانەمان زۆردارییە!... بەڵێ... کوردەواری ئەڵێ: «بەسیەتی شەوگاری دوور و درێژ!... ئەمانەوێ ڕۆژگارێکی نەوبەهار ببینین!.

ئەمانەوێ بژین... بەڵام ژینێک: کە لەسەر بنچینەی زانست و هونەر و دادپەروەریی دامەزرابێ. پێویستە یاسای کۆنی ڕزیوی کۆمەڵایەتیمان بگۆڕین. تا لەگەڵ کاروانی پێشکەوتنا بەڕێوە بچین!... ئەمەش هەر بەئاوات پێک نایەت. هەر بەقسە سەر ناگرێ.

ڕەنج و کۆششی ئەوێ. لێکۆڵینەوەی ئەوێ. ژیریی و کردەوە و ڕەوشتی مەردانەی ئەوێ. بڕیاری پۆلایی و بەرەنگاری کردنی شێرانەی ئەوێ. ئارامی پیاوانەی ئەوێ.

نەتەوەی مەردی کورد، لە هەزاران ساڵانەوە تا ئیمڕۆ و بەم جۆرە ڕەنجی داوە و کۆششی کردووە و هەڵمەتی بردووە. جووڵانەوەکانی ئەم چەرخەشی نموونەیەکن لەو خەبات و تەقەلایانە. ئەوەندەی لە جووڵانەوەکانیا، ڕاست بۆی ڕۆیوە، سەرکەوتووە. ئەوەندەی هەڵەشی کردووە، ژێرکەوتووە!...

ئەم نووسراوەش، ئاوێنەیەکە، لە چیرۆکەکانیا، بەشی زۆری ئەو جووڵانەوە و ئاوات و کارەساتانە پیشان ئەدات. هەروەها ڕێگای گەیشتن بەئامانجیش ڕۆشن ئەکاتەوە. لەبەر ئەوە هیوادارم کە بێ کەڵک نەبێ[*]. گۆڕان یاسایەکی خواییە. نەتەوەی نەژادی کورد باوەڕی پێ هێناوە و خەریکیشە خۆی ئەگۆڕێ. لەبەر ئەوە، دڵنیام، کە بەرەو پێشکەوتن ئەڕوا. بەرەو کامەرانی. بەرەو ئازادیی.

جا ئەگەر زۆردارێک چەقی ڕێگای لێ بگرن، ئۆبالی بەئەستۆی خۆی، پاشەجار ملی ئەشکێ!؟.

لەگەڵ ئەوەشا بڕوام وایە، کە لەسەر بنچینەیەکی تێگەیشتن و خۆشەویستی و دادپەروەریی، ئەتوانرێ بەشیرینی، هەموو گیروگرفتێک لە ناوەند زۆردار و زۆرلێکراو لابرێ. ئەوسا چاکە و فەڕی (ژینێکی نوێ)ش هەردوولا ئەگرێتەوە.

جا لە خوای پاکی بێ هاوتا ئەخوازم کە ئەم (ژینی نوێ)یەمان بۆ پێکبێنێ.

شاکر فەتاح

***

---

(*) ئەم نووسراوە بەبۆنەی نەورۆزەوە لە ١٩٥٨/٣/٣١دا پێکهێنرا. بەڵام گەلێک لە لاپەڕەکانی لە ساڵەکانی ٩٥٣ و ٩٥٤ و ١٩٥٨دا بڵاوکراونەتەوە. (ش.ف)

## شەڕ و ئاشتی[1]

### شەڕ دوو جۆرە:

شەڕ دوو جۆرە. شەڕ هەیە ئەکرێ بۆ مەبەستی خۆپەرستی. واتا بۆ داگیرکردن، بۆ دیلکردن، بۆ خۆهەڵکێشان، بۆ ئازاردان، شەڕیش هەیە ئەکرێ بۆ سەندنەوەی ئازادی و سەربەستی، بۆ گێڕانەوەی زەوی و سامان، بۆ لابردنی تەنگ و چەڵەمەی زۆرداری و هەژاری و ناڵەباری و نەخۆشی. لەبەر ئەوە جۆرە شەڕی یەکەمیان شەڕی دوژمنایەتی لێ پەیدا ئەبێ. جۆرە شەڕی دووەمیشیان پێی ئەڵێن شەڕی دۆستایەتی. چونکە دۆستایەتیی لێ پەیدا ئەبێ.

### شەڕ هەر خراپە:

شەڕ هەر خراپە، لەبەر ئەوە شەڕی دوژمنایەتی خراپە، کە ئەنجامی دوژمنایەتی. هیچ کەڵکێکی تیا نابێ و بۆ ئەولایەی کە شەڕەکە هەڵئەگیرسێنی، تەنانەت ئەگەر سەریشکەوێ. چونکە خوا جەوروستەم لە کەس پەسەند ناکات. دوایی زۆرداریش هەر سەرئەنگری ئەکاتەوە. جگە لەوە هەر وەک لای شکا و زیانی لێ ئەکەوێ، لای سەرکوتوویش زیانی لێ ئەکەوێ!...

شەڕی دۆستایەتیش هەرچەندە بەپێی ئەنجام بەکەڵکە، بەڵام دیسانەوە زیان و سەرگەردانی بۆ هەردوو لا تیایە وەک شەڕی دوژمنایەتی...

من دڵنیام کە ڕۆژێک دێت لە دانیشتووانی هەموو سەر زەمین بەچاوێکی سووک سەیری شەڕ ئەکەن. هیچ جۆرە شەڕێکیش پەسەند ناکەن. هیچ شەڕێکیش ناکەن. چونکە هەرچۆنێکی لێک دەیتەوە، شەڕکردنە کە پڕە لە کردەوەی نەنگی و خۆپەسەندی. ئەنجامەکەی پڕە لەسەرگەردانی و ماڵوێرانی. لە ئەنجامی هەموو شەڕێکا: هەمیشە بارستایی ڕەوشت و خوی بڵند نیشتۆتەوە. نەخۆشیی لەش و هۆش و گیان داکەوتوون و بڵاوبوونەتەوە... هەمیشە لاوە هەرە بەهێز و تواناکان کوژراون و لەناوچوون، نەخۆش و پەککەوتە و داماوەکان ماونەتەوە... لەبەر ئەوە کۆمەڵ بەجۆرێ تێکڕایی کزتر بووە لە لەش و لە هۆش و لە گیان و لە ساماندا. جگە لەوە هەموو شەڕێکیش، تۆوی هەڵگیرساندنی شەڕێکی سامناکتر و گەورەتری چاندووە ئینجا بڕاوەتەوە...

لەبەر ئەوە پێویستە شەڕی دۆستایەتی ئەکرێ هەتا هەموو جۆرە تەقەلا و کۆششێک بەفیڕۆ ئەڕوا بۆ سەندنەوەی ئازادی و سەربەستی و مافی داگیرکراو. بەڵام شەڕی دوژمنایەتی هەر نابێ بکرێ...

### هۆی شەڕ:

شەڕی دوژمنایەتی هۆی زۆرە. وەک خۆپەرستی، چاوبرسێتی، ئارەزووی زۆرداری و دەسەڵاتداری، ئارەزووی ناوبانگ و خۆپێشاندان، ئارەزووی سەرداریی.

---

(١) لە هیوا. گ. ژ (٦) س(١) کانوونی یەکەمی ١٩٥٧، ل: ٢٠ بڵاوکراوەتەوە.

ئەگەر بهاتایە هەموو تاک و تەرایەکی گەلمان بۆ تێ بگەیینرایە لە هەست و نەستی شەڕ و ئەنجامی شەڕی دوژمنایەتی، لام وایە هیچ گەلێک ئارەزووی شەڕی نەئەکرد، ماوەی سەرکردەکانی خۆیشی نەئەدا کە بەناوی ئەوەوە شەڕ هەڵ بگیرسێنن لەگەڵ گەلانی بەسەزەمان و بێ تاوانی تردا...

بەلام داخەکەم هێشتا ئەو گەلە خوێندەوارە تێگەیشتووە پێگەیشتووانە لە جیهاندا پەیدا نەبوون!... هێشتا ئەو سەرکردە پاک و دڵسۆز و کردەوە بڵندانە زۆر نەبوون کە بتوانن واز لە کەڵکەی خۆیان بهێنن بۆ کەڵکی گەلەکانیان. یان گەلەکانیان لە خراپیی شەڕی دوژمنایەتی تێبگەیەنن و ماوەی شەڕکردنیان نەدەن. لەبەر ئەوە هێشتا گەلە بەسەزمانەکانی جیهان، وەک مەڕ بەدەست سەرکردە گورگەکانیانەوە سەر ئەبڕێن و ئەکوژرێن و لەناو ئەبرێن!... سەرکردەی جەنگاوەرەکان بۆ دەستکەوتنی ناوبانگ و پایە و نیشان، دەوڵەمەندەکانی بۆ دەستکەوتنی پوڵ و سامان. سەرکردە فروفێڵبازەکان بۆ چنگکەوتنی پایە و مایە و ناو، یان بۆ سارێژکردنی دەردی دڵی خۆیان لە پایە ماڵکردنی دوژمنەکانیاندا، هەروەها سەرۆکە ئایینییەکان بۆ مانەوەی نەوازش و دەستکەوت و ئارەزووانی خۆیان.. ئەم دڕندانە هەموو، هەمیشە ئاواتەخوازی شەڕی دوژمنایەتی هەڵگیرساندنن. لە کۆشش و تەقەلای ئەومشدان کە گەلەکانیان چەواشەکەن و بیانکەن بەگژ گەلەکانی تردا، بۆ کەڵکی ناپەسەندی خۆیان!...

(پاپا)ی ئەورووپا و شاهەکانی ئەورووپا و سەرکردەکانی جەنگ و بازرگانە گەورەکان، شەڕی دوژمنایەتییان چەند سەد ساڵێک لەمەوپێش هەڵگیرساند لەناو گاورەکان و ئیسلامەکاندا، بەناوی پاراستنی جێگا پیرۆزەکانی گاورەوە... کەچی لە ڕاستیدا شەڕی دوژمنایەتی و زەوی داگیرکردن و پارە دەس خۆخستن و دەسەلاتداری و خۆپەرستی بوو![1].

لە شەڕی (قریم)دا قەیسەری ڕووس لەلایەکەوە، خونکاری تورکیش لەلایەکی ترەوە، ئالای پاراستنی ئاینیان هەڵکرد و هەردوو لایان بەبیانوی خواناسییەوە گەلەکانی خۆیان بەشەڕدا[2]... کەچی لە ڕاستیدا بۆ دەستکەوتنی زەوی و سامان و کەش و فشی سەرداریی بوو!... هەروەها جووەکانی ئەمریکا و ئەورووپاش بۆ فرۆشتنی کەلوپەلی کارخانەکانیان، بەهەزار فروفێڵ و چاوڕاو توانیان شەڕی گەورەی یەکەم و دووەم هەڵگیرسێنن لەناو گەلانی جیهاندا... وا ئێستایش خەریکن شەڕێکی تر هەڵگیرسێنن بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان... (ئەندەلوس)ی گاور کە داگیرکرا لەلایەن ئیسلامەکانەوە بەهاندانی بازرگانی جوولەکەبوو... (ئەندەلووس)ی ئیسلامیش کە داگیرکرایەوە لەلایەن گاورەکانی ئیسپانیاوە هەر بەهاندانی بازرگانەکان جوولەکەبوو!...

---

(١) مەبەستی لە شەڕی خاوەن خاچەکانە -الحروب الصليبية-.

(٢) شەڕی قرم: ١٨٥٤ - ١٨٥٦ لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و بەریتانیا لەلایەک و ڕووسیای قەیسەریدا بەرپابوو، زۆرترین ڕووداوەکانی ئەو شەڕە خوێناویە لە سوچی خوارووی نیوەدوورگەی قرمدا بوو کە بەسەدان سەربازی تیا کوژرا و دواجار قەلای (سیواستپول) لە ڕووسەکان گیرا. قەیسەر هەستی کرد کە نەمساش لەوەدایە بچێتە پاڵ دووانەکەی تر و دژی بووەستێ. بۆیە خێرا پەیماننامەی پاریسی لە ١٨٥٦دا مۆرکرا بۆ وەستانی شەڕ.

## شەڕی پەسەند:

ئەگەر تەنیا شەڕێک هەبێ کە پیرۆز و بەرز بژمێررێ، مەگەر ئەو شەڕەبێ، کە گەلەکانی سەر زەمین هەموو چاو بکەنەوە و ئەو سەکردە خراپانەیان لابەرن کە هەمیشە بۆ کەلکی خۆیان، بۆ کەلکی ناپوختە و نەنگ و ناپەسەندی خۆیان، گەلەکانی جیهان ئەکەن بەگژ یەکا... بەڵێ ئەو ڕۆژەی کە تێگەیشتن و پێکەیشتن بەتەواوەتی بلاوئەبێتەوە بەناو هەموو گەلەکانی جیهاندا، ئیتر ئەو جۆرە سەرکردە درۆزنە فروفێلبازە ناپاکانە نان ناخۆن. لەسەر دەزگای دەسەلات و سەرکردەیی نامێنن. ئیتر ناشتوانن گەلان چەواشە کەن و بۆ کەلکی خۆیان شەڕیان لەناودا هەلگیرسێنن کە هەتا هەتایێ نەکوژرێتەوە...

بەڵێ ئەم جۆرە شەڕی دۆستایەتی، یاخود شەڕی ئاشتییە پێویستە بکرێ. بەلام پێویستە لە پاش وەرگرتنەوەی بەشی خوراو لە ئازادی و سەربەستی و زەوی و سامان، بنچینەی ئاشتی و دۆستایەتی و ئاسایش دادەمەزرێنرێ لەگەل گەلاندا. ئینجا لەناو چینەکانی ناوخۆدا... پێویستە دەزگایەکی حکومەتی وەها دادەمەزرێنرێ بۆ گەل کە ئیتر ئەوە چینە چینە [illegible]. ئیتر شۆڕش و شەڕ و ناکۆکیی بەبیردائەهێنێتەوە. بەلکو لە بریتیی ئەوە هۆگری: یارمەتی و کۆمەک و برایەتی و خۆشەویستی بێ لەناو خۆیدا و لەگەل گەلانی تری سەر زەمینەدا.

وەکو گوتمان تەنانەت ئەم شەڕی دۆستایەتی و ئاشتییەش نابێ بکرێ هەتا لە هەموو تەقەلا و کۆششێک وەڕس نەبین. ئەگین تەنگ و چەلەمە و گیروگرفتی ژیان، هەمووی، ئەتوانرێ لەسەر بنچینەی برایەتی و ئاسایش و تێگەیشتن ببڕێنرێتەوە... واتا پێویستی بەشەڕ و شۆڕ نییە... ئەم دەستوورەش هەروەک بۆ ناو گەلان ئەتوانرێ بەکاربهێنرێ، ئەتوانرێ بۆ تاک و تەراکانیش (افراد) بەکاربهێنرێ...

## شەڕی تاک و تەرا:

شەڕی ناو ئەم و ئەو، یاخود شەڕی ناو تاک و تەرا لە زۆرداریی یەکتیکەیان، یان لە زۆرداری هەردووکیان پەیدا ئەبێ. پیاوی زۆردار پیاوێکی تێگەیشتوو پێگەیشتوو نییە. پیاوێکی ژیر نییە. پیاوێکی کردەوە نەنگ و بەدخوو ناشیە. پیاوێکی خۆپەرست و چاوبرسی و پەڕپووچە. پیاوێکی بەکەش و فش و خۆهەلکێشە. پیاوێک دڵی بەگوێی هۆشی ناکات... لەبەر ئەوە دڵی چی ئارەزوو بکا ئەوە ئەکات. دڵی ماوەی هۆشی نادات لەشت بکۆڵێتەوە، ئەنجامی کارەسات لێک بداتەوە، ئەوی بۆ ئاسایش و سەربەرزی پێویستە بیکات. دڵی ڕێی ئەوانەی نادات. دڵی هۆشی کردووە بەدیل. لەبەر ئەوە دەست ئەبات بۆ سەر و سامان و ئابڕووی ئەم و ئەو. زۆرداری لەم و لەو ئەکات... دڵی ئەم ئەشکێنێ. ئابڕووی ئەو ئەبات. زەویی ئەو داگیر ئەکات. دزی لەوی تر ئەکات. ئەم ئەکوژێ. بەوی تر ئەو داگیر ئەکات.

بەڵێ پیاوی بێ هۆش، زۆرداریی وا ئەکات.

## بەلام ئەنجام!؟

ئەنجامی ئەم زۆردارە ئەوەیە، ڕۆژێک تووشی یەکێک لە خۆی بەهێزتر دێت. ئەچی بەگژیا ئەیشکێنێ.

تۆڵەی هەموو کەسێکیشی لێ ئەکاتەوە... یاخود ئەو زۆرلێکراوانە بەرە بەرە هۆشیان دێتەوە بەرخۆیان. لەژێرەوە یەک ئەگرن. هورووژمێکی بەهێز ئەبەنە سەر ئەو زۆردارە. تا تەخت و تاراجی تێک نەدەن و تۆڵەی خۆیانی لێ نەکەنەوە وازی لێ ناهێنن.

## کەس زۆرداریی بۆ ناچێتە سەر:

زۆرداریی پەتۆ نابات. ئەتوێێ. کەس زۆرداریی بۆ ناچێتە سەر. چونکە خوایەک هەیە بەو سەرەوە چاودێریی دادخواهی ئەکات. دەستی زۆرلێکراو و داماوان ئەگرێ. پشتیوانیی لێ قەوماوان ئەکات. زۆرداران سەرنەنگری ئەکات. بۆ ئەمەی دووبارە دادخواهی بلاوبێتەوە بەناو گەلا، بەناو هەموو گەلاندا.

شاهەنشاهەکانی عەجەم، ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما، خونکارەکانی تورک، کە مەستی دەسەلات و هێز و سامان بوون، پریان دایە گەلە بەسەزمانەکانی خۆیان و ئەم لا و ئەولایان... دەستیان کرد بەزۆرداری. دوایی لە مێژوودا چاوتان پێکەوت، کە چۆن زۆرلێکراوان لێیان ڕاستبوونەوە، چوون سەر ئەنگریشیان کردن!...

سەرەک هۆزێک لە هەورامان، چاوی بڕییە نۆکەرێکی خزمی خۆی، لە شەوی بۆکێتیدا کچەکەی خراپ کرد... بەلام ئەزانن چە وەرامێکی لە نۆکەرەکەیەوە وەرگرتەوە؟... پانزە ڕۆژێکی پێ نەچوو، نۆکەرەکەی خۆی گوللەیەکی نا بەکەللەی سەریەوە، گیانی لەبەر بڕی!.

خێزانێک ئەناسم، باوک و دایک و کوڕ، هەرسێکیان، بەقسەی ڕەق و ناخۆش، بەقیرەقیر و شاتەشات دلی گەلێک کەسیان شکاند. زۆریان لە زۆر کەس کرد. لە ئەنجاما هەرسێکیان لە ماوەی دە سالێکدا بەگوللەی زۆرلێکراوان گیانیان لە لەشیان جوێ کرایەوە!؟...

(هیتلەر) و (مۆسۆلینی) هەردووکیان گەلی خۆیان تووشی دیلی و بەندەیی کرد، کردیانن بەگژ جیهاندا، دوایی هەردووکیان هەریەکە بەگوللەیەک دوایی بەژیانیان هێنرا!...

## مەبەسی ژیان چییە؟:

مەبەسی ژیان ئەوەیە کە خۆشی لە ژیان ببینین. وەختێکیش ئێمە ئەتوانین خۆشی لە ژیان ببینین کە خۆشەویستی و برایەتی و یەکێتی و یارمەتیمان لەناودا هەبێ. ئەمانەش تا سەربن تاکو لەناوماندا ئاسایشی تاسەر پێک بێ. ئەو بەختیاری و کامەرانییەش کە ئاواتی هەموو لایەکمانە، تەنیا لە سەرچاوەی خۆشەویستی و برایەتی و یارمەتیی گشت لایییەوە هەلئەقولێ.

ئەو وەختەی کە هەموو کەس لەسەر زەمینا، ئەبێتە خوێندەواری تەواو، ئەبێتە خاوەن دلی پاک و زبانی پاک و کردەوەی چاک، ئەبێتە گەورەی خۆی، واتا جلەوی دلی بەدەست هۆشیەوە ئەبێ و بەسەرپەرشتیی هۆشیەوە ئەڕوات بەڕێوە... ئەو وەختە ئاسایش و خۆشەویستی و کامەرانی لە هەموو کلاوەی سەر زەمینا فەرمانڕەوا ئەبێ... ئەو وەختە شەڕ و شۆڕ و جوێن و خوێن و ناکۆکی نامێنێ... ئەو وەختە دانیشتوانی سەر زەمین وەک یەک خێزانیان لێ دێ. ئینجا جیهان ئەبێتە خانوویکی هەموویان.

یەک حکوومەتیان ئەبێ. یەک زبانیان ئەبێ. یەک پارە و یەک پۆستە و یەک جۆرە خوێندەوارییان ئەبێ... ئەو وەختە جیهان وەک بەهەشتی لێ دێ. ئامانجی هەموو: ڕابواردنێکی ئاوازەی خۆشی پڕ تەندروستی و سەربەستی بەختیاری و کامەرانی ئەبێ.

جا کەوای لێ هات بام هەر لە ئێستاوە، هەر کەسمان خۆی بۆ ئەو ژینە ئامادەکات. یارمەتیی براکانیشی بدات بۆ ئەو ئامادەبوونە. واتا: بام هەر لە ئێستاوە تێکۆشین ببین بەپیاوێکی تەواو، یەکتر بکەین بەپیاوی تەواو. دڵێکی پاک و زبانێکی پاک و کردەوەیەکی چاک بۆ خۆمان و بۆ هەموو لا پێک بێنین. تا بەو ئامانجە پیرۆز و بەرزەمان بگەین.

## جیهان بەرەو چاکی ئەڕوا:

لەگەڵ ئەم هەموو شەڕ و شۆڕ و بەدکردارییەشدا کە ئیمڕۆ لەناو جیهاندا ئەیبینین، من باوەڕم وایە کە جیهان بەرەو چاکی ئەڕوا و دوایی هەر ئەگاتە ئەو ئامانجەی ئاواتی بۆ ئەخوازین. واتا ئەبێتە یەک خێزان لەناو یەک خانوا. بەڵا خێزانێکی بەختیار لەناو خانووێکی ئاوازەدا.

هەست پێ ئەکەم کە لەم ئاواتە زۆر کەس پێ ئەکەنێ. زۆر کەس سەری سوڕئەمێنێ. چونکە ئەو هیوایە لەم دانیشتوانی جیهانە خراپانە ناکات. بەڵام بڕوا بکەن کە ئاواتەکەم ڕاستە و دێتەدی. نەء، ببەخشن ئەمە ئاواتی من نییە. ئاواتی خوایە. بەڵکو ئامانجی خوایە. مەبەسی خوا لە ناردنی پێغەمبەرەکانی بۆ ناو دانیشتوانی جیهان هەر ئەمە بووە کە بیانخەنە سەر ئەم ڕێگایە، کە بیانگەیینە ئەم ئامانجە. ئەم شەڕ و شۆڕ و جوێن و خوێنەش کە ئێستا ئەیبینین لە جیهاندا و مێژوو بینوێنێ لە جیهاندا، دیسانەوە هەموو هەنگاوێکن دانیشتوانی جیهان ئەیهاوێژن لەم ڕێگایەدا بۆ گەیشتن بەو ئامانجە. ئەم سەرگەردانی و کوشتاری ناو جیهانە وەک هاوار و فریادی ئەو نەخۆشە وایە کە لەژێر نەشتەرکاریی پزیشکێکی پسپۆڕدا ئەیکات.

چەند ڕۆژێکی پێ ناچێ نەخۆشەکە چاک ئەبێتەوە و سوپاسی پزیشکەکە ئەکات. دانیشتوانی جیهانیش لە پاش ئەم شەڕ و کوشتار و سەرگەردانییە، هۆشیان دێتەوە بەرخۆیان. ڕێگای چاکە ئەگرنە بەر و بەم ئامانجە پیرۆز و بەرزە ئەگەن. ئەوسا کە سوپاسی پزیشکی مەزن و واتا خوای بێ هاوتا ئەکەن کە ئەم نەشتەرکارییە و ئەم ئامۆژگارییەی کردوون.

دیسانەوە ئەیڵێمەوە: جیهان بەرەو چاکی ئەڕوا. زۆر بەتیژیش بەرەو چاکی ئەڕوا.

تەلەفۆن و بێ تەل و ڕادیۆ، لە هەناسەیەکدا لە دەرد و ئازار و خۆشی و بەختیاری هەموو دانیشوانی جیهانمان ئاگادار ئەکەن. شاخ و کێو و دەشت و دەر و زێ و ڕووبار ڕێگە و بانی دوور و درێژ لە بەرامبەر هێزی بروسکەیی تەلەفۆن و بێ تەل و ڕادیۆدا خۆیان پێ ناگیرێ، بەرگە ناگرن، هەروەک نەبن وایە. لە بەرامبەر فڕۆکە و ئۆتۆمۆبیل و شەمەندەفەر و کەشتیدا، ماوەی ڕێگا دوورەکان نەماوە، وەک تەنگی هەرد کێشرابێتەوە وەهایە. ڕۆژ بەڕۆژ تێکەڵ بوونی گەلان بەیەکتر و خوێندەواری گشت لایی لەناو دانیشتوانی جیهاندا زۆرتر بلاوئەبێتەوە. گیانی چاکە و کۆششی مەردانە بۆ پێشخستنی هەموو

دانیشتوانی جیهان ڕۆژ بەڕۆژ لە پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەدایە، (کۆمەڵی گەلان)، (کۆمەڵی نەتەوە یەککگرتووەکان)، (یەکێتیی پۆستە و تەلگراف)، (دادخانەی گشت لایی لە لاهای)، (ئەنجوومەنانی گەلان) کە لەم حکومەت و لەو حکومەتا ئەگیرێن بۆ بەرەنگاری کردنی نەخۆشی و پێشخستنی کاروباری شینایی (زراعە) و کشتوکاڵ و ئاوەدانی و ڕێکخستنی گوند... داهێنانی ئەلەکتریک و سینەما و چاپ و تەلەفزیۆن... ئەمانە، هەموو، بەڵگەن کە دانیشتوانی جیهان بەرەبەرە چاو ئەکەنەوە. وریا ئەبنەوە. لەوە تێ ئەگەن کە هەموو یەک خێزانن. خۆشی و ناخۆشیان یەکە. یەک خانوویان هەیە، پێویستە ئاوەدانی بکەنەوە. ئەویش کڵاوەی زەمینە. پێویستیشە تیا بەخۆشی بژین.[1]

بەڵێ ئەمانە و گەلێ شتی تریش بەڵگەن کە دانیشتوانی جیهان. هەموو، تەکان ئەدەن بۆ پێشەوە. بۆ یەکناسین، بۆ یەکبوون، بۆ یەک خێزانی، بۆ برایەتی، بۆ خۆشەویستی، بۆ ژینێکی پڕ بەختیاری.

سا خوا ئەم ئاواتە بڵند و پیرۆزەمان بهێنێتەدی. جیهان لە ژینێکی پڕ ئاسایش و ئاشتی و خۆشەویستی کامەرانیدا ببینین... لە جیهان نیشتمانی ئاوەدان، لە دانیشتوانی جیهانیش گەلێکی ئازاد و بەختیار پێک بێت...

## بەرخەکە[2]

کوڕەکەم لە تەمەنی دوانزە ساڵاندا بوو. ڕۆژێک هەستی کرد بەئاوارەیی تەنیایی. ئەگەڕا بۆ شتێک دڵی خۆی پێ خۆش کات: خۆشەویستی و دڵسۆزی و چاودێریی خۆی تیا بەخت کات. ناچاری کردم بەرخۆلەیەکی بۆ بکڕم لە مەڕسەربڕێک (قصاب). زۆری پێ نەچوو کوڕەکەم بوو بەدۆستێکی گیانی بەگیانی بەرخەکە. بەرخە بەسەزمانەکە وا هۆگری بووبوو، کە کوڕەکەم ئەڕۆیشت ڕای ئەکرد بەدوایا. لێی ئەچووە پێشەوە. خۆی تێ هەڵئەسوو. یاری لەگەڵ ئەکرد. کوڕەکەمی لە جێگای دایکی دانابوو ئەو دایکەی کە خۆپەرستی ناپەسەندی ئەوەی ئادەم لەوی جویێ کردبووەوە.

هەرچەند بەرخەکە بەتەنیا بمایەوە، ئەی باڕاند: کوڕەکەمی بانگ ئەکرد پێویستی جێبەجێ بکات، هاودەمی بکات، دڵی خۆش بکات. جا کوڕەکەم چەند بەختیار بووبوو بەو بەرخە بەسەزمانە!... بەرخەکە هەموو کاتێکی، هەموو بیرەوەرییەکی کوڕەکەی داگیر کردبوو. کوڕەکەم ئەوەندەی بەتەنگ دڵی ئەو بەرخەوە بوو بەتەنگ دڵی کەسی ترەوە نەبوو...

بەڵام، بەلای منەوە، باڕاندنی بەرخەکە لە بانگکردنی کوڕەکەم زۆرتری تیابوو. شتێکی گرنگتری تیابوو. دیلی و بەندەیی بێ دەسەڵاتیی بەرخەکەشی ئەنواند بەرامبەر بەهێزێکی وا کە نەیئەتوانی بەرەنگاریی بکا!... بەرخەکە لە خۆشەویستی و دڵسۆزی و چاودێریی دایکی بێ بەش کرابوو. لە

---

(١) ئەم ئاواتەخوازی و پێشبینیە وردانەی مامۆستا، بەتایبەت لە بواری گەیاندن و تەکنەلۆژیاوە، خۆشبەختانە زۆر زۆریان هاتوونەتە دی و دنیای ئەمڕۆ بۆتە گوندێکی گەورە، بەڵام بەداخەوە بەرەی شەڕ و شەڕانگێزان هێشتا ماون و ئەو خەونە خۆشە لە مرۆڤایەتی دەشێوێنن.

(٢) ئەم بابەتە لە: هیوا - گ ژ (٩) ساڵی (١) مارتی ١٩٥٨ ل ١٩ - بڵاوکراوەتەوە.

خۆشەویستیی و دڵسۆزی و چاودێریی کوڕەکەم دڵنیا نەبوو. بەشتێکی دەسکردی ئەدایە قەڵەم. ئەو حەزی ئەکرد بچێتەوە لای دایکی. حەزی ئەکرد سەربەستیی خۆی دەست کەوێتەوە. لە زۆرداریی دوورکەوێتەوە. لەبەر ئەوە هەستی بەترس ئەکرد. ئەترسا لەوەی شتێکی بەسەربێ!.

لە ڕاستیدا بەرخەکە بەهەڵەدا نەچووبوو...

چۆن ئەبوو باوەڕ بکا بەدۆستایەتیی کوڕەکەم و ئەو مەڕسەربڕەی کە ئەو بەسەزمانەیان لە دایکی جوێ کردبووەوە!؟... بەرخەکە بەدڵ هەستی ئەکرد بەجیاوازییەکی گەورە لە ناوەند خۆشەویستی دایکی کە پڕ بوو لە دڵسۆزی و خۆبەختکردن و خۆشەویستی کوڕەکەم مەڕسەربڕەکە کە پڕ بوون لە خۆپەرستی!... لەبەر ئەوە هەرچەند بەتەنیا بەیەوە ئەیبارڕاند، ئەلالایەوە. چونکە خۆی لە تەنگ و چەڵەمەدا ئەدی. ئەترسا لەوەی لەناو بچێ. وا تێگەیشتبوو کە ئەگەر بەهۆی کەمتەرخەمی کوڕەکەمەوە لەبەر بێ ئاوی و بێ خۆراکی نەمرێ، دوور نییە سەگ و گورگ لە پەرژینی خانووەکەوە باز بدەنە ژوورەوە، پەلاماری بدەن، بیخۆن یاخود دز و درۆزن و زۆردارێک بەشەو بیدزن و سەری برێ، بیبرژێنێ و بیخوا. ئەمە ڕاستە کوڕەکەم دۆستێتی دڵسۆزێتی، بەڵام تەق و ئارەزووی چووە سەر گۆشتە ناسکە خۆشەکەی!... کێ ئەڵێ سەری نابڕێ؟ بۆ چ هەموو ڕۆژ هەزاران بەرخی وەک خۆی سەر نابڕێن بۆ خۆشیی بن دانی کوڕەکەم و هاوتای کوڕەکەم؟!

لەبەر ئەوە بارە باری ئەو بەرخە لە باوک و دایک بڕاوە کڵۆڵە، کە وەک هاوارێکی بێ دەسەڵات و بێ چاران ئەهاتە بەرگوێ، کە سێدارە لە نزیکیانەوە هەڵخرابێ دڵمی ئەسووتاند، جەرگمی ئەبرژاند. تەنانەت ئەوەشی لەبیر ئەبردمەوە کە کوڕەکەم و هەموو خێزان نازیان ئەکێشا و چاودێرییان ئەکرد!... بەڵام منیش بەهەڵەدا نەچووبووم. زۆری پێ نەچوو، دۆستایەتی و نازکێشان و دڵسۆزی بەرامبەر بەرخەکە لەبیر کوڕەکەم و خێزان چووەوە. کاتێکم زانی بەرخی بەسەزمانیان داوە بەزەویدا ئەیانەوێ سەریبڕن و گۆشتەکەی بکەن بەچێشت کە لە سەیرانگا دەرخواردی چەند میوانێکی زۆرداریی وەک خۆیانیان بدەن!. باش بوو فریاکەوتم و بەرخی بەسەزمانم لە دەستیان ڕزگار کرد!.

گەلێک لە نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتیش، داخەکەم، لەو بەرخە بەسەزمانە ئەکەن!. ئەوانیش هەرچەندە سەرۆکە خۆپەرستەکانیان خۆشەویستییان بۆ ئەنوێنن و یارمەتییان ئەدەن و چاودێرییان پێشکەش ئەکەن... بەڵام، هەی هوو!... تازە چاویان کراوەتەوە، قەت چەواشە نابن. لە ترسی گیانی خۆیان ناچارن هەر هاوار فەریاد بکەن تا خوا دەرگایەکی ڕزگاربوونیان لێ ئەکاتەوە!...

## زۆرداری بەڕێز

(بێژەن) لە باوکییەوە زەوی و سامان و سەرۆکایەتیی بۆ مایەوە. خۆیشی بەچاکی و بەخراپی خۆی لە فەرمانڕەوایی (حکوومەت) بردە پێشەوە تا بووە ئەندامێکی کۆڕی نەتەوە (نائب). بەڕاست و بەدرۆ گەلێ دۆستی لە دەسەڵاتدار و کاربەدەستان پەیدا کرد. بەڵام لەم بەدبەختیی ئەو گوندەکەی بووە ناوچەیەکی فەرمانڕەوایی گرنگ!... لەبەر ئەوە (بێژەن) داجڵەکی. دڵەکوتێ و گلاراوییی پێکەوت. بەم لاو و بەولای خۆیا ئەیڕوانی کە ڕێگایەک بدۆزێتەوە بۆ پاراستنی دەسەڵاتە ناپوختەکەی لە گوند و

هۆزەکەیا!... دوایی گەلێ ڕێگای خوار و خێچی دۆزییەوە کە بیگەیێنێ بەمەبەسی خۆی. دەسی کرد بەبەرتیلدان و مێچکەکردن و خۆ بردنە پێشەوە لای گەورە گەوران و خۆنووساندن بەم دەستە (حزب) و بەو دەستەوە...

لەوانەش مەبەسی ئەوەبوو کە دانیشتوانی گوندەکەی و هۆزەکەی چەواشە و بەچەترسێن بکات بۆ ئەمەی بەئارەزووی خۆی بیان ڕووتێنێتەوە و بیانچەوسێنێتەوە. لە ئەنجامدا هۆزە بەسەزمانەکەی خۆی تووشی هەژاری و ڕووت و قووتی و ملکەچی و چارەڕەشی کرد. بەڵام زۆری پێ نەچوو ئەم زۆردارییەی لە وزە دەرچوو!. ئیتر هۆز چاوی کردەوە... وای لێ هات ڕاست لە درۆ، چاک لە خراپ، دڵسۆزی لە چەواشەکردن جیا بکاتەوە. هێزی ژیان کەوتە گیانیەوە. ئینجا چەند کەسێکی ئازا و بەجەرگی لێ هاتە کۆڕەوە. دەستیان کرد بەبەرەنگاری کردنی زۆرداری و دەستدرێژیی (بێژەن) و نەهێشتنی دەسەڵاتی ناپەسەندی!. ئیتر هیچ بۆ (بێژەن) نەمایەوە ئەوە نەبێ دەست بداتە بەدگۆیی و تەڵەنانەوە لای فەرمانڕەوایی بۆ ئەو لاوە سەر بڵندانەوە؛ داخەکەم هەندێ لەو کاربەدەستانە گەلێک جار بڕوایان پێ ئەکرد و لەبەر نەشارەزایی و کەڵک پەرستیی خۆیان، لەبەر دڵی (بێژەن) زۆرکەسیان لەو لاوە بەنرخانە ئازار ئەدا! و تەفروتونا ئەکرد!. لەگەڵ ئەوەشا ئەو زۆرداریبیانە گەڕان بەچاکە بۆ هۆزا!... زۆری پێ نەچوو گیانی بەرەنگاری کردنی زۆرداری و دەستدرێژی، زۆربەی هۆزی گرتەوە. دەنگیان کرد بەیەک و ڕاستییان گەیاندە کاربەدەستان. ئینجا زۆرداریی بەڕێز، باڵاپۆش (عبا)ەکەی لە خۆیەوە پێچا و سواری ئۆتۆمبێلە شەنگ و شۆخەکەی بوو ڕووی کردە هەندێک لەو کاربەدەستانە. پاش ئەوەی کڕنۆشی نەوازشی بۆ کێشان، ڕستەیەکی لەناوی هەندێ فەرمانبەرانی بێ تاوان پێشکەش کردن. گوناهی ئەو فەرمانبەرانە ئەوەبوو یارمەتی بێژەنییان نەئەدا لە زۆرداریی و ڕووتکردنەوەی هۆزەکەیا!... تێکۆشا ئەو کاربەدەستانە بخاتە سەر ئەوەی ئەو فەرمانبەرانە تەفروتونا کەن، لەناو بەرن. بێژەن وای ئەزانی هەموو کاربەدەستێک وەک یەکە. بەبیریا نەئەهات کە هەروەکو کاربەدەستی بەرتیل خۆر و دز و زۆردار هەیە، کاربەدەستی دادپەروەر و تێگەیشتوویش هەیە. لە پاش ئەمەی کاربەدەستەکان گوێیان لە درۆودەلەسەکانی گرت، بەدزیی ئەوەوە پرسیان لە فەرمانبەران و دانیشتوانی گوند و هۆزەکە کرد. ئەوەندەی پێ نەچوو درۆ و مەبەسی ناپوختەی سەرەک هۆزی بەڕێزیان بۆ دەرکەوت. ڕاستی و دڵسۆزی و بێ تاوانی ئەو فەرمانبەرە بەسەزمانانەشیان بۆ ئاشکرابوو. مەردانە پشتی فەرمانبەرەکانیان گرت و بەئافەرینەوە لە شوێنی خۆیان هێشتیاننەوە!... بەو ڕەنگە ڕۆژگار، تەنیا بۆ یەکەمجار لە مێژووی ئەو ناوچەیەدا، لە پێکی لە دەمی سەرۆکی خۆپەرست و ئەندامی کۆڕی نەتەوەی ناپاکدا!... بێژەنیش بەسەرشۆڕی و دڵشکاوی و ڕووڕەشییەوە گەڕایەوە گوندەکەی خۆی تا ئەو فەرمانبەرە هۆزپەروەرە، سەر بڵندانە، واتا دوژمنەکانی خۆی، بەگەشی و خۆشیی سەرکەوتنیانەوە ببینی!...

ئا بەم ڕەنگەیە ژیانی گەلە هەژارەکەمان!...

ئەی خوا! تاکەی وا ئەمێنینەوە؟!...

تاکەی؟!...

## ڕاپەڕینی گەل

(بیوراسپ) لاوێک بوو، لە هەڕەتی کوڕێنیا!... هەندێکی خوێندبوو. بەڵام لە پاش مردنی باوکی کە سەرەک هۆزێکی بەچنگ بوو گۆڕا. دەستی دایە زۆرداریی و دەستدرێژی. بەڵێنی بەخۆی دا، کە زەبر و زەنگی (تەیموور لەنگ) و زۆرداریی (جەنگیزخان) و وێران کردنی (هۆلاکۆ) بژێنێتەوە!... چەقۆی نایە سەر ملی هۆزەکەی خۆی و هەموو جۆرە زۆرێکی لێکردن. لەلایەکەوە لێی ئەدان. لەلایەکەوە لێی ئەکوشتن. لەلایەکی ترەوە لەلای فەرمانڕەوایی بەدناوی ئەکردن. بەوەش وازی نەهێنا هەندێکیانی لە کرد و کۆشی و گوزەرانی سەر بڵندانە بەربەست کرد!... تەنانەت ئەو فەرمانبەرانەی کە لە هۆزی خۆی بوون و بەرەنگاریی زۆرداریی و چاوبرسێتی و بەدگۆیی ئەویان ئەکرد لە دەستی ڕزگاریان نەبوو، تێکۆشانیان ببڕێ، ئاوارەیان کات، بیانخاتە بەندیخانەوە!...

یەکێ لە زۆرداریەکانی ئەوە بوو هەر کەسێ کار و فەرمانێکی بەکەڵکی بۆ خۆی بدۆزیایەوە، یان بچوایە گرەوی وەرگرتنی پرۆژەکانی فەرمانڕەواییەوە، یاخود بیویستایە سامانێک بۆ خۆی پێکەوەنێ، (بیوراسپ) بەرەنگاریی ئەکرد، هەڕەشەی لێ ئەکرد، جەزرەبەی پێ ئەگەیاند: بەکوشتن، بەبڕین، بەلێدان، بەخانوو سووتاندن، بەکەتن پێکردن، بۆ ئەمەی کەسی تر نەتوانێ بەربەرەکانێی بکا و سایە و پایە و مایە هەر بۆ خۆی بمێنێتەوە!...

بەم ڕەنگە (بیوراسپ) توانی پێوەندی دیلی و بەندەیی بخاتە پێی هۆزەکەیەوە. ئەم هێزەشی لە ڕۆژگاری کەچ ڕەفتار و هەژاری و نەخوێندەواری و دەردەداریی کۆمەڵەوە دەستکەوتبوو لەگەڵ فڕوفێڵبازی و چاوڕاوی بلیمەتانەی خۆیەوە!... ئەگەر تەماشای دەموچاوی تاک و تەرای هۆزەکەیت بکردایە بەئاشکرا ترس و لەرز و سستی و بێ کارەییت تیا ئەبینی!... بەم ڕەنگە ئەو هۆزە کلۆڵە بەترس و لەرزەوە ئەژیا. نەیان ئەوێرا، نە بەتاک و تەرا، نە بەکۆمەڵە هیچ کار و فەرمانێکی گرنگ و بەکەڵک ببینن تا گوزەرانی پێوە بکەن!... بەڵکو نەیانئەوێرا لە دەست زۆر و ستەمی (بیوراسپ) و دەس و پێوەند و هاوکارانی، لای فەرمانڕەوایی سکاڵای دەردی خۆیان بکەن!. ئەگەر بیانویستایە فرمانێک ببینن ئەبوو لە پێشەوە بەرتیلیان بەو بدایە!...

بەم ڕەنگە گەلێک ساڵ تێپەڕی...

بەڵام جیهانیش هەندێک گۆڕا...

هۆز چاوی کردەوە... ڕاستی و دروستیی بینی... کەمێکیش خۆی ڕاست کردەوە... ئینجا هێزی گرتەوە... لە پڕ هەستایە سەرپێ و داوای گێڕانەوەی مافی داگیرکراوی خۆی کرد!... پاش ئەوە مەردانە و گورج و گۆڵانە ڕەنجی دا و تێکۆشا و بەرەنگاریی کرد تا لە شەڕی یەکەما بێ شەڕ و شۆڕ بێ کوشتن و بڕین سەرکەت!... زۆری پێ نەچوو پاوانەکەی خۆی لە دەست زۆرداری ئەگریس سەندەوە!...

هەروەها ڕێگایەکی پان و فراوانی ڕاست و ڕەوانی بۆ ئازادی و سەربەستی پاشەڕۆژی خۆی کردەوە!... ئینجا بەهەڕەت تیژ بووە سەر داواکردنی بەشە خوراوەکانی تری. یەکێک لە تاک و تەراکانی ئەو هۆزە چووە ناو گرەوی بەمزگرتنی چاپخانەیەکەوە کە ساڵەهای ساڵ بوو لە ترسی هەڕەشەی ئەو زۆرداره نەی

ئەوێرا لە شارەوانی (بلدیە) بیگری. ئەبوو زۆردارەکە لە شارەوانیی بگری، پاشان ئەویش بەمزێکی زۆر لە زۆردارەکەی بگرێتەوە!... بەڵام کە چاپچییەکە لەلایەن کاربەدەستانی فەرمانڕەواییەوە دڵنیا کرا و باوەڕی بەدادخواهی و نیشتمانپەروەرییان کرد، ترسی لە زۆردارەکە نەما، خۆی هاوێشتە پێشەوە و بەنرخێکی گەلێک هەرزانتر لە جاران و دووریش لە دیلی و بەندەیی بۆ زۆرداران، چاپخانەکەی لە شارەوانی وەرگرت. بەم ڕەنگە جارێکی تریش هۆز سەرکەوتەوە!...

ئینجا بێ پەروا دەستی دایە کار و فەرمانی چاک و بەکەڵک بۆ خۆی و بۆ هەمووان!؛ هۆز وردە وردە پێشکەوت و بووژایەوە و ئازادیی دەستکەوتەوە.

بۆ (بیوراسپ)ی بەرێزیش ڕەنجەڕۆیی و شەرمەزاریی نەبێ هیچی تر نەمایەوە!؟.

بەڵێ. ئەگەر گەل بزانێ مافی خۆی چییە و چۆن داوای ئەکا و چۆن لە داواکردنیا مەردانە و گورج و گۆڵانە تێ ئەکۆشێ، ئەتوانێ، تاسەر، بەسەر هەموو زۆردارێکا سەرکەوێ!...

ئایا زۆردارەکانی ترمان لەم پەندە تێ ئەگەن؟!...

## گوندی ئازاد

گوندی مەزن و لەژێر باری گرانی جووتە برای زۆردارا ئەینالاند. چونکە ئەبوو هەموو گوندییەک لەو گوندەدا، هەر ساڵی چەند جارێک، سەرانە بەو دوو ئاغایە بدات!... جگە لەوە، ئەبوو لە کاتی ژنهێنانا پێشەکی سوورانەیان بداتێ!... ئەوی بییتە فەرمانبەری فەرمانڕەوایی هەمیسان بەرتیلیان بداتێ!... ئەوی بییتە خۆشەویستی ناوخۆی و ئاغاکان بپارێزی هەموو دەم دیارییان پێشکەش بکات!...

چونکە ئەگەر وایان نەکردایە: نەیان ئەتوانی لەو فەرمانانەیان بمێننەوە!...

ئەمانە لەوێ بووەستێ. ئەبو دانیشتوانی گوند گەلێک شتی تریش بۆ ئاغاکانیان بکەن وەک: بێگار و باربوکردن و شەڕ بۆ کردن بەخۆڕایی!... ئەگینا زەوییە فەرمانڕەواییەکانیان لەدەست ئەسێنرایەوە، فرمانە فەرمانڕەواییەکانیان لێ وەرگیرایەوە، هەروەها لە بەخششی ڕووخۆشی جووتە ئاغاش بێ بەش ئەمانەوە!...

بەم ڕەنگە ئەو گوندە بەسەزمانە، دەمێکی دوور و درێژ، لەژێر مۆتەکەی هەژاری و دیلی و بەندەیی ئەو دوو ئاغا بەرێزەدا مایەوە!...

بەڵام سەیر ئەوەیە، ئەو دوو ئاغایە، ئەو هێز و دەسەڵاتەیان بەهۆی فەرمانڕەواییەوە دەستکەوتبوو!؟... چونکە هەموو دەم هاتوچۆیان ئەکرد بۆ لای فەرمانبەران. دانیشتوانی گوندەکەیان وا چەواشە کردبوو کە فەرمانڕەوایی لە پشت هەردووکیانەوەیە. چییان لێ بکەن بۆیان ئەچێتە سەر!؟...

ئاغاکان: یەکێکیان ڕەزەکانی فەرمانڕەوایی لە فەرمانڕەوایی وەرگرتبوو، بەمزێکی کەم. بەڵام خۆی بەمزێکی مەزن ئەیدایەوە بەلادێییەکان.

ئاغاکەی تریشیان بووبووە فەرمانبەرێک زەوی و ڕازەکانی فەرمانڕەوایی ئەپارلست لەو گوندەدا. ئەو دوو ئاغایە کە چەند ساڵێک لەوە پێش کێچ لە باخەڵیاندا سەوزەڵەگیاغیان ئەگوت و کەسیش لە

دانیشتوانی ئەو گوندە سەیری بۆ دانەنواندن و گوێی نەدانێ و سەرانەی پێ نەئەدان... بەهۆی ئەو دوو فەرمانەوە کە لە سەرەوە پێشانمان دان، وا خۆیان لە فەرمانبەران نزیک خستبووەوە، وا گوندییەکانیان چەواشە کردبوو ترساندبوویان، زۆری پێ نەچوو هێز و دەسەڵاتەکەی پێشوویان بۆ خۆیان گێڕایەوە و ئەو گوندییە بەسەزمانانەیان بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان ڕووت و نابوون و کز کردووە!... خۆیشیان گەیاندوە پلەی هەرە دەوڵەمەند و هەرە دەسەڵاتداری ئەو ناوە...!

بەم ڕەنگە لەگەڵ گوندییەکاندا: هەژارییان گۆڕییەوە بەدەوڵەمەندیی، بێ دەسەڵاتیشیان گۆڕییەوە بەگەورەیی!...

بەم ڕەنگە چەرخی ڕۆژگار چەند ساڵێکی وا ناخۆشی ڕابووراند بەسەر ئەو گوندە کاولەدا!...

بەڵام... زۆرداریی لە وزە دەرچوو!؟...

ڕۆژگار گۆڕا...

گوند چاوی کردەوە...

لە فەرمانبەرانی ئەو وەختەشا تاک و تەرا هۆگری دادخواهی و چاکی پەیدابوون...

گوند لە پڕ ڕاپەڕیی!؟...

لە پڕ هورووژمی هێنا!؟...

مافی خۆی لە فەرمانڕەوایی گەیاند و بێ شەڕ و بێ خوێن پێوەندی زۆرداریی پچڕاند!؟...

بەم ڕەنگە، سەرداریی گوند، کەوتەوە دەست دانیشتوانی گوند...

سەربەستی و ئازادییان بوونە پێشەنگ بۆ بووژانەوە و ڕزگارییان لە هەژاری و لە نەخوێندەواری و لە دەردەداری...

گوندی مەزن ئازادیی خۆی سەندەوە...

ئاغاکان ناچارمان بەسەر شۆڕییەوە دەست لە کاروباری گوندەکە بکێشنەوە...

بەم ڕەنگە ڕاستی و دروستی و دادخواهی سەرکەوتنەوە...

بەم ڕەنگەش گەلی نەژاد مەردایەتی و ئازادی پەروەریی خۆی نواندەوە!...

## خەبات بۆ سەربەستی

هاوڕێی نوێمان لە باوک و باپیریەوە دەسەڵاتێکی خواناسی بۆمابووەوە. بەڵام زیرەک بوو، زۆر تێگەیشت کە (شێخێتی) بەرەو نەمان ئەڕوا. هەروەها لە وزەشیا نییە کە لەم چەرخەدا سامانی زۆر و دەسەڵاتی گەورە بەرهەم بێنی... دەسی دایە (ئاغایەتی). زۆری دەس و پێوەند و ئۆتۆمبیل و تفەنگچی و گەلێک جووتیار و سەپان کە بەوەش وازی نەهێنا. هێرشی هێنایە ناو لاوە خوێندەوارەکانەوە توانی تا ئەندازەیەک گەلێک لەو لاوانە چەواشە کات!... بەڵام زۆری پێ نەچوو، تەڵەکەبازییەکەی دەرکەوت... دڵ و دەروون و نیازی ناپەسەندی لە توێی پەردەی شێخێتییە درۆزنەکەیەوە لە لاوان ئاشکرابوو!؟... لە پڕ

هێزی ڕاستی و دروستی و دادپەروەری و سەربەستییەکی گرت و بەسەرکردەیی لاوە تێگەیشتووە بەهێزەکانەوە دەرکەوت و سەرکەوت!... لەشکری (شێخ ئاغا) لە کۆڕی نەتەوە و نیشتماندا شکا و بەشپرزەیی و سەرشۆڕییەوە تەفروتونا بوو!...

بەم ڕەنگە کەڵەکی هاوڕێی نوێمان ڕووخا!... هەر کۆشش و پارەیەکیشی لەپێناو شکاندنی لەشکری گەلا بەختکردبوو بەفیرۆچوو!... ئەمەش یەکەم جاری بوو لە ژیانیا کە هەستی بەگەورەیی (نەتەوە) و هێز و توانای (لاوی تێگەیشتوو) کردبێ!؟...

ئەم کارەساتەش لەوەوە ڕوویدا: کە لاوەکان ویستیان ئاهەنگێک بگێڕن بەبۆنەی جەژنێکی نەتەوە. (شێخ ئاغا) بۆ کەڵکی ناپەسەندی خۆی هەندێ لە کۆنەپەرست و کاربەدەستانی لە نەتەوە ورووژاند. گەلێک بەرهەڵست و کۆسپیشی خستە بەر ڕێگای گەل تا ئەم ئاهەنگە نەکا!...

بەلام... ئاهەنگ هەر کرا!... لاوان سەرکەوتن و ئەو سەرنەکەوت!.

بەڵێ... ڕاستە، پاشەجار، ئەو توانی هەندێ لەو لاوانە بدا بەکوشت، هەندێکیشیان بەهۆی فەرمانڕەواییەوە بخاتە زیندانەوە... بەلام ئێستاش لاوەکان چاویان لەوە نەترساوە. هەر بەهەرەتی نیشتمانپەروەرییەوە خەبات ئەکەن بۆ گەیشتن بەئامانجی سەربەستی!...

ئێستاش وەک ئەو ساڵە، هەموو ساڵێک، ئاهەنگ بەو جەژنە پیرۆزەوە ئەکەن و پەروا لە پەنگ و پەراوێز و تەڵەکەبازیی کاکی بەرێزمان ناکەن!؟.

## دوژمنی خوێندنگا

گوندەکە گەورە بوو... جوان بوو. ئاو و بای سازگار بوو. پڕ بوو لە کانیاو و دار و درەخت و میوەهات، بەلام بەهۆی شێخی بەرێزەوە، لەژێر بارێکی گرانی زۆر و ستەمابوو!...

شێخ بەهۆی دەسەلاتی باوک و باپیریەوە، فەرمانڕەوایی بەسەر دانیشتوانی گوندە کلۆڵەکەی خۆیا ئەکرد. لەژێر پەردەی خواناسیدا ڕووت و قووتی کردبوونەوە!...

بەڵێ شێخ تەکیە و خانەقا و دەروێش و ڕستە (تسبیح) و ڕیش و مێزەر و لبادەی هەبوو!؟. بەلام ئەمانە هەمووی وەک پەردەیەکی تەنک وابوون، پیاوی هۆشیار و تێگەیشتوو لەژێریەوە ئەبینی کە بەچە جۆرێک شێخی بەرێز ئەو گوندە بەسەزمانانە ئەڕوتێنێتەوە و ئەچەوسێنێتەوە!... شێخ پەروای نەبوو لە هیچ. باکی نەبوو لە کەس. دەمێک بەفروفێڵ و چاووڕا و، دەمێکیش بەکوشتن و برینی نهێنییەوە کە لەو گوندی بەسەرگەردانانەی ئەکرد، مەبەس و ئارەزووی دڕندانەی خۆی ئەبردەسەرا!؟.

لە وتارەکانی پێشومدا باسی هەندێک زۆردارانم کرد، لە ئاغا و شێخەکان، لام وایە پێویست ناکات دووبارە باسیان بکەمەوە. چونکە لایەکی گەورەی ژیانی شێخ، ئاغایەتی بوو!... بەلام لایەکەی تری ژیانی شێخ بۆ ئەوە تەرخانکرابوو، کە بیری بەرز و سەربەست، بەربەست بکا. بلاوکردنەوەی خوێندەواری لە گوندەکەیا بەرەنگاری بکا!... گەلێک جار فەرمانبەرە دڵسۆزەکان ویستبویان لە گوندەکەی (شێخ)دا خوێندنگا بکەنەوە، بەلام بۆیان نەچووبووە سەرا.

چونکە شێخ بەرەنگاریی کردنەوەی خوێندنگای ئەکرد. تەگەرەی ئەهێنایە بەر... جارێک بەناوی خواناسییەوە، جارێکیش بەناوی شتی ترەوە، فروفێلێکی ڕێک ئەخست نەی ئەهێشت بکرێتەوە!... داخەکەم جاری واش هەبوو گوندییەکان خۆشیان لەوەدا، پشتی شێخیان ئەگرت!... چونکە چاویان نەکرابووەوە تا کەڵکی خوێندەواری بزانن!...

بەڵام کاری شێخ ڕاست بێ، بەهۆی زەبر و زەنگ و زۆروستەمی خۆی و کوردەکانیەوە، دانیشتوانی گوندەکەی وریاکردەوە. چاویانی کردەوە. ئینجا گوێیان دایە بانگی یەکێک لە فەرمانبەرە دڵسۆزەکان... بەدەنگیەوە چوون... واتا بڕوایان پێ کرد کە خوێندنگا بۆیان بەکەڵکە. ئینجا هەموو بەجارێک داوای کردنەوەی خوێندنگایەکیان لە فەرمانڕەوایی کرد، شێخ هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ گەلێک کۆسپ و بەرهەڵست بخاتە بەر ئەو فەرمانبەرە و گوندییەکان، تا لە کردنەوەی خوێندنگاکەدا سەرنەکەون!.

بەڵام خەباتی پیرۆزی شێخی بەڕێز بەفیڕۆچوو!...

فەرمانبەر و گوندییەکان گەیشتنە ئامانج...

خوێندنگا کرایەوە...

شاگردان، پۆل، پۆل، ڕژانە ناویانەوە...

گەشی و دڵخۆشی و ڕۆشنایی کەوتە گوندەوە...

شێخیش شەرمەزاری نەبێ، هیچی تری بۆ نەمایەوە!...

لە پاش چەند مانگێک مێژوو (تأریخ) هەستایە سەرپێ و قاقا پێکەنی!.

چونکە لەلایەکەوە تەکیەیەک و شێخێتییەکی درۆی ئەبینی، لە باتی ئایینی ڕاستەقینە، ڕێژگاوی و فروفێڵی، بەناوی خواناسییەوە بڵاو ئەکردەوە!... کە لە ڕاستیا خواناسی بەرەنگاری ئەو ڕێژگاوی و فروفێڵانە ئەکات!...

لەلایەکی تریشەوە خوێندنگایەکی گورج و گۆڵ و وریای ئەدیی: خوێندەواری و ڕەوشت و کردەوەی پاک و نیشتمانپەروەری و جیهانپەروەری و خواناسیی ڕاستەقینەی بڵاو ئەکردەوە بەناو گوندییەکاندا، ڕێگای ژیانێکی پڕ ئازادی و کامەرانیشی بۆ ڕۆشن ئەکردنەوە!...

# داڵپەروەران

## پەردەی یەکەم

(١)

(جێگا: دیوەخانەیەکی کوردانەیە. سەردار بەگ، جوامێر ئاغا، مەلا پیرۆت، شێخ وەیس، حاجی شوکل، بارام ئەفەندی دانیشتوون، فەرهادی نۆکەریش لە پشت دەرگاکەوە ڕاوەستاوە).

سەردار بەگ: برا خۆشەویستەکان، سەرچاو هاتن، شەوتان باش.

هەموو بەیەک دەنگ: سوپاست ئەکەین. خوا خۆشت کات. بەخۆشی هاتیتەوە.

جوامێر ئاغا: ئۆخەی، سەد ئۆخەی، کە خوا تۆی بەتەندروستی و سەرئەفرازییەوە بۆ هێناینەوە. بەڕاستی سەردار بەگ زۆر بیرمان ئەکردیت. نۆ مانگ بوو، هەموو، بەتاسوقەوە چاوەڕوانیمان ئەکردیت. لە بریتی هەموو براکان سوپاسیت لێ ئەکەم.

سەردار بەگ: سوپاستان ئەکەم براکان. بەڕاستی منیش زۆر بیرم ئەکردن. بەڵام داخەکەم زۆر کزتان ئەبینم. کسپەم لە جەرگەوە دێ. پێم ناڵێن بۆ چ گەشی و ڕووخۆشییەکەی جارانتان نەماوە؟.

جوامێر ئاغا: چی بێ لە تۆ نهێنی بێ. دەردێک داکەوتە ناو پەزەکانمەوە هەمووی کوشتن. دەغڵەکانیشم ئەمساڵ هیچ برشتیان نەبوو، وەختە تابینا قاقام بکەوێتە دەستیا و (قرض)ەوە.

مەلا پیرۆزت: منیش لێت ناشارمەوە لەم ماوەیەدا کە تۆ لێرە نەبووی کوڕە گەورەکەم بوو بەژێر ئۆتۆمبێلەوە، مرد. جا کەسم بەدەستەوە نەماوە کە یارمەتییەکم بدا لە گوزەراندا.

شێخ وەیس: بەڕاستی ئەوی لە من قەوماوە یاخوا لە کەس نەقەومێ!... دوو مانگ لەمەوپێش ئاگرێک بەردرایە خانووەکەمان. هەرچییەک خوا پێیدابووم سووتا. هەر خۆمان بەبێ وەی ڕزگارمان بوو!...

حاجی شوکل: بەگم لەمە زۆرتر چیم بەسەرهێ؟! سێ مانگ لەمەو پێش هەرچیم هەبوو لەدوکانەکەما دز بردیی!... بەڕاستی کەوتوومەتە سەر ساجی عەلی!... وەختە جەرگم بەربێتە خوارەوە.

بارام ئەفەندی: پاش تۆ ئەوەندەی پێ نەچوو، فەرمانڕەوایی دەستی لە فەرمان کێشامەوە. لەوساوە تا ئێستا منیش دەستە ئەژنۆ دانیشتووم. بەکوڵەمەرگی، بەموچەیەکی کەم ئەژیم. ڕووتی و برسێتی سەریان کردۆتە خۆم و منداڵم.

فەرهادی نۆکەر: (لەبەرخۆیەوە) ئێوە هەروا زۆردارین خوایش واتان بەسەر ئەهێنێ!...

سەردار بەگ: داخەکەم نە ئێوە، نە من، هیچمان لەم ماوە کەمەدا، لە دەست کارەساتی ناخۆشی ڕۆژگار ڕزگارمان نەبووە. بەڵام بڕوام پێ بفەرموون، ئەوی بەسەرمندا هاتووە، بەسەر کەستاندا نەهاتووە. ژنە خۆشەویستەکەم لە ڕێگا گیانی بەخاک سپارد. خۆیشم تووشی شەڕێک بووم، سێ مانگ خرامە بەندیخانەوە. پاش ئەوە تووشی دوو نەخۆشی گەورەش هاتم. ناچار مام نەشتەرکاریی خۆم بکەم. ئینجا دوو مانگ لە خەستەخانەدا مامەوە تا چاک بومەوە. هەر

پارەیەکم لەگەڵ خۆم بردبوو، بۆ گەشتوگوزاری ئەوروپا و خۆش ڕابواردن، لە ئەنجاما بەفیڕۆ ڕۆی!.

جوامێر ئاغا: لەگەڵ ئەمەشا، من وام دێتە پێش چاو کە تەندروستی و شۆخ و شەنگیی ئێستات لە هی پێش ڕۆیشتنت چاکترین. پێویستە ڕازی ئەمەمان پێ بڵێیت، سەردار بەگ، ئەگین قسان دەکەین!...

سەردار بەگ: (بەپێ کەنینەوە)، براشیرینەکان ئەمە ڕازێکی خواییە. هەڵبەت ئێستا لە پێشووم چاکترم بۆیە بەخوا وا چاکی بۆ کردووم!... من ئامادەم ئەو ڕازەتان پێ بڵێم. بەڵام بەخوا پێتان ناڵێم تا بەڵێنم نەدەنێ هەرچیتان پێ ئەڵێم بەگوێم بکەن.

هەموو بەیەک دەنگ: دەفەرموو پێمان بڵێ بەسەرچاو بەگوێت ئەکەین.

سەردار بەگ: براکانم، تا ئەو شار و دێهاتانەی خاکی ڕۆژئاوایەم نەدی، لە جیهان و خواناسی و چاکی و پیاوەتی و نیشتمانپەروەریی تێ نەگەیشتم. تا ئەو هەموو دەرد و ئازارانەشم نەچێشت نەهاتمەوە هۆش خۆم و تێ نەگەیشتم کە چۆن ژیانمان بەفیڕۆ چووە!. ئەوەندەی نەمابوو گیانم دەرچێ. لە شەوێک لەو شەوانەدا کە لە تاو ئازاری دڵ و لەشم لە گیانی خۆم وەڕس بووبووم، وەک سینەما هەموو ژیانی بێ فەرانەی خۆم هاتەوە پێش چاو. ئینجا تێ گەیشتم کە هۆی ئەو دڵتەنگی و سەرگەردانییانەم: ئەو خۆپەرستی و خراپیانەی خۆم بووە! لە ترسی خوا، لەپڕ، دڵم ڕاچەنی و لەشم دەسی کرد بەلەرزین!... ئەم ئەزانی، کە مردم، بەچەرویەکەوە بچمە بەردەمی خوای پاکیی بێ هاوتا!...

بەڵام، لەپڕ، شتێکی بچووکم بەدڵدا هات... بڕیارم لەسەردا... کاتێکم زانی دڵم ڕۆشن بووەوە... بووژامەوە... گەشی و خۆشی کەوتە لەشمەوە!.

ئەو شتەش ئەوەبوو، بڕیارم دا: «کە ئیتر واز لە خۆپەرستی و خراپیی خۆم بهێنم... خوا بناسم... ڕێگای چاکەش بگرمەبەر... هەتا ماویشم، تا لە توانامابێ، بۆ کەڵکی نەتەوە و نیشتمان تێ بکۆشم»!... تا ئەو گوناه و تاوانانەی خۆم لەگەڵ نەتەوە و نیشتماندا کردومە بەچاکە بیان سڕمەوە. هەروەها پاداشتی خواییش بەچاکەکردن لەگەڵ نەتەوە و نیشتمانە نازدارەکەما بکرم.

ئینجا برا شیرینەکان، ئەو خوا ناسین و بیروباوەڕ و بڕیارە بوو کە کاری کردە سەر لەش و هۆشم و چاکی کردمەوە. ئەم گەشی و ڕووخۆشییەشم کە ئێوە ئەیبینن لە سایەی بەجێهێنانی ئەو بڕیارەوەیە.

مەلا پیرۆت: بەڕاستی سەردار بەگ نیاز و بڕیارەکەت ڕاست و جوان و پەسەندن. خوا سەر ئەفرازت کات. ئەی ئێمەش بۆ چ وەک تۆ نەکەین؟ خۆ، لەپێی خۆمان، لە تۆ کەمترمان نەکردوە و بەسەر یشمان نەهاتووە!...

سەردار بەگ: براکانم! پێشنیار (إقتراح)ەکەی منیش ئەمەیە: بام سبەی شەویش لێرە کۆببینەوە. ئەوسا هەریەکەمان لەبەردەم هەموماندا پێ لە بەسەرهات و کردەوەی خراپیی خۆی بنێ. لە بڕێتیی ئەمەی -هەروەکو جاران ئەمان کرد- ناوی ئەم و ئەو بەخراپیی بهێنین و بەند و باویان بۆ دەرکەین

و لای فەرمانڕەوایی بەدگۆییان بۆ بکەین یاخود تەڵەیان بۆ بنێینەوە تا تووشی داوێکیان بکەین... لە بریتی ئەمەی بەو شتە ناخۆش و ناشایستانەوە دڵی خۆمان تەنگ بکەین و خۆمان تووشی تۆڵەسەندنەوەی نەتەوە و سزای خوایی بکەین... بەڵێ لە برێتیی ئەمانە بام پێ لە خراپی خۆمان بنێین و کردەوەی خۆمان ڕاستکەینەوە و چاکە لەگەڵ هەمووکەسدا بکەین، بەڵکو خوا لە پاداشتی ئەمەدا بمانبەخشی و چاکەشمان بداتەوە و بشمانخاتەوە سەر دۆخی جاران.

هەموو بەیەک دەنگ: قەت قسە لەمە چاکتر نەبووە. خراپە و دوژمنایەتی لە خراپە بەولاوە هیچیتریان لێ پەیدا نابێ. بەگوێت ئەکەین.

هەموو بەیەک دەنگ: سوپاست ئەکەین سەردار بەگ.

فەرهادی نۆکەر: بەگم لە دەرەوە پیاوێکی کەڵەگەتی چوار شانەی پیری سەروچاو جوان حەز ئەکا بتانبینێ ئەم نامەیەشی بۆ هێناوی (نامەکە ئەداتە دەست سەردار بەگ، لێی وەردەگرێ) ڕێ هەیە بێتە ژوورەوە؟.

سەردار بەگ: (نامەکە ئەخوێنێتەوە) «برا خۆشەویستەکەم. سەردار بەگ. ڕۆژتان باش. بەیادی ئەو چەند ڕۆژە خۆشەوە کە لە ئەورووپادا پێکەوە ڕامانبوارد، ئەوا لەسەر بەڵێنەکەی خۆم، نووسەری گەورە و ڕۆژنامەنووسی نیشتمانپەروەر مامۆستا بلەچ شێرکۆ پێشکەش کردن. بەمەبەسێکی پاک و بڵندەوە هاتووتە لاتان. تکایە بیناسن و ڕێزی لێ بگرن. هیواداریشم کە لە بیروباوەڕ و کردارە بەنرخەکانی کەڵک وەرگرن. چاوەڕوانی مژدەی خۆشتان ئەکەم. ئیتر خۆشیتان گیانەکەم. برات: جەمشید.»

فەرهاد پێی بڵێ بام بفەرموێ.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: (دێتە ژوورەوە). شەوتان باش. خۆش هاتن براگیان.

(یەک بەیەک دەستی ئەگوشن و خۆیانی پێشکەشی ئەکەن. دائەنیشنەوە).

(ئینجا فەرهاد خەریک ئەبێ جگەرە و چاو قاوە و دیاری و میوەیان پێشکەش ئەکا.

(پەردە دائەدرێتەوە)

پەردەی دووەم

(٢)

(جێگا: دیواخانەیەکی کوردانەیە. سەردار بەگ، جوامێرئاغا، مەلا پیرۆت، شێخ وەیس، حاجی شوکل، بارام ئەفەندی، مامۆستا بلەچ دانیشتوون. نۆکەرێکیش فەرهاد ناو لە پشت دەرگاکەوە بەپێوە ڕاوەستاوە).

سەردار بەگ: براکان ئەوا من لەسەر بەڵێنی دوێنێ شەومان پێ لە خراپەکانی خۆم ئەنێم. ئایا ئێوەیش ئامادەن بەڵێنەکەتان بهێننە جێ؟

هەموو بەیەک دەنگ: بەڵێ ئامادەین. فەرموو تۆ دەس پێ بکە.

سەردار بەگ: من لە كانی دڵمەوە حەز لە كەش و فش ئەكەم. كە يەكێك بانگم بكا و نەڵێ (بەگ) بەدڵ زيز ئەبم. كە لەگەڵ خەڵكا ئەڕۆم، حەز ئەكەم پێشيان كەوم. كە لە شوێنێكا لە گەڵيـاندا دائەنيشم حەز ئەكەم سەرويان كەوم. نانی شەويشم نەبێ، خۆم پۆشتە و پەرداخ پێشان ئەدەم. بەكولەمەرگيش بێ، هەر ئەبێ دوو نۆكەر پەيدا بكەم، تا لە پشتمەوە بڕۆن و فەرمانم جێبەجێ بكەن. كەس لە خۆم بەگەورەتر نازانم. هەر كەسێ بەدڵم نەجووڵايەوە بەچاك و خراپ بەگژيا ئەچم، قسەی ڕەقی پێ ئەڵێم. ئەگەر لە برسا بمرم و پێم ناشيرينە وەک خەڵک كار و فەرمان بكەم و خۆم بژێنم. حەز ئەكەم فەرمانێک ببينم. ناوبانگی تيابێ، بێ ئەرک بێ، ئاسودەبێ. بۆ كەس خۆم ماندوو نەكەم، بەڵام هەموو كەس خۆی بۆ من ماندوو بكا!... جا لە ڕووی ئەم خۆپەرستی و لووت بەرزييەوە گەلێک جار تووشی گێرە و كێشە و تەنگ و چەڵەمە بووم، بەزۆريش وەختم بەدڵ تەنگی ڕائەبوێرم. جار جارێكيش كە زۆر ئەكەومە تەنگانەوە، شەرمەزاری خۆم و خەڵک و خوا ئەبم و لە خوا ئەخازم كە يان كردەوە و ڕەوشتم ڕاستكاتەوە، ياخود بم كوژێ!... جا كە خۆم وەهابم شوورەيی نييە ناوی خەڵک بەخراپە بەرم؟!.

فەرهادی نۆكەر: بەڵێ بەخوا شوورەييية!.

هەموويان بەيەک دەنگ: ها ها ها!...

جوامێر ئاغا: منيش وەنەبێ لە (سەردار بەگ) چاكتربم. بەڵكو پێی لێ ئەنێم كە خراپترم. ئەم لادێييە ڕەش و ڕووتانە شەو و ڕۆژشان و قۆڵ ئەكوتن ک دەرامەتێک بۆ خۆيان پەيدا بكەن. بەڵام من وەک كوللە بەر ئەبمەگيانيان. هەرچييەک پەيدا ئەكەن نيوەيان بەفرۆفێڵ لێ ئەسێنم. كە ميوان هاتن: ئەيان نێرمە سەر ورگی ئەوان. كە پارەم پێويست بوو: لە وانی كۆتەكەمەوە، هيچيشيان نادەمەوە. كە ژن بهێنن، يان بێ دڵيم بكەن، يان مەڕومالات و دەغڵودان بەرهەم بهێنن: باجی خۆميان لێ ئەستێنم. هەر وەختێكيش شەڕم بوو، بەتفەنگی خۆيان شەڕيان پێ ئەكەم. ئەمە جگە لە هەرەوەز پێكردن و داركاری كردن و ئەتک پێ كردن. لەگەڵ ئەمەشا كە ئەزانم ئەم كلۆڵانە هەموو هەژار و داماو و شپرزەی دەستی منن، بەزەييەكم پيايانا نايەتەوە.

نە تێ ئەكۆشم بۆ حەسانەوەيەكيان، نە بۆ خوێندەواری و تەندروستی و پێشكەوتن و بووژانەوەيەكيان. جا لەم ڕووەوە خۆيشم بەرەبەرە كەوتوومەتە ماڵوێرانی و سەرگەردانييەوە. شەو و ڕۆژ بير لە چارەڕەشيی خۆم ئەكەمەوە. تازە وا لەم ڕۆژانەدا هۆشم هاتووەتەوە سەر خۆم، كە تێ ئەگەم نەخۆشی و خەفەتباری و دەستكورتی و دوژمنداريی خۆم، هەموی، لە ڕووی ئەم زۆرداريیانەوەيە كە لەگەڵ ئەو لادێييە بەسەزمانانەدا كردوومە. تازە وا هەست بەخراپيی خۆم ئەكەم و لەبەردەم خوادا شەرمەزاريی ئەمگرێ!

جا كە ئەكەومە تەنگانەوە لە خوا ئەپاڕێمەوە: يان چاكم كاتەوە، ياخود لەناوم بەرێ؛ تا خۆيشم و ئەو لادێييە كلۆڵانەش لە دەست ئەم ئازار و نەخۆشييە ڕزگارمان بێ.

جا توخوا شوورەيی نييە كە لەسەر خراپيی خۆما ناوی خەڵک بەخراپە بەرم!...

فەرهادی نۆکەر: ئەی دەمت خۆش ئاغا. کەواتە بەم زووانە زەوییەکەی لە ئەنکمت داگیر کرد ئەیدەیتەوە.

هەموو بەیەک دەنگ: ها ها ها!...

شێخ وەیس: قەت من پەیڕەوی باوک و باپیری خۆم نەکردووە. ئەوان خوێندەواری تەواو، خواناسی تەواو، سەرکردەی گەلەکەی خۆیان بوون. بەڵام، من، ئەوەی ئەوان پێکیانەوە نابوو لە سامان و جێگا و ناوونیشان، لە ناوم برد!... بەدیمەن وەک ئەوان بووم. بەڵام لە پێستی مەڕا گورگێکی دڕندەبووم!... تا توانیم چاوەڕاو و فروفێڵم لە ناشی و نەزانان کرد. داوێن پیسیم کرد. دزی و درۆزنیم کرد. زۆرداریم لە هەژاران کرد. ئەوی بەدڵم نەجوڵایەوە بەخۆڕایی بەدناوم کرد، یان پێم ئەگوت دەسی بۆ ژنی خەڵک بردووە، یاخود ئەمگوت جوێنی بەخوا و پێغەمبەر و ئایین داوە!... بەکورتی بووبوومە یەکەم گزیری شەیتان و نەتەوەم بەرەو خراپی و ناپاکی ئەبرد!... جا تا بەجارێ نوقمی دەستکورتی و نابوتی و سووکی نەبووم، هۆشم نەهاتەوە بەرخۆم!... ئاخ شەرمەزاری خوا و خۆم و باووباپیری خۆم!... کاشکی هەر نەهاتمایە جیهانەوە!... جا کە خۆم بەم جۆرە بووبم، شوورەیی نییە ناوی کەس بەخراپە بێنم!...

فەرهادی نۆکەر: دە نوشتەیەکیش بۆ خۆت بکە بەڵکو پێی چاک ببتەوە!...

مەلا پیرۆت: (لە خواناسیا شەرم نییە) بەمنیش (مەلا) ئەڵێن... یاخود خۆم بەخۆم ئەڵێم (مەلا)!... بەڵام لە ڕاستیا من مەلای لابەلام!... مەرەکەب... و قاقەز چەرمەگام!... ئەگینا کە خوێندەوارنیم بۆ چ ئەڵێم خوێندەوارم؟!.

بۆ چ ئەم هەموو کەسە بەمێزەرێک و ڕستەیەک و ڕیشێک و سیواکێک چەواشە ئەکەم؟!

مەلا ئەوەتا: تا ئەتوانی بخوێنیتەوە، بکوڵێتەوە، لە خوا و یاسای خوایی بیر بکاتەوە. مەلا ئەوەتا: دڵ و زوبان و دەستی یەکبێ، قسە و کردەوەی یەک بگرێتەوە، هەرچی ئەکا لە یاسای خوایی نەچێتە دەرەوە، بیری نەتەوە ڕۆشن بکاتەوە، وریایان بکاتەوە، بیانخاتە سەر ڕێگەی چاکی و خۆشی و کامەرانی.

بەڵام من تا (فەقێ) بووم نانی خۆم بەدەقنە و ڕاتو پێک ئەهێنا. سەرشۆڕیم بۆ هەموو کەسێک ئەنواند کە پوڵ و پارەیەک، یان پارچەنانێکی پێ ببەخشیمایە. قەت بەبیرما نەئەهات فرمانێک بۆ خۆم بدۆزمەوە. تا خۆمی پێوە بەرێوە بەرم و ئیتر بێزم نەیەت ئەمەندە دەست لەم و لەو پان کەمەوە!...

کەی زانست و هونەر و خواناسین سەرشۆڕی سەرکزی پەسەند ئەکات؟ کە بووشم بەمەلا، هەر چاوم لە خەڵات و بەرات و سەرفترەی ئەم و ئەو بوو. بۆ ئەمەی نانی خۆم نەبڕم، مەرایی و دووریی و درۆزنیم بۆ هەزار دەوڵەمەند و دەسەڵاتداران ئەکرد. کەی خواناس چاوی لە تفەنگ و شیر و تیر ترساوە؟! کەی بەزەبری پوڵ و پارە نوشتاوەتەوە؟!. تا ئێستایش لەگەڵ مەلایەتییەکەما فرمانێکم نەدۆزیوەتەوە بۆ خۆم کە بەناوچەوان بەرزی و سەربەفرازییەوە نانێک بۆ خۆم پەیدا بکەم!... هێشتا هەر چاوم لە دەست ئەم و ئەوەوەیە!... باوکیشم مەلایەک بووە: هەموو ئاغا و بەگ و حاجییەکان لێی سڵەمیونەتەوە. لە ترسی ئەو

ئەیان وێراوە خراپە لەگەڵ کەسا بکەن!... بەنان بدەیی و چاکەکردن لەگەڵ ئەم و ئەوا هەموو کەسێکی وەکو ئەموستیلە خستبووە پەنجەیەوە!... ئەی دەستی شکاوم بۆ ئەم ڕۆژە ڕەشە کە خۆم تێ خستووە. کاشکی هەر لە دایک نەبوومایە!.

جا منێک کە ئاوەها گوناهبارێم لە بەرامبەر خوادا، ڕەوایە کە ناوی کەس بەخراپە بێنم؟!.

فەرهادی نۆکەر: نە ء. من بوومایە لە جیاتی تۆ شەپقەم لەسەر ئەکرد!.

هەموو بەیەک دەنگ: ها ها ها! خوا بتگرێ فەرهاد بۆ خۆت و قسەت!...

حاجی شوکل: پاش ئەوەی گەلێک جووتیاری و کرێکاریم کرد بووم بەسەرکاری ئاغایەک کە زۆر لەگەڵم باش بوو. لەگەڵ ئەوەشا تا پێم کرا دزیم لەویش و لە لادێییەکانیش کرد. زۆری پێ نەچوو دەوڵەمەند بووم. بەڵام لەبەر سپڵەیی خۆم لەو ئاغا باشەم جیابوومەوە. چووم دوکانێکم کردەوە. بۆ ئەمەی، لە کڕین و فرۆشتنا، باشتر بتوانم هەژار و ناشییەکان چەواشە بکەم حەجێکم کرد. ئینجا کەشیدەیەکی زلی ڕەنگ زەردی زەرقیم بەسەرمەوە بەست. پاشان بەهەڵلا و بەزمێکی گەورەوە گەڕامەوە گوندی خۆم و حاجییەکەی خۆم لە گوندییەکان گەیاند. نانێکی زۆرم بەشییەوە. دیارییەکی زۆرم نارد بۆ ئەم و ئەو. ئینجا بەئاهەنگێکی پڕ لە تەپڵ و دەفەوە حاجیەتییەکەی خۆم بۆ هەمووان ئاشکرا کرد!...

هەموو کەس وا تێگەیشت کە ڕێی چاکەم گرتبووە بەر!... ئەهاتن شتم لێ بکڕن. بەڵام، من، هەم لە کڕینا، هەم لە فرۆشتنا گزیم لێ ئەکردن!... کەچی بەحەجەکەم سوێندم بۆ ئەخواردن کە لە نرخا درۆیان لەگەڵ ناکەم!... یان لە کێشانەدا گزییان لێ ناکەم!...

دەوڵەمەندی ڕووی تێ کردم!؟

بەڵام خوا تۆڵەی هەژار و بەسەزمانانی لێ کردمەوە!...

جارێک دز. جارێک زۆردار. جارێک نەخۆشیی بۆ ئەناردم هەتا سامانەکەم هەمووی لە دەست چووەوە. ڕیسوایی و خەفەتباریش سەری تێ کردمەوە. وا بیر لەوە ئەکەمەوە کە جارێکی تر بچمەوە لای ئەو ئاغا باشەم! بەڵام نازانم، بەچە ڕوویەکەوە بچمەوە لای؟ یان بەچە ڕوویەکیشەوە ژێردەستی پەسەند بکەمەوە؟!. جا کە خۆم وەهابم ڕەوایە ناوی کەسی تر بەخراپە بێنم؟!.

فەرهادی نۆکەر: نە بەخوا. هەر خۆت بەخۆت بێ!...

هەموو بەیەک دەنگ: ها ها ها! هەتیو فەرهاد وس! تۆیش بەشێکی ئەوت پێوەیە!...

بارام ئەفەندی: من پێی لێ ئەنێم کە گوناهی من لە هی هەمووتان گەورەترە. چونکە تا شاگرد بوم و ئەم خوێند لە خوێندنگاکاندا قسەم لە هەموو کەسێک ئەکرد کە خراپەی لەگەڵ نەتەوە و نیشتمانەکەما ئەکرد. لێیان ئەدوام. ئەچووم بەگژیاندا. کەچی کە لە خوێندن بوومەوە و هاتمە سەر کورسیی فەرمانڕەوایی، نە نیشتمان لە بیرم ما، نە گەل لە بیرم ما!... هەر خەریکی بەزم و ڕەزم و قومار و هەتیوبازی و مێبازی خۆم بووم!... هەتا توانیم زۆرم کرد لە بێکەس و هەژاران و

لام کردەوە لە دەوڵەمەند و زۆرداران. تا پێم کرا بەرتیلم وەرگرت و ناوچەکانی خۆم وێران کرد و دانیشتوانی ناوچەکەم نابوت و سەرگەردان کرد. خێزان و خزم و دۆست و گەل و نیشتمانم، هەموو، فرۆشت بۆ کەیف و بەزمی خۆم! هەتا ڕۆژگاریش لێم وەرنەگەڕایەوە و سەرنەنگریی نەکردم هۆشیار نەبوومەوە!... تا ناوونیشانم نەچوو، سامانم نەچوو، فرمانیشم لە دەست دەرنەچوو نەهاتمەوە هۆش خۆم و تێ نەگەیشتم کە چیم کردووە بەخۆم! هەی ڕوو ڕەش خۆم!؟.

جا کە منیش ئەوەهابم، ئیتر چۆن ڕووم بێ ناوی کەس بەخراپە بێنم؟!...

فەرهادی نۆکەر: ئەفەندی مسگەرت ناوێ بۆت بێنم!.

هەموو بەیەک دەنگ: ها ها ها! هەتیو نابێ ئابڕوت بێ؟!.

سەردار بەگ: فەرهاد! کوڕم وەرە جگەرەمان بدەرێ چایمان بۆ بێنە. پاشان نانمان بۆ تێکەن. ماندووبووین بام بحەسێینەوە.

فەرهادی نۆکەر: باشە بەگم. (جگەرەیان ئەداتێ. چایان بۆ ئەهێنێ).

سەردار بەگ: ها برا خۆشەویستەکان، ئیمشەوتان چۆن هاتە پێش چاو؟ ئایا لەو شەوانە خۆشتر نەبوو کە ناوی ئەم و ئەومان بەخراپە ئەهێنا؟ داومان بۆ ئەم و ئەو ئەنایەوە؟!.

هەموو بەیەک دەنگ: بەڕاستی شەوێکی ناوازە و خۆشمان ڕابوارد. بەتەواوەتی دڵمان خاوێن بووەوە، گەشایەوە، چونکە ڕووناکی خوای تێکەوت کە ئەویش ڕاستی و خۆشەویستیی گشتی و پێ نان لە گوناهی خۆمانە بەمەبەسی خۆ ڕاستکردنەوە.

سەردار بەگ: مامۆستا بلەچ شێرکۆی بەڕێز، تکایە لە بیروباوەڕ و ئامۆژگارییە ئایابەکانت بێ بەشمان مەفەرموو.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: برا گەورەکان! نازانم بەچە زوبانێک سوپاستان بکەم کە ڕاز و نهێنیی خۆتان لەبەردەم کابرایەکی ئاوارە و بێچارە و نەناسراوی وەک منا ئاشکرا کرد. هەروەها نازانم بەچە زوبانێک سوپاسی خوای بێ هاوتا بکەم کە لە پێش مردنا بەم ئاواتە بەرزەی گەیاندم، کە گەورە و دەسەڵاتدارانی کورد ببینم، لە ڕووی نەژادی و دڵپاکی خۆیانەوە پێ لە گوناهەکانی خۆیان بنێن و پەشیمان بنەوە لەو کەمتەرخەمی و کردەوە خراپانەی کە دەربارەی نەتەوەی مەردی خۆیان کردووە. لەم دەمودەستەدا، هەر ئەوەندەم لەدەست دێ کە پیرۆزباییتان لێ بکەم و پڕ بەدڵیش لە خوای مەزن بپاڕێمەوە کە لەم نیازە پاکەتاندا پشتتان بگرێ و کۆمەکیتان بکات و سەرتان خات، تا لە ژیانتاندا کامەرانیی ڕاستەقینەی خۆتان و گەلی نەژادی کورد بچێژن.

برا بەڕێزەکان! من خۆیشم یەکێک بووم وەک ئێوە. هیچ بەزم و ڕەزمێک نەما لە جیهاندا نەیبینم. هیچ خۆشی و شیرینییەکی ژیانیش نەما نەیچێژم. بەڵام هیچی نەگەیشتە ئەو کامەرانییەی کە لە یارمەتیدانی کۆمەڵا دەستم کەوت. بەڵێ گەورەیی ڕاستەقینە، کامەرانیی ڕاستەقینە، هەمووی لەوەدا دەست ئەکەویت کە پیاو ڕەنج بدا بۆ پێشکەوتنی نەتەوەی خۆی و تێبکۆشی بۆ ڕزگارکردنی لە دەست

زۆرداری و هەژاری و نەخـوێندەواری و نەخـۆشی و نالەباری. تەنانەت ئەگـەر هاتوو لەم ڕێگەیەدا تەنگانەشی هاتەبەر، دیسانەوە هەر پێی کامەران و سەربڵند ئەبێ. چونکە خۆشەویستی گەلی پێ دەست ئەکەوێ کە لە هەموو شتێک بەنرخترە.

برا گـیانەکـەم! دڵنیـابن، بەو مـەرجەی نەچنەوە سـەرکـردەوەکـانی پێشـووتان، خـوا بەشی خـۆی لە گوناهەکانتان خۆش ئەبێ. بەڵام بەشی نەتەوە ناتان بەخشێ، تا نەتەوە خۆی نەتان بەخشێ. ئەوەندە هەیە ئێوە مـاوەتان زۆرە. ئەتوانن بەکردەوەی چاک نـواندن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خـراپەتان لەگەڵ کردوون، پاش ئەوە بەکردەوەی چاک نـواندن لەگـەڵ نەتەوەدا، ئەو گـوناهانەتان بسـڕنەوە. ئەوسـاکـە خوایش ئەتان بەخشێ. جگە لەوە بەئامانجی پاشی خۆیشتان ئەگەیێنێ.

جا بۆ ئەمەی خۆتان پاک بکەنەوە لەو گوناهانەی پێشـووتان کـە دەربارەی گەل و نیشـتمـانی خۆتان کردووتانە، پێویستە ئەم قـسانەی ئێستـاتان لەناو کۆمەڵێکی گەورە و تێگەیشـتووی گەلەکەشـتاندا دووبارە بکەنەوە. جگە لەوە داوای گوناه بەخشـینی خـۆتان لە گەل بکەن. بەڵێنیشیـان بدەنێ کە ئیـتر خراپە دەربارەی کەس نەکەن، دەربارەی نەتەوە نەکەن. ئەوی خراپەشتـان لەگەڵ کردووە تۆڵەی بۆ بکەنەوە و دڵی خۆش بکەن. هەروەها لەگەڵ هەموو کەسێکا، لەگەڵ نەتەوەشا لە چاکە بەولاوە هیـچیـتر نەکەن. بەکورتی پێویستە لە ژیانتاندا لە دەستووری خوایی و نیشتمانپەروەریی نەچنە دەرەوە.

هەمـوو بەیەک دەنگ: سـوپاست ئەکـەین مـامـۆسـتـای بەڕێز. ئـامـۆژگـاریەکـانت، هەمـوو، جـوان و بەجێن، بەڵێنت ئەدەینێ کە بەدڵ پێڕەویی بکەین.

سەردار بەگ: براکـان! من وای بەچاک ئەزانم، مـامـۆسـتـای بەڕێز بلەچ شێرکـۆ سبـیـەنێ لە برێتـیی ئێـمە بچێتە ناو گوندی، ئەم بیروباوەڕ و بڕیارانەی ئێمەیان تێ بگەیێنێ.

پاش ئەوە، بام بەسەرپەرشتی ئەوەوە گوندییەکان شەش برا گەورە و دەم ڕاست لەناو خۆیاندا هەڵبژێرن کە بەناوی ئەوانەوە بمانبینن و گـفـتوگـۆمـان لەگەڵ بکەن، تا بەجـۆرێکی ببـرا ببـرایی ئەم دوژمنایەتی و ناکـۆکـیـیـە لە ناوەند خـۆمـان و ئەوانەدا هەڵگرین و پەیمانێکی برایانە ببەسـتین بۆ تێکۆشین و ڕەنجـدان لەپێناو پێشکەوتنی گونددا.

هەموو بەیەک دەنگ: فەرموودەت پەسەند ئەکەین. تکا لە مامۆستا بلەچ شێرکۆیش ئەکەین کە ئەم ئەرکە بخاتە سەرشانی خۆی.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: زۆر سوپاسی جوامێریتان ئەکەم. ئامادەم بۆ بەجێهێنانی هەموو فەرمانێکتان، هەر ئێمشەو ئەو فەرموودەیەتان جێبەجێ ئەکەم.

فەرهادی نۆکەر: بەگم نان ئامادە کراوە.

سەردار بەگ: فەرموون بام بچین شێو بخۆین.

جوامێر ئاغا: تکا ئەکەم سبەی شەو لەماڵی برای خۆتان نان بخۆن.

هەموو بەیەک دەنگ: باشە. سوپاست ئەکەین. (ئەچنە دەرەوە. پەردە دائەدرێتەوە).

## پەردەی سێهەم

## (٣)

(جێگا: دیوانخانەیەکی لادێیانەیە. مامۆستا بلەچ شێرکۆ لە سەرەوە دانیشتووە. شەش کەسی تریش دانیشتوون، هەریەکە گەورەی گەرەکێکە: بایز، سالار، شاباز، کاوە، خورشید، هیوا).

(مامۆستا بلەچ شێرکۆ): کاک بایز، ئاخۆ ئەوە ئەزانیت کە من زۆر بەهەڵەداوان هاتووم بۆ لاتان؟ کە کاک جەمشید لە کەینە و بەینەکەی ئێوە و سەردار بەگ و هاوڕێکانی ئاگادار کردم، ترسم لێ نیشت کە خوا نەخواستە هەرایەکی گەورە بقەومێ لە ناوتاندا. جا لەبەر ئەوەی هەردووکمان لەو بڕوایە داین کە لەسەر بنچینەی خۆشەویستی و شیرینی ئەتوانرێ هەموو گیروگرفت و دوژمنایەتییەکی ناوەندتان ببڕێنرێتەوە هاتووم بەمەبەستێکی نیشتمانپەروەرانەوە ئاوێک بەم ئاگرەدا بکەم. ئایا ئامادەیت قسەکەم نەشکێنیت؟

بایز: مامۆستا گیان. پیاوێکی بەڕێز و دڵسۆزی ئەتەوەی وەک تۆ سەر بەگوندی ئێمەدا بکا بۆ شتێکی وا چاک و نایاب بۆ هەمووان، چۆن بەقسەی ناکەین؟

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: کە وایلێ هات مژدەتان ئەدەمێ بەهونەرمەندیی کاک جەمشیدەوە تا هاتم نیوەی فەرمانەکەمان تەواو بووبوو. ماوەتەوە سەر نیوەکەی تری ئەویش بەهیوام کە لە سایەی نەژادی و دڵپاکی ئێوەوە تەواو ببێ.

بایز: سوپاسی ئێوە و کاک جەمشید ئەکەین. خوابتانهێڵێ بۆ سەر ئەفرازی ئەتەوە و نیشتمان. ئێمەش ئامادەین نیوەکەی تری فەرمانەکە، بەدڵی ئێوە و بۆ کەڵکی گشتلایی تەواو بکەین.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: سوپاستان ئەکەم.

چاوپۆش کراوێک دێتە ژوورەوە: مام بایز، تفەنگەکان گەیشتن.

بایز: چۆنتان هێنابوون؟

چاوپۆشکراو: لەناو باری کادا!...

بایز: دەرتان هێنان؟ پاکتان کردنەوە؟ چەندن؟ چەند فیشەکیان لەگەڵە؟ ئەی شەستتیرەکانتان نەهێناوە؟

چاوپۆشکراو: بەڵێ دەرمانهێنان. پاکیشمان کردنەوە. شەست تفەنگ و سێ شەستتیر و نۆ هەزا فیشەکن.

بایز: ئافەرین کوڕم! هەر بژین. سەرچاو هاتنەوە. فەرموون لەو ژوورەوەی ئەودیو دانیشن. پشو بدەن. شێو بخۆن. چایی بخۆنەوە. تا بیرێکیان لێ ئەکەمەوە.

چاوپۆشکراو: سوپاست ئەکەین مامەگیان.

بایز: کوڕە! شاسوار. (شاسواری کوڕی مام بایز دێتە ژوورەوە).

شاسوار: بەڵێ بابە. چی ئەفەرمووی؟

بایز: کورم جاریَ میوانداریيەکی جوانی ئەو برایانەمان بکە. هەر ئێستا بنێرە بەشوێن هەر شەش کوێخای گەڕەکەکاندا. بەپێی ئەو ڕستەیەی کە ئێوارە پێشانم دایت، بەسەرپەرشتیی کوێخاکانەوە فیشەک و تفەنگەکان دابەشکەن بەسەر گەڕەکەکاندا. شەستتیرەکانیش یەکێکیان لای خۆمان گل بدەنەوە بەهەزار فیشەکەوە. دوانەکەی تریش یەکێکیان لەگەڵ هەزار فیشەکا بنێرە بۆ ماڵی (کاک شاباز). ئەویتریشیان بەهەزار فیشەکەوە بنێرە بۆ ماڵی (کاک هیوا).

شاسوار، ئەمەویَ تا نیوەی شەو، ئەمانەم هەمووی بۆ تەواوکەیت. پاشان دووبارە کوێخاکان و گیانبەخش (فیدایی)ەکانم بۆ کۆ بکەمەوە بۆ فەرمانی دوایی. تێگەیشتیت؟

شاسوار: بەڵێ تێگەیشتم هەر ئێستە فەرموودەکانت جێبەجیَ ئەکەم. (ئەچێتە دەرەوە).

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: (بەسەرسوڕمانێکەوە). کاک بایز پێم بڵێ تۆبی خوا ئەوە چی ئەکەیت؟

بایز: تکا ئەکەم کاک سالار تۆ تێیی بگەیێنە تا من نەچم سێ مانگە لە پارێزدابن. بەپێی چاوڕاوێک کە لێمان کراوە، هەموو شەو چاوەڕوانی ئەوەین تفەنگچیی دوژمنەکانمان - مەبەسم سەردار بەگ و دەستە و خزمایەتی- بدەن بەسەر ئاواییدا. لەبەر ئەوە هەرچەندە، لە حەوت ساڵ لەمەو پێشەوە، لە ترسی گیانی خۆمان، خەریکی تفەنگ پێکەوە نانێن و هەتا ئیمڕۆ (٢٤٠) دوو سەد و چل تفەنگمان پێکەوە ناوە، بەڵام بەپێویستمان زانی کە ئەم شەست تفەنگ و سێ شەستتیرەش لەگەڵ ئەو نۆ هەزار فیشەکەدا بکڕین، تا بەتەواوەتی بەهێز بین. ئەوا بەمانەی ئیمشەوەوە (٣٠٠) سێ سەد تفەنگ و سێ شەستتیرمان هەیە. بەم ڕەنگە ئاوایی گوندەکە (٩٠٠) نۆ سەد ماڵە، هەر سێ ماڵەی تفەنگێکی بەرئەکەویَ. جگە لەوە خەنجەر و دەمانچەش لە ئاواییدا گەلێک هەیە.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: بۆ چ هێزی دوژمنەکانتان چەندە؟

شاباز: لەناو گوندەکەماندا، هەمووی دە ماڵ نابن. بەخزمەکانیانەوە کە لە گوندەکانی ترن دەگەنە پەنجا ماڵێک. بەڵام ئێمە مەترسی لە هۆزی تر ئەکەین بیانهێننە سەرمان. لەبەر ئەوە بەپێویستی ئەزانین کە زۆر بەدووربینییەوە بجووڵێینەوە.

کاوە: ئەگەر ئەوان هۆزی تر بهێننە سەرمان. ئێمەیش بیست گوندی ترمان بەدەستەوە هەیە، کە هەموو لەگەڵماندا سوێندخوارن، ئەتوانین بیانکەین بەگژیاندا.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: بەڵام من وام بۆ دەرئەکەویَ مەبەسی ئیمشەوتان هەر ئەمەندە نییە!...

خورشید: مامۆستا گیان! ڕاستیت ئەویَ زۆروستەم و کەمتەرخەمی و گزی و دزیی ئەو دوژمنانەمان کاری لە ئێسکمان کردووە. ئێمە تا حەوت ساڵیش لەمەوبەر، هەر بەشیرینی و پیاوەتی و دەروون فراوانییەوە لەگەڵمان بەسەر ئەبردن. بەڵام کە زانیمان تا یەن تیژتر ئەبن لە سەرمان، ناچاربووین دەستمان لیَ کردنەوە. ئەمساڵ دوکانی حاجی شوکل مان بریی. کوڕی مەلا پیرۆزمان بەئۆتۆمبێل پلیشاندەوە. خانووی شێخ وەیسمان ئاگر تێبەردا. بارام ئەفەندیشمان لە فرمانەکەی بەدەر

کردندا. وا خەریکین ئیمشەویش بدەین بەسەر ماڵی جوامێر ئاغا و سەردار بەگدا تا بەخۆیان و دەس و پێوەندیانەوە بیانکوژین و ماڵیان تالان کەین. تا تۆڵەی چەند سەد ساڵەی خۆمان و باووباپیرمانیان لێ بکەینەوە و گوندەکەشمان لە دیلی و بەندەیی رزگار کەین.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: بەڕاستی من لەم قسانەتان دائەچڵەکێم. ئەگەر ئیمشەو ئێوە ئەمە بکەن، خوا ئەیزانێ من خۆم ئەکوژم!...

هیوا: مامۆستای خۆشەویست. تۆ دڵنیابە: هیچی وا لە ئێمە ناوەشێتەوە کە تۆی پێ بڕەنجێی. کاک خورشید گوتی نیازمان وایە بیکەین. ئەیگوت هەر ئەیکەین. بەڵام ئەگەر بڕوا ئەفەرموون؛ حەوت ساڵ لەمەوپێش بەهۆی فڕوفێڵ و تەڵەکەبازیی ئەو دوژمنانەمانەوە ناکۆکی کەوتبووە ناو خۆمانەوە لە تاقە شەوێکا هەشت کەسمان لە خۆمان کوشتا؟... جگە لەوە ئەوانیش تا ئێستا بیست خوێنی تریان لە ئێمە کردووە. کە لەسەر داواکردنی مافی خۆمان لە زەوی و سامانداء، یاخود لەسەر گوتنی ڕاستی لەبەردەم دادگاە (محكمه)دا کوشتویانن!... نزیکەی پەنجا پارچە زەویمانیان بەو جۆرە هەڕەشە و کوشتن و بڕینە و بەهۆی فەرمانڕەوایی داگیرکردووە!؟. ئەمە بێجگە لە دەستبردن بۆ ئابڕومان، دزی لێ کردنمان و جەریمەکردن و دارکاری کردن و بێگار پێکردن و سووککردن و ڕووتاندنەوەمان!...

سالار: بەڵام لەگەڵ ئەوەشا، لە سایەی گەورەیی خواوە، لەو ساوە هۆشمان هاتۆتەوە سەر خۆمان. ئاوایی هەموویەکمان گرت و هێزمان پێکەوە ناو ئاش و ماش (مقاطعه)مان لەگەڵ ئەوان کرد. جگە لەوە بیست گوندی تریشمان بەدڵ و گیان نووساند بەخۆمانەوە، لەهەر کاتێکا بمانەوێ لەگەڵمان ئەبن و ئامادەن بۆ بەختکردنی سەر و سامانیان لەپێناو سوودی گشتی ئێمە و خۆیاندا. لەبەر ئەوە دوژمنەکانمان ڕۆژ بەڕۆژ کزتر ئەبن، بەڵام ئێمە بەهێزتر ئەبین.

شاباز: ئەمە ڕاستە ئێمە وەک سایە و پایە و مایەمان نییە، وەک ئەوان کاربەدەستانی فەرمانڕەوایی ناناسین و کاریان تێ ناکەین... بەڵام چونکە هۆگریی یەکین و کۆمەکین، هێزی گشتیمان، لەگەڵ خواناسی و بیروباوەڕی نیشتمانیمان لە هی ئەوان بەهێزترە. جگە لەوە توانیمان لە فەرمانڕەوایی بگەیێنین کە ئێمە ئامادەین: سەرباز بدەین، بەرەنگاریی گوناهکاریی و تاوانکردن لەناو گوندەکەماندا بکەین، فەرمانی باشی فەرمانڕەوایی جێبەجێ بکەین، تەنیا بەو مەرجەی لە ئەندازەی دادپەروەریی تێ نەپەڕێ. لەبەر ئەوە فەرمانڕەواییش خەریکە لەگەڵمان ئەبێ بەدۆست وە بەچاوی پارێز لێ کردن تەماشای (سەردار بەگ) و هاوڕێکانی ئەکات. چونکە بۆی دەرکەوتووە کە هۆی سەرکێشیمان لە یاسا و تاوانکردنمان دوژمنەکانمان بوون، خۆمان نەبووین!؟.

کاوە: لەبەر ئەوە هیوامان بەخوا وایە، کە دوژمنەکانمان سەرنەنگری کەین و ئازادی و مافی خۆمان دەست خەینەوە. ئینجا هەمووشمان بەگشتی لە ڕێگای چاک و پاکەوە بەکامەرانی و سەربڵندییەوە بژین.

(بایز دێتە ژوورەوە. هەموو لەبەری هەڵئەستن).

بایز: هیوادارم که مامۆستای خۆشەویست لە هەموو شت تێگەیشتبێت. ئەگەر هیچی ترماوە بفەرموو بام پێت بڵێم.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: برا بەڕێزەکان! پڕ بەدڵ پیرۆزبایی گیانی پاک و نیشتمانپەروەرانەتان ئەکەم. بەڕاستی ئەم تێگەیشتن و وریایی و ڕاپەڕینە و کاردروستییەتان شایانی سەربەرزیی هەموو کوردەوارییە. ئەوەندە هەیە، تکا ئەکەم، کە هاتنی من بەخۆڕایی نەڕوات. ئیتر لەمەولاش کارەساتی وا ناخۆش و سامناک لەناوتاندا ڕوونەداتەوە. تکا ئەکەم هەر بڕیارێکتان داوە ئێستا بیوەستێنن تا ئەو فەرمانەی بۆی هاتووم باش تێتانی بگەیێنم.

براکان! ئیمشەو لە ماڵی سەردار بەگ بووم. ئاغا خۆی، ئاغا هاورێکانی، هەموو لە کردەوەی خۆیان پەشیمان بوونەتەوە. بڕیاریشیان وا داوە کە لە گەڵتاندا ئاشت ببنەوە. هەر فەرمانێکتان بەسەریانەوە ماوە بۆتانی بگێڕنەوە. بۆ لەمەودواش وەک برا لەگەڵتاندا بجووڵێنەوە. جگە لەوە، لەگەڵ ئێوەشا، پێکەوە، تێکۆشن و ڕەنج بدەن بۆ سوودی گشتی، بۆ پێشکەوتنی گوندەکەتان.

ئەگەر ئەتانەوێ ڕاستی قسەکەشمتان بۆ دەرکەوێ فەرموون ئەوە وتارەکانیانە بیان خوێننەوە. ئەوە (فەرهادی نۆکەر)یشیان لەبەر دەرگایە لێی بپرسن و ڕاستیی قسەکانمی لێ تاقی بکەنەوە.

فەرهادی نۆکەر: (دێتە ژوورەوە). هەرچی مامۆستا بلەچ پێی فەرموون ڕاستە تەنیا ئەوەندەی لەبیرچوو کە بڵێ فەرهادیش لە تەختی نۆکەریی هاتە خوارەوە و وازی لە پایە بڵندی خۆی هێنا!...
(فەرهاد ئەچێتە دەرەوە).

هەموو بەیەک دەنگ: ها ها ها! بژیی فەرهادی ئازاد!...

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: جا بڕیارمان وایە، سبەی شەو شەش کەسی هەڵبژاردە لە گوند لەگەڵ خۆم ببەمە ماڵی (جوامێرئاغا) و لەوێ لەگەڵ ئەواندا ئاشتتان بکەمەوە و پاش پاکانەکردن بۆ یەک و سوێند بۆ یەکتر خواردن، هەر کەسە زەویی خۆی و نرخی خوێن و سامانی دزراو و داگیرکراوی خۆی لەوان وەرگرێتەوە. ئینجا بکرێ بەشایەییەکی گشتی کە هەموو گوند تیا شادمان و کامەران بن. ئیتر (ژینێکی نوێ) ڕابوێرن، پێکەوە، دووربن لە ئازار و هاوار، پڕبن لە خۆشەویستی و دادخوازی و ئازادی و کامەرانی. ئایا مژدە لەمە گەورەتر ئەبێ برا گەورەکان؟!. (ورتارەکانیان ئەداتێ بیخوێننەوە).

هەموو بەیەک دەنگ: زۆر سوپاسی جوامێریت ئەکەین مامۆستای بەڕێز. هەر بژیت. ڕاست ئەکەی قەت مژدە لەمە گەورەتر نەبووە. هەرچی تۆ ئەفەرموویت بەگوێت ئەکەین.

(وتارەکان بەبێ دەنگی ئەخوێننەوە). (کوێخاکان دێنە ژوورەوە).

بایز: براکان! لەبەر ئەوەی لە سایەی خوا و هونەرمەندیی کاک جەمشید و مامۆستا بلەچ شێرکۆوە، تاریکی ژینمان خەریکە لابچێ و بکەوینە (ژینێکی نوێ) وە کە پڕبێ لە ئازادی و کامەرانی، ئەو فەرمانانەی ئێواریێ دابووم بەسەرتانا، جارێ دەستی لێ هەڵبگرن. هەر ئێستا، لە هەموو

ئاوایی و گیان بەخشەکان و جەنگاوەرەکان بگێڕنەوە کە دەس لە کەس نەوەشێن. سبەینێش کەسیان لەماڵ دەرنەچن. تا خۆم ئاگاداریان ئەکەم!...

ماموستا بلەچ شێرکۆ: زۆر سوپاستان ئەکەم کاک بایز. کە وای لێ هات تکا ئەکەم تا سبەینێ ڕستە (لیستە)ی ئەو کەسانەی کە مافیان ماوە بەسەر سەردار بەگ و هاوڕێکانیەوە بۆم بنووسن و بۆم ڕەوانە فەرموون، بەڵکو تا ئێوارێ خۆم هەموویان لەگەڵا ڕاست بکەمەوە. تاکو لە وەختی کۆبوونەوەتاندا زوو بەزوو ڕێککەون. ئێوارەش لێرە کۆبینەوە. خۆم دێم بەشوێنتاندا، تا پێکەوە بچینە ماڵی جوامێر ئاغا. باشە براکان؟.

هەموو بەیەک دەنگ: باشە. بەسەرچاو. چۆن ئەفەرمووی وا ئەکەین.

ماموستا بلەچ شێرکۆ: کەواتە من ئەڕۆمەوە بۆ لای سەردار بەگ. شەوتان باش.

هەموو بەیەک دەنگ: خوات لەگەڵ ژیانت باش.

(پەردە دائەدرێتەوە).

## پەردەی چوارەم

(٤)

«جێگا: دیوەخانێکی ڕازاوەی جوانی لادێییانەیە لە ماڵی جوامێر ئاغادا. لەسەرەوە ماموستا بلەچ شێرکۆ لە ناوەڕاستی سەردار بەگ و کاک بایزدا دانیشتووە. لەم لا و لەولایشەوە هاوڕێکانی سەردار بەگ و کاک بایز دانیشتوون. بەهەموو، سیانزە کەسن. لە پشت دەرگاکەشەوە نۆکەری جوامێرئاغا (شوان) ڕاوەستاوە. لەبەردەم ماموستا بلەچ شێرکۆدا مێزێکی گەورە دانراوە، دەسکێ گوڵی نێرگس و گوڵاڵکە سوورە و گوڵەوەنەوشەی لەسەر دانراوە، هەندێ قاقەز و ڕستە و قەڵەم و ستامپا و سندیش لەگەڵ هەندێ پارەدا لەسەر مێزەکە کەڵەکە کراوە».

ماموستا بلەچ شێرکۆ: بەناوی خوای گەورەی بێ هاوتاوە!

لە پێش هەموو شتێکا، سوپاسی بێ پایانی هەموو نەتەوەی نەژادی کورد پێشکەش بەبارەگای یەزدان ئەکەم، کە لەم شەوە پیرۆز و خۆشەویستەی (نەورۆز)ەدا هەموومانت بەئاواتی ئاشت بوونەوە و ئاسایش و برایەتی و یەکیەتی و خۆشەویستی گەیاند. ئەو ڕۆژی (نەورۆز)ەی کە ساڵەهای ساڵ بوو، بەڕەنگی زەرد و لێوی بەبارەوە، بەهەناسەی سارد و دڵی خەفەتبارەوە ڕامان ئەبوارد، سبەینێ بەڕەنگی سوور و لێوی پڕ لە پێکەنین و دەروونی پڕ لە خواناس و دڵی پڕ لە کامەرانییەوە ڕای ئەبوێرین. خوایە بەگەورەیی و میهرەبانی خۆت، هەروەک لەم گوندە نازەنینەدا بەئاواتت گەیاندین، هەروەها، لە هەموو کوردستانی گەورەشدا، ئاوەها بەئاواتی ئاشتی و خۆشەویستی و ئاسایشمان بگەیێنی. بەئاواتی ئازادی و کامەرانیمان بگەیێنی و بمانکەیت بەگەلێکی چاک و پاک و بڵند بۆ خۆمان و بۆ هەموو جیهان.

(هەموو دەست ئەکەن بەچەپڵە لێدان)

برا بەرێزە خۆشەویستەکان!

پڕ بەدڵ خۆش هاتنتان ئەکەم. پیرۆزبایی ئەم ئاشت بوونەوەیەتان لێ ئەکەم لە خوام ئەوێ بۆ (نەورۆز)ێکی کە، پیرۆزبایی پێشکەوتنی ئاوایی و ئاوەدانبوونی گوندتان لێ بکەم. پیرۆزبایی ژینێکی پڕ تەندروستی و ئازادی و خۆشگوزەرانیتان لێ بکەم.

هەموو بەیەک دەنگ: سوپاست ئەکەین. هەر بژیت.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: برا گەورەکان!

ئەمە نزیکەی بیست و پێنج سالی دوور و درێژە وێڵ و دەربەدەر بەشاران و گوندانی کوردستاندا ئەگەڕێم. ئاوی تاڵ و سوێرم خواردەوە. ماندوێتیم دی. شڕوپڕی و برسیەتیم دی. شپرزەیی و سەرگەردانیم دی. لە هیچ شوێنێکا تروسکەی دادپەروەری و زانستی و چاکیم نەدی، تەنیا لەم گوندە شەنگ و شۆخەی ئێوەدانەبێ. هەڵبەت خوای گەورە نیازێکی زۆر ژیرانە و بڵندانەی خۆی هەیە، بۆیەکا وا یەجگار دڵخۆشی کردووم، کە لەم شەوی نەورۆزەدا، کە جەژنێکی ڕاستەقینەی کوردە و ڕزگاربوونی نەتەوەی کورد لە دەست زەبر و زەنگی سروشت و زۆروستەمی (بیوراسپ = ضحاک = ئەژدەهاک)مان ئەخاتەوە یاد... کە لەم شەوە پیرۆز و بەرزەدا بەم ئاواتی چەند ساڵەیەی گەیاندم!...

لەبەر ئەوە نازانم بەچە زوبانێک خۆشیی دڵم ئاشکرا بکەم و بەچە زوبانێک سوپاسی ئێوە و سوپاسی یەزدانی پاک بکەم!...

برا گیانەکان! ئەوە بوو ئیمرۆ لە پاش چەند کۆبوونەوە و گفتوگۆیەکی جوێ جوێ لەگەڵ هەردوولاتاندا، بەجۆرێکی جوان و جوامێرانە پەیماننامەی ئاشتی و دۆستایەتی لەناوتاندا بەسترا.

ئێستایش، وای بەباش ئەزانم کە پەیماننامە کە لەبەردەم هەردوولاتاندا بخوێنمەوە، تا لەبەردەم یەکتریشا پەسەندی بکەن، ئینجا مۆریشی بکەن. پاشان یەکتری ببەخشن و ئەم لا و ئەولای یەکتر وەک دوو برای باوک و دایکی ماچ بکەن.

هەموو بەیەک دەنگ: فەرموو پەیماننامەکە بخوێنەرەوە. چۆن ئەفەرموویت وا ئەکەین.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: سوپاستان ئەکەم، ئەمە پەیماننامەکەیە

(پەیماننامەی ژینی نوێ)

(ئێمە کە باوەڕپێکراو و هەڵبژێرراوی (دەستەی دەسەلاتداران) و (دەستەی نەتەوە)ین لە گوندەکەماندا، بۆ هەموولا ئاشکرای ئەکەین کە لەگەڵ یەکا بەدڵ و بەگیان وەک برا ئاشتبووینەوە و یەکتریان بەخشی و بڕیاریشمان دا لەسەر ئەم شتانەی خوارەوە. بەخوای مەزن و خاکی پاکی کوردستان و نەتەوەی خۆشەویستی کورد سوێند ئەخۆین کە بڕیارەکانمان جێبەجێ بکەین:

١- دەستەی دەسەلاتداران بەسەرپەرشتی سەردار بەگەوە ئەو پەنجا پارچە زەوییەی کە لە تاک و

تەراكانی نەتەوە داگیریان کردووە، بیاندەنەوە بەخاوەنەکانیان لەگەڵ (سندی تسویە)کانیاندا. هەروەها نرخی بیست و هەشت خوێنیش کە ئەکاتە دوو هەزار و هەشت سەد دینار بدەن بەکەسوکاری ئەو کەسانەی کە لەسەر شەڕوشۆڕی زەوی و ناکۆکیدا لە نەتەوە کوژراون. دیسانەوە نرخی ئەو زیانانەش کە لە خەرمان سووتاندن و داربڕین و کەلوپەل دزین و ئاژەڵ کوشتنا لە دەستەی نەتەوە کەوتەوە و ئەکاتە دوو هەزار و دوو سەد دینار بیاندەنەوە بەخاوەنەکانیان یاخود بەنەوەی خاوەکانیان کە لە دامێنی ئەم پەیماننامەیەدا ناویان نووسراوە.

٢- دەستەی نەتەوە، بەسەرپەرشتی کاک بایزەوە نرخی خوێنێک و دزینی دوکانێک و سووتاندنی خانوویەک کە ئەکاتە دوو هەزار و پێنج سەد دینار بدەنەوە بەخاوەنەکانیان کە لە دامێنی ئەم پەیماننامەیەدا ناویان نووسراوە.

٣- هەر دوو دەستە پێی لێ ئەنێن کە ئیتر لەمە بەولاوە هیچ لایەک مافی بەسەر ئەویترەوە نەماوە.

٤- جوامێرئاغا و سەردارە بەگ بڕیاریان دا تاسەر نەتەوە ببەخشن لە مافی بەگێتی و ئاغایەتی وەک (سورانەوە و مەڕانە و دارانە و سەرانە و خەرمانانە و هەروەز و جەریمەکردن و دارکاریی کردن و بێگار پێکردن و ڕیسواکردن و تفەنگ پێ کڕین و پیتاک پێ کۆکردنەوە...! هەر کەسێ زیانی لێ کەوت لە بریتی بەگ و ئاغا لای فەرمانڕەوایی سکالای خۆی بکات.

٥- هەردوولا بۆ کاروباری گشتی ڕاوێژ بەیەکتر بکەن. یارمەتی یەکتر بدەن. بڕیاری هەردوورنزەشیان، ئەگەر لە بابەت شتی گرنگەوە بوو، لە ئاوایی بگەیێنین، ئەگەر پەسەندی کرد ئەوسا جێبەجێی بکەن. بڕیاریش بەزۆریەی دەنگ ئەدرێ. ئەندام و سەرۆکی ئەم کۆڕەش بەهەڵبژاردن ئەبێ. هەموو ساڵ لە شەوی جەژنی نەورۆزدا نوێ ئەکرێتەوە. لەبەر ئەمەی هەموو گوند بە(دەستەی دەسەڵاتداران) و (دەستەی نەتەوە)وە یەکی گرت ئەم کۆڕەمان ناونا (کۆڕی نەتەوە).

٥- هەر کەسێ ئەم پەیماننامەیە بشکێنێ لە گوند دەرئەکرێ.

٢١ی نەورۆز ساڵی ١٩٦٠

| دەستەی دەسەڵاتداران | | دەستەی نەتەوە | |
|---|---|---|---|
| سەردار | وەیس | بایز | کاوە |
| جوامێر | شوکل | سالار | خورشید |
| پیرۆت | بارام | شاباز | هیوا |

بلەچ شێرکۆ

برا بەڕێزەکان، ئایا هەردوولاتان واتان پەیمان داوە یان نا؟

هەموو بەیەک دەنگ: بەڵێ ڕاست ئەفەرموویت وامان پەیمان بەیەکتر داوە.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: کەواتە، تکا ئەکەم، فەرموون پەیماننامەکەتان مۆرکەن.

هەموو بەیەک دەنگ: بەڵێ باشە.

برا بەڕێزە خۆشەویستەکان!

پڕ بەدڵ خۆش هاتنتـان ئەکـەم. پیـرۆزبایی ئەم ئاشت بوونەوەیەتان لێ ئەکەم لە خـوام ئەوێ بۆ (نەورۆز)ێکی کە، پیرۆزبایی پێشکەوتنی ئاوایی و ئاوەدانبوونی گوندتان لێ بکەم. پیرۆزبایی ژینێکی پڕ تەندروستی و ئازادی و خۆشگوزەرانیتان لێ بکەم.

هەموو بەیەک دەنگ: سوپاست ئەکەین. هەر بژیت.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: برا گەورەکان!

ئەمە نزیکەی بیست و پێنج ساڵی دوور و درێژە وێڵ و دەربەدەر بەشاران و گوندانی کوردستاندا ئەگەڕێم. ئاوی تاڵ و سوێرم خواردەوە. ماندوێتیم دی. شرویری و برسیەتیم دی. شپرزەیی و سەرگەردانیم دی. لە هیچ شوێنێکا تروسکەی دادپەروەری و زانستی و چاکیم نەدی، تەنیا لەم گوندە شەنگ و شۆخەی ئێوەدانەبێ. هەڵبەت خوای گەورە نیازێکی زۆر ژیرانە و بڵندانەی خۆی هەیە، بۆیەکا وا یەجگار دڵخۆشی کردووم، کە لەم شەوی نەورۆزەدا، کە جەژنێکی ڕاستەقینەی کوردە و ڕزگاربوونی نەتەوەی کورد لە دەست زەبر و زەنگی سروشت و زۆروستەمی (بیوراسپ = ضحـاک = ئەژدەهاک)مـان ئەخـاتەوە یاد... کـە لەم شـەوە پیـرۆز و بەرزەدا بەم ئاواتی چەند ساڵەیەی گەیاندم!...

لەبەر ئەوە نازانم بەچە زوبانێک خۆشـیی دڵم ئاشکرا بکەم و بەچە زوبانێک سـوپاسی ئێـوە و سوپاسی یەزدانی پاک بکەم!...

برا گـیـانەکـان! ئەوە بوو ئیـمرۆ لە پاش چەند کـۆبوونەوە و گـفـتـوگۆیەکی جـۆرێ جـۆرێ لەگەڵ هەردوولاتاندا، بەجۆرێکی جوان و جوامـێرانە پەیماننامـەی ئاشـتی و دۆسـتـایەتی لەناوتاندا بەسترا.

ئێستایش، وای بەباش ئەزانم کە پەیماننامە کە لەبەردەم هەردوولاتاندا بخوێنمەوە، تا لەبەردەم یەکتریشا پەسەندی بکەن، ئینجا مۆریشی بکەن. پاشان یەکتری ببەخشن و ئەم لا و ئەولای یەکتر وەک دوو برای باوک و دایکی ماچ بکەن.

هەموو بەیەک دەنگ: فەرموو پەیماننامەکە بخوێنەرەوە. چۆن ئەفەرموویت وا ئەکەین.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: سوپاستان ئەکەم، ئەمە پەیماننامەکەیە

(پەیماننامەی ژینی نوێ)

(ئێـمـە کـە باوەڕپێکراو و هەڵبـژێرراوی (دەسـتـەی دەسـەڵاتداران) و (دەسـتـەی نەتەوە)ین لە گوندەکەماندا، بۆ هەموولا ئاشکرای ئەکەین کە لەگەڵ یەکا بەدڵ و بەگیـان وەک برا ئاشتبووینەوە و یەکتریان بەخشی و بڕیاریشـمان دا لەسەر ئەم شتانەی خوارەوە. بەخوای مەزن و خاکی پاکی کوردستان و نەتەوەی خۆشەویستی کورد سوێند ئەخۆین کە بڕیارەکانمان جێبەجێ بکەین:

١- دەسـتـەی دەسـەڵاتداران بەسـەرپەرشـتی سـەردار بەگـەوە ئەو پەنجـا پارچە زەوییـەی کـە لە تاک و

(هەموویان هەڵئەسن، یەک بەیەک پەیماننامەکە مۆر ئەکەن. مامۆستا بلەچ شێرکۆیش بۆ بەڵگەمۆری ئەکات).

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: ئینجا براکان نۆرەی دەستگوشین و یەکتر بەخشین و ماچکردنە. تکا ئەکەم دەست پێ بکەن.

هەموو بەیەک دەنگ: بەڵێ باشە.

(هەردوولا هەڵئەستن یەکتری ئەبەخشن و گەردنی یەکتر ئازاد ئەکەن و یەکتری ماچ ئەکەن و دەستی یەکتر ئەگوشن و دائەنیشنەوە).

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: منیش سەربەرز ئەبم کە بەناوی سوپاسکردنی نەژادی و چاکیتانەوە هەڵسم دەستان بگوشم و پیرۆزباییتان لێ بکەم. (هەڵئەستی دەستی هەموویان ئەگوشی و دائەنیشێتەوە).

هەموو بەیەک دەنگ: سوپاست ئەکەین. بەراستی گەورەییت بەجێ هێنا. هەر بژیت مامۆستای بەڕێز. هەر بژیت.

(دەست ئەکەن بەچەپڵەلێدان)

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: گەورەکانم سوپاستان ئەکەم. من لە فەرمانی نیشتمانیی خۆم بەولاوە هیچی ترم نەکردووە. شایستەی سوپاس نیم. ئێوە شایستەی سوپاسن، سوپاسی هەموو کوردەواری. سوپاسی هەموو کەس.

جوامێر ئاغا: کوڕە (شوان)! ئادەی شەکراومان بۆ بێنە بیخۆینەوە.

شوانی نۆکەر: بەڵێ ئاغا. (شەکروایان بۆ ئەهێنی ئەیانداتێ).

جوامێر ئاغا: برا بەڕێزەکان! لەسەر فەرمایشی مامۆستا بلەچ شێرکۆ، خاوەن زەوی و خوێن و زیان لێ دراوەکانم هەموو لە ماڵی خۆماندا کۆکردۆتەوە. تا زووە بام دەست بکەین بەماف پێدانەوەیان.

(هەموویان چەپڵە لێ ئەدەن)

هەموو بەیەک دەنگ: باشە بام یەکە بەیەکە بێنە ژوورەوە بیاندەینێ.

جوامێر ئاغا: شوان! بانگ کە بام لەسەر ڕستەکەی پێم داوێ بێنە ژوورەوە.

شوانی نۆکەر: بەڵێ ئاغا. (ڕوو ئەکاتە دەرەوە). فەرموون براکان وەرن. مافەکانتان وەرگرن.

(خاوەن مافەکان دێنە ژوورەوە هەر کەسە بەشی خۆی وەرئەگرێ و لەسەر ڕستەیەک، لەلایەن مامۆستا بلەچ شێرکۆوە پەنجەی وەرئەگیرێ پاشان هەر سیانزە کەسەکە بۆ بەڵگە ڕستەکە مۆر ئەکەن).

جوامێر ئاغا: کوڕم شوان! مەهێڵە ئەو برا و خوشکانە بچنەوە ماڵی خۆیان، تا نان ئەخۆن. زووکە نان بۆ ئێمەیش و بۆ ئەوانیش تێکەن!

شوانی نۆکەر: بەڵێ ئاغام.

مـاف پێدراوەکـان: (لە دەرەوە). هەر بژی (کۆڕی نەتەوە). هەر بژی مـامۆسـتا بلەچ شێرکـۆ. هەر بژی جـوامـێـر ئاغـا و سـەردار بەگ و هاوڕێکانیـان. پایەداربێ (پەیماننامـەی ژینی نوێ). هەر بژی جەژنی نەورۆز.

فەرهادی نۆکەر: (دێتە ژوورەوە) هەر بژی فەرهادی نۆکـەر. هەر بژی فەرهاد بەگ ئاغا. هەر بژی شـێخ مەلا فەرهاد. هەر بژی حاجی فەرهادی ئەفەندی!...

هەموو بەیەک دەنگ: ها ها ها!... (چەپڵە لێئەدەن).

کاک بایز: برا بەڕێزەکـان! ئەوەتی ژیاوم، لەم شەوەم خۆشـتر نەدیوە!. جا لەبەر ئەوەی سبەینێ نەورۆزە، من وای بەجوان ئەزانم کە هەر لە ئێسـتاوە دەنگ بدەینە ئاوایی، تا سەیرانێکی گەورەی گشتی بکەین. تا بەئارەزووی دڵی خۆمـان بەکەیف و شایی و بەزم و ڕەزمەوە ڕابوێرن. جا تکا ئەکەم ئێوەش هەمووتان بفەرموونە جێگا سەیرانەکە تا لەسەر خوانی بچووکی خۆتان نان بخۆن.

سەردار بەگ: فەرمایشەکەتان بەجێیە کاک بایز. منیش وای بەباش ئەزانم. بۆ بانگێشتنەکەشت دێین. سوپاست ئەکەین. بەڵام، هەر لە ئێستاوە لەسەر لوتکەی شاخەکەی پشت گوندی، ئاگری نەورۆز هەڵگری. دەهۆڵ و زوڕناش لێرە و لەناو کۆڕی ناو گوندا لێ درێ. تا نەتەوەی خۆشەویست هەر لەم شەوەوە چێشکەی ئەم ئاشتی و ئاسایش و ئازادییە بکەن.

هەموو بەیەک دەنگ: فـەرمـایشی هەردووکـتـان بەجێیـە. بام هەر لە ئێسـتـاوە جێـبـەجێ کرێن. سوپاسی هەردووکتان ئەکەین.

(چەپڵە لێ ئەدەن)

شوانی نۆکەر: ئاغا نان تێ کراوە، خاوەن مافەکانیش هەموو نانیان بۆ تێ کرا. وا ئەیخۆن.

جوامـێر ئاغا: باشـە کوڕم. تا ئێـمـە نان ئەخۆین. تۆ بنێرە دەهۆڵ و زوڕناژەنەکـان بێنە ئێـرە و کۆڕی ناو گوند. تا دەس بکەن بەدەهۆڵ و زوڕنا لێدان.

(ڕوو ئەکاتە میوانەکان). فەرموون بام نان بخۆین.

(هەموو ئەچنە دەرەوە بۆ نانخواردن. پەردە دائەدرێتەوە. دەهۆڵ و زووڕنا دەست پێ ئەکات).

## پەردەی پێنجەم

### (٥)

جێگا: ڕۆژی نەورۆزە، ٢١/مارت/١٩٦٠. لە پاڵ چیایەکدا، لەسەر کانی و ئاوێک، لەبن شوورەبی و دارقەیسی و دارسێو و دار قۆخ و کاژدا، دەستەی ئەتەوە: بایز، سالار، شاباز، کاوە، خورشید، هیوا، دانیشتوون. لە دووریشەوە دەس و پێوەند بەلای سەماوەر و کەلوپەلی سەیرانەوە کۆبوونەتەوە. لە دوورتریشەوە، لەم لا و ئەولادا، کۆمەڵ، کۆمەڵ، کوڕ و کچ، ژن و پیاو خەریکی هەڵپەڕکێ و یاریی و گەمە و پێکەنین و چایی خواردنەوە و بەزموڕەزمن.

بایز: براکان جەژنی نەورۆزتان پیرۆزبێ.

هەموو بەیەک دەنگ: خوا لە تۆشی پیرۆز کات.

ئازاد: (دێتە ژوورەوە). بابەگیان ئەوا سەردار بەگ و هاوڕێکانی لەگەڵ مامۆستا بلەچ شێرکۆدا هاتن. (ئەچێتەوە دەرێ).

بایز: باشە کوڕم. وەک پێم گوتن هەمووتان بچن بەپیریانەوە. (سەردار بەگ و هاوڕێکانی دێنە ژوورەوە).

بایز: فەرموون برا بەڕێزەکان، یاخوا بەخۆشی بێن، سەرچاوی من بێن جەژنتان پیرۆزبێ).

هەموو بەیەک دەنگ: ئێوەیش جەژنتان پیرۆزبێ. سوپاستان ئەکەین. (هەموو دەستی یەک ئەگوشن و گەردن ئازادیی لەیەک ئەکەن. دائەنیشن، بایز بەدەستی خۆی جگەرە و چا و قاوەیان ئەداتێ).

سەردار بەگ: خوا ئەم ڕۆژە لە هەموو ئاوایی و لە هەموو کوردەواری پیرۆز کات.

هەموو بەیەک دەنگ: خوانزات گیرا کات. بام بەخۆشی ئەم ڕۆژە پیرۆزەوە، هەندێک هەڵئەپەڕین.

(دەهۆڵ و زوڕنا دەس پێ ئەکات. هەڵ ئەپەڕن. پاشان دائەنیشنەوە).

جوامێر ئاغا: براکان! لە جەژنی نەورۆزدا پێویستە سێ شت بکرێ: یەکەم: نواندنی خۆشەویستی بۆ یەکتر و بۆ گەل. دووەم: بەزموڕەزم و پێکەنین بۆ دڵخۆشی گشتی. سێیەم: چاکەکردن لەگەڵ یەک و نەتەوەدا. ئەوا ئێمە بەشی یەکەم و دووەمان کرد. ماوەتەوە سەر بەشی سێیەم کە چاکەکردنە لەگەڵ یەک و نەتەوەدا. ئەگەر بەقسەی برای خۆتان ئەکەن بام ئەمیش بکەین.

هەموو بەیەک دەنگ: قسەکانت بەجێن. باشە بەگوێت ئەکەین.

جوامێر ئاغا: لەبەر ئەوەی زۆر هەتیو و هەژار بەهۆی ناکۆکی و دوژمنایەتی ناو ئێمە پەیدابوون لە گونددا؛ بەڵام وایە ئەم گوناهانەمان بەهیچ ناسڕێنەوە بەوەنەبێ کە خوێندنگایەکی باش و ڕێکوپێکیان بۆ بکەینەوە بەخۆڕایی تیابخوێن و بنون و بخوێن و فێری پیشەوەری بکرێن و رابهێنرێن بەژینێکی سەربەستانە و مەردانەوە تاخوێندنی سەرەتایی تەواو ئەکەن.

هەموو بەیەک دەنگ: زۆرمان پێ باشە. ئامادەین یارمەتیت بدەین.

جوامێر ئاغا: کە وای لێ هات زەوی و ساختمانی خوێندنگاکە و جێگای کۆبوونەوە و لاسایی کردنەوە و

یاریکردن و تەختە و کورسی و نووسراو و قەڵەم و قاقەز و هەرچی کەلوپەلی پێویستیتر هەیە لەسەر من.

(چەپڵە لێ ئەدرێ)

سەردار بەگ: هەرچی بۆ خواردن و پۆشین و نوستن و سرەوتی ئەو شاگردانەش پێویست بێ لەسەر من.

حاجی شوکل: مانگانەی تا سەری سێ مامۆستایان لەسەر من.

(چەپڵەی بۆ لێ ئەدرێ)

شێخ وەیس: مانگانەی تا سەری سێ مامۆستای تریشیان لەسەر من.

(چەپڵە لێ ئەدرێ)

مەلا پیرۆت: من یەکێکم لەو مامۆستایانەی کە بەخۆڕایی بەشاگردەکان ئەخوێنن.

(چەپڵە لێ ئەدرێ)

بارام ئەفەندی: منیش یەکێکم لەو مامۆستایانەی کاروباری خوێندنگاکە بەخۆڕایی هەڵئەسوڕێنن. ئەشتوانم پێیان بخوێنم.

(چەپڵە لێ ئەدرێ)

بایز: منیش خۆم و هاوڕێکانم و نەتەوە تەختکردن و قیرتاوکردنی ڕێگاکانی ناو گوند،ئامادەکردنی ناوی خواردنەوە بۆ هەموو گەڕەکەکان، دروستکردنی شەش سەرشۆرک، یانەیەک، باخچەیەکی گشت لایی، لەگەڵ دامەزراندنی ڕووناکی بۆ ناو کۆڵانەکانی ناو گوند ئەخەمە سەر ئەستۆی خۆمان.

(چەپڵە ڕێزانی بۆ ئەکرێ)

جوامێر ئاغا: براکان پێویستە هیچمان چاکەی مامۆستا بلەج شێرکۆ و مامۆستا جەمشید لەبیر نەکەین. ئەگەر ئەو دوو برا گەورەیە نەبوونایە ئێمە بەم ڕۆژە خۆشە نەئەگەیشتین.

هەموو بەیەک دەنگ: فەرمایشی تۆ بەجێیە. ئامادەین بۆ پاداشتی هەردووکیان.

سەردار بەگ: من وای بەجوان ئەزانم، ئەگەر مامۆستا بلەج شێرکۆ لای خۆش بێ، لای خۆمان گلی بدەینەوە و بیکەین بەسەرۆکی گوند، ژنی بۆ بهێنین، مووچەی باشی بۆ ببڕینەوە. خانووی نایابی بۆ دروست بکەین. تا ژیانی گوندەکەمان بەسەرپەرشتی ئەوەوە ڕۆژ بەڕۆژ پێشکەوێ.

هەموو بەیەک دەنگ: فەرمودەت بەجێیە، بام بیکەین، تکایە لەو یارمەتییەدا هەموو بەشدارین.

مامۆستا بلەج شێرکۆ: پیاوەتییەکەتانم زۆر پێ خۆشە، سوپاسی گەورەییتان ئەکەم. خوا لە مەردایەتیتان کەم نەکات. هەر بژین بۆ کەڵکی گوند. بۆ کەڵکی کوردەواریی. من خۆم بەبرا بچووک و فەرمانبەری هەمووتان ئەزانم سەردار بەگ. (چەپڵە لێ ئەدرێ... هەموو هەڵئەسن دەستی مامۆستا بلەج/شێرکۆ ئەگوشن، پیرۆزبایی لێ ئەکەن).

بایز: منیش بەناوی نەتەوە و هەموومانەوە یادگارێکم بۆ مامۆستا جەمشید ئامادە کردووە بیدەمێ. ئێوە چی ئەفەرموون؟

جوامێر ئاغا: زۆرمان پێ خۆشە. بزانین دیارییەکەت چییە؟

بایز: دیاریەکە بریتییە لە گوڵدانێکی گەورەی زیوی نایاب. دەسکە گوڵێکی ڕەنگاوڕەنگی دەستکردی تیایە پڕە لە گوڵە نێرگس و گوڵاڵکە سوورکە و گوڵە وەنەوشە. لەسەری نووسراوە: «یادگاری ژینی نوێ لە نەورۆزی (١٩٦٠)دا بۆ مامۆستا جەمشیدی کوردپەروەری بەڕێز». لە خواریشەوە ناوی هەر سیانزەمانی لەسەر هەڵکەنراوە.

هەموو بەیەک دەنگ: ئافەرین کاک بایز بۆ خۆت و کردەوەی ڕەندیت. هەر بژیت.

مامۆستا بلەچ شێرکۆ: ئەوا لە دوورەوە ئۆتۆمبیلێک هات یەکێکی لێ دابەزی. وا بزانم مامۆستا جەمشیدە. دیارە نامەکەی پێ گەیشتووە. فەرموون بابچین بەپیریەوە.

(هەڵئەسن ئەچنە دەرەوە. پاش تاوێک لەگەڵ مامۆستا جەمشید دێنەوە ژوورەوە)[1]

مامۆستا جەمشید: برا خۆشەویستەکان و ڕۆژتان باش. جەژنی نەورۆزتان پیرۆزبێ. هەروەها پیرۆزتان بێ (ژینی نوێ)، ژینی ئاشتی و یەکێتی و ئاسایش و تێکۆشانی مەردانەتان بۆ پێشکەوتنی نیشتمانەکەتان. خوایە! سەد جار سوپاست ئەکەم کە بەئاواتی خۆمت گەیاندم. هەروەها سوپاسی مامۆستا بلەچ شێرکۆ و ئێوەیش ئەکەم کەوا کوردانە و مەردانە هاتنە پێشەوە بۆ سەربەرزی گوندەکەتان.

هەموو بەیەک دەنگ: خۆش هاتی برای نیشتمانپەروەری خۆشەویستمان. سەرمان بەرزبووەوە بەتێکۆشین و هاتنت. هەرچیمان کردووە، هەمووی، لە سایەی ڕەنج و کۆششی تۆ و مامۆستا بلەچەوە بووە. خوا جەژنی نەورۆز لە تۆیش و لە هەموو کوردێکیش پیرۆز کات.

(هەموو دەستی ئەگوشن و پیرۆزبایی لێ ئەکەن. ئینجا مامۆستا جەمشید لە ژوور خۆیانەوە دائەنێن. بایز جگەرەی پێشکەش ئەکا. پاشان شەکراو بۆ ئەو و بۆ هەموویان ئەهێنن).

بایز: گەورەی بەڕێز، مامۆستا جەمشید! نازانم بەچە زوبانێک سوپاس و ستایشی ئێوە بکەم لە بەرامبەر ئەم تێکۆشانە مەردانەیەتاندا بۆ کەلکی ئەم گوندە، کە ئەویش وێنەیەکە لە کوردەواری و کوردستان. تەنیا لەم دەم و دەستەدا هەر ئەوەندەم لە دەست دێ کە بەناوی ئەتەوەوە ئەم یادگارە بچکۆلەیەتان پێشکەش بکەم. تکایە لە بچووکی خۆتانی وەرگرن.

(گوڵدانە زیوەکەی ئەداتێ)

مامۆستا جەمشید: کاک بایزی جوامێر و سەربڵند!

سوپاسی پیاوەتی و هونەرمەندیتان ئەکەم. دیارییەکەتان گەلێک لام پیرۆز و خۆشەویستە. بەسەرچاو وەری ئەگرم. (گوڵدانەکەی لێ وەرئەگرێ. چەپڵە ڕێزانی بۆ ئەکرێ). دەست ئەکرێ بەدەهۆڵ و زوڕنا لێدان و هەڵپەڕکێ. دائەنیشنەوە).

---

(١) لێرەدا وەک دەردەکەوێ مامۆستا تووشی غافڵگیرییەک بووە، چونکە لە پێشاندانی دیمەنی (پەردەی پێنجەم) وای دەردەخات کە وان لە سەرکانی و ئاوێک لە بن شۆڕەبی و دار و درەختدا. کەچی لێرەدا وەک لە ژوورێکدابن!!. دەبوو مامۆستا ئاگاداری ئەمە بووایە.

هەموو بەیەک دەنگ: هەر بژی کورد و کوردستان. هەر بژی کۆڕی نەتەوە. هەر بژی مامۆستا جەمشید.
هەر بژی مامۆستا بلەچ شێرکۆ. سەرگری ژینی نوێ. پایەداربێ ڕۆژی نەورۆز.

مامۆستا جەمشید: برا بەڕێزەکان!
بەڕاستی ئەمە (ژینێکی نوێ)یە. ئەوەتی من لە بیرم دێ لە کوردستاندا شتی وا ڕووی نەداوە. خوا لێتانی پیرۆز کات. بەڵام ئەبێ تێکۆشین، نەک هەر ئەم گوندە، بەڵکو هەموو کوردەواری وەها بژین. وا تا ژینێک بژین؛ کە پڕ بێ لە ئازادی و کامەرانی و دادپەروەری. دووربێ لە زۆرداری و هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری. ژینێک؛ کە دامەزرێ لەسەر بنچینەی زانست و هونەر و خواناسی و نیشتمانپەروەری، تاکو ئیتر، هەتا سەر تەنگانەمان نەیەتەوە ڕێ، پێشکەوتنیشمان لە خۆیەوە جێبەجێ بێ!...

هەموو بەیەک دەنگ: ئەو ژینە ئامانجمانە. ژیرانە بیری لێ ئەکەینەوە. گورج و گۆڵانە بۆی ئەجووڵێینەوە.
مەردانە بۆی تێ ئەکۆشین. دەرکەوێ کوردستانی ئاوەدان. سەرکەوێ کوردی ئازا و قارەمان.
(چەپڵە ڕێزان دەست پێ ئەکرێ)

فەرهادی نۆکەر: (لە بەرگی کەڵەشێرێکی شەنگ و شۆخدا کە پانتۆڵ و سوخمە و کراس و بۆیمباغی لە بەرایی دێتە ژوورەوە گۆچانێکی بەدەستەوەیە، پەنجەیەکی خستۆتە بن باخەڵی سوخمەکەیەوە. ئەقوقێنی): ئا ئە ئا ئازادیی!...

هەموو بەیەک دەنگ: ها ها ها!

فەرهاد: برا بەڕێزەکان! خوا جەژنی نەورۆز و ژینی نوێ لە هەمووتان و لە هەموو کوردەواری پیرۆز کات.
بەڕاستی هەمووتان جێگای ستایش و سوپاسی نەتەوەن. خوابتان هێلی بۆ سوودی گشت لایی.
(هەموو چەپڵەی بۆ لێ ئەدەن)

گەورەکان! منیش لەم ڕۆژەم پیرۆزتر دەست ناکەوێت کە بەرگی نۆکەری تیا داکەنم و بەرگی ئازادیی تیا لەبەرکەم. لەبەر ئەوە بڕیارم داوە کە ئیتر نۆکەریی نەکەم؟... بڕواش بفەرموون کە لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا کە نۆکەریم کردووە لای سەردار بەگ لە چاکە بەولاوە هیچی ترم نەدیوە. بەڵام داخی هیچ نامکوژێ ئەوە نەبێ کە چەند جار خوازبێنی کچی مەلا پیرۆتم کردووە، لەگەڵ ئەوەشا کە هەردووکمان دڵخوازی یەکین، کەچی مەلاژن پێم ئەڵێن تۆ نۆکەری، کچت نادەینێ! ؟...

سەردار بەگ: بەڕاستی ئەمە زیانێکی گەورەیە لە من ئەکەوێ. چونکو فەرهاد جگە لە دڵسۆزی و سەر ڕاستی و گیان سووکی، بەپێچەوانەی گەلێک کەسی تر، لەسەر خراپەی خۆم و هاوڕێکانم هەموو جار بەرەنگاری ئەکردم. لایەنی نەتەوەی ئەگرت، بۆ سەر چاکەی خۆم و گشتی هانەی ئەدام. هەرچەندە تووڕەی ئەکردم، بەڵام کە ئەهاتمەوە سەر خۆم لەسەر ئەو چاکە پەروەرییەی زووتر ئەچوو بەدڵما.

بایز: خوا ئاگاداره لێت ناشارمەوە، هەر چەند ئیمەشی ئەدی ستایشی تۆی ئەکرد، لەسەری ئەکردیتەوە، بەڵام بەرەنگاری ئێمە نەبوو تا لەگەڵ تۆ و هاورێکانتا بمانکاتەوە بەیەک.

سەردار بەگ: کە وای لێ هات من ناهێڵم فەرهاد لەلام بڕوا. ئێوەیش یارمەتیم بدەن. بەڵام بەنۆکەریش نای هێڵمەوە. ئەیکەم بەکوڕی خۆم. هەر لە ئێستاوە وەک یەکێ لە کوڕەکانم بەشە زەوی و سامان و خانووی خۆی بۆ جیا ئەکەمەوە و پێی ئەبەخشم.

فەرهاد: سوپاست ئەکەم گەورەم. (ئەچێ دەستی سەردار بەگ ماچ ئەکات). هەر بژیت بۆ جوامێریت.

(ڕوو ئەکاتە مەلا پیرۆت): ئا ئە ئا ئازادیی!... کەواتە من بووم بە(فەرهاد بەگ)!... احم مامۆستا مەلا پیرۆت!... کەی تۆیش ئەمکەیت بەکوڕی خۆت؟!...

مەلا پیرۆت: هەتیمە، ئەگەر من نەبام، قەت ئەتۆ لە نۆکەری ڕزگارت ئەبوو؟ قەت ئەبووی بەبەگ؟ باشە منیش لەبەر دڵی خۆت و دڵی هەمووان ئەتکەم بەکوڕی خۆم!...

فەرهاد: سوپاست ئەکەم گەورەم. (ئەچێ دەستی مەلا پیرۆتیش ماچ ئەکات). هەر بژیت! ئا ئە ئا ئازادیی!... کەواتە من بووم بەمەلا فەرهاد بەگ!! (ڕوو ئەکاتە مامۆستا جەمشید): تۆ خوا مامۆستا جەمشید من پیاوێکی کەمم؟!...

مامۆستا جەمشید: (دەست ئەکات بەپێکەنین). نەبەخوا مەلا فەرهاد بەگ پیاوێکی کەم نییت!...

(ڕوو ئەکاتە ئەوانی تر): براکان ئێوە وەک من فەرهاد ناناسن. فەرهاد یەکێکە لە لێ قەوماوە خانەدانە باشەکانی کوردی ئێران. نیشتمانپەروەر و خوێندەوارێکی ڕاستەقینەیە. بەڵام ڕۆژگار ناچاری کردووە بووە بەنۆکەر. هەروەها (مامۆستا بلەچ شێرکۆ)یش یەکێکە لە نیشتمانپەروەرە مەزنەکانی کوردی تورکیا. جگەرسۆزی و کوردپەروەریی خۆی گەیاندوویەتە ئێرە. لەبەر ئەوە تکا لە (کۆڕی ئەتەوە)ی بەڕێزتان ئەکەم کە (فەرهاد) بکەن بەسەر مامۆستای ئەو خوێندنگایەتان کە خەریکن بۆ هەتیوان و هەژارانی بکەنەوە.

هەموو بەیەک دەنگ: فەرمایشت پەسەندە. بەسەرچاو ئەیکەین.

بایز: کاک فەرهاد، پیرۆزت بێ ئەم هەموو بەخشندانە. هەرچی بۆ ژنهێنانەکەشت پێویست بێ لەسەر مامی خۆت.

فەرهاد: سوپاسی تۆیش ئەکەم گەورەم (دەستی بایزیش ماچ ئەکات). سوپاسی هەمووتان ئەکەم گەورەکانم خوا بتانهێڵێ بۆ من و بۆ کەڵکی گشتی.

(چەپڵە ڕێزانی بۆ ئەکەن)

کە وای لێ هات منیش زوڕناتان بۆ لێ ئەدەم، ئێوەیش لە شاییەکەما هەڵپەڕن. (فەرهاد زوڕنایەک لەبن باخەڵی دەرئەهێنێ و دەست ئەکات بەلێدانی. دانیشتووانیش هەموو دەست ئەکەن بەپێکەنین و هەڵپەڕین).

(پەردە دائەدرێتەوە)

## زانستی خۆناسین

# ڕێگای سەرکەوتن[1]

ئەگەر لەو کەسانەی کە هەمیشە لە ژینا دوا ئەکەون، لە تەنگانە و دەستکورتی و کەموکوڕیدا گیرماون و داماون نازانن چۆن پێشکەون، چۆن بەئاواتی خۆیان بگەن... وە ئەیانەوێ لە ژیاندا سەرکەون... گوێ گرە: بام ئەم ڕێگای سەرکەوتنەت پێ بڵێم!

### مەترسە:

هیچ شتێک وەک ترس تەگەرە لە سەرکەوتن نادا. ترس گەورەترین دوژمنی گیانە. ناهێڵێ پیاو لە ژینا سەرکەوێ و بەخۆشییەوە بژی. ترس ژەنگێکە خۆی ئەدا لە پەلوپۆی پیاو. لە هۆش و لەشی مرۆڤ، ئەندامەکانی سست ئەکا و لە کەڵکی پیاوەتیی ئەخا. بەشی زۆری نەخۆشی و سەرگەردانی بەهۆی ترسەوە پەیدا ئەبێ. لەبەر ئەوە ترس لە دڵی خۆت دەرکە. کە ئەڵێم ترس مەبەسیشم لەمانەیە: پەشم و قین، تووڕەیی، چاوپیسی، دوودڵی، گلاراوی، پەلەپەلکردن، ئارام نەگرتن سەرچڵی، ورەبەردان، بڕست بڕان، دەمار کزی... چونکە ئەمانە هەموو ترسن. وە لەش و ژیان بەربادا ئەکەن. لەبەر ئەوە هەچ ترسێک لە دڵتا هەیە دەریکە. وە لە بریتی ئەوە (باوەڕ بەخۆکردن) بخەرە دڵتەوە.

### باوەڕ بەخۆکردن:

باوەڕ بەخۆکردن، بەپێچەوانەی ترس، یاریدەی مرۆڤ ئەدا لە سەرکەوتندا. پیاو ئەخاتە گەڕ بۆ کرد و کۆشش، بۆ تەندروستی، بۆ ژینێکی پڕ سەرکەوتن و بەختیاری. لەبەر ئەوە پەروەردەی گیانی خۆت وەها بکە کە (باوەڕت بەخۆت بێ). تا بتوانی بۆ هەموو کاروبارێکی پەسەند و بەکەڵک پڕ لە ئاوات خۆت بکوتی و تیا سەرکەوی.

### باوەڕکە بەخوا:

بۆ ئەوەی باوەڕ پەیداکەیت بەخۆت، پێویستە باوەڕبکەی بەخوا. چونکە خوا یەکە تۆی دروست کردووە. وە ئەم هەموو جیهان و ژیانە خوایە بۆ تۆ و بۆ هەموو کەسێکی ئافەریدە کردووە. جا ئەو خوایەی تۆی هێناییتە بوون، هەڵبەت بەتەنگ تەندروستی و بەختیاری و سەرکەوتنی تۆشەوەیە، بۆیەکا ئەم هەموو بابەتی ژین و خۆشییەی بۆ پێکهێناوی. کەواتە بۆ نەیناسی؟ بۆ چ خۆشت نەوێ؟ بۆ چ بەدڵی ئەو نەجووڵێیتەوە. تا لە ژیانتا سەرکەوی و بەرکەوی و دەرکەوی.

---

(١) گۆڤاری هیوا. ژ (٢) س (١) ئابی ١٩٥٧.

## خوا چییه؟

خوا نابینرێ بەچاو. چونکە گیانە. هێزێکی گەورەی گیانییە. بەڵام بەبیر هەستی پێ ئەکرێ. وە بەهۆی بیرەوە پیاو ئەیناسێ، تێی ئەگات، وە پێی ئەگات. وە ئەتوانێ گفتوگۆی لەگەڵ بکات. بەڵکو ئەتوانێ بەکاری بهێنێ بۆ گەیشتن بەئاواتی پەسەندی خۆی!

## بەڵام کەی؟

وەختێک کە پیاو لەسەر پێڕەویی خوایی بجووڵێتەوە. پیاو ناتوانێ پێڕەویی خوایی بجووڵێتەوە. ناشتوانی خۆی لە ڕێگای خوایی لادا. ئەگینێ تووشی دەرد و سەرگەردانی دێ و سەرناکەوێ چونکە دەستووری خوایی فەرمانڕەوایە بەسەر هەموو شتێکی جیهاندا وە تەنیا دەستوورێکە کە لەو بەولاوە دەستوورێکی تر نییە جیهان بەڕێوەبەری!

## دەستووری خوایی:

جا ئەگەر پێڕەویی ئەم دەستوورەت کرد ئەوا سەر ئەکەوێ. وە ئەگەر نەت کرد ئەوا ژێر ئەکەوێ. ئەم دەستوورە زۆر سادە و سووکە. (چاکە کردن و خراپە نەکردنە). بۆ هەڵسوڕاندنی کاروبار و سەرکەوتن بەسەر گیروگرفتی ژیاندا و گەیشتن بەهەموو ئاواتێکت: هیچی پێ ناوێ ئەوە نەبێ: «بڕوات بەخوا هەبێ. بڕوات بەدەسەڵاتی هەبێ. پاشان داوای یارمەتیی لێ بکەی بەدڵ. پاشان گوێگری کە لە ڕێگای بیرتەوە چیت پێ ئەڵێ. ئەوەی پێتی ئەڵێ بیکە». ئەمە ڕێگایەکە خوا پیشانتی ئەدا بۆ سەرکەوتنت. کە کردت دڵنیابە بەئاواتی خۆت ئەگەیت لە ژیانتا سەریش ئەکەوێ.

## بڕوات بەبەخت نەبێ:

بەخت درۆیە. بڕوات پێی نەبێ. ئەوی ڕاستە (دەستووری خوایی)یە. تەنیا پێڕەویی دەستووری خوایی بکە. بێگومان سەرئەکەوێ. جا ئەمەت لەبیر نەچێ!

## (قەزا و قەدەر) خراپ تێ نەگەیت:

خەڵک خراپ لە قەزا و قەدەر گەیشتوون. وا ئەزانن هەرچی دەردی سەری و گیروگرفتێک لە ژیاندا هەیە، خوا لە چارەی نووسیون!. خوا نووسیوێتی کە دزی و درۆزنی بکەن. خوا دایناوە کە بکوژن و ببڕن زۆرداری بکەن. خوا هەژاریان ئەکات. خوا بەدناویان ئەکات. لەبەر ئەوە پێویستە بەبەشی خوایی بێ دەنگ بن. بەڵێ خەڵک وا لە قەزا و قەدەر گەیشتوون. بەڵام ئەو خەڵکانە خراپ لە قەزا و قەدەر گەیشتوون. زۆر بەهەڵەدا چوون!. بڕوایان پێ مەکە!. چونکە خوای گەورە لەوە دوورە کە خۆی زۆرداریو دزی و خراپی بەپیاو بکات و پاشان خۆیشی گوناهباری بکات و تەمێ خوارووی بکات!... هەموو ئاینێکی خوایی ئەم قسەیە پەسند ئەکات کە خوا ڕێگایەکی داناوە هەر کەسێ لەسەری ڕۆیشت سەر ئەکەوێ. هەر کەسێ لەسەری نەڕۆیشت سەر ئەنگری ئەبێ. هەرگیز ناگۆڕێ. بۆ هەموو کەس، بۆ هەموو

شوێنێک هەریەکە لایەنگیریش بۆ کەس ناکات.

چۆن ئەوەتەی جیهان هەبوو و هەیە، ڕۆژ و شەو بەرەو دوای یەک پەیدابوون، وە چوار گونەر (فصل)ی ساڵ بەرەو دوای یەک هاتوون چۆن هەموو کەس وەک یەک لەدایک نەبێ، وەک یەک ئەمرێ، چۆن پەل و پۆ و ئەندامی هەموو کەس وەک یەکن، چۆن وەک یەکیش بەخواردەمەنی و ئاو و با ئەژین... بەڵێ: چۆن ئەم دەستوورانە ئەبینن کە دەستووری خوایین و هەرگیز ناشگۆڕێن... ئا وەهاش ئەو دەستوورە کە فەرمانڕەوایە بەسەر سەرکەوتنی تۆ و من و هەموو کەسێکا ناگۆڕێ و لایەنگیری بۆ هیچ کەسێ ناکات.

ئەم دەستوورە ئامادەیە بۆ پێکهێنانی هەموو ئاواتێکت بەو مەرجەی پێڕەویی بکەیت. لەبەر ئەوە تەنیا پێڕەویی ئەم (دەستووری خوایی)یە بکە. ئەمەشت لەبیر نەچێ!

## بیر چییە؟

بیر هێزێکی گەورەیە، یەکجار گەورەیە. چونکە بەشێکە لە گیانی مەزن. ڕێیەکە ڕاستە و ڕاست ئەتگەیێنێ بەهێزی (گیانی مەزن) ئەتگەیێنێ بە(خوا). هێزی بیر لە هێزی ئەلەکتریک و ئاو و زەوی، لە هێزی هەموو شتێک گەورەترە... بەهۆی بیرەوە لە خوا تێ ئەگەیت. بەهۆی بیرەوە بەخوا ئەگەیت. بەهۆی بیرەوە پرسیار لە خوا ئەکەیت. لە ڕێگای بیریشەوە خوا وەرامت ئەداتەوە. واتا بۆ سەرکەوتنت ڕێگات پێشان ئەدات... جگە لەوە: بیرەکە بنچینەی ژیانت بۆ دائەمەزرێنێ. تۆی ئێستات ئەنجامی بیری کۆنی خۆتی، ئەنجامی بیری ئەو کەسانەشی کە کاریان تێ کردوویت. تۆی لەمەودوا ئەنجامی بیری ئێستاتی و بیری ئەو کەسانەش کە کارت تێ ئەکەن.

کەواتە چۆن بیر لە پاشەڕۆژی خۆت بکەیتەوە وا ئەبیت. ئەگەر خۆت بەسەرکەوتوویی هێنایە پێش چاوی خۆت ئەوا سەرئەکەوی. ئەگەر بەژێرکەوتوویش خۆت هێنایە پێش چاوی خۆت ئەوا ژێرئەکەوی. لەبەر ئەوە قەت بەنەخۆشی و سەرگەردانی و هەژاریەوە خۆت مەهێنە پێش چاوی خۆت. هەمیشە خۆت بەتەن دروستی و بەختیاری و دەوڵەمەندی و سەرکەوتوویییەوە بهێنەوە پێش چاوی خۆت تا خۆشی بێ و خۆش بژی و سەرکەوی.

## لەش و گیان:

ڕاستە پیاو لە (لەش) و (گیان) هاتۆتە بوون. بەڵام بابەتی (گیان) لە مرۆڤدا مەزنتر و لە پێش ترە. بەڵکو پیاو بەپیاو ناناسرێ بە(گیان)ی نەبێ. خۆ ئەگەر (لەش) گیانی لەتەکا نەبێ، نەک هەر بێ نرخە، بەهیچیش ناژمێررێ.

هەروەها هەموو شتێکیش، لە جیهاندا، لە سەرەتادا، لە (بیر) دروست ئەکرێ. پاشان ئەو بیرە ئەبێتە بەرجەستە، ئینجا (لەش)ی لێ پەیدا ئەبێ. لە پێش ئەمەدا خانووەکەت دروست بکەیت، لە بیرتا دروستی ئەکەیت. پاشان بیرەکەت ئەخەیتە سەر قاقەز. واتا نەخشەی خانووەکەت بۆ دروست بکات. هەروەها ئەبێ هەر ئاواتێکیشت هەبێ، لە پێشا لە بیرتا (نەخشەی سەرکەوتن)ی بۆ دروست بکەیت. پاشان ئەو ئاواتەت بەش بەش کەیت، بیریش لەوە بکەیتەوە بەش بەش چی پێویستە بکرێ بۆ جێبەجێ

کردنی. ئینجا هەنگاو بنێیت بەش بەش ئاواتەکەت پێکبهێنی. کەواتە تا ئەتوانی بیر لە پێکهێنانی ئاواتەکەت بکەرەوە، بیر لەسەرکەوتنی فەرمانەکەت بکەرەوە. لە خوا داواکە بۆ پێکهێنانی ئەو ئاواتە بۆ سەرگرتنی ئەو فەرمانە رێگات پێشان بدات، یارمەتیت دا... ئەمە هەموو جارێک لە پەنایەکی بێ دەنگ و سەنگا، لەسەرخۆ، بەنەرم و نیانی لە خوا داواکە و دووبارەی بکەرەوە. زۆری پێ ناچێ، کاتێک ئەزانی پاش چەند رۆژ یان چەند مانگ یان چەند ساڵێک خوا ئاواتەکەت ئەهێنێتە جێ. ئەو فەرمانەش کە بۆی تێ ئەکۆشی جێبەجێ ئەبێ. حەز ئەکەم بزانی کە لەو وەختەوەی داوای یارمەتی ئەکەیت لە خوا بۆ سەرگرتنی فەرمانەکەت، خوا هەموو هێزێکی جیهانی ئەخاتە گەڕ یارمەتیت بدەن تا سەرئەکەوێ. جگە لەوە ئەو وەختەی نیازی دڵت لەسەر باڵی بیرت بەهێز و هەڕەت ئەنێریتە کن پەروەردگار، پەروەردگاریش هەر لەسەر باڵی بیر وەرامەکەت ئەداتەوە، واتا رێگایەکی راست و رەوانت پێشان ئەدات کە چۆن دەستبکەی بەفەرمانەکەت وە چۆن تیا سەرئەکەوێ. ئینجا تۆ پێویستە نەوەستی، دەم و دەست، دەس بکەی بەپێڕەویی ئەو فەرمانی خوایە، واتا لەسەر ئەو رێگایە برۆی کە خوا پێشانتی ئەدا... جا لەو وەختەدا کە لەسەر ئەو رێگایە ئەڕۆیت، (گیانی مەزن = خوا) هەموو هێزێکی خۆیت پێشکەش ئەکات، پشتت ئەگرێ، یارمەتیت ئەدا تا لە فەرمانەکەتا سەرئەکەوی، تا بەئامانجەکەت ئەگەیت، تا ئاواتەکەت ئەهێنێتە بوون. بەڵام ئەوەندە هەیە خوا یارمەتی کەسێک ئەدات کە ئامانجەکەی پاک و پەسندبێ، وەبێ بۆ کەس تیا نەبێ، خۆیشی کردەوە جوان و رەوشت پوختە بێ، لەگەڵ باوەڕکردنا بەخوا پێڕەویی دەستووری خوایش بکات. کەس لەگەڵی ئێمە ژێرکەوتووتر نییە. خۆزگە لەسەر ئەم رێگای خواییە برۆیشتینایە تا لە ژینا سەرکەوتینایە.

## رێگای کامەرانی[1]

کامەرانی:

کامەرانی یان سەعادەت ئەوپەڕی مرازی هەموو لایەکمانە. کەس نییە بۆ کامەرانی تێنەکۆشێ، لە راستی یا هەموو کردەوە و کارێکمان رووەو کامەرانی ئەچێ. وە ئەگەر ژین کامەرانیی لێ بکەیتە دەرێ ئەبێتە دۆزەخ کە لە مردنیش خراپترە. کەواتە کامەرانی ئامانجی هەموو کەسێکە وە نیازی هەرە نازداری هەموو گیانلەبەرێکە. وە بۆ هەر بابەتێکی ژیان تێکۆشین، وە هەر شتومەکی پەیدا کەین وە بەهەر جۆرێک بجووڵێینەوە مەبەسمان گەیشتن بەکامەرانییە.

کەواتە کامەرانی ئاواتی ژیانە، نیشانەی زیندەگانی و سەرکەوتن و بەرکەوتنە لە ژیانا بەڵکو جوانیی ژین و گیانی ژیانە. کامەرانیش کە هێندە نازەنین و نازدار و نرخدارە لە بەرچاوی هەموولایەکمان رازێکی خواییە، خوا بۆیە وای لێ کردووە کە پیاو تێکۆشی و کەڵک ببەخشی و لە دەستووری خوایی شارەزایی و لە رێگەی پێڕەوی کردنی دەستووری خواییەوە لە خوا نزیک بێتەوە وە پیاو لە رێزی

(١) گۆڤاری هیوا. ژ (١) س (١) تەمموزی ١٩٥٧.

گیانلەبەر و درندەوە بۆ پایەی پیاوچاکی وەبێتە یەکێک لە کەڵک بەخشی و چاکیا وە فریشتەیی. ئەوسا سەر زەوی بێتە یانەیەکی پیاوچاکان، برازێتەوە بەداد و چاکەپەروەرییەوە، بیێتە بەهەشتێکی خوایی کە هەموو کەس تیا دڵخۆشی و سەرفراز و کامەران بی. کەوابوو کامەرانی شتێکی پیرۆز و بەرزە، خۆشەویستیی خەڵک و خوایە وە ئامانجی هەردوولایە. بەڵام ئایا ئەتوانین بەئاسانی بگەین بەکامەرانی؟... رێگایەک هەیە بیگرین تا بۆ کامەرانی مان بەرێت؟... کامەتا ئەو رێگایە؟... وە چۆن ئەبێ بەو رێگایەدا برۆین؟... گوێگرن بام هەنگاو بەهەنگاو بۆ ئەم رێگایەتان ببەم.

کە پیاو لەدایک ئەبێ خوا لە دڵیا سیانزە جۆر (ئارەزووی نەژاد) دروست ئەکات. لەم ئارەزووە نەژادانەش پەلوپۆ ئەبێتەوە. لەم ئارەزووە گەورانە و بچووکانەش کە جاروبار یەک ئەگرن و تێکەڵ ئەبن و گەلێ ئارەزوو و ئاواتی تر پەیدا ئەبن ئەمانە هەر کامێکیان پێکهاتن، کامەرانی پێکدێت وە پیاو هەست بەکامەرانی ئەکات. بەڵام کە بچنەوە سەر بنج و بناوانیان هەموو ئەچنەوە سەر ئەو سیانزە ئارەزووە نەژادە. جا ئەم ئارەزووانەن کە پیاو ئەخەنەگەڕ، وە پیاو بەم ئارەزووانەوە هەستی خۆی ئەتوانی بپارێزی، وە ئەتوانی ژیانی خۆی بەرێوەبەری. وە کۆمەڵەی ئادەمیزادیش بەرەوپێشکەوتن وە کامەرانی وەتەن دروستی بەری لە ژیانا. وەیان بەرەو دواخستن و سەرگەردانی و هەژاری و نەخۆشی و دڵتەنگی بەریت. کەواتە ئەم ئارەزووانە لە خۆیانا نە خراپن و نە چاکن. بەڵام ئەو رێگایەی کە ئێمە ئەیگرین تا پێکیان بهێنین وە بەکامی دڵی خۆمان بکەین، چاکی و خراپیمان دەرئەخات. بام نموونەیەکتان لەم بابەتەوە نیشان بدەم.

یەکێ لەو ئارەزووانە ئەوەیە کە پیاو حەز لە رەگەزی ژن ئەکات. ئەم ئارەزووە خۆی ئەنگیی تیا نییە و خراپ نییە. بەڵام ئەگەر هات و ئێمە ئەو ژنەی حەزی لێ ئەکەین بەزۆر لە ماڵی باوکیمان داگیر کرد، یاخود فراێمان، ئەوە دیارە کە کردەوەیەکی خراپمان کردووە وە ئەوەندەی لە دەستکەوتنی ئەو ژنەدا پێی کامەران ئەبین، ئەوەندەش ناخۆشیمان دێتە رێ لەو زۆردارییەوە کە کردمان لە ژنەکە و لە کەسوکاری ژنەکە و لە کۆمەڵایەتی و لە حکوومەت. لە ئەنجاما شیرینی و تاڵیمان وەک یەکی لێ دێتەوە بگرە تاڵیمان لە شیرینیمان پتر ئەبێ. چونکە ئەو رەوشتەی گرتمان بۆ پێکهێنانی ئەو ئارزووەمان رەوشتێکی خراپە، نە خەڵک، نە حکوومەت، وە نەخوا پەسەندی ناکات بەڵام ئەگەر ئێمە ئەو ژنەمان لەسەر دەستووری خوایی خواست لە باوکی وە بەخۆشیی خۆی مارەمان کرد دیارە کە کامەرانییەکەمان کامەرانییەکی تەواو پەسەند ئەبێ. چونکە هەم ئارەزوویەکی دڵی خۆمانمان بەجێ هێنا، هەم ئازاری دڵی کەسیشمان نەدا وە هەم فەرمانی خوایی و کۆمەڵایەتی و حکوومەتیشمان نەشکان.

کەواتە هەر تەنیا بەئارەزوو پێکهێنان، کامەرانیمان بێک نایەت، ئەبێ رێگای ئارەزوو پێکهێنانیشمان لە دەستووری خوایی و خەڵک و حکوومەت نەچێتە دەرەوە.

دەستووری خوایی لەسەر دوو بنچینەیە:

١- چاکە کردن، ٢- خراپە نەکردن.

جا هەر شتێک ئەکەین بەلای خواوە دروست و پەسندە بەو مەرجەی شتێکی چاک بێ بۆ خۆمان یان بۆ

خەڵکی، پاش ئەوەی ئەو شتە زیانیشی بۆ کەس تیا نەبێ.

دادپەروەری راستگۆیی، سەرراستی، دڵسۆزی، دەسپاکی، سەربەستی، ئازادی، داوێنپاکی، دڵ خاوێنی، بەئارامی، رووخۆشی ئەم رەوشتە چاکانە هەموو بابەتی ژینێکی پڕ کامەرانین. چونکە هەموو بەڵگەی ئەوەن کە خوا ئەناسین وە باوەڕ بەخوا و بەدەسەڵاتی خوا ئەکەین کە بەپێی کردەوەمان یان سزامان ئەدات وەیان چاکەمان ئەداتەوە، لەبەر ئەوە پێویستە بزانین کە خواناسی و کردەوە و رەوشتی چاکیش رێگایەکی گرنگن بۆ کامەرانی، وە هەر رێگایەک بگرین بۆ پێکهێنانی ئارەزووەکانی دڵمان ئەبێ لەسەر ئەم بنچینەی خواناسی و چاکیە دایەزرێنین ئەگینی بەکامەرانی ناگەین. وە ئەگەر بەکامەرانیش بگەین تەمەنی زۆر درێژ نابێت وە زۆری پێ ناچێ ئەوەندەی کامەرانێکە و پتریش تەنگانە و تەنگوچەڵەمەمان دێتە رێ وە کامەرانییەکەمان لەبیر ئەباتەوە.

## دەستووری کۆمەڵایەتی:

لە هەموو گەل و کۆمەڵێکا رەوشت و خو پەیدا ئەبێت وە ئەم رەوشت و خووانە لە ئەنجاما ئەبنە دەستووری ژیانی ئەو کۆمەڵە ئەم دەستوورانەش ئەگەر بشکێنرێن ئەوە دیارە لەلایەن کۆمەڵەوە پیاو تووشی گیروگرفت و دەردیسەری دێت وە ئەگەر پێڕەوی کرێن ئەوە دیارە پیاو خۆی لەوەیی کۆمەڵ و ئازاردانی ئەپارێزیت. جا کە وەختی تێنەکۆشین بۆ پێکهێنانی ئارەزووی دڵمان پێویستە هەر وەک پێڕەوی دەستووری خوایی بکەین هەروەها. پێڕەوی ئەم دەستووری کۆمەڵایەتییەش بکەین. وە هیچ گێرە و کێشەیەک بۆ خۆمان پەیدا نەکەین.

## دەستووری حکوومەتی:

دەستووری حکوومەتی یان لەسەر بنچینەی رەوشت و خوو دەستووری کۆمەڵایەتی وەیان لەسەر دەستووری خوایی وەیان لەسەر هەردوو دەستوور دائەمەزرێ. جا کەواتە دەستووری حکوومەتیش پێویستە راگیرێ و نەشکێنرێ.

بەڵام ئەگەر هاتوو دەستووری کۆمەڵایەتی وەیان دەستووری حکوومەتی پێچەوانەی دەستووری خوایی وەستان، تۆ پێویستە دەستووری خوایی راگریت لە پێکهێنانی ئارەزووەکانتا، چونکە لە جیهاندا لە دەستووری خوایی بەولاوە هیچ دەستوورێکی تر ناتوانی پیاو بەرەو کامەرانی بەریت.

## ئەنجامی قسە:

کەواتە تێ گەیشتین کە کامەرانیمان بەوە پێک دیت کە سیانزە ئارەزووەکانی دڵمان بەجێ بهێنین بەو مەرجەی ئەو رێگایانە بگرین بۆ پێکهێنانیان کە لە دەستووری خوایی و حکوومەتی و کۆمەڵایەتی نەچنە دەرەوە. ئێستە ئایا ئەم سیانزە ئارەزوو نەژادانە چین؟... ئارەزووە نەژادەکان ئەمانە:

١- خۆ دوورخستنەوە لەو شتانەی ئازارمان ئەدەن.

٢- بەرەنگاری کردنی ئەو شتانەی کە ئازارمان ئەدەن، یان زیانمان پێ ئەگەیەن.

٣- نواندنی گەورەیی وەک هی دایک و باوک بۆ کوڕ و کچیان وەک هی سەرۆکان بۆ بەر دەستیان.
٤- حەزکردن لە ڕەگەزی تر وەک حەزکردنی پیاو لە ژن، وەهی ژن لە پیاو.
٥- لێ پرسینەوە، لێ کۆڵینەوە، بەدواداگەڕان.
٦- ئارەزووکردنی ملکەچی بۆ ئەوانەی دەسەڵاتیان هەیە وە ترسی ئازاردانیان لێ ئەکرێ، یان هیوای چاکەیان لێ ئەکرێ.
٧- سەرکەوتن، پێشکەوتن، بەسەرا زاڵبوون.
٨- ئارەزووی کۆمەڵایەتی، هاوڕێ دۆزینەوە.
٩- ڕاوکردن، بەدووی ئاندا گەڕان.
١٠- ئارەزووی شت پەیداکردن، شت کۆکردنەوە.
١١- ئارەزووی شت پێکهێنان، شت دامەزراندن، شت دروستکردن.
١٢- ئارەزووی لەشخۆشی، دڵخۆشی، بەزم و ڕەزم.
١٣- ئارەزووی یاریدەدان، یەکگرتن، هاوکاری.

## خوا ڕێمان پێشان ئەدا

جا هەروەکو وتمان بۆ پێکهێنانی ئەم ئارەزووە نەژادانە، هەزاران ڕێگا هەیە کە بیگرین، بەڵام ئەو ڕێگایانە هەموو باش نین. ئەبێ ئەو ڕێگایانە هەڵبژێرین کە باش بن. واتا پێچەوانەی دەستووری خوایی و کۆمەڵایەتی و حکومەتی نەکەین لە پێکهێنانی ئارەزووەکەماندا ئەتوانین بەهۆی بیرەوە خوا بناسین، بەخوا بگەین، وە لەگەڵیا گفتوگۆ بکەین، وەلێ داوای پێشاندانی ڕێگا بکەین بۆ سەرکەوتن و تەندروستی و کامەرانیمان. پێویستە پێڕەوی ئەو ڕێگایانە بکەین کە خوا پێشانمانی ئەدا بۆ پێکهێنانی کامەرانیمان.

چونکە ڕێگای خوایی ڕاستە، دروستە، هەڵە ناکات، وە جێگای باوەڕە کە بەتەواوەتی ئەمانگەیێنێ بەئارەزووی دڵمان، کەواتە بۆ کامەرانیشمان هەر بام ئەم دەستوورە بەرزە پیرۆزە بگرین.

## کامەرانی بەدەست خۆمانە:

کامەرانی بەدەست خۆمانە. چونکە تەنیا خۆمان گەورەی خۆمانین. وە هەموو کەسێکمان دەسەڵاتی تەواومان هەیە کە خۆمان کامەران کەین. چونکە کامەرانیش وەک هەموو شتێکی تر لە ژیاندا لە ئەنجامی پێڕەوی کردنی دەستووری خوایی و تێکۆشینەوە پەیدا ئەبێ. لەبەر ئەوە قەت بڕوا بەوە نەکەی کە خوا تۆی بەکلۆڵی و سەرگەردانی دروست کردبێ. هەرچۆنی بێ بارت، هەر چۆنی بێ نیشتمانت، حکومەتت، دەوروپشتت، ئەتوانی زاڵ بیت بەسەر هەموو گیروگرفتێکی ژیانتا وە بگەی بەکامەرانی. لەبەر ئەوە ئەگەر دڵتەنگییەکت هەیە، بزانە لە چییەوەیە؟ بۆچی پەیدا بووە؟ بێگومان ئەبێ دەستوورێکی خراییت شکاندبێ بۆیەکا ئەو دڵتەنگییەت ڕووی داوە. ئینجا کە هۆی دڵتەنگییەکەی خۆتت دۆزیەوە، خۆتی لێ لادە، بەپێچەوانەی ئەو، پێڕەوی دەستووری خوایی بکە، زۆری پێ ناچێ دڵتەنگییەکەت لە

کۆڵ نەبێتـەوە، وە کـامـەرانی هەست ئەکـەیت خوا پیـاوی بۆ ئەوە دروست نەکـردووە کـە هەمـیـشـە لە گێرەوکێشە و گیروگرفت و دڵتەنگیا بێت. بەڵکو بۆ ئەوەی دروست کردووە کە هەمیشە وەک هەمیشە بەهار لە کـامـەرانیـا گـەش و ڕووخـۆش و شـەنگ و شـۆخ بێ ئەوانەی کـە چەوت ئەڕۆن لە ژیاندا: واتا ئەوانەی دزی و درۆزنی و زۆرداری ئەکەن، هەروەها ئەوانەی تەمـەڵ و تەوەززەل و بێکارەن وە ئەبن بەبار بەسـەر خەڵکەوە، وە ئەوانەی فـەرمـانی خـۆیان بەجێ ناهێنن وە ئەوانەی دەسـتـووری خوایی ئەشـکێنن لە خـواردن و خـواردنەوە و نوستن و هەڵسـان و دانیـشتن و فـەرمـانکردن و بەزم و ڕەزم و کـۆمـەڵایەتی و تەندروستیدا... ئەوانە هەموو دوور ئەبن لە بەختیاری و کامەرانیەوە. جا بۆ ئەمەی بگەیت بەکامەرانی پێویستە دەستوورەکانی خوا کە بۆ هەموو لکێکی ژینی داناوە شارەزابیت وە پێڕەوییان بکەیت.

## بەهەڵەدا نەچیت!!

زۆر کـەس هەیە وا تێ ئەگـەن کـە کـامـەرانی تەنیـا لەوەدایە کـە سـامـان و دەسـەڵات و پایەی بڵند و شتومەکی زۆریان دەستکەوێ. بەڵام ئەوانە بەهەڵەدا چوون. چونکە ئەو شتانە نیوەی کامەرانین. نیوەکەی تری کامـەرانیش پێویسـتـە وەدەست خەن، ئینجا تەواو ئەگـەن بەکامەرانی. ئەو نیوەیەش (کامـەرانیی گیان)یە. بەڵکو ئەتوانم بڵێم (کامەرانیی گیان)ی هەموو کامەرانییە. چونکو (کامەرانیی شتومەکیشن) هەر ئەچیتەوە سەر (کامەرانیی گیان). چونکو پیاو لە ڕاستیا (گیانی)یە. یاخود بەشی گیانی زۆرترە لە بەشی (لەشی)ی.

لەبەر ئەوە قەت بڕوا نەکەیت کە کامەرانیت بەمە پێک بێت کە سامـان و ژن و ماڵ و کۆشکی جوان و دەسـەڵات کـۆکـەیتـەوە. زۆری وا هەن دەوڵەمـەند و پایەبڵند و دەسـەڵاتدارن، کـەچی لەگـەڵ ئەوەشـا زۆر سەرشۆڕ و دڵتەنگن. زۆر لە وەزیر و شاهەنشاهان بەدڵتەنگییەوە ژیانیـان بەسەر بردووە وە لە کامەرانی دووربوون.

## لێم ناپرسی بۆ چ وابوون؟

لەبەر ئەوە وابوون کـە بەتەنیـا بە(کـامـەرانی شـتـومـەک) وازیان هێناوە. هەوڵی دەسـتـکەوتنی (کامەرانیی گیان)یان نەداوە. ئەم کامەرانیی گیانە لەوەوە دەستئەکەوێ کە پیاو لە هەمو وەختێکا وە لە هەمـوو شـوێنێکا وە لە هەمـوو بارێکا، لە هەمـوو ژیانـیا لەسـەر دەسـتـووری خـوایی بڕوات. ئەمـە یەک، دووەم تێکۆشی بەهۆی بیریەوە بگات بەخوا. جا کە گەیشت بەخوا، خوا ئارامێکی گیانی، ئاسایشێکی دڵی پێ ئەبەخشی، وە بەهێمنی وە ئەرمونیانی و بێ دەنگیەوە، بەدڵخۆشی و کامەرانـییەوە ژیان بەسەر ئەبا.

ئەوی کامەرانیی گیـانیی دەستکەوی، ئەوەندە باکی بوون و نەبوونی شتومەکی جیهـانیی نییە. ئەگەر لە ڕێگای سـەربڵندییەوە شـتومەکی جیـهـانیی دەسـتکەوت ئەوا دڵی خۆی پێ خۆش ئەکـات، وە ئەگەر دەستی نەکەوت، لە ڕێگای چەوتەوە بۆی تێ ناکۆشی دەست خۆی خات، وە بەتەنگ ئەوەشەوە نایێ کە دەستی بکەوێ.

پیاوێک کە بوو بەدۆستی خوا و توانیی پێی بکات و لەگەڵیا یەککەوێ، وە هەمیشە لەسەر ڕێگای خوا بڕوات، هەمیشە کامەران ئەبێ، چونکە خراپی لێ ناوەشێتەوە، وەیی بۆ کەس تا بێ، بەپێچەوانەی ئەوە حەز بەچاکەکردن ئەکات لەگەڵ هەموو کەسێکا چونکە هەموو کەسێکی خۆش ئەوێ، بەهەموو جێگایەک دڵی ئەکرێتەوە تەنانەت ئەیەوێ لەگەڵ دوژمنی خۆشیا چاکە بکات. جا ئەو خۆشەویستییە کە تروسکەیەکی چرای خواییە ئەکەوێتە دڵی پیاوەوە و ڕۆشنی ئەکاتەوە ئەبێتە هێزێکی مەزنی گیانی، ئارام ئەبەخشی بەگیان سرەوت ئەدا بەدڵ، وە پیاو تا سەر کامەران ئەکات، هیچ گومان نییە کە هەبوونی خانوویەکی خنجیلانە و خانمێکی جوانکیلانە و ئۆتۆمبیلێکی ناوازە و سامانێکی زۆربە و دەسەڵاتێکی گەورە دڵی پیاو خۆش ئەکا و ئەیخاتە کامەرانییەوە. بەڵام ئەو کامەرانییە تا سەر بۆ پیاو نامێنێ. ئەگەر پیاو فەرمانی خوایی کە لەسەر شانیەتی بەرامبەر ئەو ناز و نیازانە، جێبەجێی نەکات. واتا: تا دڵێکی چاک و ڕەوشتێکی چاک و کردەوەیەکی چاکی خۆیشی نەخاتە گەڕ بەرامبەر خۆی و خزم و کەسوکار و هاونیشتمان و برا دانیشتووەکانی جیهانی، کامەرانییەکەی تەواو نابێ، وە تا سەر نابێ، وە زوو لەناو ئەچێ.

خواناسی، ترس لە دڵی پیاو ئەکاتە دەرەوە. وە دڵی بەهێز ئەکات. ڕەوشت و کردەوەی چاک و چاکەکردن لەگەڵ خەڵک پیاو لە خەڵک و خوا نزیک ئەخەنەوە، پیاو بەهێز ئەکەن. وە چرای خۆشبەختی لە دڵی پیاوا هەڵئەگیرسێنن وە پیاو ئەکەن بە(گەورەی خۆی) و نازداریی خەڵک و خوا... لەبەر ئەوە هیوادارم کە هەموومان بەتەنشت کامەرانیی شتومەکەوە بۆ کامەرانیی گیانیش تێ بکۆشین تا کامەرانییەکەمان تەواو و تا سەر بێ.

## لەنگەری پێشکەوتن(١)

### گیان و لەش

مرۆڤ لە دوو شت دروست بووە: (گیان) و (لەش). هەرچیش لە جیهاندا ئافەریدە بووە لەناو و با و ڕۆژ و ئاگر و گڵ و بەرد و دار و درەخت و دڕندە و پەرندە و مار و مێر و بۆ ژیاندن و گەشەپێکردن و بوژاندنەوەی (گیان) و (لەش) دروست کراوە.

بەڵام ئەگەر هاتوو لە ئەندازە بەدەر (گیان)پەروەر دەکرا، یاخود لە ئەندازە بەدەر (لەش) پەروەردە کرا. ئەوا ئەو لەنگەرەی کە هەیە لە ناوەندی (گیان) و (لەش)دا تێک ئەچی، کە ئەو لەنگەرەش تێکچوو ژیان و نەخۆشییان لە لەش یان لە گیان یان لە هەردووکیان ئەکەوێ... بەکورتی پێشکەوتنی (گیان) و (لەش) ئەبێ شان بەشانی یەکتر بڕۆن. ئەگینا ئەگەر لایەکیان بەرەڵا کرێ و ئەوی تریان خەمخۆریی کرێ، زیان و نەخۆشی بۆ مرۆڤ پەیدا ئەبێ.

---

(١) ڕۆژی نوێ -گ: ژ (٥) س(٢) ئابی ١٩٦١، ل ٦٢ - ٦٩.

## گەشەی گیان

گیان بەوە گەشە ئەکات: خۆشەویستی بکەوێتە دڵەوە. جوانی بکەوێتە بەرچاو ڕەوشت و خووی پەسند و کردەوەی بڵند لە دەست بووەشێنەوە. سرەوت و ئاسایش و چاکە لە نێواندا بێتە بەرهەم.

## گەشەی لەش

لەشیش بەوە گەشە ئەکات: خواردن و خواردنەوەی خۆش و جلوبەرگی نایاب و خانووبەرەی ڕێکوپێک و سرەوت و بەزمورەزم بۆ پیاو پەیدابێ.

## بەراوردێکی جیهان

بەڵام ئەگەر سەیرێکی مێژوویی ژیان بکەین، لە جیهاندا: ئەبینین ئەوەندەی خەمی لەش خوراوە، هێندە خەمی گیان نەخوراوە. بەواتایەکی تر ئەوەندەی زانست و پیشەسازیی و شارستانێتی پێش خراوە، هێندە کردەوەی بڵند و ڕەوشت و خوی پەسەند و گیانی مرۆڤایەتی پێش نەخراوە.

لەبەر ئەوە بەجۆرێکی تێکرایی ئەبینین کە مرۆڤ لە جیهاندا لە شارستانێتیدا زۆر پێشکەوتووە، بەڵام لە مرۆڤایەتیدا پێش نەکەوتووە، بەڵکو زۆر دواکەوتووە! پوولپەرستی، ئەمرۆ گەیشتۆتە ڕادەیەک. زۆربەی فەرمانڕەوایانی جیهان کەوتوونەتە ژێر چنگی سەرمایەدارانەوە. بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان فەرمانڕەوایانی جیهان ئەکەن بەگژ یەکا، بەملیۆن مرۆڤ بەکوشت ئەدەن، بەهەزاران دێهات و شاران وێران ئەکەن، دوژمنایەتی و نەخۆشی و خەفەتباریی ئەخەنە ناو گەلانی جیهانەوە کە تا سەر نەکوژێتەوە.

مەیدانی شەڕی ناولەشکرانی جاران کە لە چەند کیلۆمەترێک تێپەڕی نەئەکرد ئێستا لە هەزاران کیلۆمەترە تێپەڕ ئەکات، کوشتاری جەنگی جاران کە لە چەند هەزار کەسێک زۆرتر نەئەبوو، کوشتاری جەنگی ئێستا لە دەیان ملیۆن پتر ئەبێ.

ئەگەر بهاتایە ئەو پارەیەی لە پێناوی جەنگا بەخت ئەکرا، لە پێناوی ئاوەدانکردنەوەی دێهات و شاران و نەهێشتنی هەژاریی و نەخۆشی و نەخوێندەواریدا بەخت کرایە، ئێستاکە لە هەموو سەرزەمینا وێرانی و نەخۆشی و نەخوێندەواریی بەرچاو نەئەکەوتن.

جاران کە درۆزن لە ڕووی ئەئەهات لە کون سەردەرهێنی، ئێستاکە درۆزنی و فروفێڵکردن و چەواشەکردن بوون بەهونەرمەندیی، نەک تەنها تاک و تەرای مرۆڤ، بەڵکو فەرمانڕەوایانیش بەڕادیۆ درۆودەلەسە و تەڵەکەبازیی و چاوورواو و بڵاو ئەکەنەوە.

بەکورتی بازاڕی خواناسی و ڕاستی و دروستی و جوامێریی لە زۆر بەشی جیهاندا کەوتۆتە کزی. داخەکەم نە فڕۆک نە تەلەفزیۆن نە ڕادیۆ نە ئەم تانک و تۆپ و شەستتیرانە، نە ئەم هەموو خوێندنگا و خەستەخانە و کۆشک و تەلارە باشانە. نە ئەم هەموو هێز و سامان و هونەرانە، نەیانتوانیوە مرۆڤایەتی بخەنە سرەوت و ئاسایش و کامەرانیەوە.

جیهان بەپرتاو بەرەو دوژمنایەتی و شەڕ و شۆڕ و جوێن و خوێن و وێرانی و نەخۆشی و شپرزەیەتی

ئەڕوا. ئەمەیش هەمووی لەبەر ئەوەیە کە لەنگەری ناوەند (لەش) و (گیان) یاخود (خۆپەرستی) و (خواپەرستی) تێک چووە. هەمووی لەبەر ئەوەیە شان بەشانی شارستانێتی مرۆڤایەتی پێش ناخرێ، ئەوەندەی خەمی لەشمان ئەخۆین خەمی گیانمان ناخۆین. داخەکەم جیهان لە شەڕێکی خوێنیندا ئەبینم، کە هەتا هەتایە ئەنجامی کارەساتی پڕ سزا و ئازار و ناخۆشیمان لە بیر نەچێتەوە.

## پێشکەوتنی ڕاستەقینە

پێشکەوتنی ڕاستەقینە ئەوەیە: هەموو گەلێک بەدڵی خۆی ئازاد و سەربەخۆبێ. نە زۆردار و داگیرکەر بمێنێ. نە زۆرلێکراو و داگیرکراو بمێنێ... پێشکەوتنی ڕاستەقینە ئەوەیە: ئاسایش و ئارام و ئاشتیی گشتی لە جیهاندا جێگیربێ. نە دوژمنایەتی بمێنێ لەناو گەلاندا، نە ڕقەبەریی، نە شەڕ و شۆڕ بمێنێ. نە جوێن و خوێن.

پێشکەوتنی ڕاستەقینە ئەوەیە: پەیوەندیی ناو گەلان لەسەر بنچینەی خۆشەویستی و دۆستایەتی و برایەتی و یارمەتیدان یەکتری دابمەزرێ.

پێشکەوتنی ڕاستەقینە ئەوەیە: فەرمانڕەوا پێگەیشتووە گەورە بەهێزەکان دەستی برایەتی و یارمەتی درێژکەن بۆ گەلە زۆرلێکراوەکان، لە دەست دیلی ڕزگاریان کەن. هەژاریی و نەخوێندەواریی و دەردەدارییان لە کۆڵ بخەنەوە.

پێشکەوتنی ڕاستەقینە ئەوەیە: هۆشمان زاڵبێ بەسەر دڵماندا، خوا ناسی و کردەوەی چاک و ڕەوشتی بڵند و دڵی پاک لە سەروی هەموو شتێکی جیهانییەوە دانێین؛ وازبهێنین لە خۆپەرستی، لە تەنپەرستی، لە پولپەرستی، هۆگری مرۆڤپەرستی بین، وە لەگەڵ هەموو براکانی سەرزەمینماندا ڕەنج بدەین بۆ کەلک و کامەرانیی گشتی.

## دەستووری خوایی

خوا بەخۆڕایی ئێمەی دروست نەکردووە. ئەم بەهەشتی سەر زەمینە و ئەم ئاسمانە شینە ڕەنگینە ئەو ڕۆژە و ئەستێرە جوانانەی بۆ ژیان و کامەرانی و سەربەرزیی ئێمەی دروست کردووە. خوا بۆیەکی ئافەریدە نەکردوین کە تا سەر لە دیلی و بەندەیی و ئازار و هاوارو و نەخۆشی و هەژاریدا بتلێینەوە؛ بۆیەکی دروست کردووین بەهۆی ئەو زەمین و ئاسمانەوە ژیانێکی زۆر بڵندی پەسەندی پڕ کامەرانی بژین. بۆیەکی دروست کردووین کە لە دڕندەیەتییەوە بگەینە پایەی فریشتەیی لە ڕەوشت و خووی پاک و جوان و کردەوەی بەرزا.

بۆ ئەمەی بشگەین بەم ئامانجە پیرۆز و بڵندە. بەهۆی پێغەمبەران و پیاوچاکانەوە دەستوورێکی خوایی پێشان داوین، ئەم دەستوورە فەرمانڕەوایە بەسەر ئێمە و بەسەر هەموو گیانلەبەر و داردرەخت و ئاو و بەردێکا. ئەم دەستوورە ئاشکرا و ئاسان و ڕاست و ڕەوانە. لە خۆیەوە فەرمانڕەوایی ئەکات، هەر کەس پێڕەوی بکات سەر ئەکەوێ لە ژیانیا. هەر کەس پێڕەوی نەکات ژێرئەکەوێ.

ئێمە ناتوانین لەم دەستوورە لادەین. ئێمە ناتوانین بەرەنگاریی ئەم دەستوورە بکەین، ئەگەر کردمان

تووشی سەرگەردانی و هەژاریی و نەخۆشی و دیلی و خەفەتباریی ئەبین.

جا ئەم هەموو شەڕ و شۆڕی جیهانە، ئەم هەموو سەرگەردانی و ناخۆشییەی لەناومان دایە، هەمووی لەوەوە پەیدا ئەبێ کە پێڕەویی ئەم دەستووری خواییە ناکەین.

ئەم دەستوورە داوامان لێ ئەکات سەر ڕاست و کار دروست و دادپەروەر بین. ئەم دەستوورە داوامان لێ ئەکات لەگەڵ یەکا خۆشەویستی و برایەتی و یارمەتی بکەین، هەروەها تێکۆشین بۆ کەڵکی گشتی.

ئەم دەستوورە داوای ڕەوشت و خوی پاک و پوختە و کردەوەی مەردانەمان لێ ئەکات. نایەوێ، ئەم دەستوورە، خۆپەرست و پوولپەرست و بەدخوو زیانبەخش بین. نایەوێ، ئەم دەستوورە، قین لە دڵ و بەدگۆ و لەگەڵ یەکا دوژمن بین، نایەوێ زۆرداری بکەین؛ بەکورتی ئەم دەستوورە پشتیوانمانە لە چاکەکردندا، دوژمنمانە لە خراپەکردندا. کەی دانیشتووانی سەر زەمین پەیڕەوی ئەم دەستوورەیان کرد. زۆری پێ ناچێ خۆشەویستی و ئاشتی و ئاسایش هەموو جیهان ئەگرێتەوە، زۆری پێ ناچێ تەندروستی و خوێندەواری و دەوڵەمەندی و ئازادی و کامەرانی هەموو دانیشتوانی ڕووی زەمین ئەگرێتەوە.

نە زۆرداریی ئەمینێ. نە داگیرکردن ئەمینێ. نە شەڕ و شۆڕ ئەمینێ. نە جوێن و خوێن ئەمینێ. نە شپرزەیی و سەرگەردانی و هەژاریی ئەمینێ. نە نەخۆشی و نە خوێندەواریی ئەمینێ.

جیهان وەک خانوویەکی لێدێ ئاوەدان و پێشکەوتوو، دانیشتوانی جیهانیش وەک خێزانێکی لێ دێ، کامەران و سەرکەوتوو.

## تروسکەی هیوا

کاکەی خوێندەوار! ڕەنگە زۆر بەڕیشی من پێبکەنی کە ئەم قسانەت بۆ ئەکەم، بەڵام لە خوام ئەوێ تەمەنی تۆ و من ئەمەندە درێژبێ کە ڕۆژێ لە ڕۆژان پێت بڵێم: ئەوا ئاواتەکانم هاتنە دێ!.

ئەمە ڕاستە، هەروەکو لە پێشەوە گوتم جیهان ئەمڕۆ بەرەو جەنگێکی خوێنینی سامناک ئەڕوات؛ بەهۆی خۆپەرستی و دڵڕەقی و کەمتەرخەمی هەندێ لە کاربەدەستانی جیهانەوە، بەڵام زۆر دڵنیام کە سەرئەنجامی ئەو جەنگە خوێنینە ئەمەندە ئازار و زیانمان، پێ ئەگەیەنێت، وریامان ئەکاتەوە لە هەڵەکانمان، پەشیمانمان ئەکاتەوە لە کردەوە خراپەکانمان. ڕوومان وەرئەگێڕێتەوە بۆ خوای پاکی بێ هاوتا، داوای پێشاندانی ڕێگای ڕزگاری لێ ئەکەین لە زۆرداریی و هەژاریی و نەخوێندەواریی و دەردەداریی، ئەویش لە ڕێگای بیرەوە پێمان ئەڵێ: «ڕێگاتان دەستووری خواییە، دەستووری دۆستی و ئاشتی و ئاسایش. دەستووری ڕەوشتی بەرز و کرداری بڵند، دەستووری چاکی و دادپەروەریی».

## لەنگەری پێشکەوتن

دڵنیام ئەو پێشکەوتنەی هەیە لە جیهاندا لە زانست و پیشەسازی و هونەردا، واتا لە شارستانێتیدا، دانیشتوانی سەرزەمین بەرەو سەرگەردانی و کەساسی و دیلی ئەبات، ئەگەر بێتو (لەنگەر)ێ نەگری بەپێڕەوی کردنی (دەستووری خوایی)، لەلایەن کاربەدەستانی جیهانەوە، بەواتەیەکی تر هەر تەنگ و

چەڵەمە و گیروگرفت و جەنگ کارەساتێکی ناخۆش لەمەولا روودەدات لە جیهاندا تۆباڵی بەئەستۆی کاربەدەستانی جیهانە!

ئەم قسەیەی ئەیکەم، راست و رەوان، ئاوازی دەروونی زامداری هەزاران هەزارانی گەلە کڵۆڵە سەرگەردانە هەژارەکانی سەر زەمینە دڵسۆزی راستەقینە بن بۆ گەلەکانی خۆیان، کە هەریەکە ئەندامێکن لە لەشی گشت دانیشتوانی سەرزەمین، ئەگەر دڵسۆزی راستەقینە بن بۆ پێشکەوتنی راستەقینەی هەموومان، ئەبێ گەلەکانی خۆیان تێ بگەیەنن کە؛ شەڕ و شۆڕ و دوژمنایەتی باوی نەماوە.

ئەبێ ئەو کۆشکە گەورانەی بۆ هەڵگرتنی تانک و تۆپ و فیشەک و تفەنگ و بۆمبای ئەتۆم دروستیان ئەکەن. بەکاریان بهێنن بۆ هەڵگرتنی داوودەرمان و بۆ کوشتنی مار و مێروو و میکرۆب و ئەو دڕندانەی کە کشتوکاڵی دانیشتوانی سەرزەمین ئەخۆن.

ئەو لەشکرانەی بەکلۆر دیناریان تیا سەرف ئەکرێ، لە بریتی کوشتار پێکردنیان بەرامبەر براکانی سەر زەمینیان ئەبێ بەکاربهێنرێن بۆ بەختکردنی رێگاوبان دروستکردنی ساختمان، بۆ خوێندنگا و خەستەخانەکان، بۆ بەرهەمهێنانی دانەوێڵە و سەوزەوات و میوەهات بۆ خورشتی هەژاران.

ئەبێ ئەو پارەیەی بەخت ئەکرێ لە جەنگ و شەڕ و شۆڕا بۆ لەناوبردنی برایانی سەر زەمین و کاولکردنی دێهات و شاران. بەختکرێ بۆ نەهێشتنی هەژاریی و نەخۆشی و نەخوێندەواریی لەناو گەلە دواکەوتووەکانی سەر زەمینا.

ئەبێ ئەو فڕوفێڵەی بەکارئەهێنرێن بۆ لەناوبردنی براکانی سەر زەمینیان، بەکاربهێنرێن بۆ ئازادکردنی گەلە زۆرلێکراوەکانی سەرزەمین و رزگارکردنیان لەدەست زۆردارە داگیرکەرە خوێنمژەکانیان.

بەڵێ (لەنگەری پێشکەوتن) بەهیچ شتێک ناگیرێ، بەپێڕەویی کردنی (دەستووری خوایی) نەبێ کە بریتییە لە خۆشەویستی و برایەتی و یارمەتی و چاکەکردن بەرامبەر هەموو دانیشتوانی سەر زەمین، کە ئەمەش لە پێش هەموو کەسێکا پێویستی سەرشانی کاربەدەستەکانی جیهانە.

## کوردستانی خوێنین

کوردستانی خوێنینیش کە پارچەیەکە لە بەهەشتەکانی رووی زەمین. ئەبو ئەو پانزە ملیۆن کوردەی تیایەتی لەوپەڕی ئازادی و کامەرانیدا بژین. بەڵام داخەکەم لەوپەڕی کلۆڵی و سەرگەردانیدا، لەوپەڕی نەخوێندەواری و هەژاری و دەردەداریدا ئەژین!

دوژمنەکانمان چەقۆیان بۆ ملمان ئامادە کردووە، هەر رۆژە ئازادیەکمان لە دەست ئەچێ، هەر رۆژە کارەساتێکی پڕ لە ئازار و هاوارمان لێ روونەدا.

لەلایەکەوە زۆرداران و داگیرکەرانی دەرەوە، لەلایەکیشەوە زۆرداران و ستەمکارانی ناوەوە رەگ و ریشەی ژیان و کامەرانیمان لەبن دەردەکێشن، ناکۆکی و دوژمنایەتی شار و دێهاتەکانی کاول کردووە، تروسکەی خۆشی لە دڵماندا نەهێشتووە.

ئا لەم کاتە ناسک و گرنگەماندا هیچ داڵدەیەکمان نییە پەنای بەرینە بەر خوا نەبێ. تەنیا پەیڕەوی کردنی (دەستووری خوایی)یە کە ڕزگارمان کات لە دەس زۆرداریی و هەژاریی و نەخۆشی و نەخوێندەواریی.

ئەی کاربەدەستانی جیهان! ئێبالّمان بەئەستۆتان، گەلی کوردیش وەک گەلی خۆتان تەماشاکەن. لە دۆستایەتیمان کەڵک وەرئەگرن نەک لە دوژمنایەتیمان.

## ئاوات[1]

ڕاست ئەکەیت ئەی دڵ!... شەوەکەی تاریک و توونەکە. ڕەشەبا و بەفر و باران، داروپەردوی داوە بەیەکا.

لێرە تەقە و ڕەقەیە، لەولا وژە وژی با و خورە خوری چۆڕاوگەی بارانە، لەم لاوە: دڵۆپەیە تکەتک نەکات. ناو ژوورەکانی هەموو تەڕ کردووە، بۆ دانیشتن جێگای نەهێشتۆتەوە.

لەولاوە گوێسوانەیە: ئەڕوخێ. سەربانە: ئەتەپێ. زێرابە: ئەتەقێ. خانوو ڕێگایە پڕ بوون لە ئاوی لافاو.

هەر خەڵکە و ئەخنکێ. خێزانە و دەرئەپەڕێ. شتومەکە و ئاو ئەیبا.

لە هەموو لایەکەوە. دەنگە دەنگە، زریکەیە. شین و گرینە قوڕپێوانە، ئازار و هاوارە، تریشقەیە، گرمە گرمە، بروسکەیە، شریخەیە... لەگەڵ ئەمانەشا، هەموو، ئەی دڵ!... مەڕەنجێ!.

هیوات بەخوابێ، بەسەر ئەم گیروگرفتەشا زاڵ ئەبین.

زۆری پێ ناچێ: شەوگار بەسەر ئەچێ، لافاو ئەگیرسێتەوە، ئاسمان ڕۆشن ئەبێتەوە، ڕۆژ دەرئەکەوێتەوە، دەماری مەردایەتیمان ئەبزوێتەوە، هەرەوەز ئەکەینەوە، پیتاکیش کۆ ئەکەیتەوە، دەستی هەژاران و بێچاران و بیمارانیش ئەگرینەوە.

ئینجا کڵپەی دەروون دائەمرکێتەوە.

فرمێسکی چاو وشک ئەبێتەوە.

برینی دڵ سارێژ ئەبێتەوە.

هێز و تین بۆ لەش و هۆش تازە ئەبێتەوە

نیشتمانەکەمان ئاوەدان ئەبێتەوە.

بەم کۆشش و ئەنجامەمان سەری گەل بڵند ئەبێتەوە جا هیوات بەخوابێ ئەی دڵ. وەڕس نەبیت. بەئاوات ئەگەین.

***

---

(١) ڕۆژی نوێ - گ: ژ (١١) س(١) شوباتی ١٩٦١، ل ١٩-٢٥.

ڕاست ئەکەیت ئەی دڵ! ئەو جێگایەی بۆی ئەچین دوورە. ئەو ڕێگایەی پیانەڕۆین؛ درێژە، هەوراز و نشێوە، سەخت و ڕەقەنە، پڕە لە کەند و کۆسپ و دڕک و داڵ، پڕە لە گڵ و بەرد و قوڕ و لیتە، تەسک و تروسکە، خێچ و خوارە.

دز و ڕێگریش سەرلوتکەی شاخەکانی لێ گرتووین، ڕووتمان ئەکەنەوە، گروتاوی خۆریش؛ ئەمان برژێنێ، ئەمان پروکێنێ، شپرزەمان ئەکات.

گێژەڵوکە و تەپ و تۆز و ڕەشەبایش؛ ئەوەندەی تر سەرمان لێ ئەشێوێنێ، تینوێتی زمانی شکاندووین، لەم دەشت و بیابانە چۆڵ و هۆڵەدا، لەو شاخ و کێوە سەخت و سامناکەدا، ئاومان دەسناکەوێ، نامان دەس ناکەوێ، دەنگمان بەخوا دانەبێ، بەکەسدا ناگات.

بەڵام لەگەڵ ئەمانەشا هەموو، ئەی دڵ مەڕەنجێ. هیوات بەخوابێ، بەسەر ئەم گیروگرفتەشا زاڵ ئەبین.

ها! گوێم لە زەنگی کاروانێکە لە پێشمانەوەیە، ئەڕوا، چاوم لە سێ کاروانی تریشە، یەک لە دوای یەکەوە بەدوامانەوەن.

زۆری پێ ناچێ؛ ئەگەین بەو کاروانەی لە پێشمانەوەیە.

زۆری پێ ناچێ؛ ئەو سێ کاروانەی تریش پێمان ئەگەن.

ئینجا هەموو یەک ئەگرین.

بۆ یارمەتیدانی یەکتریش دەست درێژ ئەکەین.

ڕێگاکەمان پان و تەخت و ئاسان ئەکەین.

تێنوێتیمان ئەشکێ

برسێتیمان لێ لائەچێ... ماندوومان ئەحەسێتەوە، ئینجا هێواش هێواش، لەسەرخۆ ڕێگا ئەگرینە بەر و بەرامبەر ئامانجمان ئەڕۆین، دز و ڕێگریش تەفروتونا ئەکەین. ئینجا ئەگەینە هاوینەهەوار. جێگای سرەوت. جێگای خۆشی و ئازادیمان.

لەوێ سەری سەربەستی و بەرزی گشتیمان بڵند ئەکەینەوە.

جا هیوات بەخوابێ ئەی دڵ. وەڕس نەبیت! بەئاوات ئەگەین.

***

ڕاست ئەکەیت ئەی دڵ!. دوژمنەکانمان؛ زۆرن، هەر چوار لایان لێ گرتووین. دوژمنەکانمان؛ خوێن خوارن، سامناکن، بەچنگن، دڕندەن، دوژمنەکانمان؛ لە پەنادا خۆیان شاردۆتەوە، تا لە پڕ پەلامارمان بدەن و لەناومان بەرن.

ڕاست ئەکەیت، دوژمنەکانمان؛ بەهێزن، خوانەناسن، هەموو خراپەیەکیان لێ ئەوەشێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشا، هەموو، ئەی دڵ مەڕەنجێ، هیوات بەخوابێ، بەسەر ئەم گیروگرفتەشا زاڵ ئەبین. زۆری پێ ناچێ؛ وریا ئەبینەوە، ڕوو ئەکەینەوە خوا و ڕێگای چاکی ئەگرینەوە. دڵمان بەیەک ئەسووتێتەوە، هۆگر ئەبینەوە، بۆ کەڵکی گشت لاییش کۆشش ئەکەینەوە.

خوێندەوارەکانمان؛ خۆیان تەرخان ئەکەن، ناشیبەکانمان پێ بگەیەنن.

پزیشکەکانمان؛ خۆیان تەرخان ئەکەن، نەخۆشەکانمان چاک بکەنەوە.

دەوڵەمەندەکانمان؛ خۆیان تەرخان ئەکەن، کار و فەرمان بۆ هەژارەکانمان بدۆزنەوە، دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەنەوە.

جەنگاوەرەکانمان؛ خۆیان تەرخان ئەکەن، بەروبوومی باش و پوختە و هەرزانمان بۆ ئامادە بکەن.

پیشەوەرەکانمان؛ خۆیان تەرخان ئەکەن، دەستکردی پێویستمان بەچاکی و جوانی و هەرزانییەوە بۆ دروست بکەن.

بوێژ و وێژەوان و خواناس و هونەرمەند و زاناکانیشمان؛ خۆیان تەرخان ئەکەن، ئامۆژگاریمان بکەن، وریامان بکەنەوە، پێشڕەویمان بکەن بۆ ژینێکی پڕ چاکی و خۆشەویستی و شادمانی و ئازادیی.

ئینجا کۆششی هەموو لایەکمان یەک ئەگرێتەوە... ئەبینەوە بەگەلێکی یەک دڵ و یەک زوبان... ئەبینەوە بەگەلێکی پێ گەیشتوو، ئەبینە نەتەوەیەکی ئازاد لە هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواریی.

ئینجا بەم چەکە بەهێزە تازەیەمانەوە. بەرەنگاریی دوژمن ئەکەینەوە، وازیشی لێ ناهێنین تا تەفروتونای ئەکەین!

کەواتە هیوات بەخوابێ ئەی دڵ... وەڕس نەبیت، هەر بەئاوات ئەگەین!.

***

ڕاست ئەکەیت ئەی دڵ... کوردستان ئەو بەهەشتە نازەنینەی گەلی کوردە، لەت لەت کراوە، بەش بەش کراوە لەناو دوژمناندا... پڕ بووە لەوێرانە... پڕ بووە لە کەلاوە... پڕ بووە لە قەل و داڵ؛ پڕ بووە لە گورگ و چەقەڵ.

سامانی گشتی بەدەست دوژمنەوەیە، بلاوی ئەکاتەوە، بەئارەزووی خۆی!. کوردەوارییەکەش هەر کلۆڵی بۆ ماوەتەوە و شپرزەیی و سەرگەردانی... لە هەژاری و نەخوێندەواری و دەردەداریدا ناوبانگی دەرکردووە، گەیشتۆتە ئەوپەڕی!.

ڕاست ئەکەیت ئەی دڵ... ئێمە زۆر پاشکەوتووین، پەنجەی دوژمن بۆ لەناوبردنمان لە کاردایە، لە هەزاران سالاوە. خۆپەرستی و دوودڵی و دووبەرەکیش کۆمەڵی کوردەواری لەت و پەت کردووە. دای ڕزاندووە، وەختە بڵێم لە کەلکی ژیانی خستووە.

لەگەڵ ئەمانەشا هەموو. ئەی دڵ مەڕەنجێ، هیوات بەخوابێ، بەسەر ئەم گیروگرفتەشا زاڵ ئەبین.

زۆربەی گەلانی جیهان؛ ئەم بارەی ئێمەیان بەسەرا هاتووە. بەم دەردەی ئێمە گەیشتوون لەم ڕێگایەوە تێپەڕیون. بەلام لە پڕ ڕاپەڕیون و وریا بوونەتەوە! ڕوویان کردۆتە خوا و ڕێگای چاکەیان گرتۆتەبەر.

پیاوی گەورە و هەڵکەوتوویان تیا پەیدا بووە؛ خاوەنی بیروباوەڕی بەهێز و کرداری بلند، خاوەنی دڵی پاک و فراوانی پڕ لە خۆشەویستی گشتی... خۆیان تەرخان کردووە؛ بۆ ڕزگارکردنی گەلەکەیان لە دەست زۆرداری و هەژاری و نەخوێندەواری و دەردەداری!

بۆ پێشخستنی گەلەکەیان، بۆ ئاوەدانکردنەوەی نیشتمانەکەیان رەنجیان داوە و خۆیان ماندوو کردووە، کۆمەڵیان پێک هێناوە و گەلەکەی خۆیان خستۆتە سەر رێگای یەکبوون و یارمەتیدان و چاکەی گشتی، دوایی بەئامانجی خۆیان گەیشتوون؛ نیشتمان ئازاد بووە و گەلیش کامەران.

ئێمەش، گەلی کورد، ئەی دڵ، لەو گەلانە کەمتر نین، مێژوویەکی زۆر کۆن و پاک و روناک و پڕ لە چاکی و بڵندیان هەیە؛ نەک تەنیا کەڵکمان بۆ خۆمان بووە، کەڵکمان بۆ هەموو جیهانیش بووە. لە کۆڕی نیشتمانپەروەری و زانست و وێژە و هونەردا، لە کۆڕی جیهانپەروەریدا پیاوی کەڵەکەڵەمان پێ گەیاندووە، کە هەموو جیهان ئێستایش کرنۆشی نەوازشیان بۆ ئەکێشن.

نیشتمانێکی وەک بەهەشتمان هەیە، جوان و رازاوە، پڕ پیت و فەڕ، ئێمەیش ئەتوانین، ئەی دڵ، وەک ئەو گەلانە بکەین کە وەک ئێستای ئێمە بوون پاشان خۆیان رزگار کردووە.

ئەتوانین رووبکەینە خوا و لە رێگای چاکە لانەدەین. ئەتوانین مەردانە تێبکۆشین بۆ پێگەیاندنی خۆمان!

بۆ نەهێشتنی هۆی هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی.

ئەتوانین؛ ئەو رێگایە هەندێکیمان لێ بڕیوە، تەواوی بکەین. ئەتوانین بگەین بەئامانجی هەزار ساڵەمان، کوردەواریەکی ئازاد و کوردستانێکی ئاوەدان پێک بهێنین.

ئەمە راستە، لە ئەنجامی خەباتی دوور و درێژماندا، تووشی گەلێک بەسەرهاتی سامناک و خوێناوی بووین. ئەمە راستە هێشتا بەئامانجی خۆمان نەگەیشتووین، بەڵام بڕوات بێ، ئەی دڵ، بەرەو ئامانجمان زۆر نزیک بووینەتەوە.

بیروباوەڕی پۆڵاینی کوردایەتیمان، هێشتا لە دڵ و هۆشماندایە، بەهێز و هەرەتەوە ئەجووڵێتەوە. گیانی بەرزی کوردایەتیمان بەتوندیەوە خەبات ئەکات و ئەنەڕێنێ ئەڵێ: ئەی دوژمنانی چاکی و ئاشتی و ئازادی، رێژگاو مەبن کورد نەمردووە، کوردیش نامرێ! چونکە لە بەختکردنی سەر و سامان و چوونە ناو زیندان چاوی ناترسێ! مژدەتان ئەدەینێ، سەرئەکەوین بەسەرتاندا، چونکە لە راستی و دروستی و دادپەروەریی لانادەین... هەر ئەشگەین بەئامانج.

ئامانجی ئازادی. کەواتە هیوات بەخوابێ، ئەی دڵ، وەڕس نەبیت، هەر بەئاوات ئەگەین!.

## جوانی[1]

جوانی لە بەژن و باڵا و لەش و لاری ڕێک و پێک دایە. جوانی لە بیری ڕۆشن و هەستی بڵند و کردەوەی شیرین دایە.

جوانی لە ئاشتی دایە، لە خۆشەویستی دایە، لە برایەتی دایە، لە یەکێتی دایە، لە یارمەتی دایە.

جوانی لە خەبات و کۆششی گشت لایی دایە، بۆ بەرەنگاری کردنی زۆرداریی بۆ نەهێشتنی هەژاریی و نەخۆشی و نەخوێندەواریی، بۆ ئازادکردنی کوردان، بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان. بۆ یاریدەدانی داماوانی جیهان.

جوانی لەو گەورەیە دایە کە خەمی بچووک نەخوات، لەو بیروهۆشەدایە کە چارەسەری گیروگرفت نەکات، لەو هێزە دایە کە پارێزگاری دادپەروەری نەکات، لەو خوێندەواریە دایە کە نەخوێندەواری لانەبات. لەو سامانە دایە کە هەژاری لەناو نەبات، لەو پزیشکایەتیە دایە کە نەخۆشی چار نەکات.

جوانی لەو دڵ تەڕیە دایە کە ژیانی هەموان پڕ لە ساز و ئاواز و بەزم و ڕەزم و شادمانی نەکات.

جوانی لە سروشتی ڕەنگاوڕەنگ و پڕ پیت و فەڕەدایە لەگەڵ نەوەی ئادەم دا کە هونەرمەندی خوای پاکی بێ هاوتا دەرئەخەن.

کوا ئەو ڕۆژەی جوانی لە جیهانپەروەری دانیشتوانی جیهاندا ببینم؛ دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ کەن، کوردەواریەکی ئازاد و پێشکەوتوو، کوردستانێکی ڕازاوە و ئاوەدان پێک بهێنن تا ئێمە ببینە ئەندامێکی بەهێز و بەکەڵک و دەستی یارمەتی درێژ کەین بۆ ئەو گەلانەی لە کورد کاولترن و نیشتمانەکەیان لە کوردستان کاولترە.

---

(١) ڕۆژی نوێ - گ: ژ (١٢) س(١) مارتی ١٩٦١، ل١٩.

## شیعر

### شاکر فەتاحی شاعیر

هەروەک مامۆستا خۆی بۆمان باس دەکات؛ «... هەتا ئێستاش لەبیرم دێ کە لە تەمەنی ١٢ ساڵاندا بووم خۆشخوانیم هەڵبەستووە. بەڵام گێرە و کێشەی گەردوون هەروەکو لە شتی کەی کردم لەویشی دەستخەرۆ کردم، فڕێم دایە ئەولاوە...».

لەناو دەستنووسەکانیدا دەفتەرێکی ڕێکوپێک بەناوی (خۆشخوانی)یەوە بەخەتێکی جوان نووسراوەتەوە (هەڵبەستی شاکر فەتاح -لە قوتابیانی سانەوی مەرکەزیی بەغدا- کووزی چوارەم ١٩٢١). کە تایبەتە بەکۆمەڵە شیعر و هەڵبەستێکی خۆی لەگەڵ پێشەکییەک.

لەمەوە دەردەکەوێ کە ئەویش وەک زۆربەی نووسەر و ئەدیبانمان سەرەتا بەشیعر دەستی داوەتێ و باوکیشی لەم بوارەدە هاندەرێکی چاکی بووە، لەو بڕوایەیەوە کە: «زۆر جار پێم دەڵێ: حەڵێک زمانت دەکرێتەوە. فێری خۆشخوانی وتن دەبی، کە کۆمەڵێکی گەورە خۆشخوانی کوردی و هیتر لەبەر بکەی بەرەنگێ تێیان گەیشتبی!»

جا بەپێی ئەو گەڕانە بەدوای هەڵبەستەکانیدا، دەردەکەوێ مامۆستا لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٣١ەوە کانی شیعر وتنی تەقیوەتەوە و کۆمەڵێ شیعری لە بابەتەکانی: دڵداری، نیشتمانی، کۆمەڵایەتیدا هۆنیوەتەوە و زۆربەشیانی پاراستوون و وەک ئەولنەی پێشوو و کاتی مێرد منالی، تووڕی هەڵنەداونەتە ئەولاوە! جگە لەمە لە یادنامەی ساڵی ١٩٣١یدا بەشێکی تەرخان کردووە بۆ شیعر و باسکردنی خۆی لەگەڵ شیعر وتندا.

لە ڕاستیشدا بابەتی شیعرەکانی لە دەروونی لاوێکی دڵسۆزی بەئەمەکەوە بەرامبەر نەتەوەکەی هەستاوە و سەریان کردووە، وشەکانی کوردیەکی ڕەوانی سادە، زۆر هەوڵی داوە وشەی بیانی تیا بەکار نەهێنێ، جاری واش هەیە وەک تێبینی لە پەراوێزی شیعرەکەدا نووسیویە:

هەروەک لە (کوردستان - ٤ مارتی ١٩٣١)دا نووسیویە: لەم ١٥ کەرتەدا ١٦ پیتی بێگانەی تیایە، ئەمەش لە ڕاستیدا زۆر بەناشرینی دەزانم، چونکە شت کە کوردی بوو دەشێ لە هەموویدا کوردی بێ، کەچی ئەمە هیچ نایەتە بەرچاو بوێژەکانی کورد، بەڵکو تورک و عەجەمیش بەزمانی خۆیان...

وە لە شیعرێکیدا کە بۆ عەلی عارف ئاغای شاعیری ناردووە، لە پەراوێزیدا دەڵێ: «ئەم قسانەی هیچی بێگانە تیا نییە، هەمووی کوردی پەتییە.»

لەو سەرەتای نووسینەیەوە ویستوویە ڕێبازێکی نوێ لە هۆنینەوەدا بگرێ و خۆی دەرباز کات لە شێوە تەقلیدییەکەی شاعیرانی تر کە پابەندی کێش و سەروا و بەحرە شیعریە بیانییەکان دەبوون، وا بزانم ئەم کارەی هاوزەمانبووە لەگەڵ تەقەللاکانی: ئەورەحمان بەگی نفوس و شێخ نوری شێخ سالح و گۆراندا، بەڵام داخەکەم مامۆستا نەبەردەوام بوو لە وتنی شیعردا و نە تاسەر شیعری وت، من بزانم لە سەرەتای پەنجاکانەوە، ئەو تاکوتەرایەی کە ناو بەناو دەیوت، ئەوەشی نەما. بڕوانە لە نامەیەکیدا بۆ کاک: س.ع.

شادمان (شێخ سەعید شێخ عەلی) دەڵێ: «هەر چەندە من خۆم بەبوێژ -شاعیر- نازانم... هەڵبەستی تازەم نییە، ئەگەر خۆتان لە نووسراوەکانم -پرشنگ، ئافرەتی کورد- یاخود گۆڤاری نەورۆز -ژمارەی یەکەم- هەڵبژێرن پێم باشترە.) بەرواری ئەو نامەیە: ١٩٦٠/٢/٢٤ کە کاک شێخ سەعید بەسوپاسەوە بەفۆتۆکراوی دایمێ.

جا لەوە دواشی مەگەر ئەو یەک دوو پارچەی وتبێ و ئێستا دیارنین.

لە (پێک گەیشتنا) کە (ژیان) لە ١٩٣٣/٦/١دا بلاوی کردۆتەوە دەڵێ:

هاتە خوارێ

چاو خومارێ

شەدەلارێ

سنگی وەک جامی بلور

وا لەسەر پەنجە، بەلەنجە هاتە لام

شینی لێ کردم بەسوور

هەروا لە (گۆرانی کرێکار)دا کە لە گۆڤاری (نەورۆز) ژ (١) ١٩٥٩دایە:

منیش کوردم بەڵام کوردێک

کە ئاشتیخواز و دڵسۆزبێ

لە بۆ چینی کرێکاران

خەباتی بەرز و پیرۆز بێ.

دیاردەیەکی جیاواز لە نووسەرانی سەردەمی خۆی، چ لە شیعر و چ لە چیرۆکدا، کە من هەستی پێ دەکەم، ڕوو هەڵماڵینە لە هەندێ دیمەن و وێنەی شیعریی و چیرۆکەکانی لە ڕووی ئەدەبێکی جنسییەوە، کە ئەم دیاردەیە تەنیا تا ساڵانی چلەکان بووە و ئیدی لە بەرهەمەکانیدا کز کز بوون و ئەسەریان نەماوە:

لە (یار)دا -١٦ مارتی ١٩٣١- دەڵێ:

خۆ ئەگەر بێتو ڕووت بکاتەوە خۆی

مـانگی تابانە، ڕۆژی تیـشـکینە

خۆ ئەمەندە ناسک و سپی و تەنکە

شـتی تیـا دیارە چەشنی ئاوێنە

تیشکی سووری بەیانیـان و لەشی

مـەی لەناو کـاسـەیی بلوورینە

ماچی لێـوانی هەڵکوشینی لەشی

لام بەنرخی خـەتا و مـاچینە

---

(١) لە وەرگێرانێکی تایبەتی دوکتۆرەوە بۆ ئەم پرۆژەیەکە لە: ل١٩٠-١٩٢ی چاپی ڕووسی (مێژووی ئەدەبی کوردی نوێ) بەکورتی... لەگەڵ سوپاسمدا.

جگە لەمانە مامۆستا زۆربەی شیعرەکانی تری لەسەر شێوە تەقلیدیە کلاسیکەکە هۆنیونەتەوە و بۆ مەبەستی هەمە چەشنە، بەتایبەت دڵداری و کۆمەڵایەتی و نیشتمانی.

لە زۆر کەرەتدا شێوە و (نزعە)ی نووسینی پەخشان زاڵبووە بەسەر مەبەستی هۆنینەوەکانیدا، بۆیە دەبینین مامۆستا دەستی داوەتە (پەخشانە شیعر) و یا لە ناوەراستی شیعرەکانیدا گۆڕیویەتە سەر پەخشان و پارچەیەکی هونەریی تێهەڵکێش کردووە... ئەم غوونەیە لە بابەتەکانی ناو پرشنگدا زۆر بەرچاو دەکەون. لەم رووەشەوە دەسپێشخەری ئەم لەبەر چاوە. من ئەمە وا لێکدەدەمەوە کە بەهرە و توانستی شاکیر فەتاح بەرووکارێکی پەخشاندا خوڵقاوە زیاتر لەوەی بەرەو رووی شیعر و شاعیریەتی.

جا وەک د. مارف خەزنەدار دەڵێ: «لەو رۆژگارەدا چیرۆک و وتار بوو بەهونەرێکی تایبەتی لە بەرهەمی شاکیر فەتاح. بەرهەمەکانی ئامانجی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و رۆشنبیرییان هەیە».

وەیان: ئەوەی ئەو دەیویست دەریبڕێ و ئامانجی پێ بپێکێ لە چیرۆک و پەخشاندا زیاتر و سەرپەستانەتر بۆی دەچووە سەر و دەردەبڕا. ئەوەی من ویستم لەم بواری (شیعر)ەدا، لە بەرهەمەکانی مامۆستا، بێنم هەرچی هۆنراوەکانێتی تیا کۆبکەمەوە، دیارە بەکتێبی (پرشنگ)ەوە کە زیاتر لە نیوەی بابەتەکانی بریتین لە شیعرەکانی خۆی، کە چی بەداخەوە هەندێ (پەخشان)یشی تێکەڵ کردوون کە نەدەبوو وابێ و، ئەو بەرهەمەی تایبەت بوایە بەشیعر و وەک دیوانێکی شیعری دەردەچوو.

هەر چۆنێکبێ ئێمە ئەو بەرهەمەمان خستە ناو ئەم بەشەوە، بەپەخشانەکانیشەوە (وەک کتێبێکی مامۆستا) بەڵام ئەوەندە هەیە هەندێ بابەتی -پەخشانەکانی- لە گۆڤار و رۆژنامەی تردا بڵاوکراونەتەوە، جا لەجێی خۆیاندا ئاماژەمان پێکردون و بواردومانن، تەنیا ناونیشانەکەیانمان هێشتوونەتەوە. بەپێی تواناش شیعرەکانیمان بەپێی ساڵی وتنیان داناوە.

## خۆشخوانی

بەناوی خوا!

یەکێ لە کردەوە جوانەکانی باوکم ئەوەیە لەو ساوەی من پێم ناوەتە تەمەنی حەوت ساڵی بەقسە و بەکردن ئارەزووی خستوومەتە سەر خوێندن، بەتایبەتی زمان فێربوون، خۆشخوانی[1] و گەلێ شتی ترکە بەزیانەوە بەندە!!.

رەنگە هەتا ئێستا بەچەندان چیرۆک و نووسراوانی پێ لەبەر کردبم کە بەخۆشخوانی نووسراونەوە. لەگەڵ پیریشیا هەمو حەڵی خۆشخوانیی پێ خوندوومەوە پیت بەپیتێ تێگەیاندووم بۆ ئەوە دەمێکی دوورودرێژ خەریک بووە وازی نەهێناوە.

زۆر جار پێم دەڵێ: «حەڵێک زمانت دەکرێتەوە، فێری خۆشخوانی وتن دەبی، کە کۆمەڵێکی گەورە خۆشخوانی کوردی و هیتر لەبەر بکەی بەرەنگی تێیان گەیشتبی!»...

---

(١) خۆشخوانی: هەڵبەست، هۆنراوە، شیعر... دەستنووسێکی ١٩٣١ی مامۆستایە.

جا ئەم ئامۆژگاریەی چەند سالانە دلمی بۆ وتنی هێنا بووە خرۆش، جاری وا هەبوو شەو و ڕۆژم لە نووسینەوەی خۆشخوانی کوردیا بەخت دەکرد کە لە لایەکی ترەوە بارێک خوێندنی قوتابخانەم بەسەرا کەوتبوو، بۆ ئەمەی بیان خۆیندەوە لەبەریان بکەم.

هەتا ئێستاش لە بیرم دێ کە لە تەمەنی ١٢ سالاندا بووم خۆشخوانیم هەلبەستووە.

بەلام گێرە و کێشەی گەردوون هەروەکو لە شتی کەی کردم لەوێش دەستـخەڕۆی کردم، فڕێم دایە ئەولاوە...

بەلام لەم چەند سالی دواییەدا کە دیم لە زمانی کوردیدا چۆنم داوەتە دواوە خەلکی تریش لە زبانی خۆیاندا چۆنن، پێم لە ناتوانایی خۆم نا ئینجا خووم دایە کۆکردنەوەی خۆشخوانی جوان، چیرۆک و قسەی تێگەیشتـوانی کوردی پاشـان بەوەش وازم ئەهێنا لە سـالی ١٩٣٠دا دەسـتم کـرد بەنووسـینی یادگارنامەیەک هەتا دوایی سال، ئێستاش بەهی ئەم سالەوە ١٩٣١م خەریکم. مەبەستم لەمانە ئەوە بوو بەتۆزە تۆزە نووسینم باش ببێ، لە ڕاستیشا گەلێک نووسینم جوان بووە.

بەلام ئەم چەند ڕۆژی ئەم سالە کە لە ناوەڕاستی سالدا چوومەوە سلێمانی، کاتێکی زۆر نازەنین بوو کە لەوەدا کەوتمە ژیانێکی تازەوە... چونکو باوکم بەهەموو دەم هەر هەلێکی دەست بکەوتایە باسی

خۆشخوانی و چیرۆکی بۆ دەکردم، پێی دەخوێندمەوە... خۆ ئەو کۆمەلە نووسراوانە کە لەو دەمەدا دەستم کـەوتن وەک «ڕۆژنامـەی پێشکەوتن، داسـتـانی ڕوسـتـەم و جیـهـانگیـر...» لەوەش بەولاوە چاوئەندازە ڕەنگینەکانی سلێمانی کە هەموو کەسی گروفتار کردووە، ئەمانە کارێکی باشیان کردە دل و دەروونم، ئیتر دلم کرایەوە، بەتەرحێکم لێ هات پەرستنی خوایم پەرستنی چیا و ئاو و سەوزایی و بەفر و ڕۆژ و ئاسـمـان و مـانگ و ئەستـێرە بوو... ئیـتر بەیانییـەک بوو لە جێگاکەم سەرم دەرهێنا، پەردەی عـورووسی یەکەم لادا، چاوئەندازی ئەو شاخە ڕەنگینەم دی، کاری کردە دلم، ئیتر هەر ئەوە دلم جۆشا پەڕ و پەڕە (قەلەم و قاقەزە)ە کەم بەدەستەوە گرت، هەلئەسام هەتا ئەم ١٥ خۆشـخـوانییـەم لە سێ چارەکدا تەواو کردا...

منیش بەمە حەز دەکەم، هەمـوو حەلێ ئاواتم خواستووە و ئێستەش ئاوات دەخوازم کە ببمە نووسەرێک یاخود بوێژێک چەشنی شوبنهوری ئینگلیزی یاخود گۆتێی ئەلمانی، یان ئەناتۆل فرانسی فەرانسزی.

ئەمە ئاواتی گەورەی ژیانمە، ئیتر گەورەیی و دەولەمەندی و شتی تر بۆ براکانی تر بەجێ دەهێلم هەر ئەمەم دەوێ چونکی ئەو حەلە خۆم بەگەورە دەزانم کە ئەو ڕەنجەی شکسپیر و ئەوانەی تر بۆ زبانی خۆیان داوە منیش بۆ زوبانی کوردی بدەم تا وەکـو زبانی ئینگلیـزی و ئەوانی تر زمـانی کـوردیش بگاتە پایەی بلندی، ئینجـا ئەو حـەلە «شـاکـر» گـەورە دەبێ، بەشـەرەف دەبێ، پالەوان دەبێ، چونکو کـوردی بلند کردۆتەوە، کوردستانی پێشخستووە!...

٤-٣- ١٩٣١ بەغداد

قوتابی سانەوی مەرکەزی کوورزی چوارەم

شاکر فەتاح

## یار

١٦ی مارت ١٩٣١م

چاوەکـــەی جــوانە مـــانگو پەروینە
روومـــەتی ئاڵە لێــوی نەخــشـــینە
رووی لەناو ئەگـریجـە و قـژی سـەریا
چەشنــی ڕۆژە شـــــەوێکی هاوینە
مەمکەکەی چەشنی سێوی سەردە شتە
سنگەکـــەی گـــەرم و نەرم و بێ کـــینە
بەکەمەر چەشنی موو. ئەمەند شیرین
لە لـەشـــــا چەشنی ئاسکی چینە
خۆ ئەگـەر بێـتـو رووت بکاتەوە خۆی
مـــانگی تابانە ڕۆژی تیـــشکینە،
خـو ئەمـەند ناسک و سـپی و تەنکە
شـــتی تیــــا دیارە چەشنی ئاوێنە
تیـــشکی ســووری بەیانیـــان و لەش
مـــەی لە ناو کـــاســـەیی بلوورینە
مـــاچی لێـــوانی هەڵگوشـــینی لەش
لام بەنرخی خـــەتا و مــــاچینە
بەخـــتـــیـــاریم، خــوایە هەر بەمـــەیە
دڵ و گـــیـــانم ویـــساڵی شـــیـــرینە

***

## نامە

ئەمەم لە ١٩٣١/٤/٧ دا
بۆ فائیق بێکەس، بوێژی لاوڕەوانە کردووە

(١)

کـاکـە گـیـان فـائیق دۆسـتی دڵسـۆزم
بێ تینم لە بۆت زۆر جگەر سـوزم
هەمـیـشـەوە دەم بەبای سـبـەینان
عـەتری سـەلامم بەدڵ و بەگـیـان
خۆشـیی تۆ خۆشـیی لەش و هوشـمە
هەواڵی چاکـیت بادەی نۆشـمـە

نامەتم وەرگرت وورد وورد خوێندمەنە
عەبیری قەسەت دڵی کردمەوە
ڕەغنەت گرتبوو زۆر لەجێدا بوو
سەرکەوتنی من لەوە بەدوا بوو
لای عەلی عارف مەلای مەزیوورە
بۆ تۆم داناوە گورج وەریگرە[1]
بەڵام عەباسی کوڕی کاک سەعید
نەینارد شیعرەکان کردمی نائومێد
بچۆ ! پێی بڵێ تکای لێ دەکەم
زوو بۆم بنێرێ با مەراق نەکەم
ئینجا؛ بێینە سەر هەواڵی بەغدا
با بۆت بنووسم بتکەم دڵنیا
(یانەی سەرکەوتن) لە سەرکەوتنە
ڕابوردووی وەستان ئێستای ڕۆیشتنە
هەینی ڕابوردوو گەورە بچووکمان
تیا کۆبووینەوە بۆ ئەغرا دانان
لەلایەن (چیاووک) کردەوەی یانە
پێشانمان درا دانە بەدانە
ئینجا (ئەمین بەگ) خۆی ڕاستەوە کرد
بەدەنگ چەشنی شێر ئاوازی بەرز کرد
وتی: «مەئیووسی پیشەی کورد نییە
یا نەهەوڵ نەدا وەستانی نییە».[2]

(١) دیارە کتێبی(مەلای مەزیوورە-مەشهورە)ی لەلای عەلی عارف ئاغای شاعیر بۆ بێکەس داناوە تا وەری بگرێ.

(٢) باسی ئەو کۆبوونەوەیە دەکات کە یانەی سەرکەوتنی کوردان لە هەینی ٣/٤/١٩٣١ لە بارەگای یانە گرتیان بۆ هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبردن تازە، مەعروف چیاوگ ١٨٨٥-١٩٥٨ تیایدا وتارێکی خوێندەوە چالاکییەکانی یانەی باسکرد و باسی ئەو ئاستەنگانە کرد کە بەربەستی کارەکانیان دەکات.
ئەمین زەکی بەگیش وتەیەکیدا و هانی دان کە ڕەشبین نەبن و مەئیوس نەبن لە تەقەللا و تێکۆشان و دوایی هەڵبژاردنی دەستەی تازە کرا. مامۆستا لە (ئاوێنەی ژینم) دا بەدرێژی باسی ئەمە دەکات.

لە سـالّی پاردا ئیـمـلامـان چاپ کـرد
دوێنێش تەئریخـمـان بۆ چاپخـانە برد[1]
(بێکەس) فـرگـێنی ئەگـەر نەنیـرێ
مـوژدە نانێـرێ (شـاکـر) بەفـێـری

(٢)

ئەمـیش نامـەیەکە بۆ عەلی عـارف ئاغـام ناردووە کـە ئەویش هەر بەخـۆشخـوانی لە پێشـەوە بۆی نووسیبوم:[2]

برای دلسـۆزم بینـایـی چاوم
هەمـیـشـە بۆ تۆ بێ تین و تاوم
نامـەتم هەلگرت بەدڵ و بەگـیـان
ورد ورد خـوێندمـەوە نامـە سـەرچاوان
سـەرم هەلبـڕی بۆ یەزدانی پاک
پێتکاتە خـاوەن زەوییزار و خـاک
هەر تۆی لە یاران دلسـۆز و پاکـبی
بۆ هاوڕێت بەکـار چەشنی برابی
ئەوەندە هەیە دلتـەنگت نەکـەم
شـتـێکت دابێ سـا زۆربێ یا کـەم
ئەمـەند دەیدەیتـە بەچاوی پیـاودا
بەهـای ناهێـلـی دەیدەی بەبادا
هەر بیـرکـەیتـەوە تۆزێ. دەبینی
چەندە چاکـەی من خـۆشت چلۆنی؟!
زۆر ناشـیـرینە برام بۆ ئێـمـە
بژمـێـرین بۆ یەک چاکـەی پێشـینە
چونکی بۆ خـزم و برای چەند سـالان
هیچ نرخی نیـیـە کـردەوە و کـاران

---

(١) یانەی سەرکەوتن لە ١٩٣٠دا نامیلکەیەکی مەعروف چیاووگی چاپ و بلاوکردەوە: (بەرگی املای کوردی - نووسراوی معروف چیاووک، ناردراوی هەولێر، چاپی یەکەم - چاپخانەی نەجاح ١٩٣٠ بەغدا).
ئەو کاتەش ١٩٣١ یانە دەستی کردووە بەچاپکردنی (خولاسەی تاریخی کورد و کوردستان)ەکەی مێژوونووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ.

(٢) واتا عەلی عـارف ئاغـا (شاری) پێشـتـر نامـەیەکی بەشـیـعـر بۆ مـامـۆسـتـا ناردووە، هەندێ لاو ناوەڕۆکی نامەکەی لەم هەلبەستەدا بەدیار دەخات.

بەندە بەڵێنم بەجێ هێناوە
ڕۆژنامە و نامە و نووسراو نێرراوە
قەت وا تێنەگەی برای دڵسۆزم
تۆم لەبیر ناچێ زۆر بۆت بەسۆزم
هەتا دەمێنم برای جارانم
لەسەر گفت دەڕۆم هەر بەپەیمانم
هەر بۆت دەنێرم ڕۆژنامە و نامە
بەڵام درەنگ بێ ئەوسا بەتامە
ئیتر براگیان نۆرەی ئێوەیە
بۆ نووسراوەکان چاوم لێوەیە
خۆ ئەمانەشت گەر بۆ دەست نەخرێ
ڕۆژنامەی کوردی[1] زوو پەیدا دەکرێ
خۆشەویستەکەم لەسەر پەیمان بە
بەڵێنت بەجێ، بێنە و ئازاد بە
ئەگەر هەردووکمان یاریدەی یەکدەین
بۆ یەک براین، بۆ هیچ کۆڵ نەدەین؟!
کەریم و جەمال تاهیر - براکان
دەستیان دەگوشم بەدڵ و بەگیان
کاکەگیان (ئەتۆش) ئەسپەردەی خوابی
سەربەرز و ئازا جێ لە بالابی

## لەگەڵ دڵ

١٦-٣-١٩٣١

یەک شەو لە خەوا، خەم لە دڵ و مات و پەرێشان
بیرم لە ژیانێک بوو پڕی دەرد و سەرێشان
بۆم هەڵنەدەهێنرا بەچە جۆرێکبم و بێخۆم
خۆم کەم بەئەمیر، یان بەمەلا، یاخود بەشێخان

---

(١) زاری کرمانجی: ژمارە - ١، ٧
بانگی کوردستان: ژمارە ١١
بانگی حەق: هەر سێکی
پێشکەوتن: ژمارە ١،٢،٣،٤،٥،٦
ئەم قسانەم هیچی پیتێکی بێگانەی تیا نییە، هەمووی کوردی پەتییە. (ش.ف)

پاشان لە دڵی ناسکەوە گوێم لەشتێ بوو
دەنگێک: کە بووە بۆنەیی بووژانەوەیی گیان
قیراندی! وتی چیتە ئەوەندە بەپەرۆشی
بۆ منتە ئەمە؟ دەردە، مەکە. مەمدە بەتاڵان
بۆم دەبیە ئەمیر - کورد بکەیە بەندەیی نادۆست؟
زۆر و ستەمت بێنێتە دەر، گیانی هەژاران!؟
یاخود بەمەلا: کورد بخەیە چاڵی نەزانین
دوایخەی، کەری کەی، بیخەیە ژێر باری نەیاران؟!
یاخۆت کەیە شێخ: کورد بکەیە لەشکری دەروێش
هەوڵ دەی بۆ تەمەڵکردنی خەڵق بردن و تاڵان؟
سەر ڕاستبە لەگەڵ خۆت و لەگەڵ خەڵکی جگەرسۆز
کێت دی کە لە ڕێی ڕاستەوە گوم بووبی بەقوربان؟
ئەم پەندە لە(شاکر) بگرە گەر ئەتەوێ ژین:
(سەربەرز) و (گیان-سووک)بە، بەسەر زاریی، بەپەنهان

قوتابی کووزی چوارەمی سانەوی

بۆ پێکەنین

١٩٣١-٨-١

**ماینە بۆرە**

ئەمەم لەگەڵ (عەلی ناجی) ناو هاوڕێیەکمدا بەسەر ماینێکی هاوڕێ یەکماندا[١] هەڵداوە کە لە (١٥)ی تەموز ١٩٣١ دا ئەسپەر دەی گڵ بووە.[٢]

***

ماینە بۆرەی پەرندە
داردەستی خدری زیندە
سوبحانەڵلاە کە چەندە
قەشەنگ و شۆخ و شەنگە
تەییارەیە بۆ سەفەر
تەختە ڕەوان بۆ حەزەر

---

(١) ئیسماعیل مەلا عەلی مامە شێخە. (ش.ف).

(٢) مەبەست ئەوەیە کە: ئەسپەکە لەو بەروارەدا ئەسپەردەی گڵ کراوە، دەقی ڕوداوی تۆپینی ئەو ماینە و هۆکەی لەگەڵ سەرەنجامەکەی وا لە(پێکەنین پرشنگ دەدات لە ژین) لاپەڕە(٦٩)، کە لەگەڵ ئەم کتێبی دووەمە دایە.

خەمخۆرە وەقتی خەتەر
ئەجاتدەرە بۆ بەشەر
کلکی دەڵێی بەیداغە
چوار پەل ئەمامی باغە
ئەمەند جوان و بۆشناغە
هەزار جەرگی بۆ داغە
چاو ئاسکی فەرەنگی
عالەم لە کۆرەی دەنگی
لەرزەی پالە هەندی
کەڕ دەبوو وەقتی جەنگی

*

بەڵام لە وەقتی تاوا[1]
دەتووت تانجیی ڕاوە
ملی سوواری دەشکاند
جەرگی دەبرد بەناوا

*

وەلێ زەمانی بەد خوو
نەیهێشت بمێنێ وا زوو؛
ئەویشی خستە ناو خاک
دەستی خستینە زانوو.[2]

*

ئەی فەلەکی بەدسورشت
تۆ بۆ چ ئەم تاووسەت کوشت
یان هەر پیشەتە دائیم
بکەیتە دۆزەق بەهێشت.[3]

*

ڕەفیقی ڕۆژ و شەوان
مەنعم مەکەن لە گریان

(١) تاو: غار
(٢) زانو: ئەژنۆ
(٣) یان هەمیشە پیشەت ئەوەیە کە بەهەشتیان لێ بکەیتە دۆزەخ.

بەهارم بۆتە خەزان
دەرچۆە لەتەن رۆح و گیان

*

هەروە نەبێ وابم من
عالەم خانە خرابن
بوومەلەرزەیان تێکەوت
بێ سایەمان پیاو و ژن

*

حەتتا لەبەر شینی ئەو
زۆریان دەسی کرد بەرەو
بێ خانەمان لە دەشتی
نە خۆراکیان ما نە خەو

*

ئێستەش لە یەزدانی پاک
دەخوازم بەدڵێکی پاک
سەبووری خاوەندی دات
ئێمەش نەبینە غەمناک.

### شافیعی و حەنەفی

سولەیمانی: ٧-٩-١٩٣١

شافیعی عارەبێکە لەو چۆڵە
حەنەفی کوردی شاخ و ناو دۆڵە
کورد ئەچن رێی یەکەم کەسیان ئەگرن
توخوا واز بێنە بام وەها بمرن!؟

### بەڵێن

[سەفەد - فەلەستین ١٩٣١]

هێندە ئەی شاخی بەرزی کوردستان
دیقـقـەتم کردە بەژنو بالاکەت
دەنگم بەرز کرد لە بۆ حەقی کوردان!
زۆری پێ ناچێ: «هەڵکەم ئالاکەت»

**ئینسان و شەیتان**

بروممانا - لوبنان ١٩٣٢

ئەگـــەر دڵپـــاکی ئینســـانی
ئەگـەر دڵپـیـسی شـەیتـانی

## کوردستان

ئەم هەڵبەستە وەک دەردەکەوێ یەکەم بەرهەمی شیعریی مامۆستا بووە، لە یادنامەی ساڵی ١٩٣١دا -دەسنووس- بەشێکی سەربەخۆی، نۆ لاپەرەیی، بۆ تەرخان کردووە کە بریتییە لە: پێشەکییەک و هەڵبەستی (کوردستان) پاشان شیعرێکی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی ساحێبقران کە (بەسەر هەراکەی سلێمانیدا - ٦ ئەیلوولی ١٩٣٠ - هەڵیداوە):

بۆ چ هەوا ئاڵۆزە لێڵ و سـوورە ئاسـمـان
گیژە ڵووکەی ئەکبەتە یا فیتنەیی ئاخرزەمان

دوای ئەم هەڵبەستێکی (شێخ سەلام)ە کە: (لە کۆمەڵی گەلان - عوسبەتولئومەم-ی نووسیوە، لەسەر ئەوەدا کە بەڵێنەکەیان وەک سێبەرە، قەت کورد نایگاتێ):

عوسبەتولئومەم کۆمەڵی گەورە
پڕ پێچ و پەتا بەفـــێڵ و دەورە
لە دوور بەدرۆ بۆ هەقی کـــوردان
تەکانت دەدا، خـۆت دادەشـرنگان

دوا بەدوای ئەمیش هەڵبەستێکی حاجی تۆفیق (پیرەمێرد)ەکە بەسەر (وەفدی کوردستان)دا هەڵیداوە (کە لە پاش هەراکە - شەشی ئەیلول .١.ب - چوو بوون بەپیر پاشای عێراقەوە -بەزۆری حکومەت- فائیق بێکەسیش کردوویەتی بەپێنجی -تەخمیس-):

قەدری میللەتتان بەجارێ شکاند
نە حەیاتان ما نە ئاوونیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەر شان
«وەفدی کوردستان میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان»

جا بابێینەوە سەر بەرهەمە شیعرییەکەی مامۆستا کە پێشەکییەکەی بەسەردێری (خۆشخوانی)یەوەیە دەڵێ:

«ئەو با خۆشە، ئەو ئاوە سازگارە، ئەو داروبەردە خومارە، ئەو کیژ و کوڕە نازدارە، ئەو چاوئەندازە جوانانەی لە سلێمانی چاوم پێکەوت، تیری حەزلێکەریی هاوێشتبووە دڵمەوە، بەئاو و سەوزایی و ڕووی

جوانەوە شێت و سەرمەستی کرد بووم، لەبەر ئەوە زۆری بۆ نەبوو، ئاگری ئەو خۆشەویستیانە لە کانی دڵمەوە هەڵقوڵینە دەرەوە، برژێتە (تا برژێتە - أ.ب) سەر لاپەڕەی قاقەز، بەتەرحێک بیسوتێنێ تا ئەمێنم لەبەر چاومدا بێ.

حەلی خۆی، منالانە تۆزێ دەمم لە خۆشخوانیەوە دەدا، بەڵام دەمێکی دووروودرێژە ئەوە ڕۆیشت.

ئەمجارە ئەوا تازە بووەوە... هەر بەیانییەک بوو لەپێخەف ڕاسپێ بوومەوە. هەر ئاوڕێک بوو لە شووشەی عوروسییەکەی پشت سەرمەوە دامەوە، ئەو شاخ و بیابانەم لە لاپەڕەی دڵا نیگارکێشا، هەر کاتێک بوو قاقەز و پەڕەم داگرت و دەستم کرد بەبێژینی خۆشخوانی...

شاکر یەکەم کۆی بوو لە ژیانیا بەدڵێکی کەیلەوە خۆشخوانی بڵێ!... باوکم دەڵێی خۆشخوانی و تووە، هەتا خوا حەز کات حەز لە خۆشخوانی دەکا، هەر ئەویشە منی خستۆتە سەر ئەوەی ئەمەندە خۆم بەخۆشخوانییەوە خەریک کەم، لەوەش بەولاوە مامێکیشم هەیە هەردەم لەمەوە دەدات، خۆشمان لە تیرەی هەممەوەندین کە لە ئاو و سەوزایی شتی جوان، ئەسپ و تفەنگ بەولاوە هیچی تری بەرچاو ناکەوێ،... سا بۆیەکا ئەمەندە بۆی بەپەرۆشم، ئەگەر ئیتر هەوڵ بدەم، تیا قووڵ ببمەوە، ئەوە بێ گومانە بەم ئارەزووەوە کە من هەمە ئەچمە ڕیزی بوێژە چاکەکانی کوردەوە.

ئێستە لە دەروازەدا وەستاوم، بۆی هەیە بچمە ژوورەوە، بۆی هەیە بەرەو دوا بگەڕێمەوە، سا خوایە یاریدەدەرم بێ، بمکەیتە بوێژ، چونکی بوێژێکی کوردی تر دێتە کۆڕەوە، بەوە، زوبانەکەمان بەهێز دەبێ، پێش دەکەوێ... ئەمە خۆشخوانی یەکەم:-

**کوردستان**[1]

«هەڵبەستەری: شاکیر فەتاح - ڕۆژی ٤ی مارتی ١٩٣١»

ئەگەر ئەتدیوە کوردستان ببینە
کە چەند شیرینە، جوانە، چەند بەتینە
کە ئەو ڕۆژەی بڵێن ڕۆژی بەهارە
ئیتر پیاو بۆ دەرودەشت بێ قەرارە
لەوێدا بەزمە، سەیرانە، زەماوەند
لە لایەک مەل دەخوێنێ، لایە چاز بەند
لەلایەک کیژ و کوڕ ئالاوی یەکترین
سەما و ڕەقس دەکەن بۆ کەیفی نەسرین
لە نەسرین گەر دەپرسی پێت بڵێم ها
زەمین و ئاسمانە هەرچی تێدا

---

(١) ئەمە یەکەم هەڵبەستە لە دەستنووسی (خۆشخوانی) مامۆستادا.

## نامە و شیعرێکی مامۆستا بۆ شێخ محمدی خاڵ[1]

ئەتروش - دهوک
١٩٣٧/٥/١٤

برای شیرینم محترم شێخ محەممەد

دەستەکانتان ئەگوشم وە بەم کزە با خۆشەی بەهارەدا، کە لەسەر شاخەکانی مزووریەوە تێپەڕ ئەکات عطر و عبیری سلام و احتراماتی برای خوشەویستی خۆت پێشکەش ئەکەم.

وا بیر ئەکەیت لە بیرم چوویتەوە، خوا ئەیزانی دڵم لاتە، وە تا لێت دوورکەومەوە، زیاتر بیرت ئەکەم، و زۆرتر تاسەی قسە خۆشەکان و ڕابواردنە خوشەکانت ئەکەم.

داخەکەم لێرە نە ئەو مەلایەم دەست ئەکەوێت نە ئەو مزگەوتە کە تێروپڕ سکاڵای دڵی خۆمی لەلا بکەم. هەواڵی قەومەکەی خۆت ئەپرسیت. شپڕزە و شێواوە، هێشتا لە ژەنگی زەبر و زەنگی کۆن پاک نەبوونەتەوە. خرافات، فسادی، جهالت بەربۆتە گیانیان.

مەگەر نوری عیلم و عرفان و شیری عەدالەت بێت بتوانی بیانخاتەوە سەر ڕێگەی ڕاست. ئەو ڕوحە عەزیزەی کە هەموو دڵسۆزێک ئەیپەرستی هێشتا نەکەوتۆتە ناویان. ئێمەش مەگەر لە کوولەکەدا بانگ بدەین ئەگین زروف و موحیت لەوە زیاتر ڕێ نادات.

لەمەدا چونکی بەمەلایەکی ڕاستەقینەتان ئەزانم، ناترسم لە دڵشکانتان، پێویستە بڵێم تاوانی ئەم پاشکەوتنە بەشی گەورەی ئەکەوێتە سەر ئاغا و مەلا و شێخەکانی مزوری، خوا هەڵناگرێ هەندێکی بەغیرەتی تیایە، بەڵام هی خراپ گەلی بەقوتیشی تیایە، پەکی گەلێ مەشروعی خێری من ئەخەن.

تەکیەی شێخ نوری بریفکانی لە ناحیەکەماندایە لە علیە مکتب مەزبەتە ئەکەنەوە. تا ئێستا چەند جار تشبثاتم کردووە بۆ مەکتەب. ئەوان بلعەکس هەوڵیان داوە لە گوندەکەیاندا نەکرێتەوە. بەڵام لە سایەی خواوە زەفەر بۆ ئێمە بووە، وەعدێکی بەقوەتم وەرگرتووە ئەمساڵ بێتەوە مەکتەبێکمان لە بریفکاندا بۆ بکەنەوە بەرامبەر بەتەکیەی شێخ!... لەم بەینەدا پێنج شەش جار کردمانە سەری بۆ تەبەرعی ماڵە فەقیرەکانی مەکتەبی پیرەواتروش، لەپاش ئیغفالاتێکی زۆر ئاخریش نەیناردا!... کەچی أهالیەکە (٣٢) دیناریان تبرع کردا...

جا شێخم، شتی وا کەمنیە کە دەمارەکەم بجوولێنێتەوە و، شعورێکی فەوقەلعادەم. بخاتە خەیاڵەوە!... وە لە ڕەغمی ئەوەی کە شاعیرنیم و خۆم بەشاعیر نازانم، لە سایەی شێخەوە فێری شیعر گوێگرتن بووم!... ئەوا بۆ یادگار تەقدیم کردن، لە بریتی هاتنە مزگەوتێکم کە لە مجلسەکەی ئێوەدا سکاڵای دڵی خۆم ئەکرد، تکا ئەکەم، و بەو رابطە علمی و وادبیەیە کە لە بەینماندایە سوێندت ئەدەم، تنقیدێکی ڕاستەقینەم بکە. یا ئەم موضوعە بیێتە سەر گوڵی مخابەراتمان.

***

---

(١) بەسوپاسەوە ئەم نامەیە مامۆستا (خالد محمد خاڵ) دایین.

شێخم ئێستا ناحیەکەمان خانمانە، بەبۆنەی بەهارەوە خۆی ڕازاندووەتەوە، شاخەکان گوڵاڵکە سورکە و گوڵە وەنەوشە و بەیبوون و گوڵە زەرد و گوڵە سپیان لە سنگ و بەرۆکی خۆیان داوە. ئێمەش لەم کەژ و کێوەدا ئەو حەیاتە سادە بێگەردەی فەقێیانەیە ڕائەبوێرین کە لای خۆتان باوە، هەر ئێوارەیە لە چیمەن و لالەزارێکا کۆڕی دۆستان دەورەی سەماوەر و قۆریە ئەدەین!... خۆزگەم لامان بونایە!...

## ئێمە و گەورەکانمان[1]

١٩٣٧/٢/٤

(١)

ئەمـــە بۆتـە ڕەوشت و کـــردەوەمـــان
هەرچی دەســتـدارە خـێـوی نان و خـوان
بێ ئەمـەی تێی بگەین چییـە و چە نیـیـە
دین و ئایـین و باوەڕی بەچـیـــــیـــە
خـوا ئەناسێ بەڕاسـتی یان بۆ مـەبەس
هاودەمی چاک و باشـــە یان ناکـــەس
کـــاروباری یەکـــە لەگـــەڵ زاری
دڵـی خـــاوێنە، جـــوانە کـــرداری
ڕەگـــەزی خـــۆی ئەوێ، ئەکـــۆشێ بۆی
یاخـود ئەیفـرۆشێ بۆ مـەرامی خـۆی!...
پێی ئەڵێن: دەرگـــەوان و نۆکـــەرتین
بۆ هەمـــوو کـــاروبارێ ڕەنجـبــەرتین
چەشنی کـوێر! هەرچی ئەو بڵـی ئەیکەین
هەرچی پێویستی بێ بەدەستی ئەخەین!...

(٢)

ئەویش ســاســەیدە ئەگـــەر پیـــرە
یاخـــود ســـەردارە یان کـــوڕی مـــیـــرە
تـاکـــــو چەنـد ڕێ بـدا دەروون و دڵـی
زیرەکـــییی بریکـا: ئەوەندە بەکـــوڵـی
بەفـــــروفـــــێڵ و تەفـــــرەدان و درۆ
قـڕ ئەکـا گـیـان و مـاڵی قـومی خـوا!...

---

(١) شیعرەکە لە لاپەرە دووی نامەکەوە دەست پێدەکات.

هێندێ شێخمان هێندە ئەزان و پاشکەوتین

هێندێ لەگەڵ یەکتری بەد و چەوتین

تێ ئەگەیشتووین لە دەردی خۆ هێشتا

دوژمن و دۆست بەیادی خۆ هێشتا

وا ئەزانین کە فەرمووەی خوایە:

شێخ و سەردارمان کە ئاوایە!...(٢)

(٤)

شێخ ئەگەر شێخی راستەقینە، ئەبوو مە

بۆچی چاوی لە مالی خەلقی ئەبوو؟!

لەم هەموو دیاریە کە شێخ وەری گرت

پێم بلێ «تەکیە»یەک، ئەبێ چیی کرد؟!

«تەکیە»و کەوی فاقیەیە بە تۆزی نان

کەر و گیا ئەگەری پێی دزی ایمان...

شێخ بە دوعا و رموز و نیازگەری

نانی دوقت و خوێندەواری بری...

دەبیستان، خەستەخانە، علم و فن:

شێخ ئەڵێ: «دوژمنی بە دین و وطنە!...

شێخ ئەگەر تۆزێ خوای بناسیایە،

بێ زیان، راست و دڵ دروست بوایە!

ئەی ئەخوێند خۆی و خەلقی ئەخوێنن؛

تاکو هەرچی بڵێن بەجێی بێنن!...

بۆچی ئەی فەرمووە پێغەمبەری دین:(٢)

«اطلبوا العلم ولو بالصین»؟!

(٥)

لەمەدا سەرکۆمار وەکو شێخن(١)

هێندێکیە شێخ نین بەڵام شێخن!...

هەرچی والێ جەرچاو نزووی شێخان

رووتئەکەن قەومەکە لە نان و خوان

---

(١) سەرکۆمار: لێرەدا مەبەستی ئاغاکانە.

تاوەکــــو چەک بەدەست و بەردەست بن
بۆ هەمــــوو کـــاروباری دەردەست بن
تاوەکــــو چەشنی ڕانی بزن و مـــەڕان
بیـــانفـــرۆشن بەئارەزوی خـــۆیان!...

(٦)

کـــاکی خـــۆم وازبهـــێنە لەم بیــــرە
گـەورەیی نە بەشـێـخـە نە مـیــرە!...
هەر کــەس هات بەکــردەوەی جـوانی؛
برسی تێـر کـرد بەسـفـرە و خـوانی؛
وازی هێنا لە خــۆپەرســتــیی خــۆی؛
مــاڵی کــردە فــیــدای وڵاتی خــۆی؛
یـاریـدەی بـێـکـەس و هـەژاری دا،
پـیــــاوی زانا و فن و کـــــاری دا؛
چوو بەگـــــــژ بەدڕەوشت و زۆردارا
هـاتـە مـــــــەیدان لـە ڕۆژی هـاوار؛
بەخــــتــــیـــاریی وڵاتی ئازادیی:
کــردە ئامـــانجی خـــۆی بەدڵشـــادی
ئەوەتا پـیـــــاوی میلەت و گــــــەورەی
کـەمـە، هەرچەندی بەندەیێتـیی بکەی!...

(٧)

قــــــەیێکم هەیە بچــــوک و ڕەقــە
تیـــژ و کـــاریگەرە، ئەوەندە حـــەقـــە
«ئەگـــــەر بینـین و فـــــام و هۆشت بێ
مـەکـە بڕوا کـە گـەورەییێکت هەبێ!...»
دوو هەزار شـــێخ و پیـــر و ســـەردارت
دەســـتـــدەنە کـاروبار کــەس و کــارت
پشـتـیــان پێ مـەبەسـتـە سـەد ئامـان
گورگی خـونخـوارن، دوژمنی ئیـمـان!...
ترس نەکەی، سەربەخۆ، گەش و سەرا ڕاست
پێشی بخە قومی خۆت لە سەر ڕێی ڕاست
تا خـوا ڕۆســتــەمــێکی داســتــانێک
شـێـری مـەیدان وەکـو کـەریم خـانێک

ئەرەخسێنێ بۆ خاکی کوردستان
رستگاری ئەکا لە دەست فەوتان
ئەگینا تاکو شێخ و میر مابێ
کوردی بێچارە هەر ئەبێ وا بێ؟!!...

ئەمەندە و احتراماتم بۆ براکانتان تکا ئەکەم هەواڵی خوتانم بۆ بنووسە. ئیتر حرمت گیانەکەم.

برای دڵسوزتان
مدیری ناحیەی مزوری
شاکیر فتاح

# پرشنگ

کۆمەڵە وتارێکە؛ هەژاری، نەخوێندەواری، زۆرداری و نالەباری لەناو کوردەواریدا دەرئەخا.

١٩٤٧ - نرخی ١٠٠ فلسە. چاپخانەی معارف - بغداد

سەرەتا

داخەکەم گیانی بازرگانی و خۆپەرستی بەتەرحێک کاری کردۆتە ژینمان؛ هەموو رەوشت و دین و ئاین و ئادابێکمان، وەک بابەتی بازرگانی بازارمان بۆ داناون، ئەیان کرِن و ئەیان فرۆشن!... لەبەر ئەوە - تاک و تەرامانی لێ دەرکەی - تێکرا کەسمان و هیچ چینە و دەستەیەکمان لەسەر فرمانی راستەقینەی خۆمان نەماوین وە هەموو لە رێگای راست لامان داوە!.

بۆیە هەموو بەرەو نەمانی و پەرێشانی و سەرگەردانی ئەرِۆین!... وە بۆیە تادێت: زۆرداری و هەژاری و نەخوێندەواری و نالەباریی لەناومانا بڵاو ئەبێتەوە!... بەڵام لە دوورەوە تیشکێکی چرای هیوا دیارە. ئەویش راپەرین و کۆششی مەردانەی هەندێ لاوانە بۆ بەربەستکردنی بۆنەی پاشکەوتن و بەرهەمهێنانی هۆی پێشکەتن. جا بۆ ئەمەی ئەو تیشک ببیتە پرشنگ: ئەم نوسراوی (پرشنگ)ەم نووسیەوە. پێشینان وتویانە: «دۆست ئەوەتا ئەتگریێنێ، دوژمنیش ئەوەتا پێت پێئەکەنێ». لەبەر ئەوە هیوادارم کە هەموو لایەک بەچاوی برایانە سەیری وتارەکانم بکەن وە قسەکانم وەرنەگێرِنە سەرباری خراپی بەڵکو هێندە کار لە دەماری مەردایەتیان بکا پێکەوە تا سەر بەرەنگاریی هۆی هەژاری و زۆرداری و نەخوێندواری و خەفەتباری و نالەباری بکەن لەناو (کوردەواری)دا وە بۆ پێکهێنانی گەل و نیشتمانێکی ئازاد و شادمان هەوڵ بدەن.

سا دەست لە دەست و هێز لە خوا براکانم.

شاکیر فتاح - ١٩٤٧/٤/١٢
قایمقامی سلیمانی

## نیشتمان

عەردت ڕەنگین
ئاوت شیرین
بادت موشکین
خاک و خۆڵت وەک بلور
نیشتمان!
پڕ لە باغ و میوەهات و دەغڵ و دان و سەوزەواتی
پڕ ژیان

***

سەیری گەشتی
ناو بەهەشتی
دۆڵ و دەشتی
سەرچەم و باغ و چیای!
تاکو چاوم پڕ ئەکات
چاوەیی خوشی و زەماوەند، عیش و نوش، ئازادییە
ژین لە شادی پڕ ئەکات!...

***

تۆیش بەچنگ بووی
سەر بڵند بووی
شۆخ و شەنگ بووی
دەوڵەمەند بووی وەختی خۆی
وا دیارە
ئەم هەموو سامان و شوێنەت کردەی سەردارییە
ئاشکارە!...

***

تێک شکاوی
ناتەواوی
نان براوی
زۆر شپرزەی ئێستەکە!...
بۆچ وەهای؟
یان سەبارەت دوو دڵی و بەدخواهی و گومڕاهییە

بێ بەهای؟!...

***

لاوەکانت
پەریەکانت
زەویەکانت
ڕۆژ بەڕۆژ وا گوم ئەبن!...
بۆ چ ئەهێلی!
حەیف نییە بۆ تۆ لەسەر خۆتا کە خەڵک داخت بخۆن؟
هێندە لێڵی؟!...

***

هەستە، ڕابە!
ڕوو لە خوابە!
دڵنیابە!
تێ بکۆشیی چەشنی مەرد
زوو ئەگەیتە تەخت و بەخت
زۆری وەک تۆ هەوڵیان دا و پێگەیین
بوون بەشاهەنشاهی وەخت!...[1]

## بانگی زانستی[2]

وا وەرن! وا وەرن! کۆمەڵی لاوان
یەک گرین، پێش بخەین زانستیمان
زانستی جێگای علم و عرفانە
شوێنی ڕووناکی و ژینی کوردانە
واوەرن لاوەکان یەکگرین، یەکگرین
زانستی ڕا گرین

***

(١) ئەم پەخشانە شیعرەی (نیشتمان) لە (گەلاوێژ)ی ژ (١٢) س(٦) کانونی یەکی ١٩٤٥، ل ٣٨-٣٩ بلاوکراوەتەوە.

(٢) لە دەستنوسی (خۆشخوانی)دا نووسراوە: (لە مایسی ١٩٣٣ دا نووسراوە لەسەر ئاوازی بەیداغی لوبنان - کلنا للوطن - وتراوە بۆ کۆمەڵەی زانستی.

ئیمرۆ لاوی هەموو میللەتانی سەرزەمین
هەوڵ ئەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی زانین
بۆیە وا گەورەن و بەرزن و دوربین
ئێمە پاشکەوتووی دەستی نەزانین
وا وەرن لاوەکان یەک گرین یەکگرین
زانستی ڕا گرین

یاریدەی لاو نەبێ، کوششی لاو نەبێ
هەوڵ و کۆششمان، شەو لەگەڵ ڕۆژ نەبێ
بۆ بڵند کردنەوەی، زانستیی کوردان
ناگرین جێگەمان، ون ئەکەین نیشتمان
وا وەرن لاوەکان یەک گرین یەکگرین
زانستی ڕاگرین(*)

قەڵەم

قەڵەم! سەرسوڕماو و هێز و گوڕی تۆم
دڵبەستەی گوفتەی جەشنی دەری تۆم
هێنەرەی بێ دەنگی، ئەوەندە بەزاری
ئەوەندەی سەرسیتەی، هێندە کارگوزاری
ئەگەر جەژن بکەی کۆشک و تەخت و بەخت
دێنێتە لەرزە بەوەخت و بێ وەخت
تارەزووش بکەی زنجیری گەدایی
ئەگەیەنیتە نشینگەی شایی
دڵەی پڕ ئازار بەهەوڵێکی کەم
ڕستگار ئەکەی لە دەس خەم و تەم
لەگەڵ ئەمەشا چونکە نەژادی
هاوڕێی جوامێری و دەرون ئازادی
بەم هۆیەوە هێز و گیردارانەوە
خۆت لێ ناگۆڕی و ئێستە وکایەوە

(*) ئەمە بەگۆرانی لەسەر لەنگەری «کلنا للوطن» بۆ «کۆمەڵی زانستیی کوردان» لە وەختی خۆیا هەڵبەستراوە.

ملکەچ بۆ خێوت خۆت ئەرەنجێنی
دڵسۆز، گوێڕایەڵ، خۆت ئەنوێنی
ڕۆشنکەرەوەی نشینگەی ڕازی
چونکە چەشنی نەی پڕ لە ئاوازی
چەکی بەکاری ڕۆژی تەنگانەی
بەڵام ئاخ داخم قەدرت ناگرین
بۆیەکا بۆ یەک پوشوو ناگرین
ئەگەر شان بەشان تفەنگ، شیر و تیر
ئەمان کردیتە چەکی جوان و پیر
بەم ئەندازەیە دوا نەئەکەوتین!...
بەرچنگی دوژمن وا نەئەکەوتین!...
ئەوسا کە کورد و کوردستانمان
جۆری تر ئەبوون، سەر و سامانمان!؟...

## ڕاستی و دروستی

ڕاستی و دروستی جێیان بۆ نییە
ناو تاوونیشان وریان بۆ نییە
بەچاو نابینرێن، ناگیرێن بەدەس
سەر نانەوێنن بەئارەزوی کەس
گەورە و سەربەرزن، سەربەست و ئازان
بۆ هەموو شوێنێک ئەچن، شارەزان
جوان و شیرینن، ئاسک و نازدارن
بنچینەی هێزی ڕەوشت و کارن
شیرازەی ژیان بەوان پێچراوە
خۆشی و سەرکەوتن بەوان بەستراوە
دوژمنیان دز و درۆزنانە
پیاوی پولەکی و کوژراوی ئانە
هێندەش ئازکن تۆزە ئازارێک
زۆردارێک بیکا یاخود بەدکارێک
ئەیان ڕەوێننێ، هەوار بەهەوار
تا لە هەواردا ئەبێتە هاوار!...

لەگەڵ ئەمەشا چونکە لەسەرخۆن
تۆ لە سینەوەن گیانی سەربەخون!...
کاتێک ئەزانی وەک مەردی چالاک
خۆیان دەرئەخەن، سەبەست و بێ باک
زۆردار و ناکەس لە شەق تێر ئەکەن
کۆشکی بەدڕەوشت سەرەوژێر ئەکەن
جوامێر و پیاو چاک ئەخەنە سەر تەخت
تەختی سەربەرزی، سەر ئەنجامی بەخت
دڵەی بێ ئارام ئەمرکێنن
چرای خۆشبەختی تیا ئەسووتێنن
سارێژی ئەکەزامی دەروونی
ڕزگاری ئەکەن ن لە چەندوچوونی
چونکە هەموو کەس بەئاوات ئەگا
تۆڵە ئەسێنێ و بەشی خۆی ئەبا
ئەگەر سەرڕاست و کاردروست ئەبووین
بۆ چ وا لە ژینا سەر نوشوست ئەبووین؟
لە عاستی ڕاستا بەد هەر ئەنەوێ
خوا ڕاستە و پیاوی ڕاستی خۆش ئەوێ.

خێزان

مامە!... بۆ چ وا داماوی؟ هەمووی لەبەر من؟
بۆ چ وەها ماتی؟ لەبەر چوونی من؟!.
پێت خۆشبێ یان ناخۆش، تازە نایەمەوە بەماڵتا!. ئەمەوێ سەربەست بژیم. دڵم ئەڵێ: «بۆ خۆم، لەگەڵ خۆم، بەرەنجی شانی خۆم بژیمە!... بیرنەکەی! تازە نایەمەوە... دڵت خۆش نەکەی!...

***

خانووەکەت: بام کۆشک و باڵەخانەبێ
خوانەکەت: بام دەوڵەمەندانە و شاهانەبێ.
بەرگ و پۆشتە نیم: بام شازاردا نەبێ.
بیرنەکەی!... تازە نایەمەوە بەکالتا. دڵت خۆش نەکەی!...

***

پێم ئەڵێی: مۆنی، بۆیە ناتدوێنم

پێم ئەڵێی: گرژی. بۆیە بەدەمتەوە پێ ناکەنم

پێم ئەڵێی: سست و شل و شێواوی، بۆیە کەمتر گەپت لەگەڵ ناکەم؛ بەلام نازانیت؟ چەوتیەکم ئەگەر هەبێ: لە بەدخواهیی خۆت و لە چەقبەند و کورتەی ڕەوشت و کردەوەی دوورلەمەندانەی ماڵی خۆتەوەیە ؟!.

ئێستا - کە خۆم لە دەست ماڵی تۆ ڕزگار کردووە و بەندی ماڵی تۆم پچڕاندووە: مۆن و گرژ و شل و شێواو نەماوم!... ئەی گەش و لەش خۆش و دڵخۆشیم نابینی؟!

ئیتر من بیری خۆت و بەندیخانەکەت ناکەمەوە! تازەش بۆ ماڵتا نایەمەوە.

بیرنەکەی!... دڵت خۆش نەکەی!...

***

منت بەخێو ئەکرد بەناوی مامێتی و خزمایەتییەوە...

خەڵکیش خەڵەتابوو، بەچاکی ئەیدایە قەڵەم!.

کەچی ڕاستییەکەی: نۆکەرێکت لێ ڕائەگرتم، ڕەنجبەریی خۆت و ماڵ و منداڵت بکەم!...

کەی تۆ وەک کوڕەکەت تەماشات ئەکردم؟!...

کەی وەک ئەو سەربەستیی هەڵسان و جوڵان و قسەکردن و ڕابواردنت ئەدامێ؟!...

کەی ئەتهێشت شتێک بکەم، تۆزێک پێچەوانەی ئارەزوی خۆت بێ؟!.

چەند کەسێک هەبوون خۆشیان ئەویستم و دۆستایەتیان لەگەڵم ئەکرت و بۆم ئەکۆشان. ئایا منت لەوان و ئەوانت لە من نەکرد؟

چونکە دوژمنی خۆت یا هی باوو باپیرت بوون؟!...

ئێستا کە وا لە دەست ماڵی تۆ ڕزگارم بووە، بەدەست و سەرمەست و سەربەستم.. تازەش نایەمەوە بەماڵتا... بیرنەکەی!. دڵت خۆش نەکەی!

***

بەلای تۆ خۆشیی من بەماڵی باش و بەرگی جوان و ماڵی خۆشەوە بەستراوە... بەلام لای من: خۆشییتی و دڵپەستی و سەر نوشتی تەریکەی خۆشیی ماڵەکەتا بە هێشتووە...

لای من بەختیاری: بەخۆشەویستی و دڵشادی و سەر ئازادییەوەیە.

ئەو جێیەم پێخۆشە کە دڵ تیا خۆشە...

ئێستا کە من لە تۆ ڕزگار بووم: ڕۆژ بەڕۆژ لە بالادام. تازەش بۆ لای نایەمەوە لاتا... سەرێشت ناکەمەوە بەماڵتا!... بیرنەکەی!... دڵت خۆش نەکەی!...[1]

---

(١) ئەم پەخشانە شیعرییەی لەوە دەچێ، دەربڕینی ژان و ئازارەکانی ساڵی یەکەمی خوێندنی بێ لە بەغدا ١٩٢٨ - ١٩٢٩.

***

## خزمایەتی

لەم جیهانەدا هەرچی هاودڵمە
ڕۆژی تەنگانە و خۆشی لەگەڵمە
بەو دڵ و چاوم ئەگەشێتەوە
پایەی بڵندیم بەرز ئەبێتەوە
خەو و هۆشیاری لە خەیاڵی دام
بۆ پاریزگاری لەژێر باڵی دام
ئارەزوی دڵ و دەرون و هۆشم
هاوتای هی ئەوە کردەوە و کۆشم
چرای خۆش بەختیم هەڵئەگیرسێنێ
خەم و ئازارم لێ ئەڕەوێنێ
ئەوە دایک و باوک، برای بەکارم
ئەوە لە جێگەی گشت کەس و کارم!...

***

ڕێی خوایەک بگرە گەورەی هەموانە
سەرکردەی هەموو چاک و پاکانە
بزانە لای ئەو کەسوکار هەیە؟
خزم و دایک و باوک،دۆست و یار هەیە؟
هەرچی چاک نەبێ و بەدڵی نەبێ
قەت لای نازدار و خۆشەویست نەبی؟!.

## فنی ژین

یەک شەو لە خەوا: خەم لە دڵ و مات و پەرێشان
بیرم لە ژیانێک بوو پڕی دەرد و سەرئێشان
بۆم هەڵنەدە هێنرا بەچە جۆرێک بم و بیخۆم
خۆم کە بەمەلا، یان بەئەمیر، یاخود بەشێخان
پاشان لە دڵی ناسکەوە گوێم لە شتێ بوو
دەنگێک کە بووە بۆنەیی بووژانەوەیی گیان
قیژاندی!. وتی: چیتە ئەمەندە بەپەرۆشی؟!...
بۆ منتە ئەمە؟ دەردە. مەکە. مەمەدە بەتالان!...

بۆم ئەبیـــە امـــیـــر: کـــورد بکەیە بەندەیی نادۆست؟[*]
زۆر و ســـتـــەمت بێنیستـــەدەر گـــیـــانی هەژاران!...
یاخـــود بەمـــەلا: کـــورد خـــەیە ناو چاڵی نەزانین؟
دوای خـەی، کـەری کـەی، بیـخـەیە ژێر باری نەیاران!...
یان خـۆت کـەیە شـێخ: کـورد بکەیە لەشکری دەروێش؟
هەوڵ دەی بۆ تەمـــەڵکردنی خـــەڵک بردن و تاڵان!...
ئەم پەندە لە (شـــاکـــر) بگرە گـــەر ئەتـەوێ ژین
(سەربەرز) و (گـیـان سـووک)بە، بەسەرزاریی، بەپەنهـان
(سەرڕاستبە) لەگەڵ خۆت و لەگەڵ خەڵکی (جگەرسۆز)
کـێت دی کـە لە ڕێی ڕاسـتـەوە ون بووبێ بەقـوربان؟!...[1]

بۆ خانەدانەکان

بەس خـۆت هەڵکێـشـە بەباوانتـــەوە!...
بەس نیـــازی بەخـــزمـــانتـــەوە!...
وەرە بـەر دیـوان قـــــــەومی هـەژارت
بۆیان بژمـــێـــرە کـــردەوە و کـــارت
چەند تێکوشـــاوی؟ چیت بۆ کـــردوون؟
چەند جـــار تەنگانە، دەســتت گـــرتوون؟
ئەوســـا تەرازووی تاســـەی هەژاران؛
پێشـــانتی ئەدا: ســـووکی یان گـــران!...
ئەجـــا تێ ئەگـــەیت کـــە خـــانەدانی؛
بۆ تۆ وەک یەکـــە: مـــانی، نەمـــانی!...
کـە خۆت هیچ نەبی... خەڵکی بەتوچی؟!...
ســـکـەی نـــارەوا!... وەک ڕەوا ئـەچی؟!...

بۆ دەست بڕەکان

بۆی لوا لـەم جـــیـــهـــانەدا زۆر کـــەس
خـــواردی بۆ خـــۆی و ڕێی نەدا بەر کـــەس

---

(*) لێرەدا پلارە کە گیراوەتە تەنیا ئەم میر و مەلا و شێخانە کە لە فرمانی ڕاستەقینەی خۆیان داوە. ئەگینا پیاوی دینی و پیاوی جیهانی ڕاستەقینە، لە کۆمەڵدا بوونیان پێویست و بەکەڵکە. (ش.ف).

(١) دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ کە لە دەستنووسی (خۆشخوانی - ١٩٣١/٣/١٦) ئەم هەڵبەستەی بەناوی (لەگەڵ دڵا) نووسیوە. لەگەڵ کەمێ دەستکاری و ئەو پەراوێزەی بۆی داناوە.

خواردنەوە و کەیف و بەزم و ڕەزمی کرد
بۆ هەموو جۆ گوناهی عەزمی کرد
هەندێ نەیتوانی نەیگو ناتوانم!...
گوتی: من دوژمنی خراپانم!...
زۆری بێ دەست ولات و بێ دەسەڵات
خۆی نیشاندا لە زومرەیی سادات
دەست بەجێ مێزەرێکی سەوزی کڕی
بەدرۆ دەستی میللەتێکی بڕی؟!...

## ئێمە و گەورەکانمان

ئەمە بۆتە ڕەوشت و کردەوەمان
هەرچی دەسدارە، خێوی نان و خوان
بێ ئەمەی تێی بگەین چییە و چەنییە
دین و آیین و باوەڕی بەچییە
خوا ئەناسێ بەڕاستی یان بۆ مەبەس
هاودەمی پیاوی باشە یان ناکەس
کاروباری یەکە لەگەڵ زاری
دڵی خاوێنە، جوانە کرداری
ڕەگەزی خۆی ئەوێ، ئەگۆشێ بۆی
یاخو ئەیفرۆشێ بۆ مەرامی خۆی
پێی ئەڵێین: دەرگەوان و نۆکەرتین،
بۆ هەموو کاروبارێ ڕەنجبەرتین
چەشنی کوێر هەرچی ئەو بڵێ ئەیکەین!...
هەرچی پێویستی بێ بەدەستی ئەخەین!...

***

ئەویش ساسیدە[1] ئەگەر پیرە
یاخو سەردارەیان کوڕی میرە
تاکو چەند ڕێی بدا دەروون و دڵی
زیرەکی بڕ بکا، ئەوەندە بەکوڵی
بەفروفێڵ و تەفرەدان و درۆ
قڕ ئەکا گیان و ماڵی قەومی خۆ!...

(١) ساسەییدە

ئێـــــمەش هێندە نەزان و پاشکەتووین
خـۆ بەخـۆ چەوت و دوو دڵ و بەدخـووین
تێ نەگـەیشـتووین لە دەردی خۆ، هێشـتا
دوژمـن و یار و مـــەردی خـۆ هێـشـــتــا
وا ئەزانین کـــە فـــەرمـــودەی خـــوایە
شـــێخ و ســـەردارمـــان کـــە ئاوایە!؟...

***

شـێخ ئەگـەر شـێـخـی راسـتـەقـینە ئەبوو
بۆ چ بەرو و باش و دڵ بەکـینە ئەبوو؟!...
بەم خـــــــەڵات و بـەراتـە بـۆیـان بـرد
پێم بڵێ: تەکـیـەیەک نەبێ چی کـرد؟!...
تەکـیـەکـەی فـاقـەیە بەتۆزێ نـان
کــەر و گــا ئەگــرێ پێی دزی ئیمان!؟.
شـێخ بەدوعـا و رمـوز و نیـازگـەری
نانی دوکـتــۆر و خـوێندەواری بری!...
دەبسـتـان، خـەسـتـەخـانە، علم و فن
شـــێخ ئەڵێ: «دوژمنن بەدین و وطن»!.
شـێخ ئەگـەر تۆزێ خـوای بناسـیـایە،
بێ زیـان، راسـت و دڵ دروسـت بـوایە
نەی ئەفـەرمـوو بەخـەڵکی مـەخـوێنن.
خـوێندن هی شـێـخـە وازی لێ بێنن»!...
بۆچی نەیفـــەرمـــووە رسـولی أمین:
«اطـلـبـــــوا الـعـلـم ولـو بـالـصـین»؟!.

***

لە مــەدا سـەرکــۆمــار وەکــو شـێــخن
هێند هەیە شـێخ نین بەڵام مـێـخن!...
هەرچی وانن بەراوێژی شـــێــخـــان
روت ئەکەن قـەومـە کە لە نان و خوان!...
تا وەکـــو چەک بەدەست و بەردەست بن
بۆ هەمـــوو کــاروبارێ دەردەست بن
یاخـو هەر چەشنی رانی بزن و مـەران:
بفـــرۆشـــرێن بەئارەزوی ئەوان!...

کاکی خۆم واز بهێنه لەم بیره
گەورەیی نە بەشێخە نە میره!...
هەر کەسێ هات بەکرەوەی جوانی
برسی تێر کرد بەسفره و خوانی
یاریدەی بێکەس و هەژاری دا
پیاوی زانست و فن و کاری دا
وازی هێنا لە خۆپەرستی خۆی
تەخت و بەختی لە ڕێی ولاتیا ڕۆی
چوو بەگژ بەدڕەوشت و زۆرداردا
هاتە مەیدان لە ڕۆژی هاوارا
بەختیاریی ولاتی، ئازادیی:
کردە ئامانجی خۆی بەدڵشادی
ئەوەتا «پیاوی میللەت و گەورەی»
«کەمە هەر چەندی بەندەیتی بکەی»

***

قسەیێکم هەیە پچوک و ڕەقە
تیژ و کاریگەرە ئەوەندە حەقە
ئەگەر بینین و فام و هۆشت بێ
مەکە بڕوا کە گەورەیێکت هەبێ!؟.
دوو هەزار شێخ و پیر و سەردارت
دست دەنە کاروبار کەس و کارت
پشتیان پێ نەبەستی سەد ئامان
تا نەهێنی بەڕاستیان ایمان
خۆ بەخۆ تێبکۆشە مەردانە
پێش بخە کورد کە قەومی کوردانە
تا خوا ڕۆستەمێکی داستانێک
شێری مەیدان وەکو «کریم خان»ێک
ئەرەخسێنێ بۆ خاکی کوردستان
ڕستگاری ئەکا لە زۆر دەستان

## ئەگـــینا تا کـــو شـــێخ و مـــیـــر وا بێ
## کـــوردی بێــچــاره قـــەت بەهێچ نابێ!؟...[1]

### ئاوازی هەژار

دەوڵەمەند!...
تۆش یەکێکی وەک من. نەپتری، نەکەمتر...
ئەو پەلۆپەیەی خوا بەتۆی داوە، بەمنیشی داوە...
هەر دوو وەک یەک لە دایک بووین...
یەک ئاسمان دامان ئەپۆشێ...
یەک ڕۆژ تیشکمان بۆ ئەهاوێژێ...
هەر مانگێک و چەند ئەستێرەیەکیشە ناو جەرگی ئاسمانمان بۆ ئەڕازێنێتەوە...
یەک بایە هەناسەی پێ ئەدەین...
یەک ئاوە تێنوێتیمان ئەشکێنێ...
هەر یەک زەویشە لە دەمە و مردنا ئەمان گرێتە باوەش...
ئەی بۆ چ خۆتم لێ ئەگۆڕی؟!...
بۆ چ لووتم لێ ئەکەیتە ئاسمان؟!...
بۆ چ ئەمخەیتە کۆتە و بەندی ئارەزوی خۆتەوە؟!...

***

دەوڵەمەند!...
تا دوێنێ بوو، هەژارێک بووی وەک من...
بەڵام فەلەک بەدڵی تۆ سوورا...
تۆزێ هێزت لە من پتر بوو، بەو بەشەی کە خوا دابویتێ وازت نەهێنا، بەشەکەی منیشت داگیر کرد!...
بۆی بەدەوڵەمەند! منیش بووم بەهەژار!
بووی بەدەوڵەمەند! منیش بووم بەهەژار!
هێزی لێ دەرکەی چت لە من پتر بوو؟!.
ئەوا من ملم بۆ زەمانە کەچ کرد. بەڵام تۆ بۆ بەدوو بەش تێر ناخۆی؟.
بۆ دانامرکێی؟!. بۆ چ بەچاوی سووک سەیرم ئەکەی؟!. بۆ چ ئەتەوێ بمخەیتە بەند و کۆتەی ئارەزوی خوتەوە؟!.

***

(١) هەر ئەم چامەیەیە لە ١٩٣٧/٥/١٤دا بۆ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵی ناردبووە لە ئەترووشەوە، لێرەدا کەمێ دەستکاری کردووە.

که له لاوازیی خۆم گەیشتم: هەوڵم دا له تۆ بەهێزتر بم، تا بەشەکەمت لێ بسێنمەوە...

بەڵام تۆ لەو دەمەدا که من کۆستم کەوتبوو، بەنەشئەی سەرکەوتنتەوە هەلێکی باشت دەست خوت خست هۆشی خۆت بەهێز کرد... بەدرۆ هەزار دەستووری وەک: گەورە و پچووکی، بێ دەنگی و گوێی - دەبڕی، ملکەچی و سەربەرزی، خواناسی و گەل و نیشتمان پەروەریت لێ کردم بەچەک!... گیانی سەربەخۆیی و پشت بەخۆبەستن و بەختیاریت تیا کوشم...

گیانلەبەرێکی، باربەری، کزی، ملکەچی، ترسنۆکی، چارەڕەشت لێ هێنامە بوون...

تا پایە و سایە، مایە و خۆشی و بەختیاریت تا سەربێ!

خەمی پەیداکردنی نان و بەرگی چەند ساڵانەش، و چانی ئەدام فێربم، منی نەزان هێشتەوە...

کردمی بەنێچیرێکی دەستوبرد گرت!.

کەواتە بۆ چ شەرمی خوا ناتگرێ و بەزەییت پیاما نایێتەوە؟.

بۆ چ له دڵڕەقی و زۆرداریی خۆت ناکەوی؟!.

***

دەوڵەمەند!...

بەخواناس خۆتم پێشان ئەدەیت، کوا دینت؟

بەجوامێر خوت ئەنوێنی: کوا کرداری شیرینت؟

بەسەربەرز خۆت دەرئەخەیت: کوا ابرووت؟ کوا دەروونی خاوێنت؟!

کەی تۆ هەژارێکت حەساندەوە؟... کەی دڵت بۆ بەردەستێکت خرۆشا؟!

***

دەوڵەمەند!

کام خواردن خۆشە: بۆ خۆتی ئەبەی!

کام بەرگت جوانە: خۆت لەبەری ئەکەی!

کام شت نایابە: بەهی خۆتی ئەکەی!

کام ژن جوانە: بۆ خۆتی داگیر ئەکەی!

کەچی لەگەڵ ئەمانەشا: له من چاوبرسیتر، له من دڵ تەنگتر، له من بێ هێزتری؟!

نه دینت هەیە، نه ڕەوشتی چاک!

نه پیاوەتیت هەیە، نه هۆش، نه ئاداب!

دڕندەیەکی بێ سامانی. لەگەڵ ئەمەشا خۆت له من ئەخەیتە ڕیزەی جوامێر و لاوچاکانەوە!. تا چەواشەم کەیت و تا سەر له کۆتەی دیلی و هەژارادا بم هێڵیتەوە!. تا خۆشی و جوانی جیهان له خوێنی من دەربێنی و بەرەنجی شانی من پێکی بێنی؟...

***

دەوڵەمەند!...

تۆ دینت بەرباد کرد!

تۆ ڕەوشتی چاکت لە ناودا نەهێشت!

تۆ جوامێری و لەش و هۆشی تەواوت پایەماڵ کرد!

تۆ ناکۆکی و شەڕوشۆڕ و جوێن و خوێن و درۆ و دووڕوویی و دزی و هەژاری و ناڵەباریت خستە ناوەوە!

***

دەوڵەمەند!

ڕۆژێک دێت: ئەم کڵپەی دەروونەم دامرکێتەوە

ڕۆژێک ئەبێ: ئەم ئایینە بەهێزە پیرۆزەم، بەسەر خۆت و تەخت بەختتا زاڵ بێ!... نەناوت بهێڵم نەنیشان!

ئینجا هەموو وەک یەک بووەستینەوە...

بەروبوومی جیهان، برایانە پێکەوە بخۆین...

کردەوە و ڕەوشتی جوان، سروە و نەشئەی بیری بەرز و کرداری گەورە، خۆشییەکی گشت لایی بینێتە بوون.

ئینجا ئەوسا ئەزانیت: کێمان لە بنچینەدا، بەشدار بووە، دیندار و ڕەوشتدار بووە، پایەدار!؟

کێمان: گیانێکی پاک و دەروونێکی خاوێن.

کێمان: دڵێکی ڕۆشن و ڕوویەکی خۆشی بووە!؟

کێمان: پیاوێکی تەواو بووە!؟

ڕاستی و سەربەستی

وەک هەندێ سۆفی بەڕیش و سیواک

یان هەندێ مەلا بەمێزەری پاک

یان هەندێ سەید بەشالێکی کەسک

یان هەندێ حاجی بەکەشیدەی تەسک

نیم: بەسیاست، بەزمانی لوس

بەفێڵ سوێند بخۆم: بەخوا و بەناموس

خۆم لای هەموو کەس وەها پیشان دەم

پیاوی چاکم و خواناس و هاودەم

چەواشەیان کەم، تەفرەیان بدەم

تا لە ژێرەوە کاری خۆم بکەم!...

یەزدانی گەورە وای دروست کردووم
بۆ ڕاستی و جوانی وەها شەیدا بووم
لە تەقەی ناحەز ناترسم، سەربەست
ئاشکرا هەرچی سەرم بکا مەست
ئەیکەم، ئەینوێنم، سەرم نانەوێ
خوا ڕاستە و پیاوی ڕاستی خۆش ئەوێ

***

دڵم بۆ جوانێک ئەگەر بخرۆشێ
بۆ نازەنینێک ئەگەر بجۆشێ
یان تاسەی گەمە و زەماوەندی کا
یان مەی و نەی و شەوئاهەنگی کا
یان بەستەی گەشی و جوامێری لاوێ
خواناس، کافرێ، ژنێ، یا پیاوێ
یان سەرمەست جوانیی ڕەز و ناو باخی
دوور لە نیشتمان بەهەشتە شاخی
یان سەرسوڕماوی مەردی، زانایی
بێگانە، خزم، شایی، گەردایی
یەزدانی گەورەوای دروست کردووم
بۆ ڕاستی و جوانی وەها شەیدا بووم
لە تەقەی ناحەز ناترسم، سەربەست
ئاشکرا هەرچی سەرم بکا مەست
ئەیکەم، ئەینوێنم، سەرم نانەوێ
خوا ڕاستە و پیاوی ڕاستی خۆش ئەوێ

***

کە من ئەهاتم بەرەنگاریت کەم
وەیم بۆ هیچ کەس نەبێ زۆر و کەم
بۆ نیشتمانی بێکەس و هەژار
تێکۆشم بەدڵ بەدەست و بەزار
ئەزانی بەدخو ئەگەر زۆرداریی
بۆ گیانی ئاسک دەستە و ئازاریی

بۆ چ خەریک نابیت بەکاری خـۆوە؟
سەربار ئەخەیتە سەرباریخـۆوە؟
کورتی و بێ شەرمی و ناتەواوی خـۆت
ڕێک و پێک ناخەیت پەشێواوی خۆت؟!
نازانی؟ یەزدان وای دروست کـردووم
بۆ ڕاستی و جوانی وەها شەیدا بووم
لە تەقەی ناحەز ناترسم سەربەست
ئاشکرا هەرچی سەرم بکا مەست
ئەیکەم، ئەینوێنم، سەرم نانەوێ
خوا ڕاستە و پیاوی ڕاستی خۆش ئەوێ

***

بەسیە چەند کەست لە یەکتری کردا
چەند کەست تووشی دەردی سەری کردا...
بەبۆنەی دین و هۆی ایمانەوە
دڵی هەزارت خەستە ژانەوە!
بۆ دینت نییە کە تۆ وا ئەکەی!...
بۆ چاکەیش نییە. خۆت ڕسوا ئەکەی!؟
ژین و سەربەستی لە خەڵک بار ئەکەی
نازانی چاکان لە خۆت هار ئەکەی؟!
بۆ کەڵکی خۆتە ئەم ڕاو و ڕووتە!...
ئەم تەفرەدانەت پیشەی نابووتە!؟
بزانە، یەزدان وای دروست کـردووم
بۆ ڕاستی و جوانی وەها شەیدا بووم
لە تەقەی ناحەز ناترسم سەربەست
ئاشکرا هەرچی سەرم بکا مەست
ئەیکەم، ئەینوێنم، سەرم نانەوێ
خوا ڕاستە و پیاوی ڕاستی خوش ئەوێ

***

ڕۆژێک دێ بڵێم بۆ چ خۆت ڕانەگرت؟
ئەو ڕەغنەیەی خۆت لە خەڵکت ئەگرت

نانت پێی نەخوارد، بۆ چ خۆت لەناو برد؟
بەدبەختی ڕووڕەش، هەی خۆڵت بەسەر
خواناسی و چاکیت وەها بردەسەر؟!
نەتزانی؟ زۆردار هەر بێزار ئەبێ
زۆروستەمی لەسەر بار ئەبێ
ئەوەندەی خەڵکت تۆ بەو دەردە برد
ئۆخەی سەد ئۆخەی خوا تۆی ڕسوا کرد
جا تێگەیشتی؟ کە خوا وای کردووم
بۆ ڕاستی و جوانی وەها شەیدا بووم
لە تەقەی ناحەز ناترسم، سەربەست
ئاشکرا هەرچی سەرم بکا مەبەست
ئەیکەم، ئەینووسم، سەرم نانەوێ
خوا ڕاستە و پیاوی ڕاستی خۆش ئەوێ

## خۆشیی ژیان

هاتمە جیهانەوە بۆ ئەمەی لە جیهاندا بژیم...

جیهان بۆ من کراوە. لەبەر ئەوە بەروبوومیشی بەرەو ڕووی من کراوەتەوە... بۆ چ لەبەر چرای ڕۆژیا: خۆشی لە کار و فرمانی کەلکداری نەبینم؟ بۆ چ لەژێر خیوەتی شەویا: خۆشی لە ماندوو و حەسانەوە و نووستن نەبینم؟!...

بۆ چ بەتەماشاکردنی شاخ و باخی ڕەنگین و چیمەن و لالەزاری شیرینی، چاوئەندازی دەمی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای، بەتریفەی مانگەشەو و جریوەی ئەستێرانی، بەخوڕەی ئاو و تافەتافی چەمانی... خۆم دڵگەشاو نەکەم، خۆم نەشئەدار نەکەم؟...

بۆ چ بەهەڵمژینی کزەبای فێنکی، بەخواردنەوەی ئاوی سازگاری، بەخواردنی میوەی زەرد و سووری پێگەیشتووی چەند ڕەنگەی مزر و ترش و شیرینی و، سەوزاواتی تەڕ و تازە ئاسک و ئاوداری، یان خورشتی جوانی ڕەنگینی، خۆم تێر و کامەران نەکەم؟...

بۆ چ لە بەخێوکردنی پەڕندە و ڕام کردنی دڕندەی جوان و نازەنینی لە ڕۆیشتنی ناو کۆشک و هەواری ڕازاوەی پاک و خاوێنی، لەپۆشینی پوشتەنی ڕەنگاوڕەنگ و نایابی: خۆشییەک وەرنەگرم، گەشایشێک؟

بۆ چ بەو پەلوپۆیانە کە خوا لەشی منی پێ ڕێکخستوە لێی ئاوەتە بوون، کە بەهۆی ئەوانەوە خۆشیی خواردن و ڕۆیشتن و بینین و گەڕان، گوتن و خوێندن و بیرکردنەوە و بیستن و پێکەنین و نووسین و گەشت و سەیران کردنم پێ نەگات: سەرێکی پڕ ئاسایش و دڵێکی ڕۆشنی سوپاس و تاسەم نەبێ؟

***

ئەشێ! لە خوێندنەوەی ئەم نوسراوە خۆشانە، لە وەرگرتنی ئەم زانست و فەنە بەکەڵکانە، لە بیستنی ئەم گۆرانی و ئاواز و سازەی خوا کرد و خۆ کردانە، لە فێربوون و فێرکردن، سروەیەکی خۆشیم تێکەوێ، گەشییەک!...

ئەشێ! بەو خوشەویستییە کە هەموو کار و فرمانم لەگەڵ هەڤاڵەکانما بەند ئەکا و رێکوپێک ئەخا، بەو خوشەویستییە کە زنجیرەی ڕابواردنی ژیانمان پڕ لە ئاهەنگ و بەزموڕەزم و یاریدە و یەکپەروەری ئەکا، بەتاسەیە کە من جووتی نازەنینێکی پەری رووی هاو دڵ ئەکا... بەمانە خۆم بەختیار بزانم سەر ئازاد...

***

بەڵام ئاخ جیهان! ئاخ!

پرت شین و شەپۆر و ئازار و ئاوات و هاوارە!...

ئەم هەموو گەنج و مایەی خۆشییەت تا سەر دڵێکی خۆش نەکرد!...

تەموغەمی لەسەر لانەبرد!...دوژمن

ئەی دوژمن!...

دوژمن

تۆم دی: لە خێزانێکی پەشێواو و شر و پڕا، لە خزمایەتییەکی سارد و سڕا، لە کۆمەڵایەتییەکی پچڕ پچڕا...

تۆم دی: لەسەر دارێکی بێ سەرا، لەبەر دەستێکی بی فەڕا، لە گەورەیەکی بێ هونەرا...

تۆم دی: لە شێخێکی وەک مێخدا، لە مەلایەکی لابەلادا، خانەدانێکی بێ خاداندا، لە بازرگانێکی گرانجاندا، لە خوێندەوارێکی بێ گیاندا...

تۆم دی: لە رێبوارێکی بەجەنگا، لە هاودەمێکی بێ کەڵکا...

تۆم دی: لە شێوەی زۆرداری و هەژاری و نەخوێندەواری و نالەبارییدا، لە هەموو نەنگی و ناشیرینی و ناتەواوی یەکدا...

***

لە منالیدا: تێزم پێ کرا، فیزم بەسەرا کرا، شەڕ و شۆڕم لەگەڵ کرا.

چونکە داوای یەکسانیم ئەکرد لەگەڵ بەچکە دەوڵەمەند و زۆردارەکاندا...

لە فرمانبەریدا: دوو جار ماڵم دزرا، سەجار نیازی کوشتنم کرا.

چونکە زەویوزاری جوتیارە بێکەس و هەژارەکانم نەئەدایە تالانی بەئاغا و بەگەکان!...

ئەویش هەر لەبەر ئەوەیە کە تۆ هی هەمووانی. کەچی هەر کەس ئەیەوێ بەتەنیا بۆ خۆیت داگیر و ئەوانی کەت لێ بێ بەش بکا!... لەبەر ئەوە تا وەها بێ لەناو خۆماندا: هەر کوشتن و برین، زۆر و ستەم، گرتن و دوو دڵی ئەبینین!...

داخەکەم! دوورە ئەو رۆژەی هەمووان بتوانن بەختیار و سەرئازارد بژین!...

دووریشە تا هەبێت و ئەشبێت یەکێک بتوانێ تا سەر داگیرت بکا و پێتەوە بەختیاربێ!...

چونکە ئەگەر بشتوانێ، بڕواناکەم شین و هاواری بیماران و بێچاران بهێڵێ ساتێ دڵی ئاسودەبێ!...

ئەمەی لە پێشەوە گوتم ڕاستە. بەڵام ئێستە نا!... ئەوسا کە گشت لا وەک خۆت پێکەوە بڵێن جیهان هی هەموانە، هەموان ئەبێ وەک یەک پێکەوە، برایانە تیا بەسەر ئازادی بژین!...

بەچاووڕراو: کرام بەفاشیستی، کرام بەنازی، کرام بەکۆمۆنیست، کرام بەئەندام و سەرۆکی کۆمەڵانی نهێنی... چونکە ئەمگوت بەشێخ و مەلا و خوێندەوار و سەردار و بەردەستەکان: «ئەبێ لە فرمانی ڕاستەقینەی خوتان لا نەدەن...، لەگەڵ گەل و نیشتماندا دۆژمنایەتی نەکەن»!...

هەوڵ درا: نانم ببڕرێ، فرمانم لە دەست دەربکێشرێ، بەنەخوێندەوار بهێڵرێمەوە، بخرێمە بەندیخانەوە، تەفروتونا بکرێم... چونکە لەسەر هەژار و بێکەس و لێقەوماوم نەکردەوە!...

***

لەگەڵ ئەمانەشتا ئەی دوژمن! زانیوتە؟ کە نەتتوانیوە بەربەستی سەربەستی و سەرکەوتن و بەرکەوتنم بکەی؟ وە لە گەیشتن بەئامانجی پیرۆز و بەرزم ڕەنجەڕۆم بکەی؟!... زانیوتە؟ کە لە زۆرداریتەوە دادخواهی، لە خەم پێ دانتەوە دڵخۆشی و بەختیاریی، لە تالان کردنتەوە ماڵداری و دەوڵەمەند بوون، لە دەست قوچاندنتەوە دەستبلاوی و پیاوەتی، وە لە پەشم و قینتەوە خۆ خۆشەویست کردن و دڵپاکی، لە کز کردنتەوە خۆ بەهێزکردن و یارمەتیدان و پێشەوایکردن بەکورتی لە بەدکرداری و ناڵەباریتەوە فێری هەموو کردەوە و ڕەوشتێکی جوانی و بەهێزت کردوم؟!...

لەبەر ئەوە ئەی دوژمن!. لەبەر ئەم هەموو چاکە و بەهرە و هونەرمەندیەش کە لە سایەی دوژمنایەتیی تۆوە دەستم کەوتووە، سوپاست ئەکەم لە بارەگاهی خوادایش بەڵێنت ئەدەمێ: «کە تا ئەمێنم بەدڵ خۆشم بوێی و قینت لە دڵا بۆ هەڵنەگرم، وە دوژمنایەتیت لەگەڵ نەکەم!... بەڵکو وەک دۆستێکی دڵسوز، کۆشش و هەوڵ بدەم بۆ چاک بوونت، وە لە ڕێی چاکەدا بۆ سەرکەوتن و پێشکەوتنت»!...

***

لەمە قەت سەرت سوڕنەمێنێ ئەی دوژمن! چونکە منیش لە پێش چەندساڵێکا وەک تۆ بووم. وام ئەزانی: ئەگەر خراپە لە خراپەکەر نەکەم وە دوژمنایەتی بەدوژمن نەنوێنم، ناپیاوەتی ئەکەم!... وام ئەزانی کە تەنیا لە تۆڵەسەندندایە، ئاسودەیی دڵ و ئارامی گیان!...

بەڵام کە سەرەنجم دا: لە تۆڵەسەندندا دڵ و دەروونم زامدارتر و بەئازارتر ئەبێ، وە لە دوژمنایەتیا بەختیاری لێم بار ئەکا. پاشان کە ورد بوومەوە: خۆشم بۆ خۆم هەرە گەورە دوژمنێک بووم!... بامدایەوە!؟... چونکە دیاردی دابۆم، کە هونەرمەندی و گەورەیی لەوە دایە کە لەجێ و وەختی خۆیا: پاداشی خراپە کەر بەچاکە بدەمەوە، وە دوژمنایەتی بگۆڕمە سەر دۆستایەتی!... بەڵێ... کە ئەمانم بۆ دەرکەوت: بڕیارم دا کە -لە پاش پاراستنی گیان و سەربەرزی- «قەت لەگەڵ دوژمنا دوژمنایەتی نەکەم»!.

***

لە ڕاستیا ئەی دوژمن!... من و تۆ زۆر لە یەک جیاوازین:-

خراپەکردنی تۆ لەگەڵ چاکاندایە، بۆ کەڵکی خۆت و بۆ ئازاردانی خەڵک!... خراپەکردنی من لەگەڵ دوژمنانی کۆمەڵدایە، بۆ چاککردنەوەی خۆیان و بۆ کەڵکی گشت لایی.

تۆ بەرچاو تەنگی. نیشتمانت ئەو زەوی و خانوەیە کە بەهی خۆتی ئەزانی، وە گەلیشت تەنیا خۆت و ئەو کەسانەیە کە بەکارت دێن!... بەڵام من نیشتمانم هەموو سەرزەمینە. وە گەلیشم هەموو دانیشتوانی سەرزەمینە، بەچاک و خراپیانەوە!...

تۆ وا تێگەیشتوویت کە چاکەی کەست بەسەرەوە نییە!... بەڵام من بڕوام وایە کە چاکەی گشت کەسم بەسەرەوەیە!... لەبەر ئەوە یارمەتیی چاکەکانیان ئەدەم. وە لەگەڵ ئەوانیشا هەوڵ ئەدەم بۆ چاکردنەوەی خراپەکانیان، وە بۆ چاکەی گشت لایی!...

تۆ لە خراپەی خوتەوە: ڕۆژ بەڕۆژ کزتر و دڵزیزتر و بێ هێزتر ئەبی!؟ بەڵام من لە خراپەکانی تۆوە فێری چاکە و گەورەیی و دەستداری ئەبم.

وە لە چاکە لەگەڵ کردنیشتا دڵم ئاسودەتر و گیانم بەئارامتر و لەشم بەهێزتر ئەبێ!...

لەبەر ئەوە سەرت سوڕ نەمێنێ ئەی دوژمن! کە بۆچ بەسەرتا زاڵ ئەبم. وە هەتا دێی، تۆ بەناخی عەردا ئەچیتە خوارەوە. کەچی من هەتا دێم لە بەرزبونەوە و پەسند بوون دام!...

***

ئەی دوژمن من!...

پێویستە بزانیت: تەنیا هێزێک کە بتوانێ دەرەقەتی هەموو شتێک بێت، خوشەویستییە!... تەنیا، لە سایەی ئەو سەرچاوەی خواییەوەیە کە ژیان و گوزەران و کامەرانیی گشت لاییمان پێک دێت. بەڵام داخەکەم تۆ لەو خۆشەویستییە بێ بەشی!؟... لەبەر ئەوە قەت بڕوا مەکە هەتا پشم و قین دڵت داگیر کات، بتوانیت ساتێ دڵت ئاسوودەبی!؟... قەت بڕواش مەکە، کە بتوانیت بەسەر هەموو کاروبارێکا زاڵ بیت!... بەڵێ، تۆ وەختێ ئەتوانیت بەسەر هەموو گیروگرفتێکی ژیانتا زاڵ بیت!... وە تەواو بگەیت بەهەموو شادمانی و کامەرانییەکت، کە دڵت لە پشم و قین و خۆپەرستی پاککەیتەوە، وە پریکەی لەو ڕۆشنایی خوایەکە پێی ئەڵێن خۆشەویستی!... ئەوسا: کە شادمانی و کامەرانیی گشت لایی بەشادمانی و کامەرانیی خۆت بزانیت.

وە بەسەرپەرشتیی چرای خۆشەویستیی گشت لاییەوە، دەست خەیتە ناو دەست هەموو براکانی سەر زەمینتەوە، وە هەوڵ و کۆشش بکەی بۆ پێشکەوتنی هەموو لایەک. کە هەموو لا بەچاک و خراپیەوە چاکەیان بەسەرتەوە هەیە!... ئەوسا تۆیش منت خۆش ئەوێ. ئینجا ئەوساکە منیش ئەڵێم دوژمنەکەم – نا– دۆستەکەم هەربژیت»!؟...

شعر

نەی و مـەی و یار نیـیـە لە دەورم
کـز و شـپـرزە و گـیـرەوەی جـەورم
تاسەی دڵداری... کوانیی لە سەرما؟
قـەڵەم تۆ بشکێ کـارم پێت نەمـا!
نەی و مـەی نەبێ و یار دیار نەبێ
کەی شعـری جوانم لەسـەر زار ئەبێ؟!

شەو[1]

شەو!... تۆ سامداری بەتاریکیت، مەندی بەبێ دەنگیت، دڵگیری بەرازاوەییت.

شەو! باڵی فراوانی تۆ سەر زەمینی دانەپۆشیایە: ئەم شورەیی و ئابڕوو چوونە، ئەم هەموو گریان و شینە، ئەم هەموو کوشتن و برینە، لە دەست گیان لەبەر نەئەوەشایەوە...

شەو!... سێبەری باڵی تۆ نەبوایە: ئەم هەموو دڵدارانە بەنازدارانیان نەئەگەیشتن، سنگی ئاسمان و تریفەی مانگ و جریوەی ئەستێران هێندە جوان نەئەبوون. ئاهەنگ و زەماوەند نەئەگێڕرا. ئینجا دڵ نەئەکرایەوە.

فرمێسک وشک نەئەبووەوە. چاو نەئەگەشایەوە. لەش نەئەبووژایەوە. بەڵکو خەفەت و سزا پیاوی لەناو ئەبرد...

شەو!... تۆ نەبویتایە: جوانیی ڕۆژ دەرنەئەکەوت. ڕۆژ هێندە خۆشەویست نەئەبوو. ڕۆشنایی ئەمەندە نازی نەئەکێشرا بەڵکو پیاوچاکی لە خراپ، ڕووناکی لە تاریکی، خۆشی لە ترشی، درۆی لە ڕاست جیا نەئەکردەوە...

شەو!... تۆ پەنای دز و درۆزنانی. ڕابەری دۆست و دڵدارانی. لە مەندیتا بلبل تەفرە ئەدەی: بەدیار خونچەوە بووەستێ تا بەیان. خونچەش پێ ئەگەیێنێ تا دەمەو ڕۆژ. کەچی کە دێنە سەر پێکگەیشتن: خەو لە بلبل ئەخەی، خۆشت هەڵدێی. خونچە ئەدەی بەبێگانەیەک. خونچە ئەکرێتەوە، بلبلیش دڵی ڕا ئەچەنێ. ئەویان پێ ئەگەیێنی، ئەمیشیان لەناو ئەبەی!...[2]

---

(١) لە دەستنووسی (خۆشخوانی)دا مامۆستا نووسیویە: لە مارتی ١٩٣٣دا نووسراوە لە ٤ مایسی ١٩٣٣ لە ڕۆژنامەی -ژیان-دا چاپکراوە.

(٢) لەمەدایە شاعیری فارسی دەڵێ:

عطر گل بلبل کـشـیـد و رنج بلبل باد بود
بێستون را عـیشق کند و شهرتش فرهاد بود

یەکێکی خۆشمان دەڵێ:

شەوا... تۆ داخی. گوڵی باخی. نازداری. نازەنینی. گەورەیەکی زەبر بەدەست و دڵ نەرمی. لەبەر ئەوە لە هەموو دڵێکدا جێت بەرزە. ئەگەر گەورە نەبوێتایە: ئەم سەر و سامانەت نەئەبوو. ئەگەر ئەم گاز و بازەشت نەبوایە: وا خۆشەویست نەئەبووی!...

شەوا... تۆ تۆمارێکی بەشت زۆریت. ئەوی من نووسیومە لاپەڕەیەکتە. بەڵام تۆ سەد لاپەڕەیت!...

## بۆ پەزیشک

توخوا پێم بڵێ: تۆش هەروەک من لە گۆشت و خوێن و ڕەگ و ئێسک دروست نەکراوی؟!... ئەی بۆ چ؟... ئەوی تۆ ئەیزانی من ڕێی پێ نابەم ئەوی تۆ ئەیکەی من لە توانامدا نییە. ئەوی تۆ بەدڵتا یەت من بەبیریشما نایەت؟!...

سەیر نییە؟... کە تۆ سامدارێکی ترسنۆک و زۆردارێکی دڵ نەرم و پەلەپەل کەرێکی لەسەرخۆ و بەجەرگێکی بێ جەرگی؟!...

سەیر نییە؟... کە هەموو دەم لەگەڵ نەخۆشایت و کەچی خۆت خۆشی؟!

شەو و ڕۆژ دەستت لە بڕین و بڕینایە، کەچی خاوێنی؟! هەموو دەم گوێت لە ئاخ و ئۆفی دەردەدار و نەخۆشانە، کەچی خۆت ڕووخۆش و دڵخوشی؟! ئەی توخوا سەیر نییە؟... کە تۆ ئازارم ئەدەیت و بێزارم ئەکەیت و ئەمگرێنی، کەچی من لە پاش چاکبوونەوە، لەگەڵ پاداشدانەوەشا، سوپاست ئەکەم و بەدەمتەوە پێ ئەکەنم؟!...

## هاودەم

نەخۆم بەئارەزووی ماڵەوە بەند ئەکەم، نە بەهی خزمانەوە... نە دیلی بەندی کردەوە و ڕەوشتی کۆنی ڕزیوی کۆمەڵایەتی ئەبم، نە هی دین نە هی ئایین...

نە ڕەگەز لێک ئەدەمەوە، نە شار، نە نیشتمان... نە لە تەمەن ورد ئەبمەوە، نە لە هەژاری، نە لە پایەداری...

---

= گوڵ بەدەم بادی سەباوە پێکەنی و بولبول فڕی
یەعنی عاشق لازمە دووربێ لە یاری بێ وەفا

مەولەویش هەر لەم تەوەرەدا دەفەرموێ:

ڕەمەزان طلوع، شەوال شام شەن
أول ڕۆژ ئەو نامەواری شەن
غورە غورەی ئەو، سەفاش پەی غەیرەن
ئازیز قیبلەی من، وەفاش پەی غەیرەن

ئەم سێ پارچەیەم لە مامۆستا ئەورەحمان مەسرەپییەوە وەرگرت، وەک لێکچوون و خولانەوە بەدەوری مەبەستێکدا، سوپاسی دەکەم.

چونکە لەم جیهانەدا، بەتەنیایی بووم، بەسەربەستی بووم، بەئازادی هاتوومە ناوەوە...
خۆم گیرۆدەی هیچ کۆتە و زنجیرێک ناکەم!...

***

لەم جیهانەدا: ئەگەڕێم بۆ یەکێ؛ لە هۆش و تاسەدا لە خۆم بچێ ئەوی بەمن خۆشە بەویش خۆش بێ...
ئەوی دڵم نایگرێ، دڵی ئەویش نەیگرێ...

لە خۆشیا لەگەڵما بێ، لە تەنگانەیشا هەر لە گەڵما بێ... یارمەتیم بدا و یارمەتیی بدەم. درێخیم لێ نەکا و درێخی لێ نەکەم. هەموو دەم تێرم لێ نەخوا و منیش بێ هاودەمی ئەو هەڵنەکەم، بەیەک شت پێ بکەنین، بەیەک شتیش بگریێین!...

***

سا کچ بێ یان کوڕ، ژن بێ یان پیاو، هاو ڕەگەز و نیشتمان و ئایین بێ، یا جیاواز. دەوڵەمەند بێ یان هەژار. هاوکار و فرمان بێ یان نا... ئەبم بەهاودەمێکی تا سەری: تا گیانێکی پاکی هەبێ، دەروونێکی خاوێن. تا دڵێکی پڕ تاسە و بەجۆش و خرۆشی هەبێ، کردەوەیەکی جوان و ڕەنگین - لەگەڵما ڕێککەوێ و لە تەکما ڕێککەوێ!...

***

برا دۆست! گەڵێک لام پیرۆزی چونکە تاسە و بزەکەت، هەموو دەم لە خەو و بێداریدا ئەمگەشێنیتەوە دڵم پڕ ئەکاتەوە...

چەند خۆشە؟!. کە لەبەر گوێ ئاگرە نیڵە نیڵەکەی شەوانی زستان دا، بێ ترس و لەرز هەموو ڕازێکی دڵی خۆمت پێ ئەڵێم و هەموو پەنهانییەکی ژیانمت لێ ئاشکرا ئەکەم!... تۆش بەو چاوە گەشانەتەوە کە پرشنگی خۆشەویستیی تیا ئەچریسکێتەوە تەماشام ئەکەیت و کون و قوژبنی دەردە و ئازارم ئەپشکنی.

یا بەنەرمی و شیرینی برایانەوە برینم سارێژ ئەکەیت و کڵپەی دەروونم دەکوژێنیتەوە!...

چەند خۆشە! کە لە نەخۆشیا سەرم لێ ئەدەیت و لە تەنگانەدا بەهاوارمەوە دێیت.

چەند خۆشە! کە لەسەر خراپە، بەسەرما دێ و ڕێی چاکەم پیشان ئەدەیت.

چەند خۆشە! ڕاز و گلەییەکانت: کە بێ پەیانیت لە گەڵا ئەکەم و گفت و بەڵێن بەجێ ناهێنم.

چەند خۆشە! کە توڕەت ئەکەم و ئاشتت ئەکەمەوە؛ هیچت لە دڵا نامێنێ و هیچم بەدڵەوە نامێنێ.

چەند خۆشە! ڕابواردنی ئاهەنگان و سەیران و گەشتوگوزارانت.

برا! تۆ دەرمانی دەردمی. شنۆی ژینمی. ڕووناکی دڵمی. تۆ سروەی خۆشیمی...

لە تۆوە شادیم دەست کەوت. لە تۆوە بەختیاری... لە تۆوە سەربەرزی...

چونکە خۆم یەکێک بووم، بەتۆوە بووم بەدوان!...

## سولاف

سۆلاف[*] روخسارت! سۆلاف روخسارت!
سۆلاف ڕەنگینیی هەردە و کوهسارت!
کام زەردەخەنە وێنەی هەڵاتن
ڕۆژی سەر کەلی بەیانیانتە؟
کام خاڵ وێنەی ماڵ سەر کێوانتە!
کام چاو بەجوانی وەک چاوانتە؟
کام سوخمە و کەوا، کراس و دەسماڵ
ئارایشدەر وەک دارستانتە؟
کەی زرنگەی بازن، قەتارە و خرخاڵ
شیرین وەک هاژەی تافاوانتە؟!...

***

سولاف روخسارت! سۆلاف روخسارت!
سۆلاف ڕەنگینی هەردە و کۆهسارت!
عطر و عبیری بای بەیانیانت
زەرپۆشی دڵگیر چاونەندازانت
باوەشێن بەدەست دار چنارانت
ساز بەدەم کەوی سەر کۆسارانت
ئاوی سازگار، میوەی باخانت
گۆرانی و بەستەی تەڕ دەماخانت
تافەی سۆلافت، خوڕەی چەمانت
سەما و هەڵپەرکێی دیدەکاڵانت
عیشوە و گوریشمەی دیدەکاڵانت
ڕازاندوویتیەوە کچی خوا کردووم
چاوبەستت کردووم، وەها سەرمەست بووم
سەربەست بووم تا هەم لە کەس ناکەم سڵ
ئازاری جیهان قەت ناگرمە دڵ!...

***

---

(*) سولاف تەماشاگایەکی زۆر ڕەنگینە لە تەنیشت عەمادییەوە. لە هاوینەهەوارەکانی کوردستانی عێراقە.
(ش.ف)

سۆلاف روخسارت! سۆلاف روخسارت!
سۆلاف رەنگینی شێوەی کوهسارت!
هێندە لە دڵم کـــاری کـــردووە
تاریکی ژینم باری کـــردووە
سوێند بەو ئێزەدەی دروستی کردووی،
وەها جوانتر و تەردەستی کردووی،
دڵخـواستم وایە تاکو ئەمێنم
«رووخۆش بم وەک تۆ. کەس نەرەنجێنم»!

کاژی بلکیف[*]

سوار: دارە کاژەکەی چیاکەی بلکیف
چیتە وا شەیدای خوت داوەتە کیف
کاژ: هۆ سوارا... شێت نیم بەدەمە کێوان
لەیلام نەفریوە وەکو مەجنونان
لەیلام فیرییە، هەر ئەم چیایە
ئازادی و خۆشی ئەوم هێوایە
سەیری ناکەی؟ سنگی بێ گەردی سپی
روو بەژن و بالای ناسک وەک پەری
ئارای زێرینی، پشتێن زیوینی
گەشە و نەشئەکەی شیرین، رەنگینی
دامێنی سووری، چڕ و جنوری
چەماوی خوری وەکو بلووری
باخ و بێستانی بەدارستانی
مەل و بلبلی ناو گولستانی
چەدڵکێشێکە و چەندە دڵگیرە!...
پێ بەستەی ئەکا شێت ئەگەر ژیرە!...
من و لەیلای خۆم هەرد و هاودەمین
دەست لە ملانی یەک، دەم لەناو دەمین[1]

---

(*) (بلکیف) سەیرانگا و هاوینەهەوارێکی بەناوبانگە، کە لە ناوچەی مزورییەوە لە قەزای دهۆکدا. (کیف) بەشێوەی ئەوێ بە(فیری) بە(نیرە) (کاژ) بە(سنەوبەر) ئەڵێن.

(1) راستتر: دەست لەملان و دەم لەناو دەمین.

تۆ شەرم ناکەیت بەخۆت ئەنازی؟
لە خۆت گۆڕیوە ئەکەی شانازی؟
لەیلای تۆنییە دیلی زستانە؟
بەندیی لەشکری بەفری کوێستانە؟
بەخۆت نازانی کە ساردی و سڕی؟
وەهای تەزاندویت کردوویتیە گڕی؟!

کاژ: سوار نەزانی، سوار نەزانی!...
فنی شەڕ و شوڕ تۆ شارەزانی!...
بەبەرگ و شێوە هەڵمەخەڵەتێ!
زەندەقت نەبا هەڵپە و هەڵمەتێ!
مەزانە بەفر، بەفرەیی خۆی[1]
لەیلام بستێنی بیکاتە هی خۆی
ڕەنجەڕۆم بکا، شەرمەزارم کا
تووشی ئازار و شین و زارم کا
کێمانە سەری بڵند کردووە؟
کێیە لە پایین منا کەوتووە؟
نابینی دەستە و دامێنی لەیلا
تکای لێ ئەکا بی بەخشی بەخوا؟
پاش گوناهباری بەپەشیمانی
بەجۆگەی فرمێسک خۆی ئەشواتەوە
ڕووسووریی لەیلا دەرئەخاتەوە؟!...
نابینی ڕووخۆش، چەند شۆخ و شەنگم
پۆشتە و نەخشینم، لای ڕۆژ پەسەنگم[2]
کە هەڵدێ بەیان بەزەردەخەنە
«ڕۆژباشی»م ئەکا، ئەڵێ: پێکەنە!...
بەکزەبای بەیان ئەشەکێمەوە
بۆ دۆستی دڵسوز ئەگەشێمەوە
ئێستەش چاودێری ئەو لەیلا جوانەم
چەتر هەڵگری ئەو گوێ گۆلانەم

---

(١) بەفرەیی: بەزۆریی

(٢) پەسەنگ: پەسەند.

سایە و سێبەر و نیگا هەبانیم
لە لەیلا نابڕێ تاکو نەمانیم
گەر زستان وەها بێتە زانمایە
بەزەبری سەرما بیگریانمانە
ڕەشەبا و بەفر و تەزرە و بارانی
دایەزراندایە شکوە و شانی
ئێستێکە منیش وەک ئەو دارانە
ڕەنگ زەرد، پەشوکا و، بەسەر کزانە
ئەژیام. بێ بەرگ و بێ نەوا ئەبووم
خۆم ئەگرتایە: ئاوەها ئەبووم؟!
هەرچی خۆی ئەگری، پرزەی ئابڕی
بەرامبەر سەختی بەرگە ئەگری
کردە و کۆششە سەرچاوەی جوانی
ڕاستەوخۆ ئەتیا بۆ کامەرانی
سوار: سەرم سوڕ ماوە لە گەشی و جوانیت!...
ئەی کاژ بۆ چ هێندە دڵ ڕەق ئەڕوانیت؟
بۆ ڕەگەزی خۆت بۆ چ هێند بێ خەمی؟
لە شیوەنیاندا وا کەمتەرخەمی!؟...
نابینی چۆنە شین و زاریان
بەدەست سەرماوە دەردی کاریان
تۆش وای هەڵ ئەگرت کز و دڵ زیزبی
نەک وەکو ئێستا گەش و بەفیزبی!...
کاژ: سووار لێم گەڕێ! وازم لێ بێنە!...
لە کاری خوادا پەنجەت مەگێڕە!...
کەس ناگاتە ئەو بۆ دادپەرستی
وێنەی کەس نییە بۆ کار دروستی
ئەم دارە کاژە کە وای ئەبینی
هاوین دیار نادا جوانی و ڕەنگینی
ئەمانەش خۆیان وا ئەنەخشێنن
خۆ بەبەروبووم ئەپەسەنگێنن

لەیلا بەتەرحێک ئەرازێننەوە
تۆڵەی چەند ساڵم لێ ئەسێننەوە!...
لە خۆشی ئەوان جوانیم نانوێنی!
مەگەر وەک تۆ بێ، بێ بم لاوێنێ!
لەگەڵ ئەوەشا بۆ خۆشی لەیلا
خۆم نارەنجێنم، ناکەم سکاڵا
هەروا گەش و خۆش، باڵا بڵندم
دەم بەپێکەنین، هەر شۆخ و شەنگم
خۆشیم بەوە دێ کە ئەم دارانە
ئەرازێننەوە وا نازدارانە
ئاڵووالا و گەش، زەرپۆشی دڵگیر
هەزارکێش ئەکەن لە جوان و لە پیر
ئەیکەنە سەیران لە گۆیی ئەو چەمە
بەزم و شادییە، دەم لە بان دەمە
لەو خۆشییەدان هەتاکو زستان
لەشکر ئەنێری بۆ چیای کوێستان
جا وایان لێ دێ کە ئەیان بینی
نۆرەی من نییە کە وام ببینی؟!...
وەفادارییە کە من بەزستان
ئەی رازێنمەوە وەکو گوڵستان
لە تەنگانەدا دڵسۆزیی دیارە
لەیلا من نەبم کێی لە سەرکارە؟
گەر رەنگ و شێوەم وا رەنگین نەبێ
لەیلا ئەو وەختە کەی شیرین ئەبێ؟
جا تێگەیشتی رازی جوانی من
«دادی خوا»یە کامەرانی من؟
سوار: دار، تێگەیشتم لە ئاخافتنت!
لە کردەوە و کار تێگەیشتنت!
بەلام تو بی خوا ئەگەر راست ناڵێیت
ئاخوا ئەزانی چەند خۆشم ئەوێیت؟
کاژ: بەڵێ ئەزانم ئەمنت خۆش ئەوێ
لە دەردی دووریم دڵت ناسرەوێ

گەر نەتویستمایە بەدڵ و گیانت
ڕۆشن نەبووایە بەمن ژیانت!
تۆ بەم زستانە ماندوێتی ڕێگات
ئەخستە بەرخۆ و خۆشیت پێی ئەهات؟
ئەگەر هاودەمیم شیرین نابینی
بۆ چ هێندە وەستای کە بدوێنی؟
بەڵام ڕۆشنایم وا لە دڵ ئەبری
حەیف ناکەی، سەرڕاست قەت سوێندی ئەدرێ!؟
سوار: دارکاژ! ڕاست ئەکەی زۆر قسە جوانی
بەهێز و گورتا ڕاست و ڕەوانی
بەژن باڵا جوان، چاومەست ئەنوێنی
دڵ نەرم و سەر ڕەق، سەربەست ئەنوێنی
دڵسوز و هاودەم، برای تەنگانەی
سەربەرز و ڕووخوش شۆخ و شەنگانەی
چاکە دەرەوەی، لە سەرخۆ و ژیری
لە چاو داراندا چەشنی ئەمیری!
بەخوا ڕاست ئەکەی من خۆشم ئەوێی
چی بکەم من لە وێم کەچی تۆ لە مێی
تۆش گەر وەک من بی بۆ خۆشەویستیت
بۆ چ دیاری نەدا میوان پەرستیت؟!...
کاژ: خوا هەڵناگرێ!... سوار بڕوانە!
چەند جوانە شێوەی ئەم درەختانە
لەم بەر ئەو بەری ڕێوە وەک سوپا
چۆن ڕیز وەستاون لە خۆشیت برا!
بۆ نازگرتنت یەکسەر پەیوەستە
مەستی هاتنت هەموو دڵ بەستە
سوار: کاژە ڕەنگینە سوپاست ئەکەم
تاسەی جوامێریی بەڕاستت ئەکەم
یاخوا تا سەر بێ دۆستایەتیمان
قەت نەکوژێتەوە برایەتیمان

ئەی نایەی هەوای دەماخم بدەی؟
بەرداخی دڵی پڕ داخم بدەی؟
کاژ: هاوردەرد! پەیمان بێ، سەد جار پەیمان بێ
گفت و بەڵێنی نەوجەوانان بێ
نەیێڵم دابێ، بەهاری تازە
پۆشم بەرگی تازە و ناوازە
بگەمە (ئەتروش) بێم بەمیوانیت[*]
برازێنمەوە تەختی دیوانیت[1]

### تاسەی نیگایەک

بەو چاوە گەشەی لە تویی عەباوە
خستمیە خرۆش، جۆشی سەوداوە
بەو تیلایی یکەی کە تێم ئەنواڕێ
لەت لەتی ئەکا دڵم بەجارێ
ساوەرە توخوا دەم دەمانێ کەین!
زەمزە مەوشادیی کامەرانی کەین!
لەبن دارێکا، لەسەر گوێی چەمێ:
جووت دابنیشین دەمێ سا دەمێ
ساز و سەمتووری هاژە هاژی ئاو
شنەی شەنگە بێ،یانەی گوێی چەماو
چریکەی بلبل، دڵ ڕاچەنی گوڵ
بێنێتە دەرێ ڕازی پشەی دڵ
خەمی چەند ساڵە بدەین بەبادا
بدەین دیدە و دڵ بەبای صەفادا
بەنەشئەی جوانی لەنجە و لارەکەت
شەو بۆی هەناسەت، لێو گوڵنارەکەت

(*) (ئەتروش) ناوچەی ناحیەی مزورییە. نووسەر لە ساڵی ١٩٣٧دا لەوێ مدیری ناحیەوە بووە. (ش.ف)
(١) ئەم شیعرە، کاتی خۆی بەناوی (من و کاژی بلکێف)ەوە لە (گەلاوێژ)ی ژ (١). س(١) کانوونی یەکی ١٩٣٩، ل ٢٣-٢٩دا بلاوکراوەتەوە.

بەگەردنی بلوور، ئەگریجەی خاوت
پرشنگی کوڵمت، تیشکی ناو چاوت
بەشۆخ و شەنگی باڵا بەرزەکەت
بەزەردەخەنەی نازک تەرزەکەت
مەست بین بەجامی مەیی دڵداری
قەت لەیەک نەبین: خەو و بێداریی!

## من و تۆ[1]

تاکو یەک نەگرێ دڵی من و تۆ
وەک یەک نەنوێنێ گوڵی من و تۆ
وەک یەک نەچێژێ دەمی من و تۆ
بەیەکتر نەگات: غەمی من و تۆ
مایەی من و تۆ، پیری من و تۆ
سایەی من و تۆ، ژیری من و تۆ
قەت بڕوا مەکە هەتا نەمێنین
ژن و مێردیێتی بەجێ بهێنین

***

هەڵسە و دانیشە! وەک من تێکوشە!
ژیانی ڕاستی هەر عەیش و نۆشە
مۆسیقا فێربە! شتێکی خۆشە
بۆ بەزمی شەوان جۆش و خرۆشە
لە قومار گەڕێ! سەراپا بۆشە
چونکە کردەوەی پیاوی بێ هۆشە
ئەگەر وانەکەی هەتا نەمێنین
ژن و مێردیێتی بەجێ ناهێنین!...

***

یاری و وەرزشە هۆی زیندەگانی
گەشی و لەش خۆشی و هێز و جوانی

---

(١) ئەم هەڵبەستە دیسان لە کتێبی (ئافرەتی کورد)دا بڵاوکراوەتەوە لە ل: ٤٨

سواری و گەشت بکە! نێچیرەوانی
شاخەوانی کە! هەم دارەوانی
بەسەختی رابێ! بەمەڵەوانی
ئەمانە خۆشن، ئەگەر نەیزانی[1]
قەت بڕوا مەکە هەتا ئەمێنین
ژن و مێردێتی بەجێ بهێنین!...

***

ئامۆژگاری من ئەمەندەیە و بەس
ڕووخۆش و گەشبە لەگەڵ هەموو کەس!
مەڕوخێ بەسەر کەسا وەک هەرەس
لەگەڵ جوامێران دەس بدەرە دەس
کاروباری خۆت، هی بێگانە و کەس
دوا مەخە! بیکە! بەخۆشی و هەوەس
ئەگەر وا نەبێ هەتا ئەمێنین
ژن و مێردێتی بەجێ ناهێنین!

***

فێری زانست بە! ئاداب و فنون
بنچینەی هێزی گشت ڕەوشت و خون
زەوق و شەوق ئەدەن بەدڵ و دەروون
ژینت شاد ئەکەن بەبوون و نەبوون
هاودەمی مەن، یاری خۆش ڕوون
بەهاودەمیان کە! بەبێ چەند و چوون
ئەگەر وا نەکەی هەتا ئەمێنین
ژن و مێردێتی بەجێ ناهێنین!...

---

(١) دەبوو: (ئەگەر نایزانی) بووایە.

## سەیران[1]

بەری بەیان، مەلا بانگان هەموو کەس روویان کردە مزگەوت...

پۆل پۆل، لادێییەکان روویان کردە بارەگای خوایی...

بەرامبەر پەروەردگار: پارانەوەی خۆش رابواردنی ئەورۆژیان بوو.

درندە و پەرندەش بەزبانی خۆیان ئەلالانەوە کە خوا لە گوناهیان خوشبێ!...

پیاو و ژن بەزمان، مەرومالات بەباران، پەلەوەر بەچریکاندن، ئاو بەخورە، کزەبا بەشنە... هەموو لەخوا ئەپارانەوە کە ئەم رۆژەیان لێ پیرۆز کا!...

منیش یەکێک بووم لەوانە. بەلام کە ئاورم دایەوە دیار نەبووی!.

گەرام بۆت نەمدۆزیتەوە!

خانە گوڵ بۆ چ نەهاتی؟!

نازدارەکەم بۆ چ نەهاتی؟!

***

رۆژ خۆی دەرخست لە کەلەوە. کێو و کەژ و دەشت و دەری بەتارایەکی زێرین رازاندەوە...

بلبل دەرکەوت لە چلەوە. دای لە شەقەی باڵ و چوو بۆ گەشتـوگوزار... خونچە لە خۆشی نەوبەهار و رازاوەی مێرگ و مێرغوزار پێکەنی...

پەرەکانی کردەوە، بەسەر لقەکانیا شەوغی کرد و کزەبای گرتە باوەش...

دارکەوتە شەکانەوە. گیا لە خۆشیا دەستی کرد بەوورشە ورش...

کچ و لاو بەرازاوەیی لە تاریکی ماڵ رەویان کرد و روویان کردە گوڵ و گوڵزار، چیمەن و لالەزار...

منیش لە گەڵیاندا بووم...

بەلام کە ئاورم دایەوە: تۆم نەدی!

گەرام بۆت: نەمدۆزیتەوە!

خانە گوڵ بۆ چ نەهاتی؟!...

دڵ رفێنەکەم بۆ چ نەهاتی؟!...

***

ئینجا لە گوێی کانییەک، لەژێر سێبەری شورەبییەکدا بەرە و قاڵیچە لەم بەر و لەوبەری ئاوەکەوە راخرا...

---

(١) ئەم پەخشانە کاتی خۆی لە(گەلاوێژ)ی ژ(٤) س(٤) نیسانی ١٩٤٢، ل ٤٢ - ٤٦، بڵاوکراوەتەوە، لێرەدا هەندێ دەسکاری کـراوە. هەروا لە دەستنووسی (خـۆشـخـوانی)دا نووسـیـویە: سلێـمـانی لە ١٩٣٣/٤/٢٢ نووسراوە.

سەماوەر و قۆری لەبەر تیشکی ڕۆژ ئەبریسکانەوە. ماست و هێلکە و پەنیر و خورما و تەرەپیاز: خوانەکەی ئەرازاندەوە...

ئینجا سەیرانکەران، دەستە دەستە لە گوێی ئاوەکە دانیشتن...

ئاوەکە: کەمەر و کێلانە خەنجەری کوڕان، و پلپلەی لاگیرە و گێل گێلە و گەردانە، پشتە سەر و هەیاسە و بەرگی ئاڵووالای کچ و ژنانی ئەنواند...

بەقسەی خۆش و گەمە و پێکەنین و مەتەڵ هەڵهێنانەوە ئەو نان و چایە خورا...

منیش دەستم برد نان بخۆم...

چونکە تۆم لاوە نەبووی: پاروەکەم لە قورگ گیرا!...

ئاورم دایەوە: دیار نەبووی!...

گەڕام بەشوێنتا: نەم دۆزیتەوە!...

هەموو کەس لای دەزگیرانی خۆیەوە دانیشتبوو نانی ئەخوارد...

هەموو کەس دەزگیرانی هاتبوو. من نەبێ!

دەزگیرانەکەم: بۆ چ نەهاتی؟!

***

کە پاش نیوەڕۆ فێنکی کرد؛ لەناو جەرگی شینی ئاسماندا: پەڵە هەورەکان، بەتیشکی جوانی ڕۆژی گەوهەرین، زەرد و سوور ڕازانەوە...

لەژێر سێبەری ئەو دارانەدا: گوریس هەڵخرا. دەستەی کچان دەستیان کرد بەدیلانێ...

لەسەر کانیش کوڕ و کیژ دەستیان کرد بەڕەشبەڵەک و هەڵپەڕین...

گوڵاڵەسوورکە و گوڵەوەنەوشە چاوبازەش چەشنی ئەمان: لەناو ئەو گژوگیایەدا، بەخۆشی شنەی شەماڵەوە دەستیان کرد بەدەست لە ملکردن...

ئاسمان لەلایەک. گوڵ و لالەگوڵ لە لایەک. کچ و کوڕ لە لایەک.

چەم و کانیاو لەلایەک. شمشاڵ و بلوێر و دەهۆڵ و زوڕنا لە لایەک

هەریەکە لە جۆش و خرۆشێک، لە بەزموڕەزمێکا بوون...

گیانەکەم! لەم ڕۆژە خۆشەدا، هەر کەسە بەدڵخوازی خۆی گەیشت.

من نەبێ!...

ئەو ڕۆژگارە درێژەم بەچاوەڕوانیی تۆوە ڕابووارد!...

تو نەهاتی!...

خانەگوڵ! بۆ چ نەهاتی؟!

خۆشەویستەکەم! بۆ چ نەهاتی؟!

دڵ ڕفێنەکەم! بۆ چ نەهاتی؟!

دەزگیرانەکەم! بۆ چ نەهاتی؟!

## بەهەشتی ژین[1]

### گۆرانیی بەیانی

ئازیز! درەنگە، گوڵی باخەکەم
خانە شۆخەکەی بەدەماخەکەم!
بەری بەیانە خەبەر بەرەوە!
عطر پەخشان کە! دەم بکەرەوە!
لێفەکەت لادە، سنگتم بۆ دەرخە
فەقیانەت هەڵکە، دەستەکەت سەرخە
گەردن بڵندکە، بام کسزەی بەیان
ئەگریجەت چین کا، بگری دڵ و گیان
بەڵکو ئەو کوڵمەی کە هەروەک گوڵە
دەرکەوێ و پرشنگ بدا لەم دڵە
چاوێک هەڵبرە، بەنیگای سحرێ
بەڵکو تەم و خەم لە دڵ بسرێ
پێبکەنە بەڵکو لێوی لەعلینت
بکشێ و دەربخا دانی دوورِینت
خرنگەی بازنەکەت، شنە شنەکەت
عیشوە و نازەکەی تەرز ڕەنگینەکەت
ببێتە بادە و گیانم بینۆشێ
گەشی و دڵداریم یەکسەر بجۆشێ
خۆت بکێشەوە سنگت سەرکەوێ
دوگمەت بترازێ، مەمکت دەرکەوێ
جارێ تێر ماچی سنگی گەرمت کەم
مەمکۆڵەی ناسک نۆڵونەرمت کەم
سنگە، بەیانە، باخچەی ئەو گوڵە
مۆسیقەگاهی ئاوازەی دڵە

---

(١) (بەهەشتی ژین) ئەم چیرۆکە لە دەستنووسی (خۆشخوانی)دا بەناوی (ژینێکی بەرز)ەوە نووسراوە کە لە ١٩٣٣/٤/٣دا نووسراوە، دیسان هەروا لە (دیاری لاوان) ١٩٣٤ ل ٧٩ - ٨٥، بەڵام لێرەدا ناو نیشانەکەی گۆڕیوە. لە شوێنی خۆیدا دانراوە.

ئەو لەش و لارەش کە وەک کەلەرمە
بیگوشم بام، ئازیز چە وەختی شەرمە؟!
ئەجا سنگ بنێم وەبان سنگتەوە
دەستخەم لە باسک ناسک ڕەنگتەوە
ئازیزا دەستەکەت بیکەرە ملم
ماچێک، لەو دەمەی ڕەنگین وەک گوڵم
دڵ نەی،ڕوو گوڵزار، دەم شەراب و مەی
چاویش ئاوێنەی خۆشیی مەی و نەی
یاران! شادییە و گیان ئازادییە
ژین هەر سەربەستی و بەزم و شادییە!

## گۆرانیی نیوەڕۆ[1]

ئازیزا برسیمە وا نیوەڕۆیە
برسێتیم تۆبالّ بەئەستۆی تۆیە!
خورشت نایابە، سفرەت ڕەنگین کە!
دانیشە و وەک گوهەوار نەخشین کە!
بگەشێنەوە و بخۆ لەگەڵم!
بەگفتگۆی خۆش ڕۆشن کە دڵم
بەڵکو پێمکەوێ و نۆشی گیانم بێ
فریشتەی خۆشی دەست لە ملانم بێ
ئازیز لەرزانە! نازک تەرزانە
ژین عەیش و نۆشی ناو نازدارانە

***

کراس و دەسماڵ، سوخمە و کەوای شەنگ
پیرۆزبێ ئازیزا بەرگی ڕەنگاوڕەنگ
لە لەش چەسپیون، جوان و تونگ و تۆڵ
گوڵ بۆ گوڵ باشە، شۆخی گورجوگۆڵ
هەستە، سەرمەستکە، دڵم پەیوەست کە!
گیانم لە کوتە و بەندیی سەربەست کە!

---

(١) لە (ئافرەتی کورد)یشا بڵاوکراوەتەوە - ل ٦٠-٦٣ ساڵی ١٩٥٨.

دڵ داخـورپێنه! شـێـوەت شـیـرینه
شـەمـاڵ بۆی شـەوبۆی قـژیم بۆ بینه!
ئـازیـز لـەرزانـه! کـــــــۆڕی یـارانـه
بەلارولـەنجـــــه وەرە ئـێـــــرانـه!

***

بەناز و عـیـشـوە هەسـتـه هەڵپـەڕە!
هەڵپـــــەڕە ئازیز! تـوخـــوا داپەڕە!
پانیبەرز شەقەقه و تەقـەقەی بێ لە دوور
پاوانـه و بازن بـکەن خـــرنـگ و هۆڕ
ســرنگەی قـەتارە و گـەردانەی لا مل[1]
ورشـەی دەســمـــاڵی ڕازاوە وەک گـوڵ
مـۆسـیـقـەیێکن گـیـان ئەهێننه جـۆش
گــورەی کـــورێنیم ئەهێننه خـــرۆش
ئـــازیـــز لـــەرزانــە! بـــاڵا بـــەرزانـــه
تـافی هەڵپـــــەرکێ و بەزمی یارانـه

***

پلپــــەی گــــەردانەت بلەرێتــــەوە
کـــەمـــەرە و لولەت بچێ و بێـتــەوە
گـولی لاگـیـرەت بچـریسکێـتــەوە
لەرەی گـوارەی گـوێت نەگـیـرسێـتەوە
سنـگ و مـــەم بەرز و نرم بێـــتـــەوە
مێخەک بەند جـوولـەی نەوەستێتـەوە
آرەق لە گـــۆنـات گلۆر بێـــتـــەوە
مـەسـتم کـا و هۆشم هەر نەیێتـەوە!...
ئـازیـز لـەرزانـه! شــــــایـیـی یـارانـه
ژیــن بـــەزم و ڕەزمـــی نـــاو نـــازدارنـــه

***

سـەمـاوەر! بەزمی، شـۆخی زێرین پۆش
ســازی، ئاوازی، تـوخـوا بێـرە جـۆش

(١) ڕاستتر: زرنگەی قەتارە...

سەری شاهانیت، قۆریەی گوڵ ڕەنگی
کەلارەی سەرخە! شاهان پەسەنگی
پرشنگی زێڕین، چۆری زیوینت
قۆریە! ڕەنگ لەعلت، لەعلی ڕەنگینت
ئازیز دڵخۆش بێ و بنەخشێتەوە
نەشئە پەخشان کا و بدرەوشێتەوە
ئازیز لەرزانە! نەشئە بارانە
سەماوەر گوڵی کۆری یارانە

***

هەڵپەرکێ بەسە، ئازیز وچانە
وەرە سا نۆرەی دەست لەملانە!
سەماوەر جۆشا ئاو هاتۆتە کوڵ
چا دەمی کێشا، بۆن خۆشە وەک گوڵ
سینی و جامی زەرد پیاڵە و شەکردان
چاوەڕوان لەبەر پەنجەی ناسکتان
توخوا دەی ئازیز پڕکە ئێستیکان!
چاو و دەم بۆ چای دەسی تۆ شەیدان
ئازیز لەرزانە! چای ئێوارانە
ئاهەنگی چایی شایی یارانە

***

خواردنی ئاوازە لەگەڵ شۆخ و شەنگ
ڕازاوە بەچەک، بەرگی ڕەنگاوڕەنگ
پشوی ئێوارێ و نەی و سازی خۆش
ئاهەنگی چایی و هەڵپەرکێی بەجۆش
ڕۆشنکەرەوەی ڕێگەی ژیانن
بووژێنەرەوەی دڵان و گیانن
بێ آهەنگ آزیز! ڕۆژێ مەبویرە
تا پێت نەکرێ خۆش ڕابویرە!
ئازیز لەرزانە! جێی نازدارانە
ژین کەیف و شایی و بەزمی یارانە

## گۆرانیی نیوەشەو[1]

هاتە خواری
چاو خوماری
شەدەلاریٚ
سنگی وەک جامی بلورێ
وا لەسەر پەنجە بەلەنجە هاتە لام
شینی لێ کردم بەسوور.

***

کەوتمە داوی
زولفی خاوی
بوومە ڕاوی
پێکەنینْ و نازەکەی
شێت و شەیدای لار و لەنجەی جوانی بووم،
نازی بێ ئەندازەکەی

***

کەوتمە دەستم
دیدە مەستم
دڵ پەرستم
گەرم و نەرمە و نەرموشل!
سنگت لەسەر سنگ، ڕان لەسەر ڕان، پێکەوە
لێو لەسەر لێو، دەس لەمل!...

***

ئاسکەکەم!
چاو ئاسکەکەم!
گێلاسەکەم!
عشقی تۆیە ڕەهبەرم
مایەی ژینی منیت و هەر سوپاسی تۆ ئەکەم
تاکو ئەمرم نۆکەرم!...

---

(١) ئەم هەڵبەستە لە دەستنووسی (خۆشخوانی)دایە، نووسراوە: لە (١) حوزەیرانی ١٩٣٣ لە ڕۆژنامەی ژیاندا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام بەناوونیشانی (پێککەیشتن)، لێرەدا بووە بە(گۆرانی نیوەشەو). بڕوانە: ژیان - ژ ٣٦٥ سالی ٨، ١/٦/١٩٣٣ ل٣.

## کۆمەڵە شیعرێکی تر

### تاسەی نیگایەک[1]

بەو چاوە گەشەی لە توێی پەردەوە
بەجارێ خەمی دڵمی بردەوە...
بەو تیلاییەی کە تێم ئەنوارێ
لەت لەتی ئەکا دڵم بەجارێ
سا وەرە توخوا دەم دەمانێ کەین!
زەمزەمە و شادیی کامەرانی کەین!
لەبن دارێکا، لەسەر گوێ چەمێ
جووت دابنیشین، دەمێ، سا دمێ
ساز و سەمتووری هاژە هاژی ئاو
شنەی شەنگە بێ، یانەی گوێی چەماو
چریکەی بولبول، دڵ ڕاچەینی گوڵ
بێنێتەوە دەرێ ڕازی بێشەی دڵ[2]
خەمی چەند ساڵە بدەین بەبادا
دڵداری لە دڵ بام پرشنگ بدا
بەنەشئەی جوانیی لەنجەولارەکەت
شەوبۆی هەناسەت، لێو گوڵنارەکەت
بەگەردنی بلور، ئەگریجەی خاوت
پرشنگی کوڵمت، تیشکی ناو چاوت
بەشۆخ و شەنگیی باڵابەرزەکەت
بەزەردەخەنەی نازک تەرزەکەت
مەست بین بەجامی مەیی دڵداریی
قەت لەیەک نەبین: خەو و بێداری!

---

(١) لە نامیلکەی (ئافرەتی کورد) ١٩٥٨، ل ٥٠-٥١

(٢) بێشەی دڵ: واتە (ئاخی دڵ).

### گۆرانی کرێکار[1]

کە تۆ کوردی بڵێ کوردم
برای هاوڕاز و هاودەرم
ئەگەر ئێستاکە سەربەرزیت
ئەوە بۆ خوت: بڵێ کوردم

***

بەشم ئازار و هاواریی
فەلاقە و کوتەیی زیندان
بەپەتماکەن، بەسێدارە
درۆ ناکەم ئەڵێم کوردم

***

برانی سایە و مایە!
مەترسی مەرگ و بێ نانی!
هەزار گەفتان بەفلسیکە![2]
بەسەربەرزی ئەژیم، کوردم

***

منیش کوردم بەلام کوردێک:
کە ئاشتیخواز و دلسۆزبێ
لە بۆ چینی کرێکاران:
خەباتی بەرز و پیرۆز بێ.

---

(١) نەورۆز: گۆڤار - ژ (١) ساڵی ١٩٥٩ سلێمانی - چاپخانەی کامەران، ل ٥٥

(٢) گەفتان = گەفتتان = گەف - سوعبەت و قسەی خۆش. لێرەدا پەیمان - وعد)ە.

# ئەدەبی منداڵان

## ئەدەبی منداڵان لەلای شاکر فەتتاح

بەبێ هیچ سێ و دوویەک، هەر کەس بیەوێ لە بواری ئەدەبی منداڵان بکۆڵێتەوە لە کوردستاندا، ناتوانێ ناوی مامۆستا ببوێرێ و فەرامۆشی بکات؛ وەک پێشەنگێ لەوانەی بەشدارییەکی کاریگەرییان کردووە لە دانانی بنچینەی ئەم بوارە لە ئەدەبی کوردیدا.

بیرکردنەوەی مامۆستا لە نووسین بۆ منداڵانی کورد و ئاراستەکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی لە (پەیمانگەی بروممانا) دەبێ لە لوبنان بۆ خوێندنی زمانی ئینگلیزی ساڵی ۱۹۳۲، لە بەرواری ۱۹۳۲/۱/٤دا دەنووسێ: «لەم ئاوەدا پێنج چیرۆکی ئینگلیزیم خوێندەوە، بەتەواوەتی لە هەموو سەرەوکارێکی گەیشتم، کەڵکێکی گەورەم لێیان دەستکەوت.... چیرۆکەکان بۆ منداڵ دانرابوون، هەریەکە ۳۰-۳۲ لاپەڕەیەکی بچووک بوون، هەمووشی باسی جنۆکە و شتی سەیر سەیر بوون. کەچی لای ئێمە ئەم هەموو چیرۆکە هەیە کە دایکمان بۆماندەکا فرێمان داوەتە ئەولاوە دەڵێین: بۆ منداڵ ناشێ.

زۆر حەزم لێکردن، لەبەر ئەوە نیازم کردووە لەم هاوینەدا بیانگۆڕمە سەر کوردی».

لەم کاتە سەرەتاییەوە مامۆستا بیر لە نووسین و وەرگێڕان دەکاتەوە بۆ منداڵان و خەمی ئەو منداڵە بێ نازانە دەخوات، جا دەبینین دوای گەڕانەوەی بەردەوام دەبێ لە گەڕان و پشکنین بۆ بەرهەمێ کە بشێ بۆ منداڵان، ئەمە لە چیرۆکەکانی (کامل گەیلانی)دا دەبینێتەوە و دەست دەکات بەگۆڕینیان بۆ سەر زمانی کوردی.

لەو دەسنووسانەی بەرچاوم کەوتوون ئەو شەش زنجیرە چیرۆکەی گەیلانییە کە لە ئەسڵدا هەشت بووە و بەداخەوە دوانی نەماوە، لە دەفتەری بچووکی خنجیلانەی جواندا بەخەتێکی ڕەنگاوڕەنگی جوان نووسیونیەتەوە و هەرچی وێنەکانیشە مامۆستا خۆی بەدەست و خامەی ڕەنگینی خۆی نەخشاندوونی. لەوانە:

(ڕاوکەری ئەستێران، خانووی تازە، گوڵچین و گورگ، مریشکە سوورە، بچکۆڵە، مام ڕێوی، پرچ زێڕین).

کە ئەمانە لە نێوان ساڵانی ۱۹۳۱-۱۹۳۳دا نووسیونیەتەوە و هەتا شێوە و چۆنێتی چاپکردنەکەشی دیاری کردووە، بەڵام وەک دەردەکەوێ دەستکورتی و نەداراییی بۆتە ئاستەنگێ لە ڕێی چاپکردنیاندا.

مامۆستا لەو ڕۆژانەشدا هەوڵی داوە کە لەلایەن میریەوە هەندێ لەو چیرۆکانەی چاپکرێن، جا دەبینین بۆ یەکەمجار (وەزارەتی معارف)ی ئەو کاتە کۆمەڵێ لەو چیرۆکانەی بەشێوەیەکی جوان و ناوازە چاپ دەکا و بەقوتابخانەکانیدا بلاو دەکاتەوە، بەرامبەریش پاداشتێک دەدا بەخاوەنەکەی و مامۆستا ئەمە لە یادداشتەکانیدا دەگێڕێتەوە. بڕوانە کتێبی یەکەم.

ئەمەش کارێکی وا دەکات کە شاکر فەتاح یەکەم نووسەرێکی کوردی باشوورە کە کۆمەڵە چیرۆکیی تایبەتی بەمنداڵان چاپکرێ و بخرێتە بەردەست.

لە ساڵی ۱۹۳۳، لەسەر مەسرەفی خۆی (خانووی تازە) لە چاپخانەی ژیان لە سلێمانی بەقەوارەیەکی بچووک ۱۲×۱٦سم و بەکاغەزێکی ئاسایی (جەریدە) چاپ دەکا لە (۲۰) لاپەڕەدا و بلاوی دەکاتەوە، بەنرخی (هەشت فلس).

مامۆستا پێشەکییەکی بچووکی بۆ ئەم نامیلکەیە نووسیوە بەسەردێڕی (سەرپەڕە)، تیایدا دەڵێ: «هەشت چیرۆکم نووسیوە، گەلێ کەس پەسەندی کرد و تیژی کردمە سەر چاپکردنیان، بەڵام لەبەر گرانجانی چاپخانە و زینکۆغراف خانەکان و یارمەتی نەدانی کەس، هە چ ڕەنج و کۆششێکم بۆ لە چاپدانیان داوە، لە عێراق و سوریە و میسردا، بەبا چوو».

لەگەڵ ئەم گیروگرفتانەشدا مامۆستا هەر هەڵێکی بۆ ڕەخسابێ و هەر دەرفەتێکی بۆ لوابێ درێغی نەکردووە و بەرهەمی پوخت و جوانی لە (چیرۆک و پەخشان و ئامۆژگاری) بۆ منداڵان نووسیوە.

شێوەی زمانێکی ڕەوان و پوخت، بەکارهێنانی وشەی ئاسایی ناو کۆمەڵ و بابەت و ناوەرۆکێ کە منداڵ ئاراستە بکات بۆ کار و خوو و ڕەوشە پەسەندەکان، ئەمانە بەچری سیمای نووسینەکانێتی لەم بوارەدا.

هەروا سوود وەرگرتن لە کەلەپوور و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان، ئەمانە بەباشی لە کۆمەڵە چیرۆکی (خودای هەژاران)دا بەدیار دەکەون کە لە ۱۹۷۹دا بەچاپی گەیاندووە.

مەبەستەکانی نووسەر تەنیا بۆ تەمەنێکی دیاریکراوی منداڵان نەبووە بەڵکو لە (هاورێی منداڵ - ۱۹٤۸)دا ڕوو دەکاتە مێردمنداڵان و دەیەوێ لە پەنا ئامۆژگاری و ڕێنماییەکاندا شارەزاشیان کات بەدنیای پێشکەوتووی ئەو ڕۆژگارە و شتێ لە مێژووی نەتەوەکەشیان.

تا بەمجۆرە دەبینین کە مامۆستا لە پاڵ دوانی ڕاستەوخۆی لەگەڵ منداڵانی کورددا خەریکی ئەو لێکۆڵینەوانەش بووە کە دەربارەی منداڵ نووسراون و تەقەللای وەرگێڕانیانی داوە.

جا لەم ڕووەوە شاکر فەتاح بەپێشەنگێکی دیار و دەستڕۆیشتوو دادەنرێ لە بواری نووسین لە ئەدەبی منداڵاندا و جێگای شیاوی خۆی کردۆتەوە.

# چیرۆک بۆ منالان

ژمارە (١)

## ڕاوکەری ئەستێران

دانەری: کامیل گەیلانی
کوردیی نووسی: شاکر فەتاح
١٩٣٢/١٢/٣٠

بۆ:

ئەو ئەمامەی سبەی ئەبێ بەدرەختێکی بەردار بۆ ولاتەکەی؛ بۆ ئەو دلەی لەمەولا بۆ خۆشی و ناخۆشی هاوخوێنەکانی ئەخرۆشێ؛ بۆ ئەو مۆمەی چەند ساڵێکی تر ئەبێتە چرایەکی پرشنگدەر بۆ ڕووناک کردنەوەی تاریکیی کوردستان؛ بۆ گوڵی کورد... بۆ منالانی کورد... ئەم چیرۆکە بچکۆلەیەم پێشکەشە.

١٩٣٢/١٢/٣٠
شاکر فەتاح
(یەکێ لە قوتابییانی بیعسەی هەندەسە بۆ ئینگلتەرە)

## ڕاوکەری ئەستێران

لە بەیاندا

(١)

لە بەیاندا شێرۆ بەزەردەخەنەیەکەوە بەدایکی گوت:

«دایەگیان ئەزانی دوێنێ شەو لە کوێ بووم من؟».

دایکیشی بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

«شێرۆ تۆ لە جێگاکەتا نوستبووی».

لەناو کەشتییە بچکۆلەکەدا

(٢)

ئینجا شێرۆ بەسەرسوڕمانێکەوە بەدایکی گوت:

«دایە! کەوایە دوێ شەو هەرسێکمانت نەدی – من و ئەرچۆی برام و گورنەتەڵەی هاوڕێم لەناو کەشتییە بچکۆلەکەدا بووین؟»

دایکیشی بەسەرسوڕمانێکەوە پێی گوت:

«شێرۆ لە کام کەشتی دابووی تۆ؟».

«من ئەو شەوگارە درێژەی دوێنێ شەو تۆم دیی هەر لە جێگاکەتا نوستبووی!»

شێرۆ ئەستێرە ڕاو ئەکا

(٣)

ئینجا شێرۆ بەزەردەخەنەیەکەوە بەدایکی وتەوە: «من دوێنێ شەو سواری کەشتییەکی بچووک بووبووم، ئەرچۆی برام و گورنەتەڵەی هاوڕێشم لەگەڵا بوون. دایە مانگ جوان بوو لە ئاسماندا. کە سەرنجمان ئەدا: ئەستێرەکان لە ئاسمانیش و لە ئاویشدا دەدرەوشانەوە. ئێمەش لەناو کەشتییەکەماندا بەناو ئاوەکەدا ئەڕۆیشتین و ئەستێرەمان ڕاو ئەکرد.

ئاخ دایە چەند خۆشە ڕاوی ئەستێرە! ئێستەش لە بیرم نەچۆتەوە».

دیارە شێرۆ خەوی بینیوە

(٤)

کە دایکی ئەمەی بیست قاقا دەستی کرد بەپێکەنین. بەزەردەخەنەیەکەوە بەشێرۆی گوت:

«ڕۆڵە ئەوە تۆ خەوت دیوە دوێنێ شەو. سا بۆیە شێرۆ من تۆم نەدیوە دوێنێ شەو کە ڕاوی ئەستێرەت کردووە لەناو کەشتییە بچکۆلەکەتا لەگەڵ ئەرچۆی برات و گورنەتەڵەی هاودەمت».

ژمارە (٢)

**خانووی تازە**

دانەری: کامیل گەیلانی

کوردیی نووسی: شاکر فەتاح

١٩٣٣م - ١٣٥٢

سلێمانی - چاپخانەی ژیان

شەوی ٢١-١٩٣٣/٨/٢٢ کە مامۆستا لە ماڵی (شێخ حیسامەددین) دەنوێ و لە ژوورەوە دەینوێن، لەبەر (وردە گەرما و مێشوولە) خەوی لێ دەزڕێ، دەڵێ: «شەپۆلی ئەندێشە هێنامیە سەر بیری چاپکردنی دووەم چیرۆک لەو هەشت چیرۆکانەی کە لە عەرەبییەوە بۆ منداڵانی کوردم کردبوو بەکوردی - هەر هەشتی بەناوی- چیرۆک بۆ منالان-ەوە لە ساڵی ١٩٣٥دا لە شێوەیەکی جوان و ڕازاوە و نایابدا، لەلایەن میرییەوە چاپ کرا، تا منالانی کورد، هی پۆلی دووەمی سەرەتایی بیخوێنن.

ئەم ژمارەی دووەمەیان بۆ دەستەی کچان دەشیا، لەبەر ئەوە، هەر لەو ژوورە گەرمەدا بەبیر ئەم هەڵبەستەی خوارەوەم بۆ بەشی پێشکەشیی چیرۆکەکە دانا:

بۆ دەستەی کچان دایکانی دوارۆژ

کە پێگەیێنن چرۆی هیوامان

بەکردەوەی جوان، بەکاری ڕەنگین
ئاواکەنەوە خاکی کوردستان

ئەم چیرۆکانەم ئەوا پێشکەش کرد. ل٣٦ (گەشتی هەڵەبجە و هەورامان ١٩٧٤ چاپخانەی کامەرانی)

## پێشکەشیی

بۆ ئەو نەو نەمامەی سبەی ئەبێ بەدرەختێکی بەردار بۆ ولاتەکەی؛ بۆ ئەو دڵەی لەمەولا بۆ خۆشی و ناخۆشی هاوخوێنەکانی ئەخرۆشێ؛ بۆ ئەو مۆمەی چەند ساڵێکی تر ئەبێتە چرایەکی پرشنگدەر بۆ ڕووناک کردنەوەی تاریکی، کوردستان؛ بۆکولی[*] کورد... بۆ مندالانی کورد... ئەم چیرۆکە بچکۆلەیەم پێشکەشە.

## سەربردە

منال، بەدڵ حەز لە شتی ئالووالا، قسە و چیرۆکی خۆش ئەکا، ڕقی لە نووسینی ڕەق و ناشیرین ئەبێتەوە، کە شتێک ئەگێڕێتەوە قسەکان دووبارە ئەکاتەوە...

کەواتە: بام چیرۆکێکی بۆ دابنێین، بەپێی تەمەنی خۆی بێ، نووسینەکانی گەورە و جوان قسەکانی ڕاست و ڕەوان، ناسک و ئاوداربێ، بەوێنەی ڕەنگاوڕەنگ بەزمانە سووکەکەی خۆی بۆی بنووسینەوە بەتەرحێکی وابێ خوێندنەوەی لا شیرین کا، نەک بەچاوێکی قینەوە تەماشای بکا. جگە لەوە خووی جوامێریی، لاوچاکی، دڵنەرمیی و پیاوەتی و سەربەرزیی، پێ بگرێ. ئەوی من ئەمویست؛ لە کۆمەڵە چیرۆکی (کامل گەیلانی)دا دیم. ئەم نووسەرە گەورەیە، بەهۆی ئەمانەیەوە، لە میسرا ناوێکی وا گەورەی دەرکرد، نیشتمانییەکانی یارمەتییەکی وایان دا، ساڵ تێ وەرنەگەڕایەوە بەچیرۆکە خنجیلانەکانی خۆی، ژوورێکی خوێندنەوەی نایابی بۆ منالانی ولاتەکەی ڕازاندەوە. منیش بەزیانم زانی منالانی کورد لەم گەنجە گەوهەرییە بێ بەش بهێڵمەوە هێنام کۆمەڵەیەک لەم چیرۆکانەم بەئاوداریی و ناوداریی قسەکانیانەوە، بەسووکی و ڕەوانیی شێوەکانیانەوە، بەڕەنگینی و ڕەندینی نووسینەکانیانەوە، بەڕازاوەیی و دلگیریی وێنە و نیگارەکانیانەوە بەڕاستی و دڵسۆزییەکی تەواوەوە لە عەرەبییەوە گۆڕییە سەر کوردیی. لەسەر ئەم شێوەیە: هەشت چیرۆکم نووسییەوە، گەلێ کەس پەسندی کرد و تیژی کردمە سەر چاپکردنیان. بەڵام لەبەر گرانجاتیی چاپخانە و زینکۆغرافخانەکان و یارمەتیی نەدانی کەس، هەچ ڕەنج و کۆششێکم بۆ لە چاپدانیان، لە عێراق و سوریە و میسردا بەبا چوو. هەڵبەت خوێندەواران لەم بەرگ و شێوەیەدا لە کورتی و ناشیرینیم ئەبوورن. ئەگەر یارمەتیی دۆستان ببێ، خوایاربێ ئەمجارە هەنگاوێکی گەورەتر ئەنێم، بەشکو بەهۆی ئەم چیرۆکانەوە تۆزە بەربەستێکی لافاوی نەزانین بکەین پشت بەخوا.

شاکر فەتاح
دەرچووی مەتریکولیشنی ئۆکسفۆرد - کمبرج
سلێمانی: ٣١ میوەگەنان ١٩٣٣

---

(*) لە چاپەکەدا هەروا نووسراوە، لەوانەیە (گەلی)بێ یا (گوڵی) بێ، بەڵام بەهەڵە چاپکرابێ. (ئاراس).

## بەرخ و بەراز

(١)

بەرازێک بەبەرخێکی هاوڕێی گوت: «نیازم هەیە خانووێک بکەم تیا بحەوێمەوە».

بەرخەکەش بەبەرازەکەی وت: «منیش یاریدەت ئەدەم؛ خانوویەک ئەکەین هەردووکمان تیا ئەحەوێینەوە».

ئینجا بەرازەکە بەبەرخەکەی هاوڕێی گوت: «من عەرد هەڵئەدڕم خانووەکەی تیا دروست کەین».

بەرخەکەش بەبەرازەکەی کوت: «منیش دار لە درەخت ئەبڕمەوە خانووەکەی پێ دروست بکەین».

ئینجا لە خۆشیانا بەرخەکە و بەرازەکە دەستیان کرد بەهەڵپەڕین.

## لە ناوەڕاستی دارستانەکەدا

(٢)

ئینجا بەرخەکە بەبەرازەکەی گوت: «کاکە، لە کوێ خانووەکەمان دروست بکەین؟».

بەرازەکەش بەبەرخەکەی گوت: «برام! خانووەکەمان لە ناوەڕاستی ئەم دارستانەدا دروست ئەکەین».

بەرخەکەش بەبەرازەکەی گوتەوە: «دەی! بام خانووەکەمان لە ناوەڕاستی ئەم دارستانەدا دروست بکەین».

ئینجا بەرازەکەش گوتی: «دەی! بام خانووەکەمان لە ناوەڕاستی ئەم دارستانەدا دروست بکەین».

## قازە زیرەک

(٣)

کە بەراز و بەرخەکە چوون خانووەکەیان دروست بکەن. لە ڕێ قازێکی زیرەکیان پێ گەیشت.

قازە زیرەکەکە لە بەرازەکەی دۆستی و بەرخەکەی هاودەمی پرسی: «کوێوە ئەچن؟»

بەراز و بەرخەکەش بەقازە زیرەکەکەیان گوت: «پێوەین خانووێک لە ناوەڕاستی ئەم دارستانەدا دروست بکەین».

قازە زیرەکەکەش بەبەراز و بەرخەکەی گوت: «منیش

خانووەکەتان لەگەڵ دروست ئەکەم، ئینجا هەمووبان پێکەوە تیا ئەحەوێینەوە».

بەراز و بەرخەکەش بەقازەکەیان گوت: «چۆن یاریدەمان ئەدەی؟».

قازە زیرەکەکەش بەبەراز و بەرخەکەی گوت: بەدەندووکە درێژەکەم پووشتان بۆ کۆ ئەکەمەوە، درز و قلیشەکانی خانووەکەی پێ ئەگرم تا سەرما و باران کارتان لێ نەکا».

ئینجا بەرازەکە و بەرخەکەیش بەقازە زیرەکیان گوت: «ئەمە زۆر باشە، وەرە لەگەڵماندا پێکەوە خانووەکە دروست بکەین و هەرسێکمان تیا بحەوێینەوە».

## کەروێشکە سپییە بچکۆلە

(٤)

ئینجا بەرازەکە و بەرخەکە و قازەکە هەرسێکیان ڕۆیشتن خانووەکە دروست بکەن. لە ڕێ کەروێشکە سپییە بچکۆلەی هاودەمیان پێ گەیشت

لێی پرسین: «ئەچن بۆ کوێ؟»

ئەوانیش پێیان گوت: «ئەچین خانووێک دروست بکەین».

ئەویش پێی گوتن: منیش لە دروستکردنی خانووەکەدا یاریدەتان ئەدەم».

ئەوانیش پرسییانەوە: «چۆن یاریدەمان ئەدەی؟».

کەروێشکە سپییە بچکۆلەش وتی: بەدانە تیژەکانم دارتان بۆ ئەقرتێنم و بۆتان ئەهێنمە ناو خانووەکەتانەوە».

ئەوانیش پێیان گوت: «زۆر چاکە... زۆر چاکە... وەرە لەگەڵماندا؛ خانووەکەمان ئەکەین و پێکەوە تیا ئەحەوێینەوە».

ئینجا بەرازەکە و بەرخەکە و قازەکە و کەروێشکەکە، هەر چواریان لە خۆشیدا دەستیان کرد بەهەڵپەڕین.

## کەڵەشێری خوێندەوار

(٥)

ئینجا بەرازەکە و بەرخەکە و قازەکە و کەروێشکەکە چوون خانووەکەیان دروست بکەن. لە پڕ کەڵەشێرە بانگدەرەی هاوڕێیان پێ گەیشت. پرسی: «دۆستینە بۆ کوێ ئەچن؟»

ئەوانیش وتیان: «نیازی خانووێکمان هەیە لە ناوەڕاستی ئەم دارستانەدا دروستی بکەین تیا بحەوێینەوە».

کەڵەشێرە بانگدەرەش گوتی: «منیش یاریدەتان ئەدەم بام پێکەوە دروستی بکەین».

ئەوانیش پرسییان وتیان: «چیمان بۆ ئەکەی؟»

کەڵەشێرە بانگدەرەش گوتی: «من خانووەکەتان بۆ پاک ئەکەمەوە».

ئەوانیش پێیان گوت: «ئەمەش چاکە».

لەپاشا کەڵەشێرە بانگدەرە پێی گوتن: «ئەی ناتانەوێ لە خانووەکەتاندا سەعاتێک ببێ درەنگ و زوویی شەو و ڕۆژتان پێشان بدا؟».

من ئەو سەعاتەم کە درەنگ و زوویی شەو و ڕۆژتان پێشان بدەم. ئەوە هەر منم کە درەنگ و زوویی شەو و ڕۆژ لە خەڵک ئەگەیێنم. لەبەر ئەمەشە کە خەڵک ناویان ناوم «کەڵەشێرە بانگدەرە».

ئەوانیش قیژاندیان وتیان: «ئەمە زۆر باشە، شت لەمە چاکتر نەبۆتەوە، وەرە لەگەڵماندا خانووەکە دروست بکە».

ئیتر ئەمەندە خۆشی خۆشییان پێکەوت هەموو لە خۆشیانا دەستیان کرد بەهەڵپەڕین.

## ئینجا خانووەکەیان ئەکەن

(٦)

ئینجا پێکەوە، هەموو ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ناوەڕاستی دارستانەکە. کە گەیشتنە ئەوێ دەستیان کرد بەدروستکردنی خانووە تازەکەیان.

بەرازەکە عەردی عەڵدڕی، بەرخەکە داری بڕی، قازەکە بەدەندووکە درێژەکەی پووشی کۆکردەوە، تا درز و قڵیشی خانووەکەی پێ بگرێ و سەرما کاریان لێ نەکا، کەروێشکەکەش لەوەدا یاریدەی قازەکەی ئەدا، مایەوە سەر کەڵەشێرەکە ئەویش ناو خانووەکەی پاک کردەوە.

## لە خانووە تازەکەدا

### (٧)

کە خانووەکەیان تەواو کرد، کەوتنە شایی و زەماوەندەوە هەموو بەجارێ هاتنە جۆش لە خرۆشا دەستیان کرد بەهەڵپەڕین.

ئیتر بەرازەکە و بەرخەکە و قازە زیرەکەکە و کەروێشکە سپییە بچکۆلەکە و کەڵەشێرە بانگدەرەکە هەموو پێکەوە لەناو ئەو خانووە تازەیەدا ژیان.

هەموو شەو و ڕۆژیان بەکەیف و خۆشییەوە ڕاتەبوارد.

لەبەری بەیاندا زوو، هەموو ڕۆژێک کەڵەشێرە بانگدەرە، لە پێش هەتاو کەوتنا خەبەری ئەکردنەوە تا زوو دەست بدەنە کار و فەرمانیان.

کەڵەشێرە بانگدەرە هەموو ڕۆژ لە بەیاندا ئەیخوێند. پێی ئەگوتن:

«هەڵسن لەخەو عووعوو عوعوو<br>
بێ فەڕ مەبن عووعوو عوعوو<br>
دەست کەن بەکارتان زوو بەزوو<br>
هەڵسن لەخەو عووعوو عوعوو<br>
عوو عوو عوعوو».

ژماره (٣)

## گوڵچین و گورگ

دانەری: کامیل گەیلانی
کوردیی نووسی: شاکر فەتاح
یەکێ لە قوتابییانی بیعسەی هەندەسە بۆ ئینگلتەرا
١٣٥١: ١٩٣٣/١/٢٦ سولەیمانی

### گوڵچین کولیچە بۆ نەنکی ئەبا

(١)

دایکی گوڵچین بەگوڵچینی گوت: «گوڵچینە! کچم بچۆرە لای نەنکت، خۆشیی و چلۆنی لەگەڵا بکە و ئەم کولیچەیەشی بدەرێ بیخوا».

گـوڵچـینیش بەدایکی گـوت: «دایە خـۆشم زۆر بیـری ئەکەم، دەمێکە نەمدیوە. هەر ئێستا ئەچم ئەم کولیچانە بۆ نەنکم ئەبەم و خۆشیی و چلۆنیشی لەگەڵا ئەکەم».

### گورگێک لە رێ بەگوڵچین ئەگا

(٢)

گـوڵچین بەتاقی تەنیا بەخۆی و کـولیـچەوە رووی کـردە مـاڵی نەنکی. رێ چۆڵ بوو، کـەسی تیـا نەبوو. لە پڕ گورگێک بەگوڵچین گەیشت، خۆشیی و چلۆنی لەگەڵا کرد و لێی پرسی: «کچە بچکۆلە ناوت چییە؟».

کچەش پێی وت: «ناوم گوڵچینە».

ئینجا گـورگە لێی پرسییـەوە وتی: «گـیانەکـەم نیـازی کوێت هەیە بچیت؟».

گـوڵچـینیش بەگـورگی گـوت: «ئەمـەوێ بچـمـە کن داپیـرەم خـۆشـیی و چلۆنێـتی لەگـەڵا بکەم و ئەم کولیچانەی بۆ بەرم».

### گورگەکە لە گوڵچین ئەپرسێ ماڵی نەنکی نیشان بدا

(٣)

ئینجا گورگ وتی:

«گوڵچین کامەیە ماڵی داپیرەت؟».

گوڵچینیش بەگورگی وت: «ئەو خانووە سپییە بچکۆلەت چاولێیە بەسەر شاخەکەوە لەوپەڕی ئەم ڕێگا درەختدارەوە؟ ئەوە ماڵی نەنکمە».

ئینجا گورگە پێی وت: «کە خۆشیی و چلۆنیت لەگەڵ داپیرەت کرد لە بیرت نەچێ پێی بڵێ مام گورگی برازات زۆر بیرت ئەکا و زۆر حەز بەبینینت ئەکا».

## مام گورگ داپیرەی گوڵچین ئەخوا

(٤)

گورگی بەدخوو بەنیشانەکردنی گوڵچینەوە خانووەکەی نەنکی دۆزییەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو کە گوڵچینی بەجێ هێشت گەیشتە خانووەکە. کە دیی دەرگا دانەخراوە چووە ژوورەوە، پەلاماری نەنکی گوڵچینی دا و خواردیی. خێرا جلەکانیشی لەبەرکرد و لە جێگاکەیا نوست.

## مام گورگ چاوەڕوانی گوڵچین ئەکا بیخوا

(٥)

کە گوڵچین گەیشتە ماڵی نەنکی بەقایم بانگی کرد: «نەنێ! منم دەرگام لێ بکەرەوە».

گورگیش چەشنی داپیرەی گوڵچین بەدەنگێکی نەرمەوە پێی گوت: «گوڵچین وەرە ژوورێ دەرگا دانەخراوە».

## مام گورگ خۆی ئەباتە شێوەی نەنکی گوڵچینەوە

(٦)

کە گوڵچین هاتە ژوورەوە، وای زانی، نەنکێتی لە جێگادا کەوتووە. گوڵچین گوتی: نەنە ئەو کولیچانەم لێ بگرە. ئەوە دایکم بۆی ناردوویت».

مام گورگیش وتی: «بێنە کولیچەکان لێرە دانێ و وەرە لەگەڵ نەنکی خۆتا لەم جێگەیەدا بنووین».

گوڵچینیش بەقسەی گورگە بەدخووەکە چوو کولیچەکانی دانا و هاتە ناو جێگاکەوە لەگەڵیا بنوێ.

## گوڵچین لە مام گورگ سەری سوڕئەمێنێ

(٧)

پاشان گوڵچین بەسەرسوڕمانێکەوە پرسی: «ئەرێ نەنە! ئەرێ نەنە! ئەوە چیتە وا دەستەکانت درێژ بوون؟».

مام گورگیش پێی وت: «کزەی جەرگم تا چاک دەست لە ملت کەم».

گوڵچین دیسان پرسییەوە: «ئەی نەنە! ئەی نەنە! قاچەکانت بۆ چ وا درێژ بوون؟».

مام گورگیش پێی وتەوە: «گیانەکەم ئەوە تاکو چاک هەرا بکەم»

گوڵچین پرسی: دایە پیرە! دایە پیرە! ئەی گوێچکەکانت بۆ چ وا درێژ بوون؟»

گورگەش وتی: «بەقوربان؛ هەتا چاک لە قسەکانت تێ بگەم».

ئینجا گوڵچین پرسی: «ئەی نەنە! ئەی نەنە! چاوەکانت بۆ چ وا فراوان بوون؟».

گورگیش پێی گوت: «گیانە هەتا باشتر تۆ ببینم».

ئەمجارە کە گوڵچین لێی پرسی: «ئەی نەنە دانەکانت بۆ چ درێژ بوون؟»

مام گورگ پێی گوت: «نازدارەکەم تا تۆی پێ بخۆم».

لالەی گوڵچین گورگەکە ئەکوژێ

(٨)

کە گوڵچین ئەمەی لە گورگە بیست لە ترسا بەهەرچی هێزی خۆی هەیە قیژاندیی. خواوراستان ئەو ڕۆژە لالەی گوڵچینیش ئارەزووی چاوپێکەوتنی نەنکی

گوڵچینی کربوو: کە هات و گەیشتە بەر دەرگاکە و زریکەی گوڵچینی هاتە بەرگوێ؟ دەستبەجێ هەڵمەتی بردە سەر گورگە و گورگەی لەوێدا کوشت.

بەم ڕەنگە گوڵچین لە دەست ئەو گورگە بەدخووە ڕزگار بوو.

ئینجا بەرەو پەروەردگار سەری دانەواند و سوپاسی ئەو خوایەی بەجێ هێنا کە لە دەست مردن ڕزگاری کرد.

ژماره (٤)

## مریشکه سووره بچکۆڵه

مریشکه سووره بچکۆڵه
دانەری: کامیل گەیلانی
کوردیی نووسی: شاکر فەتاح
٢ی ڕەشەمێ، ١٩٣٣

دەنکە گەنم

(١)

مریشکه سووره بچکۆڵه له عەردا چینەی ئەکرد. له پڕ مریشکه سووره بچکۆڵەکه له عەردەکەدا دەنکە گەنمێکی بەدیی کرد. که مریشکه سووره بچکۆڵه ئەو دەنکە گەنمەی له عەردەکەدا دۆزییەوه گەلێ دڵخۆش بوو. ئینجا مریشکه سووره بچکۆڵه ویستی ئەو دەنکە گەنمه له زەوییەکەیدا بچێنێ تا گەنمێکی زۆری لێ وەدەست کەوێ.

کێ دەنکە گەنمەکه بچێنێ؟

(٢)

مریشکه سووره بچکۆڵه عەلیشیشی هاودەمی و مراویی هاوڕێشی لەگەڵدا بوو. ئینجا مریشکه سووره بچکۆڵه بەعەلیشیشی هاودەمی و مراویی هاوڕێی گوت: «من دەنکە گەنمەکەم دۆزیوەتەوه و منیش ئەمەوێ بیچێنم؛ ئەی کامتان ئەی چێنن؟».

عەلیشیش گوتی: «من نایچێنم»

مراویش گوتی: «منیش نایچێنم»

ئینجا مریشکه سووره بچکۆڵه بەعەلیشیشی هاودەمی و مراویی هاوڕێی گوت: «من ئەیچێنم».

له پاش ئەوه مریشکه سووره بچکۆڵه چوو دەنکە گەنمەکەی چاند.

## کێ گەغەکە بهاڕێ؟

(٣)

زۆری پێ نەچوو: کـە مـریشکە سـوورە بچکۆڵە ڕۆژێک سەیری کرد تەماشای کرد دەنکە گەغەکەی گەغێکی زۆری لێ پەیدا بووە. ئینجـــا مـــریشکە ســـوورە بچکۆڵە چوو بەعەلیشیشی هاودەمی و مراویی هاوڕێی گوت: «ئەوا دەنکە گەغەکەم گەغێکی زۆری لێ پەیدا بووە؛ ئینجا کێ ئەچێ ئەم گەغە بەرێتە ئاشی و بیهاڕێ؟»

عەلیشیش گوتی: «من ئەم گەغە نابەمە ئاشی بیهاڕم».

مراویش گوتی: «منیش ئەم گەغە نابەمە ئاشی بیهاڕم».

ئینجـا مـریشکە سـوورە بچکۆڵە گـوتی: «من ئەم گـەغە ئەبەمە ئاشی و ئەیهاڕم»

کە ئەوەی گوت. دەستبەجێ مریشکە سوورە بچکۆڵە چوو گەغەکەی بردە ئاشیی و هاڕیی.

## کێ هەویرەکە ئەشێلێ؟

(٤)

کە مریشکە سوورە بچکۆڵە گەغەکەی هاڕیی گـەڕایەوە کن عـەلیـشـیـشی هاودەمی و مـراویی هاوڕێی.

ئینجا مریشکە سوورە بچکۆڵە بەعەلیـشـیـشی هاودەمی و مـراویی هاوڕێی گـوت: «من دەنکە گەغەکەم دۆزییەوە، من دەنکە گەغەکەم چاند، من گەغەکەم بردە ئاشی، من گـەغەکـەم لە ئاشـەکـەدا هاڕیی و منیش ئاردەکـەم هێنایەوە. ئینجـا کێ هەویرەکە ئەشێلێ؟»

عەلیشیش گوتی: «من هەویرەکە ناشێلم».

مراویش گوتی: «منیش هەویرەکە ناشێلم»

ئینجـا مـریشـکە سـوورە بچـکۆڵە گـوتی: «من هەویرەکە ئەشێلم».

هەر ئەوەی گوت و چوو ئاردەکەی کرد بەهەویر.

## کێ نانەکە بکاتەوە

(٥)

کە هەویرەکەی شێلا؛ مریشکە سوورە بچکۆڵە بەعەلیشیشی هاودەمی و مراویی هاوڕێی گوت: «من دەنکە گەغەکەم دۆزییەوە، من دەنکە گەغەکەم چاند، من گەغەکەم بردە ئاشی، من گەغەکەم لە ئاشەکەدا هاڕیی و منیش هەویرەکەم شێلا؛ بزانم کامتان نانەکە ئەکەنەوە؟».

عەلیشیش گوتی: من نان ناکەمەوە».

مراویش گوتی: منیش هەویرەکە ناکەمەوە بەنان».

ئینجا مریشکە سوورە بچکۆڵە بەعەلیشیشی هاودەمی و مراویی هاوڕێی گوت: «من نانەکە ئەکەمەوە».

پاشان چوو هەویرەکەی کردەوە بەنان.

## کێ نانەکە ئەخوا

(٦)

کە هەویرەکەی کردەوە بەنان، مریشکە سوورە بچکۆڵە بەعەلیشیشی هاودەمی و مراویی هاوڕێی گوت: «من دەنکە گەغەکەم دۆزییەوە، من دەنکە گەغەکەم چاند، من گەغەکەم بردە ئاشی، من گەغەکەم لە ئاشەکەدا هاڕیی،

من ئاردەکەم کرد بەهەویر و منیش هەویرەکەم کردەوە بەنان؛ کەواتە کێ نانەکە ئەخوا؟»

عەلیشیش گوتی: «من نانەکە ئەخۆم»

مراویش گوتی: منیش نانەکە ئەخۆم».

ئینجا مریشکە سوورە بچکۆڵە بەعەلیشیشی هاودەمی گوت: «نابێ تۆ نانەکە بخۆی».

پاشان مریشکە سوورە بچکۆلە بەمراویی هاوڕێی گوت: «تۆش نابێ لە نانەکە بخۆی» «ئەبێ من نانەکە لەگەڵ جووجەڵەکانما بخۆم».

## ژماره (٦)

# مام ڕێوی

دانەری: کامیل گەیلانی
کوردیی نووسی: شاکر فەتاح
دەرچووی «مەتریکۆلێشنی ئۆکسفۆردکەمبرج» و
یەکێ لە قوتابیانی بیعسەی هەندەسە بۆ ئینگلتەرە.
١٦ی بەختە باران ١٩٣٣ سولەیمانی

### مام ڕێوی بەتەڵەوەبوون

(١)

مام ڕێوی ویستی مریشکێک لە ماڵی جووتیار بفڕێنێ و بیخوا. جووتیارەکەش لە ماڵەوە تەڵەیەکی نابووەوە، هەچ ڕێوییەک بهاتایە بۆ مریشک خواردن پێی ئەگرت.

لەبەر ئەوە کە مام ڕێوی هاتە ماڵی جووتیارەکە مریشکەکەی بفڕێنێ: تەڵەکە تەقی، کلکی مام ڕێوی پێوەبوو! مام ڕێویش تەکانی ئەدایە خۆی ڕابکا، ئەترسا لەوەی جووتیارەکە بێت بیبینێ و بیکوژێ.

مام ڕێوی هەر تەکانی ئەدا خۆی بەردا، لە پڕ بەربوو، بەڵام کلکی پەڕا.

ئینجا مام ڕێوی دەربەری خۆی لە دەست جووتیار ڕزگار کرد.

### لەناو ڕێوییەکاندا

(٢)

ئینجا کە مام ڕێوی، ڕێوییەکانی دۆستی دی و هەموو کلکیان هەیە و خۆی کلکی نییە گەلێ خەفەتی بۆ کلکەکەی خوارد. پاشان مام ڕێوی بەڕێوییەکانی دۆستی گوت: «ڕێوی گەل! ئەم کلکانەی ئێوە هەتانە بێ کەڵکن، ئێوەش وەک من کلکی خۆتان ببڕن: جوانتر ئەبن. شیرینتر ئەبن».

بەڵام ڕێوییەکان کە مام ڕێوییان دی کلکی قرتاوە، دەستیان کرد بەپێکەنین.

ئینجا یەکێ لە ڕێوییەکان پێی گوت: «ئەگەر تۆ لەپێش ئەمەی کلکت بقرتایە ئەمەت بەئێمە بگوتایە، باوەڕمان پێ ئەکردیت، بەڵام تۆ حەلێک پێمان ئەڵێی کە خۆت کلکت قرتاوە».

ڕێوییەکی کەش پێی گوت: «تۆ ئەگەر قاچیشت بپەڕایە ئەتگوت: قاچمان بپەڕێنین».

لەولاشەو ڕێوییەکەی کە پێی گوت: «تۆ ئەگەر چاویشت هەڵبکۆڵرایە ئەتگوت چاومان هەڵبکۆڵین».

بەم چەشنە ڕێوییەکان لە فێڵی مام ڕێوی گەیشتن.

لەبەر ئەوە ڕێوییەکان ئەم ئامۆژگارییە خراپەی مام ڕێوییان لەگوێ نەگرت.

## پیرۆز و هەنگ

پیرۆز هەرچەند هەنگێکی بدیایە: لێی ئەدا و ئازاری ئەدا. باوکی پیرۆزیش لە ڕەوشت و خووی هەنگ شارەزابوو. لەبەر ئەوە هەموو جارێ چاکەی هەنگی بۆ پیرۆز ئەگێڕایەوە: تا پیرۆز واز لە لێدانی هەنگ بێنێ

بەڵام پیرۆز لاسار بوو، گوێی نەئەدایە قسەی باوکی.

پیرۆزیش کە بۆقێکی ئەدی زمان درێژ ئەکا بۆ ئەو هەنگەی لە نزیکییەوەیە: بیگرێ و بیخوا؛ ئەچوو یاریدەی بۆقەکەی ئەدا ئەیهێنا ئەو گوڵانەی هەنگی پێوە نیشتۆتەوە لە بۆقەکەی نزیک ئەخستەوە؛ تا بۆقەکە بەئاسانی هەنگەکە بگرێ و بیخوا.

زۆری پێ نەچوو پیرۆز نەخۆشییەکی گرانی گرت. بەڵام کە چاک بووەوە پزیشک پێی گوت هەنگوین بخوا تا هێز بگرێتەوە و بێتەوە سەر دۆخی جاران. ئینجا پیرۆز تێگەیشت کە هەنگ چەند بەکەڵکە. لەبەر ئەوە پیرۆز لە کردەوەی پێشووی پەشیمان بووەوە. ئیتر لەو ڕۆژەوە پیرۆز هەنگی خۆش ئەویست، ئاگاداریی ئەکرد و لە دوژمنەکانی ئەپاراست.

ئیتر لەو ساوە پیرۆز بەهەموو شەوێک داوای ئەکرد لە باوکی ڕەوشت و خووی هەنگی بۆ بگێڕێتەوە. باوکیشی زۆر چیرۆک و سەرگوروشتەی سەیر و جوانی بۆ ئەگێڕایەوە.

## کۆتر و بێچووەکانی

جارێک کۆترێک لە هێلانەدا بەبێچووەکانی ئەگوت مەچنە دەر منالەکانم.

بەڵام بێچووەکان گاڵتەیان پێ کرد نەترسان لەوەی تووشی داوێ بن لەلانە دەرچوون چوونە دەشتودەر نەترسان لەوەی تووشی داوێ بن.

زۆری پێ نەچوو ڕێوییەکیان تووش بوو بێچووەکانی گرت یەک یەک خواردنی چونکو کەس نەبوو لەو دەوروپشتە بێچووەکانی گرت یەک یەک خواردنی.

هەرچی لاساربوون وایان بەسەرهات، چونکی بێ گوێیی قسەی دایکیان کرد بێچووەکان بۆیە وایان بەسەرهات، چونکی بێ گوێیی قسەی دایکیان کرد.

ژماره (٨)

## پرچ زێڕین

بەقەڵەمی: کامیل گەیلانی
کوردیی نووسی: شاکر فەتاح
دەرچووی مەتریکولیشنی ئۆکسفۆرد - کمبرج
٢٦/میوەگەنان/ ١٩٣٣ سولەیمانی

ورچەزلە، ورچە ناوونجی، ورچەی بچکۆڵە و پرچ زێڕین

لە بێشەکەدا

(١)

ورچەزلە لەگەڵ ورچە ناوونجی و ورچە بچکۆڵەدا لە بێشەیەکدا ئەژیان. ئەزانن بێشە چییە؟
بێشە زەوییەکی فراوان، زۆر فراوانە پڕە لە داری گەورە گەورە، داری زۆر گەورە.
هەرسیە ورچەکە بەخۆشییەوە لە بێشەیەدا لە یەک ماڵدا ئەژیان.

سێ ورچەکە

(٢)

ورچە زلەکەیان زۆر زەلام بوو. دەنگیشی یەجگار زل بوو.
ورچە ناوونجیش نە زۆر گەورە، نە زۆر بچووک بوو، دەنگیشی نە زۆر گەورە نە زۆر بچووک بوو.
بەڵام ورچە بچکۆڵە زۆر بچووک بوو، دەنگیشی زۆر نەرم بوو.

خانووی سێ ورچەکە

(٣)

وەکو وتمان: خانووی سێ ورچەکە لە دارستانەکەدابوو.
ئەزانن دارستان چییە؟
دارستان -وەکو پێتم گوتن- زەوییەکی فراوان، زۆر فراوان، پڕە لەداری گەورە گەورە، داری زۆر گەورە.
ورچەزلە لەگەڵ ورچە ناوونجی و ورچە بچکۆڵەدا لەو خانووەدا ئەژیان. خانووی سێ ورچەکە دوو ژووری هەبوو: یەکێکیان هی خواردن ئەویکەیان هی نوستن بوو.

ژووری خواردن

(٤)

لە ژووری خواردنا مێزێک دانرابوو ورچەکان نانیان لەسەر ئەخوارد، سێ کورسیش دانرابوون؛ ورچەکان لەسەری دائەنیشتن.

یەکەم کورسییان زۆر گەورە و زۆر بەرزبوو.
کورسیی دووەمیان نە زۆر گەورە نە زۆر بچووک بوو، نە زۆریش بەرز نە زۆریش نەویی بوو.
بەڵام کورسی سێیەم زۆر بچووک و زۆر نزم بوو.
کورسیی یەکەم هی ورچەزلە بوو.
کورسیی دووەم هی ورچە ناوونجی بوو.
کورسیی سێیەمیش هی ورچە بچکۆڵە بوو.

ژووری نوستن

(٥)

ژووری نووستنیش سێ تەختی تیابوو. تەختی یەکەم زۆر بەرز و زۆر گەورە بوو. تەختی دووەم نە زۆر بەرز و نە زۆر نزم بوو، نە زۆریش گەور و نە زۆر بچووک بوو
بەڵام تەختی سێیەم زۆر بچووک و زۆر نزم بوو.
ورچەزلە لە تەختی یەکەمیانا ئەنوست ورچە ناوونجی لە تەختی دووەمیان ئەنوست. ورچە بچکۆڵەش لە تەختی سێیەمیانا ئەنوست.

لەسەر مێزەکە

(٦)

ورچەکان، لە بەیاندا، هەرسێکیان شیر و هەنگوینیان گەرم ئەکرد، پاشان شیر و هەنگوینەکەیان ئەکردە سێ کاشییەوە و لەسەر مێزەکەیان دائەنان.
١- یەکەم کاشییان زۆر گەورە بوو.
٢- دووەم کاشییان نە زۆر گەورە، نە زۆر بچووک.
٣- سێیەم کاشییان زۆر بچووک.
ورچەزلە لەناو کاشیی یەکەمیانا ئەیخوارد. ورچە ناوونجی لەناو کاشیی دووەمیانا ئەیخوارد.
ورچە بچکۆڵە لەناو کاشیی سێیەمیانا ئەیخوارد.

ورچەکان هەوای باڵی خۆیان ئەدەن

(٧)

بەیانیان لە پاش ئەمەی ورچەکان شیر و هەنگوینەکەیان ئەکردە ناو کاشییەکانیانەوە، هەرسێکیان ئەچوونە دەرێ لە بێشەکەدا ئەگەڕان هەوای باڵی خۆیان ئەدا.
ورچەزلە لەگەڵ ورچە ناوونجی و ورچە بچکۆڵەدا ئەچووە دارستانەکەوە هەوای باڵی خۆی ئەدا. هەتا شیر و هەنگوینەکە سارد ئەبووەوە. پاشان ورچەزلە لەگەڵ ورچە ناوونجی و ورچە بچکۆڵەدا ئەگەڕانەوە ماڵێ. ئینجا هەرسێ ورچەکە دەستیان ئەکرد بەخواردنی شیر و هەنگوینەکەیان.

## پرچ زێڕین

(٨)

لەلایەکی دارستانەکەوە مالێکی بچووک هەبوو، کچێکی بچکۆلەی تیا دائەنیشت. پرچی ئەم کچە زۆر درێژ بوو، ئەم پرچە زەرد و ڕەنگێکی هێندە جوان بوو، وەک زێڕ ئەدرەوشایەوە، لەبەر ئەوە لە مالەوە ناویان نابوو (پرچ زێڕین). (پرچ زێڕین) لەو مالە بچووکەدا دائەنیشت، مالەکەی لە خانووی سێ ورچەکەوە زۆر دوور بوو.

بەیانییەک (پرچ زێڕین) لە خانووەکەی خۆی چووە دەرەوە.

(پرچ زێڕین، بەناو بێشەکەدا ڕێگایەکی زۆری بڕیی هەتا گەیشتە خانووی سێ ورچەکە.

لەو حەلەدا ورچەزلە لەگەل ورچە ناوەنجی و ورچە بچکۆلەدا چووبووە دارستانەکەوە بۆ گەڕان.

## پرچ زێڕین ئەچێتە خانووی ورچەکانەوە

(٩)

(پرچ زێڕین) چووە خانووی سێ ورچەکەوە.

(پرچ زێڕین) لە خانووی سێ ورچەکەدا چاوی بەژووری نان خواردن کەوت، مێزێکیشی لە ژووری نان خواردندا دیی.

(پرچ زێڕین) سێ کاشیی پڕ لە هەنگوین و شیریشی دیی لەسەر مێزەکە دانرابوون.

(پرچ زێڕین) وتی: «کەس لە مالیدا نییە، ئەمەش خۆرشتێکی خۆشە، منیش برسیمە چونکی ئەم بەیانییە ناشتام نەکردووە، لەبەر ئەوە وا چاکە من لەم چێشتە بخۆم».

## پرچ زێڕین ئەچێتە سەر خوانی ورچەکان

(١٠)

(پرچ زێڕین) ئەیزانی کە ئەمە خۆرشتی سێ ورچەکەیە.

ئینجا (پرچ زێڕین) چووە سەر خوانەکە، لە هەرسێ کاشییەکە، یەکی کەوچکێکی خواردەوە، تەماشای کرد زۆر خۆشە.

لەبەر ئەوە (پرچ زێڕین) گوتی: «وا لەسەر کورسیی دائەنیشم و هەرچی لە کاشییەکە دایە ئەیخۆم».

## پرچ زێڕین بەشە چێشتی ورچە بچکۆلە ئەخوات

(١١)

(پرچ زێڕین) ویستی لەسەر کورسییە گەورەکە دابنیشێ. لەبەر ئەوە (پرچ زێڕین) چوو کورسییە گەورەکەی جوولاند لەسەری دابنیشێ بەلام تەماشای کرد بەرزە.

ئینجا (پرچ زێڕین) چوو بەلای کورسیی دووەمەوە، جوولاندی کە لەسەری دابنیشێ، تەماشای کرد ئەویش بەرزە.

بەڵام کە (پرچ زێڕین) لەسەر کورسییە بچکۆڵەکە دانیشت، تەماشای کرد باشە وەک بۆ خۆی دروست کرابێ وایە.

ئینجا (پرچ زێڕین) دەستی کرد بەخواردنی شیر و هەنگوینی کاشییە بچکۆڵەکە تا چۆڕی لە چێشتەکە بڕیی.

## لە ژووری نوستندا

(١٢)

ئینجا (پرچ زێڕین) چووە ژووری دووەمەوە کە سێ ورچەکە تیا ئەنوستن. تەماشای کرد لە ژووری نوستنا سێ تەخت هەیە. (پرچ زێڕین) گوتی: «گەڕانی ناو بێشەکە ماندووی کردم، لەبەر ئەوە وا چاکە ئێستا بنووم».

***

(پرچ زێڕین) ویستی لە تەختە گەورەکەدا بنوێ، تەماشای کرد زۆر بەرزە، پاشان ویستی لە تەختە ناوونجییەکەدا بنوێ، تەماشای کرد ئەویش زۆر بەرزە. ئینجا چوو لە تەختە بچکۆڵەکەدا نوست، تەماشای کرد باشە، وەک بۆ خۆی دروست کرابێ وایە.

نیتر (پرچ زێڕین) لە تەختە بچکۆڵەکەدا نوست خەبەری نەبووەوە تا سێ ورچەکە پەیدا بوونەوە.

## لە ژووری نان خواردنا

(١٣)

کە سێ ورچەکە هاتنە ژووری نانخواردنەوە، ورچەزلە بەدەنگێکی زۆر زلەوە گوتی: «کێیە! ئەم کورسییەی منی لە جێی خۆی بزواندووە؟».

پاش ئەو، ورچە ناونجیش بەدەنگێکی نە زۆر زل و نە زۆر بچووکەوە گوتی: «کێیە! ئەم کورسییەی منی لە جێی خۆی بزواندووە؟

ئینجا ورچە بچکۆلەکەش بەدەنگێکی زۆر نەرمەوە گوتی:

«کێیە: لەسەر کورسیی من دانیشتووە؟»

پاشان ورچەزلە بەدەنگێکی زۆر بەرزەوە گوتی:

«کێیە: لە خۆرشتی منی چێشتووە؟»

پاش ئەو ورچە ناونجیش بەدەنگێکی نە زۆر بەرز و نە زۆر نەرمەوە گوتی:

«کێیە: لە خۆرشتی منی چێشتووە؟»

ئینجا ورچە بچکۆلەش بەدەنگێکی زۆر نەرمەوە گوتی:

کێیە: هەموو خۆرشتەکەی منی خواردووە؟

## لە ژووری نوستنا

### (١٤)

پاشان سێ ورچەکە چوونە ژووری نوستنەوە.

ئینجا ورچەزلە بەدەنگێکی زلەوە گوتی:

«کێیە: لەسەر تەختی من نوستووە؟»

ورچە ناوڤجیش بەدەنگێکی نە زۆر گەورە و نە زۆر پچووکەوە گوتی:

«کێیە لەسەر تەختی من نوستووە؟»

ورچە بچکۆلەش بەدەنگێکی زۆر نەرمەوە گوتی: «کێیە نوستووە؟... ئاخ! ئەوەتا. ئەم کچە بەدخووەیە؛ لەسەر کورسییەی من دانیشتووە،خۆرشتەکەیشی خواردووم و لەسەر تەختەکەیشم نوستووە».

ئینجا بەجارێ هەرسێ ورچەکە قیژاندیان وتیان:«ئەمە ئەم کچە بەدخووەیە؛ بێ پرسی ئێمە هاتۆتە ماڵەکەمانەوە».

## پرچ زێڕین لە ورچەکان هەڵدێ ئەکا

### (١٥)

پرچ زێڕین لە دەنگە دەنگی ورچەکان وریا بووەوە. چاوی کردەوە. تەماشای کرد ئەوا هەرسێ ورچەکە لەبەردەمیا وەستاون بۆڵە بۆڵ ئەکەن. ئیتر هەر ئەوەندەی پێ کرا لە پەنجەرەکانەوە بازدی دایە خوارەوە بەڵام تاکێ پێڵاوی لێ بەجێما ورچێکیان هەڵی گرت.

بەڵام (پرچ زێڕین) بەناو دار و درەختی بێشەکەدا هەر هەڵای ئەکرد تا لەبەرچاوی سێ ورچەکە ون بوون.

سێ ورچەکەیش، بەشوێنیا، هەر کوێیەک ئەگەڕان نەیان ئەدۆزییەوە. ئێستاش لەو سێ ورچە کەسیان نەیان دۆزیبووەتەوە. ئیتر لەو ڕۆژەشەوە (پرچ زێڕین) نەچۆتەوە بەماڵی ورچەکاندا.

## دانیشتن بەبێ کورسی[1]

ئەگەر بەبیست سی منداڵێکیان گوت: دانیشن و هیچ شتێکیان نەدانێ کە لەسەری دانیشن، بێگومان بیر لەوە ئەکەنەوە کە لەسەر عەرد دانیشن، لەگەڵ ئەوەشا بێ ئەوەی ماندووی خۆیان لەسەر عەرد بحەسێننەوە ئەتوانن بەبێ کورسی زۆر بەئاسانی دانیشن.

وێنەکە چۆنێتی ئەم دانیشتنە دەردەخا[2]، منداڵەکان بەئەڵقە دائەنیشن، هەریەکەیان لەسەر ئەژنۆی

---

(١) دیاری لاوان: بەغدا ١٩٣٤، ل ٦٨-٧٠.

(٢) لەگەڵ باسەکەدا وێنەیەک هەیە بۆ پیشاندانی چۆنێتی دانیشتنەکە. بەبێ دەستکاری ڕێنووسەکەی و هەرروەک خۆی.

ئەوی دواوەی دائەنیشێ، ئەژنۆی دوا منالیان ئەبێتە کورسییەک بۆ یەکەمیان، هی ئەمیش ئەبێتە کورسییەک بۆ دووەم منالیان لەسەری دائەنیشێ. هەروەها تا ئەلقەکە تەواو ئەبێ. ئەم تەرحە ماندوو حەسانەوەیە بۆ چەند منالێک یاخود چەند پیاوێک دانراوە کە بەناوی فیڵەوە یاخود یارییەوە بیکەن.

عەسکەری فەرەنسزەکان لە جەزائیر و گەلێ جێگای تری ئەفریقادا هەمیشە ئەمەیان بەکارهێناوە، کە جێگایەک تەڕ و، قوڕ و لیتەبێ لێی دانیشتن عەسکەرەکان ئەخۆش ئەخا. لەسەر فەرمانی سەردارەکانیان بەو چەشنە دائەنیشن.

ئەم جۆرە دانیشتنە وەک وێنەکە دەری دەخا، هێندە ئاسان نییە، بەڵام لە پاش تۆزێ پێوە خەریک بوون چەند منالێ بیەوێ ئەتوانێ بەو تەرحە دانیشێ.

دیارە بۆ پێکهێنانی ئەم فێڵە سەیرە ژمارەیێکی گەورە پێویست نییە، بەشکو شەش کەس ئەتوانن بەم جۆرە لەسەر ئەژنۆی یەکتر دانیشن، ئەوەندە هەیە بەقەد دانیشتنێکی وا کە ژمارەیێکی گەورە بیکا ماندوویان ناحەسێتەوە چونکە ئەلقەکە هەتا بچووک بێ، منالەکان لە ڕاستی یەکتردا باش ناکەونە بەردەمی یەک. لەو شوێنەدا کە کورسی تیا دەست ناکەوێ ئەمە ڕێیەکی باشە بۆ ماندوو حەساندنەوەی دەستەیەکی گەورەی منالان.

لە ئینگلیزیەوە وەرگێڕاوە
ش. ف.

# هاوڕێی منداڵان

خوێندنەوەیەکی نوێیە ئامانجی:

پێگەیاندنی منالآنی کوردە، لەسەر بنچینەیەکی زانست و فەن و گیانی نیشتمانپەروەری

## سەرنجێک لەم (هاوڕێی منال)ە

ئەم نووسراوە یەکێکە لە بەرهەمە بەناوێکانی مامۆستان لە بواری ئەدەبی منالآندا، ویستوویە بابەتەکانی دووتوێی ئەم بەرگە فرەلایی بن، یانی تەنیا چیرۆک یا شیعر یا موچیاری نەبن.

بەڵکو هەر بۆ ڕاکێشانی سەرنجی منالآن و چێژ وەرگرتنیان، پەند و ئامۆژگارییەکانی بەشێوازی جیاجیا بخاتە ڕوو، لە شێوەی نامە ئاڵوگۆڕکردندا لەلایەن دوو منالی دوو شاری جیای کوردستان، ناساندنی ناودارانی کورد و باسی ژیان و کردەوە چاکەکانیان، هەندێ بەروبوومی ناو کوردەواری و خواردەمەنی وا کە ئەمڕۆ بوونەتە فۆلکلۆر!

دیارە دلسۆزی و شەیدایی مامۆستا بۆ هێنانەدی کۆمەڵێکی بەختەوەر و سەرفراز و تەواو لە کوردستاندا لەو بابەتانەدا ڕەنگیان داوەتەوە و وەک شتێ (دەستە و کۆمەڵە و دامەزراوی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری) وای باس کردووە کە بەخەیاڵێکی یۆتۆپیایانەوە ئاواتەخواز بووە کە ئەو شتانە لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا بۆ سوودی گشتی بێن و کورد سوودیان لێ ببینێ.

ئەوەی لێرەدا بوترێ شیعرێکی مامۆستا زێوەری شاعیرە (فرۆک) کە لەلاپەڕە (٤٠-٤١)دا دایناوە، ئێمە لامانبرد؛ چونکە هەر ئەو شیعرە لە نامیلکەی (زێوەر)ی مامۆستا خۆیدا بلاوکراوەتەوە.

دیارە نووسینەکانیش بۆ منالآنی ١٠ - ١٥ ساڵە و لە ئاستی ئەواندایە، بەڵام درێژدادڕی بەزۆریانەوە دەبینرێ، کە ئەمەش دەرچوونە لە شێوازی نووسینی تایبەت بەمندالآن.

## هاوڕێی منال

هاوڕێ بچکۆلە خۆشەویستەکەم

من هەر هاوڕێ دلسۆزە خۆشەویستەکەی جارانتم. ئەمجارەش، ئەوا نووسراوی (هاوڕێی منال)م پێشکەش کردی. بەمە نووسراوێکیتریشم خستە ناو نووسراودان (کتێبخانە)ە جوانکیلانە خنجیلانەکەتەوە. خۆت ئەزانی: من هەر لە مێژەوە بڕیارم داوە کە خەمخۆری خوێندەواری تۆ بکەم. وە تا لەتوانام دابێ، بکوشم نووسراوی جوان و نایاب نایابت بۆ لە چاپ بدەم. بۆ ئەمەی دلخۆشت کەم، بەهۆشت کەم، وە بتخەمە سەر ڕێگای ڕاستەقینەی پیاوەتی و گەورەیی. وە من خۆم بەهاوڕێی تۆ ئەزانم، بۆیەکا تا ئێستا نووسراوانی (خانووی تازە، فەرهەنگۆک، چیرۆک بۆ منالآن، پرشنگ، شەبەنگەبەڕۆژ، گەورە پیاوان) وە ئەم (هاوڕێی منال)م بۆ نووسیویەتەوە و پێشکەشم کردویت. وە ئەگەر مام، بڕیارم وایە، ساڵ بەساڵ، نووسراوی جوانتر و نایابتر و بەکەڵک ترت پێشکەش بکەم. تا نووسراودانە خۆشەویستەکەت پڕ کەم لەو نووسراوانەی کە بەدڵتن وە بەکارت دێن.

من هاوڕێتم لەبەر ئەوە بەدڵ خۆشم ئەوێی. تەنگانەت بەتەنگانەی خۆم وە شادمانیشت بەشادمانیی خۆم ئەزانم. وە هەموودەم تێ ئەکۆشم بۆ پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی و کامەرانیت، لە ڕێگەی پێگەیاندن و تێگەیاندن و ڕاپەڕاندنتەوە. لە ڕاستیا منیش هاوڕێیەکتم، دۆستێکتم وەک مامۆستا بەڕێزەکان و دایک و باوکە خۆشەویستەکانت. بەڵام دۆست ئەوەتا ئەتگرێێنی دوژمنیش ئەوەتا پێت پێئەکەنێ. لەبەر ئەوە ڕاست و ڕەوان پێت ئەڵێم: تا خۆت نەڕەنجێنی و تێ نەکۆشی بۆ پێگەیاندن و تێگەیاندن و پێشخستنی خۆت، من و مامۆستا و دایک و باوکت بەکەڵکت نایەین. وە تۆیش بەئاواتی خۆت ناگەیت.

بەکورتی: یەکەم هاوڕێی تۆ، خۆتی. یەکەم مامۆستای تۆ، خۆتی یەکەم دایک و باوکی تۆ، خۆتی. تەنیا خۆت ئەتوانی، خۆت پێ بگەیێنی. وە بەڕەنجی شان و کۆششی مەردانەی خۆت نەبێ، نابیتە پیاو، نابیتە گەورە وە ناگەیت بەهیچ ئارەزوو و مەبەستێکت!...

بەڵام تۆ هاوڕێیەکی تریشت هەیە. هێشتا پێم نەگوتری. ئەو هاوڕێیەت زۆر گەورەیە، یەجگار بەدەسەڵاتەو وە لە ئەندازە بەدەر بەتەنگ چاکە و بەختیاریتەوەیە. ئەو لەگەڵ ئێمەماناندا -من و باوک و دایک و مامۆستاکانت- بەراورد ناکرێ. ئەو هاوڕێیەت خوایە. بەڵێ. خوای پاک و گەورە و بێ هاوتایە!... ئەمە ڕاستە تۆ ناتوانی ئەم هاوڕێیەت ببینی. بەڵام بڕوات بێ کە هەیە، وە نیگەهبانیشت ئەکا. خوا هێزێکی گەورەی گیانییە. کەس هێشتا نەی دیوە، وە لە ڕازی تێ نەگەیوە. بەڵام کردەوەیان بینیوە. لەگەڵ ئەوەشا، بۆ هەموو کەس، لە دەماری لەش نزیکترە. هەر کەسێ داوای یارمەتی لێ بکا، فریای ئەکەوێ. بەو مەرجەی یارمەتییەکەی بۆ چاکەبێ، وە خراپەی کەسی تیا نەبێ. خوایە: ئێمەی دروست کردووە. وە ئەم زەمین و ئاسمان و خۆشی پێشکەوتن و سەرکەوتن و بەختیاری مانەوەبێ. ئەوەندە هەیە: ئەبێ باوەڕمان پێی بێ. وە لەسەر ڕێیەک بڕۆین کە ئەو بیەوێ. ئەویش: چاکەکردن و خراپە نەکردنە، داوای یارمەتی و کۆشش کردنە. خوا بۆیە باوک و دایک و مامۆستا و هاوڕێی دروست کردووە: کە مناڵ بەخێوکەن، پێی گەیەنن و پێشیخەن. لەبەر ئەوە خواش وای پێ خۆشە: کە مناڵ دڵی دایک و باوک و مامۆستا و هاوڕێی خۆی ڕاگری، لە ئامۆژگارییان گوێگرێ، وە یارمەتییان بدات: لە پێگەیاندنی خۆیدا. کە مناڵ ئەوانەی کرد، ئیتر هەر شتێکی پەسەند لە خوا داواکات و کۆششی بۆ بکات، خوا بۆی ئەکات. چونکە خوا هاوڕێی مناڵە، وە هاوڕێش درێغی لە هاوڕێی خۆی ناکات!...

بەڵام، مناڵ، کە پێگەیشت، بوو بەپیاو و بوو بەخوێندەواری تەواو، کە کەوتە ژیانەوە و هاتە ناو کاروباری جیهانەوە: ئەبێ ئەویش بۆ باوک و دایک و کەسوکار و مامۆستا و هاوڕێکانی، بۆ نەتەوە و نیشتمانی، بۆ برا دانیشتووەکانی جیهان، تێ بکۆشێ و کەڵکیان پێ ببەخشێ. چونکە ئەمانە، هەموو، چاکەیان بەسەریەوە هەیە، وە ئەویش پێویستە چاکەیان بداتەوە. پێویستە ئەویش، وەک درەختێکی شۆخ و شەنگی بەرداری سێبەرداربێ؛ هەموو کەس خۆشی بوێ، هەموو کەس لە سایە و پەنایدا بحەسێتەوە.

نووسراوی (هاوڕێی مناڵ)، هاوڕێی تۆیە. بۆیەکا بۆم نووسیویتەوە کە بتخاتە سەر ئەو ڕێیەی، ڕاستەوڕاست ئەتگەێنێ بەپلەی گەورەیی و پیاوەتییێکی وەها؛ کە باوک و دایک و مامۆستا و هاوڕێ و

نەتەوە و دانیشتوانی جیهان، هەموو، خۆشیان بوێت و پێتەوە بنازن. ساخوا من و تۆ بەم ئاواتە پیرۆز و بەرزە بگەینێ گیانەکەم.

هاورێت:
شاکر فەتاح
قایمقامی سلێمانی
١٩٤٨/٩/١٥

## کۆمەڵی دەستەبرا

سلێمانی: ١/خەرمانان/ ١٩٦٠

بابەگیان:

ئەوەتی تۆ چوویتە شەقلاوە، بۆ سەرپەرشتیی کاروبارت، من خەریکی کۆششم. بەسایەی خوا و سەری تۆوە، لە تاقیکردنەوە (امتحان)دا بەیەکەم دەرچووم. مامۆستاکانیش، بەبۆنەی لێ بوونەوەی تاقیکردنەوە. ئاهەنگێکی گەورەیان، لە خوێندنگادا کرد، هەرچی کەسی و کاری شاگردەکان و پیاوی گەورە و زانست و تێگەیشتووانی شار هەیە، بەژن و پیاوەوە بانگ کرابوون. سەرمامۆستاکەمان هەندێ بەخششی (خەلات) لەسەر مێزێک دانابوو، بیدا بەو شاگردانەی کە لە تاقیکردنەوەدا هونەریان نواندبوو. ئاهەنگ دەسی پێ کرد سەرمامۆستا، بەناوی خوێندنگاوە. ماندوونەبوونی و خۆشهاتنی لە میوانەکان کرد پاشان دەستەی ساز و گۆرانی، کردیانە زەماوەند. دڵی هەموانیان گەشاندەوە.ئینجا خواردەمەنییان پێشکەش کرا. پاش ئەوە چەند شاگردێک وتاریان خوێندەوە. منیش یەکێک بووم لەوان. سەرمامۆستاش بۆیەکا منی بەقسەکەر دانابوو، چونکە لە زبانی کوردیدا، لە هەموو شاگردەکان باشتر دەرچووبووم. وە سەرمامۆستا ئەمانەی، هەموو، لە دانیشتوان گەیاند.

مانگی پێشوو بەڵێنم دابونێ کە باسی (کۆمەڵی دەستەبرا)ت بۆ بکەم. ئەم کۆمەڵە، لە سلێمانی، چەند مامۆستایەکی زرنگ دایانمەزراندەوە. مەبەسیان ئەوەیە، هەموو شاگردەکانی کورد، لە کوردستاندا دۆسایەتی بگرن. هەر شاگردە شتومەکی دەستکردی کوردی شاری خۆی لەگەڵ ئەوی تردا بگۆڕێتەوە وێنەی شاران و جێگاکانی کوردستان نووسراو و هەڵبەستی زانست و تێگەیشتووانی کورد، پولی پۆستە و دراوی حکومەتانی کورد، بەرگ، چەکی کوشندە. وردە دەستکرد، تۆ و، پەپوولە، درندە و پەرندە، تەنانەت خواردەمەنی: لەناو ئەو شاگردانەدا کە ئەندامی ئەم کۆمەڵەن ئەگۆڕێتەوە!... ناوونیشانی ئەو شاگردانەش، مانگ بەمانگ، لە چەند لاپەڕەیەکدا لە چاپ ئەدرێ و بەناو ئەندامی کۆمەڵدا بلاو ئەکرێتەوە.

هەندێ لە شاگردەکان شتی سەیر سەیریان کۆکردۆتەوە، شاهۆی سەرخر، کوڕی جووتیارەکە، هەندێ وێنەی سەیر سەیری بەدەستی خۆی کێشابوو، ناردی بۆ شارەزایەک لە (دیاربەکر)، ئەوانیش لە جیاتی ئەوە کۆمەڵەیەک وێنەی ژنانی کوردی بەبەرگی جوێ جوێ و ڕەنگاوڕەنگەوە بۆ ناردبوو. فەرهادی کوڕی گەورەی شار، هەر بەشت گۆڕینەوە، دەستێ بەرگی تەواوی کوردانەی دەستکردی کوردی پێکەوە ناوە.

خۆی ئەڵێ: «ئەمـانـەم هەریەکـە لەلایەکـەوە کـۆکـردۆتەوە شـاگـردێکی (زاخـۆ)، ڕانکوچۆغـەیەکی شـاڵی زاخۆیی بۆ ناردووم. لە (دیاربەکر)ەوە پەستەکێک، لە (وان)ەوە مرادخانەیەکی ئاوریشم، لە هەولێرەوە کراسێکی ئاوریش، لە بانەوە دەست کێشێک و گۆرەوییـەکی کـورک، لە ڕەواندزەوە کـڵاوێکی سـەید طەیی، لە کۆیەوە کالەیەک، لە کرماشانەوە کلاشێک، لە هەورامانەوە فەرەنجییەک، لە سلێمانییەوە خەنجەر و چەقۆی ئاسنبڕ و دەمانچە و تفەنگێکی بێ دەنگ، لە کەرکوکەوە سەبیلێک، لە ئامێدییەوە قەندفەیەک، لە سنە و سابلاغیشەوە مشکی و پشتێن و دەسەسرێکی ئاوریشمم بۆ هاتووە»!.

شاسواری کوڕی پیرێژنە ئانەواش. بەسزمانە، هەر کۆمەڵەیەک پەپوولەی ڕەنگاوڕەنگی بۆ کۆبووەوە، ئەویشی ئاردبوو بۆ کوڕە باخەوانێک لە ئامێدی، ئەویش لە نامەیەکدا کە بۆی نووسیبوو، بەڵێنی دابوویە کە مانگی مشتاخان داهات بەرچنەیەک هەرمیی ناوازەی بەشەمەندەفەری ئامێدی – سلێمانیدا بۆ ڕەوانە بکا.

بابەگیان! چەند کۆمەڵێکی جوانە!... جگە لەوەی کە شتومەکی سەیر سەیرمان لا کۆ ئەبێتەوە، برایەتیشمان لەناودا تازە ئەبێتەوە. ئەگەر جارێکیش پیاو ڕێی کەوتە شوێنێک لەو شوێنانە، دەستە برای ئەوەندە لێ کۆبێتەوە، هیچ خۆی بەبێگانە نازانێ!... دەمێک بوو، لە دڵمابوو بۆت بنووسم کە بمخەیتە ئەم کۆمەڵەوە. بەڵام ئەمویست هەڵیگرم شتی وات لێ داواکەم.ئینجا بۆت بنووسم. وا ئێستا بەکامی خۆم گەیشتم تۆیش هیچت لەدەست نەچوو. چونکە خوێندنگا، لەبەر ئەم سەرکەوتنەم، بەناوی پاداشەوە بەپارەی خۆی، کردمی بەئەندامێکی ئەم کۆمەڵە. سەرمامۆستاکەمان، لەبەرچاوی میوانەکان بانگی کردم، سەربەرەی کۆمەڵەکەی دامێ. ئەوانیش لە خۆشیانا دەستیان کرد بەچەپڵەڕێزان. بەڵام من هێشتا نەچووبوومەوە جێی خۆم (شیرین خان)، بوێژ (شاعر)ی بەناوبانگ، لەشانشینەکەوە هاتە خوارێ، سەرمێزەکە. بەبانگ کراوەکانی گوت: «گەورەکانم! من زۆر دڵشام کە ئەبینم، منداڵێک لەم تەمەنەدا، ئەمەندە بۆ زبانەکەی خۆی بەپەرۆشە. ئەمە نیشانەی بەختیاریی کوردە. ئەوا من بەبۆنەی ئەم سەرکەوتنەیەوە، ئەم دیارییە بچکۆڵەیەم پێشکەش کرد». ئەوەی گوت و دەستی برد، نووسراوێکی جوانی. نایابی (مەموزین)ی دامێ. ئیتر دەست کرایەوە بەچەپڵەڕێزان منیش چوومەوە جێی خۆم.

(شیرین خان) ژنێکی زۆر دڵ چاکە. تا ئەمرم ئەوەم لەبیر ناچێتەوە، کە لە پاش تەواوبوونی ئاهەنگەکە، بەڕوویەکی خۆشەوە بەرەو پیریم هات، دەستی گرتم و گوشی و پێی گوتم: «شێرکۆ! بەقسەی پوری خۆت ئەکەی، بۆ هەر شاگردێک شت ئەنێری، داوای نووسراوی کوردی لێ بکە. ئەوانە زۆر بەکەڵکن. لە زبانەکەتدا شارەزات ئەکەن. بزانە لەگەڵ شاگردانی هەورامان و کرماشان و خاکی موکری و جزیر و بۆتاندا ئاشنایەتی پەیدا بکە. چونکە ئەو شوێنانە گەلێک پیاوی زانا و تێگەیشتووی گەورەیان پێگەیاندووە. هە چ وەختێکیش تەنگانەی پارە، یان نووسینت هاتەبەر، بەمن بڵێ، من بەهەمموو ئارەزووی دڵمەوە یارمەتیت ئەدەم».

کوڕت: شێرکۆ

## چاپخانەی کوردستان

کۆیە: ٧/خەرمانان/ ١٩٦٠

کورە خۆشەویستەکەم شێرکۆ

بەنامەکەت گەلێک گەشامەوە. منیش هەر وام لە تۆ ڕانەپەرموو. لەبەر ئەوە، لە پاداشی ئەو سەرکەوتنە تا ئەوا بیست دینارم بۆ ناردیت کە لە گەشتی هاوینەهەوارە خۆشەکانی ناوچەی هەولێردا بەختی کەی. بەڵام حەز ئەکەم بێیتەوە لام بۆ کۆیە چونکە ئەمە چەند ڕۆژێکە بەهۆی کار و فەرمانەوە گوێزراومەتەوە ئێرە. ئیمڕۆ لە زەماوەندێکی ڕەندین و شیریندا بووم. خۆزگە لەگەڵما ئەبووی. زەماوەندەکە بەبۆنەی تەمەنی هەشت ساڵەی (چاپخانەی کوردستان)ەوە کرابوو. لە گشت لایەکەوە بوێژ و ئەدیب و خوێندەواران و زانایانی کورد بانگ کرابوون. شەو و ڕۆژێکی یەجگار خۆش و ناوازەمان ڕابوارد. گەلێک وتار خوێندرایەوە لە بابەت بنچینەی دامەزراندنی ئەم چاپخانەیە و کردەوە ڕەنگینانەی کە پێکی هانیوە و بلاوکردنەوەی زانست و ئەدیبانی کوردی. لەلایەن دانیشتووانیشەوە سوپاسێکی بەگەرمی خاوەن چاپخانەکان کرا. لە ئەنجامی پرسین و لێ کۆڵینەوەیەکی زۆرا بووم دەرکەوت، کە ئەم چاپخانەیە لە ساڵی ١٩٥٢دا لەلایەن چەند خوێندەوارێکی کارگوزاری نیشتمانپەروەرەوە دامەزرێنراوە. بەهونەرمەندی و زرنگی خۆیان توانیویانە، بەدەست مایەیەکی زۆر کەمەوە چاپخانەیەکی وەها گەورە دابمەزرێنن، کە ئیمڕۆ لە هەموو کوردستاندا هاوتایەکی نییە. لە چاپخانەکەدا گەلێک ژوور و بابەتی حەسانەوە دروست کراوە بۆ سرەوت و خۆش ڕابواردنی فەرمانبەر و کرێکارانی چاپخانەکە. باخچەیەکی ڕەنگین و نووسراوخانەیەکی بەنرخیش تیا دامەزرێنراوە، بۆ خوێندنەوە و نووسراو نووسینەوەی خۆیان و بۆ بلاوکردنەوەی خوێندەواریش لەناو خەڵکا. کرێکار و فەرمانبەرەکانی بەدڵی خۆیان مانگانەیان بۆ بڕاوەتەوە. وە گشتیان برایانە، بەخۆشی ئازادییەوە وەخت بەسەر ئەبەن. مانگی چوار جار ئاهەنگ ئەگێڕن بۆ خۆیان و بۆ ئاشنایان و خوێندەوارانی چاپخانەکە. وە لەوێدا گەلێک وتاری زانستی و ئەدەبی و کۆمەلایەتی ئەخوێندرێتەوە، وە گەلێک چیرۆکیش بەلاسایی ئەگێڕێتەوە. چاپخانەی کوردستان خوێندنگایەکی شەوی یەک ساڵیشی کردۆتەوە بۆ نەخوێندەواران بەخۆڕایی تیا ئەخوێنن. گەلێک لە شاگردانی ئەم خوێندنگایەی فێری چاپگەریی و نووسراو بەندکردن کردووە وە گەلێکیانی خستۆتە سەر ڕێگای خوێندەوارییەکی تەواو. جا لەمانە، هەر ساڵە، چەند شاگردێک ئەنێرێتە دەرەوە بۆ ناو شار و دێهاتەکانی کوردستان، بۆ کۆکردنەوەی: «وشە و چیرۆک و گەمە و یاریی کوردی». هەنێکیش ئەنێرێ بۆ پرس و پشکنین و تاقیکردنەوە و لێ کۆڵینەوە لەبابەت مێژوو و ناسیاویی شێوەی ژیانی ناو تیرە و هۆزەکان. پاشان لە ئەنجامی ئەم کۆشش و تەقەلایانەدا، چی کۆبووەوە، لەلایەن لیژنەیەکی شارەزای زانستی و فەنەوە، بژار و بەراورد و هەڵگێڕ و وەرگێڕ و پاک و پوختە ئەکرێ، ئینجا لە چاپ ئەدرێ. ئەو شاگردانەی کە ئەم هونەرمەندیانە ئەکەن پاداشی گەورە گەورەیان ئەدرێتەوە. تا ئێستا، چاپخانەی کوردستان، بەجوانی و ڕێکوپێکی و بەکەڵکی، سەد نووسراوی نایاب نایابی لە چاپداوە. زۆر لەم نووسراوانە بەوێنە و نیگار و نەخشە ڕازێنراونەتەوە. هەندێک لەمانە: سەرگوروشتەکانی (مەم و زین،

سەلاحەدین، کەریم خانی زەند)، دیوانەکانی (حاجی قادری کۆیی، مەلا محەمەدی کۆیی)، مێژووی هۆزەکان (خۆناسین = سایکۆلۆجی)، (فەنی چاککردنەوەی نەخۆش بەبێ دەرمان)، (فەنی دڵداری و سک و زا)، (گەورە پیاوان)، (گەورە شاهان)، (سەرکردانی سەربەستی)، (پەزیشکی خێزانی)، (ژینی تایبەتی)، (کۆمەڵە چیرۆکی جیهانی) و (خوێندەواریی منداڵ)ە. بۆ یاریدەدانی ئەم چاپخانە بەنرخە بەڕێزە و توانەنی سوپاسگوزارییان بەرامبەر خاوەنە نیشتمانپەروەرەکانی، گەلێک لە بانگ کراوەکان سەر و سەد نووسراویان لە نووسراوەکانی کڕی. منیش یەکێک بووم لەوان. ئەوا بەپۆستەدا (١٠٠) دانەم لەو نووسراوانەم بۆ ناردی. هیوادارم کە دڵت خۆش بکەن و بەکەڵکت بێن. تکا ئەکەم باش بیان پارێزە لە نووسراودانە خنجیلانەکەتا. بەڵام هاوڕێکانیشت لە خوێندنەوەیان بێ بەش مەکە.

چاپخانەی کوردستان، جگە لەوەی کە بۆتە گەوهەرێکی زانست و فەن، وە بەپرشنگی خۆی هەموو کوردستانی رووناک کردۆتەوە، کار و باری چاپ کردنیشی بۆ هەموو کوردێک ئەوەندە ئاسان و هەرزان و پوختە و جوان کردووە، لەوێ بەولاوە، بۆ چاپکردن، روو ناکەنە شوێنێکی تر. هەروەها دەرگای دەرامەت و خۆشگوزەرانیشی لە سەدان خێزانانی کورد کردۆتەوە، لە هەموولایەکی کوردستاندا.

ئینجا، شێرکۆ، کە لە گەشتوگوزار بوویتەوە، حەز ئەکەم بێیتە ئێرە لای باوکی خۆت. تا ئەگەر پێت باش بێ، بتکەم بەئەندامێکی کارگوزار و بەکەڵک لەم چاپخانەیەدا. بەڵکو تۆیش بتوانی لەم رووەوە – کە بەنرخترین و بەکەڵکترین شتە بۆ کوردستان– هەندێک بەکاری نیشتمانە نازدارەکەت بێیت.

باوکت: ئازاد

## شاگردی سەرکەوتوو

شێرکۆ، شاگردێکی چست و چالاک و زیرەکە. بەیانیان زوو لەخەو هەڵئەسێ. دەس و دەموچاوی ئەشوا. بەرگی خاوێن لەبەر ئەکا. چایی و بەرچایی ئەخوات. نووسراوەکانی ئەگری بەدەستەوە. دەستی دایک و باوکی ماچ ئەکا و ئەچێت بۆ خوێندنگا. لە رێدا، خۆی بەهیچەوە خەریک ناکات، راست و رەوان، تا ئەگاتە خوێندنگا. کە تووشی هاوڕێ یان ناسیاوێک دێ، خۆشی و چلۆنی لەگەڵ ئەکا، کە بەپیر و پەککەوتوویەکیش ئەگات، خۆ لائەدا، رێی بۆ بکاتەوە بڕوا. لە خوێندنگادا، لەگەڵ هاوڕێکانیا بەیاری و گفتوگۆی خۆش رائەبوێری. لە ژووری خوێندنیشا دڵ ئەداتە قسەی مامۆستاکانی، وە بێ دەنگ گوێ ئەگرێ. کە لە شتێک نەگەیشت، شەرم ناکا لە هاوڕێ و مامۆستاکانی ئەپرسی. ئێوارانیش کە هاتەوە ماڵێ، بەخوێندنەکانی خۆیەوە خەریک ئەبێ تا رەوانیان ئەکا.

شێرکۆ، جگە لە وریایی و زیرەکی، دڵێکی چاکیشی هەیە. وەیی بۆ کەس نییە یارمەتیی بێکەس و هەژاران ئەدا. دڵی کەس ناڕەنجێنی. لەبەر ئەوە خۆشەویستی هەموانە.

شێرکۆ، جگە لە کردەوە جوانەکانی، لە خوێندەواریشا لە هەموو هاوڕێکانی لە پێشترە. سا بۆیە، هەموو دەم، لەلایەن هاوڕێ و باوک و دایک و مامۆستاکانیەوە ئافەرین ئەکرێ.

# خوێندنگای پیاوەتی

خانەقین ١/میوەخۆش/ ١٩٦٠

براگیان شێرکۆ.

زۆر دڵخۆش بووم کە تۆیش هاتیە ناومان، وە بووی بەیەکێ لە ئەندامی (کۆمەڵی دەستەبرا). جا چونکە منیش وەک تۆ ئارەزووی دەنگوباسی پێشکەوتن و خوێندەواری ئەکەم لە کوردستاندا، ئەوا ئەم باسەم بۆ نووسیت. هیوادارم کە تۆیش دەنگوباسی لای خۆتانم بۆ بنووسی. لە بابەت مێژووی (خوێندنگای پیاوەتی)یەوە پرسیارت کردبوو. چوومە بنج و بناوانیەوە. بۆم دەرکەوت کە لە ساڵی ١٩٥٤دا، لە خانەقین، لەلایەن چەند مامۆستایەکی ئاوارە و پەرێشان، بەڵام هونەرمەند و نیشتمانپەروەر کارگوزارەوە کراوەتەوە. بەدەستمایەیەکی زۆر کەمەوە دەستیان پێ کردووە. بەڵام لە سایەی کۆشش و تەقەلای مەردانەیانەوە توانیویانە (خوێندنگای پیاوەتی) بگەیێننە ڕیزی خوێندنگا هەرە پێشکەوتووەکانی جیهان. ئێستا (١٢) مامۆستا و (٣٠٠) شاگردی تیایە. لە مامۆستاکاندا وەستای (خانوو دروست کردن) و (ئاسنگەریی) و (تەنەکەچیتی) و (دارتاشی) و (ڕەنگ و نەخش و نیگارکردن)، شارەزاییەکی زانستی (خۆناسین و پێگەیاندن و خواناسین)، مامۆستایەکی (ساز و ئاواز) هەیە.

پێڕەویی خوێندنگای پیاوەتی، هێندە پان و فراوانە، جگە لە تەواوکردنی خوێندەواریی حکومەتی - متوسطة و ثانوي- لە ماوەی پێنج ساڵدا شاگرد فێری پێنج شەش تەرح پیشەوەری و فەنی دیدەوانی و پیاوەتی و مەردایەتی ئەکات. ژینی ناو ئەم خوێندنگایە، ئەمەندە خۆشە، پیاو بەخۆی نازانی تیایەتی تا ئەو پێنج ساڵە تەواو ئەکا. لێرەدا هەموو کاروباری لەسەر بنچینەی خۆشەویستی و برایەتی و هاودەمی هەڵئەسووڕێنرێ. ترس و لەرز و شەڕوشۆڕ و پشم و قین نییە. لەگەڵ ئەوەشا، نازی بەیەکتر زۆر ئەگیرێ، هەموو کەس خوا خوایەتی یارمەتیی ئەویتر بدات، گشت لا ئەیەوێ ڕۆژ بەڕۆژ خوێندنگا، بەکردەوەی پەسەند و پیاوانە، پێشخرێ. لێرەدا تا نیوەڕۆ خوێندن. پاش نیوەڕۆش پێشەوەریی لە کارگەکانی خوێندنگادا. هەفتەی شەوێکیش ئاهەنگ و زەماوەند و یاری و لاسایی کردنەوە. مانگێ جارێکیش ڕۆژێک بۆ سەیرانکردن ساڵی دووجاریش، هەر جاری دوو هەفتە، بۆ گەشتوگوزار و دیدەوانی دانراوە.

پاش نیوەڕوانی چوارەم هەفتەی هەموو مانگێک، (٢٠٠) شاگرد، بەسەرپەرشتی مامۆستاکانیانەوە دابەش ئەبن بەسەر خانوو و دوکان و کۆڵان و زەویوزازەکانی ناو شاردا. تا بانگی شێوان، بۆ حکوومەت و بۆ بەلەدیە و بۆ خەڵکی خانەقین، فەرمان، دارتاشی و ئاسنگەریی و تەنەکەچێتی و کرێکاری و خانوو دروستکردن و ڕەنگ و نەخش و نیگارکردن و زەوی کێڵان و داربڕین و دروێنە و کاروانچێتی ئەکەن بەخۆڕایی!...

لە بەهار و پایزیشدا، هەر جارەی دوو هەفتە دابەش ئەبن بەسەر دێهاتەکانی ناوچەی خانەقیندا، بۆ یاریدەدانی حکوومەت و لادێییەکان بەخۆڕایی؛ لە دروێنەکردن و ڕێگا تەختکردن و خانوو دروستکردن و زەوی کێڵان و داربڕین و کاروانچێتی و کوڵلەکوشتن و فەرمانەکانی تریاندا. بۆ دڵخۆشکردن و

ئامۆژگاری و چاوکردنەوەی لادێییەکان، تا ئەو (١٥) ڕۆژانە تەواو ئەبن، شاگردەکان لەژێر سەرپەرشتی مامۆستاکانیاندا، هەموو شەو بەخۆڕایی؛ ئاهەنگ و زەماوەند ئەگێڕن، وتاری نایاب و جوان و بەکەڵک ئەخوێننەوە، یاری لاسایی و گەمە ئەکەن. ئەوا بۆ تاسوق هەندێکم لەو وتار و چیرۆکانە بۆ ناردیت کە ئەمانەن: (کورد و کوردستان، سەلاحەدینی ئەیوبی، نەورۆز، سەیران، ماڵ ڕێکخستن، شار ڕێکخستن، مەڕ، سەمەنی، بەفر، گەزۆ، قسەی پێشینان، فرۆک، ترێ، یاریی مام ڕێوی، یاریی مامۆستا و شاگرد، یاریی زانستی گشت لایی).

شاگردەکانی خۆشیان لەم یارمەتیەدا بەشدران. تا ئێستا بەهەر یەکەیان دەستەیەک کورسی و دوو مێز و نووسراودانێک و چوار تەپلەک و تەختێکی نوستنی نایاب بەخشراوە. جگە لەوە مانگ بەمانگ نیوەی دەستکورتی کارگەکانی خوێندنگاکەیان بەسەرا دابەشکراوە و ئەکرێ. خوێندنگا؛ یاریخانەیەک، هۆڵ (صالون)ێک و شانۆیەک، سینەمایەک، یانەیەک باخچەیەکی جوانکیلانە و نووسراوخانەیەکی بەکەڵکیشی بۆ شاگرد و مامۆستاکان پێک هێناوە مامۆستاکان، هەر یەکەیان خانوویێکی نایابی بۆ تەرخان کراوە بەمز (کری)یەکی کەم تیا ئەبن تا لەوێدابن. هەموویان مانگانەی باشیان بۆ براوەتەوە بەدڵی خۆیان. جگە لەوە نیوەی دەستکەوتی کارگەکان بەسەر ئەواندا دابەش ئەکرێ.

بەڕاستی خوێندەوار و هەژار لە سایەی ئەم (خوێندنگای پیاوەتی)یەوە کەوتۆتە حەسانەوە!...

دەرامەتی خوێندنگا لە مزی خوێندنی شاگردەکان -هەریەکە ساڵی ١٢ دینار ئەدات- و دەستکەوتی (ئاهەنگ) و لاسایی کردنەوە (تمثیل) و (سینەما) و خانوو و دوکانەکان و فرۆتن و دروستکردنی کەلوپەلی ناوماڵ و هی کاروباری کشتوکاڵ دێتە بوون. کارگەکانی خوێندنگا، تەنانەت یاریی منالانەی ڕەنگاوڕەنگ دروست ئەکەن و ئەفرۆشن. خوێندنگا لە گەڵێ لادا کۆگای کردوەتەوە بۆ فرۆشتنی ئەو جۆرە کەلوپەل و بابەتانە. بەهەرزانی و سەرڕاستی و ڕێکوپێکی هەموو کوردێکی دڵخۆش و سوپاس گوزار کردووە.

خوێندنگا، لە پێشا، لە خانوویێکی بچووکی ناخۆشی کرێ گرتەدابوو. ئێستا کە تەنیا حەوت ساڵە دامەزراوە، لەناو زەویەکی (٣٠,٠٠٠) مەترە چوارگۆشەیی خۆیدا ئەم کۆشکە زەلامانەی خوێندنگایە و (١٥) خانوو و (٥٠) دوکانی پێکەوە ناوە. لە هەمووی سەیرتر ئەمەیە کە ئەمانەی هەموو بەدەس و پەنجە و ڕەنجی شانی مامۆستا و شاگردەکان دروست کردووە و پێک هێناوە!... هێشتا بەمەش وازی نەهێناوە، وا خەریکە لەم زەمینەدا (٤٠) خانووی تر دروست بکات بۆ ڕزگارکردنی دانیشتوانی خانەقین لە دەست تەنگ و چەڵەمەی بێ خانوێتی!...

خوێندنگای پیاوەتی، ڕۆژ بەڕۆژ لە پێشکەوتن و سەرکەوتن و دەوڵەمەندبوون دایە. بەکردەوەی پەسەند و بڵندی خۆی دەرگای خۆشگوزەرانی و کامەرانی و پێشکەوتنی لە هەزاران کردۆتەوە. لەبەر ئەوە جێی بەرز و پیرۆزیشی لە دڵی هەموو کەسێکا، بۆ خۆی کردۆتەوە. وا حکومەت و بەلەدیە و دانیشتوانی خانەقین، خەریکن. پاداشی چاکەی بدەنەوە. پیتاکێکی (٥٠٠) دیناریان بەدەستەوەیە بۆی بدەن بەدوکان و کرێکەی بەرەوڕوو بکەنەوە.

من یەکێکم لە شاگردەکانی ئەم خوێندنگایە. بەدڵ خۆشم ئەوێ. وە تا ئەمێنم بۆ سەرکەوتن و پێشکەوتنی تێ ئەکۆشم. چونکە بەکەڵکی من و بەکەڵکی هەموو خەڵکی ناوچەی خانەقین هاتووە. ئایا نافەرمووی لە پایزی ئەمساڵدا سەرێکمان لێ بدەی وە پێکەوە گەشتوگوزاری (١٥) ڕۆژییەکەمان بکەین!.

هاورێت: فەرهاد

## کورد و کوردستان

کورد لە کۆنترین نەتەوەکانی ئارین. لە پێش هەمووشیاندا خانمان و تەخت و بەختیان لەلای ژووروی خاکی ئێراندا دامەزراندووە. نوخشەی حکوومەتەکانیان (مەد) بووە. جگە لەوە لە گەلێ جێگای تردا، چە لە کوردستان وە چە لە خاکی دراوسێکاندا، حکوومەتی گەورە گەورەیان پێک هێناوە وە ئەو خاکانەیان ئاوا کردۆتەوە.

کورد ناوی خۆی بەخۆیەوەیە. ئازایەتیی کورد بێ هاوتایە. بۆیە هەموو دەم. بێگانەش سەرکردەی لەشکریان لە کورد داناوە. کورد پیاوی وەک (سەلاحەدینی ئەیوبی) و (کەریم خانی زەند)ی پێ گەیاندووە، کە لە هەموو مێژووی جیهاندا تەنیا چەند شاهێکی وەک ئەو دووانە گەورە و خواناس و دادخواە و نیشتمانپەروەر و بەفەڕ و خۆشەویستی هەموولایەک ئەدۆزیتەوە!.

کورد هەر بەئازایەتی بەناوبانگ نین. لە دۆستایەتی و پیاوەتی و میواندارییشا ناویان دەرکردووە. سەریان لە پێناو دۆستێکیاندا داناوە. وە هەرچی پەنای بردبنە بەر داڵلایان داوە.

ئافرەتی کورد لە ئافرەتی هەموو دراوسێکانی سەربەستتر و بۆ مێرد بەکەڵکترە. زۆریان لە ئازادیی و فەرمانرەوایی و ژیری و زانایی و نیشتمانپەروەردا ناویان دەرکردووە. قەرەفاتم، قەدەم خێر، عادلەخانمی عوسمان پاشا، ماەشرفخانی ئەردەلانی، لەیلا بەدرخان، حەپسەخانی نەقیب، بەهیە فەرەجوڵلا لەو جۆرە ژنانەن.

زمانی کۆنی کورد ئەچێتەوە سەر زمانی (ئاوێستا). (زەردەشت) پێغەمبەری کورد بووە. بەو زمانە ئایننامەی (زەندەوستا)ی نووسیتەوە، کە لە گەلێک ڕووەوە لە دینی ئیسلام ئەکات!... نووسینیان لە ڕاستەوە بۆ چەپ بووە. بەڵام لە هی ئێستامان ناکات.

کورد گەلێ پیاوی. ژیر و زانا و بوێژ و ئەدیبی بەناوبانگی پێ گەیاندووە کە ئەمانە نەک هەر بۆ کورد، بۆ بێگانەش بەکەڵک بوون. بابە تاهیری هەمەدانی، ئەحمەدی خانی، شەرەفخانی بیدلیسی، حاجی قادری کۆیی، مەلا محەمەدی کۆیی، نالی، مەولەوی، کوردی، سالم، مەحوی، عیلی بەگی، شێخ مارفی نۆدی... لەو پیاوانەن.

کوردستانیش نیشتمانی کوردە. تا بڵێی دڵگیر و دەوڵەمەندە. خوا کێو و کەژی بڵند بڵندی دار و دەشتی ڕەندینی پڕ دەغڵ و دان و چەم و کانیاوی شیرین و سازگار و باغ و بێستان و مێرگ و مێرخوزاری جوانی پێ بەخشیوە. جگە لەوە مەڕومالات و دڕندە و پەرندەیەکی زۆریشی داوەتێ.

کورد ئێمەین. کوردستانیش نیشتمانی ئێمەیە. لەبەر ئەوە لەسەرمان پێویستە تا ئەتوانین خۆمان پێ بگەیەنین و پێشخەین و نیشتمانەکەیشمان ئاوا بکەینەوە. وە خۆمان بخەینە ڕیزی نەتەوە پێشکەوتووەکانی جیهان وە لەگەڵیاندا دۆستانە و برایانە بەخۆشی و سەربەرزییەوە بژین.

## سوڵتان سەلاحەدین

سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی، لە شاهە تاقانەکانی جیهانە. ئەم شاهە کوردە، لە تکریتدا لەدایک بووە. لە مووسڵ و شامدا خوێندنی تەواو کردووە. لەگەڵ ئەوەشا کە بەناپەدڵ چووەتە لەشکرەوە، سەلاحەدین لە بەرامبەر دوژمنا ئازایەتییەکی زۆری نواندووە. بەژیریی و چوست و چالاکیی خۆی توانیویتی دەوڵەتێکی گەورە لە میسردا دامەزرێنی. ئەگەر سەلاحەدین نەبوایە گاورەکانی ئەورووپای ئەوحەلە ئیسلامەکانیان تەفروتونا ئەکرد. بەڵام سەلاحەدین جگە لە دەرکردنی دوژمن، توانی ئەو هەموو خاکە ئیسلامانە هەر لە تەرابلوسەوە هەتا عێراق وە هەر لە کوردستانەوە هەتا یەمەن بخاتە ژێر چنگی خۆیەوە. سەلاحەدین ئەوەندە کردەوەی مەردانەی هەبووە، لەگەڵ دوژمنیشا پیاوەتی نواندووە. وا ئەگێڕنەوە جارێک کە (شێردڵ - ڕێکاردۆس) ناو شاهی ئینگلیزی دوژمنی نەخۆش ئەکەوێ، سەلاحەدین، خۆی ئەخاتە شێوەی پەزیشکێکەوە، وە لەگەڵ پیاوێکیا ئەچێ چاکی ئەکاتەوە. پەیتا پەیتاش پەزیشک ئەنێریتە ناو لەشکری دوژمن نەخۆشەکانیان چاک ئەکاتەوە. جارێکی تر لە شەڕا، ئەسپی (ڕێکاردۆس) ئەکوژرێ، سەلاحەدین ئەسپەکەی خۆی بۆ ئەنێری سواری بێ تا بتوانی شەڕی لەگەڵ بکا!... لەگەڵ ئەوەشا کە سەلاحەدین، ئارەزووی گرتنی خاکی دراوسێکانی زۆر بووە، بەڵام گەلێک بەتەنگ ئاوەدانی و پێشکەوتن و خۆشگوزەرانییانەوە بووە. سەلاحەدین ئازادیپەروەر بوو گشت کەسی خۆش ئەویست. وەک برا لەگەڵیان ئەجوولایەوە. وە بەیەک چاو سەیری ئەکردن. ئێستەش لە شام و لە میسردا شوێن خوێندنگا و مزگەوت و بیمارخانە و نووسراوخانەکانی سەلاحەدینی دیارن وە لەبیر نەچوونەوە. سەلاحەدین وەک شاهەکانی تر چاوی لە خۆش ڕابواردنی خۆیەوە نەبووە. هەر چییەکی بووە دەرخواردی هەژار و لێ قەوماوانی داوە. سەلاحەدین کە مرد تەنیا (٤٧) درهەمی زیو و تۆزقاڵی زێڕی لە پاش بەجێما!... بەهۆی کردەوە و کاری مەردانەیەوە خۆی لای هەموو کەس شیرین کردبوو کوردی کردبووە گەورەی هەمووان. کوردی بەهەموو کەس ناسیبوو، وە لای هەموویان خۆشەویستی کردبوو لە ڕاستیا گەورەیی کورد، زۆرتر، لە دەمی سەلاحەدینەوە ناوی دەرکرد. سەلاحەدین لە شام نێژراوە. ئێستەش بۆ بینینی گۆڕی سەلاحەدین دەستە دەستە، گەورە و بچووک، بەپەرۆشەوە ئەچنە ئەوێ یەکێک لەوانە شاهەنشاهی ئەڵمانیا غەلیومی دووەم بوو کە بەبینینی گۆڕی سەلاحەدینەوە شانازیی ئەکرد. لە بەردێکی مەرمەری نایاب، گۆڕێکی جوانی پڕ نەخش و نیگاری بۆ هەڵکەندراوە. شا کلاوەکەشی بەسەرەوە دانراوە لە تەنیشت گۆڕەکەشیەوە نووسراودانە بەکەلکەی دامەزرێنراوە. ئەمانە هەمووی لە خانوویەکی خنجیلانەی جوانکیلانە دایە، پڕە لە دارودرەخت بەدەوری سۆرک و ئەستێرکێکی جوان و ڕەنگینەوە. ئێستەش گۆڕی سەلاحەدین لەلایەن خێزانێکی کوردی بنەماڵەی ئەیوبییەوە پارێزگاری ئەکرێ. وە لە جێگە پیرۆز و بەرزەکانی کورد و ئیسلام ئەژمێررێ.

# نەورۆز[1]

نەورۆز جەژنی راستەقینەی کوردە. جەژنێکی پیرۆز و بەرزیەتی. چونکە بەر یەکەم رۆژی بەهار و سەری سال ئەکەوێ. وە لەم رۆژەدا هەموو سالێ، کوردستان لە زەبر و زەنگی زستان رزگاری ئەبێ و تازە ئەبێتەوە و، کاروباری کشتوکال و دەرامەدی تر دەست پێ ئەکاتەوە. شەوی ئەم جەژنە لە هەموو لایەکی کوردستاندا ئاگر نێلەنێل ئەکرێتەوە. پیاو و ژن، کور و کچ، مندالان بەدەوریا گرد ئەبنەوە. بەگۆرانی و هەلپەرکێ رائەبوێرن بەیانی لە هەموو لایەکەوە بەزموورەزم و ئاهەنگ و زەماوەند دەست پێ ئەکرێ. دوکان و بازار هەلئەگیرێ هەموو کار و فەرمان ئەوەستێنرێ کوردەکان بەرگی جوان ئەپۆشن و خۆیان ئەرازێننەوە خواردەمەنیی خۆش دروست ئەکەن و دەستە دەستە روو ئەکەنە دەرودەشت. بەسەیران و گەشت و گەرانەوە رۆژ ئاوا ئەکەنەوە.

منالانی خوێندنگا کۆنەکانیش بەخۆشیی ئەم رۆژەوە، هەریەکە لەلایەن مامۆستای خۆیەوە (نەورۆزنامە)یەکی بۆ ئەنووسرێتەوە، کە لەبەری کا و لەبەردەم دایک و باوکیا بیخوێنیتەوە. ئەوانیش شاباش بەخۆیان و پاداشی بەمامۆستاکانیان ئەدەن.

بەلام شاگردانی خوێندنگا تازەکان لە هەموو لایەکی کوردستان، وە لەو شوێنانەشا کە کوردی تیا کۆبۆتەوە، ئاهەنگ و زەماوەندی گەورە گەورە و نایاب و ناوازە ئەکەن بەبۆنەی نەورۆزەوە. لەوێدا هەرچی گەورە پیاو و خوێندەوار هەیە لە کورد و لە بێگانە بانگ ئەکەن، ئەو رۆژە بەگوتنی وتار و لێدانی ساز و ئاواز و کردنی هەلپەرکێی کوردانە و خواردنی خۆرشتی نایابەوە وەخت بەسەر ئەبەن. گیانی نیشتمانپەروەری و برایەتی و سەربەستی و خۆشگوزەرانی زیندوو ئەکەنەوە. وە بۆ پێشخستنی کورد و کوردستان دەماری مەردایەتیی نیشتمانپەروەران ئەبزوێننەوە.

جەژنی کورد، یاخود نەورۆز، سەرگوروشتەیەکی خۆشی هەیە. سا سەرگوروشتەکە، لە بنج و بناوانیا، راستبێ یان درۆ، مەبەس نییە. بەلام هەرچییەک بێ، ئەوە ئەگەیێنی کە کورد لە هەموو دەمێکا مەرد و ئازا و ئازادی پەروەر بووە. وا ئەگێرنەوە کە چەند هەزار سالێک لەمەوپێش لە کوردستانی ئێراندا شاهێکی بێگانەی زۆردار هەلکەوتووە ناوی (بیوراسب) بووە. گەلێ زۆروستەمی لە کوردەکان کردووە. دوو ماری گەورەی بووە، پەرستونی. هەر رۆژەی دوو کەسی بۆ سەربرینون و دەرخواردی داون. کوردەکان لەمە گەلێک بێزار ئەبن، وە لەوە بەولاوە ناتوانن بەرگەی ئەو بەدکارییەی بگرن. لە ناویاندا ئاسنگەرێکی ئازا و ژیر پەیدا ئەبێ ناوی (کاوە) ئەبێ. بەزەیی بەهاوخوێنەکانی خۆیا دێتەوە ئەچێ هانەهانەی هاونیشتمانەکانی خۆی ئەدا پیستەکەی بەرۆکی کە لە ئاسنگەریدا بەکاری ئەهێنا ئەکا بەئالا. بەخۆی و ئالاکەیەوە پێشیان ئەکەوێ و ئەدا بەسەر سەرای شادا. شاە ئەگرێ و ئەیخاتە زیندانەوە. لە جێی ئەو شاەزادەیەکی کوردی سەر راست و نیشتمانپەرست کە ناوی (فەرەیدون) ئەبێ، لەسەر تەخت

---

(١) لە گۆڤاری (بەیان) ژ (١٣)ی ١٩٧٤، ل(٨)دا بلاوکراوەتەوە.

دائەنێ و ئەیکا بەشاه. بەم ڕەنگە کوردەکان، لە دەست زۆر و ستەم و بەدکاریی ئەو شاهە بەدخووە ڕزگار ئەکا.

جا بەخۆشیی ئەو سەرکەوتنەوە، کوردەکان ئەو ڕۆژە ئەکەن بەجەژنێکی گەورە و بەرز و پیرۆز، ناوی ئەنێن (نەورۆز).

## سەیران[1]

لە بەهارا، گژوگیا دەرئەچن. دار و درەخت گەڵا ئەکەن. گیانلەبەر ئەبووژێنەوە. ئاو ئەژێتەوە. دەرودەشت سەوز و ڕەنگین ئەبن. سەرما ئەشکێ. هەموو کەس ئارەزووی گەشتوگوزار ئەکا. لە هەموو لایەکەوە سەیران دەس پێ ئەکرێ. لەناو کورددا، هەموو چوار شەممانێ، دەستە دەستە، کوڕ و کچ بەرگی جوان لەبەر ئەکەن، خواردەمەنی لەگەڵ خۆیان هەڵئەگرن و لەوێ بەبەزم و خۆشی ڕائەبوێرن تا ئێوارێ.

لە سلێمانیدا، ئەو ساڵەی دڵخۆش بێ و کار و فەرمان باش هەڵسوڕێ، لە کورە کوری شار دەستەیەک کۆ ئەبنەوە، سەیرانێکی گەورە ڕێک ئەخەن. لەناو خۆیانا، چەند کەسێ هەڵئەبژێرن و دائەنێن بەپاشا و گزیر و ناوبژیکەر و بەردەست و سەرباز و میوان بەرێکەر. دەستەیەکیش بۆ بەزم و پێکەنین بەپێستە بزن و زەنگۆڵە و دەهۆڵ و زوڕناوە ئەڕازێننەوە. کۆمەڵێکی تریش بۆ کوژاندنەوەی شەڕوشۆڕ و هەراوزەنا دائەنێن. ئەمجارە شاه بەخۆی و بارەگایەوە بەناو گۆرانی گوتن و دەهۆڵ و زوڕنالێدان و چەپڵە ڕێزانی سەیرانکەرەکاندا تێپەڕ ئەکا و ڕوو ئەکاتە جێی سەیران. لەوێ خیوەت و بارەگاه هەڵئەدەن. تا دووسە ڕۆژ بەئاهەنگ و زەماوەند و یاری و گەمەی خۆش خۆش و ڕمبازی و نیشان نانەوەوە ڕائەبوێرن. کە میوان هات بەپیریەوە ئەچن. میواندارییەکی باشی ئەکەن. لەم سەیرانەدا هەرچی شاه ئارەوزوو بکا ئەیکا. ناوبژیی شەڕکەران ئەکا. سەرکێش و بزێو ئەخاتە ناو ئاوەوە و تەمێی ئەکا. ئەو زۆردارانەش کە لەوەپێش زۆرێکیان لە دوکاندار یان هەژارێکی ناو شار کردبێ، لەو ڕۆژەدا تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ و جەریمەش ئەکرێن. پاشان کە گەڕانەوە لە سەیران، هەرچی پارەیەک بۆیان کۆبووەتەوە دابەشی ئەکەن بەسەر هەژاراندا.

## ماڵ ڕێکخستن

ماڵ یەکەم شوێنی منالە کە چاوی تیا ئەپشکوێ، هەناسەی تیا ئەدا، تیا ئەخوا، تیا ئەنوێ، تیا یاری ئەکا و ئەحەسێتەوە. تا گەورە ئەبێ و ئەمینێ ئەو ماڵە لە سەرمای زستان و گەرمای هاوین، لە دز و درۆزن ئەیپارێزێ و ئاگاداری ئەکا. کە بوو بەپیاو جێگای ژن و ماڵ و کوڕ و کچی ئەبێ، شوێنی خزمان و میوانانی ئەبێ. لەبەر ئەوە پێویستە ئەوەندەی خۆمان خۆش ئەوێ، هێندەش ماڵەکەمان خۆش بوێ. ئەوەندەی بۆ خۆمان بەپەرۆشین، هێندەش بۆ ڕازاندنەوە و ڕێکخستنی ئەو بکۆشین. کە کەلەبەر و درز و قلیشی تێ بوو، دیوار و گوێسوانەکانی ڕووخا، کە ڕەنگی دیوارەکان و نەخش و نیگاری ژوورەکانی

---

(١) لە گۆڤاری (بەیان) ژ (١٣)ی ١٩٧٤، ل (٩) بلاوکراوەتەوە.

تێک چوون و پلیکانەکانی هەڵوەشان پێویستە دەس بەجێ وەستایان بینینە سەر: چاکیان بکەنەوە، ڕێکیان بخەنەوە، تازەیان بکەنەوە. ماڵ چەند جوان بێ ئەوەندەش دانیشتووەکانی دڵیان خۆش ئەبێ و خۆش ڕائەبوێرن. پیاوێک چەند دڵتەڕ و پاک و ڕێکوپێک بێ ماڵەکەشی هێندە ڕازاوە و جوان ئەبێ. ئەبێ خانووەکە وا هەڵکەوێ پشتی لە ڕەشەبا و بەری لە ڕۆژبێ. ژوورەکانی، هەموو، پەنجەرەی سەر و خواریان بێ کە بای ژوورەکەی پێ تازە کرێتەوە. پێویستە بۆ هەر مەبەسێ ژوورێ دانرێ. بۆ میوان ژوورێک، بۆ نان و خوان ژوورێک، بۆ نووستن، بۆ خوێندنەوە و نووسین، بۆ سەرشتن، بۆ چێشت لێنان، بۆ چاوەڕوانیی میوان... بۆ هەر کاروبارە ژوورێکی تایبەتی دابنرێ.

لە خاکە پێشکەوتووەکاندا، جگە لەمانە، بۆ منالان و دەس و پێوەندان، بۆ یاریکردنیش ژووریان داناوە. ئەبێ ئەم ژوورانە، هەر یەکەیان، بەپێی خۆیان، بەتەرحە ڕەنگێک دیوارەکانیان ڕەنگ بکرێ و وێنە و نیگار و پەیکەر (هیکل، تمثال)یان تیا هەڵبواسرێ و دابنرێ و برازێنرێنەوە. ئەبێ هەموو ڕۆژێک ناوماڵ پاک بکرێتەوە گەسک بدرێ. هەر هەفتەی جارێکیش نوێن و پێخەف و دۆشەک بخرێنە بەرهەتاو. ئەگەر ماڵ بکەوێتە پەڕی شارەوە یان ناو باغچەیەکەوە گەلێ باشترە. ئەگەر دەستیش بدا هەر لەوێدا -لەماڵێدا- جێگایەک بۆ یاریکردن تەرخان کرێ، گەلێ تەواوتر ئەبێ.

ئەمە شێوەی ماڵ ڕێکخستنی پێشکەوتووانە. ئەو خێزانەی ماڵێکی وای پێ ڕێکخرێ، ئەخۆشیی تێ ناکەوێ، تا یەت دڵخۆش ئەبێ، لای یەکتری شیرین و لای دەرودراوسێ خۆشەویستتر ئەبن. وە لە هەموو شتێک و لە هەموو دەمێکا سەر ئەکەون!...

## شار ڕێکخستن

شاریش وەکو ماڵ پێویستە برازێنرێتەوە. ئەمەش بەسایەی کۆشش و تەقەلای گەورەی شار (رئیس بلدیة)ەوە پێک دێ. ئەبێ لە شارا شەقامی ڕاست و پان بکرێتەوە. کۆڵانەکان پاک و خاوێن ڕاگیرێن. جۆگەلە و شیو داپۆشرێن. لەم بەر و لەوبەری شەقامەکانەوە ڕیزە درەخت لێ بدرێ. لە هەندێ شوێنێدا باخچەی ڕێکوپێک و خۆش پێک بهێنرێ سۆرک (فوارة) و ئەستێرک (حوض) بەهەموو لایەکیا بڵاوبکرێتەوە. سەرپەرشتیی پاکی و خاوێنیی ناو بازاڕ و ماڵان و کۆڵانان بکرێ. بۆ پاراستنی شار لە ئاوی لافاو. لەم بەر و لەوبەری شارەوە بەند (سدة) دروست بکرێ. ئەو شوێنانەی کە ڕێبوار پیا دێتە ناو شارەوە بەدار و درەخت و ساختمان (بناء)ی جوان برازێنرێنەوە. جگە لەمانە پێویستە ئاوێکی خۆش و ڕوون بەتایبەتی بۆ خواردنەوەی دانیشتوانی شار دابنرێ و بەلولە بەماڵاندا بڵاوبکرێتەوە.

هێزی کارەبا (ئەلەکتریک)یش پێویستییەکی تری شارە، بۆ ڕۆشنکردنەوەی ناو ماڵان و کۆڵانان و خستنەگەڕی چەرخ (ماکینە)ی ناو کارگەکان و سووڕاندنەوەی باوەشێن و ڕادیۆ لێدان...

بەکورتی هەرچی خۆشگوزەرانی و کامەرانی پێک بهێنێ بۆ دانیشتووانی شار، (بلدیە) ئەبێ بیکا. چونکە ئەوی بەلەدیە هەیەتی هی دانیشتووەکانی شارە. لەگەڵ ئەوەشا، هەمیسان پێویستە ئێمەیش یارمەتیی بدەین. ئەو خانوانەی سەرلەنوێ دروستیان ئەکەنەوە لەسەر شێوەی تازەبن. ناو ماڵ و بەردەرگامان پاک ڕاگرین. بۆ خۆمان و بۆ ئەوانەش کە ڕوو ئەکەنە شارەکەمان میوانخانە و جێگای

حەسانەوە و خۆشڕابواردن دروست بکەین. چونکە تا شارەکەمان جوان و پاک و ڕێک و پێک بێ، ئەوەندەش میوان ڕووی تێ ئەکا، ئەوەندەش دەرامەت، گوزەرانی باش، وە ئاوەدان ئەبێتەوە.

## مەڕ

مەڕ گیانلەبەرێکی بەسەزمانی بەکەڵکە. لە نیشتمانی خۆماندا گەلێ کەس بەمەڕەوە بەڕێوە ئەچن. بەهاران شوان ئەیانبەنە کەژ و کێو بۆ لەوەڕاندن، لەوێ گیا ئەخۆن. لە هاوینا بەپوش ئەژین، لە پایز و زستانیشا بەگەڵاوە بەڕێوە ئەچن.

لە بەهارا کە گیانلەبەر سک و زا ئەکا، مەڕیش ئەزێ و ئەبووژێتەوە و شیری زۆر ئەبێ. لادێیەکان لە شیرەکەی گەلێ خواردەمەنی دروست ئەکەن. لە شیر. ماست، فرۆ، دەڵەمە، لۆرک، پەنیر، لە ماستیش؛ دۆ لە دۆیش؛ کەرە و دۆینە و شیرێژ. لە شیرێژیش؛ سوێرەکە و کەشک. لە کەشکیش؛ دۆکەشک. لە کەرەش؛ ڕۆن دروست ئەکرێ.

خوریەکەشی گەلێ نایاب و بەکەڵکە. ئەمیش لە بەهارا ئەبڕێ و پاک ئەکرێتەوە و ئەنێرێتە شاران بۆ فرۆشتن. لە خوریەکەی شالی ڕانک و چۆغە، فەرەنجی، پەستەک، گۆرەوی، دەسکێش، تەقیلە و کڵاو، پەتۆ، دەوار، گوریس، خەرار، جاجم و پوپەشمێن و بەرماڵ بەڕە و قالیچە و گەلێ شتی نایابی تر دروست ئەکرێ.

لە شاخەکانی دەسکی چەقۆ و کێرد و خەنجەر، دوگمە و شانە و دارجگەرە دروست ئەکرێ. پشقلەکەشی بۆ سووتەمەنی و بەهێزکردنی زەوی و زار بەکارئەهێنرێ. پێستەکەی ئەکرێ بەکالە و پێتا و، بەمەشکە و کوندە و هەمانە بەتەپڵ و دەف و کەلوپەلی ولاخ و گەلێ شتی تر.

کە سەربڕا گۆشت و سەروپێکەی ئەخورێ. ڕیخۆڵەکانیشی ژێ و گەلێ شتی تری لێ دروست ئەکرێ.

دراوسێکانمان هەموو ساڵێ دێنە کوردستان بۆ کڕینی ڕانەمەڕەکە بیبەنەوە خاکی خۆیان جا لەمەوە دەستکەوتێکی باشمان دەس ئەکەوێ.

لەبەر ئەوەی مەڕ هێندە بەکەڵکمان دێ، پێویستە زۆر باش بەخێوی کەین، ئازاری نەدەین، وە زۆر بەتەنگ خۆشی و حەسانەوەیەوە بێین.

## سەمەنی

سەمەنی خواردەمەنیێکی ناوازەی کوردانەیە. بەڕەنگ لە دۆشاو ئەکا تام و بۆنیشی خۆش و شیرینە. ئەم خواردەمەنییە نایابە لە چلەی زستاندا دروست ئەکرێ. سەمەنی ئەرکی زۆرە لەبەر ئەوە هەموو کەس ناتوانێ دروستی بکا. ئەوانەی سەمەنی ئەکەن، دێن؛ گەنمەکە ئەشۆنەوە لەسەر سەبەتەیەک بڵاوی ئەکەنەوە، ڕۆژ بەڕۆژ ئاوی لێ ئەپرژێنن هەتا چەکەرە ئەکا و گیایەکی ناسکی تەڕوبڕی لێ دێتە دەرەوە. لە دوای ئەوە، بەگیا و چەکەرەوە لەناو دۆڵێکا ئەکوترێ و لەناو شتێکا ئەگلوفرێ و ئەگوشرێ تاتلپە ڕونەکەی ئەمێنێتەوە. ئینجا ئەو تلپە فڕێ ئەدرێ. ئاوەکەشی ئەپاڵێورێ و ئەکرێتە مەنجەڵێکی گەورەوە.

پاش ئەوە بەپێی خۆی ئارد و ئاوی تێکەڵ ئەکرێ و ئەکوڵێنرێ تا توند ئەبێتەوە. ئەمە لە ئێوارێوە تا نیوەشەو ئەخایێنێ. لەم دەمەدا کوڕ و کچی کەس کار و دەرودراوسێ کۆ ئەبنەوە بەگۆرانی و ڕەشبەڵەک شەوگار بەسەر ئەبەن.

سەمەنی کە پێگەیی دائەگیرێ و دائەنرێ تا بەیانی. کە بەیان هات و تەماشای مەنجەڵەکەیان کرد، ئەبینن ئاوێکی زرنگ و ڕوون بەسەر سەمەنییەکەوە وەستاوە، سەمەنییەکەش ئاڵ هەڵگەڕاوە. ئینجا تێی ئەکەن، بەخزم و دەرودراسێدا ئەیبەشنەوە.

سەمەنی خواردەمەنییەکی تایبەتیی کوردە. جگە لەوەی کە خۆشە، بەبۆنەی دروست کردنیەوە کەسوکار و دەرودراوسێش لەیەک جێدا کۆئەبنەوە خۆشەویستی و دۆستایەتییان تازە ئەکەنەوە، وە کەمەری یەکێتی و برایەتی ئەبەستنەوە. کورد لەم جۆرە خورشتە خۆشەویستانەی زۆرە. گیپە و کەشکەک و ساوەر و دانولەش وەک سەمەنی سەرچاوەی خۆشی و بەزموڕەزمی و هۆی بەهێزکردنی کۆمەڵایەتیمانن. لەبەر ئەوە پێویستە بەچاوێکی خۆشەویستانە سەیریان بکەین.

## بەفر

زستانان، لە کوردستاندا، هەندێ ڕۆژ کە پیاو بەیانیان لەخەو هەڵئەسێ. سەیر ئەکا؛ ناو ماڵ و سەربان و کۆڵانان سپی ئەکەنەوە، شتێکی سپی لق و پۆپی درەختانی شاردۆتەوە، کێوانیش سەراپا بەرگێکی سپیی بێ گەردیان پۆشیوە، تێ ئەگا بەفرە باریوە. ئەمجا لەو ڕۆژەدا ماڵان ئەکەونە خۆیان. لەسەر ڕەوشتی کوردەواری دۆینە و دۆکەشک لێ ئەنێن. بان گوشان بەخۆیان و بەفرماڵەکانیانەوە ئەکەوتە سەریان بەفر ئەماڵن. هەرزەکاران ئەچنە کێوان بوراوی نێچیر. منالان کۆ ئەبنەوە بۆ شەڕە تۆپەڵکردن و شێرە بەفرینە دروستکردن. بەفر فرۆشەکانیش سەرلەبەیانی ڕوو ئەکەنە ئەو شاخ و کێوانە، هەر کەسە لە چاڵە بەفری خۆیا دەس ئەکا بەبەفر شاردنەوە. بۆ ئەمەی کە هاوین هات بیفرۆشن وە بەدەستکەوتەکەی ماڵ و منداڵی خۆیانی پێوە بەڕێوە ببەن.

بەفر کەڵکی زۆرە. لە زستانا شاخ و کێو و دەرودەشت ئەڕازێنێتەوە. هە چ کرم و مێرووێەک کە زیانی بۆ زەویوزار و کشتوکاڵ بێ ئەیکوژێ لە بەهارا ئاو ئەڕژێنێتەوە. لە هاوینیشا بۆ بەفراو و شەکراو و ماستاو و بەستەنی (دۆندرمە) بەکارئەهێنرێ. چێشت و میوەش لە ترشان و ڕزین ئەپارێزێ.

لەو خاکانەدا کە بەفری خوا کرد دەست ناکەوێ، بەفر بەچەرخ (ماکینە) دروست ئەکەن. بەڵام بەفری کوردستانی خۆمان کە خوا کردە، گەلێک هەرزانتر و خۆشتر و نایابتر و بەکەڵکترە. ئێمە سەهۆڵیشمان هەیە کە لە بەفریش پوختەترە.

## لاسایی کردنەوە (تمثیل)ی: گەزۆ

(پەردە ئەکرێتەوە. جێگا: دوکانی وەستایەکی پەپکەگەزۆیە. دوو شاگرد: یەکێکیان ئەبێ بەکوڕ، یەکێکیشیان ئەبێ بەباوک. لاسایی وەستای پەپکەگەزۆ (حەلواچی) و کوڕەکەی ئەکەنەوە. کوڕەکە پەپکەگەزۆیەک ئەگرێ بەدەستیەوە و ئەیخوا. ئینجا ڕووئەکاتە باوکی. کە ئەویش بەبەرزەوە دانیشتووە، دەستەیەک قامیشی بەدەستەوەیە بەقایم لەناو مەرکانەیەکی زلی وەرئەدا).

کوڕ: بابەگیان! سوپاست ئەکەم بۆ ئەم پەپکە گەزۆوە جوانە بۆن خۆشەی کە بۆت دروست کردووم. ئەی پێم نافەرمووی چۆن دروست ئەکرێ؟

باوک: ڕۆڵە لە گەزۆ دروست ئەکرێ.

کوڕ: گەزۆ چییە؟

باوک: گەزۆ شتێکی سپییە، شیرینە وەک شەکر.

کوڕ: گەزۆ چۆن پەیدا ئەبێ؟

باوک: شەو لە خواییەوە ئەبارێتە سەر گەڵای درەخت. کە ڕۆژ بووەوە لادێییەکان ئەو گەڵایانە بەتوڵەکانیانەوە ئەبڕن. لە جێگایەک کۆمەڵەیان ئەکەن و ئەیان خەنە بەر خۆر تا وشک ئەبنەوە. پاشان لەسەر مەوجێک گەڵاکان ئەوەرێنن و لاسکەکان فڕێ ئەدەن. ئینجا بەگەڵا کوتک، گەڵاکان ئەکوتن تا ورد ئەبن. کە ورد بوون لە بێژنگیان ئەدەن تا هەر پوش و پەلاشێکیان پێوەبێ لێیان جیائەکەنەوە. ئینجا هەمانە و تورەکە دێنن، ئەمەیەک ئاویان لەناو ئەدەن و گەڵا ورد کراوەکانیان ئەخەنە ناوەوە. پاشان ئەو هەمانە و تورەکانە لەبەر ڕۆژا دائەنێن تا گەز و گەڵا وردکەکان یەک ئەگرن و پێکەوە ئەلکێن. ئەمە، لادێییەکان (تۆلا)ی پێ ئەڵێن. ئەوسا بەبار ئەیهێننە شار ئەیفرۆشن. جا (دۆشاوی گەزۆ) و (پەپکە گەزۆ) لەمە دروست ئەکرێ.

کوڕ: ئەی بابەگیان پەپکە گەزۆ چۆن دروست ئەکرێ؟

باوک: وەستاکان (تۆلا) کە ورد ئەکەن و ئەیخەنە ناو ئاوەوە. تا وردە گەڵاکان سەر ئاوەکە ئەکەون و گەز و کەش ئەنیشێ. ئینجا ئەیپاڵێون و هێلکەی لێ ئەدەن تا ئاوێکی زرنگی ڕۆنی لێ پەیدا ئەبێ. ئەمیش ئەکوڵێنن تا بەتەواوەتی توند ئەبێتەوە. تۆزێ ئەسپۆن یان شەکرێ لێ ئەدەن. ئینجا دایئەگرن تا سارد ئەبێتەوە. ئەوساکە پەپکە پەپکە ئەیبڕن و ئەم پەپکە گەزۆیەی لێ دروست ئەکەن.

کوڕ: بابە ئەم گەزۆیە لە کوێ ئەبارێ؟

باوک: ڕۆڵە، گەزۆ لە گەلێ شوێن ئەبارێ. بەڵام زۆری لە کوێستان و دارستانەکانی کوردستاندا پەیدا ئەبێ. -وەکو ئەڵێن- هەرچەند ئەبارێتە سەر گەڵای هەموو دار و درەختێک، بەڵام ئەوی لەسەر گەڵای دار بەڕوو و دار ماز و ئەبارێ بەکەڵک نایە.

کور: بابەگیان سوپاست ئەکەم. تێگەیشتم. ئەم پایزە بێتەوە منیش لەگەڵ برا لادێییەکانما ئەچمە شاخی، گەڵا ئەڕنم و تولا ساز ئەکەم و بەسەرپەرشتی تووە پەپکە گەزۆ دروست ئەکەم.[1]

(پەردە دائەدرێتەوە)

## قسەی پێشینیان

باو و باپیرمـان ئەوەندە لە دەستـووری ژیان گەیشتـوون و هێندە پێڕەویی خواییـیان دۆزیوەتەوە، ئێستەش کە ئەمە هەزاران ساڵە بەسەر ئەو قسانەیاندا تێپەڕیوە، هێشتا قسەکانیان ڕێگای ژین و بەختیاری و سەرکەوتنمـان بۆ ڕۆشن ئەکەنەوە. وا هەندێ لە قسەی ئەو پیاوە ژیرانە بۆ وێنە ئەخەینە بەرچاو:

١- چاکە بکە و بیکە بەدەم ئاوەوە.

٢- کابە بڕوخێنە و دڵێ مەڕەنجێنە.

٣- پرسابە و زانابە.

٤- شەڕ لە بێ کاری چاکترە.

٥- ئەو جێیە خۆشە کە دڵ پێی خۆشە.

٦- قسە لە پاش حەوت کێو ئەگاتەوە بەخێو.

٧- سەر بۆ سەربڕین نەک بۆ سەر زەنشت.

٨- کانییەک ئاوت لێ خواردەوە بەردی تێمەخە.

٩- برا لە پشت برابێ، مەرگ مەگەر لەلای خوابێ.

١٠- پارو لە دەمدا کەم بۆ کۆش باشە.

١١- ئەوەندەی بەرەی خۆت پێت ڕاکێشە.

١٢- زۆر ببیە با لە کەم بگەی.

١٣- دۆست ئەوەتا ئەتگریێنی دوژمن ئەوەتا پێت پێ ئەکەنی.

١٤- بۆیە پێت ئەڵێم کاکە، کە چۆلەکەم بۆ بگری.

## ترێ[2]

لە هەمـوو میـوەیەک زۆرتر و نایابتر لە کـوردستـاندا ترێیە. لە هاوینا کە گەرما تین ئەسێنی ترێ پێ ئەگا. لادێییەکان پەیتا پەیتا ئەیبەنە ناو شار ئەیفرۆشن. ترێ گەلێ بابەتی هەیە. بەناوبانگەکانیان ترێی سەعدانی، سەرقولە، ڕەشمیری، مام برایە، تایەفی، کشمیشی، دۆشاویی، ڕەشکەیە. دار ترێ (مێو)

(١) لە (بەیان) گ. ژ (١٥)ی ١٩٧٤، ل ١٦دا بلاوکراوەتەوە.

(٢) ئەو بابەتانەی پێشوو: (مەڕ، سەمەنی، بەفر، گەزۆ) لە گۆڤاری (بەیان)دا ژمارە (١٤، ١٥)ی ١٩٧٤ بلاو کراونەتەوە.

بەدێمی و بەراوی لە شاخەکانی کوردستان ئەڕوێنرێ. گەلاکەی (گەلامێو) ئەکرێ بەچێشت. بەرسیلەکەشی بۆ خۆشاو (شربت) و بۆ چێشت بەکارئەهێنرێ.

لە ترێش گەلێ خواردەمەنی دروست ئەکرێ: وەک سرکە، ڕەنگاو، دۆشاو، باسوق، سجوق و مێوژ.

کە چلەی هاوین ڕەزدارەکان، بۆ دروستکردنی هەندێ لەو خواردەمەنییانە بەخاووخێزانەوە ئەکەنە ناو ڕەزەکانیان. هەر دەستەیەی لەلایەکەوە، خەریکی شتێک ئەبێ. هەندێکیان مێوژ دروست ئەکەن. دێنن ترێ کە بەهێشویی لە خولەمێشاوێکی پالاوتە هەڵئەکێشن وە لەسەر مەوجێک بلاوی ئەکەنەوە تا وشک ئەبێتەوە. مێوژە مام برایە و مێوژە سوورکە و مێوژە خولاو بەو ڕەنگە دروست ئەکرێن.

هەندێکیش خەریکی دۆشاو ئەبن. ترێ کە ئەکەن بەبۆڵ. لەناو تەشتا ئەیفلیقێننەوە و بەدەست و پێ ئەیشێلن. پاشان ئاوەکەی ئەگرن و تلپەکەی فرێ ئەدەن. ئینجا ئاوەکەی ئەپالێون. کە پالاوتیان ئەیکەنە ناو مەنجەڵی گەورەوە و لەسەر ئاگر ئەیکوڵێنن. هێلکەشی لێ ئەدەن بۆ ئەوەی هەرچی پوش و پەلاش و لیلییەکی تیا هەبێ سەرکەویتە سەر ئاوەکە و بگیرێ و فرێ درێ. ئینجا کە زۆر چاک لەسەر ئاگرەکە کولاو و لینج بوو، دائەگیرێتە خوارێ، تا سارد ئەبێتەوە و ئەبێ بە(دۆشاو).

ئەگەر ئەم دۆشاوەش بکوڵێنرێتەوە و بەرە بەرە نیشاستەی تێ بکرێ و باش تێک هەڵ بدرێ هەتا وەک پەلولەی لێ دێ، ئینجا دابگیرێ و لەسەر مەوجێکی کەشکۆڵی پان بکرێتەوە دابنرێ تا سارد ئەبێتەوە پاشان خشت ببڕێ و بکرێ بەسەلک ئەو سەلکانە (سەلکە باسوق)ی پێ ئەڵێن.

(سجوق)یش هەروەک باسوق دروست ئەکرێ. ئەوەندە هەیە لێرەدا کاکلەگوێز و بادام ئەکرێ بەپەتەوە و لە پەلولە دۆشاوەکە هەڵئەکێشرێ و هەڵئەواسرێ تا وشک ئەبێتەوە.

ترێ و ئەوی لە ترێ دروست ئەکرێ سامانێکی گەورەیە بۆ کوردەواری. ئەوەندە هەیە ئەگەر لەسەر شێوەی نوێ کارگە و چەرخی بۆ دامەزرێنرێ و خواردەمەنییەکان بخرێتە ناو قوتوو و شووشەوە و بازرگانییان پێوە بکرێ لەگەڵ دراوسێکانماندا، گەلێک گەلێک باشتر لە ئێستا ئەکەوینە خۆش گوزەرانییەوە.

## لاسایی کردنەوەی سەرگوروشتەی مام ڕێوی

(پەردەی ١)

جێگا: هەوارێکی لادێیانەیە. پیرێژنێکی کورد بزنێکی لەبەردەمایە ئەیدۆشێ. پاش دۆشینی بزنەکە بەرەڵلا ئەکا. ئینجا مەنجەڵە شیرەکەی دائەپۆشێ. پاشان تەوراسێک ئەگرێ بەدەستیەوە و لە پەنایەکا خۆی مات ئەدا.

داپیرە: ئەمە چەند جارە ئەم ڕێوییە بەدبەختە بەشیرەکەم فێربووە؟!... چۆرم بۆ ناهێڵێتەوە.
هەمووی ئەخواتەوە. پەیمان بێ ئەمجارە بێتەوە کەتنێکی وای پێ بکەم ببێ بەواتەی ڕۆژگار. ئەبێ بەم تەوراسە کلکی بپەڕێنم!...

(مام ڕێوی دێتە ژوورەوە)

مام ڕێوی: وەی لە دەورت گەڕێم میمکەی خاوەن شیرا... خۆ تۆ نەبویتایە من ئەمساڵ لە برسا ئەمردم. ئاخۆ تۆ بڵێی ئەمجارەش داپیرە مەنجەڵەکەی بۆ پڕ کردبم لە شیر؟

(مام ڕێوی سەری مەنجەڵەکە هەڵ ئەداتەوە و دەست ئەکا بەشیر خواردنەوە). ئۆخەی داپیرە یاخوا کارت ڕاست بێ. ئاهی سکم شکا!... (داپیرە بەئەسپایی لێی دێتە پێشەوە، دەسی لێ ئەوەشێنێ. تەوراسێک لە کلکی ئەدا ئەیپەڕێنێ).

داپیرە: منیش ئۆخەی کزەی جەرگەکەم، مام ڕێوی! دڵم دامرکا! (ڕێوی بەواقەواق و هەڵەداوان دەرباز ئەبێ. پەردە دائەدرێتەوە).

(پەردە ٢)

جێگا: هەوارێکی کوردانەیە. داپیرە لەناو منداڵەکانیا دانیشتووە ماستیان بۆ تێ ئەکا. لەولاشەوە سەماوەر و بەرچایی دانراوە. دێ لەبەر دەمیاندایە. لە دوورەوە ئەمانە دیارن: (چیمەن و دارستان و کانیاو، بزن، دەستەیەک کیژ، کەوش درو، مریشک، سەپانێک شەنێکی بەدەستەوەیە بەدیار خەرمانەکەیەوە).

داپیرە: ئۆخەی ڕۆڵە! باش بوو لە دەست ئەو ڕێوییە زۆردارە کە چ ڕەفتارە ڕزگارتان بوو. هیچ شیری بۆ نەئەهێشتنەوە بۆتان بکەم بەماست. لەوەتی کلکیم پەڕاندووە چارەیم نەدیوەتەوە. وا ئەمجارە شیرەکەم بۆ کردوون بەماست، ها بیخۆن بەنان و چایەکەتانەوە. نۆشی گیانتان بێ!.

(منداڵەکان بەتریق و هۆڕێکەوە ناون و ماست و چایەکەیان ئەخۆن).

منداڵەکان: باشە دایەگیان دەستت خۆش بێ. خوا تۆمان بۆ بهێڵێ کە ئەوەندە بەتەنگ خواردن و ڕابواردنی ئێمەوەی. ئەی ئەگەر هاتەوە نەی کوژین؟

داپیرە: نەء ڕۆڵە. کوشتن بدەنە دەست خوا. پیاوی زۆردار و فڕوفێڵباز پەندی پێ بدرێ چاکترە لەوەی لەناو ببرێ!.

(لەم وەختەدا ڕێوی دێتە ژوورەوە، دەس ئەکا بەپاڕانەوە لە داپیرە).

مام ڕێوی: ڕۆژتان باش داپیرە. ڕۆژتان باش منالە خۆشەویستەکان. داپیرە خۆت ئەزانی، من هەر لە باووباپیرمەوە نۆکەری ئەو دەرگایەی ئێوە بووم. ئێستەش کە کلکت پەڕاندووم قەی ناکا، تۆ گەورەمی، دەستت خۆشبێ. بەڵام هاوڕێکانم تیزم پێ ئەکەن. بیکە لەڕێی خوادا کلکەکەم پێوە بنێرەوە. بام لەمە زۆرتر ئابڕووم نەچێ. پەیمان بێ تا هەم خراپەم بۆ کەس لێ نەوەشێتەوە!...

منالەکان: (بەپێ کەنینەوە). های ڕێوی کلکی پەڕاوە!... های ڕێوی کلکی پەڕاوە!... لەسەر خواردنەوەی شیری ئێمە، ئۆخەی ئابڕووی بڕاوە!...

داپیرە: مام ڕێوی! چونکە خۆت هاویشتۆتە مالی ئێمە و ئەپاڕێیتەوە، بەشی خۆم ئەت بەخشم. بەڵام بەخوا هەتا شیری منالەکان نەهێنیتەوە کلکەکەت نادەمەوە!...

مام ڕێوی: (ئەچی بەلای بزنەوە). بز شیردە، بۆ داپیردە، داپیر کلکە قولیم بداتەوە.

بزن: بچۆ گەڵام بۆ بێنە تا شیرت بدەمێ.

مام ڕێوی: (ئەچێ بەلای دارەوە). دار گەلادە، بۆ بزدە، بز شیردا. بۆ داپیر کلکە قولیم بداتەوە.

دار: ئاوم بدە تا گەلات بدەمێ.

مام ڕێوی: (ئەچێ بەلای کانییەوە). کانی ئاودە، بۆ داردە، دار گەلادا، بۆ بزندا، بز شیردا، داپیر کلکە قولیم بداتەوە.

کانی: بچۆ دەستەیەک کیژبێنە. چۆپیم لەسەر بکەن. ئاوت دەدەمێ.

مام ڕێوی: (ئەچێ بەلای دەستەی کیژانەوە). کیژ چۆپی کەن. لە کانی کەن، کانی ئاودا، بۆ داردا، دار گەلادا، بۆ بزدا، بز شیردا، بۆ داپیردا، داپیر کلکە قولیم بداتەوە.

کیژەکان: بچۆ کەوشمان بۆ بێنە تا چۆپیت بۆ بکەین.

مام ڕێوی: (ئەچێ بەلای وەستای کەوش دوروەوە). وەستا کەوش کە، بۆ کیژکە، کیژ چۆپی کا، لە کانی کا، کانی ئاودا، بۆ داردا، دارگەلادا، بۆ بزدا، بز شیردا، بۆ داپیردا، داپیر کلکە قولیم بداتەوە.

کەوش دروو: بچۆ هێلکەم بۆ بێنە کەوشت ئەدەمێ.

مام ڕێوی: (ئەچێ بەلای مریشکەوە). مر هێلکە کە، بۆ وەستا کە، وەستا کەوش کا، بۆ کیژ کا، کیژ چۆپی کا، کانی ئاودا، بۆ داردا، دار گەلادا، بۆ بزدا، بز شیردا، بۆ داپیردا، داپیر کلکە قولیم بداتەوە.

مریشک: بچۆ دانم بۆ بێنە بیخۆم هێلکەت ئەدەمێ.

مام ڕێوی: (ئەچێ بەلای سەپانەوە). لالەی سەپان خوا خەرمانەکەت بەپیت کا. هەندێ گەنم پێ نابەخشی لەسەری داماوم؟

سەپان: بەسەرچاو مام ڕێوی. فەرموو چەند هەڵئەگری هەلگرە.

مام ڕێوی: (هەندێ گەنم هەڵئەگرێ و ئەیبا بۆ مریشک). لالۆی سەپان سوپاست ئەکەم. خوا هەربتان هێڵی بۆ چاکەی گشت لایی بەخوا ئابرووی منت کڕییەوە! (ئەگاتە لای مریشک). فەرموو مریشک ئەوە دان.

مریشک: فەرموو ڕێوی ئەوە هێلکە.

مام ڕێوی: (هێلکە کە ئەبا بۆ کەوش دروو). فەرموو وەستا ئەوە هێلکە.

کەوش دروو: فەرموو ڕێوی ئەوە کەوش.

مام ڕێوی: (جووتە کەوشەکان هەڵئەگری و ئەیان با بۆ کیژەکان). فەرموو کیژەکانم ئەوە کەوشەکانتان.

کیژەکان: فەرموو مام ڕێوی بام بچینە سەر کانی چۆپیت بۆ بکەین.

مام ڕێوی: (لەگەڵ کیژەکاندا ئەچێتە سەر کانی). فەرموو کانی. ئەوا کیژەکانم بۆ هێنایت. چۆپیت لەسەر بکەن.

کانی: فەرموو ڕێوی. ئەوا ئاوم دایتێ بیبە بۆ دار.

مام ڕێوی: (ئاو ئەبا بۆ دار). فەرموو دار. ئەوا کوندەیەک ئاوم بۆ هێناوی ئەیکەمە بنت.

دار: فەرموو ڕێوی. ئەوە گەڵا بیبە بۆ بز.

مام ڕێوی: (گەڵا ئەبا بۆ بزن). فەرموو مام بزن ئەوە گەڵا.

بزن: فەرموو مام ڕێوی ئەوە شیر. (ڕێوی دەس ئەکا بەدۆشینی شیر لە بزن).

مام ڕێوی: (بەخۆی و مەنجەڵی شیرەوە ئەچێتە ماڵی داپیرە). فەرموو داپیرەگیان ئەوە شیرەکەتان.

منداڵەکان: ئای!... ئەوە مام ڕێوییە شیرەکەی بۆ هێناوینەوە. ماندوو نەبی مام ڕێوی. دایەگیان بۆمان بکە بەماست. بۆمان بکە بەپەنیر.

داپیرە: ئافەرم مام ڕێوی!... (مەنجەڵە شیرەکەی لێ وەرئەگرێ).

وەرە کلکەکەت پێوە بنێمەوە. بەڵام بەڵێنم ئەدەیتێ کە ئیتر بێ فەری نەکەی؟ (کلکەکەی بەقیر پێوە ئەنووسێنێتەوە).

مام ڕێوی: داپیرە خوا سەرئەفرازت کا. تا ئەمرم ئەم چاکەیەتم لەبیر ناچێتەوە پەیمان بێ تا هەم ئازاری کەس نەدەم. وە دڵسۆزی خۆت و منداڵ و کەس و کارت بم. خوا ماڵت ئاواکا. (ئەچێتە دەرەوە).

داپیرە و منداڵەکانی: (بەیەک دەنگ) خوات لەگەڵ مام ڕێوی.

(پەردە دائەدرێتەوە)

(پەردەی ٣)

جێگا: دارستانێکە بەپاڵ شاخێکەوە. لە نزیک دارستانەکەوە شەش ڕێوی وەستاون لەپڕ مام ڕێوی بەخۆی و کلکە قیرینەکەیەوە دەرئەکەوێ و دێتە ناویانەوە).

مام ڕێوی: ڕۆژتان باش. برا ڕێوییەکان.

ڕێوییەکان: (بەیەک دەنگ). ئای ئەوە ڕێویی کاک قرتاوە!... ئای ئەوە ڕێویی کلک قرتاوە!... مام ڕێوی ماندوونەبی!... ئەوە کەی کلکەکەتیان پێوە نایتەوە؟

مام ڕێوی: ئەی نازانن داپیرەم ئاشت کردۆتەوە و ئەویش کلکەکەی داومەتەوە؟

ڕێوییەک: کامەتا بزانم؟ (ئەچێ بەلای کلکیەوە سەیری ئەکا) ئای خۆ ئەمە بەقیر کلکەکەیان پێوە نووساندۆتەوە!... بڕۆ بەولاوە بۆنی قیرت لێ دێ!...

ڕێوییەکانی تر: (هەموو دێنە پێشەوە لێی نزیک ئەبنەوە سەیری ئەکەن و بۆنی کلکی ئەکەن) ها!... ها!... ها...!. ڕاست ئەکا بەخوا. بەقیر کلکیان پێوە ناوەتەوە!. بڕۆ بەولاوە بۆنی قیرت لێ دێ!... هێی!... مام ڕێوی کلکی قرتاوە و بەقیر کلکیان پێوە ناوە!... هێی...!...

مام ڕێوی: (ڕائەکا لە دەستیان. لەبەر خۆیەوە ئەڵێ): ڕاوەستن بۆم تا دێمەوە وێزەتان. پەیمان بێ پەندێکتان پێ بدەم تا ئەمرن لە بیرتان نەچێتەوە!...

(پەردە دائەدرێتەوە)

(پەردە ٤)

جێگا: هەواری ماڵە کوردێکە. شاخ و داخ و چیمەن و دارستان لە دوورەوە دیارە. ژن و مێردێکی شۆخ و شەنگ بەبەرگی کوردییەوە وەستاون. لە دوورەوە ڕێوییەک بەدی ئەکەن ڕائەکا و بوخچەیەکی بەکۆڵەوەیە).

ژن: براڕۆ! باوکەڕۆ، مام ڕێوی بەرگەکانی ڕفاندم. (ڕوو ئەکاتە مێردەکەی) ئەها! لەولای دارستانەکەوەیە ڕائەکا. چاوت لێیە بوخچەی بەرگەکانی بەکۆڵەوەیە ڕائەکا؟!.

مێرد: بەڵێ چاوم لێیە. ژنەکە، سەرنج بدە. بەتەکەتەکی کلکیا وا دیارە کە مام ڕێویی لەمەڕ دایکت بێ. بیرتە داپیرە لەسەر شیر خواردنەوە، کلکی ڕێوییەکی پەڕاند و پاشان بەقیر پێوەی نوساندەوە؟... تۆ بڵێی ئەو نەبێ؟

ژن: ڕاست ئەکەی بەخوا خۆیەتی. دەک بەردت لێ بواری، ڕێوییە بۆرەی چەپەڵەی ئەگریسە!... خۆ تۆ بەڵێنت دا بەدایکم کە ئیتر بێ فەڕی ئەکەیت و وەیت بۆ کەسمان نەبێ. کوێرا دەستی کردەوە بەبەدکرداریی؟!

مێرد: خوایاربێ و تۆم بۆ خۆش بێ، مام ڕێوی لەبەدکردایی ئەخەم. وە ناشهێڵم پرزۆڵەی جلت بروا بۆتی ئەسێنمەوە. ئادەی ئەو تفەنگەم بدەرێ! هەر ئێستا دوای ئەو ڕێوییە خوێڕییە ئەکەوم. پەیمان بێ هەتا تۆڵەی تۆ و تۆڵەی گشت کەسی لێ نەکەمەوە. وازی لێ نەهێنم!...

ژن: (تفەنگەکەی ئەداتێ). ئەسپەردەی خوابی.

(مێردەکە ئەڕواتە دەرەوە. پەردە دائەدرێتەوە).

(پەردە ٥)

جێگا: شاخ و داخ و ناو دارستانە. مام ڕێوی دەستێ جلی بوکانەی لەبەرایە. لەگەڵ ڕێوییەکانی تر قسە ئەکا. لە دوورەوە گۆمێک دیارە لە بناری شاخەکەدایە شین ئەکاتەوە).

مام ڕێوی: براکان ڕۆژتان باش. بەسایەی خواوە خاسن؟ خوا ئاگادارە من بیرم ئەکردن.

ڕێوییەکان: (بەیەک دەنگ) خوا خۆشت کا مام ڕێوی. ماندوو نەبی. ئەم بەرگە جوانانەت لە کوێ بوو؟

مام ڕێوی: حەز ئەکەن هەریەکە دەستێ بەرگی واتان چنگ کەوێ؟ ڕێوییەکان: ئەی چۆن حەز ناکەین؟

مام ڕێوی: هاهاها! چاوتان لەو گۆمە شینەیە لە بناری شاخەکەدا؟

ڕێوییەکان: بەڵێ چاومان لێیە.

مام ڕێوی: دەمن ئەم بەرگە جوانانەم لەبن ئەو گۆمە دەرهێناوە. ئینجا ئەگەر ئێوەش حەز ئەکەن بەرگی واتان چنگ کەوێ، وەرن بچینە سەر ئەو گۆمە. خۆتان فڕێ دەنە ئاوەکەوە و بەرگی جوان بۆ خۆتان دەربێنن.

ڕێوییەکان: باشە بام بڕۆین. (لەگەڵ مام ڕێویدا هەموو ئەچنە سەر گۆمەکە. لەوێ یەکێ لە ڕێوییەکان خۆی فڕێ ئەداتە ناو گۆمەکەوە).

مام ڕێوی: ئافەرم ڕێوی. بەشی ئێمەش شتی جوان بێنە؟

ڕێوییەکان: مام ڕێوی. بزانین ڕێویی هاوڕێمان نەهاتە دەرەوە؟

مام ڕێوی: (بلقە بلق لە ئاوەکەوە دێت). ئەی گوێتان لێ نییە لەبن ئاوەکەوە بانگتان ئەکا؟ گوێتان لەو بلقە بلقە نییە؟ تا زووە خۆتان فڕێ دەنە ناوی. ئەو بەرگە ڕەنگاوڕەنگانە لە دەس خۆتان مەدەن!...

یەکێ لە ڕێوییەکان: ڕاست ئەکا بەخوا. وا دیارە ڕێوییەکەی هاوڕێمان بانگمان ئەکا. بام خۆمان فڕێ دەینە ناو گۆمەکەوە. بەرگی جوان دەرهێنین. (ئەویش خۆی فڕێ ئەداتە ناو ئاوەکەوە).

مام ڕێوی: ئارەزووی خۆتانە هەرچی زووتر خۆی بخاتە گۆمەکەوە شتی باشتری چنگ ئەکەوێ.

ڕێوییەکان: برا گەل دەی. (ڕێوییەکانی تریش)، یەک لە دوای یەک خۆیان فڕێ ئەدەنە ناو ئاوەکەوە).

مام ڕێوی: ئۆخەی برا ناپاکەکان. ئەوە ئێوەن بەخنکاوی ئەتان بینم چەند هەڵاتان لێ کێشام و تیزتان پێ کردم و فیزتان بەسەرا کردم؟ دەبخۆن دەی ئەوە دەردتان بێ!... (ڕێوییەکان لە پاش خنکان سەر ئاوەکە ئەکەون).

زاوای داپیرە: (بەخۆی و تفەنگەکەیەوە بەئەسپایی لە پەنا بەردێکەوە سەربەرز ئەکاتەوە. نیشان ئەگرێتە مام ڕێوی و ئەیپێکی).

ئۆخەی مام ڕێوی ناپاک. ئەویشە تۆی بەپێکراوی ئەت بینم؟ هەی سپلەی بێ ئابرو! خۆتۆ لەکن خۆت، بەڵێنت دا بەداپیرەی خەسوم کە ئیتر زیانت بۆ کەس نەبێ. چۆن دڵت بڕوایی دا، لە پاش ئەو هەموو چاکەیەی خەسوم کە لەگەڵی کردیت، بچیت بەرگی بوکێنی کچەکەی بدزی؟!.

ئەی چاکەی خۆیشت بیر ناکەوێتەوە! وەختێ کە لە هەموو کەس ئەپاڕایتەوە یارمەتیت بدا بۆ سەندنەوەی کلکەکەت لە داپیرە. کەس فریات نەکەوت من نەبێ ئەوە بوو لەسەر خەرمانەکەم گەنمم دایتێ. هەرماما بەرگی ژنەکەم بدزیت؟!

مام ڕێوی: ئەی هاوار! ئەی هاوار! کوشتمیان!...

زاوای داپیرە: (مام ڕێوی ئەگری و ڕووتی ئەکاتەوە. بەرگی ژنەکەی لەبەر دائەکەنێ و کۆی ئەکاتەوە). تۆیش بخۆ ئەوە دەردت بێ. نەت ئەزانی فروفێڵبازی و زۆرداریی بۆ کەس سەرناگرێ؟ (دەس ئەخاتە بینا قاقای. کلکی دەرئەکێشی و، ئەیبرێتە دەمی. پاشان فڕێی ئەداتە گۆمەکەوە تا ئەخنکێ). ئینجا لەبەرخۆیەوە ئەڵێ: لە عاستی ڕاستابەد هەر ئەنەوێ، خوا ڕاستە و پیاوی ڕاستی ئەوێ.

کچی داپیرە: (بەهەڵەداوان دێتە ژوورەوە). ئۆخەی مێردەکە ئەوە تۆی!

زاوای داپیرە: ئۆخەی ژنەکە ئەوە تۆی؟ ئەمگوت ناهێڵم پر زۆڵی جلت بڕوا. فەرموو ئەوە بەرگەکانت. (خۆی فڕێ ئەداتە گۆمەکەوە هەر حەوت ڕێوڕییەکەی ئەگرێ و فڕێیان ئەداتە بەردەمی ژنەکەی). فەرموو ئەویش کەولی حەوت ڕێوی لە تۆڵەی دڵ ئازاریتا! (لە ئاوەکە دێتە دەرەوە).

کچی داپیرە: (دەستی مێردەکەی ئەگوشی). سوپاس ئەکەم پورزا خوا تۆم لێ نەسێنی و هەر پایەدارت کا بۆ سەندنی تۆڵەی هەژار و لێ قەوماوان.

زاوای داپیرە: نوخشەبێ لەوانەش کە ئازاری کورد ئەدەن، خوایاربێ ئەوانیش بەو دەردە ئەبەم. پەیمانی کوردانەبێ، تا تنۆکی خوێنم لە لەشابێ بەرەنگاریی زۆرداری بکەم لە کوردستاندا. وە ئەوانەی کە زۆرداری و ناپاکی ئەکەن لەگەڵ ئەتەوە و نیشتمانما بەو دەردەی مام ڕێوییان ببەم. هەستە بام بڕۆینەوە پورزا. مژدە بەرین بۆ دایکت. بەڵام پێویستە بەدەسی بێ دیاری نەڕۆینەوە. بام لەم کەوڵانە پێنج کەوڵی پێشکەش کەین. دوانیشی بۆ خۆم و خۆت!

## گەمەی مەۆستا و شاگرد

جارێک مامۆستایەک شاگردەکانی ئەبا بۆ سەیران. لە پاش یاریکردن و نانخواردن، دێن دابنیشن چای بخۆنەوە. مامۆستا لێیان هەڵئەستێتە سەرپێ ئەڵێ: «ئەوا چا لێنراوە. هەرچی قسەیەکی وا سەیر ئەکات بمان هێنێتە پێکەنین نایەڵم چا بخواتەوە».

لەولاوە پەرویز ڕاست ئەبێتەوە ئەڵێ: جارێک منالێک بەدایکی ئەڵێ: «دایە بەخوا من لە تۆ زۆرتر حەز ئەکەم گەورە ببم. دایکی ئەڵێ بۆچی؟ ئەڵێ: ئەو حەلە تا بەیانی لە ئاهەنگ ئەبم نانووم. ئیتر تۆیش ئەوەندە سەرم ناکەیتە سەر دەم و چاوم پێ بشوی و خۆشم پێ پۆشتە کەیتەوە»!؟

لە سوچێکەوە شوغالە کەچەڵیش هەڵئەسێ. هەر لەدەم و چاوییەوە دیار ئەبێ کە ئەیان هێنێتە پێکەنین ئەڵێ: «بەخوا چی بێ لە ئێوە نهێنی.

جارێ مامۆستایەک لە شاگردێکی خۆی ئەپرسی: شەڕی گەورە، کەی پەیدا بووە؟ کێ و کێ کردویانە؟ لەسەر چی بووە؟ وە دواییەکەی بەچی گەیبوە؟ ئەویش ئەڵێ: شەڕی گەورە دوێنێ ڕووی داوە. دایکم و

باوکم کردوویانه. لەسەر ئەوە بوو دایکم پێڵاوی پاژنە ئانەیی داوا ئەکرد[1]. باوکیشم دڵی نەئەهات بۆی بکڕێ. دوایی لەیەکیان دا. باوکم سوێندی خوارد ئیتر نەی بینێتەوە. دایکیشم وتی هەتا بۆم نەکڕی نایەمەوە ماڵەوە»!.

هێشتا ئەم لە قسەی خۆی نابێتەوە گۆران هەڵئەسێ ئەڵێ: «جارێک کابرایەکی لادێیی برایەکی ئەمرێ. کە دێن بەپرسەیەوە: لە کردەوە و ڕەوشتی چاکی ئەدوێن. کابراش لەگن خۆی قسە ئەکا ئەڵێ: برا قسەی پێ ناوێ! بەخوا بۆیە مرد ساڵ دوانزەی مانگ ئەمە کاری بوو -گوایا ئەیەوێ بڵێ نوێژی ئەکرد- وەکو سنجوق ئەچەقیا، وەکو گۆچان ئەچەمیا، وەکو تولەش بۆنی وە زەوییەوە ئەکردا؟».

هەر گورنەتەلەی گوێ ڕەپ مابوو قسەی خۆی بڵێ، ئەویش دێتەوە پێشەوە ئەڵێ: «کە مام هۆمەری کوردە و ئەفغانییەکە لەسەر هەمانەبۆر شەڕیان ئەبێ و ئەبرێنە لای ناوبژی کەر (حاکم)، هەر کەسەیان هەڵئەسێ و ناوونیشانی هەمانەکەی خۆی هەڵ ئەدا. ئەفغانییەکە ئەڵێ: «تیایەتی: کاوکلتور و خەیار. ئەسکەند و تەشوی و مشار. شاخ و باخ و میرغوزار. دەریای سپی و شاری شام. سە تۆپ چۆغە و نۆ گز خام. گورز و گوپاڵی سام سام»!.

مام هۆمەریش ئەڵێ: تیایەتی: «زەویی ماچین و خەتا. ماروموور و ئەژدەها. ڕەشەبا و ئاو و دەریا. چل کۆیان و حەوت کەوا. هەندێ هەسان و شانە. مشتێ دوری یەک دانە. دۆباخ و سەرچایخانە!!». ناوبژیکەر لە داخی ئەم درۆیانە هەمانەکەیان ئەدڕێنی و ئەیانکاتە دەرەوە[2]. ئینجا کە لە قسەکانیان بوونەوە، مامۆستا ڕێی شاگردەکانی دا هەر کەسە هات چای خۆی تێ کرد و خواردیەوە.

یاریی:

## زانستی گشت لایی

ئەم یارییە لەناو کۆمەڵێک دۆست و برادەرا ئەکرێ. منداڵەکان دێن لەناو خۆیاندا شاە و گزیر هەڵئەبژێن. شاە لەو سەرەوە لەسەر شتێکی بەرز دائەنیشێ. گزیریش لەم سەرەوە بەرامبەری ڕائەوەستێ، قەمچییەکی بەدەستەوە ئەبێ، چاوەڕوانی فەرمانی[*] شاە ئەکا.

لەم لاو و لەولای شاهیشەوە دوو مامۆستا بەچۆکا دێن دائەنیشن. لەبەردەمی شاەدا دوو سندوق دائەنرێ. شاە ئەوەندەی ژمارەی سەری یاریکەران پارچە قاقەزی بچوک ئەبڕێ، لەهەر یەکەیاندا (پرسێک) و (وەڵامەکەی) ئەنووسێت. پاشان لولیان ئەدا و فڕێیان ئەداتە ناو سندوقی دەستە ڕاستەوە. ئەوەندەی تریش پارچە قاقەزی بچووکی تر ئەبڕێ و لەهەر یەکەیاندا چوار شت ئەنوسێ: «پاداشتێک. سزایەک. جەریمەیەک. دارکارییەک». ئەم قاقەزانەش لول ئەدا و فڕێیان ئەداتە سندوقەکەی ترەوە کە لە دەستە چەپییەوە دای ناوە. ئینجا یاری دەست پێ ئەکرێ. شاە، یەکە یەکە، یاریکەرەکان، بانگ ئەکا.

---

(١) پاژنەی باریک و بەرز: ئەوساکە وای پێدەوترا.

(٢) ئەمە بەشێکە لە هەقایەتی (هەزار و یەک شەوە).

(*) فەرمان: ئەمر. وەڵام: جواب. پاداش: مكافات. سزا: عقاب. جەریمە: غرامە (ش.ف)

ئەوی هات ئەبێ دەست بکا بەسندوقی دەستە ڕاست و دەستە چەپا. لەهەر یەکە قاقەزێک دەربێنێ. ئەیاندا بەشاە. ئەویش بەدەنگێکی بەرز ئەیان خوێنێتەوە. ئەگەر یاریکەرەکە توانی وەڵامی ڕاستەقینەی پرسەکە بداتەوە.

ئەوا لە قاقەزەکەی ترا چە پاداشێک نووسرابوو، شاە ئەیداتێ. خۆ ئەگەر یاریکەر نەیزانی وەڵامەکە بداتەوە، ئەوا سزا ئەدرێ. ئەگەر سزاکەی بۆ بەجێ نەهێنرا، جەریمە ئەکرێ. ئەگەر جەریمەکەشی بۆ نەدرا، بەپێی نووسینی ناو قاقەزەکە دارکاری ئەکرێ.

ئەوا لێرەدا هەندێ لەو پرس و وەڵامانە نووسراونەوە بۆ نموونەش یەکێ لەو پاداش و سزا و جەریمە و دارکارییانە پیشان ئەدەین. پاداش: سەلکی باسوق. سزا: یان زەڕین وەک کەر. یان پەنجا فلس جەریمە. یان دە دار لە بەری دەست».

شاە پاداشەکان لەبەردەستی ڕاستیا دائەنێ. جەریمەکانیش کە وەریان ئەگرێ لە ناشییەکان، ئەیان خاتە لای دەستی چەپییەوە. ئەگەر مقۆمقۆیش ڕووی دا لەسەر وەڵامەکان، لە دوو مامۆستاکەی دەستە چەپ و دەستە ڕاست ئەپرسرێ تا بەلایەکا ڕاست ئەبێتەوە. دارکاریش گزیر ئەیکا بەڵام لەسەر فەرمانی شاە.
کە یارییەکە تەواو بوو هە چ پارەیەک لە جەریمەکان کۆ ئەبێتەوە، ئەدرێ بەخواردەمەنی خۆش و دەرخواری یاریکەرکان ئەدرێ. هەندێکیشی لێ ئەدرێ بەدەس و پێوەند.

***

پرس: ئافرەت لە ڕۆژئاوادا چۆنە؟

وەڵام: ئافرەت لە ڕۆژئاوادا یەجگار سەربەستە. لە خوێندەواری کارگوزاری و نیشتمانپەروەریدا پەنجە لە پەنجەی پیاو ئەدەن. نوێنەر، سەرکردە، زانا، هونەرمەند (فنان)، نووسەر، بوێژ، دلێر، سینەماکەر، فڕۆکەوان، گەمێوان... لەناو ئافرەتی ڕۆژئاوایی دا زۆر هەڵئەکەوێ.

***

پرس: ئایا کوردیش ساڵ و مانگی هەیە؟

وەڵام: کورد هەر لەمێژە ساڵیان بەدوانزە مانگ داناوە. مانگەکانیش لەسەر هی ڕۆژئاوا ڕێکئەکەون. سەری ساڵیشیان لە یەکەم مانگی بەهارەوە (مارت) دەست پێ ئەکات. مانگەکان ئەمانەن: نەورۆز (مارت)، گوڵان (نیسان)، بەختەباران (مایس)، خەرمانان (حزیران)، میوەخۆش (تموز)، گەلاوێژ (آغستوس)، مشتاخان (ایلول)، پەڵە (تشرین آول)، گەڵاڕێزان (تشرینی ثانی)، شێن بر (کانون آول)، چلە (کانون ثانی)، ڕەشەمێ (شباط).

***

پرس: ئایا ڕۆژوو، جگە لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوایی بەکاری هیچ دێ؟

وەڵام: ڕۆژوو بەکەڵکی خۆمان زۆرتر دێ لە خوا. ڕۆژووگرتن، جگە لەوەی کە لەشمان بەهێز ئەکا و لە زۆر نەخۆشیمان ڕزگار ئەکا، فێری ڕەوشتی پیاوەتی و مەردایەتیشمان ئەکا. سەیر ئەوەیە پەزیشکەکانی

ڕۆژئاوا زۆر لە نەخۆشەکانیان بەهۆی ڕۆژوو و پارێزەوە چاک ئەکەنەوە. تەنانەت دڕندە و پەڕندەش کە نەخۆش ئەکەون بەڕۆژوو ئەبن تا چاک ئەبنەوە.

***

پرس: کورد بەچی پێش ئەکەویٚ؟

وەڵام: بەخوێندەواری و خواناسی و کۆششی مەردانە و پشت بەستن بەخوا.

***

پرس: ئایا کوردیش وەک دراوسێکانی بەشی لە پەیکەرتاشی (هیکل تاشی) و ساز و ئاواز و نووسینا هەیە؟

وەڵام: ئێستایش لە دەوروپشتی کرماشان و قەرەداغ و سورداش و پەیکولی و ڕەواندزدا گەلێ پەیکەر و نووسین و کۆشک و قەڵا و خانووی دەستکردی کۆنی کورد بەپێوە ماون. لە ساز و ئاواز (مۆسیقە)یشا کورد گەلێک پێشکەوتوون (لاووک، حەیران، قەتار، ئەڵڵاوەیسی، ڕاست، نیوەشەوی، بەری بەیان، خاوکەر...) ئاوازی جوان و ناوازەی کوردن.

نووسینیش هەر لە (١٢٠٠)ی پێش لەدایکبوونی عیسا پێغەمبەرەوە تا ئیمڕۆ و ژیر و زانایانی کورد لە هەڵبەستن و دانانی خۆشخوانی (شیعر) و چیرۆک و قسەی نەستەق و نووسراوانی زانست و هونەر (فن) دوانەکەوتوون. ئەوەندە هەیە ڕۆژگار زۆریانی لەناو بردووە.

***

پرس: کورد ئێستا چەند ملیۆنە؟ لە کویٚ و کوێدا دابەش بووە؟ حکوومەتە بەناوبانگە کۆنەکانی کورد کامانەن؟

وەڵام: کورد هەشت ملیۆنە[1]. لە خاکی ئێران و تورکیا و ڕووسیا و سوریا و عێراقدا دابەش بووە. هەندێکیشیان لەم لاو لەولای جیهاندا بڵاوبوونەتەوە. حکوومەتە کۆنە بەناوبانگەکانی کورد ئەمانەن: (میدیا، ئەردەڵان، لوڕی بچووک، زەند، بابان، سۆران، بەدرخان، ئەیوبی).

***

پرس: لە شاهە گەورەکانی جیهاندا کیٚ و کیٚ بەناوبانگن؟

وەڵام: شاهی گەورە ئەوەتا کە دادپەروەر و چاکەکەر و نیشتمانپەرست بووبیٚ و لە سنووری پیاوەتیش نەچوویتە دەرەوە. لەوانە بەناوبانگەکانیان ئەمانەن: لە عەجەما (نەوشیروان)، لە عەرەبا (عمر بن خطاب و عمر بن عبدالعزیز)، لە تورکیا (مدحت پاشا)، لە کورددا (سەلاحەدینی ئەیوبی و کەریم خانی زەند)، لە ڕووسا (پەترۆی گەورە)، لە ئینگلیزدا (کرۆمۆیل)، لە ئەمریکاییدا (ئەبراهام لینکۆلن).

***

---

(١) بەپێی بۆچوونی ئەوکاتە ١٩٤٨، ئێستا نزیکەی چل ملیۆن دەبن.

پرس: نووسەر و بوێژە بەناوبانگەکانی جیهان کێ بوون؟

وەڵام: هەندێ لە نووسەر و بوێژی هەرە بەکەڵک و هەرە بەناوبانگی جیهان ئەمانەن: لە یۆنانییەکاندا (هۆمەر و ئەفلاتۆن)، لە ئینگلیزا (شکسپیر، کارلایل، بەرنادشۆ) لە ڕووسا (تۆلستۆی)، لە عەجەما (شێخی سەعدی، عومەر خەیام) لە کورددا (بابا تاهیری هەمەدانی، ئەحمەدی خانی، حاجی قادری کۆیی)، لە عەرەبا (شێخ محەمەد عەبدە، جبران خلیل جبران، سەلامە موسا)، لە فەرەنسزا (جان جاک رۆسۆ، ڤۆلتێر، ڤیکتۆر هۆگۆ).

***

پرس: دیدەوانی (کشافە) کێ دای هێنا؟

وەڵام: سێربادین باولی ئینگلیزی دای هێنا.

***

پرس: ئەم مەتەڵانە هەڵبێنە: ئەمە چییە:

١- هەر ئەڕۆیت و نایگەیتێ؟

٢- بەسەبرا کڵاوێکیان هەیە؟

٣- ئەم لا پەرژین ئەولا پەرژین تیایەتی کۆترێکی نەخشین؟

٤- دەسی پیا ئەنێی دەم دائەچەقێنی؟

٥- قەڵای گەچین، ڕێ نییە تێی چین؟

٦- کوتکە دارێکە و ناوبژیکەری شارێکە؟

٧- هەناسە ئەدا، خاک ئەخوا، گیانلەبەر ئەخوا، دار ئەخوا، کەچی کە ناوی ئەدەیتێ ئەمری؟

٨- چل تاق، چل نیو تاق، تیایەتی چاوزاق چاوزاق؟

وەڵام: ١- سێبەرە. ٢- سێپایە. ٣- چاوە. ٤- برنگە (مەقەستە). ٥- هێلکەیە. ٦- مەنە. ٧- ئاگرە. ٨- هەنارە.

پرس: قسەخۆش و گاڵتەوگەپ کەرە بەناوبانگەکانی کورد کێن؟

وەڵام: کفر ئەحمەد، مەلا حەمدون، خلە کزی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی.

پرس: شارە بەناوبانگەکانی جیهان کامانەن؟

وەڵام: نیویۆرک، لەندەن، مۆسکۆ، پاریس، بەرلین، ڤیانا، ئەستەمول، بەغداد، تاران، سلێمانی، شام، قاهرە، کەرکووک، مەکە، قدس....

## خانەدانی نیشتمانپەروەر

کەرکووک: ۱۰/میوەخۆش/ ۱۹٦۰

براگیان شێرکۆ.

سوپاست ئەکەم بۆ خۆناسینت بەمن. خۆم بەبەختیار ئەزانم کە بەهۆی تووە برایەکی تریشم پەیدا کرد. خوا لە خۆشەویستیمان کەم نەکا. گوێگرە وا منیش دەنگوباسی کەرکووکت بۆ ئەنووسم.

لە کەرکووکدا خانەدانێکی زرنگی دەوڵەمەندی قسەخۆشی پایە بڵند هەیە. چەند ساڵێک بۆ لەدەستکەوتی هەر بیست دێیەکەی، کەمەکێک نەبێ کە بۆ ماڵ و منداڵی خۆی گل ئەدایەوە، هەرچی پێ ئەبڕا، بۆ میوانداری و هەژار و ڕێبوار و دۆست و یاری بەخت ئەکرد. هەموو دەم یاریدەی داما و لێ قەوماوی پێ ئەدا، پشتیوانیی زۆرلێکراوانی پێ ئەکرا. لەگەڵ ئەوەشا تۆزقاڵێ دیاریی لە کەس وەرنەگرت. بەڵام پێنج ساڵ لەمەوپێش کوڕێکی پێگەیشتووی، لە خاکی ڕۆژئاوادا خوێندەواری تەواو کرد و گەڕایەوە. وە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی خۆیا سەری کردە سەر باوکی، وە لە کۆڵی نەبووەوە هەتا باری بەخشین و پیاوەتی و میوانداریەکەی پێ گۆڕییە سەرپارێکی نوێتر و جوانتر و بەهێزتر و بەکەڵکتر بۆ هەمووان. ئیتر ئەمەیش لەو ساوە میوانخانەکەی داخست و بڵاوی کردەوە بەناو هەموولایەکا» کە ئیتر دەستکەوتی دێهاتەکانی بۆ دێهاتییەکانی خۆیان بەخت ئەکاتەوە».

ئیتر لەو ڕۆژەوە تا ئیمڕۆ ئەم پیاوە زرنگە بەکەڵکە، بەکۆمەکی کوڕە خوێندەوارە نیشتمانپەروەرەکە و هاوڕێ بەنرخەکانیەوە، خەریکی ڕازاندنەوە و ڕێکخستن و پێشخستنی ئەم بیست گوندە و کامەرانی و خۆشگوزەرانی دانیشتووەکانیەتی. تا ئێستا لە هەموو گوندێکا شەقامی پاک و پوختەی کردۆتەوە. لەسەر شێوەی نوێ: کانی ئاو، سەرشۆرک، میوانخانە، هۆڵی کۆبوونەوە، خوێندنگای شەو، یانە، باخچەی گشت لایی دروست کردووە و پێک هێناوە. لە هەر دێیەکا، بەمانگانەیەکی باش مەلایەکی باشی نیشتمانپەروەری دامەزراندووە، بۆ سەرپەرشتی کاروباری خواناسی و پێگەیاندنی لادێییەکان و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری لەناویاندا. ڕەنجبەر و فەرمانبەریشی داناوە بۆ پاککردنەوەی کۆڵان و شەقامەکان، لە خوڵ و شتیتر بەڕۆژ، وە ڕووناککردنەوەیان بەچراخان بەشەو. تیا ئەحەوێنەوە و ئەپارێزرێن، وە ناهێنرێنە ناو دێ وە لەبەر پاک و تەمیزی. چەرخی کشتوکاڵیشی بۆ دامەزراندن بەمز (کرێ)یەکی کەم ئەیانداتێ بۆ کێڵان و دروێنە و شتی تر.

لادێییەکان ساڵی دووجار، پاییز و بەهار، لەلایەن ئەم خانەدانە نیشتمانپەروەرەوە، بەگەورە و بچووک و ژن و پیاوەوە بانگ ئەکرێنە سەر نانخواردن ئەو ڕۆژە بەگاڵتەوگەپ و گۆرانی و هەڵپەڕکێ و بەزمورەزمەوە ڕائەبوێرن. کە سەیران تەواو بوو هەر کەسە بەپێی خۆی دیارییەکی جوانی پێشکەش ئەکرێ و بەدڵخۆشی ئەنێرێتەوە ماڵی خۆی.

جا دوێنێ بەبۆنەی ڕابواردنی پێنج ساڵەوە بەسەر ڕۆژی دامەزراندنی ئەم فەرمانە پیاوانەیەوە، لە کەرکووکدا، لەلایەن هەندێ لاوانی تێگەیشتووەوە بۆ سوپاسکردنی ئەم خانەدانە گەورەیە، زەماوەندێک

کرا. لەهەر بیست گوندەکەوە مەلا و کوێخا و شاگرد، لە کەرکووک و لەگەڵی لای تریشەوە گەلێک دەوڵەمەند و خوێندەوار و نیشتمانپەروەر بانگکرابوون. پاش ڕابواردنێکی پڕ لە ئاهەنگ و بەزموڕەزم، لەلایەن، چەند کەسێکەوە وتار خوێندرایەوە. وە بۆ دانیشتووان ڕەنج و کۆششی مەردانە و نیشتمانپەروەرانەی خاوەن دێهات کە لەو پێنج ساڵەدا دابووی لەپێناو پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی ئەو دێهاتانەدا پێشان درا. وە لەلایەن هەمووانەوە سوپاسی گەرم و گوڕ کرا. بەڕاستی جێی بەختیاری کوردە کە هەر لەوێدا گەلێک لە دەوڵەمەند و سەرۆکەکان بڕیاریان دا کە ئەوانیش وەک خاوەن دێهات - خانەدانی بەڕێز- سەر و سامانی خۆیان بەختکەن لەپێناو پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی دانیشتوانی دێهاتەکانیاندا.

برات: بەختیار

شاگردێک لە دانیشتووانی یەکێک لەو دێهاتانە

## فەرمانبەرێکی بەنرخ

قادرکەرەم: ١٥/گەلاوێژ/ ١٩٦٠

براگیان شێرکۆ.

لە گۆڤاری (کۆمەڵی دەستەبرا)دا باسی سەرکەوتنی تۆ و تێکەڵبوونت بەکۆمەڵەکەمانم خوێندەوە. خوا لێت پیرۆزکا، وە لە یارمەتیت بدا کە ببیتە نووسەرێکی باشی بەکەڵک بۆ کوردەواری. بەناوی نوخشەی نامەکاری (مراسلە)ی برایانەمانەوە ئەوا ئەم نامەیەم بۆ ناردی. لەگەڵ دانەیەک لە نووسراوی لە چاپ نەدراوی (شیرین و فەرهاد). تکا ئەکەم تۆیش بۆ چەند ڕۆژێک ئەو نووسراوی (مەم و زین)ەی خۆتم بۆ ڕەوانە بکە، لە پاش لەبەر نووسینەوەی بۆتی ڕەوانە ئەکەمەوە. دوو مانگ لەمەوپێش لەگەڵ برا و خزمەکانما لە خوێندنگاکانی کەرکووک و بەغداد گەڕاینەوە (قادرکەرەم). وامان ئەزانی کە ئەم ساڵیش وەک ساڵانیتر زۆر ناخۆش ڕائەبوێرین. بەڵام بەهۆی هونەرمەندی و نیشتمانپەروەریی گەورەی ناوچەوە، گشت کەس کەوتۆتە خۆشی و کامەرانییەوە. ناوچەش کەوتۆتە ئاوەدانییەوە. گەورەی ناوچە، فەرمانبەرێکی لاوی تێگەیشتووی پێگەیشتووی خوێندەواری نیشتمانپەروەرە. ئەمە ساڵێکە هاتۆتە ئێرە. تا ئێستا ئازاری کەسێکی نەداوە. بەپێچەوانەی فەرمابەرەکانی پێشووەوە، خەمخۆری هەموو کەسێک ئەکا. دزی و درۆزنی و بەرتیل و زۆرداری و پشێوی و ناکۆکی لەناوچەدا نەهێشتووە. لادێییەکان یەجگار خۆشیان ئەوێ، هەر کە هاتبووە ناوچەکە دەسی کرد بوو بەکۆکردنەوەی پیتاک بۆ پۆشتەکردنەوە و یاریدەدانی شاگردە هەژارەکانی خوێندنگاکانی ناوچەی (قادرکەرەم). تەنانەت لە پارەی باخەڵی خۆی کڵاو و کڵاشی بۆ گشت شاگردەکان کڕی بوو، بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە دیاریی بۆ مامۆستاکانیش ناردبوو. چەند جارێکیش گرەوی خوێندەوارانەی لەناو شاگردەکاندا دامەزراند بوو لە نووسینی چەند وتارێکدا لە بابەت بەسەرهات و ژیانی ناوچە و دانیشتووانی ناوچەکەوە، وە بەخششی بەشاگردە دەرچووەکان دابوو.

دوو مانگ لەمەوپێش کە هاتینەوە (قادرکەرەم)، سەرێکمان لێدا. میوانداریەکی پیاوانە و خۆشەویستانەی کردین. پاشان پێی گوتین: «ئەگەر بەگوێی. برای خۆتان نەکەن، مەهێڵن ئەم وەختە جوانانەتان بەفیڕۆبڕوا. وەرن منیش لەگەڵتاندام پێکەوە بام تێکۆشین بۆ پێشکەوتن و کامەرانی و خۆشگوزەرانی ناوچەکە». ئێمەیش بەڵێنمان داین. ئەمە دوو مانگە لەگەڵیا خەریکین، وە پێکەوە سە خوێندنگای شەو و باخچەیەکی گشت لایی و ڕۆژنامەیەکمان پێک هێناوە. کە باخچەکەمان تەواوکرد، لە هەموو لایەکەوە دانیشتووانی دێی قادرکەرەم و سەرکۆمارەکانی ناوچەکەمان بانگ کرد. وە لە باخچەکەدا زەماوەندێکی شۆخ و شەنگی بێ هاوتامان کرد. لەوێدا کوڕە سەرۆکەکان، لە ڕووی گیانی کوردایەتییەوە بەدەستی خۆیان جگەرە و چاوقاوە و خورشتیان ئەدا بەجووتیار و ڕەنجبەر و دوکاندارەکان. بەچەند وتارێکی نایاب و چەند ساز و ئاوازێکی خۆش و چەند هەڵپەرکێیەکی بەخۆشەوە شەوگارێکی ناوازەمان بردە سەر. ئینجا (باخچەی گشت لایی قادرکەرەم). پێشکەش بەدانیشتووانی ناوچەکە کرا. کە بەشەو و ئێواران بێن وەختی تیا ڕابوێرن. باخچەکە هەموو ڕەنگە گوڵ و سەوزە و میوەهاتێکی نایابی تیایەوە بەخۆڕایی پێشکەشی ئەوانە ئەکرێ کە دێن و تیایا دائەنیشن.

خوێندنگا شەوییەکانیشمان جگە لەوەی کە لادێییەکان فێری خوێندەواری ئەکەن و پێیان ئەگەیێنن، هەفتەی دووجاریش ئاهەنگ و زەماوەند ئەگێڕن. بەشەوچەرە خواردن و گۆرانی گوتن و وتار خوێندنەوە و یاریکردن و هەڵپەرکێ وە ڕائەبوێرن لەناو باخچەی گشت لایییەکەدا.

ڕۆژنامەکەش کە ناوی نراوە (باسەرە)، ڕۆژنامەیەکی بچکۆلانەی خنجیلانەی هەفتەییە. بەدەست ئەنووسرێتەوە، بەیەک دانەش دەرئەچێ. وە بۆ پێگەیاندنی شاگردە لادێییەکان ئەوی پێویست بێ تیا ئەنووسرێ و لەو شەوانەدا ئەخوێندرێتەوە. پاش ئەوە بۆ دوو خوێندنگاکەی تریش کە لە (قەشقە و قەلامکایل)دان ڕەوانە ئەکرێ کە لەویانەش بۆ شاگردەکان بخوێنرێتەوە. ئەوا بۆ تاسوق چەند ژمارەیەکم لەم ڕۆژنامەیە بۆ ناردیت، تکایە لە بارەی ئەوەوە چیت بەبیردادێ بۆمی بنووسە و ڕۆژنامەکانیشم بۆ بنێرەرەوە.

ئەم فەرمانبەرە بەنرخە، هەر لێرەدا ئەمەی نەکردووە. لەگەڵێ ناوچەی تریشا وەک (ئەتروش)، (چەمچەماڵ)، (خورماڵ)، چەشنی ئەم کردەوە پەسندانەی نواندووە. ئێستایش بەمە وازی نەهێناوە. بڕیاری داوە کە ئەگەر لە ناوچەکەماندا مایەوە لە گەلێ دێی ترا ئەم جۆرە خوێندنگایانە بکاتەوە. لە سەرۆکی خۆی و لە سەرۆکی فەرهەنگ (معارف)ەوە، سوپاسنامەیەکی بەنرخی بۆ هاتووە لە پاداشی ئەم کۆششە بەکەڵکانەیا دانیشتووانی ناوچەکەش بەگەورە و بچووک و دەوڵەمەند و هەژاریانەوە، لە خوا ئەپاڕێنەوە کە ئەم فەرمانبەرە نیشتمانپەروەرەیان تاسەر بۆ بهێڵێ بەڵکو لەسایە و پەنایا بحەسێینەوە.

برات: کاوە

## وەرزین(*)

تێکڕا هەموو منداڵێکی لادێیی ڕەنگ سوور و گورج و گۆڵ و وریا و توانا و چوارشانەیە. کار و فەرمانی خۆی و باوکی، لە سەرمای زستان و گەرمای هاوینا، بەئاسانییەکی تەواوەوە ڕائەپەڕێنی.

بەڵام منداڵی شاریی، بەزۆری، ڕەنگ زەرد و گێژۆوێژ و تەمەڵن، جگە لەوەی کە کاروباری خوێندنگاشیان بەجێ ناهێنن، بەتۆزە بزوتنێک بینینی کاروبارێک ماندوو ئەبن و لە پەلوپۆ ئەکەون. کەچی بێچووە لادێییەکەش ئەوەندەی منداڵی ئێمە جێگای خۆش و خواردنی ناوازە و بەرگی نایابی نییە. کە بەیانی هات ئەبێ زوو لەخەو ڕاپەڕی و بچێتە سەر جوتەکەی یاریدەی باوکی بدا. یان بچێتە شاخی دار بکات، یان سەوزە و میوەهات و دەغڵودان بەرێتە شار بیانفرۆشێ. لەگەڵ ئەوەشا نەخۆش ناکەوێ، هەموو دەم گەش و ڕووخۆشە. منداڵی ئێمەش بەتۆزە گەڕانێ ماندوو، بەتۆزە جوڵانێک پەککەوتوو، کە بایەکیشی لێ بدا دەمودەست نەخۆش ئەکەوێ. گویا ئەبێ منداڵی لادێیی بۆ چ وا و منداڵی شاریش بۆ چ وا بێ؟ لەبەر ئەوەیە کە منداڵی لادێیی: ئەجوڵێ، ئەگەڕێ، کار و فەرمان ئەکا، شاخەوانی و دارەوانی و مەلەوانی و سواریی ئەکات. خۆی بەسەرما و گەرما ڕائەهێنی. لە جێی بای پاکدا ئەژی، خۆی ئەداتە بەرخۆر. منداڵی شاریش هەر ئەوە ئەزانێ کە لە خوێندنگا هاتەوە، بخوات و بنوێ، ئەجوڵێ و بەتەمەڵی ڕابوێرێ!. لەشی پیاو پەل پەلە، ئەندام ئەندامە. هەر پەلێکی کاری پێ کرا بەهێز و گەورە، وە ئەوی گوێی نەدرا بەلاواز و بێ کەڵک ئەبێ. تەماشای قۆڵی ئاسنگەر کەن چەند ئەستوور و پتەوە!. تەماشای سنگی مەلەوان کەن چەند پانە!. تەماشای قاچی کاروانچی کەن چەند توند و بەهێزە!. ئەمانە هەمووی لەبەر ئەوەیە کە ئەجوڵێنرێن و کاریان پێ ئەکرێ. کەوابوو ئەگەر ئەم پەلانەمان یەک یەک بزواند، زۆری پێ ناچێ، هەموو لەشمان بەهێز ئەبێ. ئێمە چونکە لە شاردایین، پێمان ناکرێ ئەوی لادێیی ئەیکا بیکەین. لەبەر ئەوە ئەبێ شتێکی وا بدۆزینەوە کە هەم لە خوێندن و کار و فەرمانی خۆمان نەکا وە هەم بەهێزیشمان کا. لەبەر ئەوە وەرزین و یاریکردن لە هەموو شتێک چاکترە. لە پاش ئەمەی کە لە خوێندنگا ئەگەڕێینەوە و ماندوومان ئەحەسێتەوە، ئەشێ یاری بکەین، سۆپ تۆپینە، قەلەمی داری، بوخچە بەگەردانی؛ کەوشەک و سەباز، ڕاکردن، بازدان، یەکە و حەیزەران. چاکترین یارین کە بۆ منداڵ دەست بدەن. جگە لەمانە گەڕان لە دەشت و دەرا، گەشتوگوزار لە وەختی وچانی خوێندنگادا، شاخەوانی، دارەوانی، مەلەوانی، سواری، لە جوانترین و خۆشترین و بەکەڵکترینی بزواندنی لەشن.

بەڵام ئەگەر یاری کردن و وەرزین لە جێگایەکا نەبێ کە بای پاکی هەبێ، بەکەڵک نایەت. لەبەر ئەوە ڕۆژی گێژەلوکە و ڕەشەبا و تەپوتۆز بۆ یاریکردن دەست نادا. یاریکردنەکەش، ئەبێ، لە ئەندازەدا بێت. چونکە کە لە وزە بەدەر بوو ماندوو ئەبین تووشی نەخۆشی ئەبین.

وەکو گوتمان بزوتن لەشمان بەهێز ئەکا. نەخۆشیمان لێ دوور ئەخاتەوە. ئەوساش کەلەشێکی دروست و خۆش و توانا و وریامان بوو، مێشکێکی ڕوون و دڵێکی پاک و کەللەیەکی پڕ هۆشمان ئەبێ. لە خۆشی

(*) وەرزین: لەش بزواندن، الرياضة البدنية. (ش.ف)

بەولاوە بەدڵماندا نایەت. ئەوی ئەیخوێنین زوو بۆمان لەبەر ئەکرێ. ئەوی لەسەر شانمانە زوو جێبەجێ ئەکرێن. ئەوساکەش هەموو کەس خۆشی ئەوێین. چونکە نیشتمانپەروەریی لە لاوی تەندروست و هۆشیار نەبێ ناوەشێتەوە!...

## سەرۆکی هونەرمەند

دهۆک: ١/مشتاخان/١٩٦٠

هاورێ خۆشەویستەکەم شێرکۆ.

لەگەڵ نامەکەتا شووشەیەک ڕەنگاو و شووشەیەک ترشیات و قوتوویەک پەپکە گەزۆ و قەڵەمێکی نایابت ڕەوانە کردبوو، چونکە دەستکردی کارگەکانی خاکی سلێمانی بوون وە لە تۆوە نێررابوون چاوم پێیان ڕوون بووەوە. بەدڵ سوپاست ئەکەم. ئەوا منیش لەگەڵ ئەم نامەیەدا قوتوویەک پەنیر و قوتوویەک دۆشاو و میوە (مرەبا) و قوتوویەک زەیتونم بەدیاری بۆ ناردن هیوادارم کە بەدیاری منەوە نۆشیان بفەرموون. ئەگەر بزانن کە ئەم سە قوتووە خورشتە دەستکردی کوردی خۆمانە وە لە کارگەکانی (زاویتە) لەسەر شێوەی ڕۆژئاوایی دروست کراون، وە ئەگەر بزانن کە خاوەنی ئەم کارگانە لاوێکی چەند بەنرخ و بەکەلکە بۆ نیشتمانەکەی خۆی، وە لە چە گیانێکەوە ئەم کارگانەی پێک هێناوە، سەرت سوڕئەمێنێ، وە ئەوەندەی تر دیارییەکانت بەدڵەوە ئەنووسێ.

(جەمشید ئاغا) کە خوێندنی لە (سویچرە) تەواو کرد، لە ساڵی ١٩٥٢دا بەدڵێکی خۆش و ڕوویەکی گەش و گیانێکی نیشتمانپەروەرانەوە گەڕایەوە ناو گەل و نیشتمانە نازدارەکەی خۆی. هەر خوا خوای ئەوەی بوو بگاتەوە ئەوێ و دەمودەست دەس بکا بەپێشخستنی و ئاواکردنەوەی ناوچەی (دهۆک)وە بەتایبەتی ناوچەی هۆز (عشیرەت)ەکەی خۆیان. هەرچەندە (جەمشید ئاغا) پەروەردەی ناو هۆز و ئاغایەتی بوو، بەڵام لە ڕاستیا نیشتمانپەروەرێکی ڕاستەقینە بوو. وەک کوڕە ئاغاکانی تر نەبوو، حەز لە کەش و فش و خۆنواندن و زۆرداری لە مسکێن و ئازاردانی دراوسێ و خۆهەڵسواندن لە کاربەدەستانی حکوومەت بکا!. ئەیویست ژیانێکی سەربەستانەی پیاوانە ڕابوێرێ وە لەسایە و پەنای خۆیا هۆزەکەی و دانیشتووانی ناوچەکەی و نەتەوەکەی خۆی بحەسێنێتەوە. لەبەر ئەوە، بەسەزمانە، وای ئەزانی، هەر کە گەڕایەوە، کەسوکار و خزم و هۆز لێی کۆ ئەبنەوە و تۆڵەی دووری ئەم چەند ساڵەی بەئاهەنگ و زەماوەند بۆ ئەکەنەوە. بەڵێ. جەمشید تەماشای دڵی خۆی ئەکرد. بەبیریا نەئەهات کە ماڵە باوکێکی کپ و دڵتەنگ و کەسوکارێکی دوژمن و کردەوە ناپەسەند و هۆزێکی پچڕ پچڕی ناکۆک و پەرێشان و خاکێکی کاول و وێرانی چاو پێ ئەکەوێ!.

بەهۆی زۆروستەمی باوکی و ناشێتی براکانیەوە و بەدکرداری نۆکەرەکانیانەوە، خزمەکان لێیان تەکی بوونەوە، مسکینەکان لێیان ڕاست ببوونەوە، هیچ بەشە دەسکەوتێکیان نەئەدانێ. هۆزەکانی تریش گەلێک لە زەمینەکانیان داگیر کردبوو، هەر شەوە ناشەوێ ئەیان نارده سەریان ماڵیان ئەدانە بەرتەقەتەنگ، خەرمانیان ئەسووتاندن، ئاژاڵیان ئەدزین. کاربەدەستانی حکوومەتیش لەسەر کەتنەکانیان هەرچی ئەتک و ڕیسواییە ئەوەیان پێ ئەکردن!...

بەلام جەمشید، مەردانە هەلکەوتبوو. بڕوای بەخوا و بەچاکە هەبوو ورەی بەرنەدا. چاکی پیاوەتی لێ کرد بەلادا و هەلیکوتایە سەر باوک و براکانی. پێی گوتن: «بەو منالییەی خۆمەوە چەند جارم بەئێوەم نەگوت، خراپە خراپەی لە دوە. لە فەرمانی سەرۆکی و خانەدانی و دەولەمەندی خۆتان لامەدەن. چاوتان لە دەسی خواوەبێ. چاوتان لە ڕوتاندنەوەی مسکێن و تالانکردنی دراوسێوە نەبێ. پاشە جار پەشیمان ئەبنەوە!. چەند جارم بەئێوە گوت چاکە بکەن و بیدەن بەدەم ئاوەوە. ڕوو بکەنە خوا و دلی کەسوکار و هۆز و دراوسێکانتان ڕاگرن. بۆ پێشکەوتنی گوندەکانتان و خۆشگوزەرانی مسکینەکانتان بکۆشن. تا خواش چاوێکی لە ئێوەوە بێ و نازتان بکێشی و دەستی گەورەییتان بەسەرا بکێشی و بتانخاتە خۆشی و کامەرانییەوە!» گوتیان: «بەخوا هەر چیمان پێ بلێیت ڕاست ئەکەیت. تازە کراو لە دەس چووا».
گوتی: «نەء هێشتا لەدەست نەچووە!. ئەگەر لە کردەوەی خۆتان پەشیمان بنەوە و لەگەل منا ڕوو بکەنە خوا و داوای پیشاندانی ڕێگای ڕاستی لێ بکەن، پاشان ڕێگای خوا بگرن و کۆشش و تەقەلای مەردانە بکەن بۆ پێشکەوتنی نەتەوە و نیشتمانەکەتان... خوایش لە ئێوە خۆش ئەبێ. دەستتان ئەگری و ئەتانخاتەوە سەر دۆخی جاران لە خۆشی و کامەرانیدا». گوتیان: «پەیمان بێ لەبەر بارەگای خوادا! هەرچی باشە بۆ نەتەوە و نیشتمان ئەوە بکەین، وە هەرچی تۆیش بلێیت بەقسەت بکەین!». گوتی: «کەواتە واز لە من بهێنن. هەرچی ئەکەم بەرپەرچم مەدەنەوە، شەش مانگم لەسەر ڕاوەستن ئەگەر لە جاران باشتر خۆتان و کەسوکار و هۆز و دراوسێکانتانم نەکردەوە بەبرای گیانی بەگیانی، وە دەرامەت و خۆشگوزەرانی هەموو لایەکیشتانم لە جاران چاکتر نەکردەوە. هەرچیم پێ ئەکەن پێم بکەن دەستان خۆش بێ!...» گوتیان: «باشە پێڕەویت ئەکەین!...».

جەمشید ئاغا، دەمودەست چوار پێنج ڕیش سپی جوامێری زرنگی ناو هۆزەکەی نوساند بەخۆیەوە. بەڕاوێژ و ئامۆژگاری و یارمەتیی ئەوان یەکە یەکە چووە مالی هەموو دوژمنەکانی باوکی. وە بەگفتوگۆی شیرین و کردەوەی ڕەندینی خۆی دلی هەموویانی دایەوە و لەگەل باوکیا ئاشتی کردنەوە. کەسوکار و مسکینەکانیشی هەریەکە بەجۆرێ دلنەوایی کرد و دووبارە نوساندنیەوە بەخۆی و مالی باوکیەوە کاربەدەستانی حکوومەت مایەوە. ئەوانیشی هێمن کردەوە و دلنیای کردن کە بەبێ فەرمانی ئەوان هیچ جوولەیەک ناکرێ.

زۆری پێ نەچوو، خۆشەویستی و ئاسایش و یارمەتی و هاتوچۆ کەوتەوە ناو هۆزەکە و دراوسێکان و مال باوکی. هەرچی زیانی پێگەیشتبوو لە ڕووی بەدکرداریی باوک و براکانی و نۆکەرەکانیانەوە، تۆلەی بۆ کرایەوە و پاداش درایەوە. هەر زیانێکیش بەمالی باوکی گیرایەوە. هۆز کەوتەوە گەڕ. کار و فەرمان و ژینی ڕاستەقینە لە هەموو لایەکیەوە سەرەتای دەرکەوتەوە. چەند مانگێکی پێ نەچوو ئاوەدانی و خۆشگوزەرانی لە ناوچەکەدا پەیدا بووە. هەر لەو سالەدا، جەمشید ئاغا، مسکینەکانی مالی باوکی، تا سەر، لە باجی: «مەڕانە و سۆرانە و دارانە...» و «جەریمەکردن» و «دارکاری کردن» و «ئەتککردن» و «بێگاریی کردن»... ڕزگار کردا؟... چوار ڕیش سپی تێگەیشتووی کارگوزاریشی لەناو خۆیاندا پێ هەلبژاردن بۆ ناوبڕی کردن و پێکخستنەوە و ئاشتکردنەوە و کاروباری هەلسوڕاندنیان.

بەپارەی خۆی ڕێگای ناو دێهاتەکانی بۆ تەختکردن. مزگەوت، یانە، ئاوی خواردنەوە، سەرشۆرک، خوێندنگای شەوی، چشتیری گشت لایی (استطبل عمومی)ی بۆ دامەزراندن و دروستکردن و بەرهەمهێنان. بۆ پاککردنەوەی شەقامەکانی ناو دێهاتەکان و ڕۆشنکردنەوەیان بەچرا فەرمانبەری تایبەتی دامەزراند. بۆی بڕینەوە؛ هەر ساڵەی دوو جار، بەرگ و پۆشەنی بەهەژارەکان بدات و دیاریش بۆ دەوڵەمەندەکان بنێری.

لە هەمووی ناوازە و نایابتر، دامەزراندنی ئەو سە کارگەیە بۆ لە دێی (زاویتە)دا، کە لە خاکی ڕۆژاوا چەرخی بۆ کێشکردن، بۆ دروستکردنی قوتووە (پەنیر) و (دۆشاو) و (زەیتون) و (میوە). ئەم کارگانە جگە لەوەی کە فەرمانیان بۆ هەزاران لە هۆزەکە دۆزییەوە، وە ڕێگای دەرامەد و خۆش گوزەرانییان بۆ کردنەوە، دیسانەوە بوون بەهۆی گیرانەوەی هۆزەکە لە دزی و درۆزنی و پیاوخراپی و، بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و ژیانێکی پڕ خۆشی و گوشایش و دۆستایەتی لەناویاندا.

جەمشید ئاغا، جگە لە مانگانەی باش لە دەسکەوتی کارگەکانیشی چواریەکێکی ئەبەشێتەوە بەسەر کرێکار و فەرمانبەرەکانیا. لەسەر شێوەی نوێ خانووی بۆ هەموویان دروست کردووە، بەمز (کرێ)یێکی کەم ئەیان داتێ. بەشەو پێیان ئەخوێنی. هەر مانگێ جارێک ئاهەنگیان بۆ ئەگێڕێ. هەفتەی جارێکیش پزیشکیان ئەهێنیتە سەر، وە لەسەر پارەی خۆی چاکیان ئەکاتەوە. لە کەرەسە و کەلوپەل و خواردەمەنی و بەرگ و پۆشەنی، هەرچی پێویست بێ بەهۆزەکەی دوکانی بۆ داناوە کە هەرزانتر لە شار پێیان بفرۆشێ. جگە لەمانە هاوینەهەوار (مصیف)ێکی نایابیشی لە ناویدا دامەزراندووە. خانوو، دوکان، میوانخانە (اوتیل)، سینەما... بەکورتی هەرچی پێویست بێ بۆ ڕابواردنێکی زۆرنایابی ڕێبواران و گەشتوگوزارکەران دروستی کردووە و پێکی هێناوە. دووبارە بەسایەی ئەم هاوینەهەوارەشەوە سەرچاوەیەکی تری پێشکەوتن و دەرامەت و خۆشگوزەرانی و کامەرانی بۆ دانیشتووانی ناوچەی دهۆک وە بەتایبەتی بۆ هۆزەکەی خۆی دۆزیوەتەوە.

جەمشید ئاغا، لەم ڕۆژانەدا بۆ هەموو شاگردانی خوێندنگاکانی ناوچەی دهۆک دیاری ناردبوو. هەریەکەیان دوو قوتوو (پەنیر) و دوو قوتوو (دۆشاو و میوە) و دوو قوتوو (زەیتون)ی بەرکەوتبوو. ئەوا منیش لە بەشەکەی خۆم نیوەیم بۆ تۆ نارد. تکایە گەیشتنی بنووسەوە ئەم باسەش بەناو کوردەکانی لای خۆتاندا بڵاو بکەرەوە. بەڵکو ئەوەندەیتر کۆششی مەردانە بۆ خاکەکەی خۆیان بکەن.

لە پاداشی ئەم کۆششە نیشتمانپەروەرانەی جەمشید ئاغادا، ئیمڕۆ لە خوێندنگای ئێمەدا ئاهەنگێکی گەورە کرا. جەمشید ئاغا و گەلێک لە سەرکۆمار و خوێندەوار و دەوڵەمەندەکانی ئاکرێ و ئامێدی و زاخۆ و سنجار و ڕەواندز و هەولێر بانگ کرابوون. لەهەموو لایەکەوە ستایش و سوپاسی جەمشید ئاغا کرا. خوێندنگا بڕیاری دا کە لەسەر پارەی خۆی و شاگردان (نووسراو)ێک لە بابەت ژینی تایبەتی و ژینی گشت لایی جەمشید ئاغاوە بنووسی، وە کردەوە و کۆششە نیشتمانپەروەرانەکانی بەنەخش و نیگارەوە پیشانی هەموو کوردەواری بدات و بڵاوی کاتەوە. هەر وەختێ ئەو نووسراوە لە چاپ درا، دانەیەکت پێشکەش ئەکەم.

برات: جوامێر

## دەوڵەمەندی پەسەند

سلێمانی: ١٥/مشتاخان/١٩٦٠

برا دڵسۆزەکەم جوامێر:

گەلێک دڵخۆش بووم بەنامە و دیارییەکانت. خوا (جەمشید ئاغا)تان بۆ بهێڵێ و هاوتای زۆر کات. بەڕاستی سوپاستان ئەکەم کە ئاوا ئاگادارتان کردم لە بەسەرهات و کۆششی مەردانەی ئەو لاوە بەنرخە. دەنگوباسی سلێمانی ئەپرسی: دوێنێ لە ئاهەنگێکی شۆخ و شەنگی یەجگار نایابدا بووم کە بۆ سوپاس و نەوازش کردنی (شاهۆ بەگ) کرابوو، لەلایەن کۆمەڵی مامۆستا و شاگردەوە. لە چەقی ڕێگاکانی ناو شاردا، پایەیەک لەسەر سەکۆیەکی خنجیلانە لەناو باخچەیەکی جوانکیلانەدا دروست کراوە، لەهەر چوار ڕوویا وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگی شۆخ و شەنگ لەبەردی مەرمەڕ هەڵکەندراوە کە کارگوزاری و نیشتمانپەروەری (شاهۆ بەگ) و سوپاسگوزاری (خوێندەوارانی کورد) ئەنوێنێ بۆ ئەو بانگکراوان، لە ژن و پیاو لە گەورە و بچووک، لە دەوڵەمەند و هەژار، بەهەر چوارلای ئەو پەیکەرەدا دانیشتوون. خۆشەویستی و نەوازشی نەتەوە گەیشتبووە ئەندازەیەک بۆ (شاهۆ بەگ)، کە هەر لە دەرکەوتنیەوە -لە ئۆتۆمبیلەکەیا- تا گەیشتنی بەجێ ئاهەنگەکە، گوڵباران کرا و شادمانی بۆ نوێنرا. ئەو پەیکەرە، لەلایەن مامۆستایانی کوردەوە دروست کرابوو. زەماوەندەکەش، هەر بەسەرپەرشتی ئەوانەوە پێک هێنرابوو. ئاخۆ ئەزانی (شاهۆ بەگ) کێیە؟ و چی کردووە؟ و چۆن بووە بەم پیاوە؟ و کەی گەیشتۆتە ئەم پایەیە؟... گوێ گرە بام پێت بڵێم:

(شاهۆ بەگ)یش وەک گەلێک لە کوردە کارگوزارە زرنگ و بەکارەکان حەز لە دەسەڵات و گەورەیی و دەوڵەمەندی ئەکرد. بەڵام خراپ بۆی ئەچوو. وە گەلێک جار هەڵەی ئەکرد. و ئەکەوتە بەر شەقی ئارەزووانی لەشی!... لەبەر ئەوە خۆی تووشی گەلێک تەنگ و چەڵەمە ئەکردا. لە چەند کەسێکی ناو شار دڵی شکا. جیهانی لە خۆی هێنایەوە یەکا. خەڵکی شارەکەی بەدناو کرد و خۆی بۆ خاکی بێگانان ئاوارە کردا. لەوێدا شانی کوتا و ڕەنجی دا. تا بووە یەکەم دەوڵەمەندی ئەو ناوە!. ئینجا خووی دایە فەرمانبەرانی حکوومەت تا خۆی گەیاندە پایەیەکی هەرە بڵند لە حکوومەتا!... بەوەش تێری نەخوارد. خووی دایە فەرمانی زلەزلەی بازرگانی تا لەوەشا گەیشتە ئەوپەڕی سەرکەوتوویی!. هێشتا ئەمەش دڵی دانەمرکاند. دەسی دایە فرۆفێڵبازی بۆ ناوبانگ و گەورەیی و سەرمایە پێکەوەنان!... ئینجا ڕووی کردە قومار و سەرخۆشی و داوێنپیسی. هەرچی خوا حەزی پێ نەکات و دڵ بیەوێ کردی!. شاران و خاکان نەما سەریان پیا نەکا. تا دوایی لە شارێک لە شارەکانی کوردستانی تورکیادا گیرسایەوە!. لە خۆش ڕابواردن و بەزمورەزما هەوای باڵی خۆی نەئەدا. خۆی لەپەلوپۆ خستبوو لەگەڵ ئەوەشا دڵی نەئەسرەوت، کامەرانی دەس نەئەکەوت. دوایی لە گلاراوی خۆیا نەخۆش کەوت. وە بەجۆرێکی وا شپرزە بوو، ئەتگوت، شاهۆ، ها ئێستا بمرێ ها تاوێکی تر!... لەودەمەدا، کە شاهۆ بەگ بەدەم تایەکەیەوە وڕێنەی ئەکرد و بیری لە ڕازی ئەوە ئەکردەوە کە لەسەر ئەو هەموو ڕەنج و تەقەلایە و بەزمورەزم و سەر و سامان و ناوبانگەدا... بۆ چ تاوێک گیانی ناسرەوێ؟ و لە چەند و چۆن ڕزگاری نابێ؟ بۆ چ قەت شەوێ

بەناسوودەیی و بێ خەمییەوە سەر نانێتە سەر سەرین؟!... لەو دەمەدا کە شاهۆ بیری لەو کلۆڵییەی خۆی نەکردەوە... چەند بومەلەرزەیەکی توند و سامناک پەیدا بوو، شارەکەی هێنایە لەرزە و چەندییەکی گەورەشی لە نزیک شارەکەوە سەرەونگون کردا... بەسەدان ژن و پیاو و منال، بریندار بوون و لەناوچوون و بوون بەژێر خۆڵەوە!. بەهەزار خێزانی کوردی بەسەزمان ئاوارە و شپرزە بوون و روویان کردە ناو شار. پەنایان بردە بەر گەورە و کاربەدەستان!... قاووقیژ و دەنگە دەنگ و ئاخ و ئۆف و هاوار و فریادی ئەو کەساس و لێ قەوماوانەش، ئەوەندەیتر سرەوتی لە شاهۆ بەگ تێکدا و دەردەکەی لێ گران کردا... شاهۆ کە سەیری شپرزەیی و بێچارەیی ئەو کلۆلانەی ئەکرد، سەرگەردانی خۆی ئەکەوتەوە بیر، لە داخا دایە پرمەی گریان، نەنوست و فرمێسکی خوێنینی نەوەستایەوە تا بەیان!... یەکێک لەو کلۆلانە مامۆستایەک بوو، لە هەموو سەرمایەی جیهاندا، ژنێکی نازەنین و خانوویەکی خنجیلانەی بووبوو. ئەوانیشی لەو بومەلەرزەیەدا لە دەس چووبوو!... چووبوو بەهاواری چەند شاگردێکەوە، یارمەتییان بدا و لەژێر دار و پەردەی خانوو دەریان بێنی. بەلام، بەسەزمانە، تا رزگاری کردبوون و هاتبووە مالەوە، وچانێ بدا (خانوو خۆشەویستەکەی) و (خانمە نازەنینەکەی)، لەژێر چەپۆکی بومەلەرزەدا، لە دەس چووبوون و سەرەونگون بووبوون! شاهۆ، بەو هەموو خۆپەرستی و دلرەقییەی خۆیەوە، ئەمەندە بەزەیی بەو مامۆستا لێ قەوماوەدا، هاتەوە، خۆی لە بیرچووەوە و مامۆستای هێنایە ژوورەکەیەوە. هەردووکیان کلۆلی خۆیان بۆ یەک ئەگێرایەوە و بەسەریەکا ئەگریان تا بەیان!... شاهۆ، دلی بۆ یەکێ سووتابێ و مەبەسی پێی نەبووبێ!؟... بەلێنی دایە کە هەرچییەکی لە دەس چووە بۆی بژمێری. لەگەل خۆیا بیباتەوە بۆ (سلێمانی). لەوێ خانوویەکی نایابی پێشکەش کا و ژنێکی بەدلی خۆی بۆ بێنی و بەفەرمانێکی باشەوە دایمەزرێنی. کابرای مامۆستای بەسەزمان، شاهۆ بەگ، لەچاو ئێش و ئازاری لەش و زامی دەروونیا، ئەو رۆژەی بەکامەرانییەکی بێ ئەندازەوە رابوارد. ئیتر لەو رۆژەوە نەخۆشییەکەی رووی کردە چاکبوونەوە. وە بەرەبەرە. لە بەختیاری راستەقینە نزیک بووەوە. شاهۆ، ئەمە یەکەم جار بوو، لە ژیانیا، کە هەستی بەخۆشی و بەختیاری راستەقینە کردبوو. شاهۆ تێگەیی کە رازی بێ ئارامی و گلاراوی تا ئەوسای هەر ئەوە بووە کە لە خۆی بەولاوە کەسی تری نەویستووە. تێگەیی کە خۆپەرستی بوو بۆ رێگای بەختیاری لێ بردبووە بەست، وە بارستاییەکی گەورەی خستبووە ناوەند خوا و خۆیەوە. وە خوای لێ شاردبووەوە!؟. تێگەیی کە تا ئەوسا فەرمانی خوایی و جیهانی و نیشتمانی خۆی بەجێ هێناوە، بۆیەکا دلی بەهیچ نەکرایەوە!؟. تێگەیی کە تا ئەوسا پیاوەتی نەزانیوە و پیاوەتی نەنواندووە، هەر پولپەرستی و خۆپەرستی کردووە، بۆیەکا خەفەت و سزا و ئەرک و ئازار سەری لێ شێواندووە!؟

بەلێ. شاهۆ، رازی راستەقینەی بەختیاری تێگەیشت. لە رازی ژیان گەیشت. خوای ناسی و لێی نزیک بووەوە. وە بەلێنی دا بەخوا! کە تا ئەمێنێ یارمەتی کلۆل و بێچاران و داماوان بدا. وە ئەوەندەی ماوە لە جیهاندا، تەمەنی خۆی لە پێناو پێشخستن و سەربەرزیی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیا بەخت کا!.

شاهۆ بەگ، بۆ یەکەم جار، هەستی بەپیاوەتی کرد. هەستی بەهێز و گوڕ و سەربەرزی و مەردایەتی

کرد. پەردەیەکی ڕەشی بەسەر ژینی خۆپەرستانەی ناپەسەندی پێشووی خۆیا دادایەوە. ڕووی کردە خوا و ڕێی چاکەی گرتەبەر. وە لەگەڵ مامۆستاکەدا، بەبێ وەستان ڕووی کردەوە جێی فەرمانەکەی خۆی. بەزوویەکی زوو، هەرچی سامان و کەلوپەلێکی هەبوو لەوێ کۆی کردەوە و ڕووە و نیشتمانە نازدارەکەی خۆی گەڕایەوە!...

کە گەیشتە ئەوێ دەمودەست بڵاوی کردەوە کە بڕیاری داوە ۲۰،۰۰۰ دینار بەخت کا بۆ دروستکردنی خانوو بۆ مامۆستاکانی خوێندنگاکان لە هەموو ناوچەکانی خاکی سلێمانیدا. بڕیاری دا بەو پارەیە سەد خانوو دروست کا. (۳۰) خانووی لە شاری سلێمانیدا، لە هەڵەبجە و قەڵادزە و چوارتادا. هەریەکە (۱۰) خانوو، لە هەردە ناوچەکانی تریشا هەریەکە (٤) خانووی لە ماوەی یەک ساڵدا دروست کرد و بەمز (کرێ)ێکی کەم دابەشی کردن بەسەر مامۆستاکانی خوێندنگاکاندا. وە بڕیاری دا کە دەستکەوتی مزی ئەو خانووانە بەرەو ڕووی شاگردە هەژارەکانی ئەو خوێندنگایانە بکرێتەوە کە لەو ناوچانەدان، جگە لەوە بڕیارێکی تریشی دا کە لەوە دواش هەر ساڵێ (۲۰) خانووی تر لەو شوێنانەدا دروست بکات تا هەموو مامۆستاکان ئەخاتە حەسانەوە. ئەم کردەوە ڕەنگینە مەردانەیە، شەش ساڵی بەسەرا ڕۆیشتووە. وە ئێستا لە سایەی شاهۆ بەگەوە خاکی سلێمانی کەوتۆتە حەسانەوە و شادمانی و خۆشگوزەرانییەوە، تایبەتی خوێندەواریش بەئەندازەیەکی یەجگار گەورە و پەسەند بڵاوبووەتەوە لەناویاندا.

جا شاهۆ بەگ ئەم فەرمانە گەورە بەنرخەی، خستبووە ژێر سەرپەرشتی ئەو مامۆستا ئاوارەیەوە کە لەگەڵ خۆی لە کوردستانی تورکیاوە هێنابوویەوە. لە ڕاستیا ئەم مامۆستا بەنرخەش هونەرمەندی و کارگوزارییەکی بێ هاوتای نواند لە پێکهێنان و تەواوکردنی ئەو خانووانەدا. ئێستەش چاودێری ئەو خانووانە و دابەشکردنی دەستکەوتی مزەکانیان بەسەر شاگردە هەژارەکاندا بەسەرپەرشتی ئەوەوە ئەکرێ شاهۆ بەگیش پیاوانە لەگەڵیا هاتە پێشەوە. بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر ژنێکی جوانی بەدڵی خۆی بۆ هێنا. خانوویێکی نایابی پێشکەش کرد. وە موچە و کار و فەرمانێکی وەها باش و نایابیشی بۆ دۆزیەوە.

جا ئەم ئاهەنگەی دوێنی بۆ ئەم پیاوە گەورە نیشتمانپەروەرە کرابوو، کە تا ئێستا لە هەموو کوردستاندا هونەرمەندێکی وەها هەڵنەکەوتووتەوە.

برات: شێرکۆ

# خودای هەژاران

ئەم نووسراوە

ئەم دە چیرۆکەی پێشکەشی منداڵە خۆشەویستەکانی دەکەم، هەندێکیشیان لەسەر بنچینەی چیرۆکە نەتەوەییەکانمان دامەزراون، هەندێکیشیان لەسەر کارەسات و رووداوی ژیانی کوردەواریان. بەڵام بەهەموویان یەک ئامانجیان هەیە، ئەویش پەروەردەکردنی (منداڵانی کورد)ە بەگیانی (خوداپەرستی)یەوە، نەک (خۆپەرستی). لە راستیدا (خوداپەرستی) و (خۆپەرستی) تەواو پێچەوانەی یەکترن. لە (خوداپەرستی)یەوە؛ نیشتمانپەروەری و، گەلپەروەری و، مرۆڤدۆستی و، هەموو چاکەخوازییەک و، هەموو کردەوەیەکی پاک و پیرۆز و، هەموو رەوشتێکی جوان و رەنگین دەوەشێتەوە، لەگەڵ ژیانی (دادپەروەری)دا.

لە (خۆپەرستی)یەوە هەموو کردەوەیەکی گەنگ و ناپەسەند دەوەشێتەوە، لەگەڵ گیانی (زۆرداری)دا.

(خوداپەرستی) بۆ پێشکەوتنمان دەبات.

(خۆپەرستی) بۆ پاشکەوتنمان دەبات.

(خوداپەرستی) سەربەرز و کامەرانمان دەکات.

(خۆپەرستی) سەرشۆر و سەرگەردانمان دەکات.

لەبەر ئەوە تکا لە باوک و دایک و مامۆستا بەرێزەکان دەکەم چەندیان لە دەست دێت؛ واتای چیرۆکەکان و مەبەسی چیرۆکەکان بۆ منداڵەکانیان رۆشن بکەنەوە و، وێنەیان لەسەر (داگیرکەری) و (کۆنەپەرستی) و (هاوبەشی) و (پێشکەوتنخوازی) و (مرۆڤدۆستی) بۆ بهێننەوە، تا منداڵەکانمان هەر لە ئێستاوە دۆست و دوژمنی نەتەوەکەی خۆیان بناسن و فەرمانی سەرشانی خۆیان بەرامبەر هەر یەکەیان بزانن و، جێبەجێی بکەن.

هەروەها بایەخیش بدەن بەوەی (گیانی خۆپەرستی) لە دڵ و دەروون و مێشکی منداڵەکانمان لە رەگ و ریشەوە بهێننە دەرەوە. چونکە لە راستیدا دوژمنی راستەقینەی نەتەوەکەمان لەناو دڵ و دەروون و مێشکی خۆماندایە. ئەگەر بمانتوانیایە بەتەواوەتی هۆگری (خوداپەرستی) ببین و، خۆیشمان لە (خۆپەرستی) دوور بخەینەوە، هەتا سەر، بەئازادی و سەربەرزی و خۆشگوزەرانی و کامەرانییەوە دەژیاین. نە جەنگمان دەدی و، نە سەرشۆری. نە سەرگەردانیمان تووش دەبوو و، نە ماڵوێرانی.

لە چیرۆکەکاندا جێی؛ ئافرەتان، جووتیاران، کرێکاران، لاوان، گەورەپیاوان، مرۆڤدۆستان، زانا و تێگەیشتووان، هەژاران و داماوان و لێ قەوماوان، نیشتمانپەروەران، خەباتکاران، بەئاشکرا دیارە و پەنجەی بۆ کێشراوە.

هەروەها جێگای زۆرداران و دوژمنانی نەتەویش پەنجەی بۆ کێشراوە. منداڵانیش جێگای بەزەیی هاتنەوە و، خۆشەویستی و بەتەنگەوە بوونن.

زۆر بایەخم دا بەوەی، لەسەر شێوەی منداڵان خۆیان، قسەکان، لە زۆربەی چیرۆکەکاندا دووبارە بکەمەوە. بەزمانێکی کوردیی پەتیی سووک و ئاسان و پاراویش چیرۆکەکانیان بۆ بگێڕمەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا تکا لە مامۆستا و دایک و باوکەکان دەکەم؛ ئەگەر هەندێک وشە و واژەی تازە بابەتیان هاتە بەردەم، بۆ منداڵەکانی ڕۆشن بکەنەوە. وا بۆ ئەم مەبەستەش فەرهەنگۆکێکم پێشکەش کردوون.

نیتر ئەمەندە و ئەگەر چیرۆکەکانم دڵی منداڵە خۆشەویستەکانمان خۆش بکەن و بەکەڵکیان بێن، خۆم زۆر بەبەختیار دەزانم.

هەولێر
١٩٧٨/٨/٢٥

## خودای هەژاران

(١)

### کچێکی هەژار

(ڤیان) لە خێزانێکی هەژار لە دایکبوو بوو. باوکی ئاشەوان بوو. دایکیشی کەیبانووی ماڵ بوو. چوار منداڵی بەخێو دەکرد و، یارمەتی مێردەکەیشی دەدا لە فەرمانەکەیدا. (ڤیان) منداڵی سێهەمیان بوو. کە باوکی مرد تەمەنی سێ ساڵان بوو. دایکی ڤیان لە کوردەکانی کوردستانی ئێران بوو. باوکی ڤیان لە کوردەکانی کوردستانی عێراق بوو. ڤیان خۆیشی نە کچێکی جوان بوو. نە کچێکی ناشیرین بوو. بەڵام ئێسک سووک و قسە خۆش بوو. زیرەک و نەرم و نیان و دەم بەپێکەنین بوو. لەبەر ئەوە ئەندامانی خێزان، هەموو، خۆشیان دەویست. هەموو دەم دەیاندواند. هەموو جار گاڵتە و قسەی نستەقیان لەگەڵدا دەکرد.

(٢)

### خێزانێکی پەرێشان

کە باوکی (ڤیان) مرد، هیچ سامانێکی ئەوتۆی لەپاش بەجێ نەما، کە خێزانەکەی بتوانێت تا سەر خۆی پێ بژیێنێت. منداڵەکانی هەموو ورد بوون؛ فەرمانیان پێ نەدەکرا، تا نانی خێزانەکەی پێ پەیدا بکەن. دایکەکەیشی لەبەر جوانی و ئابڕووی خۆی نەیدەتوانی خۆی بکات بەدەس و پێوەندی ماڵە دەوڵەمەندەکان، تا نانێک بۆ خۆی و منداڵەکانی پەیدا بکات. لەبەر ناشێتی و نەخوێندەواریشی فەرمانی گشتی دەست نەدەکەوت. لەبەر ئەوە خێزانەکە کەوتبووە سەرگەردانییەکی تەواوەوە. لە پەرێشانیدا دەژیا. دامابوو نەیدەزانی؛ چی بکات؟!... ئەندامانی خێزانی بەسەزمان هەر ئەوەندەیان بۆ مابووەوە لە (خودا) بپاڕێنەوە؛ ڕێگای ژینێکی سەربەرزانەیان پێشان بدات.

(٣)

### خودا دەکەوێتە فریایان

ئاشەکە هی پیاوێکی تر بوو. هی باوکی ڤیان نەبوو. ئەم پیاوە کە دایکی ڤیانی دی، وای بەسەر

هاتووه، ترسا لەوەی ئاشەکەی پەکی بکەوێت. ویستی لە ئاشەکەدا بیهێڵێتەوە تا وەک جاران کاری پێ بکات. بێجگە لەوە دایکی ڤیان جوان و هەرزەکار بوو. حەزی لێ کرد.

کە ناردی بۆی بخوازن، بیکات بەژنی خۆی، دایکی ڤیان کەوتە بیرکردنەوە. کە لێکی دایەوە؛ بۆ پاراستنی ژیانی منداڵەکانی خۆی و ئابڕووی خۆی ئەمە چاکتر بوو کە شووی پێ بکات. لەگەڵیدا ڕێککەوت. ئەویش مارەی کرد. بەم ڕەنگە (خودای هەژاران) دایکی ڤیان و منداڵەکانی لە برسێتی و نەبوونی و ئابڕووچوون ڕزگار کرد. لەبەر ئەوە دایکی ڤیان و منداڵەکانی پڕ بەدڵ سوپاسی (خودای هەژاران)یان کرد، کە ئەو خاوەن ئاشەی بۆ ڕەخساندن، لەسەر دەستی ئەویشدا ڕزگاری کردن.

(٤)

باوە پیارەکەی ڤیان خراپ دەرچوو

کابرای خاوەن ئیش تا ماوەیەک لەگەڵ خێزانی تازەیدا باش بوو. بەڵام چونکە خێزانێکی تریشی هەبوو. زۆری پێ نەچوو، دەستی کرد بەتەنگەتاوکردنی منداڵە بێ باوکەکان. جارێک لێیان توورە دەبوو. جارێک لێی دەدان. جارێک دەری دەکردن. فەرمانی باوە پیارەیی خۆی لەگەڵ بەجێ نەدەهێنان. منداڵەکان لە کردەوەی باوە پیارەکەیان تەواو وەڕس بووبوون. خەفەتیان لێ دەخوارد. کە لەگەڵ دایکیاندا، بەتەنیا، دەمانەوە، دەکڕووزانەوە دەگریان. دایکەکەیشیان لەم بارە تەواو خەمبار بووبوو... نەیدەزانی چی بکات؟ ئەگەر لای دادگاه سکاڵای لە دەست مێردەکەی دەکرد و خۆی پێ بەرەڵڵا دەکرد. دەترسا لەوە خۆی و منداڵەکانی دووبارە تووشی سەرگەردانی و دەردەسەری بێنەوە. ئەگەر لەگەڵ مێردەکەیشیدا دەمایەوە بەزەیی بەمنداڵەکانیدا دەهاتەوە، ئەو بارە ناخۆش و ناهەموارەی پێ هەڵ نەدەگیرا. لەبەر ئەوە هیچ جێگایەک نەمابوو پەنای بەرێتە بەر (خودا) نەبێت.

(٥)

خودا فریای خێزانەکە دەکەوێتەوە

دایکی (ڤیان) ئەم جارەیش لە خودا پاڕایەوە فریایان بکەوێتەوە زۆری پێ نەچوو خودای گەورە بەهاوارییانەوە هاتەوە. خودا دوو خێزانی خوداناسی دڵ چاکی بۆ ڕەخساندن. خێزانێکیان کوڕەکە و دوو کچەکەی بردە لای خۆی، بەخێویان بکات و فەرمانیان پێ بکات. خێزانێکیشیان (ڤیان)ی بردە لای خۆی لە ڕێی خودادا پێی بگەیێنێت، پەروەردەی بکات بۆ ئەمەی ببێتە ئەندامێکی بەکەڵک بۆ نیشتمانەکەی خۆی. ئەودەمە (ڤیان) تازە تەمەنی گەیشتبووە چوار ساڵان.

(٦)

ڤیان دەنێرنە بەر خوێندن

(ڤیان)ی بەسەرزمان تا چەند ڕۆژێک لە ماڵەکەدا خۆی بێچارە و ئاوارە دەهاتە پێش چاو. دەگریا بۆ دایکی. دەیگوت؛ «دایکم دەوێت... بمبەنەوە لای دایکم... دەچمەوە لای دایکم... دایکم دەوێت... دایکم...» بەڵام کە دی کەیبانووی ماڵەکە، دایکانە لەگەڵیدا دەجووڵایەوە؛ سەر و لەشی شووشت و،

جلوبەرگی تازەی لەبەرکرد و، خواردنی خۆشی دایە و، ڕۆژانەی بۆ بڕییەوە، بەرە بەرە خەمی دڵی سارێژ بوو و، ڕاهات بەژیانی تازەیەوە. نیـتـر ئەویش بەدەم خـۆی و مێـردەکـەیەوە پێ دەکـەنی و، وەک دایک و باوکی خۆی دادەنان. زۆری پێ نەچوو دڵی نووساند بەدڵـیانەوە و قـسـەی خۆشی بۆ دەکردن و، دەیهـێنانە پێکەنین. لە ڕاستـیدا دایک و باوکە تازەکەی (ڤیان) باش دەرچوون. هەر ئەو ساڵە ناردیانە بەرخوێندن و خستیانە (باخچەی ساوایان)ەوە.

## (٧)

### ڤیان گەشە دەکات و پێ دەگات

ڤیان لەپاش ساڵێک تەواو گەشەی کرد و پێگەیشت. لە باخچەی ساوایان و خوێندنگای سەرەتایی و خوێندنگای ناوەندی و ئامـادەیی دەرچوو. خۆشی چونکە کـچـێکی نەرم و نیـان و ڕووخـۆش و کـردەوە ڕەندین بوو، لە هەموو خوێندنگاکاندا مامۆستـاکانی و شاگردەکانی پۆلەکەی خۆشیان دەویست. لەبەر ئەوە گەلێک جار دەکرا بەسەرۆکی شاگردانی پۆلەکەی خۆی. گەلێک پاداشیشی لە خوێندنگاکانەوە پێ دەبەخـشـرا. دوایی تەواو گـەشـەی کـرد و پێگەیشت. کـە دەرچوو، لەلایەن فـەرمـانڕەوایـیـشـەوە، وەک فەرمانبەرێکی ئافرەت دامەزرا.

## (٨)

### پەیوەندی ناوەند ڤیان و دایکی و برا و خوشکەکانی

هەموو جارێک دایک و برا و خوشـکەکانی ڤـیان دەهاتە سەرلێدانی ڤـیان. مـاڵەکـەیش ڕێزێکی زۆری لێ دەگرتن. ئەوانیش کە دەیاندی مـاڵەکـە ڤـیـان وەک کچی خۆیان تـەمـاشـا دەکـەن، چاویان دەگـەشـایەوە، دڵـیان شـادمـان دەبوو. خۆیان پێ نەدەگیرا؛ پڕ بەدڵ سوپاسی مـاڵـەکەیان دەکرد و، لە خـودای گەورەیش دەپاڕانەوە کـە ئەو مـاڵـە بپـارێزێت و، هەمـیـشـە دەسـتـیـان بـگـرێت و، سـەربەرزی خـۆشـگـوزەرانی و کامەرانییان پێ ببەخشێت.

کە (ڤیان)یش بوو بەفەرمانبەر، هەرچی دڵی پێ خۆش دەبوو. لە کەلوپەل و جلوبەرگ بۆ خۆی دەکڕی. هەروەها دیاری نایاب نایابیشی بۆ دایکی و براکەی و خوشکەکانی پێشکەش دەکرد. بۆ کچۆڵـەکـانی دۆستی خۆیشی دیاری دەبرد و، جلوبەرگی بۆ دەدورین و میوانداریشی دەکردن.

## (٩)

### خودای هەژاران

خودای هەژاران چاوی لە برا و خـوشکەکـانی (ڤـیان)یش بوو. براکـەی هەرچەندە کـەمی خـوێند، بەڵام بووە وێنەگـرێکی سـەرکـەوتوو. مـاڵـیشی پێکەوەنا و ژنیـشی هێنا و دوو منداڵی جوانیـشی بوو. هەمـوو جارێک سـەری لە (ڤـیان)ی خـوشکی دەدا و دیاری بۆ دەهێنا. خوشکەکانی (ڤـیان)یش هەردووکـیـان، شووی چاکیان کرد. بوون بەخاوەن مـاڵ و منداڵ. ئەوانیش لەگەڵ (ڤیان)دا جاروبار هاتوچۆی یەکـتـریان دەکرد و دیارییان بۆ یەکتر دەهێنا.

دایکی (ڤیان)یش، بەناچاری، هەر لەگەڵ باوە پیارەی منالەکانیدا مایەوە و هەڵیکرد.

هەرچەندە کابرای مێردی سەهەند بوو و، دڵی ئازار دەدا، بەڵام بەسایەی (ڤیان) و منداڵەکانی تریەوە ژیانی بۆ ئاسان بوو بوو. چونکە یاریدەیان دەدا.

باوە پیارەکەی (ڤیان)، چونکە ئازاری دڵی ئەم منداڵانە و دایکیانی دەدا، تا دەهات ژیانی سەختتر دەبوو. تەنگانەی زۆرتر دەهاتە بەر. خودا تۆڵەی ئەوانی لێ دەکردەوە.

بەڵام ئەو پیاو و ژنەی (ڤیان)یان پێگەیاند، تا دەهات خودا دەستی دەگرتن و خۆشی و ئارام و سەربەرزی پێ دەبەخشین.

بەڵێ (خودای هەژاران) وایە. هەروەک (دادپەروەر) و (کارپەسند)ە. بە(زەبروزەنگ)یشە.

هەر کەسێک چاکە بکات، چاکەی دێنێتەوە ڕێ.

هەر کەسێکیش خراپە بکات، خراپەی دێنێتەوە ڕێ.

هەر کەسێک (لا) لە (هەژاران) بکاتەوە، (بەختیار)ی دەکات.

هەر کەسێکیش ئازاری (هەژاران) بدات (جەزرەبە)ی پێ دەگەیێنێت.

## ڕەنج نەدەیت نان ناخۆیت!...

(١)

### کێ گەنمەکە پەیدا بکات؟

(ڕەوشەن) بە(مەنیج)ی دۆستی و (نەخشە)ی هاوڕێی گوت: «نیازم هەیە ڕەنج بدەم و، هەندێک گەنم پەیدا بکەم، بۆ ئەمەی بیچێنم و بەشی ساڵێک گەنم بۆ خۆم و خێزانەکەم بدرووەمەوە. کامتان یاریدەم دەدەن؟».

(مەنیج) گوتی: «من ناتوانم یاریدەت بدەم».

(نەخشە)یش گوتی: «منیش ناتوانم یاریدەت بدەم».

(ڕەوشەن)یش گوتی: «کەواتە هەر بەتەنیا خۆم ڕەنج دەدەم».

ڕەوشەن ئەوەی گوت و، داسێکی گرت بەدەستەوە. چوو بۆ گوندێک بوو بەوەرزێری خاوەن پەڵەیەک گەنم. چەند ڕۆژێک گەنمی بۆ دورییەوە و، مزەگەنمی خۆی لێ وەرگرت و، هێنایەوە ماڵەوە بۆ خۆی و منداڵەکانی.

(٢)

### کێ گەنمەکە بچێنێت؟

ڕەوشەن بەمەنیجی دۆستی و نەخشەی هاوڕێی گوت: «من پەڵە گەنمەکەم دۆزیەوە. من پەڵە گەنمەکەم دوریییەوە. من گەنمەکەی بەشی خۆم هێنایەوە. دەمەوێت هەندێک لەو گەنمە بچێنم. کامتان یاریدەم دەدەن؟».

مەنیج گوتی: «من ناتوانم یاریدەت بدەم».

نەخشەیش: «منیش ناتوانم یاریدەت بدەم».

ڕەوشەنیش پێی گوتن: «کەواتە خۆم دەچم گەنمەکە دەچێنم».

ئەوەی گوت و چوو گەنمەکەی چاند.

گەنمەکە پێ گەیشت و کاتی دروێنەکردن هات. ڕەوشەن چوو گەنمەکەی دوورییەوە، گەنمێکی زۆری لێ دەست کەوت. گەنمەکەی هێنایەوە ماڵەوە بۆ خۆی و منداڵەکانی.

(٣)

کێ گەنمەکە بهاڕێت؟

ڕەوشەن بەمەنیجی دۆستی و نەخشەی هاوڕێی گوت: «من پەڵە گەنمەکەم دۆزییەوە. من پەڵە گەنمەکەم دوورییەوە. من بەشە گەنمەکەی خۆمم هێنایەوە. من گەنمەکەم چاند. گەنمەکەم دوورییەوە. من گەنمەکەم هێنایەوە. دەمەوێت گەنمەکە ببەمە ئاشی و بیهاڕم. ئاخۆ کامتان یاریدەم دەدەن؟».

مەنیج گوتی: «من ناتوانم یاریدەت بدەم».

نەخشەیش گوتی: «منیش ناتوانم یاریدەت بدەم».

ئینجا ڕەوشەن پێی گوتن: «کەواتە من خۆم گەنمەکە دەبەمە ئاشی و دەیهاڕم». ئەوەی گوت و چوو بۆ ئاشی گەنمەکەی هاڕی و بەئاردیی هێنایەوە.

(٤)

کێ ئاردەکە بکاتەوە بەنان؟

ئینجا ڕەوشەن، بەمەنیجی دۆستی و نەخشەی هاوڕێی گوت: «من پەڵە گەنمەکەم دۆزییەوە. من گەنمەکەم دوورییەوە. من گەنمەکەم هێنایەوە. من گەنمەکەم چاند. من گەنمەکەم دوورییەوە. من گەنمەکەم بردە ئاشی. من ئاردەکەم هێنایەوە. ئەی کامتان نانەکە دەکەنەوە؟».

مەنیج گوتی: «من نانەکەت لەگەڵدا ناتوانم بکەمەوە».

نەخشەیش گوتی: «منیش نانەکەت لەگەڵدا ناتوانم بکەمەوە».

ڕەوشەنیش گوتی: «کەواتە خۆم ئاردەکە دەشێلم و، دەیکەم بەهەویر و دەیکەمەوە بەنان».

ڕەوشەن ئەوەی گوت و هەویرەکەی شێلا و کردیەوە بەنان.

(٥)

کێ نانەکە بخوات؟

ئینجا (ڕەوشەن) بە(مەنیج)ی دۆستی و (نەخشە)ی هاوڕێی گوت: «من پەڵە گەنمەکەم دۆزیەوە. من پەڵە گەنمەکەم دوورییەوە. من گەنمەکەم چاند. من گەنمەکەم دوورییەوە. من گەنمەکەم بردە ئاشی. من ئاردەکەم شێلا و، کردم بەهەویر و، کردمەوە بەنان. ئەی کامتان نانەکە دەخۆن؟!...».

مەنیج گوتی: «من نانەکە دەخۆم».

نەخشەیش گوتی: «منیش نانەکە دەخۆم».

ئینجا ڕەوشەن بەمەنیجی دۆستی گوت: «تۆ لەم نانە ناخۆیت».

هەروەها بەنەخشەی هاوڕێیشی گوت: «تۆیش لەم نانە ناخۆیت. من ڕەنجم داوە. لەبەر ئەوە هەر دەبێت خۆم و منداڵەکانم لەم نانە بخۆین. چونکە دەستوور ئەمەتا: تا ڕەنج نەدەیت نان ناخۆیت!»[1].

## قاڵی چن

(١)

### کۆگرەی قاڵی چنان

سێ دۆستە خوشک لە شاری (هەولێر)دا کۆبوونەوە.

یەکەمیان: ناوی (نەسرین) بوو، کە لە دانیشتووانی شاری (سلێمانی) بوو.

دووەمیان: ناوی (شیرین) بوو، کە لە دانیشتووانی شاری (هەولێر) بوو.

سێهەمیان: ناوی (زین) بوو، کە لە دانیشتووانی شاری (دهۆک) بوو.

ئەم سێ دۆستە لە کارگەی قاڵی چنیندا پێکەوە خوێندوویان. پێکەوە فێری پیشەی قاڵی چنین بووبوون. پێکەوە فێری هونەری وێنەکێشان و، نەخشکاری و، ڕەنگسازی بووبوون هەرسێکیان جوان و، ڕووخۆش و، کردەوە ڕەنگین بوون. لە هونەرمەندی پیشەی قاڵی چنینیشدا گەیشتبوونە ئەوپەڕی شارەزایی و پسپۆڕی. کە لەسەر ئەو سەرکەوتنانە گەلێک جار ئافەرین کرابوون. گەلێک جاریش پاداشیان درابووین. جا بۆیەکا لە پایتەختی کوردستاندا کۆبوونەوە، کە لە بابەت پێشخستنی پیشەسازی قاڵی چنینەوە، وتوتێژ بکەن.

(٢)

### بڕیاری سێ قاڵی دەدەن دروستیان بکەن

(نەسرین) گوتی: «من وای بەباش دەزانم هەریەکەمان قاڵییەک دروست بکەین سێ گەز بەچوار گەز بێت. تا بتوانین سووک و تەنک و سفت و پتەوبن. ڕەنگەکانیشیان بسازێن لەگەڵ یەکتردا. بەمەرجێک لەو ڕەنگانەبن کە دڵی مرۆڤ دەکەنەوە و، چاوی مرۆڤ دەگەشێننەوە».

(شیرین)یش گوتی: «قسەکانت بەجێن. منیش وای بەباش دەزانم لەبەر سنگی قاڵییەکانماندا چاوئەندازێکی جوانی (کوردستان)ی تێدا بێت. بۆ ئەمەی هەر بێگانەیەک بێتە هاوینەهەوارەکانمان و یەکێک لەو قاڵییانە بکڕێت، هەموو دەم یادی هاوینەهەوارەکانمان بکاتەوە و، هانەی کەسانی تریش بدات بێنە هاوینەهەوارەکانمان».

---

(١) بیری ئەم چیرۆکە. مامۆستا لە یەکێکی (کامیل گیلانی)یەوە وەرگرتووە کە هەر خۆی لە ١٩٣٣دا بەناوی (مریشکە سوورە بچکۆلە)وە ردوویە بەکوردی.

(زین)یش گوتی: «قسەی هەردووکتان بەجێیە. منیش پێشنیازم وایە لە پەراوێزەکانی قاڵییەکانماندا وێنەی ڕاستەقینەی هەشت کەسی گەورە و بەناوبانگی (کورد)یان تێدا بکێشرێت، تا نەتەوەکەمان ئەو کەسانەی لەبیر نەچێتەوە».

(نەسرین)یش گوتی: «قسەکەت جوانە. ئەو پیاوە گەورانەمان لە چ پیشە و کارێک هەڵبژێرین؟».

(زین)یش گوتی: «لەم پیشە و کارانە؛ یەکێکیان زانا بێت. یەکێکیان وێژەوان بێت. یەکێکیان زرنگکار بێت. یەکێکیان جەنگاوەر بێت. یەکێکیان سازلێدەر بێت. یەکێکیان گۆرانیبێژ بێت. یەکێکیان وێنەکێش بێت. یەکێکیان پەیکەرتاش بێت».

(شیرین) و (نەسرین)یش گوتیان: «باشە. بەقسەت دەکەین».

ئینجا (زین) گوتی: «پێویستە بۆ ئەم پرۆژەیەمان کاتێکی دیاری کراویش دابنێین. من دەڵێم ساڵێکمان بۆ ئەم مەبەستە بەسە. واتا؛ تا مانگی نەورۆزی داهاتوو، هەرسێکمان قاڵییەکانمان تەواو بکەین. تا لە ڕۆژی (١١)ی ئادار و (نەورۆز)دا، لە پێشانگاهێکدا بتوانین بیانخەینە پێش چاوی هەمووان».

(شیرین) و (نەسرین)یش گوتیان: «قسەکانت دروستن. ئەوا پەسندمان کردن».

## (٣)

## گوڵ و دار و درەخت و گیانلەبەری کوردستان

ڕۆژی دووەم کۆگرەکە گیرایەوە: (نەسرین) گوتی: «خوشکینە! هەروەک خۆتان دەیزانن چ لە ناوەند وێنەی ناودارەکاندا و، چ لە سووچەکانی بەر سنگی قاڵییەکانماندا بۆشاییەکی زۆر دەمێنێتەوە. ئەی ئەم بۆشاییانە بەچی پڕ بکەینەوە؟».

(شیرین) گوتی: «بەوێنەی ئەو گوڵ و دار و درەختانە و، ئەو پەلەوەر و گیانلەبەرانە پڕیان دەکەینەوە کە لە (کوردستان)دا هەن و بەناوبانگن».

(زین) گوتی: «ئەمە بیرێکی باشە. پەیڕەوی دەکەم».

(نەسرین)یش گوتی: «ئەم بیرەیشت باشە. پەیڕەوی دەکەم».

## (٤)

## جەژنەکانی مانگی نەورۆز

کۆگرەکە لە ڕۆژی سێهەمیدا. بڕیارنامەیەکی نووسی و، هەرسێ دۆستە خوشک مۆریان کرد. هەر ئەو ڕۆژە بڵاوەیان لێ کرد و، خۆیاندا دەستیان کرد بەقاڵی چنین. هەرسێ مانگ جارێک، هەرسێکیان لە شارێک لەو سێ شارانەدا کۆ دەبوونەوە. بۆ ئەمەی سەرپەرشتی یەکتر بکەن لە بەکارهێنانی بەندەکانی بڕیارنامەکەی کۆگرەکەیاندا. دوایی کە مانگی نەورۆز هاتە پێشەوە، هەرسێکیان هاتن بۆ هاوینەهەواری (سەلاحەدین) و، لەناو هۆڵێکی گەورەدا، هەرسێ قاڵییەکەی خۆیان بەدیوارەوە هەڵواسی و، پێشانگایەکیان بۆ دامەزراندن.

لەسەر دەرگای هۆڵەکە پارچە خامێکی سپییان هەڵواسی و، لەسەریان نووسی: «ئەندامانی کۆگرەی قاڵی چنینی کوردستان پیرۆزبایی لە گەلی کورد دەکەن بەبۆنەی جەژنی (١١)ی ئادار و جەژنی (نەورۆز)ەوە».

(٥)

پێشانگای قاڵی چنینی کوردستان

مانگی نەورۆز پڕ بوو لە ئاهەنگ و زەماوەند و گەشتوگوزار بۆ خاکی کوردستان، بەتایبەتی بۆ هاوینەهەوارەکانی، کەسانێکی زۆریش هاتنە هاوینەهەواری (سەلاحەدین) بۆ بینینی ئەو سێ قاڵییەی دۆستە خوشکەکان؛ (نەسرین) و (شیرین) و (زین) دروستیان کردبوون.

بەڕاستی قاڵییەکان ئەمەندە جوان و ناوازە و ڕەنگین بوون دڵی هەموو کەسێکیان کێش کردبوو. زۆربەی پسپۆڕان و شارەزایانی قاڵی چنینیش ئافەرینیان کردن و کارەکەیان پەسەند کردن. لەناو کاربەدەستانی کوردستانیشدا بوو بەمقۆمقۆ لەسەر شێوەی پاداشدانەوە و نرخدانان بۆ قاڵییەکانیان. دوایی لەسەر ئەوە ڕێککەوتن. بێجگە لە پاداش پێدانیان، هەرسێ قاڵییەکەیان بێ بکڕن و، هەریەکەیان بۆ نموونە بنێرنە کارگەیەکی قاڵی چنین لە شارەکانی (سلێمانی) و (هەولێر) و (دهۆک)دا، بۆ ئەمەی قاڵی چنەکانی ئەو کارگانە لەسەر ئەو شێوانە قاڵییەکانیان دروست بکەن، تا بتوانرێت بفرۆشرێن بەو کەسانەی لە هاویندا دێنە گەشتوگوزاری هاوینەهەوارەکانی کوردستان. هەروەها کاربەدەستانی کوردستان لەسەر ئەوەیش ڕێککەوتن، کە هەریەکێک لەو سێ دۆستە خوشکە دابمەزرێنرێت لە کارگەکەی شارەکەی خۆیدا، بۆ ئەمەی بووەستن بەسەر قاڵی چنەکانی ئەو کارانەوە و، سەرپەرشتییان بکەن لە قاڵی چنیندا و، ئاراستەیشیان بکەن بۆ بەرهەمی باشتر و ناوازەتر و نایابتر.

## ژیانی هەرەوەزی

(١)

شایی لادێ

(شاسوار) خۆی و دایکی و هەردوو خوشکەکەی چوون بۆ گوندێکی دوور. چونکە ماڵی لالۆی شاسوار ژنیان هێنابوو بۆ کوڕەکەیان، لەو گوندەدا. بانگیان کردبوون، لەو شایی و زەماوەندەدا هاوبەشیان بن. ئەمانیش کە چوون بۆ شاییەکە، ڕۆژەکەی خۆش بوو. هەر ئەوەندە گەیشتنە ماڵی لالۆی شاسوار و، پشوویەکیان دا، دەستیان کرد بەڕەشبەڵەک و هەڵپەڕین. سێ ڕۆژی خۆشیان لەگەڵ خزم و کەسوکاری خۆیاندا بەشایی و بەزمەوە ڕابوارد.

(٢)

لافاوێکی کوتوپڕ

بەڵام چونکە زستان بوو، زۆری پێ نەچوو، کەشەکە گۆڕا. لە پڕ هەمور بەری ئاسمانی گرت و، هەورە تریشقە و ڕەشەبا و تۆف و باران و ڕەهێڵە ناوچەکەی گرتەوە. گوندی ماڵی شاسواریش تووشی ئەو

ڕەهێڵە و تۆف و بارانە بووبوو. هەتا شاسوار و دایکی و خوشکەکانی گەڕابوونەوە لافاوێک هەڵسابوو، گەلێک ماڵی ڕووخاندبوو، کە یەکێک لەو ماڵانە ماڵی شاسوار بووبوو. بەسەرزمانە باوکی شاسوار بووبوو بەژێر خانووەکەوە. ئاوی لافاوەکەیش کە هوروژمی هێنابووە ناو خانووەکەوە، لەژێر دار و پەردووی خانووەکەدا باوکی شاسواری خنکاندبوو. بێجگە لەوە لافاوەکە هەرچی خواردەمەنی و دانەوێڵە و کەلوپەلێکیشیان هەبوو بوو، هەمووی بردبوو. بەم ڕەنگە، کە خێزانە بەسەرزمانەکە گەیشتنەوە جێ خانووەکەیان؛ نە خانوویان مابوو، نە کەلوپەلیان مابوو، نە دانەوێڵە و خواردەمەنییان مابوو، نە پەلەوەر و نە گیانلەبەریشیان مابوو، لافاوی بێ ئامان هەموویانی لەناو بردبوو.

جا لەو کاتەدا کە لاشەکەی باوکی شاسواریان دەناشت، شاسوار و دایکەکەی و هەردوو خوشکەکەی خۆیان پێ نەگیرا، دایانە پرمەی گریان. کەسوکاریشیان لەگەڵ ئەواندا دەستیان کرد بەشین و ڕۆڕۆ.

لە ڕاستیدا خێزانی شاسوار، تا ئەو ساکە، کڵۆڵی وای بەخۆیەوە نەدیبوو. نەک هەر خۆیان بەزەییان بەخۆیاندا دەهاتەوە. خەڵکی ئاواییەکەیش، هەموویان، دڵیان پێیان دەسووتا.

(٣)

کوێخا و مەلای گوندەکە دەکەونە فریایان

کوێخای گوندەکە پیاوێکی مەرد و جوامێر بوو. لە ڕاستیدا لە کەڵەپیاوان بوو. دەنگی نەکرد تا خێزانەکەی شاسوار کوڵی گریانیان نیشتەوە. ئینجا لێیان هاتە پێشەوە و گوتی:

«کوڕی خۆم شاسوار! باوکی خۆشەویستتان هەرچەندە لەم شێوە ناسۆرەدا مردووە، بەڵام خۆتان دڵتەنگ مەکەن. من دەتانبەمە ماڵی خۆم. تۆ دەکەم بەکوڕی خۆم. خوشکەکانیشت لە جێی کچی خۆم دائەنێم. دایکیشت وەک خوشکی خۆم تەماشا ئەکەم. هەموویشتان لەوە دڵنیابن کە مامی خۆتان لە ماوەی دوو سێ مانگێکدا خانوویشتان بۆ دروست ئەکاتەوە و، کەلوپەلی ناو ماڵیشتان بۆ دەکڕێتەوە و، دانەوێڵە و خواردەمەنیشتان بۆ ئامادە دەکاتەوە. لە هەموویشی بەنرختر خەڵکە چاکەکەی گوندەکەش وەک خوشک و برای خۆیان سەیرتان دەکەن و، یارمەتیان ئەدەن. زۆری پێ ناچێ، خوا یاربێ، دەچنەوە سەر دۆخی جاران».

مەلای گوندەکەیش گوتی:

«ئەگەر دانیشتووانی بەڕێزی ئاواییەکەمان ڕێم بدەن، من هەر لەم ڕۆوە دەست دەکەم بەناونووسکردنی ئەو جوامێرانەی پیتاک پێشکەشی ئەم خێزانە سەرگەردانە دەکەن».

خەڵکی ئاواییەکەیش پیاوانە هاتنە پێشەوە، گوتیان: «ئێمە کوێخای چاک و مەلای چاکی وەک ئێوەمان هەبێ، پێشڕەویان بکەن ئامادەین بۆ هەموو یارمەتییەک». ئینجا شاسواریش هاتە زمان گوتی: «کوێخای سەربەرز! مامۆستای بەڕێز! دانیشتووە خۆشەویستە دڵسۆزەکان! نازانم بە چ زمانێک سوپاسی چاکە و جوامێری ئێوە بکەم. هەر ئەوەندەم لە خودا دەوێت: بەدڵی خۆتان چاکەتان بداتەوە. ئێمەیش ڕێ پێشان بدات، تۆڵەی ئەم چاکە و پیاوەتی و خۆشەویستییەتان بۆ بکەینەوە».

## (٤)

## له دوای تەنگانە خۆشییە

(خودای گەورە) کە باوکی هەژارانە، بەم ڕەنگە دڵی دانیشتوانی گوندەکەی بۆ شاسوار و خێزانەکەی نەرم کرد.

کوێخای سەربڵند، زۆری پێ نەچوو، گفتەکانی خۆی بردەسەر. شاسواری کرد بەزاوای خۆی. خانوویێکی خنجیلانەی بۆ کچەکەی خۆی کە بووبوو بەژنی، دروست کرد و، گوێزانیەوە بۆ ئەوێ. هەرچی کەلوپەلی پێویست و ئازووقەیش هەبوو، پێشکەشی کردن. دایکی شاسواریشی لە برایەکی خۆی، کە ئەو ساڵە ژنی مردبوو، مارە کرد. ئەویش گوێزرایەوە بۆ ماڵی تازەی. کچەکانی خوشکی شاسواریش، هەریەکە، لە کوڕێکی خۆی مارە کرد و، ماڵی بۆ جیاکردنەوە.

بەم ڕەنگە، لە سایەی خودای پەروەردگارەوە، شینی خێزانەکەی شاسوار بوو بەشایی.

ئەو پیتاکانەیش کە مەلای گوندەکە کۆی کردبوونەوە لە دانیشتووانی ئاواییەکە دران بەدیاریی نایاب نایاب و، پێشکەش بەو چوار خێزانە تازەیە کران.

## (٥)

## شاسوار چاکەی گوندەکە ئەداتەوە

شاسوار ئەو دەمەی ئەو مەرگەساتەی لێ قەوما، دوایین ساڵی بوو، لە زانستگای پزیشکایەتیدا. بۆ پشووی نیوەی ساڵ هاتبووەوە ماڵەوە بۆ لای باوکی و دایکی و خوشکەکانی. ئینجا کە لە زانستگا دەرچوو، بەهەرچی چلۆنێ بێ فەرمانی میری تەواو کرد و گەڕایەوە گوندەکەی خۆی. بڕیاری دا تا دەمێنێ پزیشکایەتی لەناو گوندەکەی خۆیدا بکات، کە هەمموو دەم داماوی دەستی پزیشکێک بوون چارەی نەخۆشەکانیان بکات. بەم ڕەنگە شاسوار خۆی تەرخان کرد بۆ چارەکردنی نەخۆشی نەخۆشانی گوندەکەی خۆی، کە بەمزێکی زۆر کەم، یاخود بەخۆڕایی پزیشکایەتی بۆ دەکردن و، دڵسۆزییەکی زۆریشی بۆ بەکاردەهێنان. بێجگە لەوە بەهاوکاریی کوێخا چاکەکە و مەلا بەڕێزەکەی گوندەکەوە، دانیشتوانی گوندەکەی خۆی ئاراستە دەکرد بۆ ژیانێکی پاکتر و خۆشتر و بڵندتر. ئەمەیشی هەر بۆ ئەمەبوو کە چاکەیان بداتەوە.

## (٦)

## گوندی شاسوار پێش دەکەوێ

بەسایەی هونەرمەندی شاسوارەوە و یارمەتی و خەباتی کوێخا و، ڕاوێژی مەلاوە، تا دەهات گوندەکە پێش دەکەوت. گوندەکە لە جێگایەکی ناقۆلای شاخاویدا، دامەزرابوو. هەمموو دەم لافاوی شاخەکەی بەسەردا دەهاتە خوارەوە و، ماڵەکانی کاول دەکرد و، دەڕووخاند و، دەتەپاند. ڕێگاکانیشی تێک دەدا و خواروخێچ دەکرد. زیانێکی زۆری لە دانیشتوانی گوندەکە دەدا. لەبەر ئەوە یەکەم خەباتی هەرسێکیان ئەوەبوو گوندەکە بگوێزنە خوارەوە، بۆ ناو دەشتاییە پان و پۆڕەکەی بەردەمی. هەرچەندە گوندەکە خۆی

هەر پەنجا ماڵێک دەبوو، بەڵام ئەوان بەشی سەد خانوویان لە زەوییەکە ڕەنگڕێژ کرد، ئەمەیشیان بەسایەی ئەندازیارێکی هونەرمەندەوە بۆ دیاری کرا کە هاوڕێیەکی خۆشەویستی شاسوار بوو. (فەرمانداریی خۆیی کوردستان)یش، لەسەر خواستی دانیشتوانی گوندەکە، خۆیان بڕیاری دا سەد خانوو، باخچەیەکی گشت لایی، نووسراوخانەیەک، بازاڕێک، خوێندنگایەک بۆ کوڕان و، خوێندنگایەکیش بۆ کچان نەخۆشخانەیەک، مزگەوتێک، یانەیەک، یاریگایەک بۆ مناڵان لەگەڵ چشتیرێکدا دروست بکات. خانووەکان هەریەکە سێ ژوور و هەیوانێکیان تێدابوو، لەگەڵ جێگای دەستشتن و، چێشت لێنان و، گەرماو و، پێشاودا هەمووشیان حەوشیان هەبوو. گوندەکە لە شێوەیەکی چوارگۆشەییدا دروست کرا، کە هەرلایەی دوو سەد گەز درێژ بوو. لە ناوەڕاستدا، باخچەی گشت لاییەکەیان دروست کرد. شەقامی قیرتاوکراویش بەهەر چوارلای باخچەکەدا دروست کرا. ماڵەکان هەر پەنجایان، لەهەر چوارلاوە، دەیانڕوانی بەسەر باخچەکەدا. یاریگاکانی مناڵەکانیش کەوتبوونە ئەم سەر و ئەوسەری باخچەکەوە. لە ناوەڕاستی باخچەکەیشدا، یانەیەکی مینابەند دروست کرابوو، بۆ حەسانەوەی گوندییەکان. پەنجا خانووەکەی تریش کەوتبوونە ئەودیو خانووەکانەوە. بازاڕ و، نووسراوخانە و، خوێندنگا و نەخۆشخانە و مزگەوتیش لەودیوەوە، بەرامبەر ڕیزی دووەمی خانووەکان دروست کرابوون. هەرچی چشتیرەکە بوو لە ئاوایییەکەوە، دوو هەزار گەزێک دوور بوو. لەناو گوندەکەدا سەرەنوێل؛ قەدەغە کرا. پەڕەندە و گیانلەبەرەکان، تەنیا لەناو چشتیرەکەدا دەپارێزران. پاک و خاوێنیی ئەوان و چشتیرەک لەسەر شێوەیەکی زانستییانەی تەندروستانە دەپارێزرا. (فەرمانداریی خۆیی کوردستان) لە ماوەی سێ ساڵدا گوندەکەی دروست کرد و ڕازاندیەوە و، پێشکەشی دانیشتوانی گوندەکەی کرد. پێویست ناکات بیڵێین گوندەکە پرۆژەی ئاو و کارەبا و زێرابیشی بۆ پێک هێنرا.

(٧)

## کارە ڕەندینەکانی شاسوار

هەتا ئەم کار و فەرمانانە ڕاپەڕێنران پێنج ساڵێکی خایاند. تا ئەوە پێک هات، شاسوار هەموو حەفتەیەک، بێ پارە وەرگرتن، هەموو خێزانەکانی ناو گوندەکەی دەپشکنی. هەر کەسێ نەخۆش بوایە چاکی دەکردەوە. لەگەڵ ژنەکەیدا دەگەڕا بەماڵەکاندا ئامۆژگاریی دەکردن. ئاراستەی دەکردن بۆ پاکوخاوێنی و، خۆپاراستن لە نەخۆشی و، بۆ ڕێکخستنی ماڵ و ڕازاندنەوەی ژیانیان. لەسەر ئەرکی خۆی دوو (خوێندنگای شەوی)یشی بۆ کردنەوە، بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری. هەرچی (ئافرەتەکان) بوون، خۆی وانەی پێ دەگوتنەوە. ژنەکەی خۆیشی لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا دەیخوێند. هەرچی (مەلا)یش بوو، بە(پیاوەکان)ی دەخوێند. ئەمانەیشیان هەموو بەخۆڕایی دەکرد.

## کۆمەڵی دیدەوانی

### (١)

### لە پڕ هاوارێک هەڵسا

لەو کاتەدا کە (فەرهاد) و (خەسرەو) و (شێرزاد) لە خوێندنگاوە دەگەڕانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان بەرێگایەکی وادا ڕۆیشتن کە بەتەنشت ڕووبارێکەوە کشابوو.

(فەرهاد) گوتی: «چاوتان لێیە ئەو کوڕە بەم کەشە ساردە مەلە دەکات؟».

(خەسرەو)یش وەرامی دایەوە گوتی: «لە ڕاستیدا منیش حەز لە مەلەکردن دەکەم. بەڵام وەک چاوتان لێیە ڕۆژەکەی تووشە. بایەکەی توندە. ئاوەکەی ئاڵۆزاوە، هارە و هاژەکەی پیاو کەڕ دەکات. ئەگینا منیش مەلەم دەکرد».

بەڵام (شێرزاد) جۆرێکی تر قسەی کرد، گوتی: «ئێمە کە هەرسێکمان ئەندامین لە کۆمەڵی دیدەوانیدا و، چەند بەچەند مەشقمان کردووە لە جەربەزەییدا، نابێ چاومان بترسێ لە سەرما و گەرما و، تەووژمی ئاو و، هووروژمی با. ئەگینا فەرمانە مەردانەکانی خۆمان بۆ بەجێ ناهێنرێت!».

لە کاتێکا ئەوان لەم وتووێژەدا بوون، هاوار هەڵسا: «پیاوی چاک بن!... بگەنە فریام!... خنکام!...».

کە ڕوویان کردە جێ دەنگەکە، تەماشایان کرد ئەوا کوڕێک بەدەم شەپۆلی ئاوەکەوە ڕەت دەبات و، خەریکە بترنجێتە ناو بنی کەڵە بەردێکەوە».

ئەمانیش کە هۆگری لاوێتی و جەربەزەیی بوون، خۆیان پێ نەگیرا، هەرسێکیان بەهەڵەداوان خۆیان گەیاندە بن کەندێک و، جلەکانی خۆیان داکەند و، خۆیان فڕێ دایە ئاوەکەوە.

### (٢)

### کوڕەکەیش هاوڕێی خۆیان دەرچوو

تەووژمی شەپۆلەکان یەجگار بەهێز و هەڕەت بوو. هەرسێ دیدەوانەکە، ئاوە ساردەکە بەرەنگاریی دەکردن. توندە بایەکە گێژی دەکردن. لەگەڵ ئەمەیشدا هەرچی هێز و توانایەکیان بوو، بەکاریان هێنا، تا کوڕەکەیان لە بن کەڵەبەردەکەدا دۆزییەوە و، بەئەرک و ئاوازێکی زۆرەوە هێنایانە دەرەوە.

کوڕەکە، تەووژم و ساردیی ئاو و توندەبایەکە و، پەل کوتانی بێ سوودی خۆی کە خەباتی دەکرد خۆی بگەیێنێتە کەنار ڕووبارەکە و خۆی ڕزگار بکات، تەواو لە پەلوپۆی خستبوو. لە هۆش خۆی چوو بوو. بەناستەم نووزەیەکی لێوە دەهات. بڕستی بڕابوو. ڕاستەوڕاست لەسەر زەوییەکە درێژ بوو. هەرچەندە ڕەنگی پەڕیبوو و، چاوی لێک نابوو و، لەشی شین بووبووەوە، بەڵام کوڕەکان ناسیانەوە. هاوڕێی خۆیان دەرچوو، کە ناوی (ئەفراسیاو) بوو.

(٣)

## هۆشیارکردنەوەی ئەفراسیاو

(ئەفراسیاو) خەڵکی گوندێکی تربوو، کە لە گوندی خۆیانەوە تاکە ساتێک دوور بوو. چوون کورتەکەکانی خۆیان هێنا و ڕایانخست لە ژێریا. تا زەویەکە ئازاری نەدات. دەمودەست ئاگرێکیشیان کردەوە و، ئەفراسیاویان لە نزیکیەوە دانا، تا بێتەوە هۆش خۆی. ئینجا فەرمانی خۆیان بەم جۆرە دابەش کرد.

(فەرهاد) چووە ئاوایی، بەماڵەوەی گوت: «جێگا ڕابخەن و نان ئامادە بکەن». بەکوێخای گوندیشی گوت: «چوار زەلام بنێرێت لەگەڵ پزیشکێکی گوندیدا، تا چارەیەکی کوڕەکە بکەن و بیگوێزنەوە بۆ ماڵی خۆمان».

(خەسرەو)یش: چوو جلەکانی کوڕەکە بدۆزێتەوە و، بۆی بهێنێتەوە. هەرچی (شێرزاد) بوو: تا ئەوان هاتنەوە بەدیار کوڕەکەوە مایەوە، خەریکی دەس و پێ بزواندن و لەش سوونەوەی و، ئاو دەرهێنان لە سکی بوو. پاش نیوە ساتێک لەشی کوڕەکە گەرم بووەوە و، خوێنی جوولا و، هۆشی هاتەوە بەرخۆی. تاوێک چاوی هەڵبڕی و لێکی نایەوە. لەو کاتەدا (فەرهاد) و، (خەسرەو) و، کوێخای گوند و، پزیشکە گوندییەکە و، چوار زەلامەکە بەدارە مردوویەکەوە و جلوبەرگی کوڕەکەوە گەیشتنە جێ.

(٤)

## پزیشکی گوند ئەفراسیاو چاک دەکاتەوە.

پزیشکەکە، کە ئەفراسیاوی دی هەموو لایەکی لەشی پشکنی و، ئەندامەکانی تاقی کردەوە. مژدەی بەهاوڕێکانی دا، گوتی: «ئازار بەهیچ ئەندامێکی نەگەیشتووە. هەر ئەوەتا زۆر ماندوو بووە و، سەرمای بووە و، ترساوە لە خنکان. هەر ئێستا خۆراکێ لەم دەرمانەی بۆ دەکوڵێنم و دەیدەمێ. ئاوڕەگ (ئارەق) دەرێژێ و لەشی سووک دەبێ و، چاوی هەڵدەهێنێ و، هۆشیار دەبێتەوە. بەڵام تا سبەینێ ئینجا چاک ببێتەوە».

پزیشکەکە هەر لەوێدا دەرمانەکەی بۆ ئامادە کرد و کردی بەقوڕگیدا. ئینجا جلەکانیان لەبەر کردووە و، خستیانە سەر دارە مردووەکە و چوار زەلامەکە هەڵیان گرت و بردیانەوە بۆ ماڵی (فەرهاد). لە ماڵی فەرهاددا کوڕەکە خرایە سەر جێگا و، پێخەفێکی پاک و خاوێن و ئەستووری درا بەسەرا، تا تەواو بحەسێتەوە. کوڕەکە دوو سێ ساتێکی پێ نەچوو، ئاوڕەگی ڕشت و، لەشی سووک بوو و، هاتەوە هۆش خۆی. کە لێفەکەی لەسەر خۆی لادا و، چاوی هەڵبڕی؛ هەرسێ هاوڕێکەی خۆی دی و، ناسینیەوە. پرسی: «من لە کوێ دام؟!...».

فەرهادیش وەرامی دایەوە، گوتی:

«لە ماڵی برای خۆتدایت. ئیمشەو میوانی منیت. بەیانی دەتبەینەوە بۆ ماڵی باوکت و، ئێمە میوانی تۆ دەبین». پاشان وردە، وردە، هەموو کەینە و بەینەیەکیان بۆ گێڕایەوە.

لەو کاتەدا فەرهاد چوو، مەسینە و لەگەنی بۆ هێنا، دەم و دەستی بشوات. تا ئەفراسیاو دەم و دەستی

خۆی شوشت، کەمەکێک هێزی هاتەوە سەر خۆی. هەستایە سەر پێ و گوتی:

«براکان تا دەمێنم سوپاسی ئێوە دەکەم، کە منتان لە مردن ڕزگار کرد. خودا یاربێت ئەم چاکەیەتانم هەر لەبەرچاو دەبێت. سوپاسی خودای و پاک و یەکتایش دەکەم کە ئێوەی بۆ ڕەخساندم، هەروەها سوپاسی مام کوێخا و زەلامەکان و پزیشکی گوندیش دەکەم کە بەهۆی منەوە ئەرکیان کێشا. خودا هەمووتان پایەدار بکات و پاداشی شایستەتان بداتەوە».

ئینجا چوو ئەم لاو و ئەولای هەرسێ هاوڕێکەی خۆی ماچ کرد و، بەسوپاسێکیشەوە دەستی هەموویانی گوشی و، دانیشتەوە.

(٥)

## فەرهاد ئاهەنگ بۆ ڕزگاربوونی ئەفراسیاو دەگێڕێ.

فەرهاد نان و چێشتێکی جوانی بۆ ئەفراسیاو و مێوانەکانی تری کردبوو. کە ئێواری نانیان خوارد، دەستیان کرد بەگۆرانی گوتن و شمشاڵ لێدان و هەڵپەڕین. بەقسەی نەستەق و گاڵتەوگەپیشەوە کاتێکی زۆر خۆشیان ڕابوارد. بەهۆی تەماشاکردنی ئەو ئاهەنگ و بەزمورەزمەوە ئەفراسیاو تەواو حەسایەوە. ئەو شەوە، هەموویان، زوو دەستیان کرد بەنوستن. بۆ ئەمەی ئەفراسیاو بەشێکی زۆرتر سرەوتی لەش و ئارامی گیانی پێ ببڕێ، کە بەیانی هەستان لەخەو ئەفراسیاو تەواو چاک بووبووەوە.

(٦)

## ئەفراسیاو دەبەنەوە گوندی خۆی

بۆ ئەمەی ماڵی باوکی (ئەفراسیاو) لە نەهاتنەوەی (ئەفراسیاو) دڵیان ڕانەچەنێ و، مەترسی نەکەن، (فەرهاد) هەر لە یەکەم ڕۆژەوە[١] یەکێکی ناردبوو بۆ ماڵی باوکی (ئەفراسیاو) کە ئەفراسیاو میوانی ماڵی فەرهادەوە، دڵیان هیچ نەکات، سبەینێ هەر چواریان دێنە ئەوێ مێوانیان دەبن. ڕۆژی دوایی (فەرهاد) و (خەسرەو) و (شێرزاد) و (ئەفراسیاو) هەر چواریان بەسواری ئەسپ چوون بۆ گوندی ئەفراسیاو. کەینەوبەینەی کارەساتەکەی ئەفراسیاو لەناو گوندا دەنگی دابووەوە و، تازە گەیشتبووەوە ماڵی باوکی ئەفراسیاو. کە بەیانی هەر چوار (دیدەوان) گەیشتنە گوندی ئەفراسیاو. باوکی ئەفراسیاو و کەسوکاریان و بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی گوندەکە هاتبوون بەپیریانەوە. خانەخوێ و کەسوکارەکەی ئەفراسیاو سوپاسێکی زۆری هەرسێ دیدەوانەکەیان کرد و، مەڕیان لەبەر پێیاندا سەربڕی.

ئەو ڕۆژە لە ماڵی باوکی ئەفراسیاودا کرا بەمیوانداری و نانخواردن و ئاهەنگ و زەماوەند. پارەیەکی زۆریش بەسەر هەژاراندا بەشرایەوە.

(باوکی ئەفراسیاو) نەیهێشت میوانەکان ئەو شەوە بڕۆنەوە. بۆ بەیانی کە ڕۆیشتنەوە. (باوکی ئەفراسیاو)، بەهەریەکەیان دیارییەکی بەنرخی پێشکەش کرد، کە بریتی بوو؛ لە دەستێک (جلی تازەی کوردی).

---

(١) ڕاستتر: (هەر لە ئێوارەوە)، یا (هەر لە دوێنێوە).

ئەم دیارییانە، هەروەک نیشانەی (سوپاسگوزاری) بوون بۆ ئەوان، (دیدەوانی) و (هاوڕێیەتی)ی هەر چوار کوڕەکەیشیان دەرئەخست.

## ورچەکەی کوڕە کاژاو

(١)

### ئەحمەد پاشا و کاکە حەمە

(ئەحمەد پاشای بابان) کاربەدەستێکی گەورەی (کورد) دەبێت. لە شاری سلێمانیدا دادەنیشێت. بایەخێکی زۆر دەدات بەچاکەی گشتیی دانیشتووانی هەرێمەکەی خۆی. هەرچی بۆ خۆشگوزەرانی و سەروەت و ئارامی کوردەواری ئەو هەرێمە پێویست بووبێ ئەوە دەکات.

یەکێک لەو فەرمانبەرە گەورانەیش کە لەژێر دەستیدا دەبێت، پیاوێکی ئازا و نان بدە و بەجەرگ و کارگوزار دەبێت، ناوی (شێخ کاکە حەمە) دەبێت. ئەم شێخ کاکە حەمەیە یەکێک بووە لە سێ کوڕەکەی (شێخ عیسای بەرزنجە)، کە لەناو هەموو کوردەواریدا بەناوبانگ بووە. جا ئەم (شێخ کاکە حەمە)یە کوڕێکی زۆر لاوچاک و ئازا و پالەوانی دەبێت ناوی (شێخ مارف) دەبێت، کە ئازایەتییەکەی لەناو کوردەواری ناوچەی (سرۆچک)دا بەداستان دەگێڕنەوە.

(٢)

### ورچێکی ڕێگر

لەو دەمەدا، لە شاخی (کوڕەکاژاو)دا، کە لە ناوچەی (سرۆچک) دایە، ورچێک پەیدا دەبێت. ڕێ لە هاتوچۆکەری ئەو دێهاتانە، کە بەردەمیا دەڕۆن، دەبەستێتەوە. چەند کەسێک دەخوات و تێک دەشکێنێت. دێهاتییەکان وایان لێ دێت: ناوێرن سەر لە کون بکەنە دەرەوە. کار و فەرمانیان هەموو پەکی دەکەوێت.

(٣)

### ئەحمەد پاشا لەشکر لە ورچەکە دەکات

کە ئەحمەد پاشا لەم بارە ناهەمووارە ئاگادار دەکرێت، لەشکرێکی چەند سەد سواری بەتۆپ و تفەنگەوە لە خۆی کۆ دەکاتەوە و، ڕوو دەکاتە شاخی (کوڕەکاژاو)، تا ئەو ورچە زەبر بەدەستە لەناو ببات و، ڕێی لادێییەکانیش لەو ورچە ڕزگار بکات.

(٤)

### کاکە حەمە و مارف دێن بۆ یارمەتی

ئەحمەد پاشا دەنووسێت بۆ کاکە حەمە کە بێتە شاخی کوڕە کاژاو، بۆ لای، تا پێکەوە ڕاوی ئەو ورچە بەدکردارە بکەن. کاکە حەمەیش بەخۆی و چەند سوارێکەوە دەچێتە لای ئەحمەد پاشا. بەڵام ڕێ بە(مارف)ی کوڕی نادات کە خۆی بخاتە ئەو جەنگەوە. نەوەک تووشی شتێک بێت و، کوڕەکەی لە دەست بچێت.

بەڵام (شێخ مارف) پیاوێکی مەرد و سەربەرز دەبێت. کە باوکی دەڕوات، شەرم دەکات لە خۆی، کە باوکی بچێتە ئەو ڕاوە و، ئەوی لەگەڵ نەبێت. لە پاش ڕۆیشتنی باوکی، بەتەنیا سوارە ڕوو دەکاتە لەشکری ئەحمەد پاشا.

کە شێخ کاکە حەمەی باوکی دەیبینێت دڵی دادەخورپێت. لە دڵی خۆیدا دەڵێت: «ئای دەستی شکاوم، کوڕەکەم لە دەست چوو». (مارف)یش کوڕێکی زیرەک دەبێت، کە تەماشای دەموچاوی باوکی دەکات، دەزانێت چی بەدڵی دادێت. دەڵێت: «بابەگیان! بم بەخشە، کە نەمتوانی لە ماڵەوە بێنمەوە. حەزم نەکرد، کە تۆ بەتەنیا بێیتە ئەم جەنگەوە. خوایار بێت ڕێم بدەیت؛ سەری خۆم و تۆیش بەرز دەکەمەوە!». باوکیشی گوتی: «هەر ئەوەندەم لە دەست دێت بتدەمە دەست خودا. خودا بەگەورەیی خۆی بتپارێزێت!».

(٥)

مارف دەچێتە وێزەی ورچەکە

(کاکە حەمە) ڕووی کردە (ئەحمەد پاشا) و گوتی: «میرم! تکام وایە بفەرموون کە لە سوارەکانتان تەقە نەکات. وا ورچەکە دەرکەوت. خەریکە دێت. بام (مارف)ی کوڕم بچێتە وێزەی، زۆرانبازی لەگەڵدا بکات! (ئەحمەد پاشا)یش وەرامی دایەوە، گوتی: «باشە. چۆن ئارەزوو دەکەیت، بام وابێت».

لەو کاتەدا ورچەکە هاتە کۆڕی جەنگەوە. (مارف) بۆی چووە پێشەوە. ماوەیەکی زۆر بەزۆران گرتنەوە خەریک بوون. تەواو ماندوو بوون. ئاورەگ (ئارەق)ی ڕەش و شینیان دەردا. بەڵام (مارف) ورەی بەرنەدا. هەر ورچەی هێناوبرد، تا تەواو برستی بڕی.

کاتێکیان زانی (مارف) ورچەکەی دا بەزەویدا و، هەر چوار پەلیشی بەستەوە!...».

(ئەحمەد پاشا) و لەشکرەکەی هەموو، بەدڵخۆشی و سەرسوڕمانێکەوە ئافەرینی (مارف)یان کرد و، پیرۆزبایییان لە خۆی و باوکی کرد. چونکە بووە هۆی ئەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی لەو ورچە ڕزگار کرد.

(ئەحمەد پاشای بابان)یش کە خۆی مەرد و بەچنگ بوو، حەزی لە پیاوی مەرد و بەچنگ زۆر دەکرد. لەسەر ئەو ئازایەتییەی، پاداشتێکی گەورەی بە(شێخ مارف)دا.

## بەرازەکەی شارەزوور

(١)

بەرازێکی درندە

(شارەزوور) دەشتێکی پان و فراوانە لە ناوچەی سلێمانیدا. خاکێکی پڕ پیت و فەڕە. لەسەردەمێکی مێژوویدا شارستانێتییەکی تەواوی تیا پەیدا بووبوو. گوندی (خورماڵ) کە سەردەمێک بنکەی فەرمانداری ئەو خاکە بووە، شارێکی یەجگار گەورە و فراوان بووە. چونکە لەسەرە ڕێی هاتوچۆکەران و کاروانی بازرگانان و، ناوچەیەکی پڕ کشتوکاڵ و، ئاژاڵدار هەڵکەوتبوو.

جا لەم خاکە پڕ ژیانەدا، بەرازێکی دڕندە پەیدا بووبوو، ڕێی بەهەژاران دەگرت و، بەسەدان گیانلەبەران و پیاوانی هەڵدەدڕی، دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی خستبووە ترس و لەرزەوە. پەکی ژیان و هاتوچۆکردن و گوزەرانی خستبوون. لەبەر ئەوە پێویست بوو چارەیەکی بۆ بدۆزرێتەوە و لەناو ببرێت تا ئاسایش و ئارام و خۆشی لەو ناوچەیەدا بکەنەوە دۆخی جاران.

## (٢)

## پاشای بابان چارەی بۆ دەدۆزێتەوە

(ئەحمەد پاشای بابان) کە کارەساتی ئەم بەرازە دڕندەیەی بیستبووەوە، بەراوێژکارەکەی خۆی گوتبوو:

«پەیدابوونی ئەم جۆرە بەرازە لە خاکەکەماندا و، بەربەست کردنی ژین لە کوردەوارییەکەمان بەهۆی ئەوەوە، نابێت لێی بێ دەنگ بین. پێویستە چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە و، لەناوی ببەین. بزانم تۆ چیت بەبیردا دێت؟».

ڕاوێژکارەکەیشی کەمێک لێکی دابووەوە و گوتبووی: «میرم! ئەمە شتێکی ئاسانە. پێویستە ئەم ناوچەیەی ئەو بەرازە هاتوچۆی تێدا دەکات بەلەشکر دەورەی بدەین و، بەرەبەرە بۆی بێینە پێشەوە تا دەیدۆزینەوە. جا لە هەرلایەکدا دەرکەوت دەستڕێژێکی لێ بکەین و، بیکوژین».

ئەحمەد پاشایش گوتبووی:

«ئەمە ڕێوشوێنێکی باشە بۆم دادەنێیت. بەگوێت دەکەم». (پاشا)یش ئەوەی گوتبوو و فەرمانی دابوو:

«بام بۆ سبەینێ چەند سەد سوارێک بەخۆیان و تروتفانی جەنگەوە لەبەر سەرادا ئامادە بن تا لەگەڵ خۆیدا بەرەو گوندی (بێستان سوور) بچن».

## (٣)

## پاشا دەنێرێت بەشوێن کاکە حەمەدا

بۆ سبەینێ (پاشای بابان) بەخۆی و بارەگایەوە دەستی کرد بەجووڵان بۆ لای گوندی (بێستان سوور)، کە لە خاکی شارەزوور دایە. هەر ئەو ڕۆژەی ناردی بەشوێن (شێخ کاکە حەمە)یشدا کە فەرمانبەری خۆی بوو لە ناوچەی (سرۆچک)دا. (کاکە حەمە) ئامۆژگاری (شێخ مارف)ی کوڕی کرد: نەیەت لەگەڵیدا. پێی گوت: «کوڕی خۆم! بەقسەی باوکی خۆت بکە. لەگەڵماندا مەیێ.

(مارف)یش سەری کز کرد و، دەنگی نەکرد تا باوکی ڕۆیشت. کە باوکی ڕۆیشت. خەم و پەژارە دایگرت کە لەو سەربەرزییە بێ بەش بێتەوە: «ئەو بەرازە دڕندەیە بکوژێت و نەتەوەکەی خۆی لە دەستی ڕزگار بکات». دوایی دەماری کوڕێنیی هاتە جۆش و بەبەر خۆیەوە گوتی: «باوکم لە دڵسۆزی و مەردایەتی و ئازایی خۆیەوەیە کە خۆی بەخت دەکات، بۆ ئەمەی ژیانی من بپارێزێت. ئەی من کە کوڕی پیاوێکی وام، چۆن جێگای باوکی خۆم پڕ نەکەمەوە؟!... بەخودا شەرمەزارییە بۆ من، بهێڵم باوکم بچێتە جەنگی بەرازەوە، منیش لە ماڵدا بمێنمەوە بۆ ئەمەی خۆم لە کوشتن بپارێزم. ئەوا ئەو فەرمانی سەرشانی خۆی بەرامبەرم بەجێ هێنا. ئەی من بۆ فەرمانی سەرشانی خۆم بەرامبەری بەجێ نەهێنم؟!... خودا یەکە و

نەبووە بەدوو، هەر دەبێ بۆ ئەم ڕاوە بەرازە بچم!...».

ئیتر هەر ئەوەندە بوو، (شێخ مارف) دەمودەست بەتەنیا سوارە دوای باوکی کەوت. (ئەحمەد پاشا) کاتێکی زانی، لە دوای (شێخ کاکە حەمە)، (شێخ مارف)ی کوڕیشی پەیدا بوو!...

(٤)

مارف دەچێتە جەنگی بەرازەکەوە

کاکە حەمە کە مارفی کوڕی دی، دڵی ڕاچەنی. ترسا لەوەی ئەمجارە کوڕەکەی لە ڕاوە بەرازەکەدا لەناو بچێت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «وا دەستم لە کوڕەکەم شوشت. تاکە باڵێکم هەبوو ئەویش شکا!...». (مارف) کە باوکی خۆی دی بەو جۆرە ڕەنگی گۆڕاوە، زانی بەدڵیدا دێ، لێی چووە پێشەوە، پێی گوت: «بابەگیان! ئەم جارەیش بم بەخشە کە هاتووم. من بەمەیش نەبێت هەر دەمرم. کەواتە پیاو بەسەربەرزییەوە بمرێ باشترە، نەک بەشەرمەزارییەوە. منیش بۆیەکا هاتووم شەرمەزاریم بەسەر نەیێت. بابەگیان دڵنیابە! چونکە لەم کردەوە و کارەی مندا ڕزگاریی هەزاران جووتیار و، ڕێبوار و، خاوەن پیشەوکاری تێدایە، خودام لەگەڵ دەبێت هەر سەردەکەوم. واتا: نامرم، بەرازەکە دەکوژم. دڵنیابە لەوە بابەگیان!... دڵنیابە!...».

(کاکە حەمە)یش کە ئەم نیازە پاکە و دڵە چاکە و ئازایەتییەی لە کوڕەکەی دی هۆشێکی هاتەوە بەرخۆی و گوتی: «بڕۆ، خودات لەگەڵ بێت کوڕی خۆم! بەئارەزووی خۆت بکە. لە خودای گەورە بۆت دەپاڕێمەوە: بەدڵی خۆت سەربکەویت».

(مارف) کە لە دڵی باوکی دڵنیابوو، هێز و گوڕی ئەمەندەیتر بزووتەوە. چووە بەردەم (ئەحمەد پاشا) و بەڕێزێکی بێ ئەندازەوە کڕنووشی بۆ کێشا. ئینجا گوتی: «میرم! ئەگەر ڕێ دەدەیت بەبچووکی خۆت قسەت بۆ بکات، سەرم بەرز دەبێتەوە».

(ئەحمەد پاشا)یش گوتی: «مارف! دەزانم چی بەدڵتا دێت. فەرموو چ دەڵێیت بڵێ!».

(مارف)یش گوتی: «میرم! ئەگەر ڕێ دەدەیت بەبچووکی خۆت، حەز دەکەم من ئەم بەرازە بکوژم. ئەگینا کوشتنی بەرازێک، بەمەندە سوارە و تۆپ و تفەنگە، هیچ هونەرێکی تێدا نییە!...». (پاشا)یش گوتی: «ڕێت دەدەم مارف! ئافەرین بۆ ئازایی و بەجەرگیت».

(٥)

مارف بەرازەکە دەکوژێت

ئیتر هەر ئەوەندە بوو (مارف) لە ئەسپەکەی بازی دایە خوارەوە و، ڕووی کردە بەرازەکە و، بەپیریەوە چوو. پارچە فەرەنجییەکی گرت بەدەستی چەپیەوە و، شیرێکیشی گرت بەدەستی ڕاستییەوە. کە گەیشتە بەرازەکە، بەرازەکە هەڵمەتی بۆ برد. شفرەکەی بۆ (شێخ مارف) ئاراستە کرد. لێی وەشاند. (مارف) پارچە فەرەنجییەکەی دایە بەر. شفرەکە چوو بەپارچە فەرەنجییەکەدا. هەتا بەرازەکە خەریکی دەرهێنانەوەی شفرەکەی بوو، (شێخ مارف) شیرێکی لەهەر چوار پەلی دا پەڕاندنی. بەرازەکە کەوت.

(مارف) بەیدەستی کرد. ئینجا هەڵیگرت و بردیە بەردەم (ئەحمەد پاشا). لەوێدا تۆپی.

هەر کەسێک لەوێ دابوو، لەگەڵ (ئەحمەد پاشا) خۆی دا دەسخۆشییان لە (مارف) کرد و ئافەرینیان کرد. باوکی لە هەموو کەس زۆرتر بەو ئامانجە شادمان بوو.

(ئەحمەد پاشای بابان) پاداشێکی گەورەی بە(مارف) دا لەگەڵ سوپاس و ئافەریندا. (مارف) بەسەربەرزییەوە لەگەڵ باوکیدا لە (ئەحمەد پاشا) جیابووەوە.

## چیرۆکی بزن و مەڕ

(١)

### گفتوگۆی بزن و مەڕێک

بزنێک و مەڕێک دۆست بوون.

بزنەکە چست و چالاک و وریا بوو. بۆ هەموو کاروبارێکی خۆی بیری دەکردەوە و، لێکۆڵینەوەی دەکرد و، مێشک و هێز و توانایی خۆی بەکار دەهێنا.

مەڕەکە بەسەزمان و تەمەڵ و نەزان بوو. بۆ هیچ شتێک مێشک و هێز و توانایی خۆی بەکار نەدەهێنا.

بزنەکە دۆست و دوژمنی خۆی دەناسی و، بیری لە دوارۆژی خۆی دەکردەوە و، بەپێی ڕۆژگار دەجوولایەوە.

مەڕەکە دۆست و دوژمنی خۆی نەدەناسی و، بیری لە دوارۆژی خۆی نەدەکردەوە و، بەپێی ڕۆژگاریش نەدەجوولایەوە.

لەبەر ئەوە بزنەکە توانی خۆی لە دوژمن بپارێزێت و، لە کارەساتی ڕۆژگاریشدا سەربکەوێت.

کەچی مەڕەکە نەیتوانی خۆی بپارێزێت و، پاشەڕۆژیش گورگان خواردوو بوو.

بزنەکە بەمەڕەکەی دۆستی گوت: «من وای بەچاک دەزانم: من و تۆ، بەهەردووکمان، خانوویەک دروست بکەین و، تێیدا بحەوێینەوە، خۆمان لە سەرمای زستان و، گەرمای هاوین و، دوژمنی دڕندە بپارێزین».

مەڕەکەیش وەرامی دایەوە گوتی: «من خۆم بەخانوو و مانووەوە خەریک ناکەم. دووگی خۆم خۆش بێت خانووم بۆچییە؟!».

بزنەکەیش گوتی: «کەواتە من خۆم خانوویەک بۆ خۆم و کارژۆڵەکانم دروست دەکەم».

(٢)

### خانووی بزنەکە

زۆری پێ نەچوو بزنەکە بەسمەکانی بناغەی خانووەکەی خۆی هەڵکەند. بەشاخەکان و ددانە تیژەکانیشی دار و چیلکە و چەوێڵی بڕییەوە و هێنایەوە. بەدەمیش پووش و زەلی بۆ کردەوە و هێنایەوە.

خانوویەکی باشی بۆ خۆی و کارژۆلەکانی دروست کرد. تەنانەت تەندووریشی تیابوو بۆ نان برژاندن. هەموو جارێ کە خۆی و کارژۆلەکانی دەچوونە ناوییەوە دەرگای خانووەکەیان کلیل و کلۆم دەکرد و تێیدا دەحەسانەوە. پێویستە ئەوەیش بلێین کە کارژۆلەکانیشی لە دروستکردنی خانووەکەدا و، کار و فەرمانی ناو خانووەکەدا یارمەتی دایکیان دەدا.

(٣)

## گورگ مەڕەکە دەخوات

شەوێکیان لە زستاندا بوو بەتۆف و باران و، تەواو ساردی کرد. مەڕەکە ئەوەندەی نەمابوو لە سەرماندا زیرە بکات. لەتاو سەرما چووە لای بزنەکەی دۆستی و لێی پاڕایەوە، گوتی: «خوشکێ! ئەوەندەی نەماوە سەرما بمکوژێت. لە ڕێی خودادا جێگای شان و سەرم بکەرەوە. بام ئیمشەو ڕەق نەبمەوە».

بزنەکەیش گوتی: «چەندم پێ گوتیت: بام خانوویەکی گەورە پێکەوە دروست بکەین، هەردووکمان و خێزانمان، تێیدا بحەوێینەوە؟... بۆ بەقسەت نەکردم. ئەمە شەوەکەیە کە پێم گوتیت: «لێت دەقەومێت». ئێستاکەیش خانووەکەمان هەر بەشی خۆمان دەکات. بەلام قەی ناکات: جێگای سەرت دەکەینەوە».

مەڕەکە جێگای سەری بووەوە و نوست. بەلام شەو، ئاگای لە خۆی نەبووبوو. گورگێک هاتبووە سەری، هەموو لەشی خواردبوو بەدووگەکەیەوە. هەر پێست و ڕیخۆلەکەی هێشتبووەوە!

بەم جۆرە مەڕەکە لەبەر بێ هۆش و گۆشیی خۆی و، تەمەلی و کورتبینی خۆی، خۆی گورگان خواردوو کرد.

(٤)

## کارژۆلەکان

بزنەکە چوار کارژۆلەی هەبوو. دوانیان نێر بوون. دوانیان مێ بوون. (شەن گوڵ) و (تیتیل) کارژۆلەی نێر بوون، (مەن گوڵ) و (تیبیل) کارژۆلەی مێ بوون.

ڕۆژێکیان بزنەکە چووە دەرەوە. بەکارژۆلەکانی گوت: «کە ڕۆیشتم دەرگا لە خۆتان قایم بکەن. نەکەن بچنە دەرەوە. نەکەن دەرگا لە دوژمنە دڕندەکانمان بکەنەوە. ئەگینا ئێوە کز و بێ دەسەلاتن، دەتانخۆن. وا من دەچم گیا دەخۆم و، گوانمتان بۆ پڕ دەکەم لە شیر، تا نەهێلم بەبرسێتیەوە بمێننەوە».

کارژۆلەکانیش گوتیان: «باشە، دایە، تۆ چی دەفەرموویت وا دەکەین».

(٥)

## گورگێک چاو دەبڕێتە کارژۆلەکان

گورگێکی دڕندە لە گەڕەکەکەیاندا بوو. چاوی بڕیبووە کارژۆلەکان، هەلێکی بۆ هەلبکەوێ و بیانخوات. جا کە دی بزنەکەی دایکیان چووە دەرەوە بۆ لەوەڕ، بەهەلی زانی، لە پاش تاوێک هاتە سەریان، لە دەرگای دا و، گوتی: «تیتیلە و بیبیلەی دایە! دەرگا بکەنەوە لە دایە. شیرم لە بن گواندایە.

گیام لە بن ددانداپە».

کە کارژۆڵەکان لە کونی دەرگاکەوە سەیریان کرد، زانییان گورگە. دەرگاکەیان لێ نەکردەوە. پێیان گوت: «دایکی ئێمە رەنگی شینە. رەنگی تۆ زەردە. دایکی ئێمە ریشی هەیە. تۆ ریشت نییە. برۆ دەرگات لێ ناکەینەوە».

ئینجا گورگەکە چوو خۆی لە قوڕەشین هەڵکێشا و، ردێنێکیشی بۆ خۆ دروست کرد و، هاتەوە سەریان گوتی: «شەن گوڵ و مەنگوڵی خۆشەویستم! دەرگا لە دایکی خۆتان بکەنەوە. ماندوێتی کاری لێ کردووم».

شەن گوڵ و مەن گوڵیش وەرامیان دایەوە گوتیان: «دایکی ئێمە رەشە. دەرگات لێ ناکەینەوە».

ئینجا گورگەکە چوو، خۆی لە قوڕەڕەش هەڵسوو، هاتەوە سەریان. لە دەرگای دایەوە گوتی: «کارژۆڵەکانی دایە! دەرگا بکەنەوە لە دایە. شیرم لە بن گواندایە. گیام لە بن ددانداپە».

کارژۆڵەکانیش پێیان گوت: «برۆ دەرگات لێ ناکەینەوە. دایکی ئێمە سپییە».

ئینجا گورگەکە چوو، خۆ لە قسڵەوە دا و هاتەوە سەریان گوتی: «کارژۆڵە خۆشەویستەکان! دەرگام لێ بکەنەوە. شیرم هێناوە بۆتان».

شەن گوڵیش وەرامی دایەوە گوتی: «دەستتم پێشان بدە. بزانم چنگە یان سم».

کە گورگەکە دەستی لە کونی دەرگاکەوە بردە ناوەوە و، پێشانی دا. شەن گوڵ گوتی: «ئینجا من بەتەواوەتی بۆم دەرکەوت کە تۆ چنگت هەیە و گورگیت. دوژمنی رەگەزی ئێمەیت. بۆیەکا دەتەوێ چەواشەمان بکەیت و بمانخۆیت.

برۆ هەی زۆرداری نەگریس! دەرگات لێ ناکەینەوە».

(٦)

گورگەکە پەلاماریان دەدات

کە گورگەکە زانی هیچ فروفێڵێکی سەری نەگرت و ناسرا، قینی هەڵسا پەلاماری دەرگاکەی دا و، شکاندی، چووە ژوورەوە. (تیتیل) و (بیبیل)ی گرت و خواردنی. بەڵام (شەن گوڵ) و (مەن گوڵ)ی بۆ نەگیرا. چونکە ئەوان خۆیان لە گوڵبێنەی تەندوورەکەدا شاردبووەوە. گورگەکە وای زانی خۆیان دەرباز کردووە. لەبەر ئەوە پێی نەکرا بیانخوات. کە کەتنەکەی کرد چووەوە بۆ خانووەکەی خۆی بیری لەوە دەکردەوە، لە دەرفەتێکدا دوو کارژۆڵەکەی تریش پەلامار بدات و بیانخوات!

(٧)

کە بزنەکە هاتەوە

کە بزنەکە هاتەوە، لە رێدا دڵی خۆش بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەر ئێستا کە چوومەوە، کارژۆڵەکانم دێن بەپیرمەوە، دەرگاکەم بەخۆشییەوە لێ دەکەنەوە. منیش تێروپڕ شیریان دەدەمێ و گەمە و یارییان لەگەڵدا دەکەم».

کەچی کە هاتەوە: دەرگا شکابوو. ماڵ چۆڵ و هۆڵ بوو. کەلوپەلی ناو ماڵ تێک چووبوو. لە تاو ژانی دڵی خۆی باراندی و دەستی کرد بەشین و شەپۆڕ. وا تێگەیشت کە هەموو کارژۆڵەکانی خوراون و لە ناوچوون. لەگەڵ ئەوەیشدا یەک یەک بانگی کردن. کە (شەن گوڵ و مەن گوڵ) دەنگی دایکیان بیست، خۆشی خۆشییان پێ کەوت. وەرامیان دایەوە گوتیان: «دایەگیان! ئەوا هاتین». هەردووکیان لە گوڵبێنەی تەندوورەکە هاتنە دەرەوە و، کەینەوبەینەکەیان هەر لەسەرەوە هەتا خوارەوە بۆ دایکیان گێڕایەوە.

هەرچەندە بزنەکە دوو کارژۆڵەی خۆشەویستی لە دەست چووبوو، بەلام دووانیان ماون و نەخوراون، سروەیەکی خۆشی کەوتە دڵیەوە. لە دڵی خۆیدا سوپاسی خودای کرد و گوتی: «بۆ گەورەیەکی وەک خودا چییە ئەو دوو کارژۆڵە نازدارەی تریشم بداتەوە!».

ئینجا بەدڵنیاییەکەوە شیری دا بە(شەن گوڵ) و (مەن گوڵ) و هەر لەو کاتەیشدا بڕیاری دا: تۆڵەی خۆی لە زۆرداری ناکەس بەچە بکاتەوە.

(٨)

بزنەکە چووە سەربانی مام ڕێوی

بزنەکە چووە سەربانی ماڵی مام ڕێوی و، دەستی کرد بەتەپە تەپکردن. ڕێوی گوتی: «ئەوە کێیە تەپە تەپ دەکا؟. کاسە و کەوچکم پڕ لە خۆڵ دەکا؟. میوانم شەرمەزار دەکات؟».

بزنیش گوتی: «ئەوە منم من منۆکە. دوو چاوم پێوەیە بزبزۆکە. دوو شاخم پێوەیە ڕوم ڕمۆکە. کێ خواردوێتی تیتی من؟... کێ خواردوێتی بیبی من؟... بێتە شەڕە جەنگی من!».

مام ڕێویش گوتی: «نەم خواردووە تیتی تۆ. نەم خواردووە بیبی تۆ. نایەمە شەڕی جەنگی تۆ».

(٩)

بزنەکە چووە سەربانی مام گورگ

ئینجا بزنەکە لە سەربانی مام ڕێوی هاتە خوارێ و، چوو بۆ سەربانی مام گورگ. دەستی کرد بەتەپە تەپکردن. مام گورگ گوتی: «ئەوە کێیە تەپە تەپ دەکات؟... کاسە و کەوچکم پڕ لە خۆڵ دەکات؟... میوانم شەرمەزار دەکات؟...».

بزنەکەیش وەرامی دایەوە گوتی: «ئەوە منم منۆکە. دوو چاوم هەیە بزبزۆکە. دوو شاخ پێوەیە ڕم ڕمۆکە. کێ خواردوێتی تیتی من؟... کێ خواردوێتی بیبی من؟... بێتە شەڕە جەنگی من!...».

مام گورگیش گوتی: «من خواردوومە تیتی تۆ. من خواردوومە بیبی تۆ. دێمە شەڕە جەنگی تۆ!».

کاتی کە مام گورگ هاتە دەرەوە و لەگەڵ بزندا کەوتنە گڕ و گەفەوە و، دەنگە دەنگیان کەوتەبەر گوێی دراوسێ و کەسوکاریان؛ ئەوان هاتنە ناوبژییان و، خستیانە مێشکی هەردووکیانەوە، کە بچنە لای (دادگەر)، کێشەکەیان ببڕێنێتەوە، لەو شەڕ و شۆڕ و قیژە و هەرایە چاکترە. ئەمانیش، هەردووکیان، وازیان لە شەڕ هێنا خۆیا ئامادە کرد بچنە لای (دادگەر) ناوبژییان بکات.

## (١٠)

### هەردووکیان دەچنە لای دادگەر

بزنەکە لە شیرەکەی خۆی جامێ ماستی ناوازەی ئامادە کرد و، بردی، بۆ دادگەرەکەی پێشکەش بکات.

گورگەکەیش هەمانەیەکی پڕ کرد لە بای خۆی و، دوو دەنک نۆکی تێ خست و، بردی بۆ دادگەرەکە. پێی گوت: «ئەمە تووتنی شاوورە. بۆنی خۆشم پێوە کردووە. هەر شایستەی خۆتە!».

کە دادگەر هەمانەکەی کردەوە، بایەکەی دەرپەڕی. هەردوو دەنکە نۆکەکانیشی لێ دەرپەڕین. دایان لە چاوی دادگەر. چاویان بریندار کرد و کوێر بوو.

کە بزنەکە بەوەی زانی گوتی بەدادگەر: «گەورەم! مام گورگ مەبەستی لەم کەتنەی ئەوە بوو بتکوژێت. نەوەک تۆڵەی منی لێ بکەیتەوە. تۆزێک لە ماستەکەی من، کە بۆم هێناویت بەدیاری، لە چاوەکانتی بدە، چاک دەبنەوە». دادگەرەکە بەقسەی بزنەکەی کرد. کە ماستەکەی لە چاوی دا، ئەوەندەی پێ نەچوو هەردوو چاوی چاک بوونەوە.

## (١١)

### دادگەرەکە تۆڵە لە گورگەکە دەکاتەوە.

دادگەرەکە، کە لە سکالای بزنەکە و، قسەکانی کارژۆڵەکان و، واتەی گورگەکە و، کردەوەکانی کۆن و نوێی گورگەکە و ڕەگەزەکەی گورگەکە سەرنجی دا و لێکۆڵینەوەی کرد، بڕیاری کوشتنی گورگەکەی دا.

بەڵام لە شێوەیەکی وا هونەرمەندانەدا بڕیارەکەی خۆی بردە سەر، کە هەموو کەس سەریان سوڕما و دڵخۆش بوون و پێکەنین.

دادگەرەکە، هێنای: لە بەردەم دانیشتوانی گەڕەکەکەدا دوو شاخی لۆکەی بۆ مام گورگ دروست کرد و، لە کەللەی قایم کرد. دوو شاخی نووک تیژی ئاسنیشی بۆ بزنەکە دروست کرد و، لە شاخەکانی هەڵکێشان.

ئینجا گوتی: «دەی! بجەنگن!».

لە پێشدا مام گورگ کەش و فش و، خۆ نواندن و، گڕوگەف و، هەڕەشە و گوڕەشەیەکی زۆری لە بزنەکە کرد. بەڵام بزنەکە، کە زۆر لێ کراو و، داخ لەدڵ و، خاوەن تۆڵە بوو، هەر ئەوەندەی پێ گوت: «فڕوفێڵی تۆ کار لە من ناکات. ئەمڕۆ ڕۆژی (داد) سەرکەوتنە. چونکە خوداپشتی زۆردار دەشکێنێت و، پشتی زۆر لێ کراو دەگرێت. بەو خوایەی کە خودایە، بڕیارێکە و داومە، تا ورگ و جەرگ و هەناوت لەت لەت نەکەم و، (تیتیل) و (بیبیل) لە ورگت نەهێنمە دەرەوە وازت لێ ناهێنم!».

لە ڕاستدا گورگەکە هەرچەندە لە داروباردا بەچنگتر و بەهێزتر بوو لە بزنەکە، بەڵام چونکە (ماف) بەلای بزنەکەوە بوو، چونکە دادگەر و دانیشتوانی گەڕەکەکە خۆشەویستییان بەرامبەر بزنەکە پێشان دە..
و، بەزەییان بەودا دەهاتەوە، ترس و لەرز چوو بوونە دڵیەوە... تا دەهات بڕستی دەبڕا و،

هەروەها پەیی بەوەیش بردبوو: ئەگەر بزنەکەیش نەیکوژێت ئەوان هەر دیکوژن. لەبەر ئەوە هەر ئەوەندە یەک دوو جارێ ئەو و بزنەکە پەلاماری یەکتریان دا و، شۆقیان لە یەک هەڵدا، گێژ بوو. لەو کاتەدا بزنەکە بەهەلی زانی، شۆقێکی یەجگار توندی لە ورگی هەڵدا، ورگی دڕی و، جەرگ و هەناویشی لەت و پەت کرد. گورگەکە تۆپی!.

تەماشاکەران ئەم ئەنجامەیان یەجگار پێ خۆش بوو. بەتایبەتی کە سەرنجیان دا ئەوا هەردوو کارژۆڵەکە: (تیتیل) و (بیبیل)، لە ورگی گورگەکە هاتنە دەرەوە و، ئاوێتەی دایکە بزنەی خۆیان بوون و، دەستیان کرد بەشیر خواردن!. بزنەکە ئەوەندەی نەمابوو لە خۆشیاندا گەشکەداربێ. دانیشتوانی ئاواییەکە، هەموو، چەپڵەیان بۆ لێدا.

(شەن گوڵ) و (مەن گوڵ)یش یەجگار شادمان بوون بەوەی کە (کاکە تیتیل)[1] و (دادە بیبیل)ی خۆشەویستیان بێ وەی بۆ دۆزرایەوە. ئەوانیش بەشی خۆیان دەستخۆشی و ئافەرینیان لە دایکیان کرد و، بەشی خۆیان شیریان لە گوانی مژی...

هەر مەپرسە دانیشتوانی ئاواییەکەیش چەند دڵخۆش و شادمان بوون بەم (دادپەروەری)یەی کە (دادگەر) نواندی. لە خۆشیاندا دەستیان کرد بەبەزموڕەزم و ڕەشبەڵەک و هەڵپەڕین.

## گەورەی دادپەروەر

### (١)

### کەریم خانی زەند

شێرکۆ بەباوکی گوت: «بابە! حەز دەکەم باسی کەریم خانی زەندم بۆ بکەیت».

باوکیشی گوتی: «کەریم خان شاهێکی گەورەی کورد بووە. یەجگار گەورە و، یەجگار دادپەروەر بووە. لە سەدەی هەژدەهەمدا ژیاوە. بیست و هەشت ساڵی خشت شاهێتی بەسەر خاکی هەموو ئێران و بەشێکی گەورەی کوردستاندا کردووە. کە مرد نەتەوەکانی ژێردەستی بۆی گریان. چونکە گەورەیەکی دادپەروەر و، باوکێکی دڵسۆز و، کردەوە شیرینیان لە دەست چوو. کە بەدرێژایی تەمەنی ئەو خاکانەی لەژێر دەستی دابوون شاهی وا دادپەروەر و گەورەیان بەخۆیانەوە نەدیبوو».

ئینجا شێرکۆ لە باوکی پرسی:

«بابە! کەریم خان چۆن بوو بەشاهی ئێران و بەشێکی گەورەی کوردستان؟».

باوکیشی گوتی: «کەریم خانی زەند، لەتاو زۆروستەم و ئاژاوە و پشێوی ناو ئێران و کوردستان دەستی دایە شۆڕشەکەی خۆی. هەشت ساڵی خشتی پێوە خەریک بوو، ئینجا ئێران و کوردستانی لە دەست دوژمنانی نەتەوەکانی ئێران و کوردستان پاک کردەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەمەندە پیاوێکی گیان سووک و مەند و زرنگ بوو، بەساکاری دەژیا، نەیدەویست پێی بڵێن: «شاه». دەیگوت پێم بڵێن: (جێ نوشینی گەل)».

---

(١) ڕاستتر: دادەتیتیل.

(٢)

## کردەوەکانی کەریم خان

ئینجا شێرکۆ لە باوکی پرسی:

«بابە! کردەوە و کاری کەریم خان چۆن بوون؟».

باوکیشی گوتی: «(کەریم خان) پشتیوانی هەژار و داماو و لێ قەوماو بوو. دۆستی زانا و وێژەوان و هونەرمەندان بوو. باری جووتیارانی سووک کرد. گەلێک باجی لەسەر لابردن. گەلێک باجی بۆ کەم کردنەوە. یارمەتی بازرگانانی دا و، کاری بازرگانیشی بۆ ئاسان کردن. کشتوکاڵی پەرەپێدا. خوێندەواری لە سەردەمی ئەودا گەشەی کرد. کەچی لەگەڵ ئەمەیشدا خۆی کورە سەرەک هۆزێک بوو. تا ما بەنەخوێندەواری مایەوە!».

شێرکۆ گوتی: «بابە! کەریم خان لە چ هۆزێک بوو؟».

باوکیشی گوتی: «لە تیرەی (لەک) بوو کە بەشێکن لە هۆزی بەختیاری».

شێرکۆ گوتی: «بابە! پایتەختی فەرمانڕەواییەکەی کەریم خان ناوی چی بوو؟».

باوکیشی گوتی: «ناوی (شیراز) بوو».

شێرکۆ پرسی: «ئەی ناوی فەرمانڕەواییەکەی چی بوو؟».

باوکیشی گوتی: «فەرمانڕەوایی زەند».

(٣)

## سەر گوروشتەکانی کەریم خان

شێرکۆ لە باوکی پرسی: «بابە! لە بابەت کەریم خانی زەندەوە هیچ چیرۆکێکت نەبیستووە بۆم بگێڕیتەوە؟».

باوکیشی گوتی: «با بیستوومە. گوێ بگرە سێ چیرۆکت بۆ بگێڕمەوە:

یەکەم: چیرۆکی (بازرگانی سامان دزراو).

دووەم: چیرۆکی (دەروێشی بێ خانوو).

سێیەم: چیرۆکی (کرێکاری هەژار).

(٤)

## بازرگانی سامان دزراو

باوکی شێرکۆ گوتی: «کەریم خانی زەند، خووی وا گرتبوو؛ هەموو رۆژێک چەند کاتێک؛ گوێی لە داد و سکاڵای نەتەوەکەی خۆی دەگرت. رۆژێکیان بەماندوێتییەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. لە چەقی رێگادا

بازرگانێکی پێ دەگات. هاواری بۆ دەهێنێت. دەڵێت: «شاهم!... داد!... لە ڕێی خودادا بگەرە فریام. هەرچیم هەبوو دز بردویتی. تۆ بۆم نەسێنیتەوە کەس ناتوانێت بۆم بسێنێتەوە. خودام هەیە و تۆ».
(کەریم خان)یش پێی دەڵێت: «بۆ چ نوستیت و، ئاگات لە کەلوپەلی خۆت نەبوو، هێلات بیدزن؟ بازرگانەکانەش دەڵێت: «وام زانی تۆ ئاگاداریت!؟...».
(کەریم خان) بەوەرامی بازرگانەکە دڵخۆش دەبێت و، پێ دەکەنێت. فەرمان دەدات بەکاربەدەستەکەی ژێر دەستی خۆی، دەڵێت: «هەرچی لێ دزراوە، لە گەنجینەی فەرمانڕەوایی بیدەنەوە و، کۆشیش بکەن؛ سامانە دزراوەکە، بەدزەکەوە بدۆزنەوە!».

(٥)

دەرویشی بێ خانوو

شێرکۆ گوتی: «بابە! سوپاست دەکەم. چیرۆکەکەت خۆش بوو. دەفەرموو چیرۆکی (دەرویشی بێ خانوو)یشم بۆ بکە».
باوکیشی گوتی: «جارێکیان کەریم خان فەرمان دەدات؛ چەند خانوویەک بۆ ئاوارەکان و دەرویشەکان لە کەنار شار دروست بکەن. لەو کاتەدا دەرویشێک دێتە لای و پێی دەڵێت: «شاهم! منیش هەژار و پەرێشانم. لە گەورەیی خۆت بێ بەشم مەفەرموو. تکا دەکەم بفەرموو ژوورێکیش بۆ من دروست بکەن».
(کەریم خان)یش فەرمانی دا: «ژوورێکی بۆ دروست بکەن». کاربەدەستێکی کەریم خانیش لەوێ دابوو، ڕاست بووەوە و، پێی گوت: «شاهی خۆم! ئەم دەرویشە بەنگ کێشە. مەیش دەخواتەوە. بۆچی فەرمووت ژووری بۆ دروست بکەن؟».
کەریم خانیش گوتی: «کەواتە بنووسە بام مانگانەیشی بۆ ببڕێتەوە، بەڵکو واز لەو بەزمانەیش بهێنێت!؟...».
زۆری پێ نەچوو، دەرویشەکە، ژووریشی وەرگرت و، مانگانەیشی وەرگرت و، بەشادمانییەوە ژیا. سەیر ئەوە بوو لە بەزمی بەنگ کێشان و مەی خواردنەوەیش وازی هێنا!».

(٦)

کرێکاری هەژار

شێرکۆ گوتی: «سوپاست دەکەم بابەگیان. ئەم چیرۆکەیشتان خۆش و سەیر بوو. فەرموو چیرۆکی سێهەمیشم بۆ بگێڕەوە».
باوکیشی گوتی: «لە کاتێکدا کەریم خانی زەند بەسەر ئەو کرێکار و وەستایانە وەستابوو. کە مزگەوتێکیان لە شاری (شیراز)دا بۆ دروست دەکرد، داوای لە پیاوەکەی کرد؛ قلیانێکی بۆ تێ کرد. کە چاوی هەڵبڕی؛ کرێکارێکی ڕووت و قووتی دی، سەری هەڵبڕییە ئاسمان و، ورتە ورتێکی بەلێوی کرد و، بەتەماشاکردنێکی سەرسوڕمانیشەوە تەماشای کەریم خانی کرد! کەریم خانیش بانگی کرێکارەکەی کرد و لێی پرسی: «ئەوە چیت گوت؟».

کابرایش گوتی: «گوتم: خودایە! تۆ ناوت (کەریم)ە و، ئەم شاهەنشاهەیش کە هەر وەکو من بەندەیەکی تۆیە، هەر ناوی (کەریم)ە و، منیش کە هەر لە بەیانییەوە ئەچەوسێمەوە بۆ ئەو و، بەبەر ئەم هەتاوە گەرمەو فەرمان ئەکەم بۆ ئەو تا ئێواری، بەمزێکی کەم هەر ناوم (کەریم)ە. لە کاتێکدا کە شاهەنشاە پەنجەیەکی کێشا و، پیاوێکی شەنگ و شۆخ ئەو قلیانە زێڕینەی بۆ هێنا، کە بەبەردی نرخدار و گەوهەر رازێنراوەتەوە، قومی لێ بدا و پێی بحەسێتەوە، منی هەژار و بەسەزمانیش کە بۆ قومێک سەبیل گیانم دەچوو، ناتوانم بەسەبیلە قوڕینەکەی خۆیشم قومێک بکێشم. ئەی خودا سەرم سوڕماوە لەم جیاوازییە، لە ناوەند ئەم سێ (کەریم)ەدا!...».

(کەریم خان)یش بەزەیی بەکابرادا هاتەوە دەمودەست قلیانە زێڕینە گەوهەر بەندەکەی خۆی بەزەردەخەنەیەکەوە پێ بەخشی. ئینجا پێی گوت: «ئەم قلیانە نرخی گرانە. وریابە بەهەرزان لێتی نەکڕن!» جا وەک دەگێڕنەوە: کابرا بەنرخی ئەو قلیانە بوو بەخاوەن کار و پیشە و، جێگا و ڕێگا و، گەلێکیش دەوڵەمەند بوو و، بەخۆشیشەوە ژیا!».

(٧)

واتای دادپەروەری

کە باوکی شێرکۆ ئەم زانیاری و چیرۆکانەی بۆ شێرکۆ گێڕایەوە، شێرکۆ دڵی زۆر خۆش بوو، گوتی: «بابەگیان! سوپاسێکی زۆرتان پێشکەش دەکەم. هەروەکو دڵمتان دامرکاندەوە، داخاوێکی مێشکیشمتان دایەوە. خۆزگە واتای دادپەروەریشتان بۆ لێک بدامایەوە».

باوکیشی وەرامی دایەوە گوتی: «دادپەروەری ئەوەتا: هەرکەسە مافی خۆی بدەیتێ. نەهێڵێت کەس مافی کەس داگیر بکات. مافی هەمووانیش بپارێزێت. جا هەر دادگەر و کاربەدەستێک، هەر دەسەلاتدارێک، هەر سەرکردە و سەردارێک، هەر شاە و میر و فەرماندارێک، هەر گەورە و سەرکۆمارێک، ئەو فەرمانەی بەجێ هێنا، پێی دەڵێن: (دادپەروەر). ئەگەر بەجێی نەهێنا پێی دەڵێن: (زۆردار). هەر فەرمانڕەواییەکیش (دادپەروەر) نەبێت، تێک دەچێت و، لەناو دەچێت و، دەڕووخێت. هەر فەرمانڕەواییەکیش (دادپەروەری) بەجێ بهێنێت، دەمێنێت و، پایەدار دەبێت و، گەشە دەکات و پێش دەکەوێت».

شێرکۆ لە باوکی پرسی: «بابەگیان! کێی تر هەیە لە مێژووی کورد و کوردستاندا بە(دادپەروەری)یەوە ناوی دەرکردبێت؟».

باوکیشی وەرامی دایەوە، گوتی: «(سەلاحەدینی ئەیوبی)یش وەک (کەریم خانی زەند) دادپەروەر بووە».

شێرکۆ گوتی: «ئەی لە مێژووی عەرەبەکاندا کێ و کێ هەن لە خونکاران، دادپەروەر بووبن؟».

باوکیشی گوتی: «عومەری خەتتاب و، عومەری عەبدولعەزیز».

شێرکۆ گوتی: «ئەی لە تورکەکان و فارسەکان و هیندییەکان، کێ و کێیان دادپەروەرییان نواندووە؟».

باوکیشی گوتی: «له فەرمانداره تورکەکان (مەدحەت پاشا)، له شاهەکانی ئێران؛ (نەوشیروان)، له کاربەدەستانی هیندستانیش؛ (غاندی)، دادپەروەرییان نواندووه». ئینجا شێرکۆ گوتی: «ئەی بابە! پێغەمبەرەکان له کردەوه و کاریاندا، دادپەروەر نەبوون؟».

باوکیشی گوتی: «بەڵێ هەموویان دادپەروەر بوون و، دادپەروەریشیان نە هەموو کردەوه و کارێکیاندا نواندووه. بۆ نموونه (محەمەد) و (عیسا) و (مووسا) و (زەردەشت) و (نووح) و (ئیبراهیم) و (یوسف) دەهێنینەوه، کە هەموویان دادپەروەر بوون و، هەموویشیان له کردەوه و کاریاندا دادپەروەرییان بەکارهێناوه».

ئینجا شێرکۆ پڕ بەدڵ سوپاسی باوکی کرد و، کەوتەوه بیرکردنەوه: پرسی تری لێ بکاتەوه، تا له (دادپەروەری)دا شارەزاتر ببێت.

(٨)

چۆن دەتوانین ببینه دادپەروەر؟

شێرکۆ پرسی: «ئەی بابە! ئێمە مافمان نییە ببینه دادپەروەر؟».

باوکیشی گوتی: «بەڵێ هەموومان مافمان هەیە ببینه دادپەروەر. بەڵکو پێویستە هەموومان دادپەروەر بین. ئەگینا له ژیانماندا سەرناکەوین».

شێرکۆ پرسی: «کەواته چۆن دەتوانین ببینه دادپەروەر؟».

باوکیشی گوتی: «بۆ ئەمەی بتوانین ببینه دادپەروەر، پێویستە شارەزای مافی خۆمان و، مافی کەسانی تر و، مافی گشتی ببین.

ئینجا مافی خۆمان و، مافی کەسانی تر و، مافی گشتیش بپارێزین».

شێرکۆ پرسی:

ئاخۆ بابە! دادپەروەری له هەموو کەس دەوەشێتەوه؟».

باوکیشی گوتی: «تەنیا لەو کەسانه دەوەشێتەوه کە شارەزای مافەکانی خۆیان و کەسانی تر و گشتی بن و، دڵی پاک و دەروونی چاک و هۆشی تەواویش بەکاربهێنن، لەگەڵ چاکەخوازیدا».

شێرکۆ گوتی: «ئەی چۆن هەست بەخۆمان دەکەین: دادپەروەریمان نواندووه، یان زۆرداریمان کردووه؟».

باوکیشی گوتی: «ئەو کردەوەیەی لەگەڵ کەسێکی تردا دەینوێنیت، له خۆت بپرسه: ئەگەر لەگەڵ خۆتدا بینوێنن پێت خۆشه؟ تۆ حەز دەکەیت بتکوژن؟ نەء. کەواته کەس مەکوژه. تۆ حەز دەکەیت درۆت لەگەڵدا بکەن؟ نەء. کەواته درۆ لەگەڵ کەسدا مەکە».

ئینجا شێرکۆ دەستی باوکی ماچ کرد و، سوپاسیشی کرد و، بەڵێنیشی دایە: هەتا هەیە (دادپەروەر) بێت».

فەرهەنگۆک بۆ منداڵان و مامۆستایان و دایک و باوکان

| وشەی کوردی | وشەی عەرەبی |
| --- | --- |
| دادپەروەری | العدالة |
| زۆرداری | الظلم |
| داگیرکەری | الاستعمار |
| کۆنەپەرستی | الرجعية |
| هاوبەشی | الاشتراكية |
| پێشکەوتنخوازی | التقدمية |
| مرۆڤ دۆستی | الانسانية |
| خەباتکاران | المناضلون |
| مانگی نەورۆز | شهر آذار |
| مانگی ئاودار | شهر آذار |
| کۆکرە | المؤتمر |
| ژیانی هەرەوەزی | الحياة التعاونية |
| سەرکردەیی، پێشڕەوی، پێشەوایی | القيادة، الامامة، الزعامة |
| هاوکاری | التضامن |
| ڕەنگرێژکردن | التخطيط |
| ئەندازیار | المهندس |
| چشتیر | اصطبل الدواب |
| خوێندنگا | المدرسة |
| نووسراوخانە | المكتبة |
| گەرماو | الحمام |
| پێشا | و المرحاض |
| میناپەند | بيت زجاجي |
| پەرندە | الطيور |
| فەرمانداریی خۆیی کوردستان | الحكم الذاتي في كردستان |
| پرۆژە | المشروع |
| نەهێشتنی نەخوێندەواری | محو الامية |
| | |
| وانا | الدرس |
| پاداش دانەوە | المكافأة |

| | |
|---|---|
| کەش | الطقس |
| ڕۆژەکەی تووشە | یوم عاصف |
| جەربەزەیی | المجازفة |
| ئاورەگ (ئارەق) | العرق (عرق الجسم) |
| هەرێم | المنطقة |
| دۆخی جاران | الوضع السابق، الحالة السابقة |
| کروکەف | التبجح مع التهديد |
| دادگەر | القاضي، الحاكم (العدلي) |
| شاگرد | تلميذ |

## شیعر بۆ منداڵان

### کۆتر و بێچووەکانی

لە نامیلکەی (خانووی تازە)دا کە لە ۱۹۳۳دا لە چاپخانەی (ژیان) بەچاپی گەیاندووە، لە کۆتاییەکەیدا ئەم شیعرەی بۆ منداڵان بڵاوکردۆتەوە، جا چونکە بابەتەکە هەر بۆ منالآنە؛ بۆیە لەناو کۆمەڵە شیعرەکانیدا دامان نەنا، وا لێرەدا پێشکەشی دەکەین:

کۆتر و بێچووەکانی

ڕۆژێ کۆترێک بەبێچووەکانی؛
ئەووت: «مەچنەدەر منالەکانم»
لە هێلانەدا بەبێچووەکانی
ئەووت: «مەچنەدەر منالەکانم»

*

بەلام لاساربوون، گالتەیان پێ کرد
نەترسان لەوەی تووشی داوی بن
لە لانە دەرچوون، چوونە دەشت و دەر
نەترسان لەوەی تووشی داوێ بن

*

زۆری پێ نەچوو ڕێویەکیان تووش بوو
بێچووەکانی گرت، یەک یەک خواردنی
چونکی کەس نەبوو لەو دەوروپشتە
بێچووەکانی گرت، یەک یەک هواردنی

*

ئەوی لاساربوون وایان بەسەرهات
چونکی بێگوێیی قسەی دایکیان کرد
بێچووەکان، بۆیە وایان بەسەرهات
چونکی بێ گوێیی قسەی دایکیان کرد[1]

## ژینی تایبەتی

لە گۆڤاری (بەیان)ەوە، ژمارە (١٧)ی ئەیلولی ١٩٧٤ - ٢٦٧٤ کوردی ل ٢٠ - ٢٣.

١- **خانوو:**

١- هەر خانوویەک، پشتی لە رەشەبا بێ و رووی لە رۆژ بێ و لە پەنجەرە و دەرگاکانیەوە تێروپڕ بای پاک و تیشکی رۆژ بێتە ژوورەوە و، دووربێ لە جروجانەوەر و قاوروقیژ و تەپوتۆز و مێشومەگەز و شتێی تر، ئەو خانووە بۆ ژیان و گوزەرانی مرۆڤ بەکەڵکە.

٢- خانوو چەند باش دروست کرابێ و چەند باش رێک خرابێ و چەند رازێنرابێتەوە ئەوەندە ژیان و گوزەرانی تیا خۆش دەبێ.

٣- بۆ رۆژی ئیمرۆ خانوو چەند ساکار و چەند خنجیلانە و جوانکیلانە و کەم ئەرک بێ، بۆ کەیبانوو ئەمەندە پەسەندە.

٤- بەکورتی ئەبێ خانووەکە وابێ کە ئەو خێزانەی تیا دەژی بەتەواوی سرەوت و ئارام و دڵخۆشی خۆی تیا دەست بکەوێ.

٥- جا منالی پەسەند ئەو منالەیە کە لە ئەرکی راگرتنی خانووەکەی مالی باوکیا بەپاکی و رێکوپێکی و جوانی و رازاوەییەوە، یارمەتیی دایک و باوکی خۆی بدات. تا دلی دایک و باوکی خۆی شاد بکات و فەرمانی سەرشانی خۆیشی وەک ئەندامێکی خێزانەکەی خۆی بەجێ بهێنێ.

٢- باخچەی ماڵ

خێزان تا پێی ئەکرێ، باخەکەی هەر چوار لای خانووەکەی بگرێتەوە باشترە. هەر هیچ نەبێ لای بەردەمی بەتەواوەتی بگرێتەوە. ئەگەر ئەوەیش سەری نەگرت، بام تیلماسکە زەوییەک لەبەردەمی ژووری دانیشتنەکەیدا بکات بەباخچە. یاخود چەند ئینجانەیەک گوڵ لەبەردەمی ژوورەکەیدا دابنێ. باخچە بۆ ماڵ زۆر پێویستە. دەیرازێنێتەوە، جوانی دەکات. بۆن خۆشی دەکات. تەپوتۆزی لێ دەگێڕێتەوە. فێنکی دەکاتەوە. دڵی ئەندامانی خێزان و میوانانی خێزانیش خۆش دەکات.

جا منالی وت و وریا و شیرین کردار دەتوانێ لە ئامادەکردنی باخچەکەی ماڵی باوکیا و پاراستنیا و گەشەپێکردنیدا یارمەتییەکی زۆری دایک و باوکی خۆی بدات. تا خۆیشی و ئەوانی تریش کەڵکی لێ ببینن.

---

(١) خانووی تازە، ل ١٨، ١٩.

**٣- ماڵ ڕازاندنەوە:**

١- منداڵی پێشکەوتوو لەسەر عەرد دانانیشێ و نانوێ. چونکە بەوە پشت ئەکۆمێتەوە و، لەش ماندوو ئەبێ و، چاوکز ئەبێ و نەخۆشی ئەگات بەپیاو. لەبەر ئەوە لەسەر کورسی دائەنیشێ، لەسەر تەخت ئەنوێ. ژووری خواردن و دانیشتن و نوستنەکەی بەکورسی و مێز و تەبڵەک و تەخت دەڕازێنێتەوە.

٢- بۆیەکا تەخت و کورسی و مێز و تەپڵەکیش بەکار دەهێنێت، تا زۆرتر بحەسێتەوە.

٣- کەلوپەل و مسینەر چێوینە و نووسراو و بابەتانی شووشە و بلوور لەناو سندووق و دۆلابدا دادەنێ. تا جروجانەوەریان پیا هەڵنەگەڕێت و تۆزیان لێ نەنیشێت.

٤- ژووری دانیشتن و میوان بەگوڵ و پەیکەر و وێنەی جوانی ڕەنگاوڕەنگ دەڕازێنێتەوە. هەروەها وریای ئەوەیش دەبێت کە پەیکەر و وێنەکان هی نیشتمانەکەی و نەتەوەکەی خۆی بن، یاخود هی ئەو کەسانەبن کە بەکەڵکی هەموو جیهان هاتبن.

٤- **نووسراوخانە:** نووسراو (کتێب)، دۆستێکی دڵسۆز و هاودەمێکی ڕووخۆش و یارێکی بەجۆش و خرۆش و مامۆستایەکی زرنگ و بەهۆشە. لەبەر ئەوە خێزانی پێشکەوتوو، نووسراوخانەیەکی خنجیلانە و جوانکیلانە لە ژووری دانیشتنەکەی خۆیدا دادەنێت و پڕیشی دەکات لە نەخشە و وێنە و گۆڤار و نووسراوانی خۆشی خۆشی و بەکەڵک و نایاب، تا لە شەوانی پاییز و زستاندا ببنە گوڵی کۆڕی خێزان و میوان، کە منداڵیش ئەندامێکن لەوان.

٥- **ساز و ئاواز و گۆرانی:** لە هەموو ماڵێکی پێشکەوتوودا پێویستە شمشاڵێک، یاخود تارێک، یان عود و کەمانێک، یان گرامەفۆن ڕادیۆ و تەلەفزیۆنێک هەبێ لەگەڵ چەند دەنگ خۆشێکدا. چونکە گۆرانی و ساز و ئاوازی خۆش، سەر سووک ئەکەن، دڵ خۆش ئەکەن، لەش ئەبووژێتەوە، بۆ هەموو خاووخێزان و میوانانیش دەبنە گوڵی کوڕ و پزیشکی دڵسۆز.

٦- **گاڵتەوگەپ و قسەی خۆش:** هەروەها خێزانی پێشکەوتوو، ئەندامەکانی بایەخ ئەدەن بەلەبەرکردن و گێڕانەوەی گاڵتەوگەپی خۆش و قسەی شیرین و چیرۆک و پەند و ئامۆژگاری و هۆنراوەی ناوازە و نایاب، تا لە کاتی کۆبوونەوەکانیاندا بەهۆی ئەوانەوە دڵی یەکتری خۆش بکەن و مێشکی یەکتری زاخاو بدەن و سرەوتی گیانیشی بەیەکتری ببەخشن و بەوانە خۆیان بحەسێننەوە.

***

ژیانی ڕۆژانەی هەموو خێزانێک، جاروبار دەناڵۆزێ و ناخۆش دەبێ و پڕی دەبێ لە ئەرک و ئازار. بەڵام کە خێزان وەک لە سەرەوە پیشانمان دا، خۆی خەریک کرد بەو شتە ناوازە و نایاب و خۆشی و بەکەڵکانەوە، باری گرانی سووک ئەبێ و ئەو ئەرک و ئازارانەی زوو لە بیر ئەچێتەوە و ڕوو ئەکاتەوە کامەرانی. جا منداڵی بەهۆش، دەتوانێت، لەم ڕووانەوە، زۆر بەکەڵکی خێزانەکەی خۆی بێت و، تا ئەندازەیەکی گەورەیش ببێتە شەوچرای دایک و باوکی و برا و خوشکەکانی. کە بەوە خۆیشی زۆر خۆشی و شادمانی پێ دەگات.

# لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی

## پرۆژەی دانانی کتێبخانەیەکی کوردی

لەوانەیە خوێنەری هێژا بپرسێ کە سوود لە دانانی ئەم لیستی کتێب و گۆڤارانە چییە لەناو ئەم کتێبەدا؟

مامۆستا هەر لە کاتێک قوتابی ئامادەیی مەرکەزی بووە لە بەغدا، هەوڵی دەسخستن و کۆکردنەوە و بنیاتنانی کتێبخانەیەکی کوردی داوە، بۆ ئەمەش چەندان ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێبی کۆکردۆتەوە و لە یادنامەکانیدا -کتێبی یەکەم- لە زیاتر جارێک باسی پرۆژەکەی دەکات.

جا ئەمەش تۆماری ئەو کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامانەیە کە لە ساڵی ١٩٣١ لە کتێبخانەکەیدا پاراستوونی و دەستی خستوون، سوودی هەر نەبێ بایی ئەوەندە کەڵک دەبەخشێ کە خوێنەری هێژا تەنیا ناوی هەندێ کتێب و نامیلکەی کوردی وا بدۆزێتەوە کە ئێستا باوەڕ ناکەم مابن یان زۆر دەگمەنن لەگەڵ ناوی دانەرەکانیان، جگە لەمە هەندێ کتێبی دی بەعەرەبی و ئینگلیزی کە دەربارەی کورد هەبوون، با وەک (سەرچاوە)یەک ئەگەر ناوەکانیشیان بێنێ هەر بەدەرنین لە کەڵک بەخشین.

## بیرکاری

| ژمارە | ناوی نوسراوە | زمان | ناوی دانەر |
|---|---|---|---|
| ١٨ | کیتابولجەبرول مبتدائی ج ١، ٢ | عەرەبی | هۆل وەنایت |
| ١٩ | حیسابول موسەللەساتول موستەویە (١) | » | موحەممەد خالید حسنی بەگ |
| ٢٠ | ئەلجەبر ولۆگاریتمیاتی یە . | » | » » » » |
| ٢١ | ئەلهەندەسەتول موستەویە - جوزئو ١ | » | جۆرج وێنتوورث وەداوید یوجین سمیث |
| ٢٢ | » » - جوزئو ٢ و ٣ | » | » » » |
| ٢٣ | کیتابول حیساب لیلمەدارسیسانەویە (١) | » | موحەممەد نەزمی |
| ٢٤ | » » » » (٢) | » | » » » |
| ٢٥ | ئەلجەبرول ئیبتیدائی ، ئەلهەندەسەتول موجەسەمە | » | جامیل زەینی . علی دەرویش زەینی . |
| ٢٦ | کیتابولحیساب ، ئەلجوزئو ئەلرابیع . | » | ئەلیستەر فوعەیدی . |

## تەبیعیات

| ژمارە | ناوی نوسراوە | زمان | ناوی دانەر |
|---|---|---|---|
| ٢٧ | ئەلحوبوب وە ئەنەواع | عەرەبی | موحەممەد خەلیل جدعی |
| ٢٨ | مەعالیم تەبیعیە - نەباتات . | » | ئەلفرید مێو ج . داوود قوبا ج . |
| ٢٩ | خولاسەتو تەبیعیەل حەدیسە ، جوزء ١ ، ٢ | » | حوسێن پاشا . |
| ٣٠ | مەبادیئول فیزیا . | » | عیزەدین علاءالدین . |
| ٣١ | The Complete School Chemistry | ئینگلیزی | E. M. Oldham |
| ٣٢ | مەبادیئول کیمیا . جوزء ٢ . | عەرەبی | ئەحمەد زەکی وە عەبدولمەجید ... |
| ٣٣ | » » » (١) . | » | » » » |

## ئایین

| ژمارە | ناوی نووسراوە | بەزمانی | ناوی دانەر |
|---|---|---|---|
| ٢٤ | عولومی دینییە | کوردی | زیوەر ـ ئەفەندی |
| ٢٥ | پێشەوای ئایین | " | سەید حوسێن حوزنی موکریانی |
| ٢٦ | باوەڕی ئایین | " | (شێخ یەحیا) " |
| ٢٧ | گاتەها، سروودەهای زەردەشت | کوردی و فارسی | پورداوود |
| ٢٨ | سەرگەلی یۆحەننا | کوردی | (لەندەن ١٩٢٦) |

## زبان و ئاداب

| ژمارە | ناوی نووسراوە | بەزمانی | ناوی دانەر |
|---|---|---|---|
| ٢٩ | گۆڤاری یەبژە ـ ژمارە (١) ـ | کوردی | موستەفا شەوقی |
| ٤٠ | دیاری دبلامەی کوردی (خۆشخوانی) | " | ........ ـ (زارەکییانی) |
| ٤١ | سەماوەزەمین (خۆشخوانی) | " | عەونی ئەفەندی ـ ( " ) |
| ٤٢ | ئەحمەدی ـ ( " ) | " | شێخ مارفی نۆدێی ـ ( " ) |
| ٤٣ | خۆشی و ترشی ـ ( " ) | " | سەید حوسێن حوزنی موکریانی |
| ٤٤ | گۆرانی کوردی " ٦ " | " | قوتابخانەی سولەیمانی |
| ٤٥ | گۆرانی | " | کەریم سەعید |
| ٤٦ | یەکێتی (سۆیلاوی) کوردی | " | مەعروف جیاووک |
| ٤٧ | چیرۆکی لەجوری یبالی | " | عەبباس عەلی ـ (زارەکییانی) |
| ٤٨ | کۆمەڵ گوڤارەیتین | " | کۆمەڵی هێوی کورد لە ئیستەنبوڵ |
| ٤٩ | کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی | " | عەبدولڕەحمان سەعید |
| ٥٠ | دیوانی شێخ مستەفای مەحوی | " | عەلی باپیر ئاغا |
| ٥١ | دیوانی نالی | " | کوردی و مەریوانی |
| ٥٢ | ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد (خۆشخوانی) | " | ئەمین فەیزی |
| ٥٣ | قەڵەئەت جوزی یادوەل | " | سەید نوری و سەید فەتاحی بەرزنجی |
| ٥٤ | " دووەمین | " | " " |
| ٥٥ | ئەلفبای کوردی | " | حەمدی عەزیز ئاغا |

| ژمارە | ناوی نووسراوە | بە زمانی | ناوی دانەر یا وەرگێڕەر |
| --- | --- | --- | --- |
| ٥٦ | کۆمەڵە گۆڤاری دیاریی کوردستان | کوردی | ساڵح زەکی بەگ |
| ٥٧ | کۆمەڵە بەیتی تیایانەوە ژیان | " | پلەدیبەری سولەیمانی |
| ٥٨ | کۆمەڵە گۆڤاری زاری کرمانجی | " | سەید حوسێنی موکوریانی |
| ٥٩ | بەنما - (بەیتە) | " | مەلا سەعیدی ئێزابی (١) |
| | | xxx | |
| ٦٠ | حیکایاتی لیل ئەتفال ج (١) | عەرەبی | کامل ئەیلانی |
| ٦١ | قوسەس لیل ئەتفال (١) | " | " " |
| ٦٢ | ئیشتیراکیەتو تەسابی - پێوازی | " | نیقولا ئەبین فەرەح . |
| ٦٣ | سەناعەتول ئینشاء | " | عەزیزەددین ئال عەلەمەددین تەنووخی |
| ٦٤ | نوزهەتول قاری ج (١) | " | ئەششێخ ئەحمەدول ئەسکەندەری . |
| ٦٥ | قەواعیدوللوغەتول عەرەبیە | " | موحیەددین نەناسری . |
| ٦٦ | ئەلموجەلی فی تەئریخیل ئەدەبیل عەرەبی ج (١) | " | موحەممەد بەهجەتول ئەسەری . |
| ٦٧ | کەلیلە وە دیمنە | " | موحەممەد حەسەن نائیلولمورسەفا . |
| ٦٨ | کۆمەڵێک گۆڤاری عەرەبی | " | - - - - - - - - - - |
| ٦٩ | ئەلئەقلام | " | عەلی زەریفول ئەعزەمی |

(١) ئێزابی وێ بەکوردیشی حەریری دایە .

| ژماره | ناوی نوسراوه | بزمانی | ناوی دانەر یان وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ٨٠ | " " " | ئینگلیزی | " " " |
| | " " Second Reader | " | " " " |
| ٨١ | Royal Readers. series I. No III | " | " " " " " |
| ٨٢ | " " " No II | | " " " " |
| ٨٣ | English Grammar Series. Book II | " | j. C-Nesfield |
| ٨٤ | English Grammar for Elementary Schools Book II | " | j. c. Nesfield, M. A. |
| ٨٥ | " " " Book III | " | " " " |
| ٨٦ | A school-Book of Idioms & Idiomatic phrases | " | william j. prior. |
| ٨٧ | Harrap books | " | for infant and junior schools. |
| | | ش | |
| ٨٨ | روباعی یاتی خەییام | فارسی | . . . . . . |

| ژماره | ناوی نوسراوه | بزمانی | ناوی دانەر یان وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ٩٠ | جوغرافیە ترلمیرا قول صەریب | عەرەبی | هاشم سعدی . |

| ژماره | ناوی نووسراوه | بەزبانی | ناوی دانەریان وەرگێڕەر |
| --- | --- | --- | --- |
| ٩٣ | تەسیلی سیلاحەدینی ئەیوبی | کوردی | کۆمەڵی هێڤی کورد لە ئەستەموڵ |
| ٩٤ | ئەشغالو تیتین - (بەغدا) | عەرەبی | فەتحی سەفوەت . |
| ٩٥ | نەمازیج عینایەتە لیبرەسە وەل ئیشغالول بەدەوییە . (قاهیرە) | " | عینایەت |

| ژماره | ناوی نووسراوه | بەزبانی | ناوی دانەریان یا وەرگێڕەر |
| --- | --- | --- | --- |
| ٨٩ | قەلبو تیفل - چیرۆکان - | عەرەبی | عیززەددین عەلەددین |
| ٩٠ | کەیفە تۆ بەرەبی تیفلی | " | عەزیزە خەلیف ، حەسەن عەبدولوەهاب |
| ٩١ | بەهەشت وەخوو | کوردی | لاوانی کورد . |

# گەورەپیاوان

سەرگوروشتی چەند گەورەپیاوێکە، ئامانجی:

پێگەیاندنی گەورە و پێکهێنانی گیانی گەورەیی و پێشکەوتنە لە کوردەواریدا

## پێشەکی

گەورەپیاوان

سەرگوروشتەی چەند گەورە پیاوێکە، ئامانجی:

پێگەیاندنی گەورە و پێکهێنانی گیانی گەورەیی و پێشکەوتنە لە کوردەواریدا

نووسەری

شاکر فتاح

نرخی (١٥٠) فلسە

بەغداد — چاپخانەی معارف، ١٩٤٨

مەبەسم لەم نووسراوە بلاوکردنەوەی گیانی گەورەیی و پێشکەوتنە لەناو کوردەواریدا. بەلام چە گەورەییەک؟... ئەو گەورەییەی کە لەسەر بنچینەی خۆشەویستی و نەوازشی گەل دامەزرابێ، لە پاداشی کۆششی مەردانە و بەختکردنی گیان و سامان و ژیان، لە پێناوی پێشکەوتنی گەل و نیشتماندا.

ئەم یانزە کەسەی کە لەم نووسراوەدا گوروشتە و بەسەرهاتیان نووسراوە: هەموو گەورە پیاو بوون. چونکە بەتەنیشت پێشکەوتنی خۆیانەوە -بەڵکو لەگەڵ وە یا لە پێش پێشکەوتنی خۆیاندا- پێشکەوتنی گەل و نیشتمان و جیهانیشیان ویستووە و بۆی تێ کۆشاون. وە ئەوەندەی بەکەڵکی خۆیان هاتوون هەزار ئەوەندە بەکەڵکی گەل و نیشتمان و جیهان هاتوون. کزی و نەبوونی و نەخۆشی و بێ دەسەلاتی، تەنگ و چەڵەمە و لێ قەومان و دوژمنایەتی: چاوی نەترساندون. سەری لێ نەشێواندن. پەکی تێ کۆشینی نەخستوون!... بەهونەر و ئارام و بەرگەگرتن و زرنگی خۆیان توانیویانە بەسەر هەموو گیروگرفتێکی ژیانیاندا زاڵ بن. وە هەر بۆ پێشەوە رۆیشتوون، هەتا بەئامانجی خۆیان گەیشتوون.

زانیویانە کە لە جیهاندا خوایەک هەیە. گەورەترین و میهرەبانترین هێزی گیانییە. وە ئامادەیە بۆ پێکهێنانی هەموو ئاواتێک، بۆ هەموو کەسێک وە لە هەموو وەخت و شوێنێکا. بەو مەرجەی ئەو کەسە باوەڕی پێ بکا، وە لەسەر پێڕەوی ئەو بجووڵێتەوە.

تێگەیشتوون: کە ئارەزووی راستەقینە، بیر لێ کردنەوەی تەواو، داواکردن لە خوا، کۆششی مەردانە و تەقەللا لەسەر پێڕەوی خوایی: رێگایەکن هەموو کەس بەئامانجی خۆی ئەگەیێنن.

فێربوون: کە لە پێڕەوی خوادا، زۆرداریی و ترس و لەرز نییە. دوژمنایەتی و تەمەڵی و بەدخوویی پەسند ناکرێ. هەرچی بۆنی پێشکەوتنی لێ بێ تایەتی. بەلام هەرچی خراپەی لێ بوەشێتەوە تیا نییە.

بەڵێ. ئەو گەورە پیاوانە ئەو پێڕەویی خواییەیان زانی بوو. وە لەسەر ئەو پێڕەوییە رۆیشتوون. بۆیەکا بەئامانجی خۆیان گەیشتبوون. ئێمەیش، گەلی کورد، کە تازە خەریکی راپەڕین و

وریابوونەوەیەکی کۆمەلایەتین؛ زۆر پێویستمان بەگیان و کردەوەی ئەو جۆرە پیاوانە هەیە. بۆ ئەمەی بگەین بەئامانجی پیرۆز و بەرزمان: بەپێشکەوتن و ئازادی و خۆشگوزەرانی. لاشم وایە، کە گەیشتن بەگەورەیی، لە توانای هەموو کوردێکا هەیە. بەو مەرجەی باوەڕ بکا بەخوا و بەخۆی و بەگەل و نیشتمان و جیهان!. وە لەسەر پێڕەوی خوایی بجوولێتەوە. وە ئەوی من لەم نووسراوەم ئەوێ، ئەوەیە کە کوردێک بخاتە سەر ئەوەی ڕێی گەورەیی بگرێ. تا لە تانوپۆی ئەو گەورەییبە تاک تاکانە، بەرگی گەورەیی گشت لایی کوردەواریان بچنین و بپۆشین.

برا کوردا باش وردبەرەوە لە خۆت! وەنەبێ تۆ لە ئیمڕۆتا، لە سەرەتای ژینی ئەو پیاوە گەورانە کەمتربی، کە لەم نووسراوەدا سەرگوروشتەیان ئەخوێنیتەوە. لەهەر فەرمان و پیشە و کاروبارێکا هەی: ئەوانی وەک ئەوان تیا گەورەبێ. وە ناوبانگی گەورەیی تیا دەرکەی. بەو مەرجەی، تۆیش، لەسەر ئەو ڕێگایە بڕۆی کە ئەوان پیا ڕۆیشتوون!. گەورەیی تۆ، نەک تەنیا، شتێکی خۆش و بەکەلکە بۆ خۆت. بەڵکو فەرمانێکی نیشتمانی و جیهانی و خواییشە بەسەرتەوە، پێویستە پێکی بینی!... ئەوەندە هەیە، لەو وەختەدا کە خەریکی گەورەیی خۆت ئەبی لە فەرمانەکەتا: وریابە! لەسەر مەشقی پیاوەتی ئەچیتە دەرەوە! ئامانج و ڕێگەی ئامانجت، هەردووکی پیرۆز و بەرزبێ! چونکە لە ڕاستیا سەر زەمین نیشتمانی گەورەتە، دانیشتوانی سەرزەمین گەلی گەورەتە، وە چاکەی هەموو دانیشتوانی سەر زەمینت بەسەرەوەیە، بەچاک و خراپیانەوە!. وە تۆیش ئەو کۆششەی کە ئەیکەیت بۆ گەورەیی خۆت، پێویستە، نەک تەنیا ئازار و زیانی بۆ کەس تیا نەبێ، بەڵکو کەڵکیشی بۆ هەموو کەس تیابێ، کە گەل و نیشتمانە نازدارەکەی خۆت و جیهان و هەموو دانیشتوان جیهانی ئەگرێتەوە.

پێویستە بزانی، کە گەورەیی، هەر بەبالای شاهان و سەرکردان نەبڕاوە. هی هەموو کەسێکە!... بەخششێکی خواییە. هەر کەسێ بیەوێ، بەری ئەکەوێ. وە لە توانایدا هەیە چنگی کەوێ!... جا لە هەر کار و فەرمان و بارێکا هەی بێ! بکۆشە تا تیانەگەیتە ئەوپەڕی چاکی. واتا: کەڵک و چاکەت ئەگاتە ئەوپەڕی زۆریی بۆ خۆت و بۆ گەلت و بۆ هەموو دانیشتوانی جیهان!. ئەوساکە ئەگەیتە ئەوپەڕی پێشکەوتن و سەربەرزیی ئەگەیتە گەورەیی!... دڵنیاش بە، ئەو گەورەییەی تۆ لەگەڵ گەورەیی شاهێکی بەکەڵک و گاوانێکی بەکەڵکا جیاوازی نییە!.

لە ڕاستیا، ئێمە داماوی ئەو پێشکەوتنەین. وە لە دەست خۆمان دایە. کەواتە بۆ چ: دەوڵەمەندمان، لە دەوڵەمەندی خۆیا، فەرمانبەران لە فەرمانبەری خۆیا، سەرکردەمان لە سەرکردەیی خۆیا، مەلا و شێخان و کەبابچی و بازرگان و گاوان و شوان و گشت پیشەوەرانمان لە کاروباری خۆیاندا، ڕوو نەکەنە خوا، نەکۆشن، کەڵک نەبەخشن وە نەگەنە ئەوپەڕی گەورەیی؟!...

تا ئیمڕۆ، چونکە هەر بەخۆپەرستی خۆمانەوە خەریک بووین، تاک و تەرامانی لێ دەرکەی، تێکرا، کەسی وامان لێ پەیدا نەبووە، کە گەیشتبێتە پایەی گەورەیی!... ئایا، ئیتر ئەو ڕۆژە نەهاتووە: کە کۆشش و تەقەللامان ڕوو بکاتە کەڵکی گشت لایی و پیاوەتی و جیهانپەروەری؟ من بڕوام وایە، کە ئەو ڕۆژە هاتبێ!. هیواشم وایە، کە ئیتر مۆتەکەی پاشکەوتنمان لەسەر لابچێ!. وە ئیتر چاو لە هەلاتنی

ڕۆژێکی پێشکەوتن و بەرزبوونەوەدا هەڵێنین!. سا خوابکا ئەم نووسراوەم ببێتە نوقولانە. وە لە زوویەکی زۆدا، بتوانم، نووسراوێک لەسەر گەورەکانی کوردیش بنووسمەوە!.

شاکر فەتاح
قائیمقامی سلێمانی
١٩٤٨/٣/١٥

## ئەدیسن

باوکی ئەلەکتریک و سەرکردەی داهێنەران

١٩٣١ - ١٨٤٧

### پێگەیشتنی ئەدیسن

ئەدیسن، لە ساڵی ١٨٤٧دا لە شاری (میلان ئوماهیو) لە خاکی ئەمریکای یەکگرتوو!، لە باوک و دایکێکی هەژار هاتۆتە جیهانەوە. لەڕولاواز کەڵکی پێشکەوتنی پێوە نەبووە. لە خوێندنگادا، هەموو دەم، گەندی ناو شاگردەکان بووە. ڕۆژێک مامۆستایەکی گەیشتە تینی. پێی گوت: «نازانم باوک و دایکت تۆیان بۆ چ ناردۆتە بەرخوێندن. ئەگەر ئەمەندە وەخت و سامانی خۆیان لە تۆدا بەفیڕۆنەدایە باشتر نەبوو؟!...». ئەدیسن بەمە زۆر دڵی ڕەنجا. هەر بەو ئازارەوە چووە ماڵەوە. وە هەموو کەینە و بەینەیەکی لە دایکی گەیاند. بەڵام دایکی لە دایکە تێگەیشتووەکان بوو. دەمودەست دڵخۆشی ئەدیسنی دایەوە. زۆری پێ نەچوو بەهونەرمەندیی و کارزانی خۆی ئەدیسنی پێ گەیاند. وە خستیە سەر ئارەزووی خوێندەواریی. وە ئەدیسنی گەیاندە ئەو پایەیە کە هەموو کەسێ ئاواتی بۆ ئەخواست!... هەموو جار کە باسی گەورەیی خۆی ئەکرا، ئەیگوت: «بەهەرچی خۆشی و گەورییەک گەیشتووم لە سایەی دایکمەوەیە».

هێشتا ئەدیسن لە تەمەنی یانزە ساڵیدا بوو، خووی دایە کیمیاگەریی. نزیکەی دووسەد شووشەی کڕیی و پڕی کردن لە دەرمانی ڕەنگاوڕەنگ. لەسەر هەموو شووشەکانی نووسیبوو (ژەهر) بۆ ئەمەی توخنیان نەکەون. ماڵەوەی کردبوو بەشوێنێکی تاقی کردنەوە. هەموو وەخت و هەموو پولێکی لە کیمیاگەرییدا بەخت نەکردا...

ڕۆژێک دەست کورتی تەنگی پێ هەڵچنی بوو. پولی لە دەستا نەمابوو دەرمان بۆ کیمیاخانەکەی بکڕێ. کەسی نەبوو دەسی بگرێ. پەنای بردە بەر باوک و دایکی کە ڕێی بدەن کڕین و فرۆشتن بکات. ڕێیان دا. دەستی کرد بەڕۆژنامە و نان و میوە و شیرینی فرۆشتن بەو ڕێبوارانەی کە بەشەمەندەفەر ئەچوون بۆ شاری (دیترۆیت) لە (پورت هورن)ەوە. ئەدیسن بەشی خۆی پارەی دەست کەوت. وە بەو ڕەنگە بەسەر هەژاریدا سەرکەوتا.

جارێکیان ئەدیسن کوڕێکی کارگوزاری شەمەندەفەرەکەی لە دەست پلیشانەوە ڕزگار کرد. ئەم مەردایەتییەی دەرگایەکی پێشکەوتنی بۆ کردەوە. کابرای شەمەندەفەر پاداشی ئەو چاکەیەی دایەوە. ئەدیسنی فێری بەکارهێنانی تەلگراف کرد. ئەدیسن بەمە زۆر دڵشاد بوو. هەموو تینی خۆی دایە سەر فێربوونی زانستی تەلگراف و ئەلەکتریک.

جارێکیان لە ژوورێکی شەمەندەفەرەکەدا کە ڕێیان دا بوو کیمیاگەریی تیا بکا، شووشە فۆسفۆریک کەوتە خوارەوە، ڕژا وە ژوورەکەی سووتاند. چاوگێری (مراقب) شەمەندەفەرەکە لە ئەدیسن توڕە بوو. زللەیەکی لە بناگوێی دا، تا مردن ئەدیسنی بەکەڕێی هێشتەوە!...

## لە ڕێی گەورەییدا

ئەدیسن، لە شانزە ساڵیدا! مانگی بەپێنج لیرە، لە تەلگرافخانەی (ستراتفورد)دا دامەزرا. فەرمانبەرەکانی ئەوێ، لەچاو ئەدیسندا هیچیان نەئەزانی. شەوێک ڕەشەبا تەلەکانی پچڕاند. بەڵام ئەدیسن نەیهێشت گفتوگۆ پەکی کەوێ. بەفیکفیکە توانی پیتەکان بدا بەفەرمانبەری ئێستگەکەی تر کە سە چارەکە میل لێی دووربوو لەوبەری زێیەکەوە!... ڕۆژ بەکیمیاگەریی و شەویش بەتەلگرافەوە خەریک ئەبوو. لەبەر ئەوە گەلێک جار ماندوویێتی وەنەوزی پێ ئەدا لە تەلگرافخانەکەدا. وە ئەینواند. لە سەرۆکەکانیەوە ناچارکرا هەر تاوە ناتاوێک نیشانەیەک بنێری بەتەلگراف کە دڵنیابن نەنوستووە. ئەدیسن ئەمە زۆر وەڕسی کرد. هێنای شتێکی وای دروست کرد لە خۆیەوە هەر تاوە ناتاوێک ئەو نیشانەیەی ئەناردا. شەوێک بۆ تاقی کردنەوە سەرۆکەکەی گفتوگۆی لەگەڵ کرد، ئەدیسن وەرامی نەبوو. سەرۆک بەسەرسوڕمانێکەوە هاتە سەیری. تەماشای کرد ئەدیسن خەوی لێ کەوتووە، کەچی ئەو شتەی دروستی کردووە پەیتا پەیتا لەکاتی خۆیا ئەو نیشانە ویستراوە لەخۆیەوە ئەنێرێ. سەرۆک لەگەڵ ئەوەشا کە ئەو داهێنراوەیەی ئەدیسنی پەسند کرد، نەیتوانی چاوی لێ بپۆشی، لە فەرمانگەی دەری کردا. لەگەڵ ئەمەشا ئەدیسن وازی لە پرس و تاقی کردنەوە و تێ وردبوونەوە نەهێنا تا چووە بنجوبناوانی تەلگراف و ئەلەکتریکەوە. لە تەمەنی بیست و یەک ساڵیدا شتێکی تری داهێنا ناوی نا (داهێنراوەناس) کە بووە

سـەرەتای ڕێژە داهێنراوەیەکی زۆر و بەکـەڵک لە هەمـوو جـیـهـانـدا. ئەدیسن پێی نایە ڕێگای گەورەییەوە!. لە بیست و دووساڵیدا ئەدیسن لە شاری (نیویۆرک)دا دەست کورتی و برسێتی شپرزەی کردبوو. ناچارما، داڵلای بردە بەر (هاوبەشی لو)[1] کە فـەرمـانی ئەوەبوو: پەیـتـا پەیـتـا، دەنگوباسی نرخی دراوی، بەتەلگرافـێکی تایبـەتی ئەدا بەبازرگـانە گـەورەکـانی شـار. ئەدیسن چاوەڕوانی کـار هەڵسوڕێنەری هاوبەشییـەکـەی کرد بینینی. لەپڕ کـەلوپەلی تەلگرافـەکە پەکی کـەوت، فـەرمـانبـەر و بازرگانەکان شلەژان. دامان. نەیان ئەزانی چی بکەن!. ئەدیسن لە (میستەرلو) سەرۆکی هاوبەشییەکە چووە پێشەوە. پێی گوت ئەگەر ئارەزوو ئەکەیت من تەلگرافەکەتان بۆ چاک ئەکەمەوە، کـابرا ڕێی دا. ئەدیسن گورج و گوڵانە و هونەرمەندانە کەلوپەلی تەلگرافەکەی چاککردەوە و خستییەوە گەڕ!. هاوبەشی، لە چاکەی ئەوەدا، ئەدیسنی بەمانگانەیەکی شەست لیرەیی دامەزراند. ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەدیسن دەستی دایە داهێنان، تا بوویە یەکەم داهێنەری بەکەڵکی جیهان.

## داهێنراوەکانی ئەدیسن

داهێنراوەکـانی ئـەدیسن لە ژمـارە نایەن. زۆر کـەس ئەڵێن لە دوو هەزار زۆرترن. بەڵام لە هەمـوویان خۆشتر بەگیانی ئەدیسن چواریان بوو: «چرای ئەلەکتریک، بزوێنەری ئەلەکتریک، سینەما و گرامەفۆن».

لە ڕاستیا کەس ئەوەندەی ئەدیسن بەداهێنراوان کەڵکی نەگەیاندووە بەجیهان!. ژیانی بەجارێ گۆڕی. لە هەموو لکێکیەوە ئاسوودەیی و خۆشی و پاک و پوختەیی تێ خست. بۆ هەموو چین و کەسێک ڕێگای کامەرانی و خۆشگوزەرانی کردەوە. جیهانی بەسەد ساڵان بەرەو پێشکەوتن برد. بۆ نەهێشتنی زۆرداریی و نەخـوێندەواری و هەژاری و نەخـۆشی مـاوەی فـراوانی کردەوە. بەڕاسـتی نرخی کـردەوەکـانی ئـەدیسن لە توانای قـەڵەمـا نییـە!. لەبەر ئەوە ئەو سـامـانەش کـە لەم ڕووەوە بەسـەریـا ڕژا لە ئەندازەی ژمـاردن چۆتە دەرەوە!.

## ڕازی سەرکەوتنی ئەدیسن

ئارەزووی ڕاستەقینە، بیرکردنەوەی قـووڵ، کۆششی مەردانە، ئارامی زۆر، نووک گرتن لەسەر شت بێ خـۆ مـاندووکـردن، بەڕووی خـۆشـەوە بەرگـەگـرتنی ئەرک و ئازار... ڕازی سـەرکـەوتنی ئەدیسـن بوون. (٢٠,٠٠٠) بیست هەزار لیرەی لە تاقی کردنەوەدا بەخت کرد، خەو و خۆراکی لە خۆی بڕیی، چوار شەو و ڕۆژان لە کارگەکەیا مایەوە، نەچووە دەرەوە... نەسرەوت تا (چرای ئەلەکتریک)ی داهێنا. ڕۆژی شانزە سەعات، جاری وا هەبوو لەسەر یەک شەست سەعات فەرمانی ئەکرد!. ئەیگوت:

«لە سەدا یەک بەر پێگەیشـتـوویی و بلیـمەتی ئەکەوێ. نەوەد و نۆکـەی تری هێزی سـەرکەوتن کـرد و کـۆششـە»!. بڕوای وابوو کـە ئەرک و ئازار بڕبڕاگـەی پشـتی بەهێـز ئەکـا!. ئەو کـەڕییـەی تووشی بووبوو بەشـتـێکی نایابی ئەدایە قەڵەم!. ئەیگوت: «ناهێڵی دەنگە دەنگی ئەملا و ئەو لا بیرکردنەوەم لێ تێک

---

(١) کۆمپانیای لو.

بدا»!. لەگەڵ ئەم هەموو کردەوە گەورە گەورانەشا ئەدیسن تەنیا ٧٥٪ی بیری بەکارهێنابوو، لە پێش مردنیا، لە زیندەخەو و ڕاکشانێکیا، ئەوپەڕە ئەنکەی بەدیی کردبوو کە چاوی پیاو لە بارەگای پەروەردگار جوێ ئەکاتەوە. ئەیگوت: «لەودیو پەردەکەوە شتێکی جوان ئەبینم». ئەدیسن ڕاستی ئەکرد. چونکە لە پێش هەموو شتێکا، لەو کاتە زیندەخەوانەدا، وە لەو جیهانی بیرانەدا، داهێنراوەکانی خۆی دروست ئەکرد. ئینجا لە جیهانی هەستیشدا لە کەلوپەلی بینراو دروستی ئەکردن.

## ڕەوشتی ئەدیسن

ئەدیسن بەو هەموو پایە بڵندی و گەورەیی و دەسەڵاتداری و سامان و ناوبانگ و ناوونیشانانەشەوە کە دەسگیری بووبوو لە جیهاندا، ئەمەندە سادە ڕەنگ بوو لە دیمەن و لە دڵا لە منداڵێکی ساوا جوێ نەئەکرایەوە. لە ئەدیسن شتی سەیر سەیر ڕووی ئەدا، وە شتی سەیر سەیریشی تووش ئەبوو. جارێکیان زۆر بەگەرمی ئەیپرسی لە فەرمانبەرێکی چەند ساڵانەی تەلگرافخانەکە تەلگرافی تێ بگەیێنێ: کابرا پێی گوت: «تا سەگێک نەهێنیتە بەرچاوت، ئەمەندە درێژبێ: کلکی لە ئەیێنبورگ و سەلکی لە لەندەن بێ، وە تا لە ئەدینبورگ بەکلکیا نەنووسیت ئەو لە لەندن نەلوورێنێ: تۆ لە تەلگراف ناگەیت»!؟.

کە گەیشتە تەمەنی هەشتا ساڵی، لە ئەورووپا و ئەمریکاوە سە سەد زانست و داهێنەر لە ماڵیا کۆبوونەوە، زەماوەندی لەدایکبوونی بۆ بکەن. کەچی کە ئەدیسن تێگەیشت بۆچی هاتوون، وەک منداڵێکی ساوا دەسی کردە پێکەنین، بەجێی هێشتن و ڕایکردە ناو کارگەکەی خۆی!... زانستەکان[1] هەرچەندە ئەمەیان لەو ڕانەئەبەرمو کە وابکا، بەڵام لە ترسی ئەوەی سەری لێ بشێوێنن، وازیان لێ هێنا. ئەو چوو خەریکی داهێنانی خۆی بێ. ئەمانیش چوون زەماوەندی بۆ بگێڕن!؟.

کە گرامەفۆنی داهێنا، دانەیەکی بەدیاری ناردبوو (تۆلستۆی)، نووسەری بەناوبانگی ڕووس. تۆلستۆی زۆری پێ خۆش بوو. سوپاسنامەیەکی گەرم و گوڕی بۆ نارد.

ئەدیسن بەو هەموو زرنگی و هونەرمەندییەوە سەری لە پوول و پارە و ژمێر و ژمارە دەرنەئەچووا. لە نۆشین و پۆشیندا، لە گوزەران و ڕابواردندا، کەم تەرخەم و شل و شێواوبووا. کارگەکە و خانووەکەی بەدەم یەکەوەبوون، کەچی جاری وا هەبوو چەند شەو و چەند ڕۆژێک لە کارگەکەیا ئەمایەوە نەئەچووە ماڵەوە!. خۆشی بەداهێنان داچووبوو. داهێنان یارییەک بوو بۆ ئەو. خۆی پێوە خەریک ئەکرد.

## مردنی ئەدیسن

لە ساڵی ١٩٣١دا ئەدیسن مرد. ئەو پیاوە گەورەیە، کە کەڵکی بۆ نیشتمانی زەمین تا ئەمێنێ نابڕێتەوە: بەسەربەرزی و ڕووسوورییەوە، چووەوە لای خوای خۆی. بۆ نەوازشی گیانی پاکی، ئەمریکا، لە داخا، بەرگی تاریکی کردەبەر: تا چەند تاوێک گشت چرا ئەلەکتریکەکانی خۆی کوژاندەوە. چرای ژینی ئەدیسن کوژایەوە. بەڵام بۆ هاونیشتمانەکانی سەرزەمینی ژینێکی وای دامەزراند کە هەتا هەبن چرای شادی و ئازادییان لێ نەکوژێتەوە!.

---

[1] یان: زاناکان

## ولبەرفورس

«لابەری بازرگانی قولەڕەش و پچڕینەوەی پێوەندی بەندەیی»

١٨٣٣-١٧٥٩

### پێگەیشتنی ولبەرفورس

(ولەیەم ولبەرفورس) لە شاری (هەل) لە خاکی ئینگلیزدا، لە ساڵی ١٧٥٩دا لەدایک بووە. باوکی، لە شارەکەیا بازرگانێکی دەوڵەمەندی پایە بڵندبووە. ولبەرفورس لە خوێندنگای (هەل) و (کەمبرج)دا زیرەکی و هونەرمەندییەکی تەواوی نواندووە. کە لەوێ دەرچووە، بیست و یەک ساڵ بووە، شارەکەی هەڵیان بژاردووە بۆ ئەندامێتی پارلەمان. ولبەرفورس، لاوێکی شۆخ و شەنگ و قسەخۆش و ئەرباب و کردەوە ڕەندین و دەنگ شرین بووە. وەک پەپوولە ڕەنگاوڕەنگەکانی بەهار کە لەم گوڵەوە هەڵ ئەفڕن بۆ ئەو گوڵ، ولبەرفورس-یش لەم یانەوە بۆ ئەو یانە، وە لەم کۆمەڵەوە بۆ ئەو دەستە ئەچوو تێکەڵی ئەکردن. ژینێکی پەسەندی پڕ لە ئاهەنگی ڕائەبوارد. هەموو کەس حەزی ئەکرد خۆی لێ نزیک خاتەوە، لەگەڵیا ڕابوێری. هەموو کەس خۆشی ئەویست.

جارێکیان لەگەڵ هاوڕێیەکی وریایا کە ناوی (ئایزاک میلتەر) بوو چووە گەشتوگوزاری فەرەنسە و ئیتاڵیا و سویسرە. نووسراوی پیرۆزی (ئینجیل)یان لەگەڵ خۆیان بردبوو. لەڕێ ئەیان خوێندەوە و لێی ورد ئەبوونەوە. لەو حەلەدا کە شاخەکانی (ئەڵپ)یان ئەبڕی و تەماشای ئەو سەهۆڵ بەندانەیان ئەکرد کە بەقەد ئەو شاخە بڵندانەوە کشابوون. شتێکی وا بەدڵی ولبەرفورس داهات کە بەجارێ ڕەوشتی گۆڕی لە ژیانیا.

تێگەیشت: کە تەنیا بۆ ئەوە نەهاتۆتە جیهانەوە هەر بەخۆشی و بەختیاری خۆیەوە خەریک بێ. بۆ ئەوەش هاتووە کە خەمی خەڵک بخوا. گشت کەسی خۆشی بوێ. و بۆیان تێ بکۆشێ. وە ژینی خۆی بەخت کا لە پێناو ڕاگرتنی دڵی خوا و پێشخستنی ڕەگەزی خۆیدا کە هەموو دانیشتوانی زەمینە. لەوێدا

ژیانی چارەڕەشی ئەو قولەڕەشە هەناسە ساردانەی هاتەوە بیر کە بازرگانە سپییەکانی ئەورووپا، بەزەبری تۆپ و تفەنگ ئەیان گرتن و ئەیان کردن بەدیل و بەندە. وە وەک بزن و مەڕ کڕین و فرۆشتنیان پێوە ئەکردن!. ولبەرفورس لە خەوی خۆپەرستی و بەدمەستی ڕاچەنی. بەسەر ژینی پێشوویا پەردەیەکی شینی دادایەوە. بڕیاری دا کە ژینێکی سەربەرزانە و مەردانە ڕابوێرێ. لە بارەگای خوادا بەڵێنی دا: کە تا تنۆکێ خوێنی تیابێ لەسەر ئەو کلۆڵانە بکاتەوە. وە واز نەهێنێ تا ئازادیان ئەکات!. ولبەرفورس ڕێگەی ڕاستی گرتبوو. بەرەو گەورەیی ڕۆیی!.

## بازرگانی قولەڕەش

بام لێرەدا تۆزێک ولبەرفورس بەجێ بهێڵین. هەندێ باسی زۆر و ستەمی بازرگانی قولەڕەش بکەین. وا ئەم کارەساتە ئەکەین بەنموونە بۆ کردەوەی ئەو بازرگانە بەدخوانە: لە ئینگلتەڕەوە چەند کەشتییەکی پڕ لە پێوەند و کوتە و زنجیر، پڕ لە تۆپ و تفەنگ و بابەتی سەرخۆشی. لەگەڵ گەلێک زەلامی کوشندە و بەندی گەریی، بەرەو خاکی ڕۆژئاوای ئەفریکا تێ ئەپەڕێ، تا گەیشتە بارەگای (باربیسیا) شاه. سەرکردەی کەشتییەکان شاهی بەبابەتی سەرخۆشی چەواشە ئەکرد. لە نیوەشەوا پیاوەکانی خۆی بەچەکە کوشندەکانی بازرگانەکانەوە ئەنارده سەر دێیەک لە دێهاتی هۆزە دراوسێکانی دوژمنی. لەهەر چوارلاوە بەیەک جار تفەنگیان ئاگر ئەدا. لادێییە بەسەزمانەکان بەشەرزەیی لە خەو ڕائەپەڕین. بەشیر و تیرەکانیانەوە، بۆ بەگژداچوونی دوژمنی دڵڕەق و لە ماڵ دەرئەپەڕین. لێیان ئەکوژرا، لێیان ئەبرا، لە زنجەکانیان ئاگر بەرئەدرا. هاوار و قیژەی ژن و ئێش و ئازاری بریندارانی پیاو ئەگەیشتە ئاسمان. جەرگی پیاوی ئەتواندەوە!. جا لەو قوربەسەرانە، ئەوانەی ئەمانەوە، ئەگیران، دەس و پێوەند ئەکران و فڕێ ئەدرانە بەندیخانەی کەشتییەکانەوە!. لە ڕێگا پاقلەی وشک و ئاوی بۆگەنیان دەرخوارد ئەدرا. ئەوی ئەیخواردایە، بەزۆرێکی بێ ئەندازە و شێوەیەکی نەنگ و ناشیرین دەرخواردی ئەدا!. کە ئەش مردن لەتاو خەفەت و ئازاری دڵی خۆیان، فڕێ ئەدرانە ناو زرێوە بۆ ناشتای سەگە ئاوایییەکان!. کە ئەگەیشتنە ئەمریکای ژوور و دوورگەکانی هیندی ڕۆژئاوا: بەتاک و بەدەستە، بەچەشنی گیانلەبەر، ئەفرۆشران بەدەوڵەمەند و دەسەڵاتدارەکانی ئەو ناوە بۆ ڕەنجبەریی و کرێکاریی تا مردن لەناو زەویوزاری توتن و نەی شەکرەکانیانا. ئەڵێن لە ساڵی ١٧٨٧دا فەرەنسە ٣١ هەزار، ئینگلتەڕەش ٤٠ هەزار بەندەی لەم بەندانە ناردووە بۆ ئەمریکا. کەچی بەمەشەوە فیزی پێشکەوتوویییان لێ ئەدا!؟.

## ڕەنجدانی ولبەرفورس

ولبەرفورس لە گەشتوگوزار بووەوە. بەو بڕیارە پیرۆزەوە کە لەسەرەوە باسمان کرد گەڕایەوە لەندەن. بوو بەدۆستی کوڕێکی جوامێری تر ناوی (تۆماس کلارکسون) بوو. ئەو کوڕە دوژمنی خوێنینی کڕین و فرۆشتنی قولەڕەش بوو. کە لە خوێندنگابوو وتارێکی نایابی لەم بابەتەوە نووسیبووەوە، گرەوی تیا بردبووەوە و پاداشی لەسەر وەرگرتبوو. کە چووبووە لەندەن، لەگەڵ چەند هاودەمێکی دڵسۆزیا کۆمەڵێکی دامەزراندبوو، بۆ بەرەنگاریی بازرگانی قولەڕەش. جا (ولبەرفورس) بووە یەکێک لەو کۆمەڵە... وە

لەوساوە کۆششی مەردانەی دەسی پێ کرد. لە ئەندامێتی پێنج یانە، لە قومارکردن، لە چوونە شوێنی بەزمورەزم وازی هێنا. وە هەموو تین و هێزی خۆی دایە سەر ئەم فەرمانە بەرێزە!. لەم رووەوە پرسی کرد بە(ولیەم پت) سەرەک وەزیری ئینگلتەرەی ئەوسا کە دۆستی بوو، بەڵێنی دایە کە لە پارلەمان یارمەتی بدا. هەروەها لە دوو پیاوی گەورەی تریش (چارلس جیمس فۆکس) و (ئەدمۆند بورک) بەڵێنی یارمەتی وەرگرت. کە لە ساڵی ١٧٨٩دا ولبەرفورس کرایەوە بەئەندامی پارلەمان، بۆ نەهێشتنی بازرگانی قولەڕەش. خواستێکی پێشکەش بەپارلەمان کرد. وتارێکی ئاگرینیشی بەدوایا خوێندەوە. نیاز و وتاری ولبەرفورس کاری خۆی کرد. پارلەمانی وروژاند. لەم پەڕ و لەوپەڕی بەریتانیادا دەنگی دایەوە. ڕۆژنامەکان پشتیان گرت. تێکەیشتووەکانیش بۆی پاڕانەوە لە خوا کە سەری خا. ولبەرفورس ناوبانگی دەرکرد. وە بووە یەکەم قسەکەری دەر و ناوەوەی پارلەمان!.

## ولبەرفورس لە تەنگانەدا

لەگەڵ ئەوەشا، ولبەرفورس، تەگەرەی زۆر لە فەرمانەکەی ئەدرا لەلایەکەوە شاە (جۆرجی سێیەم)، لەلایەکی تریشەوە بازرگانەکانی قولەڕەش بەرەنگارییان ئەکرد. لە داخا، ولبەرفورس، نەخۆش کەوت وەختبوو گیان بدا. نێررایە (بات)، بەڵام لەوێ لە پاش مانگێک دەرمان کاریی و پارێزگاریی، چاک بووەوە. هاتەوە. وە دووبارە خۆی هاوێشتەوە ناو کۆڕی کۆششەوە!. هێندەی نەمابوو فەرمانەکەی سەرگری. بەڵام لەناکاو (هەرای گەورەی فەرەنسە) هەڵگیرسا. بارەگای زۆروستەمی ڕماند. وە سەربەستی و برایەتی و یەکسانیی لە جێی دامەزراند. بەڵام ئینگلیزە کاربەدەستەکانی تۆقاند. لەبەر ئەوە هەر لە نووکەوە فەرمانەکەی ولبەرفورسییان لەبنەڕەت تێک دا!. پارلەمان فەرمانەکەی پەسەند نەکرد!.

لە ڕاستیا ئەمە شکستێکی گەورە بوو بۆ ولبەفورس. لەگەڵ ئەوەشا کۆڵی نەدا. ورەی بەرنەدا. دووبارە سنگی کۆششی بردەوە پێشەوە!... لە ساڵی ١٧٩٢دا وتارێکی کاریگەری تری لە پارلەماندادا. کارەساتی دڕندانەی ئەوروپاییەکانی -کە دەربارەی قولەڕەشەکانی دێی (کالابار) کرابوو- بۆ پارلەمان گێڕایەوە. پارلەمانی ڕاپەڕاند. گەلی ئینگلیزی وروژاند. شەکری، کە ئەمریکا، بەفرمێسک و خوێنی ئەو قولەڕەشە بەندییانە پێکی هێنابوو، بڕیار درا کەس نەیکڕێ. (ولیەم کوپەر)ی بوێژ، هەڵبەستێکی بەناوی (سکاڵای بەندە)وە نووسیوە، گڕی بەردایە گیانی بەریتانیایەکان. (ودفورد) وێنەیەکی کێشا بەندەیەکی تیابوو داوای ئازادی ئەکرد. لە پێنج سەد لاوە قاقەزیان کردە سەر پارلەمان داوای تەمێ کردنی سەرکردەی ئەو شەش کەشتییەیان ئەکرد کە ئەم زۆرداریی و بەدکردارییەیان نواندووە لەگەڵ دانیشتووەکانی (کالابار)دا. بەم ڕەنگە، لە ماوەی هەشت ساڵدا، پارلەمان، ئینجا، بۆ نەهێشتنی کڕین و فرۆشتنی قولەڕەش، بڕیاری دا. بەڵام ئەم بڕیارە لە کۆڕی ڕیش سپییاندا تووشی بەربەرچدانەوەی شاە هات. لەبەر ئەوە فەرمانی پێ نەکرا!.

## سەرکەوتنی سەربەستی

دوای ئەوە، ئەورووپا، بەشەڕی ناپلیۆنەوە خەریک ما. سەرەک وەزیر (ولیەم پت)یش بەخاک سپێررا. ولبەرفورس بەمە زۆری لێ کەم بووەوە. لەگەڵ ئەمەشا چاوی نەشکا، بەهیوای هەلێکی تر کە هەڵکەوێ، دڵی خۆی دایەوە!.

لە ساڵی ١٨٠٦دا (کرنفیل) بوو بەسەرەک وەزیری حکوومەت. بەدەستی خۆی خواستی ولبەرفورسی نارد بۆ کۆڕی ریش سپییان. لە پاش ساڵێک ئەمیش و پارلەمان و شاهیش بڕیاریان لەسەردا. وە ئیتر لەو ساوە کاری پێ کرا. پارلەمان لە خۆشی پەسەندکردنی شاه، بەجارێک دەست خۆشی و پیرۆزیمان لە ولبەرفورس کرد. بەڵێ، لە راستیا، ولبەرفورس نەبووایە، ئەم فەرمانە مەردانەیە سەری نەئەگرت!. ولبەرفورس لە خۆشیا چاوی پڕ بوو لە ئاو. دوو دڵۆپ فرمێسکی بەختیاریی لە چاویەوە گلۆر بووەوە، گەلی ئینگلیز، ولبەرفورسی بەهاوتای ئەو (ولینگتن)ە دائەنا کە ناپلیۆنی گەورەی شکاند!. لەگەڵ ئەوەشا، ولبەرفورس، تازە گەیشتبووە تەمەنی ٢٨ ساڵی!.

بەمەندە ولبەرفورس توانیی هێنانی قولەڕەش لە ئەفریکاوە و ناردنی بۆ ئەمریکا و دوورگەکانی هیندی رۆژئاوا، بەربەست کا. بەڵام هێشتا مابووی کارێکی وا بکا، نەهێڵێ ئەورووپایی بتوانی قولەڕەش بکڕێ و بیفرۆشێتەوە. لەبەر ئەوە، دووبارە، گوڕی بەستەوە و بۆ ناو رەنج و کۆششی مەردانە خۆی هاوێشتەوە. دوایی، لە ساڵی ١٨٣٣/٧/٢٥دا بەئامانجی خۆی گەیشت. پارلەمان بڕیاری دا کە ئیتر لە گشت خاکی شاهەنشاهی بەریتانیادا، کڕین و فرۆشتنی قولەڕەش بەهیچ جۆرێ ماوە نەدرێ. ولبەرفورس کە ئەو بڕیارەی پێ گوترا، بەو هەمور پەککەوتەیی و برست براوییەی خۆیەوە، خۆی پێ نەگیرا، لە خۆشیانا دەنگی هەڵبڕیی گوتی: «ئۆخەی خوایە!. سوپاس بۆ تۆ، کە منت هێشتەوە تا بەچاوی خۆم ئەورۆژەم دیی کە حکوومەتی بەریتانیا ئامادەیی خۆی نواند: بۆ بەختکردنی بیست ملیۆن لیرەی ئینگلیزی لە پێناو نەهێشتنی بازرگانیی قولەڕەشدا لەناو خاکیا!».

## مەرگی ولبەفورس

پاش ئەو جەژنی ئازادییە بەسە رۆژ، واتە: لە ١٨٣٣/٧/٢٨دا ئەو پاڵەوانە گەورەیەی سەربەستی و پیاوەتییە، سەری نایەوە. لە ١٨٣٣/٧/٣١دا (٨٠٠,٠٠٠) هەشت سەد هەزار قولەڕەش، لە رێی خوادا ئازاد کرا!. ولبەرفورسیش، جێگەی بەرز و پیرۆزی، لە دڵی ئەو قولەڕەشانە و لە دڵی هەموو نەوەی جیهاندا بۆ خۆی کردەوە.

## بیل

داهێنەری تەلەفۆن

١٩٢٢ - ١٨٤٧

(ئەسکەندەر گراهام بیل)، لە دایکێکی کەڕ و باوکێکی زبان تەڕ، لە شاری (ئەدینبورگ)، لە خاکی (سکۆتلەند)دا، لە ساڵی ١٨٤٧دا هاتۆتە جیهانەوە. لە خوێندنگا گەورەکانی (ئەدینبۆرگ) و (لەندەن)دا خوێندوویەتی. لە منداڵیا زۆر لەڕ و لاواز بووە. لە ترسی ئەوەی ئەویش وەک براکانی تری بەدەردی سیل بمرێ، لەسەر ئامۆژگاری پزیشکێک باوکی بەخاو و خێزانەوە گوێزایەوە شینایی گاهێک لە تەنیشت شاری (برانتفۆرد)ەوە لە خاکی (کەنەدە)دا. ئەوسا کە (بیل) تەمەنی ٢٣ ساڵ بوو. لەوێدا گەشی و ڕووخۆشی و گوڕەی کوڕینی تازە بووەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو باوکی کرا بەمامۆستایەکی مناڵە کەڕولاڵەکانی شاری (بۆستن). لەوێدا مامۆستاییەکی هونەرمەندانەی کرد. دانیشتوانی شارەکەی دڵخۆش و سوپاسگوزار کرد. بیل، هەر لە مناڵییەوە چاوی بڕیبووە ئەوەی کە ئەویش وەک باوکی کەڕولاڵ فێری تێگەیشتنی قسە بکا بەتەماشاکردنی جووڵەی لچ و لێو یاخود (قسەی بینراو). دوایی بەئاواتی خۆی گەیشت.

ڕۆژێ لە ڕۆژان، لەسەر ئامۆژگاریی باوکی، حکوومەتی (بوستن)، بیلی لەجێی ئەو کردە مامۆستای مناڵە کەڕولاڵەکان، ساڵی بە(٥٠) دۆلار. بیل وەستایی و شارەزاییەکی گەورەی نواند. لە گشت لایەکی ئەمریکادا ناوبانگی دەرکرد چونکە دەرگایەکی کەڵک و شادمانیی بۆ خەڵک کردەوە.

جگە لەوە، بیل، خۆشییەکی زۆری بەمۆسیقەدا چووبوو. بێ ئەوەی فێرکرابێ، لەسەر پیانۆ، ئاوازی بیستراوەی وەهای لێ دا، پیاو سەری سوڕ ئەما، وای ئەزانی کە وەستایەکی زۆر شارەزا لێی ئەدا!. بیل، گوێی مۆسیقی هەبوو. ڕۆژێ لە ڕۆژان پیانۆکەی ساز ئەکرد. کە کلیلی سازکردنەکەی بادا دەنگێکی دایەوە. لەوساوە، بیری لەوە ئەکردەوە کە کارێکی وا بکا، دەنگی مۆسیقی بەهۆی تەلێکی مسەوە

بگەیێنێتە شوێنێکی دوور. لە پاشا بیری لە گوێزانەوەی دەنگی گفتوگۆ کردەوە. ئەوەبوو لە دوای رەنجدانێکی زۆر ئاواتی خۆی هێنایەدی. وە ئەم (تەلەفۆن)ەی ئێستای داهێنا!.

## لە رێی کۆششا

بیل، هەر لە منالییەوە خەریکی داهێنانی تەلەفۆن بوو بەڵام تا نەگەیشتە (بۆستن) ماوەی باشی بۆ نەکرایەوە بیرەکەی خۆی بباتە سەر. بیل: بەمناڵە کەروڵاڵەکانی (میستەر ساندروس) و محامی (هوبارد)ی ئەخوێند. لە چاکەی ئەوەدا، ئەوانیش هەردووکیان، بەزمان و بەسامان یارمەتی بیلیان دا بۆ تەواوکردنی داهێنانی تەلەفۆنەکەی. بەڵام لەبەر ئەوەی بیل زۆری پێ چوو: وە ئەو هەموو رەنج و کۆششەیشی، لەپێناو داهێنانی تەلەفۆنەکەیا، بەبا ئەچوو هەردووکیان خۆیان لێ کێشایەوە، وە ئیتر یارمەتییان نەدا!. بیل لە دەستیاشکا. دەستێکی کەوتە ئەم لا و دەستێکی کەوتە ئەولا. ناچارما وبریاری دا کە بچێتە (واشینگتن) رێدانێک لە حکومەت وەرگری بۆ پێکهێنانی داهێنانەکەی. لەوێ چووە کن مامۆستا (جۆزیف هەنری) ناو کە زانایەکی بەناوبانگ بوو. وە تکای لێ کرد کە (تەلەفۆن)ەکەی تاقی بکاتەوە و بیری خۆی دەربارەی بنوێنێ. کابرا پیرۆزبایی لە بیل کرد وە ئامۆژگاریی کرد کە تا تەواوی نەکا واز نەهێنێ. بیل بەڵێنی دایە کە تا تەواوی نەکاو کۆڵ نەدا. کە (ساندروس) و (هوبارد)ی دۆستی بەم کەینە و بەینەیەیان زانی، زۆری پێ نەچوو بایان دایەوە. وە بەبیل بەڵێنیان دایەوە کە بەسامان یارمەتیی بدەن تا داهێنانەکەی تەواو نەکا!.

لە وەختێکا، بیل لە کۆگایەکی ئەلەکتریک هەندێ وردە کەلوپەلی ئەکری بۆ سازکردنی داهێنانەکەی: (تۆماس واتسن) ناوێکی پێگەیشت، بۆ بەدۆستی. لە شارەزایی و لە یارمەتییا گەلێ بەکەڵکی هات.

## سەرگرتنی تەقەلای بیل

لەپاش رەنجدان و ئەرک و ئازارێکی زۆری تاقیکردنەوەی چەند ساڵانە، بیل بەکامی خۆی گەیشت. تەلەفۆنەکەی گرتبوو بەدەستییەوە. لە ژوورێکی تریش (واتسن)ی دۆستی گوێی گری تەلەفۆنەکە لەمەڕ خۆی بەدەستەوە گرتبوو. لە پڕ دەنگی بیل بەپاکی و رەوانی لە تەلەفۆنەکەوە هات، پێی گوت: «میستەر واتسن وەرە لام فەرمانم پێتە»!. تەلەفۆن دەنگی دایەوە. وە لەگەڵ خۆیا کۆششی مەردانە وە فەرمانی هونەرمەندانە و چاکەی «بیل»ی بۆ هەموو دانیشتوانی سەرزەمین ئاشکرا کرد. بیل ئەوسا لە تەمەنی ٢٩ ساڵیدا بوو!.

## چاکە چاکەی لە دوە

بیل، لەپێناوی داهێنانی تەلەفۆنەکەیا، گەلێک تەنگانەی دەستکورتی و کەموکوریی و پلاروتیز و توانجی ئەم و ئەوی هاتەبەر. بەڵام بەئارام و هێزوتینی خۆی زاڵ بوو بەسەر هەموو بارێکا. وە دوایی بەئامانجی خۆی گەیشت. وە تەلەفۆنەکەی داهێنا!... تەلەفۆنەکەی بیل، لە راستیا، دەرگایەکی گەورەی بۆ گوزەران و پێشکەوتن و شادمانی و کامەرانیی جیهان کردبووەوە. بیل، رەنجی بەبا نەچوو. ئەو چاکەیەی کردبووی لەگەڵ هەموو کەسا بەفیڕۆ نەڕۆی. سەد چەندانە چاکەی درایەوە!.

هەر ئەو ساڵەی کە بیل داهێنراوەکەی تەواو کردبوو، لە شاری (فیلادەلفیا)دا نوین گاه (معرض)ێکی گەورەی بۆ داهێنراوە تازەکان کرابووەوە. پاداش بۆ سەرکەوتووەکان بڕیار درابوو. بیلیش (تەلەفۆن)ە خنجیلانەکەی خۆی لەوێدا نواند. بەڵام لەبەر دەست تەنگی نەیتوانی لە شوێنێکی وادا تەلەفۆنەکەی بنوێنی کە زۆر بەرچاوی بڕیاردەرەکان کەوێ. کە بڕیاردەرەکان گەیشتنە لای (تەلەفۆن)ەکەی بیل، لە بینین و گەڕان و پشکنینی داهێنراوان وەرس بووبوون، بڕستیان بڕابوو. ماندووبووبوون، ڕۆژیش لە ئاوابووندابوو. کە بیل تەلەفۆنەکەی پێشان دان و لە بنجوبناوانی دروست کردنی گەیاندن، بەتیز و فیزێکەوە پێیان گوت: «چۆن دەنگی پیاو لە جێیەکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەگوێزرێتەوە؟». باش بوو، شاهەنشاهی برازیل (دوم بیدرو) و مامۆستا (جۆزیف هەنری) لەناو بڕیاردەرەکاندا بوون. هەردووکیان، بەرەودوا، گوێی گری تەلەفۆنەکەیان گرت بەگوێیانەوە، کە سەرنجیان دا: دەنگەکەیان لە دوورێکەوە ئەگەیشتێ و بەپاک و ڕەوانی ئەهاتە بەرگوێی، وەختبوو لە خۆشیا گەشکەداربن!. شاهەنشاە نەیکردە نامەردی قیژاندی، گوتی: «سەیری خوایە! گوێم لێیە قسە ئەکا!؟». ئینجا هەردووکیان دەستیان کرد بەستایشی بیل. وە توانیان لەناو خەڵکەکەدا بینوێنن. بڕیاردەرەکان بیری خۆیان لە بارەی بیل گۆڕی. بڕیاریان دا کە (تەلەفۆن)ەکەی ئەو چاکترین داهێنراوە کە لەو ڕۆژەدا نوێنراوە!.

زۆری پێ نەچوو «هاوبەشی بیل» بۆ بازرگانیی تەلەفۆن دامەزرا. دەستکەوتیان لە دوای هەشت ساڵ، گەیشتە چوار ملیۆن دۆلار!. بیست و پێنج ساڵی پێ نەچوو، تەلەفۆن لە هەموولایەکی پێشکەوتووی جیهاندا بڵاوبووەوە. محامی (هوبارد)ی دۆستی، کچەکەی خۆی پێشکەش کرد. ئەمە ئەو کچە بوو کە بیل بەمناڵی و کەڕیی فێری خوێندنەوەی کردبوو. بیل دەوڵەمەندبوو، لە تەلەفۆنەکەیەوە سامانێکی زۆری بەسەرا ڕژا. لە کۆڕی زانستیشدا پایەی بڵندبووەوە. لەگەڵێ خوێندنگای بەناوبانگی ئەمریکا و ئینگلتەرەوە، نیشانەی زانستی بۆ هات. گەل کۆمەڵی زانستی ئەوروپا و ئەمریکادا کرا بەئەندام. لەگەڵێ حکومەتەوە نیشانی پایە بڵندی پێشکەش کرا. لە هەمووی خۆشتر، ژیا، تا بەچاوی خۆی تەلەفۆنە خۆشەویستەکەی خۆی بینی بڵاوبووەتەوە بەگشت لایەکی جیهاندا.

## مردنی بیل

ئەو پیاوە گەورەیەی کە باڵی بۆ گفتوگۆ دروست کرد، وە دەرگای گوزەران و کامەرانی و پێشکەوتنی بۆ هاونیشتمانەکانی سەرزەمینی کردەوە. لە ساڵی ۱۹۲۲دا لە دەس چوو. دایکی زەمین جگەرگۆشەیەکی هونەرمەندی پایە بڵند و بەکار و بەکەڵکی پیاوانەی تری گرتەوە باوەش!.

# نانسن

«پاڵەوانی جیهان لە پیاوەتیدا»

١٨٦١ - ١٩٣٠

## پێگەیشتنی نانسن

(فریدجنوف نانسن)، لە ساڵی ١٨٦١دا لە دێی (ئایکر) نزیک بەشاری (ئۆسلۆ) لە خاکی (نەرویج)دا لە خێزانێکی بچووک لە دایک بووە. دایکی لە کچێنیدا وەرزشکارێکی سەیر بووە. (نانسن)یش لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا: کوڕێکی کەڵەگەتی چوارشانەی بەهێز و گوڕی شۆخ و شەنگ، وە[*] وەرزشکارێکی بێ هاوتا بووە. لە گرەوی بەفرەخلیسکێدا تا دوانزە ساڵ لەسەر یەک، گوێ هونەری نەدا بەکەس. لە یاری وەرزشەکانی تریشا هەمیسان لە خاکی نیشتمانەکەیا سەر دەستە بوو، سەرکردە بوو لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا گرەوی جیهانی لە بەفرەخلیسکێدا بردەوە. سەیر ئەوە بوو کچێکی وەرزشکاریشی مارە کردبوو. بۆیەکا خاکی نەرویج لەناو خاکاندا بە(نانسن)ەوە ئەنازی و سەری هونەرمەندیی بەرز ئەکردەوە!. لە نۆزدە ساڵیدا پایەی (دوکتۆری فەلسەفە)ی وەرگرت وە بۆ سەرپەرشتیکردنی ناوازاەگاە (مۆزەخانە)ی (بەرگەن) دامەزرا بەڵام نانسن خۆشی بە(زانستی گیانلەبەران)دا چووبوو. وە هەر لە کوڕێنییەوە بڕیاری دا بوو کە ئەم زانستە بکاتە فەرمانی تاقانەی لە ژیانیا. جا ئەم دوو ئارەزووە بووە -ئارەزووی وەرزشکاریی و ئارەزووی زانستیی گیانلەبەران- کە نانسنی گەیاندە پایەی هەرە گەورە پیاوی گەشت و گەڕان لەناو زرێدا. نانسن لە فەرمانی سەرپەرشتی کردنی ناوازەگاە (موزەخانە) وازی هێنا. وە بڕیاری دا کە بچێتە گەڕان بەناو بەستەڵەکانی ژووروی زەمیندا، بۆ ئەمەی ژیانی ناو گیانلەبەر و پەلەوەرانی ئەوێ تێ بگا و زانستیی گیانلەبەران پێش بخا.

---

(*) وەرزشکار: رياضي. وەرزش: رياضة بدنية. (ش. ف)

## کۆچێکی سەخت

نانسن لە پاش لێکۆڵینەوە و چەندوچوونێکی زۆر بڕیاری دا کە گەڕانێک بکا بەناو[*] ناوچەی سەرووی زەمیندا. لە پێشدا بگاتە کەناری ڕۆژهەڵاتی دوورگەی (گرینلاند). وە لەوێوە بەرەو ڕۆژئاوا بەناو ئەو خاکەدا تێپەڕی و بەسەر شاخە بەستەڵەکە گەورەکەی ناوەڕاستیا هەڵگەڕێ و بڕوا تا ئەگاتە کەناری ڕۆژئاوای دوورگەکە ئەمە لە دەس کەس نەهاتبوو. لەبەر ئەوە ئەوانەی شارەزای ئەو شوێنە بەستەڵەکانە بوون تیزیان پێ ئەکرد. وە ئەیان گوت: ئەمە قەت سەرناگرێ!.

بەڵام نانسن، چاوی لە هیچ نەئەترسا. چەند هاوڕێیەکی بەکاری بۆ ئەم گەڕانە هەڵبژارد. هەرچی بابەتی ئەو گەشتە بوو: وەک چرا و[**] بەفرەخلیسکە و کەلوپەلی چێشت لێ نان -کە خۆی تازە دای هێنابوو- لەگەڵ خۆی هەڵیگرت. پشتی بەست بەخوا بەرەو ئامانج کۆچی کرد. کە گەیشتە کەنار ڕۆژهەڵاتی دوورگەی (گرینلاند)، لەگەڵ هاوڕێکانیا پێویستی ڕێگای هەڵگرت و سواری بەفرەخلیسکەکانیان بوون بەشینەیی و ئەسپاییەکی زۆرەوە بەسەر ئەو شاخە سامناکانەدا دەستیان کردە سەرکەوتن. لە پاش دوو ساڵ ڕۆیشتن توانیی بگاتە ئەو لوتکە شاخەی کە شەش حەوت هەزار پێ لە رووی زرێوە بەرزبووتەوە. پاشان دا گەڕایەوە خوارەوە تا گەیشتە کەناری ڕۆژئاوای دوورگەکە. نانسن بەمە ناوبانگی پاڵەوانییەکی بێ هاوتای پچڕی. هێشتا کەس بەو پایەیە نەگەیشتبوو. ئەو زستانەی لەگەڵ خێزانێکی (ئەسکیمۆ)یدا ڕایبوارد. ژینی ئەسکیمۆکانی بەتەواوەتی کۆڵیبووەوە، کە گەڕایەوە نەرویج بەناوی (ژینی ئەسکیمۆ)وە نووسراوێکی بەناوبانگی لە بابەت بەسەرهات و ژیانی کۆمەڵایەتییانەوە. نووسیەوە. ئەنجامی گەڕانە زانستییەکەی خۆشی -کە لە دوورگەی گرینلاندا کردبووی- بەنووسراوێک بڵاوی کردەوە. لە نەرویجدا ناوی بڵاو وە پایەی بڵندبووەوە. نانسن کرایە گەورەی (ناوازەگاهی گیانلەبەران) لە (ئۆسلۆ)دا.

## کۆچ بۆ ناوچەی سەرووی زەمین

لەژێر سەرپەرشتی و داهێنانی خۆیا کەشتییەکی وای بۆ دروست کرا تا ئەوسا وێنەی نەهاتبووە جیهانەوە. پەلی بەستەڵەک کاری لێ نەئەکرد. ناوی نا (فرام). لەگەڵ کەشتییەوانێکی ئازا و یانزە هاوڕێی نەرویجیدا، بەتەنشت کەناری ژووروی ئەوروپا و ئاسیادا، بەرەو (ناوچەی سەرووی زەمین) کەشتییان لێ خوڕی. پاش (٣٥) مانگ ڕۆیشتن، لە ١٨٩٧دا کەشتییەکەیان وەستا: ئاوەکە بەهەر چوارلایا بەستبووی نەی هێشت بڕوا. ناچارمان چەند مانگێک لە جێی خۆیان مانەوە. بەڕاوکردنی گیانلەبەرانی ناوچەی سەرووی زەمین و بەخوێندنەوەی نووسراوانی ڕەنگاوڕەنگ و بەلێدانی ساز و بەگوێ گوتن لە ئاوازی خۆش وەختیان بەسەر ئەبرد. پاشان، نانسن، لەگەڵ (جالمان جونسن) هاوڕێیەکی ئازایدا، بە ٢٨ سەگی ئەسکیمۆ و (٣٠) بەفرەخلیسکە و (٣٠) گەمی وە، بەسەر ئەو بیابانە کاکی

(*) ناوچەی سەرووی زەمین: منطقة قطبي شمالي. (ش. ف)

(**) بەفرەخلیسکە: جۆرە گالیسکەیەکە، بەسەر بەفر و سەهۆڵدا، سەگ ڕای ئەکێشن. (ش. ف)

بەکاکییە بەفرینەدا، ڕێگای گرتەبەر بۆ ناوچەی سەرووی زەمین. پیاو ناتوانێ بیگێڕێتەوە کە چە ئەرک و ئازارێکیـان تووش هات. لە پاش کـۆششـێکی مـەردانەی بێ هاوتا کە لە تـوانای کـەسـانەبوو، گـەیشـتنە شوێنێکی وا نزیک لە ناوچەی سەرووی زەمینەوە، کە تا ئەوسا کەس نەیتوانیبوو بیگاتێ. لەوێ نانسن چووە سەر جێگایەکی بڵند، وە بەدووربین سەیرێکی ئەو بڵنداییە سامناکانەی ناوچەی سەرووی زەمینی کرد. ئینجا لەگەڵ هاوڕێکەیا بەرەو دوا گەڕایەوە. لە ڕێی وەختبوو لەناوبچن. (٢٦) سەگ لە سەگەکانی تۆپین. لەپڕ شـەوە سـامنـاکـەکـانی نـاوچەکـەیان بەسـەرا داهات. نەیان تـوانی لەجـێی خـۆیان بجـوڵێن تا ڕۆژهاتەوە سـەرهەڵاتن وەک جاران. لەپاش ڕەنج و کوێرەوەرییەکی یەجگار سەخت و ناخۆش کە لە وزەی کـەسـانەبوو بەرگەی گـرێ، لەو دەشـتـە بەسـتـەڵەکـە چـۆڵ و هـۆڵەدا، تاقـە زەلامـێکیـان تووش هات. ئەوە (میـسـتـەر جاکسن)ی ئینگلیز بوو بوو گەڕابوو، بەشـوێنیـانـدا بیـان دۆزێتەوە. جـاکسن و هـاوڕێکانی میواندارییەکی ناوازەیان کردن. وە لەگەڵ خۆیاندا و زمـاوەندێکی بێ هاوتای بۆ کرا. ئازایی و پاڵەوانیی نانسن لە هەمـوولایەکی زەمینـدا دەنگی دایەوە. نانسن، بەم گەشتانەی گەلێکی خستـە سەر زانسـتی و شـارەزایی لە بابەت ڕەوشـتـی زرێ بەسـتـەڵەکـەکـان وە بەتایبـەتی بابەتی گـێـژی ناو زرێوە. بووە بۆنەی داهێـنانگەلی بیـرەوەریی باش لە کـەشـتـییـەوانیـدا. لەبەر ئەوە لە خوێندنگا گـەورەکـەی (ئۆسلۆ)دا کـرا بەمـامـۆسـتـای زانسـتـیی گـیـانلەبەران وە شـوێنێکی تایبـەتیی بۆ تەرخـان کـرا. بێـینەوە سـەر باسی کەشتییەکەی، (فرام). هاوڕێکانی، لە پاش ئەو هەمـوو چاوەڕوانییە دوور و درێژە کە کردبوویان، وایان زانیـبوو کە نـانسن و هاوڕێکەی لە گەڕانەوەکـەیان بوونەتەوە و گـەڕاونەوە، پێشـیـان کـەون، هاتبـوون بەدوایاندا بیـان دۆزنەوە. لە پاش مـاندووبوون و تەقـەلایەکی زۆر و تـووشی تەنگ و چەڵەمـەبوون گەیشتبوونەوە خاکی نەرویج. وە لە پاش ئەمەی لە ڕێ دەستیـان شتبوو لە گیـانی نانسن و هاوڕێکەی، بەگەیشتنەوەی هەردووکیان موژدەیان درایێ. لەبەر ئەمەی خۆشیان و (فرام)یش هیچیان لێ نەهاتبوو لە خۆشیـانا دوو تۆپیان ئاگردا... تەنیا بۆ ئەمەی نانسن، سە نامەی کورت لە بابەت ئەم گەشتوگوزارەیەوە بنووسێ و بینێرێ بۆی، ڕۆژنامەی (دیلی کرۆنیکل)ی ئینگلیزی چوار هەزار لیرەی پێ بەخشی!. ئەمە یەکـێک بوو لە فـەرمانە گەورەکـانی دوکتـۆر نانسن بۆ جیـهان. بەڵام تۆ چیت لێ دیوە؟ سەیرکـە چەند ئەوەندەی تر بەکەڵکی هات!...

## دیل ئازادکردن لە ڕووسیای سۆڤیێتیدا

شەڕی جیهانی یەکەم تەواو بووبوو. دوو ساڵی بەسەرا تێپەڕیی بوو. کەچی هێشتا ئەو نیو ملیۆن دیلە ئەوروپاییانە کە لەلایەن حکوومەتی ڕووسیاوە گیرابوون بەرەڵلا نەکرابوون. بەسەزمانانە، لەبەر بێ نانی و سارد و سڕیی و چۆڵ و هۆڵی (سیبەریا)ی بەستەڵەک و بیابان، پەیتا پەیتا هەزارانیـان لێ ئەمرد. هەروا لە کڵۆڵی و چارەڕەشیدا مابوونەوە، کەسێ نەبوو خەمێکیـان بخوا و بەزەیی پیایاندا بێتەوە تا ئەوسا!. کۆمەڵی گەلان -عصبە الامم- کە لە ساڵی ١٩٢٠دا، دەماری پیاوەتیی جوڵا، بڕیاری دا کە ئەم دیلانە بگێڕێتەوە ناو خاکی خۆیان. بەکەسیا ڕانەنەپەڕمو بتوانێ ئەم کارگوزاریی و هونەرمەندییە بنوێنێ (نانسن) نەبێ. نانسن بەڕووخۆشییەکەوە ئەم فەرمانە گرانەی گرتە ئەستۆی خۆی. چووە ڕووسیا.

وە لە پاش چەند و چوونێکی زۆر لەگەڵ وەزیری دەرەوەی حکومەتی ڕووسیای سۆڤیەتیدا -چیچەرین- فەرمانەکەی بردسەر. بەشەمەندەفەرێکی زۆرەوە خۆی گەیاندە (سیبەریا). وە ئەو نیو ملیۆن دیلەی لەگەڵ خۆیا گێڕاندەوە ناو کەسوکاریان. بەم ڕەنگە نانسن خۆشی و بەختیاریی خستەوە دڵی نیو ملیۆن خێزان یاخود دوو ملیۆن و نیو کەسی هەناسە ساردەوە!.

## تێرکردنی برسییەکانی ڕووسیای سۆڤێتی

زۆری پێ نەچوو، برسێتییەکی زۆر داکەوت لە ڕووسیای سۆڤێتیدا. بەملیۆن لەو ڕووسە کڵۆڵانە کەوتبووە ژێر چەپۆکی مردنەوە. گرانەتا (حمى التيفوس)ی سامناکیش لەناویاندا بڵاوبووبووەوە، گیانی هەزارانی ئەکێشا. برسێتی برسییەکانی خستبووە سەر پیاوخۆریی!. نانسن، پیاوەتی هاتە جۆش. لە ساڵی (١٩٢٠)ەوە تا ساڵی (١٩٢٢)، چوار جار چووە ڕووسیا. وە ئەو تەنگانە و شپرزەیییەی ڕووسەکانی بەچاوی خۆی دی. دەماری مەردایەتیی بزووت. هاواری هێنا بۆ گەلە گەورەکانی ئەورووپا کە بەدەستیاو (قرض) یارمەتیی ڕووسەکان بدەن. بەڵکو ئەو برسێتی و نەخۆشی و دەرد و مەرگە لە کۆڵ ئەو کڵۆڵانە بکاتەوە. بەڵام یەک (گەل) گوێی لە (نانسن) نەگرت!. ئەیانگوت: کۆمەکی گەلی (بولشەوییک) ناکەین!؟. لەگەڵ ئەوەشا، نانسن، وورەی بەرنەدا. گەڕا بەناو خاکی ئەڵمانیا و بەریتانیای گەورە و بەلچیکا و فەرەنسە و هۆڵەندە و دانیمارک و ئیسوەج و کەنەدە و خاکە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا!. گفتوگۆی کرد. کۆششی کرد. تەقەلای دا. زۆری پێ نەچوو، بەزرنگی و ئازایی و هونەرمەندیی خۆی: ئەم فەرمانە پیرۆزە، بەرزە، پیاوانەیەشی بردەسەر!. دراو و کەلوپەلێکی بێ شوماری کۆ کردەوە. هێنانیە ڕووسیا. وە بەملیۆن گیانی جووتیارانی لە دەس برسێتی و مەرگ ڕزگار کرد. ئەڵێن تەنیا ئەوانەی نان و بەرگی دەست خستبوون (١,٦٠٠,٠٠٠) کەس بوون!. بەم ڕەنگە، نانسن، سەربەرزییەکی تریشی خستە سەر سەربەرزییەکانی تری.

## پەنادان بەیۆنانیە ئاوارەکانی تورکیا

پاش شکاندنی یۆنانییەکان لە تورکیادا، ساڵی ١٩٢٢، بەچەند سەعاتێک، ئاگر بەردرایە گەڕەکی یۆنانییەکانی شاری (ئیزمەر) کە ژمارەیان (١٢٧,٠٠٠) کەس بوو. (مستەفا کەمال)یش کە سەرکردەی ئەو وەختەی تورکیا بوو، بڕیاری دا بوو کە یەک یۆنانی لە خاکی تورکیادا نەهێڵرێتەوە!. یۆنانییە قوربەسەرەکان، کە ژمارەیان خۆی لە ملیۆنێک ئەدا، بێ نان و بێ دەرەتان، لات و نابووت، بەشپرزەیی و کەساسییەکی لە ئەندازە بەدەرەوە، ڕوویان کردەوە یۆنانستان، خاکی باووباپیری خۆیان!. لێ قەومانێکی یەجگار سەخت و ناخۆش بوو. جگەری هەموو کەسێک وە بەتایبەتی جگەری یۆنانییەکان ئەسووتاند. کۆمەڵی گەلان، بۆ جارێکی تر، ڕووی نایەوە لە (نانسن)، کە بەدڵسۆزیی و پیاوەتی بەناوبانگی خۆی، بۆ ئەو یۆنانییە کڵۆڵانە جێی حەوانەوە و نان پەیدا کات!. خۆشی پەیداکردنی دەستیاو (قرض)ی گرتە ئەستۆی خۆی کە بیدا بەحکومەتی یۆنان بۆ چارەکردنی ئەو سەرگەردانییە. نانسن، بەشەمەندەفەر چووە ئەستەمبۆڵ و ئیزمیر و ئەسینا. وە بەچاوی خۆی پەرێشانی و سەرگەردانیی ئەو یۆنانییە هەناسە

ساردانەی دی. نانسنم، نانسن بوو، داوێنی مەردایەتیی کرد بەلادا. گوری بەستەوە و بەهەموو هێز و توانایەکیەوە خۆی هاوێشتە ناو ئەو فەرمانە گران و بەئەرکەوە. زۆری پێ نەچوو، بەهەزاران خانووی خنجیلانەی دروست کردبوو بۆ حەواندنەوەیان. وە بەملیۆن کەلوپەلی کار و فەرمانی دانێ لەگەڵ هەموو پێویستێکی تردا، بۆ ئەمەی سەرلەنوێ ژیان و گوزەرانێکی ئاسان و خۆش دەست پێ بکەنەوە!. بەم رەنگە، نانسن، کورج و کۆلانە و پیاوانە، ژین و گوزەرانی ملیۆنێک یۆنانیی ئاوارە و بێچارەی، بەجوانی و رێکوپێکی پێک هێنا. وە فەرمان و کارگوزارییەکی بێ وێنەی تری لە مێژووی جیهاندا نووسیەوە!.

## فەرمانە پیاوانەکانی تری

نانسن، بەدڵ، کۆمەکی گەلە شپرزە و کزەکانی ئەکرد. وە لە تەنگانەدا فریایان ئەکەوت و دەستی ئەگرتن. یەکێ لە سەرکردە دەربەدەرەکانی (ئەرمەن) بەناوی خۆی و گەلەکەیەوە ئەیگوت: «ئێمە، نانسن بەپێغەمبەرێک دائەنێین، خوای گەورە بۆ ئێمەی رەخساندووە، پارێزگاریی و پشتیوانیمان بکات».

کە هەرای ناو ئیتالیا و یۆنانستان، لەسەر (کورفو)، گەیشتە ئەوەی (کۆمەڵی گەلان) لەناوبەرێ: نانسن و بەکۆششی مەردانەوە کەوتە ناوەوە. نەیهێشت شەڕ هەڵگیرسێ. گەلە بچکۆلەکانی کرد بەیەک و نوساندنی بە(کۆمەڵی گەلان)ەوە. وە جیهانی لەدەست شەڕێکی گەورەی خوێنێن رزگار کردا. کە دوژمنەکانی ئەڵمانیا، ویستیان تەگەرە بدەن لە تێکەڵبوونی ئەڵمانیا بە(کۆمەڵی گەلان)، نانسن کەوتە ناوەوە، گەلە بچکۆلەکانی کردەوە بەیەک وە ئەم گەڕ و کێچەڵەیشی لەناوا هەڵگرت!.

نانسن، ئەیویست، ئەو چەند ملیۆن کرێکارانە، کە شپرزەی دەستی زۆر و چاوبرسێتیی خاوەن کارخانەکان بوون، بخاتە ئازادیی و کامەرانییەوە. لەگەڵ (لوردسیسیل)دا کۆشا بۆ دامەزراندنی (کۆڕێکی جیهانی نوێ بۆ نەهێشتنی بەندەیی).

لە ساڵی ١٩٢٢دا بەخششی (نۆبل)ی درایە بەناوی (ئاسایش خواهی)یەوە بەڵام هەمووی لە پێناوی پیاوەتی و مەبەسی زانستییا بەخت کردا...

## رەوشت و خوی نانسن

نانسن پیاوێکی کەڵەگەت، قژ سپی، دەنگ نێر، چاوشین، دڵ رۆشن، خاوەنی سەروسیما و رەوشتێکی جوان و پیاوانە بوو. گرفتاری گەشتوگوزاری دەشت و دەروشاخ و زریێ بوو. لە وێنەکێشان و زانستی زەمین (جوگرافیا) و زانستی سروشت (علم الطبيعة)دا، لە زریێ وانی و گەشتوگەڕاندا، لە کارگوزاریی و وتار خوێندنەوەدا، لە وەرزش کاریی (الرياضة البدنية) و کردەوەی پیاوانەدا، شارەزایی و هونەرمەندیی و دەسەلاتێکی بێ هاوتای هەبوو! لەبەر ئەم رەوشت و خووە جوانانەی، نانسن، تا ما، هەرە خۆشەویست و بەرێزی جیهان بوو. گەورە و بچووک کرنۆشی نەوازشیان بۆ ئەکێشا. جارێکیان، لە ساڵی ١٩٢٨دا، چەند منداڵێکی ئینگلیز لە خوێندنگای (کەمبرج)ەوە، لەگەڵ مامۆستاکەیان چوونە (نەرویج). دیارییەکی سەیریان پێشکەشی (نانسن) کرد، نانسن زۆر سوپاسی کردن زۆر نازی کێشان.

وە میوانداریيەکی جوانی کردن. لە بابەت ڕاپەڕاندنی کار و فەرمانی پیاوانە و بەکەڵکەوە وتاێکی نایابی بۆ خوێندنەوە. دیاریی منداڵەکان ئەمە بوو: -نموونەیەکی شەش پێ- چوارگۆشەیی، یان دروست کرد ئەخشاندبوویان بەوێنەی ئەو بەفر و سەهۆڵبەندانە و ئەو زریێ و زەوییانە و ئەو گیانلەبەرە ڕەنگاوڕەنگانە کە لە ژووروی ئەوروپا و ئاسیا و ناوچەی سەرووی زەمیندان، لەگەڵ ئەو کەشتییەی کە (نانسن) پێی چووبووە ئەو شوێنانە. دیارییە کە یادگارێک بوو، خۆشەویستی ئەو منداڵانەی دەرئەخست بەرامبەر (نانسن)، بۆ ئەو کردەوە گەورانەی کە لە کۆڕی زانستییا نواندبووی. نانسن، بەمە خۆشی زۆر گەیشتێ. منداڵەکانی بەشادمانییەکی بێ ئەندازەوە گەڕانەوە ئینگلتەرە.

### کۆچی دوایی

لە ساڵی ١٩٣٠دا، نانسن. گیانی پاکی بەخواسپارد. وە دانیشتوانی زەمین فرمێسکی خوێنینیان بۆ لە دەست چوونی ئەم پیاوە گەورە بەنرخە ڕژاند. وە تێ گەیشتن کە جیهان، پیاوی وا بەکەڵکی کەم تیا هەڵ ئەکەوێتەوە!...

## گۆتەمبەرگ

«داهێنەری چاپگەریی نوێ»

١٤٠٠ - ١٤٦٨

### منالیی گۆتەمبەرگ

(جۆن گۆتەمبەرگ) لە ساڵی ١٤٠٠دا، لە ئەڵمانیا، لە شاری (مەنتز)دا لەدایک بووە. ئەو دەمە نەخوێندەواریی هەموو لایەکی ئەڵمانیای داگیر کردبوو. گۆتەمبەرگ بۆ گوزەرانی خۆی، فێری زەرەنگەریی بوو. ئەڵێن وەستاکەی کە ناوی (کەستەر) بووە، لە ساڵی ١٤٢٣دا، ڕۆژێک، لەگەڵ منالەکانیا ئەچێتە ناو بێشەیەکەوە بۆ سەیران. ئەهێنی ناوی منالەکان لە قەد درەختێک هەڵ ئەکۆڵی. گۆتەمبەرگیش بەدیارەوە ئەبێ. وە لەوساوە بەبیریادێ: کە ئەگەر بێتو تیپەکان (حروف)، یەک یەک بەجیاواز دروست کات، لەوەپاش ئەتوانێ وشە (کلمە) لەو تیپانە پێک بێنێ. بەم ڕەنگە، ئەو یارییەی کە وەستا (کەستەر) لەگەڵ منالەکانیا ئەیکرد، بیری گۆتەمبەرگی خستە سەر داهێنانی تیپیی جۆێ جۆێ. کە لە پاشا بووە بنچینەی ئەم چاپە نایابانە کە ئیمرۆ ئەبینین.

## چاپگەریی

لەوساوە تا ئێستا ڕۆژ بەڕۆژ چاپگەریی پێش ئەکەوێ، تا گەیشتۆتە ئەم ئەندازەیەی ئیمڕۆ، کە پیاو سەری لێ سوور ئەمێنێ!... لە پێشا نووسراوەکان بەدەست چاپ ئەکران. پاشان لەبرێتی دەست، شتێک داهێنرا کە با ئەدرا نووسراوەکە چاپ ئەکرا. پاش ئەوە بەهەڵم چاپ ئەخرایەگەڕ ڕۆژنامەی (تایمس)ی لەندەنی، لە ساڵی ١٨١٤دا، بۆ یەکەم جار، بەهۆی هەڵمەوە چاپ کرا. بەڵام ئیمڕۆ ئەلەکتریک چاپ ئەخاتە گەڕ. هەتادێ، چاکتر و پاکتر و جوانتر ئەبێ. زووتر بەمەبەسمان ئەگەیێنی کەمتر پارەمان پێ بەخت ئەکات. وە زووتر بەکەڵکمان دێ. ئیمڕۆ لە زۆرچاپخانەدا، لە پاش چاپدان، تیپەکان لە یەک جوێ ناکرێنەوە. دەمودەست فڕێ ئەدرێنە بۆتەوە. ئەتوێنرێنەوە. پاش ئەوە دائەڕێژرێنەوە بەتیپی نوێ. بەوە وەختیان زووتر بۆ ئەگەڕێتەوە. گەلێک شتی وایان داهێناوە. هەر خۆی قاقەز ئەنوشتێنێتەوە، ئەیبڕێ، ئەش دووری ڕۆژ نییە بەهەزار و بەملیۆن نووسراوان، بەجوانی و ڕێکوپێکی و گورجی لە چاپ ئەدرێن. خۆ چاپکردنی ڕۆژنامەکان، ئەوەندە زوو تەواو ئەبێ، پیاو سەری سوڕئەمێنێ!... جا بزانین لەمەدوا، لە جیهانی چاپگەرییدا، شتی چەند سەیرترمان چاو پێ ئەکەوێ!...

## کۆششی گۆتەمبەرگ

گۆتەمبەرگ لە ساڵی (١٤٣٤)ەوە تا ساڵی (١٤٣٩) کۆششێکی پێنج ساڵەی پاڵەوانانەی کرد تا چاپ و بابەتی چاپی داهێنا وەک: ڕەنگ، فلچە دویت، لوولە، شانەی تیپ و مەنگەنە. ئەڵێن: گۆتەمبەرگ چاپگەریی لە شاری (ستراسبورگ)دا کردووە. بۆ ئەمەی دەستکەوتی زۆر بێ، نەی هێشت کەس پێی بزانێ، خۆی وا ئەنواند کە زەڕەنگەریی ئەکا!... لە قەراغ شار، لە کەلاوەی کەنشتەیەکا، شوێنێکی بۆ خۆی دۆزیبووەوە، وە لەوێدا بەشەو، بەدزییەوی دەسی ئەکرد بەنووسراو لە چاپدان!... لای کەسیش نەی ئەدرکاند کە ئەم نووسراوانە چاپ کراون، ئەیگوت بەدەست نووسراونەتەوە!. بەڵام، ئەمەی، زۆر بۆ نەچووە سەر. پاشان پێیان زانی، هەندێ کەس پێیان ناخۆش ئەهات کە گۆتەمبەرگ دەوڵەمەندبێ!... چاویان پێ هەڵ نەهێنا!... لێی کەوتنە چاوڕاو. وازیان لێ نەهێنا تا هەر چییەکی دەست کەوتبوو لە دەستی چوو!. گۆتەمبەرگ ناچارما کۆچی کردەوە بۆ شاری (مەنتز). بەڵام لەوێ، خوا دوو کەسی بۆ ڕەخساند یارمەتییان دا. یەکێکیان (فوست)ی پارەدار، ئەویتریشیان (جوفر)ی کارگوزار، هەرسێکیان پێکەوە دەستیان کرد بەچاپگەریی بەڵام دوژمنیان زۆر لێ ڕاپەڕیی!... لە ترسی بڵاوبوونەوەی نووسراو و نەمانی نەخوێندەواریی. قەشەکانی زۆر بەرەنگارییان کرد!... ئەیان گوت: نانمان ئەبڕێ!؟... نووسراو نووسەکانیش دوژمنایەتییان ئەکرد، ترسی ئەوەی پەکی کار و فەرمانەکانیان کەوێ!... چونکە نووسراوە لە چاپ دراوەکان، گەلێک هەرزانتر ئەوەستان، لە نووسراوە بەدەس نووسراوەکان. ئەگەر نرخی ئینجیلێکی بەدەس نووسراو، بەپەنجا لیرە بوایە، یەکێکی لە چاپ دراو بەشەش لیرە چنگ ئەکەوت!... جا بزانە گۆتەمبەرگ چە زیانێکی لێ ئەدان، وە چە چاکەیەکیشی بەخەڵک ئەگەیاند!...

ئەمان نووسراوەکانیان بەڕەنگی سوور لە چاپ ئەدا. دوژمنەکانیان بۆیان هەڵبەست کە (فوست)

هاوبەشی شەیتانە!؟... خۆی فرۆشتووە بەشەیتان. شەیتانیش ئەم نووسراوانەی بەخوێنی ئەو لە چاپداوە!؟... ئەیان گوت: بەکۆمەکی شەیتانەوە نەبێ، کێ هەیە بتوانێ، لە وەختێکی هێندە کەما، ئەمەندە نووسراو لە چاپ بدا!!؟...

بەم فروفێڵ و چاووڕاو پڕوپووچانەوە، پیاوخراپەکان هورووژمیان ئەبردە سەر ئەو پیاوە دڵسۆزە باشە، وە ئەیان ویست هەر لە بێشکەدا داهێنراوەکەی بخنکێنن!...

## نوخشەی نووسراوی لە چاپ دراو

گۆتەمبەرگ لە ماوەی پێنج ساڵدا (١٤٥٠-١٤٥٥) بەزبانی لاتینی. لەسەر شێوەیەکی جوان و ڕەندین، لە دوو بەرگی گەورە و بەتیندا ئینجیلی لە چاپ دا. بەرگەکان لە داربەڕوو و پێست دروست وە کلۆمیش کرابوون. ئەم نووسراوە، کە بە(نووسراوی گۆتەمبەرگ) ناوبانگە، یەکەم جار، لەلایەن نووسراوخانەی شاری لەندەنەوە کرِا بە (٧٩٠) لیرە. پاشان لە ساڵی ١٨٨٢دا فرۆشرایەوە بە(١٦٠٠) لیرە، لەم‌دواییەشا یەکێک لە دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا بەنرخێکی بێ هاوتا کڕییەوە و بەپارێزگارییەکی زۆرەوە گوێزایەوە شاری (واشینگتون) ئێستەش ئینجیلی گۆتەمبەرگ لە هەرەتی جوانیایە. وە ئەم (٤٩٣) ساڵە کە بەسەریا تێپەڕیوە هیچی لێ نەکردووە!...

## گەورەیی گۆتەمبەرگ

تا ئەرک و ئازاری خەڵک نەزانین بەدەست نووسراو نووسینەوە و نووسراو کەمی و نووسراوگرانی و نەخوێندەوارییەوە، کە هەمووی لە ڕووی بێ چاپییەوە ڕووی ئەدا: کەڵک و چاکەی چاپ و گەورەیی و هونەرمەندیی گۆتەمبەرگ داهێنەری چاپمان باش نایەتە بەرچاو. وە نازانین بەچە جۆرێک وە تا چە ئەندازەیەک ئەم چاپە بێ هاوتایە، ئەوەی ئادەمی بەرە پێشکەوتن و ئازادیی و خۆش گوزەرانی و کامەرانی بردووە!.

نووسراو، لە پێش داهێنانی چاپدا، بەدەست ئەنووسرایەوە. درەنگ ئەهاتە بەرهەم کەمی لێ ئەهاتە ناوەوە. زۆر دانسقەبوو. کەم کەسیش لە توانایدا هەبوو بیکڕی، پیاوی زۆر دەوڵەمەند نەبێ!... لەگەڵ ئەوەشا بەدەگمەن هەڵ ئەکەوت، لە هەڵە و ناپوختەیی بەدووربێ!... لەبەر ئەوە خوێندەواریی، لە ئارەزوو و توانای کەم کەسا مابوو. وە نەخوێندەواریی بەجۆرێک فەرمانڕەوا بوو، ژیانی لە جیهان کردبووە ژان!...

بەڵام کە چاپ داهات، ئەم تاریکییە لاچوو، وە ئەو بەزمانە هیچی نەما!... ئەڵێن، پێش هەموو کەس، چینییەکان چاپیان بەکارهێناوە. لە سەدەی شەشەمی پاش لەدایکبوونی عیساوە چاپیان ناسیوە. بەڵام لەناویاندا، بلاو نەبووتەوە تا سەدەی دەهەم. لە سەدەی سیانزەهەمدا، زۆر نووسراوە کۆنە ئەدەبییەکانیان لە چاپ دراون. بەڵام لە چاپی کۆنی ئەواندا نووسراوەکان، لەسەر کەرتە تەختە هەڵ کەندران. تیپەکان، وەک هی ئێستا، جوێ جوێ نەبوون. لە جێی خۆیان نەئەگوێزرانەوە. وە بەکاری نووسراوێکی تر نەئەهاتن. ئێستایش، چینییەکان، ئەو شێوە کۆنەیان پێ باشترە لە شێوەی چاپی ئێستا. چونکە زبانەکەیان، بەسەدان تیپی تیایە، وە ئەمە بۆ ئەو باشترە.

ژاپۆنییەکان، لەوانەوە فێری چاپگەریی بوون. بەڵام، لەم دواییەدا ئەوانیش دەستیان کرد بەبەکارهێنانی تیپی جۆێ جۆێ و بزێو، وەک هەموو لایەکی ترا... ئەڵمانییەکان ئەڵێن: ئێمە دەستکردی چاپ و قاقەز و ڕۆژنامەمان گەیاندۆتە ئەوروپا. لە پێشا، وێنەی قاقەزی یاریی و دەنگوباسی قەشەکانیان، لەسەر کەرتە تەختە لە چاپ ئەدا. بەڵام، لە سەرەتای سەدەی پانزەهەما دەستیان کرد بەتیپ دروست کردن لە دار و لە مز، وە لەو تیپە جۆێ جۆێ و بزێوانە، وشە و نووسراویان پێک ئەهێنا.

لە پاش چەند و چوونێکی زۆر، مێژوونووسان، بڕیاریان دا، کە داهێنەری ئەم تیپە دار و مزانە، (جۆن گۆتەمبەرگ)ی ئەڵمانییە. ئەم تیپانە بۆیەکا باشن، گەلێک جار بەکار ئەهێنرێتەوە بۆ چاپ کردنی گەلێک نووسراوان. ئینجا بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ، کە گۆتەمبەرگ چەند بەکەڵکی هاوڕەگەزی خۆی و هاونیشتمانەکانی سەر زەمینی هاتووە. گەلێک لە گەورە پیاوان ناویان لە بیر ئەچێتەوە. بەڵام تا جیهان مابێ ناوی گۆتەمبەرگ لەبیر ناچێتەوە. چونکە، ئەگەر ئەو نەبوایە. وە پیاوی وەک ئەومان بۆ هەڵنەکەوتایە، تا ئەمباین لە چرای زانستی و فەن و ڕەوشت و ئایینی نایاب، وە لە بەری ژینی ڕاستەقینە، بێ بەش ئەماینەوە!...

## دوارۆژی گۆتەمبەرگ

سەیر ئەوەیە، گۆتەمبەرگ، گەلێک جار، لە بابەت چاپەوە دوودڵ ئەما. وەختبوو وازی لێ بێنی. چونکە بەبیریا ئەهات کە هەروەک کەڵکی هەیە زیانیشی لێ پەیدا ئەبێ بەڵام کە لێکی دایەوە: چاکەکانی چاپ لە خراپەکانی زۆرتربوو، ملی دایەوە سەر چاپگەریی، فەرمانە بەنرخە بێ هاوتاکەی خۆی. بەڵام داخەکەم، ئەو پیاوە بەکەڵکە گەورەیە. لە تەمەنی ٦٨ ساڵیدا سەری نایەوە. گۆتەمبەرگ، هەموو تەمەنی بەخت کرد بۆ سەروەت و پێشکەوتنی هاوڕەگەزی خۆی. ئەوانیش بەیادی ئەو فەرمانە و ڕەنجە بەکەڵکانەیەوە، وە بۆ ئەمەی تا جیهان ئەمێنێ ناوی نەکوژێتەوە، لە شاری (مەنز)دا پەیکەر (هیکل، تمثال)ێکیان بۆ کرد، ئەو پەیکەرە ئێستایش بەپێوەیە، خەڵک تیژ ئەکاتە سەر چاکەکردن!...

## هورد

«ڕێکخەری بەندیخانەکان»

١٧١٦ - ١٧٩٠

«قەت نەم بیستووە بەندیخانە ئارەزووی بەدکرداریی لە دڵی بەندییەک کردبێتە دەرەوە. بەڵکو بەپێچەوانەی ئەوە، هەموو ڕۆژ، ئەبینم بەچاوی خۆم، کە بەندیخانەکان، خووی گوناهکاریی و بەدکرداریی، فێری بەندییەکان ئەکەن. بەڕاستی، ڕاستی کردووە، ئەوی بەندیخانەی ناوناوە (بۆتەی بەدکردایی)!».

-دوکتۆر فرانک کراین-

### پێگەیشتنی هورد

(جۆن هورد)، لە ماڵی باپیریا، لە شاری (کلارکتول)، لە خاکی ئینگلیزدا، لە ساڵی ١٧١٦دا لەدایک بووە. هێشتا مناڵ بووە، کە دایکی مردووە. بەڵام لە دێیەکی تر، باوکی بەهۆی خانمێکی کردەوە بڵندەوە، هوردی بەپەسندی پێگەیاند. کە گەیشتە تەمەنی حەوت ساڵان، باوکی بردیە لای خۆی بۆ (لەندەن). وە لەوێ بەخووی سەر ڕاستی و دروستییەوە ڕای هێنا. ئینجا ناردیە خوێندنگاه. بەڵام هورد، لەوێ، زیرەکی و وریایی نەنواند. ئینجا ناردیە کن سەوزەفرۆشێک، لەبەر دەستی ئەوا، بەحەوت ساڵ فێری فەنی سەوزەفرۆشی بوو. بەڵام حەوت سەد لیرەشی لە باوکی هورد وەرگرت. هورد دابوویە باریکی و بنیسی. وەختبوو لەناوبچی. بەڵام باوکی مرد. سامانێکی زۆر و پارەیەکی چەند هەزار لیرەیی بۆ بەجێ هێشت. هورد وازی لە سەوزەفرۆشی هێنا. تەمەنی حەڤدە ساڵ، لە هەرەتی کوڕێنی دابوو. یەک و دووی لێ نەکرد. دەسی دایە ژیانێکی پڕ بەدڵ!.

## گەشتی هورد

هورد، لەسەر باوی ئەوسا، بۆ ئەمەی تەواو پێ بگا و لە جیهان تێ بگا، چووە گەشتوگوزار. بەناو ئیتاڵیا و گەلێ خاکی تری ئەورووپادا گەڕا. پاش ساڵێک بەخۆی و گەلێ شتی دانسقە و ناوازەوە گەڕایەوە لەندەن. چەند ساڵێکی تەنیا بێ ناخۆشی، لە لەندەندا بەسەربرد. نیازی وابوو گەشتێکی تر بکاتەوە. بەڵام کارەساتی هاتە پێشەوە. بەجارێ ژین و هۆش و بیری هوردی گۆڕییە سەر بارێکی تر.

## دیلی هورد

لە (لیزبون) پایتەختی پورتەکیزدا، بوومەلەرزەیەکی سامناک رووی دابوو، تێکومەکانی دابوو. گەلێ ئینگلیز، بەسەرکردەیی پارلەمانەوە، مەردانە هاتنە مەیدانەوە، بۆ کۆمەکییان. هورد یەکەم کەس بوو، کە خۆی پێشکەشی حکوومەت کرد بۆ یارمەتیی ئەو کلۆڵانە. بەڵام هێشتا لە کەناری زرێ ئەوەندە دوور نەکەوتبوونەوە، لەناکاو کەشتییەکی فەرەنسزی دای بەسەریاندا، کردنی بەدیل، وە هەرچییەکیشیان پێ بوو لێی داگیرکردن، تا چل سەعات بێ نان و ئاو هێشتیاننەوە، پاشان فڕێیان دانە ناو ژوورێکی بۆگەنی تەڕەوە، وە تا هەفتەیەک هەموو جۆرە کردەوەیەکی دڕندانە و نامەردانەیان لەگەڵ کردن. بەدە دە لێیان ئەمرد. جارێکیان ٣٦ کەسیان لێ فڕێ دانە تاقە چاڵێکەوە. ئەم کارەساتە، نەنگە، ناخۆشە، دەماری پیاوەتی و مەردایەتیی هوردی هێنایە جۆش. پاشان کە لە بەندیخانە ڕزگاری بوو و گەڕایەوە لەندەن بەکرد و کۆششێکی پاڵەوانانەوە هاتەمەیدان، وە توانی ئینگلیزەکان لەم پەند پێدان و ئازار و هاوارە تێ بگەیێنێ. وەبیان خاتە سەر کۆمەکی و پشتیوان کردنی ئەو کلۆڵ و بێچارانە زۆری پێ نەچوو هورد بەئامانجی خۆی گەیشت. سەکەشتی، لەو دیل و بەندییانە پڕ کرا و هێنرانەوە بەریتانیا. هاوڕێکانی دەست خۆشیان لێ کرد. بەڵام، هورد، ئەمەی بەلاوە شتێکی کەم بوو. چونکو بڕیاری دابوو واز نەهێنێ تا ڕووناکی و خۆشی و ئازادیی ئەبا بۆ هەموو بەندیخانەکانی تری جیهان!.

## هورد لە خۆشی و تەنگانەدا

هورد بیری ئەو دێیەی ئەکردەوە کە تیا گەورە بووبوو. بەخۆی و کەلەپەلە نایاب و ناوازەکانیەوە گەڕایەوە ئەوێ. لە خانووبەرەیەکی جوان لەناو باخێکی ڕەنگیندا دانیشت. زۆری پێ نەچوو ژنێکی خۆشەویستی سەر ڕاستی مارە کرد. وە بەهەردووکیان ئەو دێیەیان بەرەو خۆشی و بەختیاریی پێش خست. ژنە خۆشەویستەکەی لە دەست چوو. مناڵێکی بەسەرا بەجێ هێشت، هورد کەوتە تەنگانەوە. جیهانی لەبەرچاو تاریک بوو. تا ما داخی مردنی ئەو ژنەی لەبیر نەئەچووەوە. وە بڕیاری دا کە هەتا ئەمێنێ نازی گشت ژنێ بکێشێ، وە بەدڵ یارمەتییان بدا. مناڵەکەی دایە دەست یەکێ پێی بگەیێنێ. خۆشی چووەوە گەشتوگوزار بۆ ناو ئەورووپا. بەڵام هێشتا نەگەیشتبووە خوارووی ئیتاڵیاوە، کوڕەکەی بیر کەوتەوە. خۆی پێ نەگیرا، گەڕایەوە بۆ کنی. وە هێندەی دایک و باوکی خۆی بەپێگەیاندنیەوە ماندوو کرد. دووبارە دەستی کردەوە بەپێشخستنی دێیەکەی و چاکەکردن لەگەڵ دانیشتووەکانیا. ئەم کردەوە پیاوانەیەی، لە هەموو لایەکی نیشتمانەکەیا دەنگی دایەوە. وە هوردی بەدڵی هەموو کەسێکەوە نووساند.

## سەرەتای کۆششی

ئەم ناوبانگە جوانە، حکوومەتی خستە سەر دامەزراندنی هورد لە فەرمانێکی گەورەدا لە (بیدفورشیر). جا لێرەوە کردەوە پەسەندەکانی هورد دەستی پێ کرد. بەندیخانەکانی ئەو ناوچەیەی، هەموو، پشکنی. سەرگەردانی و کەساسیی بەندییەکانی لە (کۆڕی ڕیش سپی)یان گەیاند. لە ئەنجامدا حکوومەتی خستە سەر ئەوەی: ئیتر باج لە بەندییەکان نەسێنی. وە ئیتر بەتەنگ، تەندروستی بەندییەکانەوەبێ!... ئەم کردەوەیەی هورد پیاوەتییەکی تاقانە بوو، کەس هێشتا نەینواندبوو!. لەگەڵ ئەوەشا، ئەمە سەرەتای کۆششی بوو!. چونکە هورد بەوە وازی نەهێنا، چوو بەندیخانەکانی سکۆتلەند و ئیرلاند و هوللاند و ئەڵمانیا و فەرەنسە و ڕووسیا و ئیسپانیا و گەلێ خاکی تری ئەورووپای پشکنی، وە چەند جارێکی تریش پشکنینیەوە!. زۆر گیروگرفت و ئەرک و ئازاری هاتەبەر. کەوتە، زۆر، تەنگ و چەڵەمەوە. وەختبوو سەری تیابچێ!. بەڵام توانیی، بەدڵی بەتین و چاوی دووربین و کارگوزاری و زرنگی خۆی، بەسەر هەموو تەنگانەیەکیا زاڵ بێ وە لە هەموو تەنگ و چەڵەمەیەک سەر دەرکا!. لە پاش شارەزابوونێکی بێ هاوتا، لە بابەت ژیانی ناو بەندیخانەکانی ئەورووپاوە نووسراوێکی بەنرخی لە چاپ دا و دابەشی کرد بەسەر گەورەپیاوەکانی ئینگلیزدا. بەشێوەیەکی جوان تینی گەیاندن کە بەندیخانەکانی بەریتانیا لە بەندیخانەکانی ئەورووپا خراپترن. وە توانیی دەماری پیاوەتی و هونەرمەندیی و کارگوزارییان بجووڵێنێ بۆ چاککردن و پوختەکردن و پێشخستنی بەندیخانە و ژیانی بەندییەکان.

## کارەساتی سەیر

هورد شتی سەیر سەیری ئەکرد. لە فەرەنسە، نەیان ئەهێشت بەندیخانە سامناکە بەناوبانگەکەی (باستیل) ببینێ. خۆی کوتا، بچێتە ناوی. سەری نەگرت. بەزۆر کردیانە دەرەوە. زۆری نەمابوو ئازادیشی لە دەست بچێ!. لەگەڵ ئەمەشا توانیی زۆر پێچوپەنای ژیان و کردەوەی ناو باستیل دەربخا. یەکێک لەو شتانە سەرگوروشتەی (ژیانی بەندیی سەرتاسن) بوو لە بەندیخانەی باستیلدا!. لەگەڵ هەموو زەبروزەنگ و پەندێکی حکوومەت، هورد، توانی، لە شێوەی ژنە لادێییەکا بەناوی میوەفرۆشتنەوە بگاتە کن ئەو کەسەی، نووسراوی نهێنیی لە بابەت باستیلەوە لا هەبوو. بەفێڵ دانەیەکی لێ سەند. وە نەیهێشت بەرازی بزانرێ تا گەیشتەوە بەریتانیا!.

لە ڕووسیا، هەموو بابەتێکی ئازاردانیان پێشان دا، لە بەندیخانەکاندا، شتێک نەبێ. ئەویش کەس نەی ئەوێرا لێی بدوێ. هورد ماڵی ئەو کابرایەی دۆزیەوە، کە ئەو چەکی ئازاردانە نهێنییەی لە بەندیخانەکاندا ئەخستە گەڕ. بەسواری گالیسکەیەک چووە سەری. بەپەلە و کوتوپڕ چەند پرسیارێکی لەو بابەتەوە لێ کرد. کابرا حەپەسا. وای زانی، هورد، فەرمانبەرێکی گەورەی ڕووسە!. هەرچیی ئەزانی، پێی گوت!؟.

جارێکیان (کاترینا)، شاهەنشا ژنی ڕووس، ناردیە شوێنی، کە بێت لە تەلارەکەی ئەوا بحەوێتەوە. هورد، هەر لە ترسی ئەوەی ژیانی ئاسان و نەرمونیانی ئەوێ لە فەرمانەکەی ساردی نەکاتەوە، نەچوو. وە

لەگەڵ هاورێ هەژار و دەردەدارەکانیا مایەوە!. کە لە رووسیا گەڕایەوە، حەزی کرد بەفەرەنسەدا تێپەڕێ. لەگەڵ ئەوەشا کە حکوومەتی فەرەنسە، رێی نەئەدا بچێ، وە چاوی بۆ ئەگێرا کە بیگرێ، هورد، لە شێوەی پزیشکێکی فەرەنسزییا خۆی کرد بە(پاریس)دا. پێی زانرا. ئەوەندەی نەمابوو بخرێتە زیندانی باستیلەوە!. بەڵام ئازابوو. زوو خۆی دەرباز کرد، لەژێر پەردەی نەخۆش چاککردنەوەدا، پێ دیسکەی کرد و خۆی گەیاندە (مارسیلیا)، وە لەوێوە تێی تەقاند بۆ ئینگلتەرە!.

## رەنج دانی تر

بۆ نەهێشتنی دەردێکی گەورە، کە لە رۆژهەلاتدا پەیدابوبوو، هورد، خۆی گەیاندە (ئەستەمۆڵ). پاشان چووە (ئیزمیر)وە لەوێوە بۆ (وەندیک) لە ئیتالیا، تا وەک یەکێ لە نەخۆشەکانی ئەوێ دەست بەسەرکرێ، بەڵکو لەناویاندا شارەزای هۆی ئازار و هاوار و شێوەی چاک بوونەوەیان بێ. دوو مانگ لەناویاندا مایەوە. بەڵام لەشی تەواو تێک چوو، لەو دەمەدا دوو قاقەزیشی بۆ هات. یەکێک لە بابەت بەدخوویی کوڕەکەیەوە. یەکێکیش لە بابەت خەریکبوونی گەلی ئینگلیزەوە بەدامەزراندنی پیکەرێکەوە بۆ هورد، کە ببێتە یادگار بۆ کردەوە گەورەکانی. بۆ کوڕەکەی دڵشکاویی و ئامۆژگاری خۆی نواند. بۆ ئەوانی تریشی نووسیوە کە لە دامەزرانی پەیکەر چاکتر ئەوەیە کە بەندیخانەکان و کردەوەی حکوومەت لەگەڵ بەندییەکاندا بخرێتە سەر رێکوپێکی و بارێکی چاکی!. پاشان هورد گەڕایەوە بەریتانیا، تا بەنووسراوێکی تایبەتی: تاقی کردنەوە و شارەزایی خۆی لە بابەت بەندیخانە و ژیانی بەندییەکانەوە بلاوکاتەوە. هورد پیر بووبوو. کۆششی چەند ساڵ، برستی بریبوو. لەشی تێک دابوو. وای پێویست، کە ئیتر ئارامگرێ و بحەسێتەوە. وە لە کونێکەوە سەیری ئەنجامی هەوڵ و تەقەلا گەورەکانی خۆی بکات. بەڵام هورد لەوانە نەبوو بسرەوێ. خەمی فەرمانی پیاوانەی هەبوو. بەتەنگ خۆیەوە نەبوو. بیستییەوە کە دەردێکی گرانتر، رۆژهەلاتی ئەورووپای داگیرکردۆتەوە. وە گیانی دانیشتووەکانی ئەوێ دەرهێناوەتەوە. هورد، لە دەنگی دەروونی راچەنییەوە. خۆی پێ نەگیرا تا خۆی گەیاندە رۆژهەلاتی ئەورووپا. وە لەوێشەوە هەزار میلی تر چوو بەولاوە. بەناو ئەو ساردوسڕییەی رووسیایەدا تێپەڕیی تا گەیشتە (مۆسکۆ). وە لەوێ چوو بۆ یارمەتیی ئەو سەربازە هەناسە ساردانە، کە چاوەڕوانی دەستێکی دڵسۆزانە و چاوێکی باوکانە بوون.

## لە دەس چوونی هورد

ئەمە دوا شەڕی ژیانی بوو، کە لە پێناو دەستگرتنی داماوان و یاریدەدانی لێ قەوماوان و پاراستنی ئازادیی و گیانی هەژاراندا ئەیبردە سەر، کچە رووسێک کە ٣٤ میل لە جێ فەرمانی هوردەوە دووربوو. زۆری کرد کە کەس چاکی نەکاتەوە، هورد نەبێ!... هورد، دڵی نەشکاند. دوو جار خۆی گەیاندە لای بۆ چاککردنەوەی. بەڵام نەخۆشییەکەی ئەوی تووش بوو!... ئازارەکەی بێ ئەندازەبوو. لەگەڵ ئەوەشا تا چەند رۆژێک بەئازاییەکی بێ هاوتاوە بەرگری گرت. بەڵام نەخۆشییەکەی زۆری بۆ هانی. کە زانی ئیتر لە وزەیا نەماوە ئارام گرێ: رووی کردە خوا و لێی پاڕایەوە کە ئاگای لە کوڕەکەی و ئەو بەندیانە بێ کە

هەموو ژیانی بۆ خۆشگوزەرانی ئەوان بەخت کردبوو. وە ڕای سپارد، کە مرد، هیچ پەیکەرێکی بۆ دانەمەزرێنن.

هورد، لە تەمەنێکی ٦٤ سالّی لە ١٧٩٠دا گیانی پاکی بەخاک سپارد. بەلاّم تا سەر، ناوی گەورەیی و مەردایەتیی بۆ خۆی لە جیهاندا هێشتەوە.

## هورد پاش مردنی

دوور لە نیشتمان و گەلی خۆی، وە لە مەیدانی پیاوەتی و خواناسیا، هورد، ئەو سەربازە ئازایە، کەوت و نێژرا. بەلاّم گەلی ئینگلیز نەیانهێشت ناوی بکوژێتەوە، لە کەنشتە گەورەکەی (پولس)دا پەیکەرێکیان بۆ دروست کرد. لەوێدا، هورد، کلیلی بەندیخانەی گرتووە بەدەستێکەوە، فەرمانی بێ تاوانیشی گرتووە بەدەستەکەی تریەوە کە تیشکی هوای ئازادیی پێوەیە بۆ ڕۆشنکردنەوەی دلّی بەندییە بەسەزمانەکان. لە بنکی ئەو پەیکەرەوە، پەیکەرێکی تریشیان بۆ دروست کرد؛ هوردی تیا دیارە: لە ناوەڕاستی بەندیخانەیەکا بەندییە کلۆلەکان دلّخۆشی ئەداتەوە.

هاری (بیدفورد)یش پەیکەرێکیان بۆ کرد لە مەیداندا. هورد لە بەرگ و پۆشەنیی سەدەی هەژدەهەما ئەنوێنی، وەستاوە بیرێک قوولّ ئەکاتەوە. لەژێر پەیکەرەکەوە، ئاو هەلّ ئەقولّێ و ئەڕژێتە ناو جۆرنەیەکەوە. ئەوە ئەیەخشێ کە هورد ئاوی ساردی بۆ هەموو تینوویەک ئەبرد.

هورد هەلّی نەگرت لەوە زۆرتریشی بۆ بکرێ. چونکە هەر ڕێکوپێکی و پێشکەوتنێک کە لە بەندیخانە و ژیانی ناو بەندیخانەکانی ئیمڕۆدا ئەبینین، بنچینەکەی لە سایەی کرد و کۆششی پیاوانەی هوردەوە پێک هاتووە!...

## کۆلۆمب

«دۆزەرەوەی ئەمریکا»

١٤٤٦ - ١٥٠٦

(کریستۆفورس کۆلۆمبس)، لە سالّی ١٤٤٦دا لە شاری (جەنەوە) لە خاکی ئیتالّیادا لەدایک بووە. باوکی کرێکاربووە، خووری شیکردۆتەوە. دوو برای لە خۆی بچووکتریشی بووە. لە خوێندنگای (پاڤیا)دا زبانی لاتینی و هەندەسە و جوگرافیای خوێندوە. بەلاّم هێندە حەزی لە گەشتوگوزاری ناو زریێ کردووە، گەلێ جار خۆی لە باوکی دزیوەتەوە و چۆتە سەیری زریێ و کەشتی و کەشتییەوانی. وە هەر لە تەمەنی ١٤ سالاّنەوە وازی لە خوێندنگا هێناوە و خۆی هاوێشتۆتە ناو ژیانی ناو زریێیەوە. چەند سالێک لە تەک مامیا مایەوە کە سەرکردەیەتیی گەلە کەشتییەکی بچووکی ئەکرد بۆ پاراستنی کەنار زریێی نیشتمانەکەی لە هوروژمی عەرەبەکان. لە چەند کەشتییەکی بازرگانیشا، لە زریێی سپیی ناوەڕاستدا فەرمانی بینی. لە چەند شەڕێکیشا دەستی وەشاند و ناوی ئازایی و بێ باکیی دەرکرد. لە سالّی (١٤٨٠)دا چووە (لیزبور) پایتەختی (پورتەکیز). لەوێ کچێکی ئیتالّیایی خانەدانی مارە کرد، کە باوکی یەکێک بوو لە گەمیوانە هەرە بەناوبانگەکانی شاەزادە (هەزی). لەبەر دەس کورتی، لەوێ دەستی کرد بەنەخشە (خریطە، تخطیط) کێشان، وە بەوەوە بەڕێوە ئەچوو. نەخشەکانی ڕاست و دروست بوون، لەبەر ئەوە زۆر پەسەند بوون. بەهۆی ئەم ژن هێنانەیەوە بوو بەئاشنای گەلێک لە گەمیەوان و زاناکانی (پورتەکیز). ئەرک و ئازاری ڕۆژگاری ژیان و ئارەزووی خوێندەواریی و تێکەلّ لەگەلّ گەورەپیاوانی زانستی و فەندا، کۆلۆمبی پێ گەیاندبوو. کۆلۆمب گەیشتبووە هەرەتی پیاوەتی.

### ئاواتی کۆلۆمب

ئارەزووی کۆلۆمب، تا ئەهات، گڕی ئەسەند بۆ گەشتوگوزار بەناو زریێی ئەتلانتیکا، بۆ گەیشتنە هیند و ئاسیای ڕۆژهەلاّت لە ڕێگایەکی زۆر کورتتر و نوێ ترەوە، بەلاّم بەرەو ڕۆژئاوا. دلّنیابوو کە زەمین خڕە.

هێشتا زۆر شوێن ماون نەدۆزراونەتەوە. وە ئەو ڕێگایەی کە خۆی بەهیوا بوو تاقی بکاتەوە، لە ڕێگا بەرەو ڕۆژهەلاتییەکەی (مارکو پولو) بۆ هیند کورتتر و ئاسانترە. حەزی ئەکرد ئەو شوێنە نەناسراوانە لەسەر دەستی خۆیان بدۆزێتەوە. بڕواشی وابوو کە ئەوە فەرمانێکی خواییە هاویژراونە سەر شانی، بۆ ئەمەی بەچرای دینی مەسیحی ئەو شوێنە بت پەرستانە لە تاریکی نەخوێندەواریی و گوناهباریی، رووناک کاتەوە. هیوای کۆلۆمب بەرزبوو. ئاواتەکەی ڕەنگین و پەسەند و بەکەڵک بوو. بەڵام تەگەرە و تەنگ و چەڵەمەی زۆر لە پێشەوەبوو. کۆلۆمب لەم بیروباوەڕانەدابوو لەپڕ دەنگ داکەوت، کە لە ڕۆژئاوای زریی ئەتلانتیکا زەمینێک دۆزراوەتەوە ئەمە زۆربوو بۆ کۆلۆمب کە گوێی لێ بێ!...

ئیتر هەر ئەوەبوو: بەهەموو تین و توانایەکیەوە پەلاماری پێکهێنانی ئاواتەکەی خۆی دا، وە هەتا دە ساڵ لە ئەرک و ئازار و مەینەتیا خۆی ڕاگرت، نەبەزیی، تا بەمەبەسی خۆی گەیشت!...

## تەقەلای کۆلۆمب

بۆ ئەمەی ڕێ بکاتەوە بۆ گەیشتن بەئامانجی خۆی، کۆلۆمب پەنای بردە بەر شاهەکانی جەنەوە و پورتەکیز و ئیسپانیا و ئینگلتەرە و گەلێ کاربەدەستانی تر، کە ڕێی بدەن و یارمەتیی بدەن لەم گەشتەیا. لەگەڵ ئەوەشا کە گشتیان بیرەکەی کۆلۆمبیان پەسەند ئەکرد، کەچی، چونکە گوێیان ئەدایە قسەی زانست و پیاوە دینییەکانیان، کەسیان دەستیان نەئەگرت. کۆلۆمبیان پەسند ئەکرد، کۆلۆمب بەناخوداخی هەڵفڕیوداندنی ئەو شاهانەوە دە ساڵ تلایەوە. یەکە یەکە لە هەموویان ڕقی هەڵسا و بەقینەوە بەجێی هێشتن. دوایی بڕیاری دا بچێتە فەرەنسە، داوای یارمەتی لە شاهەنشاهی ئەوێ بکا. بەڵام هاورێکانی نەیانهێشت بچی. کەوتنە ناوەند ئەو و (ئیزابیلا) شاژنی ئیسپانیاوە. وە لە پاش چەندوچوون و گیرەوکێشەیەکی زۆر، پێکیان هانێن لە ١٤٩٢/٤/١٧دا (ئیزابیلا)، بەناوی گیانی نیشتمانپەروەریی و خواناسییەوە، لەسەر پارەی تایبەتیی خۆی، پێکهێنانی ئەم ئاواتەی گرتە ئەستۆی. بەڵێنی دا کە کۆلۆمب بکاتە سەرکردە و کاربەدەستی ئەو خاک و ئاوانەی کە ئەیان دۆزێتەوە وە پاش خۆی ئەوەکانیشی ئەو نیاز و جیازەیان بۆ بێنێتەوە. کۆلۆمب شاژنی بەجێ هێشت و چوو بۆ (پالۆس) کە لەوێوە گەمی و کەلوپەلی ئەو گەشتەی بدرێتێ.

## یەکەم گەشتی کۆلۆمب

کۆلۆمب، بەسە کەشتی و (١٢٠) کەسەوە لە ١٤٩٢/٨/٣دا بەناو زریی ئەتلانتیکا ڕۆیی. وە لە پاش حەفتا ڕۆژ ڕەنج و کوێرەوەریی و ئەرک و ئازار، بەدەست سەر کێشی کەشتییەوانەکان و هورووژمی گیژەلۆکە و شەپۆل و گێژی زرێ وە، گەیشتە سەر زەمین. ناوی نا دوورگەی (سان سلڤادۆر). لەوێدا بەخۆی و بەیداخی ئیسپانیاوە لەگەڵ گەلێک لە کەشتییەوانەکان لە جلوبەرگێکی ئاوازەدا دابەزیی و بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە بۆ خوای پاک و بێ هاوتا کڕنۆشی سوپاسگوزاریی کێشا. کۆلۆمب ئەوێی کردە خاکی شاهەنشاهی ئیسپانیا، لەژێر فەرمانڕەواییی خۆیا. کەشتییەوانەکان، لەسەرکێشی خۆیان پەشیمان بوونەوە و لە کۆلۆمب پاڕانەوە کە بیان بەخشێ. کۆلۆمب وای زانی گەیشتونە کەناری (هیند).

بەدانیشتووەکانی ئەوێی گوت (هیندی). پاشان دورگەی (کوبا)شی دۆزییەوە، کە بەلایەوە بەهەشتێکی سەر زەمین بوو. ئینجا دورگەی (هایتی)ی دۆزییەوە، کە ناوی ئێستای (سان دۆمنێکو)یە. لەوێدا هەندێک مایەوە، چەند ئیسپانیاییەکی دامەزراند، بەڵام کەشتییەکی لە دەست چوو. گەڕایەوە ئیسپانیا کە هەشت مانگ ئەبوو نەی دیبوو. بەپیرەوە چوونێکی شاهانەی بۆ کرا. ناوبانگی کۆلۆمب بەهەموو ئەوروپادا بڵاوبووەوە. شاە و شاژنیش زۆر بەدەورووپشتیا هاتن. سەرگوروشتەی گەشتەکەی بۆ گێڕانەوە. ئەو زێڕ و لوکەوچەکی کوشندە و گژوگیا سەیرە و پەلەوەر و دڕندانە و ئەو نۆ کەس هیندییانەی ئەمریکای پیشان دان. ئەوانیش بەڵێنەکانی پێشوویان بۆ دووبارە کردەوە، وە بانگی (گەورە زانستێکی ئیسپانیا)یان بەکرییان دا. قەڵغانێکیشیان پێ بەخشی نیشانەی (کۆشک و شێر)ی خاکەکانی (کاستیل و لوین)ی تیا نوێنرابوو. بەمانە کۆلۆمب. گەیشتە ئەوپەڕی گەورەیی!.

## دووەم گەشت

ئەمجارە (١٧) کەشتی و (١٥٠٠) کەسی لەگەڵ بوو. جووتیار و کرێکار و دارتاش و دوانزە پیاوی دینییان لەناوابوو. گەلێک ئاژەڵ و ئەسپ و دەرمێتو... یشی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو. لە ١٤٩٣/٩/٢٥دا بەخۆی و هەردوو کورەکەیەوە (دیاگۆ) و (فەرنەندو)وە جوڵا. لە پاش کۆچێکی (٣٩) ڕۆژیی زەوییەکی نوێی تریان بەدیی کرد، ئەوانە دوورگەکانی (ئەنتیلس) بوون کە کەوتبوونە ڕۆژهەڵاتی (هایتی)یەوە. لەوێوە گەڕایەوە (هایتی)، شارێکی تیا دروست کرد، ناوی نا (ئیزابیلا)، بەناوی شاژنەوە. ئەمە یەکەم شاری مەسیحی بوو لە جیهانی نوێدا!! لە پاش لێ هەڵگەڕانەوەی هاوڕێکانی و هورووژمی خەم و خەفەت و تووشبوونی نەخۆشی؛ کۆلۆمب، ناچارما، گەڕایەوە ئیسپانیا لەسەر خۆی بکاتەوە، وە دڵی شاە و شاژن -کە بەدگۆکان لەویان ڕەش کردبوو- پاککاتەوە. ئەمجارەش هاتن بەپیریەوە و بەدەوروپشتیا هاتن بەڵام وەک هی جاری پێشوو گەرم و گوڕ نەبوو!...

## کۆچی سەهەم

ئەمجارە تەنیا بەشەش کەشتییەوە کۆچی کرد. ئەو دەمە ساڵی ١٤٩٨ بوو. دوورگەی (ترینیداد)ی دۆزییەوە کە کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی ژووروی ئەمریکای خوارووەوە. گەلێک دوورگەی تریشی دۆزیەوە. هەندێک بەکەناری ئەمریکای خواروودا گەڕا وە بڕیاری دا کە جیهانێکی تازەی گەورەی دۆزیوەتەوە، کۆلۆمب بەکامی خۆی گەیشت!. بەڵام کۆلۆمب، بەهۆی بەدخویی پیاوەکانیەوە تووشی گەلێ گەڕوکێچەڵ ئەبوو. شەڕ و کوشتار کەوتبووە ناو ئەوان و دانیشتووانی ئەو خاکانەوە کە دۆزیبوونیەوە، پیاوەکانی گەلێک تاڵان و بڕوویان لێ کردبوون. پێنج کەشتیی گەورەیان لێ گرتبوون و ناردبوویاننە ئیسپانیا کە وەک قوڵ و بەندە بفرۆشرێن. شاژن (ئیزابیلا) لەمە زۆر قینی هەڵسابوو، گوتبووی کێ بەکۆلۆمبی گوتووە ئەم بەسەزمانانە بگرێ بەدیل؟ فەرمانی دا بوو بەهەموو لایەک کە ئەو دیلانە ئازاد کەن. خاوەن بەندەکان، لە دڵی ئەو زیانە گەورەیە کە لە ڕووی کۆلۆمبەوە تووشیان ببوو، لە کۆلۆمب کەوتنە تەقە و تواننج و سکاڵا کردن. ئەمە کاری لە شاژن ئیزابیلا کرد. دەمودەست (بوبادلا) ناو فەرمانڕەوایەکی بۆ

(هایتی) ڕەوانە کرد. پێی گوت کە فەرمانڕەوایی لە چنگی کۆلۆمب بسێنێتەوە. لە سکالا و دادوفریادی زۆر لێ کراوان بکۆڵێتەوە. کەچی کۆلۆمبی بەسەزمانیش هەرای ناو (هایتی)ی کوژاندبووەوە. و دینی مەسیحیی لەناو دانیشتووەکانیا بڵاو کردبووەوە. وە گەنجینەیەکی زێڕی (٦٠) ملیۆن ڕیالیشی دەست حکوومەتی ئیسپانیا خستبوو لە کانگا زێڕەکانی ئەمریکا!.

(بوبادلا)ی فەرمانڕەوا گەیشتە (هایتی). خانووی کۆلۆمبی داگیرکرد. کۆلۆمب و هەردوو براکەشی بەپێوەندکراویی و پەندپێدراویی ناردەوە بۆ ئیسپانیا!. ئەم کۆچی سەهەمەی کۆلۆمب، بەم ئەنجامە سزابەخشە گەیشت. ئیسپانیاییەکان ڕقیام لەم کردەوە ناپەسەندەی (بوبادلا) هەڵسا، بەزەییبیان بەکۆلۆمبی سەرگەرداندا هاتەوە لەپڕ ڕاپەڕین وە لە حکومەت داوای تەمێ کردنی (بوبادلا)یان کردا. (فەردنیاند) شاە، لەم کردەوەیە شەرمەزاربوو. بەنامەیەکی ناسک و شیرین دڵی کۆلۆمبی دایەوە (ئیزابیللا)ش چاوی بۆی بڕ بوو لە ناو. پێوەندیان لێ کردەوە. (بوبادلا)یان کێشایەوە گەلێک شاباش و نەوازشی کۆلۆمبیان کرد، بەڵام نەیان کردەوە بەفەرمانڕەوا!.

بەڵێ ئەوی سەری ئیسپانیای بەرز کردەوە و ڕەنجی مەردانەی بۆ کەڵکی هەمووان ئەدا نەئەشیا خراپەی دەربار کرێ.

## چوارەم کۆچ

بۆ جاری چوارەم کۆچێکی تری کرد بەڵام زۆر سەری نەگرت. بەشپرزەیی و ماندوێتیی چەند ساڵەوە گەڕایەوە ئیسپانیا. ئەمجارە دوورگەی (مارتینیک) و پوزەی ناوەند ئەمریکای ژوورو و ئەمریکای خوارووی دۆزیەوە. زۆری پێ نەچوو لە ١٥٠٦دا لە شاری (ڤالا دولید)دا لە تەمەنێکی حەفتا ساڵیدا گیانی شیرینی بەخاک سپارد. لە گیانەلاوەدا گوتی: «خوایە گیانی خۆم بەتۆ سپاردا». لەسەر ڕاسپاردەی خۆی پێوندەکەیان لەگەڵ خۆیا ناشت. کۆلۆمب هەرچەندە ڕزگاری بووبوو لە پێوەند، بەڵام ئەو پێوەندەی هەر بۆ یادگار هەڵگرتبوو تا ئەو ڕۆژە!... کۆلۆمب بەنەوازشێکی گەورەوە نێژرا. شاهەنشاە، بۆ یادگار، پەیکەرێکی بۆ دروست کرد. ئەمەی لەسەر هەڵکەندرابو: «کۆلۆمب بۆ خاکی کاستیل و لیون جیهانێکی نوێی دۆزییەوە». چەند ساڵێکی پێ چوو، لەسەر گوتەی کۆلۆمب خۆی، لاشەکەیان گواستەوە (سپانیولا) یاخود (هایتی). وە لە کەنشتەی (سان دومنیکوی گەورە)دا نێژرا بەڵام لە ساڵی ١٧٩٦دا بۆ جارێکی تر لاشەکەیان گواستەوە (کوبا) وە لە کەنشتەی (هاڤانا) لە پایتەختی دوورگەکەدا نێژرایەوە.

## گەورەیی کۆلۆمب

کۆلۆمب، هەروەک لە کردەوەدا پەسەند و بڵند بوو، هەروەها لەسەروسیماشدا گەش و شۆخ و شەنگ بوو. پیاوێکی کەڵەگەت، چاو گەورەبوو. لە تەمەنی (٣٠) ساڵیدا سەری سپی بووبوو. لە خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگا ڕێکوپێک نەبوو. زۆر خواناس بوو، یەجگار نوێژی ئەکرد و ڕۆژووی ئەگرت. بەکورتی وێنەیەکی بێ هاوتابوو لە هونەرمەندیی و پیاوەتی و خۆ ڕەنجاندنا بۆ کەڵکی گشت لایی. دەستیاوی بەسەر هەموو جیهانەوە هەیە. لەبەر ئەوە جیهان تا بمێنێ کۆلۆمب لەپەڕەی دڵیا پارێزگاریی

ئەکا، وە بەتاسە و خۆشەویستی و نەوازشەوە یادی ئەکا ؟!... کێ ئەوەندە شارەزای گەمی وانی و جوگرافیا بوو، کە بڕوا بکا لەم پەڕی جیهانی کۆنەوە ڕێگایەک هەیە ئەچێتەوە سەر ئەوپەڕی؟!. کێ هێندەی ئەو بەرگەی دەرد و ئازار و تەنگ و چەڵەمەی ئەگرت لەپێناو زانستی و فەندا، لەپێناو ئایین و کردەوەی بڵندا ؟!.

کۆلۆمب کە ئەمریکای دۆزیەوە، سەرانسەر نیشتەنی بوو. هەروەکو شارستانێتییەکی مەزنی تیادی، کۆچەرایەتییەکی ڕەنگاوڕەنگیشی تیا پشکنی. بەڵێ، کۆلۆمب بوو ئەو زەمینە پانە فراوانە بەکەلک و پیتە ڕەنگینەی ئەمریکای دۆزییەوە؛ کە ئەمە چوارسەد و پەنجا ساڵە وەک بەهەشتی سەرزەمین بۆتە پەناگا و سەرچاوەی دەرامەد و خۆشگوزەرانی و کامەرانی و پێشکەوتنی هەموو جیهان. کۆلۆمب بەدۆزینەوەی ئەمریکا، خۆی لە ڕیزەی هەرە گەورە پیاوەکانی جیهاندا دامەزراند. چونکە خۆی لەپێناو ژیانی ملیۆناندا مراند!؟.

## سەمپسن

«داهێنەری بێهۆش دارو»

١٨٧٠ - ١٨١١

## منالی و پێگەیشتنی

(جیمس یونگ سەمپسن) لە ساڵی ١٨١١دا، لە دێی (بالکایت) لەنزیک شاری (ئەدینبورگ)ەوە کە لە خاکی (سکوتلاند)دایە لە دایکبووە باوکی نانەوا بووە. بەڵام ئەم پێ گەیشتنە ناوازەیەی (سەمپسن) لەسایەی دایکە بێ باکە دڵسۆزەکەی و مامۆستا شارەزا زرنگەکەی و یەکەم خوێندنگاکەیەوە بوو. لەوەپاش هەرچەند، سەمپسن، مردنی دایکی بیر ئەکەوتەوە، هەناسەیەکی ساردی هەڵئەکێشا و چاویشی پڕ ئەبوو لە گریان. بەهونەرمەندیی ئەم هەناسە دوو کەسە جگەرسۆزەوە سەمپسن کەوتە سەر خوێندەوارییەکی مەردانە. لە تەمەنی چواردە ساڵیدا چووە بەرخوێندن لە بەشی فەنیی خوێندنگا

گەورەکەی ئەدینبورگدا. لەوێدا بەزەیی بەنەناسراویی و دەستکورتی و بێ دەسەلاتی خۆیا هاتەوە. یەجگار پەرۆشی بینینی دایک و باوک و هاورێ و دێیەکەی خۆی بوو. تەکانی دایە خۆی بگەڕێتەوە و لەو خەم و تەمە خۆی ڕزگار کات. بەلام لە تاقی کردنەوە (امتحان)دا باش سەرکەوت. خوێندنگاە، لە پاداشدا، موچەیەکی سالانەی پەنجا دۆلاریی بۆ بڕییەوە، بۆ یارمەتیی تا خوێندن تەواو ئەکا. ئەمە تەگەرەی دا لە گەڕانەوەی. تیژی کردە سەر مانەوەی. لە دوای کۆششێکی مەردانە، لە ١٨٣٠دا وە لە تەمەنی ١٩ سالێدا سەمپسن تاقی کردنەوەکانی بەسەربەرزییەوە بردە سەر، وە بووە پزیشک.

## سەمپسن لە فەرماندا

لە ٢٦ سالێدا لە خەستەخانەیەکا دامەزرا. وە لە دێهاتەکانی ئەدینبورگیشدا دەستی کرد بەنەخۆش چاککردنەوە. پاش دوو ساڵ کرا بەمامۆستای زانستیی نەخۆش چاککردنەوە، لە خوێندنگا گەورەکەی ئەدینبورگدا. سەمپسن لەم چەندانەدا وە لەم ناوانەدا، بەکردەوەی شیرین و پەسەندی خۆی، دڵی دەوڵەمەند و هەژاری کێش کردبوو. ناوبانگی پیاوەتی و زرنگییەکی واشی دەرکردبوو، کە لە ساڵی ١٨٤٧دا بوو بەیەکێ لە پزیشکە تایبەتییەکانی شاژن (ڤیکتۆریا)، لە (سکۆتلاند)دا.

## ئاواتی سەمپسن

سەمپسن، هەر لە منداڵییەوە کە شاگردبوو لە خوێندنگای نەخۆش چاککردنەوەدا، لەبەر دڵ ناسکی و جگەرسۆزیی خۆی، بەزەیی بەهەموو نەخۆش و دەردەدارێکا ئەهاتەوە، بەتایبەتی لەو وەختەدا کە پزیشکەکان نەشتەرکارییان (عمليات جراحيه) لە لەشی نەخۆشەکاندا ئەکرد وە نەخۆشەکان ئەکەوتنە ناڵە ناڵ و نرکە نرک و هاوار. هەموو جار لە دڵی خۆیا ئەیگوت: «تۆ بڵێی نەتوانرێ دەرمانێکی وا بدۆزرێتەوە: کە بێ ئەمەی زیان بەنەخۆشەکە بگەیێنێ، نەخۆشەکە لە هۆش خۆی ببا، تا نەشتەرکارییەکە لە لەشیا تەواو ئەبێ، وە نەهێڵێ، ئەو نەخۆشە بەسەزمانە، ئەمەندە سوێ بچێتە دڵیەوە و ئێش و ئازاری پێ بگا ؟!». سەمپسن، گەلێک جار وای لێ ئەهات، خەستەخانە و خوێندنگا بەجێ بهێڵێ. بەلام لەژێر لێوەوە، هەموو جارێ بەخۆی ئەگوت: «ئەمە ترسنۆکییە. شورەییە پیاو لە فەرمان ڕابکا. پێویستە ئاواتی خۆم بهێنمەدی. وە ئەو بێهۆش دار و (بەنج)ە بدۆزمەوە. وە ئەم نەخۆشە کڵۆڵانە لەم ئازار و هاوارە ڕزگارکەم!». سەمپسن، لەم بڕیارە گەرم و گوڕە و گەورەیەدا بوو، لەپڕ لە ساڵی ١٨٤٧دا کۆمەڵێک لە پزیشکەکانی کۆکردەوە و دەنگوباسی ئەو تەقەلایەی خۆی بۆ گێڕانەوە کە لەپێناو داهێنانی ئەم (بێهۆش دارو)ەدا نواندوێتی. هەموو بۆ سەرگرتنی ئەو بیرەی ئاواتیان خواست بەلام کەمیان بڕوایان هەبوو کە بێتەدی!؟.

## کۆششی مەردانەی سەمپسن

سەمپسن خوێندبوویەوە کە لە ساڵی ١٨٤٦دا پزیشکەکانی ئەمریکا، دەستیان کردبوو بەبەکارهێنانی (ئیثەر) لە برینکاریی (جراحه)دا. ئەمە هەرچەندە ڕێگایەکی سامناک و ناتەواوبوو. بەلام سەمپسن بەهەنگاوێکی ڕاستەقینەی ئەدایە قەڵەم، وە لەوێوە دەستی کرد بەڕۆین!. چەند جارێک. خۆی خستە

تەنگ و چەڵەمە و نزیک مەرگەوە، بەهۆی تاقیکردنەوەی ئەم دەرمان و ئەو دەرمانەوە. نەبەزیی. نەترسا. وە هەر لەسەر ڕێی خۆی ڕۆیشت هەتا گەیشتە ناو جەرگی ڕاستییەوە. پێش هەموو هاوڕێکانی خۆی کەوت، وە دوایی (بێهۆش دارو)ەکەی دۆزییەوە!.

دوکتۆر (لیون بلایفار)یش کە دۆستێکی (سەمپسن) و کیمیاگەرێکی بەناوبانگ بوو، هەر بەدووی (بێهۆش دارو)یەکی وادا ئەگەڕا. سەمپسن پێی گوت بام دەرمانەکەی تۆ لە خۆما تاقی بکەمەوە. بەڵام دوکتۆر (لیون بلایفار) نەیهێشت ئەوە بکا. هێنای دەرمانەکەی لە دوو کەروێشکدا تاقی کردەوە. کەروێشکەکان بەدەرمانەکە لە هۆش خۆیان چوون. پاشان هاتنەوە هۆش خۆیان. سەمپسن لە خۆشیاندا گەشکەداربوو. وە دووبارە لە دوکتۆر بلایفار پاڕایەوە کە ئەمجارە دەرمانەکەی لە خۆی و لە یاریدەدەرەکەیا تاقی بکاتەوە. یاریدەدەرەکەی بەقسەی نەکرد. گوتی جارێ بام بزانین چی بەسەر کەروێشکەکاندا دێ. پاشان کەروێشکەکان بەدەرمانەکە مردن. سەریان لەمە زۆر سوڕما!. بەڵام هەرچییەک بێ، ئەوەی باش بوو کە سەمپسن و هەڤاڵەکەی لە مەرگی ڕاستەقینە ڕزگاربوون!.

## سەمپسن بەئاوات ئەگات

زۆری پێ نەچوو، لە ١٨٤٧/١١/٤دا سەمپسن (بێهۆش دارو)ەکەی دۆزیەوە. خۆی و هەردوو یاریدەدەرەکانی، یەک لەدوای یەک هێندەی نیو پیاڵە لەو دەرمانەیان هەڵمژیی. لە پاش تاوێک، هەرسێکیان، لاڵ و پاڵ لێی کەوتن هۆشیان پێ نەما!. لە پڕ ژنی سەمپسن و خوشک و خوشکەزاکەی، کردیان بەهۆورا. بەسەر سوڕماویی و داماویی و لێ قەومایی ئەو سەلاشە بێ هۆشەیان بەرچاوکەوت!. بەڕاستی تەماشاکردنێکی سەیر و سامناک بوو. بابەتی مێژوونووس بوو: کە نەزانرێ سە پزیشک بەرەو مەرگ ئەڕۆن، یان بەرەو ژین؟!. بەڵام زۆری پێ نەچوو سەمپسن و هاوڕێکانی هاتنەوە هۆش خۆیان. (سەمپسن) بیرەکەی سەری گرت. بەئاوات گەیشت!. (بێهۆش دارو)ەکەی دۆزیەوە. لە شادمانی و کامەرانیدا، قاقا دەستی کرد بەپێکەنین. چونکە بەداهێنانی ئەو دەرمانە، بەملیۆن کەسانی لە ئازار و مەرگ ڕزگار کرد. وە دەرگایەکی ژین و شادی و ئازادی و پێشکەوتنی کردەوە لە براکانی سەرزەمینی. کە تا جیهان مابێ، ناوی (سەمپسن) لە سەرەتای هەرە چاک و هەرە بەکەڵکی پیاوە گەورەکانی ڕووی زەمیندا ئەژمێرێ.

## سەمپسن لە تەنگ و چەڵەمەدا

هێشتا داهێنانی ئەم (بێهۆش دارو)ە، بەتەواوەتی دەنگی نەدابووەوە، لەگەڵێ لاوە دوژمنی بەد ئایین بۆ (سەمپسن)ی بەسەزمان پەیدا بووبوو. ئەیانویست لەژێر پەردەی دینا، داهێنراوەکەی لە بنچینەوە تێک بدەن. وە ئەو هەموو ڕەنج و کوێرەوەرییەی سەمپسن بەبا بدەن. بەڵام (سەمپسن) لەوان ئازا و وریاتر دەرچوو. هەر لە ڕووی دینەوە، بەرەنگاریی کردن تا شکاندنی!. جگەلەوە، خوا دوو کەسی زۆر گەورەی کاربەدەستیشی بۆ ڕەخساند: شاژن (ڤیکتۆریا) و قەشە پزیشک (شالمەرز) ئەم دوانە پارێزگاریی سەمپسنیان کرد. وە خەڵکەکەیان بۆ خستە سەر پەسەندکردنی بەکارهێنانی بێ هۆش

دارەکەی. بەم ڕەنگە لە سایەی خوا و سەمپسن و ئەو دوو گەورەیەوە، دانیشتوانی سەر زەمینی لەم دەرمانە نایاب و ناوازەیە بێ بەش نەمانەوە.

## کۆچی دوایی

جێی داخە کە ئەم پیاوە گەورەیە، لە پاش ڕەنج و کۆششێکی دوور و درێژی مەردانە کە لە پێناو شکاندنی ئازاری نەخۆشاندا ئەیکرد، لە دوا تەمەنیا تووشی نەخۆشیی (باداریی) بوو. بەو هەموو ئێش و ئازارەی خۆشیەوە، هێشتا هەر بەتەنگ سارێژکردنی دەردی نەخۆشان و نەهێشتنی ئازاریانەوە بوو تا مردنی. ئەڵێن: ڕۆژێ ئازاری نەخۆشییەکەی تەنگی پێ هەڵچنی بوو، گەیشتبووە تینی. خەریک ئەبێ بەرگ داکەنێ و کوڵێک[*] بەهەڵم بکات.

لەپڕ بیری ئەکەوێتەوە، کە بەڵێنی داوە بەنەخۆشێک بچێتە لای. کوڵەکەی ناکا گورج خۆی پۆشتە ئەکاتەوە، گوێ ناداتە ئامۆژکاریی هەڤاڵ (هاوڕێ)ەکەی، هەر بەو ئازارەوە ئەچێ بۆ سەر نەخۆشەکەی!.

لە ساڵی ١٨٧٠دا سەمپسن کۆچی دوایی کرد. وە ناوی خۆی خستە ناو گەورە پیاوانەوە. شاژن (ڤیکتۆریا)، فەرمانی دا کە بەتەنیشت پیاوە گەورەکانەوە لە (ویست منستەرابی)دا بینێژن. بەڵام خۆی لەوەپێش گوتبووی کە لە (ورستن) لای شاری (ئەدینبورگ)ەوە بینێژن. وە لەوێ ناشتیان.

سەمپسن نەمرد تا بەچاوی خۆی دیی: هەرە گەورە و سامناک نەشتەرگەریی، لە لەشی نەخۆشدا ئەکرا، کەچی نەخۆش، ئەوەندەی تۆزقاڵێ هەستی بەئازار نەئەکرد تا نەشتەرگەرییەکە تەواو ئەبوو!...
لەوەپێشیش، ئەبوو: نەخۆش لەسەر تەختێک توندوتۆڵ ببەسترایەوە، بەترس و لەرزیشەوە نەشتەرکاری بکرایە. نەخۆشی بەسەزمان لەتاو ئازاری خۆی، هاوار و ناڵەناڵی ئەگەیشتە ئاسمان. کەچی گەلێ جاری واش هەبوو، نەخۆش بەبێ وەی دەرئەچوو، وە یا لە مردن ڕزگاری نەئەبوو!!...

---

(*) کول: حمام.

## مارکۆنی

«داهێنەری تەلگرافی بێ تەل و تەلەفۆنی بێ تەل و ڕادیۆ»

١٩٣٧ - ١٨٧٤

### پێگەیشتنی مارکۆنی

(گۆگلیامۆ مارکۆنی) لە باوکێکی ئیتاڵیایی و دایکێکی ئیرلاندەیی لە ساڵی ١٨٧٤دا، لە شاری «پۆلونا»ی خاکی ئیتاڵیادا لەدایک بووە. لە باوکە دەوڵەمەندەکەیەوە دووربینی، لە دایکە باشەکەیشیەوە گەشی و ڕووخۆشی فێر بووە. بەپشتیوانیی هەردوولاوە، خوێندەواریی لە شارەکانی (پۆلۆنا) و (فلورنسە) و (لیفورن)دا تەواو کردووە. وە لە تاقی کردنەوە و داهێنانی تەلگرافس و تەلەفۆنی بێ تەلا سەری دەرکردووە، وە چۆتە ڕیزی سەرکردە گەورەکانی پێشکەوتنی جیهانەوە. مارکۆنی، هەر لە منالییەوە شەیدای زانستیی سروشت و ئەلەکتریک بووە. لەم ڕووەوە، گەلێک زانا پێش مارکۆنی کەوتبوون. بەڵام هیچیان تەلەفۆن و تەلگرافی بێ تەلیان بۆ نەدۆزرابووەوە. چونکە هێشتا شارەزای ڕەوشتی ئەو هێزە نەبووبوون. ئەوەندە هەیە ڕۆژێک مارکۆنی، گوێی لە مامۆستا (ریفی) بوو، کە بەگەرمی باسی زانا (هەرتز) و کردەوە سەرگرتووەکانی ئەکرد. پیشانی ئەدان: شەپۆلی ئەلەکتریک چۆن بەرەڵلا ئەکرێ و چۆنیش ئەگیرێتەوە.

ئەو باسە نایابە، مارکۆنی خستە سەر تاقیکردنەوە و فێربوون و خوێندنەوەیەکی زۆرەوە لەم بابەتانەوە. سا ئەو کۆششە بوو، کە مارکۆنیی لە تەمەنی بیست ساڵیدا پێش هەموو هاوڕێکانی خستبوو، وە کردبوویە جێگەی بڕوا لەم جۆرە بابەتانەدا. مارکۆنی لەوەدا پێشیان کەوت، کە ئەیتوانی، بەئارەزووی خۆی شەپۆلە ئەلەکتریکەکان بەرەڵلا بکا و بیشیان وەستێنێتەوە. شەپۆلی درێژ بە(*) هێل (——) وە شەپۆلی کورت بە(**) پوچ (،) پیشان دات.

---

(*) هێل: خط.

(**) پوچ: صفر.

لەگەڵ ئەوەشا هیچ تەلێک نەبەستێ بە(نێرەر) و (وەرگر)ەوە. ئەوە بنچینەی ڕازی تەلگرافی بێ تەل بوو، بەم ڕەنگە، مارکۆنی، تاقە کەسێک بوو کە نیشانەی تەلگرافی بێ تەلی بۆ نزیکی میلە ڕێیەک نەگوێزایەوە. ئەم کارەی مارکۆنی سەرەتای دەمێکی نوێ بوو لە گفتوگۆکردنا. کە بەهۆی ئەوە و بەهۆی هەندێ کەلوپەلی نزیکبوونەوەی ترەوە ئەم پێشکەوتنەی ئێستامان پێکهاتووە.

## دڵدارییەکی سەیر

گوایا ئەڵێن مارکۆنی لەبەر ئەوە کەوتبووە سەر کەڵکەڵەی داهێنانی تەلگرافی بێ تەل، کە بتوانێ لەگەڵ دۆستەکەیا بەشێوەیەکی وەها گفتوگۆ بکا کە نەهێڵێ کەس تێی بگا. چونکە نەیانهێشت مارکۆنی ئەو کچە جوانە ببینێ وە ئەمیش یەجگار گرفتاری بووبوو. ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، ئەبێ جیهان سوپاسگوزاری ئەو کچە بێ، کە ئاگری دڵداریی ئەو بووە گڕی بەرداوەتە زیرەکی مارکۆنی، وە بەهۆی ئەوەوە بوو کە ئەم ڕادیۆ جوانە نایابە بەکەڵکانە بۆ دانیشتوانی سەرزەمین داهێنراون.

## مارکۆنی لە ئینگیلتەرەدا

مارکۆنی لە ١٨٩٦دا بەنامەیەکی ئامۆژگارییەوە گەیشتە ئینگلتەرە بۆ لای (سیرولیەم پریس)، کە یەکێک بوو لە شارەزاکانی هەندەسەی تەلگراف و سەرۆکی فەنیی پۆستەخانەی هەموو بەریتانیا. ئەم زانستە ناوی بەوە دەرکردبوو، کە خەریک بوو لە بریتیی تەلگراف زەوی بەکاربێنی. بەڵام مارکۆنی بەو تەمەنی ٢٢ ساڵییەی خۆیەوە توانی (پریس) بخاتە سەر باوەڕی خۆی؛ کە ئەو تەلەگرافی بێ تەلەی کە لەسەر (شەپۆلی هەرتز)ی بەندبێ گەلێ لەو تەلەگرافی زویە چاکترە کە (پیس) ئەیەوێ دای بهێنی. لەگەڵ ئەوەشا ئەو کەلوپەلەی کە مارکۆنی، بیروباوەڕەکانی خۆی پێ تاقی ئەکردەوە لە ئینگلتەرەدا، زۆر سووک و سادەبوو. لەو کەلوپەلەدا کە دەنگەکەی پێ بڵاو ئەکرایەوە کلیلە بەناوبانگەکەی (مورسی)ی بەکارئەهێنا. لەو کەلوپەلەشا کە دەنگەکەی کۆ ئەکردەوە نوێنەرێکی دامەزراندبوو کە داهێنراوەی (برانلی)ی فەرەنسەیی بوو، بەڵام (لۆج)ی ئینگلیزی پوختەی کردبوو. بەڵام ئەو تەلە قوچەی کە لە زەویا ئەنێژرا، وە لەوەوە شەپۆلەکان ڕەوانە ئەکران، داهێنراوی مارکۆنی خۆی بوو. لە ڕاستیا داهێنراوەکەی مارکۆنی لەگەڵێ کەلوپەلی کۆنی ناسراو ساز کرابوو بەڵام لە شێوەیەکی نوێدا. لەگەڵ ئەمەشا داهێنراوێکی نایابی گەورە بوو. لە ١٨٩٦/٦/٢دا بۆی ناونووس کرا.

## گەڕانەوەی مارکۆنی بۆ ئیتاڵیا

لەپاش ساڵێک، وە لە سەربانگ کردنەوەی حکوومەت، مارکۆنی گەڕایەوە ئیتاڵیا. لە (سبیزیا)دا ئێستگەیەکی بێ تەلی لەسەر وشکانی دامەزراند، وە لەوێوە بۆ دوورگەیەکی دوانزە میلی نیشانەی ناردە کن چەند کەشتییەکی جەنگی لەزرێدا. پاشان لە (ڕۆما)شدا، لەبەردەم (هەمبەرت) شاە و (مەرگریتا)ی شاژندا ئینجا لە ڕووی پارلەماندا، چەند تاقیکردنەوەیەکی پێشان دا. وە لە هەموویا بەسەربەرزی و ڕووسوورییەوە هاتە دەرەوە!.

## سەرھگرتنی قسە و بیری مارکۆنی

مارکۆنی، لە پاش چەند ساڵێکی دوور و درێژ ڕەنج و کۆشش و ماندوبوون، بەئاواتی خۆی گەیشت. وە دەرگای گفتوگۆی بێ تەلی لە ١٩٠١/١٢/١٢دا کردەوە. لەگەڵ فەرمانبەرانی ئێستگە ئینگلیزییەکەی (پولدھو)دا ڕێککەوت کە لە وەختێکی دانراودا، سە پل شەپول بە(نیشانەی تەلگرافی مورس) کە تیپی (S) ئەگرێتەوە لێ بدەن و بڵاوکەنەوە بەتەلگرافە بێ تەلەکەیان. تاکو مارکۆنی و یاریدەدەرەکەشی، لە لوتکەی (سەفنەل) لە (نیوفەنلەندە)دا بەئێستگەکەی خۆی ئەو شەپۆلانە وەرگرێ. لە ئێستگەی (پولدھو)دا چەند دارتەلێکی بڵێوی دامەزراند وە تەلی ناو بای پێوە بەندکردن. وە لە چەند شوێنێکی نزیکەوە تاقیی کردنەوە، لە وەرگرتنی چەند نامەیەکی ڕەوانە کراودا. نامەکان زۆر بەئاشکرا و ئاسانی وەرئەگیران، بەڵام لەبەر ئەوەی دامەزراندنی دار تەلی بڵێو لە (نیوفەنلەندە)دا لە وزەدا نەبوو، ناچارما، بەھۆی کۆلارە و باڵۆنی مناڵانەوە، تەلی بەئاسمانەوە لەناو بادا ڕائەگرت. تا چەند جارێک، ڕەشەبا، کۆلارە و باڵۆنەکانی شەق و پەق کرد. بەکاری نەھاتن. بەڵام جارێکیان کۆلارەیەک تاوێک بەئاسمانەوە وەستا. مارکۆنی توانی ھەر سە پلە شەپۆلەکە وەرگرێ. زۆری پێ نەچوو ڕەشەبا ئەو کۆلارەیەشی لەت و پەت کرد وە کندرەکەشی لێ پچڕاند. مارکۆنی لەو دەمەدا لە ژوورێکی تاریک و تەک و ناخۆشدا دانیشتبوو. گوێگرێکی تەلەفۆنیی وریای بەھەردوو گوێیەوە گرتبوو. بەڕوویەکی گەش و خۆشەوە سەیری یاریدەدەرەکانی ئەکرد. (کەمپ)یش وەک مارکۆنی گوێگرێکی بەگوێچکەکانیەوە گرتبوو. بەجووتە، ھەر سە پلە دەنگەکانیان لە دوورییەکی (١٨٠٠) میلییەوە، بەئاشکرایی ھاتەبەر گوێ. «تک. تک. تک». بەڕاستی ئاوازێکی خۆش بوو بەلای مارکۆنی و ھاوڕێکەیەوە. ڕۆژێکی بەنرخ و پیرۆز بوو. لە ژیانی مارکۆنیدا، سەرکەوتنێکی گەورەی ناونووس کرد. چونکە ئیتر لەو ڕۆژەوە کەوتە دەسەڵاتیەوە کە بۆ ئەم پەڕ و ئەوپەڕی سەر زەمین نامە ڕەوانەکا. وە گفتوگۆ لەگەڵ ھەموو کەسا بکا.

بەم ڕەنگە قسە و بیری مارکۆنی زاڵ بوو بەسەر قسە و بیری ھەموو زاناکانی ئەو دەمەدا. کە دەمێک بوو ئەیانگوت: شەپۆلی بێ تەلیش وەک شەپۆلی ڕووناکی وایە. ڕاست ئەڕوا، نانوشتێتەوە. لەبەر ئەوە بۆ جێی دوور گفتوگۆی پێ ناکرێ. ئەخوازەلا ئەو جێیانەی کە بەرھەڵستی بەرز ئەیان شارێتەوە لەچاو. وەک ئەورووپا و ئەمریکا کە کەوتوونەتە ئەم پەڕ و ئەوپەڕی زریی ئەتلانتیکەوە، وە بارستاییەکی سەد میل بەرزیی کەوتۆتە ناوەندیانەوە.

مارکۆنی، سەرکەوت. ئاواتەکەی ھاتەدی. نەک ھەر دانیشتوانی زەمین زاناکانیش کە ئەم تاقی کردنەوەیان لێ دی، باوەڕیان بەداھێنراوەکەی ھێنا. دوو لەو زانایانە (ئەدیسۆن) و (دەفەرست)ی بەناوبانگ بوونا.

## دۆزینەوەی لوولەی وریا

ئیتر لەو ڕۆژەوە زاناکان کەوتنە بەربەرەکانێ لە قاڵ کردن و پوختەکردنی کەلوپەلی (دەنگ دەر) و (دەنگ وەرگر)دا. تاکو زوو، وە زۆر بەووردیی ھەست بەدەنگەکە بکا. لە ١٩٠٦دا (دەفەرست)، «لولەی وریا»ی دۆزیەوە کە بەوە گفتوگۆی بێ تەل زۆر پێشکەوت. لە ڕاستیا لەوساوە سەردەمی بێ

تەل دەسی پێ کرد. موهەندس (فەلەمەنگ) کە بەشارەزای زانستی دامەزرابوو لە (یەکەم هاوبەشیی مارکۆنی)دا، لەپێش هەمو کەسێکا هەستی بەکەڵکی ئەم (لوولەی وریا) کردبوو. کە ئەگەر ئەم (لوولەی وریا)یە نەبوونایە گفتوگۆ و بڵاوکردنەوەی بێ تەل، دووربین (تەلەفزیۆن)، وێنەگوێزانەوەی بێ تەل و تەلدار، زۆر بەگرانی پێک ئەهات.

## سەرکەوتنی تر

لە ساڵی (١٩٠٢)دا بۆی دەرکەوت، کە لە شەوا نیشانەی بێ تەل، لە دوورترەوە وەرئەگیرێ تا لە ڕۆژ. لە (١٩١٠)دا کە لە (بونس ئایرس - ئارژنتین) بوو لە (٦٠٠٠) میل دوورییەوە نیشانە و نامەی بێ تەلی وەرگرت. لە (١٩١٢)دا پێڕەوییەکی داهێنا بۆ پێکهێنانی شەپۆلی پەیتا پەیتا، ناونرا (پێڕەویی وەختدانان بۆ پزیشک)، لە ئێستگە دورهاوێژەکاندا بەکارئەهێنرا. لە سایەی ئەم پێڕەوییەوە، مارکۆنی، توانی، لە ساڵی (١٩١٨)دا نامەیەکی بێ تەل، لە ئینگلتەرەوە ڕەوانەکات بۆ ئوستورالیا!...

لە سەرەتای کاردا، ئەم هەمو گفتوگۆیانە لەسەر شێوەی نیشانەکانی (تەلگرافی مورس) پێک ئەهێنران. ئێستا بەوە ئەڵێن (تەلگرافی بێ تەل)، یان (تەلگرافی ئیثەر). بەڵام لە پاشا دەرکەوت کە لە توانادا هەیە، دەنگی پیاو لەسەر باڵی شەپۆلی بێ تەل بگوێزرێتەوە ئیتر لەوساوە (تەلەفۆنی بێ تەل)یش داهات، وە ئیتر ئێستگە گەورەکان دامەزرێنران، کە ئەتوانرێ هەمو ڕەنگە وتار و ئامۆژگاری و چیرۆک و گۆرانی و دەنگوباس و ساز و ئاوازێکی پێ بڵاو بکرێتەوە!. پاشان زاناکان توانییان شتێکی وا داهێنن، کە کەشتیگوزارکەران بتوانن بەسەرپەرشتی فڕۆک و کەشتییەوە، لەناو زرێ و بەئاسمانەوە، گفتوگۆ لەگەڵ دۆست و هاوفەرمانەکانیان بکەن کە لەسەر زەمیندان. وەیا داوای یارمەتییان لێ بکەن کە کەوتنە تەنگوچەڵەمە و لێ قەومانەوە!. پاش ئەوانەش، کەلوپەلی وا داهێنرا، کە پێی بزانرێ فڕۆک و کەشتی ڕووەو کوێ ئەچێ؟ وە لە دوورەوە شت بنێرێ، ماکینە بخرێتەگەڕ!. ئێستاش لە کۆششی ئەوەدان کە لە دوورەوە شت بنێرێ، وە بەبێ تەل، هێزی ئەلەکتریک بگوێزرێتەوە بۆ دوور!. هاکا ئەمانە و گەلێ شتی بەنرخی تریش داهێنران!.

## پێڕەویی بیم

بەو پێڕەوییەی کە شەپۆلی بێ تەلی کورتی لەسەر بەکارئەهێنرێ (پێڕەوییم بیم) ئەڵێن. مارکۆنی لە ١٩١٦ بەدواوە ئەم پێڕەویی بیمەی بەکارهێنا. بڕوای وابوو کە بەکارهێنانی ئەم شەپۆلە کورتە باشترە لەهی درێژ. چونکە لە ڕاستیا، تاقە هۆیەک بوو بۆ پێشکەوتنی کەلوپەلی دووربینی (تەلەفزیۆن). باو ڕەشەبا کەم کاری لێ ئەکرد. وە لە ڕێگاشا هێندە بەرگەی ئەگرت کە کز نەبێ. کەلوپەلی دەنگ ناردنەکەی بچووک و هەرزان بوو، وە بەکەمەکی هێزی ئەلەکتریک ئەکەوتە گەڕ. لەبەر ئەوە، لەو شەپۆلانەوە کە لە هەندێ ئێستگەدا ٢٠٠ تا ٦٠٠ مەترە، وە لە هەندێکی تردا تا ٣٠٠٠ مەترە درێژ ئەبوون، مارکۆنی شەپۆلی وا کورت کردەوە گەیاندیە ١٠٠ مەترە کەمتریش!... لەمەدا مارکۆنی زۆر سەرکەوت، ئەوەبوو ئەم ڕادیۆ شەپۆل کورتانە داهاتن، کە لە ڕاستیا سەری پیاو سوڕئەمێنی لە هێز و گوڕ و ئاشکرایی

دەنگەکەیان و زوو ناردن و زوو وەرگرتنی، وە لە پاش ئەمانە هەمووی هەرزان کەوتنی!... لە سایەی رادیۆی شەپۆل کورتەوە، ئیمڕۆ ئەزانین: کەشتی لە زریێ و فڕۆک لە ئاسماندا و بە کوێ ئەگا!... ئەتوانین گەلێک مەکینە و کەلوپەل لە دوورەوە بخەینە گەڕ!... وە گەلێ شتی وا سەیر سەیری تریش ببینین کە پیاو سەری لێ سوڕ بمێنێ!؟.

## ڕەوشت و خووی مارکۆنی

مارکۆنی بەو هەموو ناوبانگ و پایە بڵندەییەوە، لە خۆی نەگۆڕی بوو، تا ئەهات لە ڕەوشت و خویشا بڵند و پەسەند ئەبوو. ئەو هەموو ئەرک و ئازار و کۆشش و ماندووبوونی چەند ساڵەیە کە بەشێکی فرەی لە تەمەنی شیرینی بەخت کردبوو، مارکۆنی لە تەمەنی زرنگی و ملکەچی، لە گەشی و ڕووخۆشی و ئێسک سووکی نەخستبوو!. هەموو دەم لە هەڵسان و دانیشتن و گوڕی باوەڕ و ئاوات و بیرکردنەوە و دیەنا وەک لاوێکی ئەوجەوان کە لە هەرەتی کوڕێنیدا بێ خۆی ئەنواند!... جارێک بەراسپاردەی ڕۆژنامەیەکی ئەمریکایی گوت: «کە خۆم خەریک ئەکەم بەتاقی کردنەوە لە کارگەکەما بەسەرپەرشتی کەشتییەکەم (ئەللتیرا) وە قەت وەڕس نابم!... منداڵ، چۆن، تۆپ و ئەسپەدارینە و بووکەشووشەکانی خۆی خۆش ئەوێ، منیش ئاوەها کار و فەرمان و کەلوپەلی بێ تەلەکەی خۆم خۆش ئەوێ!».

مارکۆنی، بەپێچەوانەی گشت داهێنەرەکانی تر، پشتی نەئەبەست بەتەماشاگەریی و بیر نواندنەوە. قەت وەختی خۆی بەچەقە چەق و چەندوچوونەوە بەفیڕۆ نەئەدا. تەنیا بڕوای بەکردەوە هەبوو!... بێ دەنگ شتەکەی دائەهێنا، ئینجا لێی ئەدا و پێشانی ئەمو ئەوی ئەدا. تا باوەڕیان پێ ئەهێنا!. گوێی نەئەدایە ناوونیشان و هەیت و هوتی زانایانە کە بۆ ئەم شت و ئەو بابەتیان دائەنا. کەشتێکی دائەهێنا، ناوی لێ نەئەنا. زانایان ناچار ئەبوون ناوونیشانی بۆ دابنێن!؟.

کە شەڕی ساڵی ١٩٣٥ لە ناوەند ئیتاڵیا و حەبەشستاندا هەڵگیرسا، لەگەڵ ئەوەشا کە مارکۆنی یەجگار نیشتمانپەروەر بوو، پیاوەتیی ڕێی نەدا، کە هونەرمەندیی خۆی لە شەڕ و کوشتاری وەهادا بەخت کا!... هەر لە کەشتییەکەی خۆیا مایەوە و خۆی بەچاککردن و قاڵ کردنی کەلوپەلی دووربین (تەلەفزیۆن) و کورتکردنەوەی شەپۆلی بێ تەل و تاقی کردنەوەیانەوە خەریک کرد، وە نەهاتە ناو شەڕەوە تا تەواو بوو!...

ئەو هەموو پێشکەوتنەی کە (ڕادیۆ) پێی گەیشتبوو، مارکۆنی، بەهیچی دائەنا، لەچاو ئەو شتانەدا کە چاوەڕوان بوو لەوەپاش دابهێنرێن. ئەیگوت: «ڕۆژێک دێ، پیاو بتوانێ بەهۆی ڕادیۆی بێ تەلەوە هەمو شتێک بخاتە گەڕ. ئەوەی ڕادیۆ ئەتوانێ پێکی بینی بۆ کەڵکی دانیشتوانی سەرزەمین و پێشکەوتنی گشت لایی، بیرمان بڕ ناکات بیهێنێتە پێش چاو. بەهۆی ڕادیۆوە وێنە لە دوورەوە وەرئەگیرێ بەپاکی و ڕووناکی، وە گفتوگۆی ناو ڕادیۆ پاک و ڕەوان ئەبێتەوە وەک گفتوگۆی ڕاستەقینە. تەنانەت ڕادیۆ لە باریا هەیە: ئەو دەنگانەشمان بۆ وەرگری کە بەگوێ ناتوانین پێ ببەین: وە بەو ساز و ئاوازە خواکردانە و ئەو دەنگ و گۆرانی گیانیانە دڵمان شادکا!... بەهەموو ڕەنگ دوارۆژمان لە چنگ ڕادیۆی بێ تەلایە!...».

## ماركۆنی چاکەی ئەدرێتەوە

جا ئەم ڕەوشتە پەسەند و کارگوزاری و زیرەکی و زرنگییە بوو کە مارکۆنی گەیاندبووە ڕیزی هەرە سەرکردە گەورەکانی جیهان. مارکۆنیش بووبووە یەکێک لەوانەی کە ڕێگایان بەمێژوو گۆڕیوە و هاونیشتمانی سەر زەمینیان هەزار بەهەزار بەرەو پێشکەوتن بردووە!...

بەڕاستی جێگای شادمانییە کە ڕەنجی مارکۆنی بەبا نەدرا: جیهان وە بەتایبەتی ئیتالیا چاکەی ئەم ڕۆڵە جوامێرە بەکەڵک و باشەی خۆی دایەوە.

لە ساڵی ١٩١٩ کرا بەڕاسپاردە و جێنوشینی شاهەنشاهی ئیتالیا لە (کۆڕی ئاشتی)دا کە لە شاری (پاریس)دا گیرا. وە بەناوی حکوومەتی ئیتالیاوە، مارکۆنی، پەیماننامەی لەگەڵ (نەمسە) و (بولگاریا)دا گرێ دا. هەر بەم ناوەوە نێررایە ئەو کۆبوونەوانەی کە (لیژنەی سەرپەرشتی) لە (پاریس) و لە (لەندەن)دا پێکی ئەهێنا. هەر لەو ساڵەشا کرا بەئەندامێک لە (کۆڕی ڕیش سپییان)ی ئیتالیادا. کە تا ما تیا مایەوە.

لە ساڵی ١٩٠٩دا مارکۆمی، بەخششی (نۆبل)ی پێشکەش کرا لە (زانستیی سروشت)دا، لەبەر هونەرمەندیی و کۆششی مەردانەی لەپێناو پێشکەوتنی تەلگرافی بێ تەلا.

لە (کۆمەڵی فەنی شاهی)یشەوە (نیشانی ئەلبەرت)ی پێ بەخشرا. لەلایەن حکوومەتی خاکە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە (نیشانی فرانکلن و جۆن فەرتز)، وە لە گەلێ لای تریشەوە نیشان و شتی تری پێشکەش کرا.

## کۆچی دوایی

ئەو پیاوە گەورەیەی کە توانی بەداهێنانی تەلگراف و تەلەفۆنی بێ تەل و ڕادیۆکەی، تەنگی عەرد بکێشێتەوە بۆ دانیشتوانی سەر زەمین لە یەکیان نزیک بخاتەوە، ڕێگای یەکێتیی و پێگەیشتن و خوێندەواریی و ئاشتییان بۆ بدۆزێتەوە، وە دەرگای ژیانێکی پڕ گەشایش و خۆشگوزەرانی و ئامودە و ئاسانییان لێ بکاتەوە... بەڵێ، ئەو پیاوە گەورەیە... مارکۆنی، لە بەیانی ١٩٣٧/٧/٢٩دا گیانی بەخاکی زەمین سپارد. وە لە دوای خۆیەوە ئەو ژینی بەهەشتی سەر زەمینەی بەجێ هێشت، کە چاوڕەوان بوو بەسایەی پێشکەوتنی فەنی ڕادیۆوە پێکی بێنی. وە برا خۆشەویستەکانی جیهانی پێوە کامەران کا!

# غاندی

«سەرکردەی کۆمەڵایەتی و پێشخەری هێند»

١٨٦٩ - ١٩٤٨

## پێگەیشتنی غاندی

له ١٨٦٩دا، له (پورپاندار)، که یەکێکه له شارەکانی هیند، غاندی لەدایک بووه. باوکی که ناوی (کافا غاندی) بووه، سەرەک وەزیریی (ڕاچکوت) و (فانکانار)ی کردووه. بنەچەکەشیان تا سێسەد ساڵ لەوەپێش هەر بەوەزیریی له ناوچەکانی (کاثیاوەر)دا پایەدار بوون. باوکی غاندی، ناوبانگی بەڕاستگۆیی و ئازایی و دەست بڵاویی و سەربەستی و لایەن نەگیریی دەرکردووه. دایکیشی ئافرەتێکی گەلێک زیرەک و خواناس بووه. وه بەکارگوزاریی و خواناسیی خۆی کارێکی باشی کردۆته سەر دڵ و دەروون و ڕەوشت و کرداری غاندی. ئەو ئامانج و ئاواتانەی غاندی بۆی ئەکۆشا، ئەنجامی ئەو پێ گەیاندنەی دایکی بوو. غاندی له بابەت دایکیەوه ئەیگوت: «زۆر خواناس بوو. تا نوێژی نەکردایه دەمی بۆ نان نەئەبرد. ڕۆژێک نەبوو نەچێته پەرستگاه (معبد). نەخۆشیش بوایه وازی له ڕۆژو نەئەهێنا. زوو ئەچووه بنچوبناوانی شتیشەوه».

له بارەی خوێندنەکەی خۆیەوه، غاندی ئەیگوت: «له خوێندنگادا هیچ فێر نەئەبووم «قسه گوتن بەمامۆستا نەبێ!. وا دیاربوو لەو دەمەدا، بیر و ژیریم هێشتا خاوبوو. وه درەنگ له شت ئەگەیشتم».

له تەمەنی حەوت ساڵیدا، باوک و دایکی گوێزایانەوه (ڕاچکوت). وه لەوێ غاندییان خستە خوێندنگایەکی سەرەتاوه. دیسان لەوێشا، وەک شاگردێکی زرنگ و زیرەک خۆی نەنواند. له دوانزه ساڵیدا خستیانه خوێندنگایەکی بەرزەوه. تا ئەو تەمەنه، غاندی، وێنەیەکی بڵندبوو له ڕەوشت و خوو و کردەوەی چاکدا. له تەمەنی سیانزه ساڵیدا، لەسەر پێڕەویی دینی هیندۆس، بێ ئەمەی غاندی له ژیانی ژن و مێردی تێ بگا. ژنی بۆ هێنرا!. غاندی لەو بابەتەوه گەلێ جار ئەیگوت: «ئێسته خۆزگه بەو لاوانه

ئەخوازم، کە هەرچی چۆنێک بێ توانیویانە، لە تەمەنی وەک ئەوسای منا خۆیان لە دەس ژنهێنان رزگار کەن. ئێمە ئەوسا لە ژنهێنان هەر ئەوەندە تێ ئەگەیشتین کە ماڵ ئەڕازێنرێتەوە. نان و خوان ساز ئەکرێ. ئاهەنگ و زەماوەند ئەگێڕێ. گۆرانی و هەڵپەڕکێ و بەرگ و پۆشەنیی تازە و ئاوازە ئەنوێنرێ کچی ئەناسراویش ئەهێنرێتە ماڵەوە پێیان ڕابوێرین!؟». غاندی، لە سەردەمێکا بەهۆی هەندێ هاوڕێیەوە، چەند بەندێکی دینەکەی خۆی شکاند. واتا گۆشتی ئەخوارد وە هەندێ شتی تریشی ئەکرد!. بەڵام ئەگەیشتە تەمەنی شانزە ساڵی، بەتەواوەتی لە کردەوەی خۆی پەشیمان بووەوە. لەبەردەمی باوکیا پێی لە گوناهی خۆی نا، وە دەستی دایەوە ژینێکی نوێ. پاش ئەوە ئەوەندەی پێ نەچوو، باوکی لە دەست چوو.

لە نۆزدە ساڵیدا چووە (کۆلیجی بافنیگار). بەڵام ساڵی تێ وەرنەگەڕایەوە -غاندی بەرگەی ئەم خوێندنەی نەگرت- گەڕایەوە ماڵێ!. لە پاش چەندوچوونێکی زۆر لەگەڵ دایکیا وە بەڵێن پێدانی کە قەت توخنی داوێنپیسی و خواردنەوە و گۆشت خواردن نەکەوێ، ڕێی درا بچێتە (لەندەن) بۆ خوێندن. لە ساڵی ١٨٨٨دا گەیشتە ئەوێ وە لەوێ خوێندنی پشتیوانی (محامیتی)ی تەواو کرد. ئەو بەڵێنەی دابووی بەدایکی نەیشکاند بەتاسوقەوە گەڕایەوە ماڵێ بۆ بینینی دایکی. بەڵام دەمێک بوو دایکی مردبوو. وە براکەی هێشتا ئاگاداری نەکردبوو. غاندی لە خەم و خەفەتا تلایەوە. لەگەڵ ئەوەشا نەیهێشت. کەس بەئازاری بزانێ. بەمەندیی و زرنگی و بێ دەنگییەوە دەسی کرد بەفەرمان بینین!.

## غاندی لە ئەفەریکای خواروودا

کە غاندی دەستی کرد بەپشتیوانی (محامات) لە هینددا، کەوتە ناو دوو شتی پێچەوانەوە. یان ئەبوو دوای هیوا و ئاواتی خۆی کەوێ و پەلاماری ڕەوشت و خووی هاونیشتمانەکانی خۆی بدات، و بەتاقی تەنیا بێتە مەیدانەوە. وە یا دووی قسەی براکەی کەوێ کە ئەیویست لەسەر مەشقی دین و کۆمەڵایەتیی هیندۆسی نەچێتە دەرەوە، وە هەموو کۆششێکی بخاتە پێناو بڵندیی خۆی!. لە ڕاستیا، غاندی، دەرامەدێکی وای نەبوو کە بتوانێ هەم ژیانێکی بڵندی خێزانی وە هەم ئاواتێکی کۆمەڵایەتیی خۆی پێ بهێنێتە بوون!. غاندی لەم تەنگ و چەڵەمەیەدابوو. لە پڕ خوا دەرووی لێ کردەوە. هاوبەشییەکی بازرگانی (شرکتێکی تجاری) لە هیندا، کاروبارێکی کەوتبووە دادگاهێکی (محکمة) ئەفریکای خواروەوە، چەند ساڵێک بوو نەبڕابووەوە، نرخی گەیشتبووە (٤٠,٠٠٠) لیرەی ئینگلیزی. هاوبەشییەکە ئەمەندە بڕوای هەبوو بەکارگوزاریی و دەست پاکی و هێز و گوڕی غاندی، براکەی لێ ڕاسپارد، بەڵکو ببێتە پشتیوانی و بچێتە ئەوێ ئەو فەرمانە گرانەی بۆ بگەیێنێ بەئەنجام. لەپاش چەندوچوونێکی زۆر، غاندی هاتە سەر قسەی براکەی. وە بەبێ سەوداکردن لەسەر کەم و زۆریی کرێ، لەگەڵ هاوبەشی (شرکة)کە ڕێککەوت و دەم و دەست چوو بۆ ئەفریکای خواروو!...

## کۆششی مەردانەی غاندی

جا، ئا، لێرەدا، مەردایەتیی غاندی دەرئەکەوێ. چونکە لەوێوە، وە لەو ساوە، غاندی، دەسی کرد بەتەقەلا و کۆششی مەردانە بۆ پێشکەوتنی هاونیشتمانەکانی. و پێشکەوتنی هەموو دانیشتووانی سەر

زەمین، لێـرەوە غـاندی ناوبانگی دەرکـرد وە بووە وێنەیەکی ناوازە بۆ بەرەنگارییکردنی زۆرداریی و بانگکردنی هەموو نەوەی ئادەم بۆ برایەتی و خۆشەویستی.

لەو حەلەدا، لە ئەفریکای خوارووەدا گەلێک هیندی هەبوون. لە هیندەوە کۆچیان کردبووە ئەوێ. ئەو هیندییانە کرێکارییان ئەکرد لە کانگا و کارخانە و باخ و بێستانەکاندا. بەڵام حکوومەتی ئەوێ کە لە ڕەگەزی سپی هاتبووە بوون، لایەنی سپییەکانی ئەگرت، وە هیندییەکانی بۆ ئەوان ئەشکاند و ئەیکردن بەبەندە!... نە ئەبوو هیندی بەم لا و بەولای شەقامەکاندا بڕۆن!. نەئەبوو سواری ئەو گالیسکانە بن کە ئەوروپاییەکانی تیا ئەبوون. وە تا حکوومەت ڕێی نەدانایە نەئەبوو شارە و شار بکەن. گەلێک پەندیان پێ ئەدرا. گەلێک جارس ئەکران، وە گەلێک وەڕس ئەبوون!... جا لێرەوە غـاندی لە حکوومـەت ڕاست بووەوە. وە لەسەر شێوەکەی خۆی بەرەنگاریی کردا... «شێوەی نەویستن و یاخی بوونی بێ شەڕ». یاخود «شەڕی بێ خوێن و یاریدەنەدان» ئەو شێوەیەی تاقانە بوو لە هەموو جیهاندا!... غاندی بەرگی ئەوروپایی فڕێدا و بەرگی هیندییانەی پۆشی!... هیندییەکانی هان دایە سەر بەرەنگاری کردنی حکوومەت!...

غاندی نووسراوەکانی (تۆلستۆی) نووسەر و فەیلەسوفی گەورەی ڕووسی خوێندبووەوە. غاندی چاوی بە(تۆلسـتـۆی) کـەوتبـوو... وە لەوەوە فـێـری ئەم جـۆرە بەرەنگارییـانە بووبوو. ئەو نووسراوانە و ئەم چاوپێکەوتنە ڕێگای تەقللای بۆ غاندی ڕۆشن کـردبووەوە. ڕێگای: «خـۆشەویسـتی و بەرگەگـرتن، بڕوا بەسـادەیی، بەکـەڵکی خـەڵک هـاتن، وە گەڕانەوە بۆ سروشت»!. غـاندی لەوێدا کـێـڵـگەیەکی ڕەنگینی دامەزراند. ناوی نا «کێڵگەی تۆلستۆی» هاونیشتمانەکانی هان ئەدا و فێری ئەکردن: «خۆیان ڕاگرن. ئازار هەڵگرن. لەسـەر ناخـۆشی ئارام گـرن. بچن بەگـژ ئارەزواتی لەشـا. وە بەرەنگاریی بێ شـەڕ بکەن لەگەڵ حکوومەتا!...».

## کۆششی مەردانەی لە هیندا

غاندی لە ئەفریکای خوارووەدا بەئامانجی خۆی گەیشت. واتا حکوومەتی ئەوێی خستە سەر چاکەکردن لەگەڵ هیندییـەکانی ئەوێدا. پاشان گەڕایەوە هیندستـان. تا شەڕی جیهـانیی یەکەم تەواو بوو، غـاندی، ورتەی نەکرد. چاوەڕوان بوو حکوومـەتی بەریتـانیا بەڵێنی خۆی بەجێ بهێنێ و هیندییەکان ئازاد کات. بەڵام کە سەرنجی دا و بڕیاری دا. هیندستان چەواشە کرابوو، زۆروستەمی حکوومەتی بەریتانیا لەسەر هیندییەکان ڕۆژ بەڕۆژ زۆرتر ئەبوو؛ پەنای بردەوە بەر بەرەنگاریی کردنی حکوومەت بەشەڕی بێ خوێن!... دیسـانەوە بڕوای کردەوە بەخۆی، کە ئەتوانێ ئازادی و خۆشگوزەرانیی هیندسـتـان لەم ڕێیەوە بهێنێتە بوون!... واتا: «بەرەنگاری کردنی حکوومەت بەبێ ڕژاندنی خوێن، بەخۆ دوورخستنەوە لە حکوومەت. بەلێ تەریکبوونی. بەدامرکان بەبەشی خۆوە. وە نەویستنی هیچ شتێ لە حکوومەت». هیندییەکانی هان ئەدا: کە ئیتر بەرگی ئەوروپایی نەکەن. بەرگی دەستکردی هیندی لەبەر کەن. ئیتر لەو ڕۆژەوە دەستی کرد بەڕاهێنانی هاونیشتمانەکانی بەژینێکی ئازادیانەوە. وە لە نوکەوە ڕەنگی ژینێکی سەربەخۆیانەی لە کرد و کۆشیدا بۆ ڕشتن. بەلای غاندییەوە یەکەم هەنگاوی بەرەو ئازادیی ئەوەبوو کە کەلوپەلی بێگانە لەکۆڵ هیندییەکان بکرێتەوە. غاندی، بەدەستی خۆی وە بەتەشی و خەرەکە کۆنەکان لۆکە و خوری ئەڕست. لەو

تاڵەدەزو و بەنانە کوتاڵی ئەچنی. لەو کوتاڵانەش کراس و لبادەی ئەدرو و ئەیپۆشی!... غاندی خۆی کردە ڕێنە بۆ هیندییەکان. وە کردیە فەرمانێکی نیشتمانی: کە هەموو هیندییەک تەشی و خەڕەک و تەونێک لە ماڵی خۆی دا دانێ. وە هەر ڕۆژە تاوێک بەکاریان بێنی، تا بەرگ و پۆشەنیی خۆی لێ پێک بێنی!... غاندی هیندییەکانی بەم فەرمانە پیرۆزەوە ڕاهێنا. وە چونکە سەر و سامانی خۆی لەپێناو بروا و ئایینی نیشتمانیی خۆیا بەخت ئەکرد، هیندییەکان باوەڕیان پێ هێنابوو. وە هەرچی ئەو بیگوتایە بەدڵ و گیان بەگوێیان ئەکرد!...

بەمە، غاندی، گەلێک پارەی بۆ هاونیشتمانەکانی خۆی گێڕایەوە وە هیندی گەلێک خستە خۆشگوزەرانی و کامەرانییەوە. زیانێکی گەورەشی بەدوژمنەکانی هیند گەیاند. وە ئەمجارەش ئەوروپایەکانی تێ گەیاند کە هیندستان هەیە. وە ئەو هیندە نییە کە تێی گەیشتوون!... هیند نامەیەکی خوایی و جیهانی و براییییە، ئەیەوێ لە خەڵکی بگەیێنی. هیند خەریکە پێ بگا، وە خەریکە خەڵکیش پێ بگەیێنی. وە چوارسەد ملیۆن هیندی، کە نەتەوەی نەژادێکی پڕ هۆشمەندی و کارگوزاری و گیانی بەرزن، ئیتر لەوە بەولاوە، بۆ ئەوروپایی هەڵنافریوێن، سەردانانەوێن. بەڵکو ڕاستەوخۆ بەرەو ژیانێکی ئازادی و کامەرانی ئەڕۆن!؟.

## ڕۆژوی غاندی

سەرت سوڕنەمێنێ کە بڵێم: غاندی بەهەڕەشەی ڕۆژوگرتن و بەڕۆژوبوون، ئەو حکوومەتە زەلامەی بەریتانیای هێنابووە لەرزین!. شتێکی بویستایە و حکوومەتی بەریتانیا بۆی نەکردایە، بەڕۆژوگرتن ئەیترساند، تا ناچار ئەبوو خواستەکانی ئەهێنایە جێ!... غاندی لە ڕاستیا، دەستی بەسەر هەموو هیندا ئەڕۆیشت. کەس نەمابوو دوای قسەی نەکەوێ!... کە «کۆڕی گەورەی نیشتمان» لە هیندا دامەزرا، وە لەسەر ڕاسپاردن و ئامۆژگاریی غاندی، فەرمانی دا بەهیندییەکان کە ڕاست بنەوە و دەست دەنە «یاخی بوونی بێ خوێن»: باج دان بەحکوومەت وەستێنرا. فەرمانبەران بەهەزاران لە فەرمانی حکوومەتی خۆیان کێشایەوە. وە خوێش کە لە هیندییەکان قەدەغە کرابوو، وە باجێکی گرانی خرابووە سەر، غاندی بەخۆی و چەند هەزار هیندییەکەوە خۆی گەیاندە سەر کانەکانی بۆ دەرهێنانی. حکوومەت گەلێکی لە هیندییەکانی کوشت، بەڵام غاندی نەیهێشت تنۆکێ خوێن لە دوژمنەکانی بڕێژرێ!. بەئارام گرتن و ئازار هەڵگرتن و خۆڕاگرتنێکی بێ شەڕ و هێمنانەوە، بەهەڕەشەی ڕۆژوەوە، غاندی، بەرەنگاریی حکوومەتی کرد، تا بەسەریا زاڵ بوو وە بەئامانجی خۆی گەیشت!. لەپاش ڕۆژوێکی (١٦) ڕۆژی، حکوومەت خواستەکانی جێبەجێ کرد، وە ناچاریش بوو کە غاندی لە بەندیخانە بەردا!...

غاندی، هەروەها، ئەم چەکە بەهێزەی، لە ڕووی هیندییەکانیشا ڕائەوەشاند ئەیترساندن وە لە بەرەنگاریدا ئەیشکاندن!.

غاندی لە ساڵی ١٩٢١دا بەڵێنی بەجێنشینی شای ئینگلیز دا، کە تا لە هیندابێ، هیندییەکان دڵی ئازار نەدەن. بەڵام کە هات، هیندییەکان بەڵێنەکەی غاندییان ڕانەگرت، نومایشی ناشایستەیان دەربارەی کرد. غاندی لەداخا شەو و ڕۆژێ ڕۆژوی گرت وە هیندییەکانی بەوە تەمێ کردا.

که له سالّی ۱۹۳۲دا، هیندییەکان پەلاماری (پیرەکانی شوریشورا)یان دا و سووتاندنیان، غاندی یەجگار تورە بووا. بۆ ئەمەی خوا لەم گوناهبارییەیان خۆشبێ، وە ئەویش دڵی بریندارى خەڵکە ئازاردارەکان بداتەوە، ڕۆژوی گرتەوە، وە دیسانەوە هیندییەکانی تەمێ کردەوە!؟...

## نەنگەویستەکان

بەڵام ئەو ڕەنجەی کە غاندی بۆ نەنگەویستەکانی هیندی ئەدا، گەورە و بەرز و پیرۆزترین ڕەنجێک بوو کە تا ئەوسا لە هەموو جیهان وە بەتایبەتی لە هیندستاندا درابوو. ئەزانی (نەنگەویست)(*) کێ بوون؟... نەنگەویست ئەو شەست ملیۆن هیندییە کلۆلە کۆستکەوتووە بەسەزمانانە بوون، کە هیندییەکان بەناوی دین و ئایین و ڕەوشتی کۆنی ڕزیوی کۆمەڵایەتییەوە، چەند سەد ساڵێک بوو، لە هەموو خۆشی و سەربەستی و سەربەرزییەکی ژیان بێ بەشیان کردبوون!؟. لە کار و فەرماندا هیچیان بۆ نەهێشتبوونەوە هی تەنگ و سووک نەبێ!. وەک گڵاو خۆیان لێ ئەپاراستن!؟ نەیان ئەهێشت لەناو دێهاتدا بژین. خزاندبوویاننە ناو قوڕتە و زنجی ناشایستەوە لە جێگا ناپوختەکاندا، وە لە خۆیان دووریان خستبوونەوە!. نەیان ئەهێشت بچنە ناو کۆگا و دوکانەوە. وە ئەبوو لە شەقامەکانیشا خۆیان دەرنەخەن!؟ ئەگەر سێبەری نەنگەویسێک لە هیندییەکی خانەدان بکەوتایە، ئەبوو دەست بەجێ خۆی پاک بکردایە!؟. خاوەن کەش و فشەکانی هیندی خواروو، وایان لەم بەسەزمانانە کردبوو، کە نەنگەویستێک (بوراهما)یەکی ببینیایە بەرەو ڕووی دێ، ئەبوو بیقیژاندایە: «گڵاوم. گڵاوم. نزیکم مەکەرەوە!؟». بەڵام لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو کە ئەم بێچارانە وا بەسووکی و زۆرلێ کراوییەوە ڕاهێنرابوون، کە پێشیان بگوترایە: «ئادەی با تەقەڵلایەک بدرێ بۆ کامەرانی و خۆشگوزەرانیتان». دەمودەست بەدەنگێکی کز و چاوێکی پڕ لە فرمێسکەوە ئەیان گوت: «پێی ناوێ. ئێمە تازە نەنگەویستین»!...

## غاندی فریای نەنگەویستەکان ئەکەوێ

جا بۆ بەرزکردنەوەی ژینی ئەم نەنگەویستانە، غاندی و هاوڕێکانی کەوتنە کۆشش بۆ پچڕاندنی پێوەندی ئایینی هیندۆسی کە چەند سەد ساڵێک بوو، ئەو کڵۆڵانەی بەو ژینە نەنگە ناپەسەندەوە بەستبووەوە!. غاندی لەپێناو ئەو نەنگەویستانەدا، گەلێ ئەرک و ئازاری هاتەبەر. بەڵام چەکی ڕۆژوگرتنی لە دوژمنەکانی گرت بەدەستەوە، وە بەرەنگاریی کردن تا بەسەریاندا سەرکەوت. لە ۱۹۳۳دا غاندی لە (پاروفدا)دا جاری دا: کە هەتا چارەی ژین و سەربەستیی نەنگەویستەکان نەکرێ، ڕۆژوەکەی ناشکێنێ تا ئەمرێ!... کاربەدەستانی ئینگلیز و هیند ناچارمان خواستەکانی غاندییان بەجێ هێنا. قانونێکیان بەنەنگەویستەکان بەخشی کە خۆیان هەر بەبیریشیاندا نەهاتبوو!. شەش ڕۆژ بوو، غاندی، لە ڕۆژودابوو. کە بەم ئاواتەی گەیشت بەشادمانییەوە ڕۆژوەکەی شکاند. زۆری پێ نەچوو، لەسەر نەنگەویستەکان، جارێکی تریش ڕۆژویەکی ۳۶ سەعاتیی گرتەوە، وە نەی شکاند تا قسەکەی خۆی بردەسەرا... غاندی وای بەباش ئەزانی: کە کامەرانی و ئازادیی نەنگەویستەکان لەسەر دەستی

(*) نەنگەویست: هیندییەکان خۆیان (دۆم)یان پێ ئەڵێن. (ش.ف)

هیندییەکان پێک بێت، نەک لەسەر دەستی بێگانەکان. کەچی گەورەکانی نەنگەویستەکان، خۆیان، وایان نەئەویست. غاندی ئەیویست نەنگەویستەکانیش وەک هیندییەکان وە لەگەڵ هیندییەکان ئەندامانی پارلەمان هەڵبژێرن. بەڵام گەورەکانی نەنگەویستەکان، ئەیانەویست شوێنی تایبەتییان بۆ دانرێ هەڵبژاردنی تیا بکەن. ئینگلیزەکانیش ئەیانویست مام ناوەندی بکەن لە میانی بیری غاندی و بیری گەورەکانی نەنگەویستەکاندا. واتا: لەو شوێنانەدا کە نەنگەویستەکان کەمترن، تێکەڵ کرێن لەگەڵ هیندۆسەکاندا لەو شوێنەشا کە ئەمان زۆرترن، ئەندامی پارلەمان بەسەربەخۆیی و تایبەتی هەڵبژێرن، غاندی، بڕوای وابوو کە ئەم بیرانە دووبەرەکی و ناکۆکی ئەخەنە ناو هیندۆس و نەنگەویستەکانەوە، جگە لەوە بەکەڵکی نەنگەویستەکانیش نایەن. لەبەر ئەوە بیری هەردوولایانی بەرپەرچ دایەوە. بۆ سەرەک وەزیری ئینگلیزی نووسی: «ژینم لەپێناو بەرەنگاری کردنی بڕیارەکانتا دائەنێم. ئەوا بڕیارم دا ڕۆژو گرم. هیچیش نەخۆم تا ئەمرم. هیچیش نەخۆمەوە ئاو نەبێ بەتۆزێ خوێ، یان بەتۆزێ سۆدەوە. ئەم ڕۆژوەشم نەشکێنم تا قسەی گشت لایی کار ئەکاتە سەر حکومەتی ئینگلیز. وە ئەو بڕیارەی کە لە بارەی نەنگەویستەکانەوە داوێتی ئەیگێڕێتە دواوە!».

غاندی گەیشتبووە تەمەنی (٦٤) ساڵی. پیری و بەندیخانە و ڕۆژو بەتەرحێ شپرزەی کردبوو، پزیشکەکان لە مردنی کەوتبوونە ترسەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ئامۆژگارییەش کە ئەکرا، غاندی ڕۆژوەکەی خۆی نەشکاند، تا ئینگلیزەکان ناچارمان، بڕیارەکەی خۆیان لەبارەی نەنگەویستەکانەوە کێشایە دواوە!. لەپاش ڕۆژویەکی شەش ڕۆژی، غاندی لە مردن گەڕایەوە، وە بەشادمانییەوە ڕۆژوەکەی شکاند. ئیتر بڕیار درا کە نەنگەویستەکانیش وەک هیندییەکان وە لەگەڵ هیندییەکاندا ئەندامی پارلەمان هەڵبژێرن، بەم مەرجەی کە (١٤٨) کورسیشیان لە پارلەماندا بۆ تەرخان کرێ.

بەڵام غاندی بەمەندە وازی نەهێنا. لەگەڵێ لای کۆمەڵایەتیی تریشەوە ڕەنجی بەکەڵکی بۆ نەنگەویستەکان دا. وە توانیی جوامێرەکانی هیند بخاتە سەر ئەوەی بەڵێن بدەن کە پایەی نەنگەویستەکان بەرزکەنەوە، وە ڕێیان بدەن کە ئەمانیش شان بەشانی هیندۆسەکانی ترەوە نوێژ لە پەرستگاکاندا بکەن وە لە گەلێ فەرمانی حکوومەتیدا فەرمانبەری بکەن.

لە ڕاستیا، ژینی نەنگەویستەکان، زۆرداری و نەخوێندەواری و نالەباری و پاشکەوتوویی ناو هەموو هیندی ئەنواند. وە پەڵەیەک بوو بەسەر ناوچەوانی هەموو هیندستانەوە. جا، غاندی بوو، کە بەشاپەڕی گەورەیی و هونەرمەندیی خۆی ئەم پەڵەیەی لەناوچەوانی گەلی هیندی سڕییەوە. وە بەمە بوو کە غاندی، لە کۆڕی پیاوەتی و مەردایەتی و نیشتمانپەروەریدا، گۆی هونەری بردەوە. وە ناوی خۆی، تاسەر، لە نووسراوی ڕۆژگارا نووسییەوە.

## ژیانی تایبەتیی غاندی

هەڵبەت، لە پاش ئەم هەموو نووسینە، حەز ئەکەیت تۆزێ لە بابەت ژینی تایبەتیی غاندیشەوە شارەزای بەرگ و کەلوپەلی غاندی بیت: کراسێک و پێڵاوێک بوو لەگەڵ چاویلکەیەک و سەعاتێکی نرخ هەرزان. لەسەر تەنکە بەڕەوە یا دۆشەگێکی تەنک لەسەر عەردی ژوورەکەی دائەنیشت و ئەنوست.

چا، قاوە، بابەتی سەرخۆشی، گۆشت، ماسی، هێلکەی نەئەخوارد. حەزی لە سەوزەوات و میوەهات و کولیچەی بەشیر و بابەتی وردەکاریی هەویر ئەکرد. لە دیەنا، لە دلا، لە کردەوەدا، خۆی زۆر پاک و خاوێن ڕائەگرت. ژینی نانی نا، ژینی گیانیی ئەویست گیان سووک، شیرین زبان، ڕووخۆش بوو لەگەڵ هەموو کەسا. پەنای زۆرلێکراو و لێ قەوماوبوو. خۆی بەبچووکی هەموو کەس ئەزانی. لەگەڵ ئەمەشا دوژمنێکی سامناک بوو بەرامبەر زۆردار و بەدکردارەکان. لە سالانەیەکی (٦٠٠) لیرەیی و خۆشگوزەرانی و شادمانیی جیهان وازی هێنا، بۆ ئەمەی بتوانێ خۆی بەخت کا، لەپێناو، بەرزبوونەوە و سەربەستی و پێشکەوتنی هیندا!...

غاندی تا تەمەنی (٧٨) سالیش هێز و گوڕی مابوو. وە بۆ ژیانێکی (١٢٥) سالی بەهیوا بوو؛ بۆ ئەمەی بەئاوات بگا و هیند بەکامەرانی و ئازادییەوە ببینێ!...

غاندی، تا، ما، هێزێکی گەورەبوو لە هیندا. لە هەموو کاروبارێکا قسەی بالا بوو. هیندییەکان، هەموو تەرحێکیان، وە لە هەموولایەکەوە، چە بۆ کاروباری تایبەتی وە چە بۆ کاروباری گشت لایی، ئەهاتنە لای پرسیان پێ ئەکرد، وە بەڕاوێژی ئەویان ئەکرد. لەگەڵ ئەوەشا گەلێک جار لەگەڵ[*] سۆسیالیستەکاندا تێک ئەچوو. چونکە ئەوان ئەیان ویست هێز و توندی، ئەمیش ئەیویست شیرینی و نەرمی بەکار بهێنرێ. غاندی نەی ئەویست خوێن بڕێژیت نە لە هیندی، نە لە ئینگلیز. دوژمنی دیکتاتۆری بوو. هەمودەم ئەیویست لە ڕێی هێمنی و خوێن نەڕشتنەوە، بێ هەرا و هۆریا، لە ڕێی خۆشەویستی و لەیەکگەیشتن و دۆستایەتییەوە. لە ڕێی خۆبەختکردنەوە: سەربەستی و کامەرانیی هیند پێک بێنی. غاندی لەم ڕووەوە ئەیگوت: «سەربەخۆیی ئەوەتا: دەسەلاتی بەریتانیا و هێزی سەرمایەدارەکانی بەریتانیا و هیند، لە هیندستان هەلبگیرێ. وە لە هێزی کوشندەی خۆپاراستنیش ڕزگارکرێ. چونکە ئەو گەلەی لەشکر فەرمانڕەوایی بەسەرا بکات، بەگەلێکی ئازاد نامینێتەوە!...».

غاندی هێشتا مەترسیی هەبوو لەوەی کە سەربەخۆیی هیند بەلوولەی تفەنگ بسێنرێ لە بەریتانیا. چونکە ئەترسا لەوەی کە ئەو هێزەی سەربەخۆیی هیند پێک ئەهێنێ، هەر خۆیشی ئازادیی هیند برمێنێ... بەلام سۆسیالیستەکان پێچەوانەی ئەو قسەیان ئەکرد و ئەجوولانەوە.

غاندی نەی ئەویست، تەنیا ئامانج، پیرۆز و بەرزبێ. ئەیەویست ڕێگای ئامانجیش پیرۆز و بەرزبێ. لەبەر ئەوە لەگەڵ فاشیستەکانیشا لەمەدا تێک ئەچوو!... غاندی دیموکراسییەکی ڕاستەقینە بوو. بەزرنگی و هونەرمەندی و کردەوەی پەسەندی خۆی، هیندی بەگەلێ ئامانج گەیاند وە خستیە سەر ڕێگای ئازادی و شادمانی. هەموو گیان و سامانی خۆی لە پێناوی هیندا بەخت کرد لەبەر ئەوە هەر (٤٠٠) ملیۆن هیندییەکە نازی ئەکێشا. وە لە ترسی ئەوان حکوومەتی بەریتانیایش دلی ڕائەگرت. غاندی هیندی بوو وە کە جێگای پێشەوایەکی ئایینیی لە هیندا گرتبووەوە، ئالای ئازادی و خۆشەویستی و برایەتیی هەلگرتبوو بەهیند وە خەریک بو ئەیکرد بەڕەهبەرێکی زرنگ و بلند بۆ هەموو دانیشتوانی جیهان.

---

(*) سۆسیالیست: اشتراکي. (ش. ف)

## دواڕۆژی غەندی

لە دووەم جەنگی جیهانیشدا هیندییەکان یاریدەی ئینگلیزەکانیاندا. بەڵام ئەمجارە وەک جاری پێشوو ڕەنجەڕۆ نەبوون. حکوومەتی بەریتانیا بەڵێنی خۆی هێنایە جێ. وە لە هاوینی ١٩٤٧دا بەناوی (هیندستان) و (پاکستان)ەوە دوو حکوومەتی گەورەی بۆ دامەزراندن. ئەم دوو حکوومەتە هەرچەندە سەربەخۆی تەواو نەبوون وە هێشتا بەسترابوون بەشاهکلاوی بەریتانیاوە، بەڵام لەچاو جاراندا ئەمە بەهەنگاوێکی یەجگار گەورە ئەژمێررا بۆ بەرەو ئازادیی هیند و پێشکەوتن و کامەرانیی. ئەمە هەرچەند، تا ئەندازەیەکی زۆر، غاندی ئەیئەویست هیند بیێتە دووبەرەکی: ئیسلام و هیندۆس. گەلێک تەقەللای دا کە هیند بکاتەوە بەیەک. بەڵام سەری نەگرت. بەڵکو ناوەندی هەردوو حکوومەت، لەسەر خاکی کشمیر، ئەوەندە تێک چوو، وەختبوو هیند بەجارێ بکەوێتە شەڕێکی خوێنینەوە، وە هە چ ڕەنجێک بۆ ئازادی و پێشکەوتنی درابوو بەبا بچێ... لەگەڵ ئەوەشا، غاندی، مەردانە کەوتە ناوەوە، وە لەسەری ساڵی ١٩٤٨دا هیندی بەڕۆژوویەکی تا مردن ترساندەوە. وە هەتا (هیندستان) و (پاکستان)ی پێک نەهێنایەوە، وە ئیسلام و هیندۆسی ئاشت نەکردەوە، ڕۆژووەکەی نەشکاند، کە حەوت ڕۆژی تەواوی خایاندا. لە وەختێکا غاندی بەم سەرکەوتنە پیاوانەیەوە، دڵخۆشیی خۆی ئەدایەوە. وە هیوای یەکبوون و چاکبوونی هیندی ئەکرد. وە بۆ گەیشتن بەئامانج ڕێگای کۆششی بۆ دائەمەزراند... دەستی بەکار، لێی کەوتە کار: لەو دەمەدا کە لەناو چەند هەزار هیندوسێکا نوێژی ئەکرد، لە ١٩٤٨/١/٣٠دا لەلایەن کابرایەکی هیندۆسییەوە بەدەمانچە کوژرا! بەم ڕەنگە بەختیاریی غاندی زۆری نەخایاند. وە ئەو پیاوە گەورە بێ هاوتایە کە لە هەموو تەمەنیا ماوەی ڕشتنی تنۆکێ خوێنی کەسێکی نەئەدا، بەچوار گوللە خوێنی ڕژا!. بەڕاستی کارەسات و کەتنێکی یەجگار ئەنگ و ناشیرین بوو. دڵی هەموو جیهان وە بەتایبەتی دڵی هەموو هیندی خستە ژانەوە!. هیند ئێستەش فرمێسکی خوێنینی ئەگیرساوەتەوە!. کڵپەی دەروونی نەکوژاوەتەوە!. غاندیی لەبیر نەچووەتەوە!. وە وا خەریکە چاکەی ئەداتەوە!... بەناوی خۆشەویستی و ئەوازشی گشت لایییەوە، وە بۆ ئەمەی کردەوەی پیاوانە و نیشتمان پەروەرانەی غاندی، هەموو دەم بیر کەوێتەوە: لە ڕۆژی ١٩٤٨/٢/٢٨دا، لە دێیەک نزیک بەشاری (بۆمبای)، لەسەر لوتکەی گردێک پەیکەرێکی نایابیان بۆ دامەزراند.

غاندی کوژرا. بەڵام هیندی خستە سەر ڕێگای ژین و پێشکەوتن و ئازادیی، کە ئیتر هەتا جیهان مابێ، جارێکی تر بەرەو پاش ناگەڕێتەوە!.

# ماكفادن

«داهێنەری فەنی لەش پێگەیاندن و چاككردنەوەی نەخۆش بەبێ دەرمان

(١٨٦٨ - ...)

## ماكفادن لە منالیدا

(بەرنار ماكفاندن)، لە سالی ١٨٦٨دا لە (میسوری) لە خاكی ئەمریكای یەكگرتووا لە دایك بووە. باوكی جووتیارێكی مەی خۆر، دایكیشی ئافرەتێكی سیلاویی بووە. كە باوكی مرد ماكفادن چوار سالان بوو. دایكی ناردیە كن مامی. ئەمیش لە رێبوارخانەكەیا هەموو فەرمانێكی ناشایستەی پێ بینی. دایكیشی مرد. شەو گوێی لە مامی بوو، بەئامۆژنی ئەگوت: «ئەترسم ماكفادنی بەسەزمانیش بەسیل بمرێ»! اماكفادن لە عەزرەتا لێفەكەی كێشا بەسەر خۆیا و بەقایم هاواری دایكی كرد!. پاشان مامی، ماكفادنی لە كۆڵ خۆی كردەوە. ناردیە كن جووتیارێك. لەوێ، لە دەست نەخۆشی و لەڕولاوزیی رزگاری بوو. بەرەبەرە گەورە بوو. بەلام چەند سالێكی پێ نەچوو، لەگەڵ كابرا تێك چوو. چووە كن مامێكی تری كە لە شاری (سانت لویس)دا لەگەڵ نەنكیا ئەژیا. لەوێ بوو بەپارە كۆكەرەوەی چەند هاوبەشییەك پاشان بۆ بەفەرمانبەری كۆگایەك. ئینجا بەنووسەری بازرگانێك. ماكفادن شەو تا درەنگ چیرۆك و سەرگوروشتەی ئەخوێندەوە. بەلام زۆری پێ نەچوو، لەشی تێك چووەوە. ئەپژمی!... گوێی لێ بوو ئەم مامەشی بەچرپە بەنەنكی ئەگوت: «ماكفادن سیلیەتی!». ماكفادن لە مردن تۆقی. پەنای بردە بەر داوودەرمان و پزیشك. بەلام هیچی بەكاری نەهات!. رەنجی بەبا چوو وە هە چ پارە و وەختێكیشی تیا بەخت كردبوو لە دەستی چوو!. بەلام زوو لە رازی ئەم نەخۆشی و دەردەدارییەی گەیشت. نەی ئەتوانی بەو رەنگە بژی. نەشی ئەتوانی بچێتەوە لادێ. ئەی چی بكا؟!. ئەوەندەی بۆ مایەوە: پەنا بەرێتە بەر لەش جولاندن و وەرزش كردن!. گوێی نەدایە تیزوفیزی ئەم و ئەو. دەمودەست، خۆی كردە یەكێ لە ئەندامانی (یانەی وەرزشی سانت لویس). لەوێدا بەتەنیشت وەرزش كردنەوە، هەرچی لە بابەت وەرزش

و لەش پێگەیاندنەوە نووسرابووەوە خوێندیەوە و بەکاری هێنا. ماکفادن چاک بووەوە. هێز و گوڕی سەندەوە. نەخۆشی باری لێ کرد. وە لە جێی ئەو ئاوات و هیوای دەرکەوتن و بەرکەوتن و سەرکەوتن هاتە بیریەوە!...

## ماکفادن لە کۆڕێنیدا

ئاواتی بەرز و کردەوەی پەسەند، بابەتی کوڕ و لاوە. ماکفادن ئەیویست «یانەیەکی وەرزش» بکاتەوە. بێ دەرمان، نەخۆشی تیا چاک بکاتەوە. بەو دراوە کە بەرەنجی شان و خو (عرق)ی ناوچەوان کۆی کردبووەوە، ئاواتەکەی خۆی هێنایەدی. تیا سەرکەوت وە بەئامانج گەیی. سامانێکی زۆری بەسەرا ڕژا. بەو هیوایەی کە یانەیەکی باشتر و جوانتر پێک بهێنێ: جاری دایخست. وە پڕی دایە فێربوونی ئەو زانستی و زبانانە کە بەکەڵکی ئەو فەرمانە ئەهاتن. پاشان دەستی دایە گرەوکردن و زۆران گرتن لەگەڵ پاڵەوانە بەناوبانگەکانی ئەمریکا و ئەوروپادا!. کەس نەبوو، بەماکفادندا ڕاپەرموی: کە ئەمانە بەرێتە سەر. هەموو تیزیان پێ ئەکرد. بەرێژگاویان دائەنا! ماکفادن، گوێی نەدایە قسەیان. کۆشا. تەقەللای دا. زۆری پێ نەچوو لە هەموو زۆرانبازییەکاندا سەرکەوت!... وە ڕووی هەموو جیهان وە بەتایبەتی ئەمریکای، بەسەر سوڕمانێک بێ ئەندازەوە، وەرگێڕایە سەر کارگوزاریی و هونەرمەندیی و هێز و گوڕ و شارەزایی خۆی!... بەم ڕەنگە ماکفادن خوێندەواری و ناوبانگی بردەوە.

لە ڕاستیا ئەم دوو فەرمانە، دوو هەنگاوی گەورە بوون بۆ دامەزراندنی دوارۆژێکی پڕ لە کامەرانی و شادمانی بۆ ماکفادن ناسرا بەپاڵەوانی پاڵەوانان و بەمامۆستای پزیشکان، لە لەش پێگەیاندن و نەخۆش چاککردنەوەدا بەبێ دەرمان!. ماکفادن بەئاوات گەیشت. چونکە چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەی ئەکرد. لەبەر ئەوە تەنیا هەنگاوێکی تری مابوو هەڵی بێنێ. ئەویش قسەکردنێکی زرنگانە و مامۆستایانە بوو، بۆ کۆمەڵێکی گەورە، لە بابەت تەندروستی و لەش پێگەیاندن و چاککردنەوەی نەخۆشەوە بەبێ دەرمان بەسایەی وەرزش و ڕێکخستنی شێوەی ژینەوە. پاش هەفتەیەک ئەمەشی بەرێکوپێکی بردەسەرا. قسەکانی کاری کردە دڵی گوێگرەکان. چونکە خۆی پاڵگەیەکە بوو بۆ ڕاستیی قسە و بیر و ئامۆژگارییەکانی خۆی. ماکفادن سەرکەوت. وە بەسەرکەوتنی خۆی، بنچینەی گەشتی و لەش خۆشی و کامەرانییەکی ئاسان و هەرزانی دامەزراند بۆ هەموو دانیشتوانی سەر زەمین.

ئینجا ڕێگە کرایەوە بۆ ماکفادن، کە یانەکەی بکاتەوە. بەڵام شتێک هاتە پێشەوە، تا چەند وەختێک لەو ڕێیە لای دا، بەم ڕەنگەی کە ئەیبینین.

## نووسەری ژیانی وەرزشکار

ماکفادن، سەروگوزەشتەیەکی گەورەی نووسیوە. ناوی نا (ژیانی وەرزشکار). کە لە ڕاستیا باسی ڕەنج و ئازار و خۆشی و کامەرانیی خۆی ئەکرە لە ژیانی وەرزشکارییدا. بردیە لای نووسراو بڵاوکەرەوەکان لە چاپی دەن. دەسیان نا بەڕوویەوە!... گوتیان: شێوەی نووسینەکەت بێ هێز و ناشیرینە، پڕە لە هەڵە و خوار و خێچی!. ماکفادن وەک شوڵێ لە سەری لوتی بدرێ وابوو. هەر لێکی ئەدایەوە..

لەبەر خۆیەوە ئەیگوت: «کەواتە هێشتا وام لێ نەهاتووە ببمە مامۆستای لەش پێگەیاندن!... دیارە کە قسەم بێ هێز و پڕ لە هەڵەبێ، کەس گوێی لێ ناگرێ»!... بەڵام... بەخێک بوو... وازی نەهێنا تا بەتەواوەتی فێری زبان و شێوەی نووسین بوو!... بەتەنیشت فەرمانی نوێیەوە -کە لە خوێندنگایەکی شەڕا، وەرزشی فێری شاگردان ئەکرد و بیروباوەڕی خۆی لە بابەت ژینێکی تەندروستانەی پاکەوە تێ ئەگەیاندن- بەشەویش تێ ئەکۆشا کە لە خوێندەواریی و نووسین و زبان زانیندا قاڵ بێ. پاش چەند مانگێک چاوێکی گێڕایەوە بەنووسراوەکەیا. بژاری کرد. پوختەی کرد و ڕێکوپێکی خست. بردیەوە لای نوسراو فرۆشەکە. نووسراوفرۆش، ئەم جارە بۆی لە چاپ دا!... ماکفادن دیسانەوە سەرکەوتەوە. ئەمجارە ناوبانگی بە(نووسەر)یش دەرچوو. وە هەستی بەخۆی کرد، کە ئیتر مامۆستایی لەش پێگەیاندنی، پێ ئەکرێ!. وە ئەتوانێ بەهۆی قەڵەمیشەوە، بیروباوەڕی خۆی بەهەمموو کەس، لە هەمموو لایەکا بگەیێنێ!... وە پێشەوایی هەمموو کەس بکا بۆ ڕێگای لەش خۆشی و هێز و جوانی و زرنگی. ئینجا ماکفادن ڕاڕەوێکی وەرزشی لە شاری (سدلیا) لە خاکی (میسوری)دا کردەوە. زوو بەزوو سەرکەوت. بۆ ناو دەرکردن، دووبارە چووەوە کۆڕی زۆرانگرتن لەگەڵ زۆرانبازەکاندا. پاش هەر سەرکەوتنێک، لە چاکە و کەڵکی وەرزش ئەدوا بۆ دانیشتوان، وە تێی ئەگەیاندن کە ئەمیش ڕێگایەکی یەجگار باشە بۆ تەندروستی. ساڵ تێوەرنەگەڕایەوە لەو زەماوەندانە، پوڵێکی فرە بۆ ماکفادن کۆبووەوە. پاشان چووە (شیکاگۆ) کە لە یانەی (ورلدزفیر)دا کار بکا. لەوێ زۆرانبازێکی تری ناسی، کە زۆر کاری کردە سەر ڕەوشتی لە ژیاندا.

## گۆڤاری وەرزش

لە هەمموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەمریکادا، تەنیا هینەکانی ماکفادن، بەرکەوتن نەکەوتوون. ئەویش لەبەر ئەوەیە کە بابەتەکانی بەستراون بەژیان و گوزەران و پێشکەوتنی ڕاستەقینەی مرۆڤەوە. (گۆڤاری وەرزش)، کە لە (٤٨) ساڵ لەمەوپێشەوە دەری هێناوە، ئێستەش گیانی کەڵک بەخشی و پیاوەتیی تیا ئەبزوێتەوە وەک یەکەم ڕۆژی، ئێستەش ڕۆژ بەڕۆژ لە سەرکەوتن و بەرکەوتنایە، وە تایەت ئەچێتە دڵی خوێندەوارانەوە. لە ڕاستیا ئەم گۆڤارەی بووبووە زبان بۆ یانە و بیروباوەڕەکەی کە لە بابەت تەندروستی و شێوەی ژیانێکی پڕ لە هێز و گەشایش و چاکەوە ئەدوا وە بۆ گەیشتن بەو ژیانە ڕێگای پێشان ئەدا. وەرزش، خواردن و خواردنەوەی پاک و پوختە و بەئەندازە، سرەوت و نوستن و خۆش ڕابواردنێکی پەسەند، دامەزراندنی ژینێکی خێزانی لەسەر بنچینەی دڵداریی هەردوولایی، ڕەوشتی جوان و دڵی بێ گەرد و دەروونی خاوێن، گیانی بەرز و کرداری گەورە و ڕەنجی مەردانەی لەپێناو ئازادیی و شادیی و خۆشگوزەرانی براکانی سەر زەمیندا. ئەمانە هەمموی ڕێگای ئەو ژینە شیرینە بوون کە ماکفادن ئەیویست بێتە بوون.

سەیر ئەوەیە، کە ئەم (گۆڤاری وەرزش)ەی دەرهێنا. لە هەزار لاوە تیزیان پێ ئەکرد. بەرەنگارییان ئەکرد. بەگژیا ئەچوون. بەشێت و ڕێژگاویان دائەنا!... بەڵام ماکفادن لە بەرامبەر کەسیاندا سەری دانەنەواند. هەر لەسەر فەرمانی خۆی ڕۆیشت، تا وەهای لێ کردن، هەر ئەو خاوەن ڕۆژنامە و گۆڤار و

خوێندەوارانە خۆیان، لە کردەوەی خۆیان پەشیمان بوونەوە. وە لە بریتیی ڕەخنە و توانج و پلار تێ گرتن، دەستیان دایە ستایش کردنی!؟...

جارێکیان کابرایەکی داودەرمان فرۆش هاتە کنی، کە لە گۆڤارەکەیا جارێکی بۆ بدا لە بابەت دەرمانێکەوە کە گوایا دەمار بەهێز ئەکا. ماکفادن لە پلیکانەوە کابرای تووڕ هەڵدایە خوارەوە!. ئینجا چووە ژووری وەرزش کە لەوێدا بیرێک لەم کارەساتە بکاتەوە. پاشە جار بڕیاری دا کە نووسراوێک دەرکات لە بابەت (ڕاستیی ژیانی سک و زا)وە، کە بەدیاری بینێری بۆ خوێندەوارانی گۆڤارەکەی. دەمودەست دەنگی دا کە لە پاش مانگێ ئەو دیارییەیان بۆ ئەنێرێ. بەڵام لەبەر هەندێ کاروباری ناکاو، ماکفادن دەستی نەپەرژا. نووسراوەکە بنووسێتەوە تا گۆڤارەکە دەرچوو بۆ ئەمەی بەدرۆ نەکەوێتەوە، ناچارما، شەویشی خستە سەر ڕۆژ، وە سرەوتی نەدا بەخۆی، تا لە درەنگە شەوێکا لە نووسراوەکەی بووەوە!. ماکفادن ئەمجارەش سەرکەوت. بەڵام چاویشی لەکار کەوت، وەختبوو!... بەڵام ئابڕووی خۆی نەبرد و نەچوو. خۆیشی هەر لەسەر ئەو ڕێ و شوێنە خواکردییە ڕۆیشت کە بۆ ئەم و ئەوی دۆزیبووەوە بۆ گەیشتن بەتەندروستی و هێز و بەختیاریی. زۆری پێ نەچوو، ماکفادن چاوی خۆی -بەوەرزش و حەسانەوە و ئەندازەگیریی لە هەڵسان و دانیشتن و خواردن و ڕابواردن دا- چاک کردەوە!... ئەم نووسراوە تازەیەشی، وەک نووسراوەکەی تری و گۆڤارەکەی، خوێندەوارانی کێش کردە سەر خوێندنەوەی وە ئەوەندی تر ناوبانگی دا بەماکفادن و گۆڤارەکەی، کە هێشتا دووساڵی بەسەرا تێ نەپەڕیبوو، لە (٥٠٠) دانە وە فرۆشتنی گەیشتبووە (١٠٠,٠٠٠) دانە!... بەم ڕەنگە (گۆڤاری وەرزش)، کە لە سەرەتادا جارنامەیەک بوو بۆ فرۆشتنی کەلوپەلی وەرزش. لە دواییدا وای لێ هات، ماکفادن، بەکۆمەڵێکی گەورە فەرمانبەر و یاریدەدەر و نووسەر و کۆشکێکی یەجگار گەورەوە، ئینجا بۆی دەرئەهات!... تا ئەوسا، لە فرۆشتنی کەلوپەلی وەرزش، پارەیەکی مفتی دەست ئەکەوت. ماکفادن ویستی پایەی خۆی و گۆڤارەکەی بڵندتر بکاتەوە. جاڕی دا: «وەرزش بەبێ کەلوپەل بکرێ چاکترە!». بەوە زیانی زۆر لێ کەوت، بەڵام لەسەرێکی ترەوە، لەبەرچاو خەڵکا یەجگار بەرزبووەوە!... ئێستاش گۆڤاری وەرزش تا دێ، لای خوێندەواران خۆشەویستتر ئەبێ. چونکو ماکفادن، بەدڵ ئەیەوێ، ژینێکی پڕ لە شادی و ئازادی و کامەرانییان بۆ پێک بێنی، بەهۆی وەرزش و بەکارهێنانی ڕێگای خواییەوە لە خواردن و نوستن و هەڵسان و دانیشتنا. ماکفادن، بەگۆڤارەکەی، خەڵکی لە خەوی بێ هۆشی و نەخۆشی ڕاپەڕاند. وە تێی گەیاندن کە «لاوازیی و نەخۆشی گوناهبارییە. وە لە توانای گشت کەسا هەیە کە گوناهباریی نەکا، وە بەئارەزووی خۆی، بەتەندروستی و دڵخۆشییەوە بژی!...».

## خانووی چاککردنەوەی نەخۆش

شەش نەخۆش، کە چەند ساڵێک بوو پزیشک و داوودەرمان خەریکیان بووبوو، وە نەی توانیبوو چاکیان بکاتەوە، بەناچاری پەنایان بردە بەر ماکفادن. یەکێکیان باداریی وە یەکێکی تریان سیلی بوو. ماکفادن ئەمەی لە هەموو کەس گەیاند. چەند مانگێکی پێ نەچوو، بەهۆی وەرزش و پێڕەوییەکانی تریەوە، هەر شەشی چاککردنەوە. وە هەموو جیهانی سەرسوڕمانەوە!. ئەم سەرکەوتنە ماکفادنی تیژ کردە

سەر ئەوەی کە لە هاوینی دواییدا هەوار بگوێزێتەوە سەر کەناری گۆمی (ڕوکونو کوناما)، لە دوورگەی (لونگ ئایلاند)دا. لە گشت لاوە نەخۆش ڕوویان تێ کرد. جارێکیان ژمارەیان گەیشتە (١٢٥) نەخۆش!... ماکفادن هەموویانی چاک کردەوە! بەڵام لەبەر فەرمانی گۆڤارەکەی و چاک کردنەوەی نەخۆشەکانی، دەسی نەئەپەرژا، زۆر خۆی بەهەڵسوڕاندنی کاروباری خانووەکەوە خەریک کات. دزیی و ناپاکییەکی زۆری لێ کرا. زیانی گەیشتە (١٠,٠٠٠) دۆلار لە ساڵێکا!. ناچارما، خانووەکەی داخست، بۆ ئەمەی هەوایەکی باڵی خۆی بدات!؟...

## شاری لەش پێگەیاندن

ماکفادن پیاوێکی نەبەزە. بۆیەکا وازی لەم خانووەی هێنا: کە شارێکی لەش پێگەیاندن دامەزرێنی. دەمێک بوو بەئاواتی ئەمەوەبوو. لە پاش تەقەللا و کۆششێکی زۆر، لە ساڵی ١٩٠٦دا زەوییەکی فراوانی لە شاری (هەلینا) لە خاکی (نیوجرسی)دا کڕی. خانووی نەخۆش چاک کردنەوە و خانووی چاپ کردنی تیا دروست کرد. لەوێدا جێ خانووی هاوبیرەکانی و شەقام و شوێنی تاقیکردنەوەی بیروباوەڕەکانی نیشانە کرد. بەهۆی هاوبەشییەکەوە شەمەندەفەریشی بۆ کێش کرد. بەکورتی هەرچی لە توانایدا بوو کردی بۆ پێکهێنان و ڕازاندنەوەی ئەم (شاری لەش پێگەیاندن)ە. زۆر کەس ڕوویان کردە شارەکەی ماکفادن. بەڵام لەسەر وتارێک کەرەپ و ڕاست لە بابەت کارەساتی سک و زاوە دابووی لە گۆڤارەکەیا، ماکفادن تووشی گێرەوکێشە و تەنگ و چەڵەمەیەکی وەهابوو، شارەکەی بەجارێ سەرونگون کرد. وە لەبیر گشت کەسی بردەوە!...

## چیرۆکی تۆوی نەخوێندەواریی

ماکفادن، بەهۆی نووسەری بەناوبانگ (جۆن کویل)ەوە، بەناوی (تۆوی نەخوێندەواری)یەوە چیرۆکێکی لە بابەت کەینەوبەینە و کارەساتی سک و زاوە بڵاوکردەوە. بۆ ئەمەی چاوی خەڵک بکاتەوە بۆ بینین و پێ زانینی زیان و ئەرک و ئازاری ئەو نەخۆشیانەی کە لە نەزانینی شێوە و ڕێ و شوێنی دڵداری و ژیانی ژن و مێردی و سک و زاوە پەیدا ئەبێ. چیرۆکەکە خۆش و بەجۆش بوو. هەموو کەس پری دایە خوێندنەوەی. بەڵام دوژمنەکانی ماکفادن، بەناوی خواناسی و ئایین و شەرم و ڕەوشتی کۆمەڵایەتییەوە، حکومەتیان لێ ورووژاند. حکومەت گرتی!. کەینەوبەینەکەی لە هەر سە پلەی دادگاە تێپەڕینرا. لەلایەن هەزاران خۆشەویستانی ماکفادن و چاکە خواهانی نیشتمانەوە، تکا لە سەرۆکی جمهوریەت کرابۆ بەخشینی. ئازاد کرا. لەگەڵ ئەمەشا، ماکفادن، تا دوو ساڵ لە گێرەوکێشە و خفەت و سزا و ئەرک و ئازار، ڕزگاری نەبوو. شارە خۆشەویستەکەشی -کە لەسەری کەوتبوو بە(١٠٠,٠٠٠) دۆلار- لەناوچوو!... جگە لەوە (٢,٠٠٠) دۆلاریش جەریمە کرا. وە گۆڤارە نایابەکەشی کەوتە گیانەلاوەوە!...

بەم ڕەنگە، لە بریتیی پشتگرتن و یاریدەدانی. حکومەت، لەسەر هاندانی ڕێژگار و کۆنەپەرستەکان، ماکفادنی شکاند، وە بەدناوی کرد بەتاوانی بەدخوویی و بێ شەرمییەوە!؟... هە چ ڕەنجێکی دابوو،

بەهای دا. هەرچییەکیشی بۆ کۆبووبووەوە -بەرەنجی شان و خوی ناوچەوان، لە سایەی گۆڤارو و خانووی نەخۆش چاک کردنەوە و شاری لەش پێگەیاندنەوە.- بەفیڕۆی دا!. لەگەڵ ئەمانەشا، هەمووی، ماکفادن، چاوی نەترسا، کۆڵی نەدا!... پشت بەستە بەخوا و خۆشەویستیی چاکە پەرستانەوە، جارێکی تریش سنگی بردە پێشەوە. وە لە نوکەوە تێ هەڵچووەوە. بۆ ئەمەی بیروباوەڕی خۆی بباتە سەر. وە هاونیشتمانەکانی بخاتە سەر ڕێگای تەندروستی و هێز و هۆشمەندیی!...

## هەرای دەرمان

داوودەرمانی ئامادەکرا و؛ کە لە ڕاستیا ژەهرێکی زیانبەخش و کوشندە بوو بەهۆی چاوڕاوی ڕۆژنامە و گۆڤار و هەندێ لە پزیشکە چاوبرسی و ناپاکەکانەوە، کڕیارێکی زۆری لە ناشی و نەزانەکانی ئەمریکا کێش کردبوو. وە گیرفانی خاوەن کارگە و دەرمانخانەکانی بەپارەی ڕووتاندنەوەی ئەو کاولانە پڕ کردبوو. جا، ماکفادن، بەفەرمانێکی نیشتمانیی دائەنا کە بەرەنگاریی ئەو داوودەرمانانە بکا، وە نەخۆشیان لێ بتەکێنێتەوە تا هێز بڕ ئەکا. وە کردی!... بەڵام دوژمنانێکی زۆربەی دەوڵەمەند و بەهێزی لە خۆی ورووژاند. لە پێشەوە بەبەرتیل دان و میچکە میچکە بۆ کردن، پاشان بەهەڕەشە و گوڕەشە، شای ژەهرەکان -داوودەرمانەکان- بەهەموو هێز و توانایانەوە چوون بەگژ ماکفادنا!... زیانێکی زۆریان لە دەرامەدی دا. بەڵام نەیان توانی پەکی بلاوبوونەوە و کاریگەریی ئەو بیروباوەڕی بخەن. ماکفادن، وردە وردە خەڵکی وریا کردەوە وە لە بەکارهێنانی ئەو داوودەرمانە ژەهراویانە دووری خستنەوە. وە لە بریتی ئەوە هۆگری کردن بەبەکارهێنانە دەرمانی خوابییەوە کە وەرزش و لەش پێ گەیاندنە. هەرچەندە، تەنیا، هەر ماکفادن نەبوو، کە بووبوو بەهۆی نەهێشتن وەیا کزکردنی بازرگانیی ئەو داوودەرمانانە. بەڵام پێش هەموو کەس، وە لە هەموو کەس بەگوڕتر و مەردانەتر ئەوبوو؛ کە دەسی بەم بەرەنگاری کردنە چاک و بەکەڵکە کردبوو. ماکفادن ناوی دەرمان فرۆشەکانی نابوو: «جادوکەر و چاوڕاوکەر، دز و جەردەی ناشی و نەخوێندەوارەکان». ماکفادن، دەسی خۆی وەشاند. هەرچەندە دەسی ئازاری گەیشت. بەڵام دوژمنەکانی خۆی و جیهانی، باش شکاند!...

## شەڕ لەگەڵ پزیشکەکاندا

ماکفادن، دوژمنی فەنی نەخۆش چاککردنەوە و پزیشک نەبوو. لەناو پزیشکە باشەکاندا زۆر دۆستی هەبوو. وە زۆریان لە بیروباوەڕ و کردارەکانیا یاریدەیان ئەدا. بەڵام دوژمنی ئەو کۆمەڵی پزیشکانە بوو، کە لە فەرمانی ڕاستەقینەی پیاوانەی خۆیان، لایان دابوو. وە خوویان دابووە، خووپەرستی و چاوبرسێتیی خۆیان. نەخۆشیان چەواشە ئەکرد و ئەیان ڕووتاندنەوە. تەندروستی گشت لاییشیان خستبووە ژێر چەپۆکی مۆتەکەی گیانی بازرگانی و پولپەرستیی خۆیانەوە، بەڵێ... ماکفادن ئەچوو بەگژ ئەو کۆمەڵێ پزیشک و پزیشکە ناپاکانەدا. وە نەشارەزایی و ناپاکییانی لە خەڵک ئاشکرا ئەکرد. ئەیگوت: «لەش پێویستی بەداوودەرمان و پزیشک نییە. لەش ئەتوانی خۆی چاک بکاتەوە لە هەموو نەخۆشییەک. بەو مەرجەی کە ماوەی تەواوی بدرێتێ، وە لەشتی خراپ بپارێزرێ. ئەویش بەهۆی:

رۆژوو و خۆپاراستن لەو خواردەمەنییانەی خراپن و بەکەڵک نایەن، ئەندازەگیریی لە خواردنا، ناشتاکردنێکی پەسەند لە پاش رۆژوو، وە لەسەر ئەو پێڕەوییەی کە پزیشکی تایبەتی ئەیدات. وەرزش. لەش سوونەوە. بەکارهێنانی بای خاوێن و تیشکی رۆژ و ئاوی پاک. هێشتنەوەی دڵ و دەروون بەپاکی و بێ گەردیی...». لەسەر ئەم بنچینەیە، ماکفادن بوو هەموو نەخۆشییەک رێگای چاککردنەوەی خواکردی دۆزیبووەوە. وە بۆ راهێنان و فێرکردنی خەڵک بەم بیروباوەڕانەوە بوو کە ماکفادن بەرەنگاریی (کێشانی جگەرە) و (خواردنەوەی بابەتی سەرخۆشی) و (چاویلکە لەچاوکردن) و (بەکارهێنانی ئاردی بێژراوە) و (پۆشینی سوخمەی مەمک) و (شەرمی درۆ)ی ئەکرد و ئەکۆشا کە لەناو خەڵکا هەڵیان گرێ.

پزیشکە خراپەکان، وە بەتایبەتی کۆمەڵی پزیشکان کە زۆرتر لە کۆمەڵێکی سیاسیی ئەکرد، بەکردەوە و بەزبان و بەنووسین هورووژمی کوشندە کوشند، یان ئەبردە سەر ماکفادن. بەڵام ماکفادن ئەمانیشی شکاند زۆری پێ نەچوو، گەلێک لەو پزیشک و کۆمەڵانە، هاتنە سەر بیری ئەو، وە لەسەر بیروباوەڕ و ئامۆژگاریی ئەو ئەجووڵانەوە!... بەم رەنگە ماکفادن کۆمەڵە دوژمنێکی دڕندەی لە کۆڵ نیشتمانەکەی خۆی کردەوە. وە رێگایەکی تری شادمانی و کامەرانیشی بۆ جیهان دۆزیەوە.

## کردەوەکانی تری ماکفادن

ئەمانە هەندێک بوون لە بەسەرهاتی ماکفادن. ئەگەر لێرەدا ماوە کەم نەبووایە، بەدرێژی باسی کردەوە نایابەکانی تریشمان ئەکرد. بەکورتی هەرچی بۆ تەندروستی و ژینێکی پڕ خۆشی و بەختیاری و کەڵک بەخشی پێویست بووبێ، ماکفادن تێ کۆشاوە بڵاوی کاتەوە بەناو جیهان وە بەتایبەتی بەناو ئەمریکادا ئەم بوو دەنگی بەرزکردەوە و تەقەللای دا بۆ پێکهێنانی سەربەستی لە لێدوانی کارەساتی سک و زادا. بۆ رزگاربوون لە دەست بەرگ و پۆشەنیی بێ کەڵک و خراپ. بۆ نومایشی لەشی جوان و شۆخ و شەنگ. ئەم بوو بیست چێشتخانەی پاک و پوختە و بەکەڵک و هەرزانی کردەوە بۆ خەڵک. ئەم بوو باوی نووسین و بڵاوکردنەوەی (چیرۆکی راستەقینە)ی داهێنا. ماکفادن چە لەلای خۆی وە چە بەهۆی نامە ناردنەوە، هەموو جۆرە نەخۆشییەک، لە هەموو لایەکی جیهاندا چاک ئەکاتەوە، وە بۆ پێکهێنانی ئەم مەبەسە (پەیمان گاە)ێک و (خەستەخانە)یەک و گەلێک (گۆڤار) و (رۆژنامە) و (نووسراو)ی نایاب نایابی دامەزراندووە و سەرپەرشتییان ئەکات. ئێستێکەیە کە ناسراو و یەکە پیاوی بەرێزە لە ئەمریکادا لە کۆڕی فەنی نەخۆش چاککردنەوە و تەندروستیدا ئەمەندە پایەی بڵندە، ناویان ناوە (باوکی لەش پێ گەیاندن). لە رێک و پێکخستنی وەرزشدا، یاریدەی ئەڵمانیا و ئیتالیا و ئیسپانیا و گەلێک لە حکومەتەکانی جیهانی داوە. تەنانەت حکوومەتی ئەمریکای یەککگرتوو، لەم شەڕی گەورەی جیهانیی دواییەدا، بۆ سەرپەرشتی کردنی کاروباری تەندروستی و وەرزش پەنای بردە بەر ماکفادن. گەلێک لە شاگردەکانی، لە جیهاندا، وەک ئەو، (پەیمانگای نەخۆش چاک کردنەوە)یان کردۆتەوە، وە بۆ تەندروستی گشت لایی ئەکۆشن. یەکێک لەوانە (مامۆستا فائق الجوهری)ی مسرییەی، کە ئەمە بیست ساڵە ئەویش وەک ماکفادن چە لە (پەیمانگا)کەیاوە چە بەنامەکاریی، نەخۆشیی لەش و هۆش و گیان چاک ئەکاتەوە لە میسر و لە جیهاندا.

ماکفادن، لە هەرە پیاوەکانی سەرزەمین ئەژمێررێ. چونکە لە منداڵیکی هەژاری بێ کەس و کەساس و سیلاوییەوە توانی بگاتە ئەم پلەیە کە هەموو جیهان، ئیمرۆ، کرنۆشی نەوازشی بۆ ئەکێشن. لە چاکەی ئەو رەنج و کۆششە مەردانە و پیاوانەیەیا کە بۆ پێکهێنانی ژینێکی پڕ تەندروستی و کەڵک و شادی و ئازادیی گشت لایی نواندوێتی و ئەینوێنێ.

## ژینی تایبەتی ماکفادن

ماکفادن بلیمەتێکە بۆ خۆی. لە هەموو لکێکی ژیانیا پیاوێکی سەیرە، سەری پیاوی لێ سوڕئەمێنێ. شەو و رۆژ سرەوتی نییە، بێ فەرمان، وە بێ فەرمانی گەورە و ناوازە و نایاب هەڵناکا. هەموو دەم کەللەی پڕە لە بیری نوێ، لە فەرمانی نوێ، لە تاقی کردنەوەی نوێ. کە دەستیشی دایە شتێک، تا نەیباتە سەر، هەرچی هێزی جیهان هەیە بچێ بەگژیا، سەری نانەوێ. نەبەردە، لاسارە، بەجەرگە، بەئارامە، بەرگەگرە، دڵ تەڕە، شت داهێنەرە، بێ ترس و لەرزە، پیاوانە و مەردە، راستگۆ و راست و رەوانە، خۆ بەخت کەرە، دڵسۆزە بۆ بیروباوەڕی خۆی، چاولێکەر نییە. پیاوی گیانی بە نانی نییە. لە ژینا سادە وە لە دەروون و دڵا پاک و ئازادە. هەموو دەم بەرەو پێش ئەڕوا، وە خەڵک بەرەو پێشکەوتن ئەبا، گوێی ناداتە تەنگ و چەڵەمە، ئەگەر سەر و گیان و سامانیشی تیابچێ واز لە قسەی خۆی ناهێنێ تا بەئامانج ئەگات!...

زۆر بەتەنگ دڵی فەرمانبەر و کرێکارەکانی خۆیەوەیە. وە وەک برایەکی باوک و دایکی لەگەڵیان ئەجووڵێتەوە. لەگەڵ ژن و منداڵی خۆیا یەجگار گەش و رووخۆش و دڵسۆزە. وەک دۆست و هاوڕێ لەگەڵیاندا ئەبزووێتەوە. لەگەڵ دوژمنەکانیشیا زۆر خۆی ماندوو ناکات. بەکردەوە بەدرۆیان ئەخاتەوە و شەرمەزاریان ئەکات.

لەگەڵ ژنەکەی پێشوویا هەڵی نەکرد، بەرەڵلای کرد. بەڵام ئەم ژنی دواییەی کە لە ساڵی ١٩١٢دا لە ئینگلتەرە مارەی کرد. بۆی بووە سەرچاوەیەکی خۆشی و بەختیاریی کە تا ئەو ساتەی نەی دیبوو بەخۆیەوە. (مس ماری ولیامسۆن)، جگە لەوەی کە لە گرەوی (جوانی و تەندروستی)دا بەیەکەم دەرچووبوو، وە (١٠٠) لیرەی ئینگلیزیش پاداشی لە (ماکفادن) خۆی وەرگرتبوو ئافرەتێکی وەرزشکاری بێ هاوتابوو، ناوبانگی دەرکردبوو لە مەلەوانی و ڕاکردنا، وە تا ئەو رۆژەی کە ماکفادن خواستبووی (٦٠) گرەوی وەرزشی بردبووەوە!...

لەم ئافرەتە چوار کچی بوو، لە هی پێشووشی دوو کچ. بەدڵ حەزیان لە بوونی کوڕێکیش ئەکرد. ماکفادن کەوتە بنج و بناوانی رازی کوڕ و کچ لە دایکبوونەوە دوایی ئەو رازەی دۆزیەوە. وە لە گۆڤارەکەیا بڵاوی کردەوە کە هەموو کەس ئەتوانێ بەئارەزووی خۆی کوڕ یا کچی ببێ!. خەڵک وە بەتایبەتی پزیشکەکانی دوژمنی گاڵتەیان کرد، کردیان بەرێژگاو! ماکفادن بەرپەرچی دانەوە، گوتی سا ئەوا من پێتان ئەڵێم ئەمساڵ بێتەوە کوڕم ئەبێ!. ئایا سەرت سوڕنامێنێ کە بڵێم ماکفادن ئەم قسەیەشی بردە سەر!؟. لەپاش ساڵێک ماکفادن کوڕێکی بوو، پاش ئەو بەرەو دوا دوو کوڕی تریشی بوو!؟. کوڕە

نوخشـەکـەی یانزە مـانگ ژیا، مـرد. دڵی مـاکـفـادن و ژنەکـەی هەڵقـرچاند. بەڵام لەگـەڵ ڕژاندنی فرمێسـکەکانیا، لە گۆڤارەکەیا پێی لێ نا، کە لە بەخێوکردنیا هەڵەی کردووە، وە بڕیاری دا کە ئیتر هەڵەی وا نابێ بکاتەوە!...

ماکفادن، پیریی کاری لێ نەکردووە، ئێستاش وەک جاران وازی لە وەرزش و گەڕان نەهێناوە. هەفتەی جارێ دوو جار، بەزیانی بەرۆژەوە (٢٧) میل بەپێ ئەبڕێ تا ئەگاتە جێی کار و فەرمانەکەی. لە پاش پشـوویەکی یەک سـەعـاتی دەست ئەکـا بەفـەرمـان وەک ڕۆژانی تر. ئنجـا ئەگـەڕێتـەوە مـاڵێ بەسـواری ئۆتۆمبیلەکەی. وە تا برسیی نەبێ ڕۆژووەکەی ناشکێنێ!.

لە تەمەنی (٦٠) ساڵیا فڕۆکەیەکی کڕی و فێری گێڕانی بوو و ئەیگێڕا!.

مـاکـفـادن، ئێسـتـە بەکلۆرپارەی هەیە، لەگەڵ ئەوەشـا لە پۆشین و ڕابوواردنا هەروەک جـارانە، لە خۆی نەگۆڕ بووە، لە هەمـوو شـتێکا حەز، لە سادەیی و پـاک و پوختـەیی و ناوازەیی ئەکـات. جگەرە، بابەتی سەرخۆشی، قـومار، داوێن پیسیی نییە، لە هەفتـەیەکا دوو ڕۆژ خۆی بەرێک و پێک خستنی کەلوپەلی ناومـاڵ، باغـچە و بەخـێـوکردنی هەنگ و ئەو جۆرە شـتـانەوە خـەریک ئەکـا. ژنێکی خێزانیی نایاب ڕانەبووێری، یەجگار حەز لە بینینی سینەما ئەکات. وە هەموو جارێ لەگەڵ خێزانەکەیا ئەچێتە سینەما. ماکفادن، جیهـانێکی گۆڕی و خستییە سەر ڕێگای پێشکەوتن و تەندروستی و کامەرانی. بەڵام خۆی نەگۆڕاوە وە هێشتا هەر لەسەر بیروباوەڕەکانی پێشوویەتی. وە هەرچی سایە و پایە و سەرمایە و گەشی و خۆشییەکیشی بۆ پێک هاتووە، هەمووی لە سایەی «لەش پێ گەیاندن»ەوە ئەزانێ!؟...

«بڕایەوە»


سەرچاوەی نووسراو:

١- انباء الانسانية، شاكر الدبس، سوريا.

٢- اساطين العلم الحديث، فؤاد صروف، مصر.

٣- الرواد، فؤاد صروف، مصر.

٤- ماكفادن، فولتون اورسلار، ترجمة فائق الجوهري، مصر.

٥- مجلة الرياضة البدنية ١٩٣٠ - ١٩٣٢، فائق الجوهري، مصر.

٦- الحيوية الجنسية، ماكفادن، ترجمة فائق الجوهري، مصر.

٧- منهج التربية الروحية، فائق الجوهري، مصر.

٨- مهاتما غاندي، رومن رولان، ترجمة عمر فاخوري، بيروت.

٩- مجلة المختار، عدد ابريل/١٩٤٧، فؤاد صروف، مصر.

١٠- تولستوي، حسن محمود، مصر.

١١- الشخصية، عطية الابراشي، مصر.

12- Great Leaders - Franklin J. Meine - U.S.A

## پێڕست